# ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان



## إحياء علُومِ الدِّين

بەرگی یەکەم

پەڕاوی زانست (کتاب العلم)

دانراوی

ئیمامی غەزالی

(خوا لێی ڕازی بێ)

وەرگێڕانی

شێخ موحسینی موفتی

# ژیانەوەی زانستەئاینیەکان
# (إحياءُ عُلُومِ الدِّين)

بەرگی یەکەم

پەڕاوی زانست(کتاب العلم)

دانراوی

## ئیمامی غەزالی

خودای لێ ڕازی بێت

وەرگێڕانی

## شێخ موحسین ی موفتی

کوردوستان - هەولێر

مزگەوت و مەدرەسەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

لە بڵاوکراوەکانی پەیڕەوانی طەریقەت

ئەهلی سوننەت و جەماعەت

(٣١)

ناوی کتێب: ژیانەوەی زانستە ئاینییەکان

دانەر: ئیمامی غەزالی

وەرگێڕ: شێخ موحسین ی شێخ خالدی موفتی

بەرگی: یەکەم

دیزاین: أحمد فاتح ahmadfatih2000@yahoo.com

چاپی یەکەم ٢٠١٦-١٤٣٧

چاپخانەی ڕۆژهەڵات – هەولێر

تیراژ: ٢٠٠٠



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٨٦ ) ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

التوبة: ١٢٢

# پێشکەشە بە:

گیانی پاکی فەخری عالەم گەورەو سەروەرمان

حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ

ئال و ئەصحابی کیرام (رضوان الله تعالی علیهم أجمعین)

ڕۆحی پڕ شکۆی حەزرەتی ئیمامی غەزالی (قدَّسَ اللهُ سِرَّهُ العزیز).

گیانی شیرینی مورشید و ڕابەری طەریقەتم:

حەزرەتی شێخ موحەممەد عوسمان سیراجەددین. (قَدَّسَ اللهُ سِرَّهُ )

باوکی دڵسۆزم (أعلی الله مقامه) و دایکی بەسۆزم و خانەوادەکەم

وە هەمو ڕێبوارانی ڕێگای طەریقەت و خوداناسی،

هاو ڕازانی ڕێگا پیرۆزەکەی ئیمامی غەزالی (خودا لێیان ڕازی بێت)

وە بەهەمووی ئەو ڕۆشنبیرە خوێن گەرمانەی کە دەیانەوێت لە پەیڕەوی

ڕاستەقینەی ئەهلی تەصەووف شارەزاو ئاگادار بن و

خۆیانی لێ بەهرەمەند بکەن.

## شاکاری ئیحیای ئیمامی غەزالی ( ئەحسەن )

وەرن یاران بە میوانیی، لە پاڵ ئەم نووری ئیحیایە
ئەوا شـاکـاری شـابازی غـەزالـی هـاتەوە کـایە

ئیمام و پێشەوای بەرزی گرۆی ئیسلام و تەقوایە
کە عیلـم پەند و دانـایی ئەوەسەرمەشقی رێگایە

چرای لەمپا لەگەڵ پرشنگی ئەو خۆرە بەراورد کە
ئەوە زانستی بێ رۆح و، ئەمە غـەزنەی گران مایە

هەساری دوور لەگەڵ تیشکی هەتاوا چۆن بشوبهێنی
بەمە طـوری دڵت پڕیە لە نـووری ئەو تەجـەللایە

دڵی مـردوو بـەراوردی دڵی زینـدوی بکـەی چـۆنە
کەئەو بێ نوور دەبێ، (ئیحیـا) لە نووری طوری سینایە

وەرە خێـرا تەمـاشـاکە جیهانێـکی ون و سـەیرە
ئەوەی بینی دڵـی خـۆشە، کـەچـاوی تیژ و بینایە

ئەوەی مەحرومە لەم باخی گولستـان و چراخـانە
ئەوە بێ بەخت و بێ چـارە، دەژی بێ کار و بێ مـایە

بە(ئیحیا) دڵ دەبێ زینـدوو، ئەمە کۆدەنگی هەمـوانە
لەدۆسـت و ئەولیـاتـوڵـلا، وەدەس بێـنێ پلـەو پـایە

ئـەزانی بـۆ چـرای هیـوای دڵـی ئێمە لـە شـەوقـایە؟
کە سەرچاوەی کوڵی دڵمان لە نووری حـەزرەتی شـایە

موناجـاتی دەرونی خـۆت لە پاڵ ئەم گەشتە پڕخێرە
بگـەیتە شـاری پڕشـۆری ئەوینی عەشقی پڕمایە

دەبێ (ئەحسەن) چراخانی دڵت رۆشن بە یادی کەی
هەتا سەرمەشقی رێگا بێ، تەمەن نەڕوا بە بێ غـایە

# پێشەکی وەرگێڕ:

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

الحمْدُ للهِ وَلِيِّ الصَّالحين، والصَّلاة والسَّلام علَى سَيِّد الأنبياءِ والمُرسلِين سيِّدنا مُحمَّد وعَلَى آلهِ وأصحابهِ وأُمَّتهِ وأولياءِ اللهِ أجمعين

**حەمدو سەنا** بۆ خودای گەورە و باڵادەست، درودو ڕەحمەتی خودا لە سەر گیانی پاکی حەزرەتی پێغەمبەری پێشەوا (صەڵات و سەلامی خودای لەسەر) وە لەسەر گیانی یار و یاوەرانی و شوێن کەوتوانی تا کۆتایی زەمان.

خوێنەری بەڕێز:

نوسین و توێژینەوە لەسەر بابەتێکی گرنگی تەصەووفی، کات و توانا و لێبڕان و شارەزایی زۆری دەوێت، دووان و شیتەڵ کردنەوەی بابەتەکان، مەلەوانی ناو دەریای مەعریفەتی خوداناسی دەوێت، تا قسەکانی لە ناخی دەروونەوە هەڵقوڵاوبێت و کاریگەری لەسەر دڵ و دەروون کارا بێت، جگە لەوەی کە دەبێت بۆ خۆی شارەزای تەصەوف بێت، نەك لە ڕوی نەزەری و ڕووکەشی و زانستی ڕواڵەتییەوە، بەڵکو دەبێت شارەزای بابەت و مەقامە مەعنەوییەکان بێت، کە خوێنەری بەڕێز بخاتە ناو جیهانێکی ڕۆحیی بەربڵاوەوە، هەستەکانی ببزوێنێت، دەمارەکانی گیانی بهەژێنێت، بە توانایەکی خاریقەوە سنووری توێکڵی بابەتەکان ببەزێنێت و، ئاودیوی ناو ناخ و ناوکرۆکی مەبەستەکان ببێت و، لە خوێندنەوەیەکی ڕواڵەتییەوە خوێنەر بگوێزێتەوە، بۆ ناو جیهانێکی پڕ لە هەستیاری و، تام و چێژێکی زۆر تایبەتی، کە وەك خۆی لە ناویدا بژی، ئاوا نزیك و ئاشنای بکات بەو جیهانە بەربڵاوە سەرسوڕهێنەرە.

کەواتە ئەوەی دەم لە بابەتێکی تەصەووفی دەکوتێت و، وەك سوار چاکێکی مەیدان قەڵەمڕەوێنی تیادا دەکات، بۆ ئەوەی خۆی لە ناو مەغزاو

ناو کرۆکی تەصەووفدا ژیابێت، باس لە پلەو مەقامەکانی بکات و، تەنها ئەو چەند وانە نەزەرییەی کە خوێندویەتی، یان بۆیان باس کردووە، بکاتە سەرچاوەی مەعریفی و تەصەووفی و، ئەو دەرەنجامەی کە پێدەگات هاوتای کەشفی حەقیقیان پێ بکات و ئەو گروپ و تاقم و دەعوا چیانەی لە ملاولاوە دەیانبینێت، بە ناوی طەریقەتخوازو ئەهلی تەصەووفەوە بیانکاتە سەرمەشقی بابەتەکانی و،کاروکردەوەکانی ئەوانیش بکاتە پێوەر بۆ ناسینی زانایانی زانستی ئاخیرەت وسالیکانی طەریقی حەقیقەت،ئەوە غەدرێکی گەورە لەو ڕێباوە دەکات

هەوا خوازان و توێژەرە کاڵ و کرچەکان وشەکانیان تەعبیر لە جوانکاریی‌یە ڕواڵەتیەکان دەداتەوە، کە بە داهێنراوی طەریقەت ناوزەد بکرێت و، لەوانەیە لە چەندین لاوە تێکەڵ بە خەوش و خاڵی بیرو هزرو میتۆدی خاوەن بەرنامە و ڕێبازەکانی تریش بووبێت، یان تەنها بۆ دەرخستنی ڕاو جەربەزەیی خۆی لە بڕیارداندا وای بگەێنێت: کە تەصەووفیش فەلسەفەیەکی زانستی‌یەو، سوودی لەگەڵێ سەرچاوەی ئەملاولا وەرگرتووەو، ڕوبەڕوی تاریف و ڕەخنەو هەموو ئەگەرێکی تریش دەبێتەوە.

کەواتە هەست و دەربڕینەکانیان لە دەروازەیەکی بەرتەنگدا خۆی دەبینێتەوە، کە ژیری و ئەقڵیان قۆناغە سەرەتاییەکانی کەماڵیشیان نەبڕیوە، تا بتوانن بەویژدانێکی پڕ لە هەستیارییەوە بۆ بابەتەکان بنوارن و وەك زانا پێگەیشتووەکانی ئەهلی تەصەووف لە ناو واقیعەکەدا بژین، کە هەست کردنی ئەهلی تەصەووف بە جوانکاریەکانی ئەو ڕێبازە، لەویژدانێکی زیندوی پڕشنگداری پڕ لە ڕۆحیەتی تێکۆشان و ڕیازەتکێشانەوە سەری هەڵداوە و سەرچاوەی گرتووە. قسەیەك لە دڵەوە بێت کار لەناو دڵ دەکات و، کاریگەریەکەیشی بەردەوام دەبێت، بەڵام قسەی سەرزارەکی هەربەخێرایی لەو دیوی پەردەی گوێکانیەوە دەچێتە دەرەوە.

جوانکاریی شارەزایانی تەصەووف لەسەرو ئەقڵەوە دەست پێ دەکات و، ئەقڵ و زانست یەکێکن لە ئامرازە سەرەکیەکانی، تا بیگەیەنن بەو ناخ و ناوەرۆکەی کە زۆر دوورە لە هەست و بۆچونی ئەو کەسانەی کە لەنێو بازنەی ئەقڵیکی کاڵی ناکامڵدا دەسوڕێنەوەو، دیلی دەستی هەواو ئارەزوات بوون و، لایەنی ماددەپەرستی زاڵ بووە بەسەر بیر و بۆچونەکانیاندا، کە ناتوانن بڕیارەکانیان لەو کۆت و زنجیرەی نەفس و ئارەزوات دەرباز بکەن و پەردەو کاڵای ویژدان و ئینصافیان بدەن بەرودا.

کەواتە نوسین لەسەر بنەماکانی تەصەووف، لەو دوو خاڵە گرنگەوە سەرچاوە دەگرێت، کە زانستی تەصەووف هەرگیز پەیدانابێت، بە بێ کارکردن بە بنەماو پرەنسیپەکانی.

وە واتای صۆفی بوون نایەتەدی، بەبێ ڕۆچون و جێگیر بوونی بنەماکان لە خاوەنەکەیدا .

بۆیە دەبینین ئەمڕۆ تەصەووفی ڕاستەقینە گیری کردووە بە دەست کۆمەڵێ تاقم و بیرو هزری نامۆو نارەواوە، وەك هەندێکیان باس دەکەین:

**یەکەم:** کەسانێك کە خۆیان پیا هەڵواسیوە و دوورو نزیك ناتوانن ڕەنگدانەوەی حەقیقەتی تەصەووف لەکارو کردارو هەڵس و کەوتیاندا بەرجەستە بکەن.

**دووهەم:** کەسانێك توێژینەوە لەسەر تەصەووف دەکەن، وەك ئەوەی کە ئەم فیکرەیە بوونێکی پێشتری هەبووە و ئێستا نەماوە، یان بە پێودانگی خۆیان دەچنە ناو ئەو بازاڕەوە و، تێکەڵکاری زۆر دەکەن لە بۆچون و هەڵوێست و نوسراوەکانیاندا.

**سێیەم:** یەکێکی تر کە بەچاوی ڕق و کینەوە بۆی دەنوارێت و هیچ شارەزاییەکی لە زاراوە زانستیەکانی ئەهلی تەصەووفدا نیەو، بە پێی

لێکدانەوەی خۆی هەرچی نەچێتە سنووری ئەقڵ و فیکرە کاڵەکەی خۆیەوە ڕەددی دەکاتەوەو ڕەخنەی لێ دەگرێت، بەڵکو هەندێك جار لە سنوورو بازنەی ئیسلامەتیش دووری دەخاتەوەو، شوێنکەوتوانیشی بە فاسق و زەندیق ناوزەد دەکات.

**چوارەم:** یەکێکی تر دەیەوێت زانست و کاری سالیکانی ڕێگای خودناسی بکاتە ناو بازنەیەکی بەرتەنگی سیاسەت بازی‌یەوە، کە ڕێبازی تەصەووف بەرەو ئەو ئاراستە فیکرییە ببات، کە لەگەڵ گوتاری سیاسی ئەملاو لادا جێگای بکاتەوە، بەمەش ڕەونەقی صۆفیەتی بە تەواوی لەکەدار دەکات، چونکە: ئامانج لە تەصەووفدا ئەوەیە هەواو ئارەزواتی تاك و کۆمەڵ بگۆڕێت و، ڕایانبکێشێت بۆ ڕێبازی بەندایەتی و پابەندی و گەردن کەچی، نەك بۆ خۆی بکەوێتە شوێن هەواو ئارەزواتی سیاسەتمەدارو دونیا ویست و هەلپەرستەکانەوە.

لە ڕوانگەی ئەو فەرمودە دروستەی کە حەزرەتﷺ فەرموویەتی:

(( **لا يُؤمِنُ أحَدُكُم حَتَّى يَكوُنَ هَواهُ تَبَعاً لِماَ جِئْتُ بِه**[1] واتە:

نابنە بڕواداری ڕاستەقینە تا بە حەزو ئیرادەو مەیلی ڕاستەقینەی دڵتان واتان لێ نەیەت، کە بۆ خۆتان شوێن ئەو ڕێباز و ڕێڕەوە بکەون، کە من لەسەری بووم و ڕام گەیاندووە.

**نەیفەرمووە:** تا بە کرداری زاهیری شوێن ڕێبازی من نەکەوێت، **بەڵکو فەرموویەتی:** کە دەبێت گۆڕانکارییەك بێت بەسەر هەواو ئارەزواتی نەفسیدا، کە هەمیشە حەزی بە دونیاو ڕابواردن و سنوور بەزاندنە، بەهۆی موجاهەدەی

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في كتاب السنة١٢/١٥ والخطيب في تأريخ بغداد ٣٦٩/٤/وابن بطة في الإبانة ٣٨٧/١، والبغوي في شرح السنة ٢١٣/١. والْحُجَّةُ في بيانِ المحجة ١٠٣. وكتاب (اَلْأَرْبَعُون البلدانِيَّة البلد الْأَرْبَعُون لِأَبِى طَاهِر).

نەفس و ڕیازەتکێشان و زیکر و عیبادەتەوە، وای لێ بێت سەرچاوەی تێکدان و قەسوەت و دڕندایەتی( کە هەواو نەفسە)، بیانگۆڕێت بە ناوەندی نوورو مەعریفەت و خودانـــاسی، کە بەمەیــــلی خۆی شوێن ڕێبـــــازی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت و، تام و چێژیش لەو شوێن کەوتنە وەربگرێت.

جارێکیان لە خزمەت ڕابەری طەریقەت،حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەددیندا دانیشتبووم، پرسیاریان لە بارەی گرنگی طەریقەتەوە لێ دەکرد، زۆر بەکورتی فەرمووی:

" ئەو کردەوانەی کە لە قاڵبێکی ڕواڵەتی و تەکلیف و ماندوبووندا و، دوور لە ڕۆحییەتی ئامادەباشی و حزوردا، بە حیساب کە لە خزمەت پەروەردگاردا دەیکەیت، بەهۆی طەریقەت و تەصەووفەوە دەبێتە حاڵەتێکی پڕ لە خۆشی و تام و چێژو ئارەزوات، بەڵکو نەفسی خۆت بە مەیلی خۆی حەزی لێیان دەبێت و، دەچێتە سەر طەبیعەت و سروشتی فریشتەکان، بۆ ڕاپەڕاندنی فەرمان و ئەرکە پیرۆزەکان ".

**پێنجەم:** هەروەها تەصەووف گیری کردووە بە دەست هەندێك بەناو دڵسۆزیشەوە، لە ئەدیب و نوسەران و ڕۆشنبیران، کە لێکدانەوە لە سەر ژیان و هەڵوێست و فەرموودە و شیعرو و نوسراوەکانی پێشەواو شاعیرانی ئەهلی تەصەوف دەکەن، بە بێ‌خاوسی دەکەونە ناوەوەو، شاعیرێکی وەک مەحوی و مەولەوی و مەلای جزیری و خانی و وەفایی و هاووێنەکانیان، بە عەشق‌بازو چاو باشقەڵ و هەواپەرست دەیاندەنە قەڵەم و، بەدڵداریی مەجازی لێکدانەوە بۆ زاراوە تەصەووفیەکانیان دەکەن، کە بەداخەوە بە خەیاڵی خۆیان تاریفیان دەکەن، بەڵام لە ڕاستی دا وەك ئەوە وایە، کە زاتێکی ئاوا قەدرگران، لەناو بازاڕێکی پڕ لە ئەدەب و ڕەوشت‌دا، شۆرتێکی ڕۆژئاواییت لەبەر کردبێت و، بەو شێوەیە بە هەوادارانی بناسێنیت!!

ئەمانەو هاو وێنەکانیان، شارەزای زاراوە تەصەووفەیەکان نین، بەڵکو بێ ئاگان لە مەغزاو دارشتنی دەستەواژەکان، باسی سەیرو سلوکی رۆحی بۆ بکرێت رەنگە بە رەوتی ناو کاروانی دونیایی لێکدانەوەی بۆ بکات. ئیتر ئەبێ لە سەیری ئەنفوس و ئافاق داو، لە برینی پلەکانی بیست دائیرە ناوازەکەو جیهانی تەجەرودو، رووت بوونی رۆح لەماددەو، رونکردنەوەی حەقیقەتی مرۆڤی کامڵ و، باس کردنی جیهانی هەستی و نیستی و، تێگەیشتن لە پلەکانی دوای برینی ویلایەتی باڵاو، بابەتە سەرسورهێنەرەکانی تر، دەبێت کە لێیان تێ نەگەیشتبێت و، زاراوەی ئەهلی پسپۆری ئەو مەیدانەش نەزانێت، ئیتر چۆن خۆی بکاتە سووری بەر لە شکرو، خەڵکێکی داماوی وەك خۆی، بە فەلسەفە وشك و لێکدانەوە بێپێزەکانی سەرقاڵ بکات.

صۆفی راستەقینە بۆ هەموو وشەو زاراوە زانستیەکان لێکدانەوەو دارشتنەوەی تایبەتی خۆیی هەیەو، ئەو وشەانەیەیش لەگەڵ جیهانە رۆحییەکەی ئەمدا گونجاوەو، هاووێنەکەیشیان لە قورئان و فەرموودەکاندا بوونی هەیە، ئەمان دەیانهێنن و دیسان بەپێی یاسای وەبەرهێنانێکی پر لە شارەزایی، لە قاڵبێکی رۆحی‌دا دایاندەرێژنەوە، تا دەیانگەیێننە دوا پلەی نەرم و ناسکی و وردەکاری، بە رێکاری پلەکاریی مەعنەوی، کە هەردوو شارێگەی تاقیکاری زاتی و، بەکارهێنانی زانستە مەعنەوییەکان لە یەك دەداتەوەو، بەرەو ئامانجی تێگەیشتن لە تەفسیرە ئیشارییەکان، دوا پلەی مەعریفی دەبرێت و، لە راستی‌یە شاراوەکان حاڵی دەبێت.

هەموو ساتەوەختێك هێزی تیگەیشتنیشی، لەسەرچاوەی یەکەمی هۆکاری پێگەیشتنیەوە زیاتر دەبێت کە قورئانی پیرۆزەو، دەری دەخات کە سلوکی صۆفی بریتییە: لە کارێکی هاوبەش لە میانی تەجرەبەو تاقیکاری مرۆڤ و قورئانی پیرۆزدا، تا زیاتر لەو بوارەدا شارەزا و بە ئەزموون بێت، زیاتر نهێنیەکانی

دڵی لەو بونەوەرو دەوروبەرەی پاکتر بکاتەوە، چاکتر لە ناوەرۆك و ئەسراری قورئان حاڵی دەبێت، لە هەردوو ڕووە زاهیری‌و شاراوەکانیانەوە.

وە شارەزابوونی ئەهەلی تەصەووف، لە ڕموزو ئەسراری قورئان.

واتە: بڕینی هەر چوار پلەو مەقامەکانی حاڵی بوون لە قورئان، بە پێی ڕێبازی پلەکاریی لە عیبادەت و دەستەواژەکانی، لە ئیشارەت و هێماکانی، لە ئەلطاف و وردەکاریەکانی، وەلە تەواوی حەقایق و ڕاستیەکانی، کە هەر پلەیەکیانی بڕیبێت، بەرزتردەبێتەوە بۆ پلەیەکی تر، تا بە ناوەرۆکی کەلامی خودایی ئاشنادەبێت.

هەڵەیەکی گەورەیە کە قۆناغ و ڕیزبەندیی لە مێژووی تەصەووفدا دیاری بکرێت و، بەپێی قۆناغەکان ناوی زوهدو تەصەووفی عەمەلی و تەصەووفی فەلسەفی لێ بنرێت، یان بووترێت: صۆفیەکانی ئەهلی سوونەت و صۆفیە فەلسەفیەکان.

چونکە زاراوەی صۆفی! کە تەنها وەسیلەو هۆکارێکە بۆ نزیك کردنەوەی واتای ڕۆحی، زۆر جیاوازە لە زاراوەی فەلسەفی، کە ئەصڵی مەبەست و فیکرەکەیە.

لەبەر ئەوەی بنەما سەرەکیەکانی زاراوەی تەصەووف هەریەکێکە، کە قورئان و فەرمووده و تەئویلی دروستی ئەصحاب و پێشینەکانە، یەکسانیەکی ڕاستەقیەنەش لە میانی صۆفیەکاندا هەیە، لە هەموو چین و نەوەکانی سەرەتاو کۆتا، جیاوازی لە میانی بەکارهێنانی زاراوە تەصەووفیەکانی ئەقطابی تەصەووفدا نی‌یە، مەگەر جیاوازی لە پلەکانیاندا هەبێت، بۆ نمونە:

هەموویان وشەی سلووکیان بەکارهێناوە، بەڵام بە پێی مەقامی سالیکانی ڕێگای ئاخیرەت، جیاوازی پەیدا دەبێت، هەر کەسە بەو شێوە تەعبیری لێك دەداتەوە کە تیایدا ژیاوە، کەواتە گوتار و خیطابی ئەهلی تەصەووت و تێکڕای

زاراوه زانستیەکان کە بەکاریان هێناوە، وەك ئیجتهادێکی فەرعی جۆراوجۆر وایە، لەناو یەکەیەکی عیرفانی بەربڵاوی بێ سنووردا، وەك ئەوەی زەمان کاریگەریی لەسەریان نەبێت.

بۆ نمونە: ئەو زاراوانەی کە ئەقطابی طەریقەت لە چەرخی سێیەم و چوارەمدا بەکاریان دەهێنا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ، لە لایەن(زەننون)ی میصری وجونەیدی بەغدادی و شیبلی و سیراج و هاووێنەکانیان، بەبەراورد لەگەڵ زاراوە تەصەووفیەکانی سەدەی سیازدەو چواردەوە، کە لە رۆژئاوای ئیسلامی دا ( ئیبن و عەجیب و مائولعەینەین) بەکاریان هێناوە، دەبینین گواستنەوەیەکی ئاشکرای تێدایە بۆ هەمان زاراوەکان، لە گەڵ بوونی هەندێك جیاوازی لە پێناسەکانیاندا، بەڵام هەموو تاریفە جیاوازەکان، بە تەواوی و گونجانی تەواوە وە، پێکەوە کۆ دەبنەوە، بۆ ڕاڤەکردنی زاراوەی تەصەووف، لە سەروو هەموو چەرخ و زەمانێکەوە، ئەمەش ئەو پێوەرە پوچەڵ دەکاتەوە، کە هەڵگۆڕان و تەطەووری زەمانی و مەکانی بەکار دەهێنن لە توێژینەوەکانیان، لەسەر دیاردەی ڕۆشنبیری و سەقافەی رۆحیدا .

لە ڕاستیدا تەفسیری ئەم یەك فیکرەیی و یەك بنەماییەی زاراوەی تەصەووف بۆ ئەوە دەچێتەوە، کە دیاردەیەکی رۆحی بەهێزە، لەو دیوی سنووری رۆشنبیری زاهیری حیسابی بۆ دەکرێت و، ناچێتە ژێر هیچ پێوەرێکی کلتوری باوی سەردەمەکانەوە، یان ئەوانەی دێنە ئاراوە و لە مەودوا پەیدا دەبن.

بێ گومان ئەم یەك بوونی زاراوەی تەصەووفە، لەسەرەتاوە تا کۆتایی هەموو چەرخەکان، دەگەڕێتەوە بۆ یەك بوونی بابەت و ڕێباز و ئامانج و هۆکار و بنەماکانی تەصەووف کە لێیانەوە وەرگیراوە، چونکە ئەو بابەتەی تەصەووف قسەی لەسەر دەکات، زاتی پیرۆزی بەرزی پەروەردگارە، وە زیاتریش نهێنیەکانی

تەصەووف لەناو کەلامی خودایی‌دا دەردەکەون، بەرەو ئامانجی پیرۆزی گەیشتن بە (مَعْرِفَةُ اللّٰه).

وە بەرنامەکەشیان، ئەو تەجرەبە رۆحی‌یە دامەزراوەیە، کە پشت قایم بەکەلامی خودا و فەرموودەی خاوەنی(تەبیین)و سوارچاکی مەیدانی رونکردنەوەی قورئان دەبێت، وەهیچ هەڵگۆڕانێکی گشتی لەزاراوە و بنەماکانیدا پەیدا نابێت، مەگەر تەنها لە بازنەی ئیجتهادی مورشیدێکی کامڵ و رێگە پێدراودا، کە دەتوانێت پلانی پێگەیشتن وپەروەردەکردنی مورید، بەشێوەیەکی جیاواز بۆی دابرێژێتەوە، بەبێ گۆڕانکاری لە ئەصڵەکاندا.[1]

زانای پێگەیشتووی ئەهلی تەصەووف کە سەیری هەموو دروستکراوەکان دەکات. تەنانەت جەستەو لاشە بێ گیان و جەمادو بێ دەنگەکانیش، هەموویان تەعبیر لە کەلیماتی بێ کۆتای خودایی دەدەنەوە، لەم بونەوەرەدا لە ڕوانگەی کەشفی ئەهلی تەصەووفەوە، شتێك نی‌یە ناوی( بێ دەنگ ی) بێت، بەڵکو هەموو گۆیایە بە زیکر و ستایشی پەروەردگار، هەرچەند خۆیان لە خۆیانەوە قسەکەر نین ، بەڵام دەرخەرو مەظهەری ئەو توانایەن، کە بەزوبانی حاڵ دەیانهێننە گوفتار.

کەواتە؛

لە ڕوانگەی چاویلکەی مەعنەویی صۆفیەوە، جیهان گشتی مەصحەف و پەڕاوێکی گەورەیە، پڕیەتی لەو هەموو پیتە چنراو و دارێژراو و تایپکراوەی، لەسەر لاپەڕەی بوون پیشاندراوەو، نوسینەکانیش لەسەر لاپەڕە پان و

---

(١) بۆ زیاتر رونکردنەوەی ئەم بابەتە بنوارە: اَلْخِطابُ الصُّوفِي بَينَ التَّأوّلِ والتَّأْوِيل بەدەستکاریەوە د. مُحمَّد المُصطَفى العزام مؤسسة الرِّحاب الحديثة. بَيروت لبنان طبعة ٢٠١٠ ص ١٨-٢٠.

بەرینەکانی بەردەوامەو هەرگیز بەکۆتا نایەت، بوونی ئەو وشەو پیت و ڕستانەش بۆ خودی خۆیان نەنوسراونەتەوە، بەڵکو پەیامێکی هەمیشە زیندو و تازەن، ڕوو بە مرۆڤەکان دەدوێن، کە بەزوبانی حاڵ، خودای گەورە دەیخوێنێتەوە بەسەر بەندەکانیدا[1]

کەواتە؛

بەلای ئەهلی تەصەووفەوە، ئامانج لە دروستکردنی ئەو خەڵکەیە، تەنها گەیشنە بە( مَعْرِفَةُ الله) و، تەواوی ئامانجەکانی تر لاوەکین، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت خودای خۆی بەحەق بناسێت، خودای گەورەش سۆز و مەرحەمەتی لەگەڵدا کردووەو، گوێ و چاوو دڵی پێ داوە، تا ڕاستیەکانی پێ ببینێت

﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ﴾ (الملك ٢٣)

وە هەموو دیاردە بینراوەکانیشی کردووە بە شایەت و بەیان، لەسەر بوونی حەقیقەتە شاراوەکان.

بۆیە **عالەمی شەهادە** بەوە پێناسە کراوە: کە بەهۆی هەست و وەهمەوە لەجوانیی ئەم دونیایە دەبینیت و هەستی پێ دەکەیت.

وە **عالەمی مەلەکوت** و غەیبیش، ئەو جیهانە شاراوەیە:

لە نهێنی و ئەسراری واتاکان شارەزا دەبیت،کە بەهۆی زانست و زەوقی سەلیمەوە دەزانرێت.

وە **عالەمی جەبەروتیش**:

کە تەعبیرە لە جیهانی پڕعەزەمەتی خودایی، کە دەریایەکی بێ پەیی بێ سەروبن و بێ کۆتایە، هەموو جیهانە بینراوو بیسراوو مەعناکانی تیا دەخنکێت و ون دەبێت، ئەو جیهانە بەرینــلاوەیش بەهــۆی کــەشف و ویــژدانی

---

(١) اَلْفُتُوحاتُ الْمَكِيَّة: ١ /١٠١ وە ب/٢ /١٨٠ و ٣٩٠.

زيندوو تێکۆشانی بەردەوامەوە لێی شاوەزا دەبێت.[1]

کەواتە کەسێك دەبێتە موریدی ڕاستەقینە، کە ئەوەی دەیەوێت لە قورئاندا دەستی بکەوێت، بەڵام تەنها ئەوانەی ئەهلی قورئانن دەتوانن بگەنە ئەو ڕاستیەی، کە هەموو زانست و وەڵامی هەموو پرسیارێك لە قورئاندا هەیە ﴿ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام ٥٩)

بۆیە لای (أَهْلُ الله):

قورئان زۆر پیرۆزو قەدرگرانە، چونکە یەکەم مەظهەری فەیزو تەجەللیاتی پەروەردگارە و، هۆکارێکی گەورەیشە بۆ ئەوەی لەو ڕێگەوە خودای گەورە خۆی بە بەندەکانی بناسێنێت و، وەسیلەیەکی مەزنیشە کە بەندەکان بەهۆی قورئانەوە خۆیان لە خالیقەکەیان نزیك بکەنەوە، کەواتە قورئان حەبلی مەتینە لە میانی بەندەکان و خالیقدا، وە سەرچاوەو کانگای قورئانیش، دڵی مەزن و گەورەی حەزرەتی موحەممەدە ﷺ، وە هەموو حەقیقەتی قورئان لەناو گیانی پێغەمبەردا بەرجەستەیە، هەموو ئەسرارەکانی قورئان، لەناو زەڕراتەکانی لاشەو گیانی پێغەمبەردا ﷺ ئاوێتەیە، هەموو نهێنیەکانی قورئان، لەناو پیتەکانی قورئاندا جێگیرەو، لەبەرامبەر هەموو گەردیلەیەکی گیانی پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەردا ﷺ کراوەیەو، هیچ شتێك بە ئیزنی خودا لێی شاراوە نیەو لێی ون نابێت.

سەرچاوەی فەیزو زانستی هەموو دۆستانی خودایش، تەنها لە ڕێگەی ئەو دڵە مەزنەی حەزرەتەوەیە ﷺ ، چونکە هەرکەسێك لەناو دڵی پێغەمبەرەوە ﷺ

---

(١) معراج التشوف إلى حقيقة التصوف، أحمد عجيبة، مطبعة المرينى تطوان ١٩٨٢ م ص(٤٢) و (الإصطلاحات الصوفية) لإبن عربي آخر كتاب التعريفات. الجرجاني الدار التونسية للنشر ١٩٧١ ص ١٤٣.

ڕێگەی بوونەوەری بۆ نەکرێتەوە، هەرگیز ناتوانێت کەسبی موحببەتی خوداﷻ بکات و بە ناسینی خودا ئاشنابێت، کە دەشزانین، ئامانج لە دروست کردنی بەندەکانی خودا، تەنها ناسینی خودایەﷻ، وەك قورئان فەرموویەتی:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات ٥٦)

وەك حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی عەباس لێکدانەوەی بۆ کردووە، واتە:

بـۆ ئەوەم درسـتکردوون کە بمناسـن، جـگە لە ئەهلـی طەریـقەت و تەصـەووفیش، کەم کەس لەهەوڵی ئەوەدان خوداناسـی بـکەن، بەڵام صـۆفی پـێش هەمـوو تـوێژەرە هەسـتیارەکان، ڕۆحەکەی داناکەوێـت و ئاسـودەنابێت، تائەوکاتەی دەتوانێت پەردەی ئەو جیهانە بەرفراوانە بدڕێت و پیایدا سەرکەوێت و، ئەو ژیانی تاریکیستانە چڕەی لە چواردەوریەتی، کە تارمایی خەستی خستۆتە سـەر پێڵـوی چاوەکـانی و، لێـی قەدەغەکـردووە کە دەرکـی حەقـیقەت و ڕاستیەکان بکات، دەبێت ئەو جیهانە تاریکە ببڕێت و، لە جیهانی موشاهەدە و بینراوەکانەوە سەرکەوێت بۆ جیهانی نەبینراو.

هەرچەندە لەسەرەتادا صۆفی ئەوەی زیاتر بەلاوە گرنگە کە عەیبە ناوخۆیی‌یەکانی خۆی و دەوروبەری چارەسەربکات، نەك بەدوای جیهانی غەیب و مەلەکوتی‌دا بگەڕێت.

وەك (إبنُ عَطاءُ الله) دەفەرمووێت:

**تَشَوُّفُكَ إلىَ مابَطنَ فيكَ مِنَ العُيُوبْ، خَيرٌ مِنْ تَشَوُّفِكَ إلىَ مَا حَجَبَ عَنْكَ مِنَ الغُيُوبْ.**[1]

بەڵام صۆفی کە قۆناى پاکسازی و چاکسازی خۆیی تەواو کرد، ئیتر بەرز دەبێتەوە بۆ جیهانی غەیبی، وە هەرچەندێك لەو جیهانی مەلەکوتی و نادیارەدا

(١) إيقاض الهِمَم، لإبن عطاء الله السكندري ص ٨١.

زیاتر ڕۆچوبێت، بەهاو نرخی جیهانی بینراوی لا کەمتر دەبێتەوە، وای لێ دێت عالەمی موشاهەدە ون دەبێت لە ناو عالەمی غەیب دا، کە بەلای ئەهلی تەصەووفەوە، ئەو میعراجە ڕۆحی‌یەی کە لە لای خوداوە پێی دەبەخشرێت، بۆ زیاتر دامەزراندنی دڵ و دەروونە لە سەر ئیمان، وە تێکەڵ بوونە لەگەڵ لوطف و میهرەبانی پەروەردگار، وەك چۆن تاریکی و زوڵمەتی شتی غەریب و نامۆ دڵەکان دەتەوسێنێتەوەو، پەردەیان لەسەر هەڵدەدات، هەروایش وەستان لە حزوری خودادا، دڵەکان دەکاتەوەو جێگیریان دەکات.

وەك ئیبن و عەطائوڵلا فەرموویەتی:

**رُبّمَا وَقَفَتِ القُلوبُ مَعَ الأَنوارِ، كَما حُجِبَتِ النُّفُوسُ مَعَ الأَغيار.**[(١)]

بۆیە دەبێت دڵەکان هەر لەسەرەتاوە وا ڕا بهێنرێن، کە بە جیهانی نادیار ئاشنا بن، قورئانی پیرۆز کاتێك مەرجی بڕوا دیاری دەکات بە ئایەتی:

**یُؤْمِنُونَ بالغَیْبِ**، خۆ بڕوا بوون بە جیهانی غەیب و شاراوە، بۆ ئەو کاتە نی‌یە کە دونیات بەجێ هێڵاوە و خۆت دەکەویتە ناو غەیبەکەوە، ئەو کاتە هیچ هونەرێکی تێدا نی‌یە کە بڕوات پێ‌ی هەبێت..

صۆفی هەر لە دونیادا ئەو بڕوایە بەرجەستە دەکات، بۆیە زۆربەی ڕێکارە پەروەردەییەکان، ڕۆچونە لە ناو جیهانی نادیاردا، بۆ ئەوەی عالەمی غەیبی لا ئاسان ببێتەوە، دەبێ قوفڵی دڵی بکاتەوە، هەرگیز ناگونجێ واتا و ناوەڕۆکی فەرموودە و ئایەتە پیرۆزەکان وەربگرێت، ئەگەر تێکەڵ بە گومڕایی ئەو کۆمەڵگا شێواوە بووبێت و، خۆیی لێ دەرباز نەکردبێت.

بۆیە پێویستە باش بیر لە قورئان و واتاکانی بکاتەوە، مەگەر دڵی قوفڵ درابێت و مۆری بەدبەختی بەسەردا نرابێت:

---

(١) إیقاظ الهِمَم ص ٢٨٠.

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا (محمد ٢٤) ﴾

کەواتە بە ناچاری بەو ئامانجە دەگەین کە دەڵێم:

**لە بەر ئەوەی ڕێبازی تەصەووف گەورەترین و تەواو ترین ڕێبازە، کە پەیڕەوانی بە حەقیقەتی ئیسلام ئاشنا بکات.**

وە باس کردنی ئەم ڕێبازەش کەسی پسپۆڕ و شارەزا و خاوەن پلە و مقاماتی تەصەووفی دەوێت، وە کەسێکی وایش لەم چەرخەدا زۆر بە دەگمەن دەس دەکەوێت و، وەك ئیکسیری لێ هاتووە، وە لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێکی وایش لە ئارادا بێت هەرگیز ناتوانێت وەك ئەوەی زانای گەورە و مەزن (ئیمامی غەزالی) بینیویەتی ئاوا ئەو ڕۆڵە کاریگەرەیە ببینێت، بۆیە باشترین هۆکار بۆ گەیشتن بە خزمەتی شەریعەت و حەقیقەت، لەوەدا دەبینمەوە، کە بتوانین لە ناوەڕۆکی کتێبی ناوازەی ئیمامی غەزالی (**ژیانەوەی زانستە ئاینیەکان**) (**إحياءُ علومِ الدِّين**) حاڵی ببین، کە هیچ کەس ئەمڕۆ لەو بوارەدا ناتوانێت( صەد یەکی بەپێزی و بەتامی) ئەو کتێبە بخاتە بەر دەستی خوێنەرانەوە.

بۆیە وا دەزانم وەرگێڕانیشی بە زوبانی شیرینی کوردی، ئەندازەیەکی باش ئەو تام و چێژە لە دەست نادات و، دەتوانین بۆ تێگەیشتن لە شەریعەتی ئیسلام و ئەسرارەکانی ڕێبازی طەریقەت و تەصەووف کەڵکی تەواوی لێ وەربگرین و، دڵەکانی پێ ببوژێنینەوەو، خزمەتێکیش بێت بە کتێبخانەی ڕەسەنی کوردی.

## خودا یارو هاوکارمان بێت.

# بۆچی ئیحیای غەزالی پێویستە ؟

**خوێنەری بەڕێز:**

ڕێگای تەصەووف بەوگرانییە، سوارچاکانی ئەو مەیدانەش بەوکەمی‌یە، شارەزایانی ئەو بوارەش بەو دانسقەیی‌یە، بانگەشەکارانی طەریقەتیش( کە خۆیشیان بێ ئاگان لەبەرنامە و نهێنیەکانی طەریقەت) بەو زۆری و کرچ و کاڵییە، ئەی چۆن بتوانین ڕێگا چارەیەك ببینینەوە، کە ئارامی بگێڕێتەوە بۆ دڵەکان، هەناسەکان بە ئاسودەیی بێنە دەرەوەو، تام و چێژی ئیمان و بڕوایش بکەوێتەوە سەر زارو دڵی هەموو دڵسۆزە هەستیارەکان.

دەبێ چی بکەین کە دڵسۆزانی ڕێبازی خوداناسی بە تەصەووفی راستەقینە ئاشنا بکەین، بە دڵنیاییەوە هەرگیز خۆم بە شایستە نەزانیوە، کە تەقە لەو دەرگای باسکردنی ڕێبازی پەروەردەیی تەصەووفی یە بدەم، هەرگیز لەو ئاستەدا خۆم نابینمەوە، کە لە وشەو فەرمودەو ڕەمزو مەغزای ڕستە پڕ لە ماریفەتەکانیان حاڵی ببم، چ جای ئەوەی کە ئەو باسە گرنگەی کە خاوەنی (قُوتُ القُلوبِ)ی ئەبوطالیبی مەککی و خاوەنەکانی ڕیسالەی قوشەیری و فتوحاتی مەککی و غونیەی حەزرەتی غەوث و هاو وێنەکانیان کردویانە، کە بتوانم وەك ئەوان کە بە نوسراوەکانیان کردویانە، ئاودێری دڵی تینوانی ڕێگای هیدایەت و خوداناسی بدەم.

زۆرم بیرکردەوە، چی بۆ ئەم قۆناغەی خوێنەر و تینوانی ڕێگای حەقیقەت دەشێت و، چۆن خزمەتی ڕۆحی و ئیمانییان پێ بکرێت، کە لە ئاستی ئەم گەلە ستەم دیدەدا بێت، کە بە نەتەوە و میللەتی ئەولیا پەروەر ناسراوە، وا خەریکە دێوەزمەکانی ڕەش و تاریکی، بەناوی بەرهەڵستی کردنی بیدعەوە، هەموو ڕێگەو

دەروازە ڕۆحی و مەعنەوییەکان لە خەڵکە هەژارەکە دادەخەن و، ڕێبازی تەصەووف بەرە و ڕووی هەموو تۆمەتێکی خراپ و نەشیاو دەکەنەوە.

قسەی ئەوان لای دانا و شارەزاو خاوەن فامەکان، هیچ نرخ و بەهاو ئەرزشێکی نی‌یە، بەڵام نەوەی تازە پێگەیشتووە بەهۆی خوێندنەوەی پەراوو نامیلکە تازەکانەوە، کە هەندێکیان ژەهریان لێ دەتکێت و، دژ بەڕێبازی سەلەفی صالحین نوسراونەتەوە، کاریگەری نەرێنی لە سەریان دەبێت.

**بۆیە بەدڵنیاییەوە دەمێ ساڵە ئەو متامەنەم لەدڵدا چەسپاوە، کە کتێبی ناوازە و مەوسوعەی پیرۆزو بەرفراوانی (ژیانەوەی زانستە ئاینەییەکان)( إحياء علوم الدين) ی ئیمامی غەزالی، باشترین هۆکارە بۆ گەیشتن بەو مەرام و ئامانجە. لەڕوی ئەم خاڵانەی خوارەوە:**

## یەکەم:

گەورەترین و ناوازەترین کتێبە کە لە جیهانی ئیسلامدا ناوبانگی باشی دەرکردووەو، صەدان جار لە چاپدراوەتەوە و، کەم کتێبخانە هەیە لە دونیای ئیسلامدا ئەم کتێبە پیرۆزەی تێدا نەبێت.

## دووهەم:

بە پێی فەرموودەی مامۆستایانی موجیزم جەنابی مامۆستا مەلا عەبدالکریمی مودەریس و باوکی بەڕێزم (أعلى الله مقامهما) کە هەمیشە هانیان دەدام دوای تەواوکردنی خوێندنیش، هەمیشە خەریکی متالای ئیحیای ئیمامی غەزالی بم، بۆیە منیش هەر لەسەرەتای هەشتاکانەوە، ئەو کتێبە پیرۆزەم بە تەواوی خوێندۆتەوە و، گەلێ جاریش بەدوای ڕاڤەو مەبەستەکانیدا دەگەڕام و سوودم لە مامۆستایان و سەرچاوەکان وەردەگرت. تاگەیشتمە ئەو دڵنیاییەی تەنها یەك نوێژ بەپێی مەرجە پیرۆزەکانی ئیمامی غەزالی ئەنجام بدەیت لە

صەدان نوێژی تر چاکترو بەبەرهەم ترە، وە تام و چێژیشی بەردەوامەو هەرگیز لە بیرناکرێت. کە لە ژیانی خۆم دا ئەم ڕاستییە بەرجەستەبووە.
وە هەوڵیشم داوە هەندێك لە کتێبەکانی، وەك: کیتابی (عیلم) و کیتابی (آدابُ الصُّحْبَة) و هەندێك پەڕاوەکانی تریش بە دەرس بڵێمەوە و پێی بەهرەمەند ببم.

**سێیەم:**

تەواوی زانایانی ئەهلی تەصەووف، لە کاتی خوێندنەوەی ئیجازە نامەی مەلایەتی‌دا، یەکێك لە مەرجە هەرە سەرەکیەکانیان ئەوەبووە، کە وەصێتیان بۆ ئیجازەوەرگرەکەیان کردووە، کە هەمیشەو ڕۆژانە متاڵای (ئیحیا علومودین) بکەیت، ئینجا ئیجازەکەیان پێ دەبەخشین.

**چوارەم:**

لە ژیانی حەزرەتی شێخ عومەری ضیاءالدین دا (قدّسَ الله سرّه) باس کراوە کە هەمیشە ئەو زاتە لە کۆڕ و مەجلیسەکانیدا دەبوایە خۆی یان یەکێ لە زاناکان، پەڕەیەك یان زیاتری ئەم ئیحیایە بخوێنێتەوە و، شەرحی بکەن و لەژێر سێبەری ئیحیادا لە حەوشی خانەقادا دابنیشن و بەبۆن وبەرامی سفرەو خوانی غیزای ڕۆحی کتێبی ئیحیا، مێشکیان ئاسودە بکەن و، خۆیان لەسەر عیبادەتی ڕاستەقینە ڕابهێنن.

**پێنجەم:**

ئەوەی بەندە لە توێژینەوەی ئیحیای غەزالی بۆم دەرکەوتبێت:

زوبانی ئیحیا تایبەت نی‌یە بە چین و توێژێکەوە، بەڵکو ئەم کتێبە پیرۆزە سەرچاوەیەکی ئاوەشتەکردنەوەی دڵەکانە، هەرکەسێك لە هەر ئاستێکدا بێت، بە ئەندازەی تینوێتی خۆی، مشتە ئاوی لێ دەردەهێنێت و خۆیی لێ ئاواشتە دەکاتەوە. بۆیە ئەگەر بڵێین:

خوێندەواری ئاسایی و، موریدی قۆناغی سەرەتایی ڕێبازی خوداناسی، بەهۆی

ئیحیاوە هەربەکەیان دەکەوێتە سەر سککەی ئیستیقامەت و لە ئامانجی داهاتووی ترسی نامێنێت، ئەوە هیچ زیادە ڕەویەکمان نەکردووە .

کە بە ڕاستی ئیحیای غەزالی قۆناغ بە قۆناغ دەستی دەگرێت و لەمەترسیەکان ڕزگاری دەکات، بۆیە دەتوانین زیاتر دڵنیابین:

کە گوتاری تەصەووفی ناو پەڕاوەکانی( ئیحیا)، کەڵکی بۆ ئەولیا گەورەکان زیاتر هەیە، چونکە لا نەدان لە سککەی ئیمان و بەختیاری و ، پابەندبوون بە فەرمانەکانی شەریعەت، لە دوای کامڵ بوونی عەقیدە سەخت ترە و خۆڕاگری زیاتری دەوێت.

مورشیدی ڕاستەقینەش دەبێت هەمیشە سنگی کراوە بێت، لە میانی خۆف و ڕەجادا بێت، بۆیە هەمو پێشهاتە ترسناکەکان کەڕو لە خۆی و مورید و پێگەیشتوانی ڕێبازی تەصەووف و خوداناسی دەکەن ، لە چوار چێوەی ئیحیادا چارەسەری خێرایی بۆ کراوەو، هەموو کەسێک لە هەر ئاستێکدا بێت، وا دەزانێت کە خاوەنی( ئیحیا) قسە لەگەڵ ڕۆحی ئەودا دەکات و، دەواو دەرمانی تایبەتی بۆ سارێژکردنی برین و خەم و گرفتەکانی دەنوێنێت و دادەنێت.

**شەشەم:**

زوبانی (ئیحیا) زوبانێکی پڕ لە ئیخلاص و دڵسۆزی‌یە، دوای دەیان تاقیکاری سەخت و، بڕینی هەموو دەریاکانی زانستە باش و خراپەکان، وە پەڕینەوە لە هەموو کێشەو گرفتە ڕۆحی و نەفسیەکان، وە دوای ئارامی دڵ و ئاواشتەیی دەروون و ،گەیشتن بە پلەکانی ڕەزامەندی تەواو لە حزوری خودادا، دوای ئەوەی نووری( حەقیقەتی موحەممەدی) لە دڵیدا داگیرساو، پشتی گیراو تەخویل کرا کە هەڵسێت بەو ئەرکە پیرۆزەی کە دڵەکان ئاوەدان بکاتەوە، دوای مشت و مڕێکی زۆر لەگەڵ فیکرەی باطینیەکان و فەیلەسوفەکان و بیدعە سازەکان و، سەرکەوتنی بە سەر هەموو گرۆ و توێژو تاقم و کۆسپ و

گرفتەکاندا، وە دوای ئەوەی کە بۆ خۆی و بە یارمەتی هەمیشەیی پەروەردگاری و، لە ڕێگەی مورشید و مامۆستای مەعنەوی خۆیەوە ڕێگەی لە پێگەی حەقیقەت کەوت و لێی تێراوبوو، چاوی دڵی بە تەواوی کرایەوە، هەموو ئەسرارەکانی قورئان و حەقیقەتی ڕسالەی ئیسلامی بۆ دەرکەوت، ئیتر ئەم کتێبە پیرۆزەی داناو، بوویە سەرچاوەیەکی نوور و فیوضات خودایی بۆ هەموو جۆرە کەسەکان و، لە هەموو ئاستەکاندا،کە توانییان لەناو جیهانی پڕ ئاوەدانی ئیحیای غەزالیدا( خودای لێ ڕازی بێت). بەویست و مەرامی خۆیان بگەن،

### حەوتەم:

ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشابم و باشتر ئەو ڕایانەی بۆ پشت ڕاست کردمەوە ئەوەیە کە:

ئیمای غەزالی دوای بڕینی قۆناغی نوسینەوەی ئیحیا، ئیتر نوسراو و پەڕاوێکی تری بڵاو نەکردەوە، کە بۆ تۆزیکیش بەدگومانی دروست بکات بەرامبەر بە سەوابیتە مەعریفییەکان و، ڕێباز و بەرنامە پەروەردەییەکەی غەزالی لە ناو ئیحیادا، بەڵکو هەر کتێبێکی تری دانابێت، یان بەرگری لە فیکرەو مەنهەجی ئیحیا کردووە، یان بەرپەرچی ڕەخنەی نەیارانی داوەتەوە، یان لەو بابەتی بیرباوەڕو ڕێڕەوی تەصەووفیەوە، بەبەڵگەو بنەمای پەسەند و شیاوتر بەرنامەکەی تۆکمەتر و، نمونەکانی زیاتر بەرجەستەو، بەڵگەکانی ڕون و ئاشکراتر کردووە.

### هەشتەم:

جێگای دڵخۆشی یە، کە هەموو میللەتە موسوڵمانەکانی جیهان سوودیان لەم شاکارە پیرۆزە وەرگرتووەو، وەریانگێڕاودتە سەر زوبانە زیندوەکانی نەتەوەکانیان، بەڵام جێگای داخە کە جگە لە هەندێك پەڕاوی تایبەتی، لەسەر ژیانی ئیمای غەزالی و، وەرگێڕانی هەندێك لە پەیامە بچوکەکانی و، دواتریش

وەرگێڕانی کورتکراوەی ئیحیا بە زوبانی کوردی، کە جێگای خۆیەتی دەست خۆشیان لێ بکەین و خودا نمونەیان زیاد بکات، بەداخەوە ئەم بەرهەمە گەورەو پیرۆزە ئەوەندەی من بزانم کەس خۆی لێ نەداوە، بۆیە ساڵەهایەکە گوێ قوڵاخ دەبم لێرەو لەوێ، هەرچەندە زۆر لە دۆستان و هاوڕازان پێشنیاریان بۆ دەکردم بۆ ئەم کارە پیرۆزە، بەڵام ئەمویست خۆمی لێ لابدەم و، ئەیشمزانی کە ڕاستەو دەبێت ئەم شاکارە لە ناو میللەتی کوردیشدا ببێت و، لێی بەهرەمەند ببین ، تا دواجارو بە ناچاری شانم دایە بەری، من دڵنیام گروپێکی شارەزاو نزیك لە یەك و هاوڕازو دڵسۆز، پێکەوە ئەم کارە پیرۆزەیان ئەنجام بدایە زۆر سەرکەوتوتر دەبوو، بەڵام کە کەسێکی تر شانی نەدایە بەری، کورد واتەنی لە نا عیلاجی‌دا ڕەجەب سەرقافڵەیە، بۆیە بڕیارم دا:

پشت بە خوداو پشت قایم بە هیممەتی دۆستانی خودا، کە دەست بەکاربم لە وەرگێڕان و ڕاڤەکرن و لەسەر نوسینی ئەم شاکارە پیرۆزە.

**نۆیەم:**

کتێبی تەصەووف لە کوردوستاندا و بە زوبانی شیرینی کوردی، لێرەو لەوێ لەسەری نوسراوە و بڵاوکراوەتەوە، کتێبی عەقیدە و بیروباوەڕ یان ئەوانەی کە گرنگی بە شەریعەتی پیرۆز و لایەنی پەروەردەیی و هەردو شاباڵەکەی جیهاد دەدەن، سوپاس بۆ خودا ئەندازەیەکی کەم بوونیان هەیە، بەڵام کتێبخانەی کوردی تا ئێستاش کتێبێکی وای تێدا نی‌یە کە بەئەندازەی (ئیحیای ئیمامی غەزالی) هەموو بابەت و زانستەکان لە قاڵبێکی مەعریفی و بە پێی بەرنامەیەکی پڕ لە ئەزموون، حەقیقەتی دروشمە هەڵکراوەکان و، ناخی کتێبە شەرعی و عەقیدەیی و تەصەووفیەکان، بەیەك ڕۆحییەتی پڕ لە ئیخلاص و، نەفەسێکی درێژ و، گیانێکی پڕ لە خۆنەویستی و ، هیممەتێکی زۆر بەرزو باڵا دەستەوە پێشکەش بکات، کە هەموو جەمسەرەکان یەك بخات و، بۆ چرکەیەکیش لە

عەقیدەی ڕاستەقینەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لا نەدات و، بۆ یەك دێڕیش لە ناو کرۆکی شەریعەتی ئیسلام دوورنەکەوێتەوە، کە بەهەموو توانای هەوڵ بدات، بەها و نرخ و قەدرگرانی بۆ فیقهی ئیسلامی بگێڕێتەوەو، بەبەرنامەیەکی تێرو تەسەلی ئادابی تەصەووفییەوە، تام و چێژی ڕاستەقینە بگێڕێتەوە بۆ هەموو چەمك و بڕگەو جەمسەرە بنەڕەتیەکانی عیبادەت و خوداناسی، بە کاڵای بەباڵا براوی پڕ لە تەقواو خۆپارێزی و یەکتا پەرستی، بەزەوق و شەوق و خۆشی و شادیەکی دەرونی و ڕۆحی بێ سنوور، بەیەك خستنەوەو بەیەکەوە بەستنەوەی هەموو ناوو نازناوەکانی طەریقەت و شەریعەت و حەقیقەت، بە زانایی و شارەزاییەکی تەواوو، قەڵەمێکی ڕەوان و زوبانێکی پاراوو، دەرونێکی پڕ لە ئیخلاصی وەك ئیمامی غەزالی( هەزار ڕەحمەتی خودا لە گیانی پیرۆزی بێت).

بۆیە حەقیقەتی کتێبی( ئیحیا علومو ددین) ئەم هەموو جەمسەرانەی یەك خستەوە و بەیەکەوەی بەستونەتەوە، تام و چێژی بۆ عیبادەتی ڕاستەقینە گێڕاوەتەوە، ملیۆنەها بەندەی خودای لە هەڵدێرەی ژیانی هەزار بەهەزاری مل شکاندن و، پلانی نەفس و شەیتان گێڕاوەتەوەو ڕزگاری کردوون.

بۆیە زۆر پێویستە کتێبخانەی هەموو ماڵێکی کوردی موسوڵمان بەم پەڕاوە پیرۆزە ئاوەدان بکرێتەوەو، دڵ و دەروون و ئیمانیانی پێ دەوڵەمەندو بەهێز بکەنەوە.

**دەیەم:** شاکاری (ئیحیا) سەرنج لە ناوەکەی بدە:

هەموو زانستە ئیسلامییەکانی لە خۆ گرتووە، بە پێی بەرنامەو ڕێبازی فوقەهای ئیسلام، بابەتە گرنگەکانی یەك لە دوای یەك باس کردووەو، ڕیزبەندییەکی ڕێکو پێکی بۆ کردوون.

بەپێی توێژینەوەی شارەزایانی نەفسی و دەرونیی، چارەسەری بۆ هەموو

کێشەو گرفتەکان کردووە، وە بە پێی بنەماکانی پیرۆزی تەصەووف و ڕێبازی (أَهْلُ اللە)، کاڵای تەقواکاری کردووە بە بەری هەموو بابەتە زانستی و فیقهی و پەندیاری و فەلسەفیەکاندا، بەرنامەیەکی زۆر تێر و تەسەلی دارشتووە، چۆن موریدی خوداناسی پێ پێدەگەیێنێت، چۆن خۆی لە نەخۆشییە ترسناکەکان لا دەدات و، دەرمانی ڕەزیلی و بەخیلی و عوجب و خۆپەسەندی و خۆسەپاندنی بۆ دیاری دەکات و، هەموو ڕەزیلەو نەخۆشییە نەفسیەکانیش لە دڵ و دەروندا بۆ یەکجاری ڕیشە کێش دەکات؟! چۆن دەیخاتە سەر سککەی ئیمان و بڕواو متمانەی تەواو؟! چۆن پەیڕەوکارێکی ڕاستەقینەی لێ دەردەچێت بە ڕێبازی شەریعەت و طەریقەت؟! چۆن دەستی مورید دەگرێت و لە ژێر سایەی مورشیدێکی ڕاستەقینەی بەتوانادا، دەیگەیێنێت بە بازاڕی حەقیقەت؟!

ئەمەیە بە کورتی پڕۆژە و ناوەرۆکی ئەم شاکارە مەزن و پیرۆزەیە.

وە بەلامەوە پەسەندبوو کە بەکوردی ناوەکەی ببێت بە **(ژیانەوەی زانستە ئاینیەکان)** کە وشەی ژیانەوە دەکرێت ژیاننەوە بێت، یان: ژیاندنەوە، بەڵام بۆ ئاسانکاری لە وتن و دەربڕینداو، لە وەش کە وشەکە زیاتر بوژاندنەوە لە خۆ بگرێت، (ژیانەوە)مان بەلاوە پەسەندترو جوان و ئاسانتربوو.

## یازدەهەم:

گەلێ لە زانایانی ئەهلی تەصەووف و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان و ئەولیا بەتواناکان ڕایان وایە: وەك چۆن زیارەتی کەعبەی پیرۆز بۆ خۆی عیبادەتەو، حەقیقەتی کەعبەش سەربەخۆ تەوەججوهی مەعنەوی هەیە، هەرکەسێکیش بە ئیخلاصەوە لە پاڵیدا تەنها سەیری کەعبە بکات، ئەو بەرەکەتە ڕوی تێ دەکات و، لەو تەوەججوهو فەیزە تایبەتییە بەهرەمەند دەبێت، ئاواش بە دڵنیاییەوە سەیرکردنی پەڕەکانی( ئیحیا)، کە پڕیەتی لە عیبادەت و خوداناسی، بەرهەم و پێزێکی تایبەتی هەیەو، تێڕامان لە عیبارەتەکانی سوود بە بڕواو

عەقیدە دەگەێنێت. ئەگەر کەسێکیش ڕێی لە مورشیدی حەقیقی نەکەوتبێت، ئەوا لە خزمەت (ئیحیادا) دەتوانێت زۆر بەهرەی تەصەووفی لێ وەربگرێت و، بە ئەسرارەکانی بەندایەتی ئاشنا ببێت، تەنانەت زۆر کەسیش فەیزی مەعنەوی و بەرزیی پلە و مەقامیان بەهۆیەوە *دەست کەوتووەو ،هەگبەی ڕۆحی و دەرونییانی لێ پڕکردووە.

کەواتە جیهانی (ئیحیا) سەرچاوەیەکی تری فەیزو بەرەکاتی خودابیەو، لەگەڵ هەموو وشەو ڕستەو فەصڵ و بەشێکی ئەم کتێبەدا، بەرەکەت و مەعنەویات و تەوەجووهاتی تایبەتی( قوطبی زەمانی خۆی) حەزرەتی ئیمامی غەزالی لە گەڵدایە.

خودای گەورە لەو بەهرە پیرۆزە بێ بەشمان نەکات، کە پشت بە خودا لە باسی(گەورەیی و فەضائیلی ئیحیادا) هەندێکی باس دەکەین. هەروەها ئەم کتێبە پیرۆزە ئیخلاص پیشانی خوێنەرو شوێن کەوتوانی دەدات، ئەوەش ئیخلاصی هەبێت خودای گەورە ڕێنمایی ڕێگای حەقیقەتی دەکات، بەو پێیە ڕێی لە مورشیدی ڕاستەقینە دەکەوێت و دەبێتە خاوەنی بەهرەی مەعنەوی.

## دوازدەهەم:

لێتان ناشارمەوە ئەوەی زۆر لێی دەترسام، بە لەڕێلادانی ئەم کتێبە پیرۆزەبوو، کە خودانەخواستە دەست و قەڵەمێکی بیدعەسازان بۆی بکەوێتە کارو، بە ناوی پاکسازی و پاکنوس و پاڵفتەکردن و کورت کردنەوەوە، هەموو بابەتە ڕۆحی و مەعنەوی و تەصەووفیەکانی لێ دەربهێنرێت و، تام و چێژەکانی لێ زەوت بکرێت و، تەحریف لە ووتەکانیدا بکرێت و، زۆربەی زۆری فەرموودەکانی کە هێناویەتی بە بێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوە متمانە پێ کراوەکان، بە هەڵبەستراو(موضوع)و هەڵەو مونکەرو لاواز بیدەنە قەڵەم و، هەوڵبدەن لایەنە مەعنەویەکەی کتێبەکە فەرامۆش و لەکەدار بکەن و، خوێنەر ساردبکەنەوە

لەسەری، یان ئەو وتانەی کە واتای هاوبەشیان هەیە، ئەوا بە زۆربێت یان بە مەیلی خۆی دایببڕێت بەسەر ئەو واتایەدا کە خۆی دەیەوێت، یان هەواو مەیلی خۆی ئەو واتایە دەخوازێت، یان بە ئاشکرا ئامانجی خۆیی هەیەو، دەیەوێت تێکڕای خەڵکە رۆشنبیرەکە بەلارێدا ببات و فێری رێبازی(بیدعەسازانیان) بکات و لە رێبازی دروستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و سەلەفی صاڵحینی راستەقینە دووریان بخاتەوە.

بۆیە بە پێویستم زانی ئەگەر نەشتوانم مافی تەواوی خۆی بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە پیرۆزە بدەم و لەڕوی هونەری و زمانەوانی و زانستی و ئەدەبییەوە خاوەنی کەموکورییەکی زۆریش بم، بەڵام پشت بە خودا لە ڕوی ئینصاف و ویژدانەوە نابێ ڕێگا بدەین ئەم شاکارە پیرۆزە بەلایەکی تردا ببرێت و، دوور بخرێتەوە لە تام و چێژە رۆحیەکەی، یان لە پێکانی ئامانجە گرنگ و پیرۆزەکەی...

بۆیە دەست لە دەست و هێزو پشت و پەنا هەر بەخودا دەستمان پێ کردو ئەگەر خودا دەرفەت و تەوفیقی دا ئەوا ئێمەش وازی لێ ناهێنین.

**پێش ئەوەی باسی کاری بەندە بکەم لەم وەرگێڕانەدا، دەمەوێت زیاتر ئاشناببین بە خاوەنی ئەم کتێبە بەنرخە لە ڕوی ڕونکردنەوەی ئەم بابەتانەی خوارەوە:**

**یەکەم**: ئیمامی غەزالی و سەرەتاو پێگەیشتن و پلەو مقامەکانی.

وە **باسی**بەرزی و پیرۆزی (إحیاء علوم الدین) لە ڕوانگەی ڕاو هەڵسەنگاندنی زانا بەڕێزو ئەولیاکانەوە، وە هەڵوێستی زانا هەوچەرخەکانەوە بەگشتی...

**دوهەم:** لە پاشان دێینە سەر باسی بەرنامەی بەندە، لە **چۆنیەتی** وەرگێڕانەکەدا بە ئیزنی خودا.

**وما توفیقی إِلاَّ باللهِ عَلَیهِ توَکَّلتُ وإِلَیهِ أُنیب**

# کورتەیەك لە ژیانی
# ئیمامی غەزالی (قُدِّسَ سِرُّهُ)

ناوی: پێشەوای ناودار و دەریای زانست و مەعریفەت، تاقانەی زەمان و تازەکەرەوەی دین (حُجَّةُ الإِسلام) ئەبوحامید موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی طوسی شافیعی غەزالی یە .... خەڵکی شاری غەزال و پیشەی باوکیشی چنینی خوری بووە، کە دەڵێن نیسبەتی ئەم زاتەیەشی لێدراوە.

لە شاری طوس ساڵی (٤٥٠)ی کۆچی لە دایك بووە، لە نزیك شاری مەشهەد، باوکی خوداناسێکی هەژاری دەسپاك بووە، لە کەسابەتی حەڵاڵی دەستی خۆیی دەخوارد، کە خوری دەچنی و لە دوکانەکەیدا دەیفرۆشت، کە دەستیشی بەتاڵ دەبوو زیاتر دەچووە ناو کۆڕی زانایانەوە و، بە سەریاندا دەگەڕا و خزمەتیشی دەکردن، گوێی لێ دەگرتن و لێیان فێر دەبوو، کە گوێ بیستی فەرموودەکانیان دەبوو، دەپاڕایەوە لە خودا و دەستی دەکرد بە گریان، زۆر ئەکڕوزایەوە لە حزوری خودادا کە منداڵێکی پێ ببەخشێت، کە ئاوا لە دین شارەزا بێت و ئامۆژگاری موسوڵمانان بکات.

خودای گەورە نزاکانی لێ وەرگرت و، دوو کوڕی پێ بەخشی، ئەبوحامیدی غەزالی و ئەحمەدی برای.

دیارە زۆربەی پیاوە گەورەکان دەبێت بە هەتیوی و بێ باوکی گەورە ببن، بۆیە موحەممەدی غەزالی هەر منداڵ بوو کە باوکی وەفاتی کرد و، بە ئاوات نەگەیشت کە بە چاوی خۆی کوڕەکەی لە کۆڕی (فیقە) و ئامۆژگاریدا ببینێت.

بەڵام دایکی مایەوە تا ئەو کاتەی کە بە چاوی خۆی بینی واخۆری بەختی کوڕەکەی لە سەر بەرزایی ئاسمانی سەربڵندیی هەڵهات و ناوبانگی بە هەموو

لایەکدا بڵاوبویەوە[1].

باوکی هەر لە ژیانی هەژاری خۆیدا غەزالی و براکەی سپارد بە هاوڕێیەکی خێرخوازی ئەهلی تەصەووف و، پێی ووت:

زۆر حەزم دەکرد فێری خۆشنووسی ببم و لە دەستم چوو، بەڵکو کوڕەکانم بەو ئاواتەم بگەیەنیت، هەرچی میراتێکم لێ بەجێما سەرفی بکە لە فێرکردنیاندا.

دوای وەفاتی باوکی، مامۆستاکەی تا توانای لە بەردەستدا بوو فێری کردن، لە پاشان لە بەر نەبوونی نەیتوانی تا سەر فێریان بکات.

فەرمووی:

ئەگەر هەژار نەبومایە زیاتر فێرم دەکردن، باشتر وایە بچنە مەدرەسەیەکەوە، بژێوی ژیانتان بۆ دابین ببێت و درێژە بە خوێندنەکەتان بدەن.

غەزالی فەرموویەتی:

لە سەرەتاوە بە دوای زانستدا دەگەڕاین، نییەتمان ڕەزامەندی خودا نەبوو، بەڵام شەرەفی زانستەکە وای کرد کە بمانخاتە سەر ڕاستە ڕێگاو خوێندنەکەشمان تەنها لە بەر خودا بێت.

بەڵێ ئەم گواستنەوەیان بۆ قۆناغێکی نوێ لە خوێندندا هۆکاری ئەوەبوو کە بەختیاری داهاتوو بە دەست بهێنن[2].

---

(١) إحياء علوم الدين، تحقيق و تخريج علي محمد مصطفي و سعد المحاسبي: ترجمة الامام الغزالي، الطبعة الاول دار الفيحاء، دمشق: ١٤٣١/٢٠١٠ .

(٢) تأريخ دمشق، ٢٠٥/٥٥ . و طبقات الشافعية لابن صلاح ٢٥٠/١ و سير أعلام النبلاء للذهبي ٣٢٥/١٩ و طبقات الشافعية الكبري لابن السبكي، ١٩٣/٦ و اتحاف السادة المتقين ٧/١ .

# سەرەتای خوێندنی

هەر بە منداڵی لە شاری (طوس) لە خزمەت مامۆستاکەیدا ئەحمەدی کوڕی محەممەدی ڕزکانی[1]. کە پێشتریش لە خزمەتی مامۆستایەکی‌تردا بوو بە ناوی (یوسف النساج).

لە پاشان ڕێگای زانستی گرتەبەر بۆ (گورگان) و گەیشت بە خزمەتی ئیمام (أبو نصر الإسماعیلی) وە هەمو ئەو وانە و بابەتە گرنگانەی کە لێیەوە فێردەبێت دەینووسێتەوە، لە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ (طوس).

ئیمام ئەسعەدی میهەنی دەڵێت:

گوێم لە غەزالی بوو کە ئەو ڕوداوەی بۆ دەگێڕامەوە کە لە ڕێگەی طوس بە سەریاندا هاتبوو، فەرمووی:

جەردەکان لە ڕێگەماندا وەستان و ڕووتیان کردینەوە، ئەوان ڕۆشتن و منیش شوێنیان کەوتم، پێشەنگیان لای کردەوە بە لامدا، ووتی: خێرا بگەڕێوە ئەینا بە هیلاك دەچیت.

منیش پێم ووت:

داوات لێ دەکەم لە بەر خاتری ئەوەی کە ڕێگای سەلامەتیت تەنها لە لای ئەو دەست دەکەوێت، ئەو جانتام بۆ بگێڕەوە، چونکە هیچ سوودێکی نابێت بۆتان.

ووتی: چی تێدایە؟

فەرمووی: هەمو گەشتەکەم لە پێناوی ئەو زانستەدا بووە، کە خوێندوومەو نووسیومەتەوە و لەوێدا هەڵم گرتووە، کابرا پێکەنی و ووتی:

---

(١) شاریکی بچوکە لە نزیکی شاری طوس. اللباب في تهذیب الاحیاء لابن الاثیر ٢/٥ .

تۆ دەڵێی فێری بووم و ئێستە ئێمەش لە تۆمان وەرگرتووە، ئەگەر لەبەرت بوایە چۆن لێت دەسەندرا؟! لەپاشان فرمانیدا بە هاوڕێکانی بۆیان گێڕامەوە، ئەمەش بووە زەنگێکی پڕ لە هۆشیاری تا منی بە ئاگا هێنایەوە و، کە گەڕامەوە بۆ طوس، سێ ساڵ بە پوختی زانستەکانم دەخوێند و هەموویم لە بەر دەکرد، وام لێهات کە ترسی ڕێگە بڕو جەردەیشم نەمێنێت، کە بتوانن جارێکی تر لەو زانستە ڕووتم بکەنەوە.

لە پاشان گەیشتەوە شاری (نیشابور) و، بەردەوام لە خزمەتی (إمام الحرمین) شێخی جووەینی دا مایەوە و، پێشکەوتنی زۆری وەدەست هێنا لە بوارەکانی فێربوونی زانستەکانی مەزهەب و، ڕا جیاوازەکان و، عیلمی ( ئوصول و جەدەل) و جۆرەها زانستیتر،کە ئیمامی جووەینی پێی سەرسام بووبوو، پێی دەیفەرمووێت: **غەزالی دەریایەکی بێ پەی و پان و بەرینە** [1].

هەروەها فەلسەفە و حیکمەتیشی خوێند و، لە هەمو زانستەکانیشدا گەیشتە ئەوپەڕی شارەزا بوون و، توانای توێژینەوە و لێکدانەوە و تێڕامان و لە سەر نووسین و شیتەڵ کردنەوەی تەواویانی پەیدا کرد، تا وای لێ هات لە هەمو هونەری زانستەکاندا دانراوی تایبەتی هەبوو، وە نووسراوەی سەربەخۆی لە سەر دادەنان و ، ڕووبەڕووی ڕاو بیر و باوەڕە نادروستەکان بوویەوە و، بە بەڵگەی پڕ لە پەندیاری و زانستی، بیروڕای هەموو لەڕێلادراوەکانی پووچەڵ دەکردەوە.

لە نێوانی چوار صەد قوتابی پێشکەوتوویدا بووە پێشەنگی هەموویان، تا لە ژیانی (امام الحرمین)دا دەرسەکانیشی دەووتەوە و کتێبی( المنخول)ی دانا، کە شێخی جووەینی دوای ئەوەی سەرنجی دا فەرمووی:

---

(١) انظر: طبقات الشافعية الكبري لابن السبكي ١٩٦/٦ و اتحاف السادة المتقين ٧/١

هەر بە زیندوویی منت خستە ناو چاڵەوە! نەدەکرا خۆت ڕابگرتایە و تا من لە ژیاندا بووم بڵاوت نەکردایەتەوە.

دوای ئەوەی لە ساڵی (٤٧٨)ی کۆچی ئیمامی جووەینی وەفاتی کرد ، غەزالی دەرچوو بەرەو دیداری (نظام الملك)، تەمەنی ٢٨ ساڵی تێنەپەڕاندبوو، ناوبانگی بە هەمو لایەکدا بڵاو بووبویەوە.

هەمو زانا ناودارەکانیش لە کۆڕی (نیزامولمولك) دا کۆ دەبوونەوە و ،هەمو دانیشتنەکان پڕیان بوو لە باس و خواسی زانستی و فیقهی و پرسە ئاڵۆز و ناوازەکان، لەم بوارەشدا ئیمامی غەزالی بوو بە پێشەنگی هەموویان و، هەموو دانیان نابە گەورەیی فەزڵ و زانایی غەزالی دا.

بۆیە بەڕێز و شانازیەوە کرا بە سەرپەرشتیار و وانە بێژی مەدرەسەی بەناوبانگی (نیظامیە) لە بەغدا، کە ئەوکاتە ٣٤ ساڵ تەمەنی بوو.

بە زانستی و زوبان پاراوی و قسە ڕەوانی و نوکتە و وردەکاریەکانی هەموانی سەرسام کردبوو. ئەوەندە سام و هەیبەتی پەیدا کردبوو لە بەغدادا، وەك عبدالغفاری فارسی زانای هاوچەرخی خۆی باسی دەکات و دەفەرموێت:

کە کەسایەتی غەزالی لە سام و هەیبەتی خەلیفە و دەستەڵاتدارەکان زیاتر بووە[1] وەك خۆی فەرموویەتی:

دەرسم دەگوتەوە بە سێ صەد قوتابی تایبەتی لە مەدرەسەی نیظامییە.

وە لەو قۆناغەی ژیانیشیدا دەستی کرد بە دانانی کتێب لە بوارەکانی ئوصول و، فیقهو، عیلمی کەلام، و حیکمەتدا[2].

---

(١) انظر: المنقذ من الضلال للغزالي، ص/١٧. و طبقات الشافعية لابن السبكي ٢٤٨/٦ .

(٢) انظر: سير الاعلام النبلاء للذهبي ١٩ /٣٢٣.

# هۆکارەکانی
# پێشڕەوی ئیمامی غەزالی لە زانستدا

زۆربەی هۆکارەکان یارمەتی ئیمامی غەزالی‌یان داوە کە لە هەمو بوارێکی زانستیدا لە پێشەوە بێت، وەلە وەدەسهێنانی یەقین‌دا بەرندەو پێشکەوتووبێت:

١-زۆر بە گەرم و گوڕی بە دوای زانستدا دەگەڕا، وە هەمیشە ئامانجی بوو کە بگات بە ڕاستییەکان و زانستە هاوچەرخەکان.
٢- توانایەکی ئێجگار بە هێزی هەبووە بۆ لە بەرکردن و لە بیر نەچونەوە.
٣- زیرەکیەکی زۆر نایاب و بێ‌وێنەی هەبووە.
٤- ئەو هەموو سالأنەی کە لە مەدرەسەی (نیظامیە)دا دەرسی دەووتەوە، بە تایبەتی لە بواری ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا کە ئەو پەڕی شۆرەت و ناوبانگی زیادی پێ دابوو.[1].
٥- جگە لەو ئیخلاص و نییەت پاکییەی کەهەمیشە خۆی ڕادەهێنا لەبەر خودا کار بکات و بخوێنێت و هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکات.
بۆیە ئەم خووڕەوشتە جوانە زیاتر ناوبانگی پاکی ئیمامی غەزالی بڵاو کردەوە و تا بهاتایە زیاتر متمانەی لەناو خەڵکی دا بەهێزتردەبوو.

---

(١) انظر دولة السلاجقة، د. علي محمد الصلابي. ص٤٥٠.

## هەڵگۆڕانی گشتی و سەرەکی
## بەسەر ئیمامی غەزالی دا

دوای ئەوەی هەموو دونیا بەدەمیەوە پێدەکەنی و، هەمو زاناکان چۆکیان دادابوو لە حزوری‌دا ، وە هەمو دەستەڵاتدارەکان سامیان لێ دەکرد و و ڕێزی بێسنووریان لێ‌دەگرت، ماڵ و سامان و ژیان وبەختەوەری دونیای هەمووی لە لوتکەدا بوو، لە هەمو ڕوویەکەوە لە پێشەوە بوو. قسەی هیچ کەسێك نەیدەتوانی زاڵ ببێت بەسەریدا، شکات و سکاڵای هیچ کەسێك بەرامبەری گوێی لێ نەدەگیرا، هەموو ڕۆژێك زیاتر ناوبانگی بڵاو دەبوویەوە.

ئا لەم کاتەدا، بانگکەری خودایی نەفس و گیان و دڵی دەهەژێنێت، هێزی ئیمان و بڕوا دڵی دەوروژێنێت و، بازاڕێکی ڕازاوە و دەوڵەمەندی تر، ڕو لە هەست و ویژدان و دەرونی دەکات، کاریگەری لەسەر ناخ و ناوەرۆکی ژیانی دەکات، بۆیە وەك لە پەڕاوی ناوازەی (**المنقذ من الضلال**)دا قۆناغە هەستیارییەکانی ژیانی دیاری دەکات و، هەندێك ڕاستی دەوروژێنێت، کە هێما بۆ هەندێکیان دەکەین وەك دەفەرمووێت: دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبە کانی (**قوت القلوب**)ی ئەبوطالیبی مەککی و ئیمامی موحاسیبی و، فەرموودە ناوازەکانی جونەیدی بەغدادی، بە دڵنیایی بۆم دەرکەوت کە ئەو زاتانە خاوەنی حاڵ و مەقامی تایبەتین، نەك خاوەنی تەنها قسە کردن بن، منیش هەوڵمدا هەموو ئەو بابەتە زانستیانەی کە لە ڕێگەی فێربوون و خوێندنەوەوە بتوانم وەدەستیان بهێنم، هەمویانم وەدەست هێنا. بەڵام ئەوەی لە ڕێگەی بیستن و فێربوونەوە هەرگیز دەستم نەدەکەوت، دڵنیابووم کە ڕێگەیەکی‌تر هەیە کە بتوانم لەو دەروازەوە پێی بگەم، ئەویش بە ڕێگەی سلوك و زەوقی تەصەووفی تایبەتی، بگەمە ڕێگای تەقواکاری و زانستی ئاخیرەت. بۆیە دەبێت واز لە هەموو پەیوەندییە دونیاییەکانم بهێنم، کە لە ڕوی نییەت و نەبوونی ئیخلاص و گرنگی

نەدان بە ڕێگای ئاخیرەت بوو، دڵنیا بووم کە تەنها ڕێگا چارەیەك لەو کێشە دەروونیە ڕزگارم بکات، ئەوەیە کە ڕێگای زانستی ئەحواڵی قیامەت بگرمەبەر، ماوەی شەش مانگێك لەناو ئەو گێژاوەدا بووم، تا لە ساڵی ٤٨٨ی کۆچیدا ئارەزوو لە دەستی خۆمدا نەما و، زوبانم گیراو قسەم بۆ نەدەکرا و، دەرسم بۆ نەدەوترایەوە، تا خۆم خستە ناو ئامێزی میهری پەروەردەگارەوەو، دڵنیا بووم کە بەرەو بەختیارییەکی زۆر نایاب هەنگاوم پێ دەنێت و، ئاسۆیەکی ڕوون چاوەنوارم دەکات، بۆیەبڕیارم دا ئیتر وازم لە هەموو دەستکەوتە دونیاییەکان بهێنم و، بەرەو ڕووی چارەنوسێکی ڕوون و پرشنگدار هەنگاو بنێم(١)

لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی ٤٨٨ی کۆچی، پێشەوا محەممەدی غەزالی بەغدادی بە جێ هێڵاو، ڕووی کردە ماڵی خودا، بۆ بەجێ گەیاندنی فەریزەی حەج،وە براکەیشی لە شوێنی خۆی دانا بۆ وتنەوەی دەرسەکان، وە لە ساڵی ٤٨٩ی کۆچی، هاتەوە بەرەو دیمەشق و، دوای ماوەیەك ڕووی کردە (**بيت المقدس**) و ماوەیەك لە قودسی پیرۆزدا مایەوە و، لە پاشان گەڕایەوە بۆ دیمەشق و، لە ڕۆژئاوای مزگەوتی گەورەی ئەمەوی، وەك (ئیبن و عەساکیر) و ئیمامی (زەهەبی) باسیان کردووە، لە سەر منارەکەی ئەو مزگەوتە بە نییەتی (ئیعتیکاف) مایەوە. وە زیاتریش لە خانەقای شێخ نەصری مەقدیسیدا دەمایەوە، کە ئەمڕۆ ئەو جێگایە بە ناو بانگە بە ( غەزالییە). ماوەی دوو ساڵ لە وڵاتی شام بەم شێوە مایەوە، وەك ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی:

ڕۆژێك ئیمامی غەزالی چووە ناو مەدرەسەی (الأمينية)، گوێی لێوە بوو مامۆستاکە دەڵێت: غەزالی فەرمووی:

---

(١) انظر: المنقذ من الضلال للغزالي ص٤٣ و مابعدها بتصرف. وكذلك كتاب: رجال الفكر و الدعوة في الاسلام السيد ابو الحسن الندوي ج١ص٢٢٥ و مابعدها.

لە ترسی ئەوەی دیسان دووچاری عوجب و خۆ بەشت زانین نەبێتەوە، ئەو جێگایەشی چۆڵ کرد و ڕووی لە وڵاتی میسر کردوو چووە شاری ئەسکەندەریە و، لە پاشان بە هەمو شار و جێگەیەکدا دەگەڕا، هەمو جۆرە ڕیازەتێکی نەفسی و ڕۆحی دەکێشا[1].

هەروەها شێخی زوبەیدی فەرموویەتی:

زاهیدی خوداناس (قطب الدين محمد) ئەردەبیلی، بە پێنووسی خۆی نووسیویەتی کە فەرموویەتی:

(حجة الاسلام) محەممەدی غەزالی فەرموویەتی: لە سەرەتاوە مونکیری ڕێبازی پیاوچاکان و مەقامی عاریف و خوداناسان بووم، تا ئەوکاتەی هاوڕێیەتی شێخ یووسفی نەسساجم کرد لە طوس، ماوەیەك پاڵفتەو هێلەساوەی دڵمی دەدا بە هەوڵ و موجاهەدە، تا هەندێك فەیز و واریداتی خودایی داباری بەسەرمدا، لە خەودا بە خزمەت خودا ﷻ گەیشتم فەرمووی:

ئەی ئەباحامید! ووتم: ئەوە شەیتانە لەگەڵما دەدوێت!

فەرمووی: نەخێر من خودای تۆم کە هەر شەش لام لێ گرتوییت ...

لەپاشان فەرمووی: وازلەو خەت و هێڵانە بهێنە کە کێشاوتە بۆ خۆت،

**(أصحَب أقواماً جَعَلتهُم في أرضي مَحلَّ نظَري وهُم الذَّين باعُوا الدَّارَين بِحُبِّي)** واتە:

لەگەڵ ئەوانەدا بگەڕێ و ژیانیان لەگەڵدا بەسەربەرە، کە لە سەر زەویدا نەزرگای ڕەحمەتی منن، ئەوانەن کە دونیا و دوا ڕۆژیان فرۆشتووە لە پێناوی وەدەست هێنانی خۆشەویستی مندا، عەرزم کرد سوێندت دەدەم بە عیززەتی خۆت، ئەگەر فێنکایی خۆشەویستی و گومانباشی بەوانە نەخەیە ناو دڵمەوە!

---

(١) انظر: اتحاف السادة المتقين للشيخ الزبيدي ج١ _٨

فەرمووی: ئەوا کردم، ئەوەی تۆی لەوان دابڕیوە، سەرقاڵیتە بە خۆشەویستی دونیاوە، بە ئیرادە و ئارەزووی خۆت خۆتی لێ ڕزگار بکە پێش ئەوەی بە زۆر لێی دوربخرێیتەوە، وە لە جیواری قودسی و پیرۆزی خۆمەوە هەندێك فەیز و نووری تایبەتیم ڕژاندووە بەسەرتدا، لێی بەهرەدار بە و لە کیسی خۆی مەدە...

ئەفەرموێت: بە ئاگاهاتمەوە زۆر بە دڵخۆشییەوە گێڕامەوە بۆ شێخەم (یوسف النساج)، بە خەندەیەکەوە فەرمووی:

ئەی ئەباحامید! ئەوە سەرەتای ڕێگا سەختەکانمانە، کە بە پێی خۆمان ئەو ڕێگایانەمان بڕیوە، ئەگەر زیاتر هاوڕێیەتیمان بکەیت چاوی دڵت بە کلی پشتگیری و حەقیقەت دەڕێژرێت و، بە چاوی خۆت عەرشی باڵا و چواردەورەکەی دەبینیت، هێشتا بەویش ڕازی نابیت، تا ئەوەش دەبینیت کە هیچ چاوێك هەستی پێ ناکات و لە گەردوگۆڵی ئینسانییەت ڕزگارت دەبێت و صەفایە کی تەواو ڕو لە سروشت و گیانت دەکات، لە سنووری ئەقڵ دەرباز دەبیت و ڕاستەوخۆ گوێت لە خیطابی پەروەردگار دەبێت، وەك چۆن بە موسا پێغەمبەری فەرموو:

**يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ** القصص/٣٠ [(١)].

شـێخی زوبەیـدی لە حەزرەتـی شێـخ عەبـدولوەهابی شـەعرانـیـیەوە دەیگێڕێتەوە کە لە کتێبی (الأجوبة المرضية)دا فەرموویەتی:

شێخ موحیددین‌ی عەرەبی فەرمویەتی: غەزالی ڕەحمەتی خودای لێ بێت، دەیفەرموو:

کاتێ کە ویستم بچمە ناو ڕیزی ئەهلی عیرفانەوە، تا پەرداخێ لە شەرابی عەشقی ئەوان بنۆشم، وە سەیری خۆمم کرد، زۆریی پەردە و حیجابی گەرد و

---

(١) اتحاف السادة المتقين ..... للشيخ الزبيدي ٩ ب١

گوناهو دووریی، ڕێگایان لێ گرتبووم. تا ئەوکاتەش مورشیدێکم نەبوو، بۆیە چومە ناو خەڵوەتەوە، چل ڕۆژی تەواو لە خەڵوەتدا خەریکی موجاهەدەی نەفسی و ڕیازەت کێشان بووم، سەرچاوەیەکی صافی زانستیم لە سەر کرایەوە کە لە پێشتر شتی وام نەبوو، سەرنجم دا هێزێکی فیقهی تێدایەو زاڵە بەسەردڵمدا، دیسان گەڕامەوە بۆ ناو خەڵوەتێکیتر، چل شەویتر لە ڕیازەت و موجاهەدەی نەفسدا بووم، زانستێکی زیاترم لە سەر ئاشکرا بوو، ناسك و صافتر بوو، پێی دڵشاد بووم، بەڵام نواڕیم هێشتا هێزێکی بەڵگە و سەرنج دانی تێدایە، بۆ جاری سێیەم چل شەویترم لە خەڵوەتدا بەسەردەبرد ، زانستێکی پاك و ناسك و صافترم لێ ئاشکرا بوو، کە سەرنجمدا ئەمەش جۆرێك لە تێکەڵی تێدا بوو لە زانستەکان، کە هێشتا نەگەیشتبووم بە (عیلمی لەدونی)، واتە:

ئەوانەی کە سەرچاوەی عیلمەکەیان بە تەواوی لە لایەن خوداوەیە ، بۆم دەرکەوت نووسینەوە لەسەر سڕینەوەی پەردە و حیجابەکان جیاوازترە لەوەی کە شت بنوسرێتەوە لە سەر دڵێك کە یەکەمجار صاف و پوختە بوبێت .. وە لە هاو وێنەکانم جیا نەدەبوومەوە مەگەر بە هەندێك فرمان نەبێت .

شێخی ئەکبەر فەرموویەتی:

ڕەحمەتی خودا لە غەزالی، ئەوەندە خاوەنی ئینصاف بوو (لەگەڵ ئەو هەموو پلە و پایە بەرزانەدا) خۆیی لە دەعوا دەپاراست[١].

---

(١) اتحاف السادة المتقين ج ٩/١

# تاریف و پیاهەڵدانی گەورە مەشایخ و زاناکان لە سەر غەزالی

ئیبن وسوبکی لە حەزرەتی شێخ ئەبولحەسەنی شازلی (خودا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: کە بە خزمەت خودا گەیشتووە ﷺ، خودا بە ئیمامی غەزالی شانازی بەسەر حەزرەتی موسی و عیسیدا دەکرد(سەلامی خودایان لە سەر) و دەیفەرموو: ئایا لە ئوممەتەکانی ئێوەدا زانا و حیبرێکی وەك غەزالیتان تێدایە؟ فەرمویان: نەخێر.

وە پرسیاریان لە گەورەی زەمانی خۆی (أبوالعباس مەرسی)کرد دەربارەی ئیمامی غەزالی، فەرمووی: من شایەتی پلەی (صددیقییەتی عوظمی)ی بۆ دەدەم[1]. هەروەها شێخ ئەبولحەسەنی شازلی بە هاوڕێکانی دەفەرموێت:

ئەگەر کارێکتان بۆ پەیدا بوو لە حزوری خودا دا، تەوەسول بکەن بە (ئیمامی غەزالی) خودای لێ ڕازی بێت.

شێخی (ئیبن و عەرەبی)ش فەرموویەتی:

ئیمامی غەزالی لە گەورە سەرکردەکانی ئەهلی طەریقەتە.

هەندێك لە دۆستانی خودا ئیمامی غەزالی یان لە دەشتێکدا بینی، گاڵوکێکی بە دەستەوە بوو، بەرگێکی پیناوی لەبەردا بوو، دوای ئەوەی کە لە پێشتر دەیبینی سێ صەد کەس لە مودەڕسەکان لە خزمەتیدا دەرسیان دە-خوێند و صەد لە ئەمیرەکانی بەغدا لە حزوریدا دادەنیشتن.

ئێستاش بەوشێوە دەیبینێت، عەرزی کرد ئەی پێشەوا ! ئایا ووتنەوەی دەرسی

---

(١) الكواكب الدرية في تراجم السادة الصوفية / الطبقات الكبري زين الدين المناوي ج/٢ ص٢٩٢، دار صادر ـ بيروت.

زانستی لەم حاڵەت باشتر نەبوو؟ ئیمامی غەزالیش بە تورەیی‌وە سەیرێکی کرد و فەرمووی:

کاتێ مانگی بەختیاری لەسەر فەلەك و ئاسۆی ئیرادەتمەندی هەڵهات، وە خۆری عەقڵ و پەندیاری شانی دادا و بەرە و رۆژئاوای گەیشتن بە حزوور ئاوا بوو، ئەو کاتە وازم لە ئارەزواتی (لەیلا و سوعدا) هێنا، گەڕامەوە بۆ لای ئەوەی کە یەکەمجار لەگەڵیا ئاشنا بو بووم، بانگکەری شەوق و خۆشەویستیی بانگی لێ کردم: لە سەر خۆ بەو ڕاوەستە، ئێرە ئەو مەنزڵگایە کە ئارەزوت لێیەتی و بە دوایدا دەگەڕێیت. فەرموو دابەزە و لێرە بمێنەرەوە...

**تركتُ هَوى ليلى وَ سُعدَى بمَنزل وَعُدْتُ إلى مَصحُوبِ أوَّلِ مَنزل**
**ونادَت بيَ الاشواقُ مَهلاً فَهـذِهِ مَنازِلُ مَن تَهوَى رُوَيدَكَ فانْزِلِ**[1].

( واتە:

**کە دیم مەنزڵگـەیی عەشقــی حەقیقی وا لە سەر ڕێیە**
**دەبێ تەرکی بکـەم حوبێ، لە بـۆ سـوعدا و لەیــلێیە**
**ئەوا مــەعشوقی ڕاستیمــە دەڵێ: ئێــرانە ئـــەو جێیە**
**کە تـۆ ویستــوتە، خێراکـە، بفەرموو لەیلی تۆی لێیە** [2]

هەر لەو بازاڕی ئەوینەدا لە وەرگێڕانی هۆنراوەیەکی (ئەبو تەمام)دا دەڵێم:[3]

**بیگـوازەوە هەرکــوێ دەتــەوێ دڵ لــە ئــەوینێ**
**حوبێ کە لـە بۆ دڵبــەری ئەووەڵ بـــوو دەمێـنێ**

---

(١) روض الرياحين حكاية ٤٦٨ ل٥٠٩، و الطبقات الصوفية للمناوي ب/٢٩٣/٢.

(٢) وەرگێڕاوی(ئەحسەن)

(٣) (ئەحسن موفتی) وەرگێرراوی ئەو شیعری أبو تەمامە کە دەڵێت:

**نَقِّل فُؤادَكَ حيثُ شِئتَ مِنَ الهَوى ما الحُـبُّ إلاَّ للحَبيبِ الأوَّلِ**
**كَـم مَنزِلٍ في الأرضِ يَألِفــهُ الفَــتى وَحَنينـهُ دَومــاً لأوَّلِ مَنـزِلِ**

ئولفەت بە چ مەنزڵگەوە دەیکات کە دەبینێ

ئاهــی دڵی هەر بۆ یەکەمین دولبەرەمێــنێ )

ئیمامی نەووی[1] لە شێخی تەفلیسی وە دەگێڕێتەوە[2] کە سەرژمێری کتێب و پەڕاوەکانی ئیمامی غەزالیم کردووە کە داینـاون، وە دابەشم کردووە بە سەر تەواوی تەمەنی‌دا هەموو ڕۆژێك چوار مەلزەمەی بەردەکەوێت. (هەر مەلزە مەیەك شازدە لاپەڕەیە)

ئیمامی یافیعی فەرموویەتی: ئیمامی گەورە أبوالحسن (علی بن حرزهم) فەقیهی بە ناو بانگی مەغریبی، زۆر بەرپەرچی کتێبی ئیمامی غەزالی دەدایەوە، قسەیشی دەبیستراو جێگەی متمانەی خەڵك بوو، فرمانی دا هەمو نوسخەکانی ئیحیا کۆبکرێنەوە و، لە ڕۆژی جومعەدا بە بەرچاوی هەمواندا بسوتێنرێت، ئەو شەوی جومعەیە لە خەوا بینی کە دەچووە ناو مزگەوتەوە، سەیر دەکات حەزرەت ﷺ تەشریفی لە وێیە، حەزرەتی ئەبوبەکر وحەزرەتی عومەریش لە خزمەتیدان ( خودایان لێ ڕازی بێت) ئیمامی غەزالیش لە بەر دەمی پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستاوە . کاتێ (ابن حرزهم) گەیشتە بەرەوە، غەزالی فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خودا ئەو پیاوە خەصمی منە و شکاتم لەوە، ئەگەر دەربارەی (إحیاء) بەو شێوەیە کە ئەو دەیڵێت، ئەوا من تەوبە دەکەم لە حزوری خودادا، وە ئەگەر لەبەر سوننەتی تۆ و بەرەکەتی شوێنکەوتنی تۆوە بەهرەمەند بووم و ئەو کتێبەم بەباشی داناوە، ئەوا تۆڵەم بۆ لێ بسێنەوە.

لە پاشان کیتێبی ئیحیای دایە دەستی پێغەمبەر ﷺ .

---

(١) بستان العارفین ص/١٥٢

(٢) لە کتێبە چاپکراوەکاندا بە شێخی بەلقینی ناوی براوە. بنوارە: الطبقات الصوفیة للمناوي ب/٢/ل٣٠٧.

(فتصفَّحهُ النّبي ﷺ ورقَّةً ورقَّة من أوله إلى آخره ثم قال: والله إنَّ هذا لشيءٌ حقّ) واته:

پەڕە پەڕە هەمو کتێبەکەی هەڵدایەوە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی و فەرمووی: وەڵاهی ئەمە شتێکی ڕاست و بەجێیە.

لە پاشان حەزرەت ﷺ دایە دەستی حەزرەتی صددیق (خودای لێ ڕازی بێ) ئەویش سەیری کرد و بە لایەوە پەسەند و شیاو بوو.

لە پاشان فەرمووی: بەڵێ سوێند بەوەی بە پێغەمبەری ڕاستەقینە ڕەوانەی کردویت ئەم کتێبە شتێکی جوان و پەسەندە.

لە پاشان دایە دەستی فاروق حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) ئەویش سەیری کرد وەك ئەبوبەکری صددیق ستایشی کرد و لە پاشان حەزرەت ﷺ فرمانی دا کە پشتی (ئیبنو حورزوهوم) ڕوت بکرێت و کراسەکەیان لەبەر داکەند، وە فرمانی دا کە (حەددی ئیفتیرای) لێ بدرێت، کە چل دارە، کە پێنج داریان لێ دا، حەزرەتی ئەبوبەکر شەفاعەتی بۆ کردو فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خودا لەوانەیە وای گومان بردبێت کە پێچەوانەی سوننەتی تۆی نووسیبێت و بە هەڵە دا چوبێت، ئیمامی غەزالی بە تکا و شەفاعەتی حەزرەتی ئەبوبەکر ڕازی بوو، ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد لە خزمەت پێغەمبەر دا ﷺ . پێغەمبەریش ﷺ عەفوی کرد و ئیتر خەبەری بویەوە و لە پاشان کە بە ئاگا هاتەوە لە بەر ئازاری پشتی نەیدەتوانی ئاسودەبێت و هەمیشە لە ئازار دا بوو، جێگای لێدانەکانی بە سەر پشتییەوە مابوو، ئەوەندە گریا و پاڕایەوە لە خودا و شەفاعەتی بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد، تا جارێکیتر بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەیشت و، دەستی موبارەکی هێنا بە سەر ئازارەکانی پشتیدا و خودای گەورە شیفای دا، ئیتر بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی ئیحیای

غەزالی و، دەروازەی مەعریفەتی خودایی لە سەر کرایەوە و، بوو بە یەکێك لە گەورەترین زانا و مەشایخانی عیلمی باطین و ظاهیر.[1]

ئیمامی یافیعی ئەفەرموێت:

ئەمەی کە گێڕامەوە بە سەنەدی صەحیح بو، لە ڕێگەی چوار کەس لە دۆستانی خوداوە کە لە یەکتری دەگێڕنەوە، قوطبی گەورە شەهابەددینی شازلی، لە شێخی گەورە عاریف و خوداناس یاقوتی شازلی، لە شێخی گەورە (العارف بالله) أبی العباس المرسی، لە حەزرەتی ئەبولحەسەنی شازلییەوە (قدس الله أرواحهم)کە هاوچەرخی عەلی کوڕی(حورزوهوم) بووە، فەرموویەتی:

کاتێك(ئیبن وحورزوهوم) وەفاتی کرد، پاش ماوەی ئەودارانەی کە لێی درابوو بە سەر پشتییەوە مابویەوە.

حافیظی گەورە ئیبن وعەساکیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کە گەیشتووە بە خزمەتی ئیمامی غەزالی و لە گەڵیا کۆ بۆتەوە دەفەرموێت:

بیستومە لە پێشەوا و فەقیە و صۆفی ناودار سەعدی ئەسفەراینی ئەڵێت: بیستومە لە شێخ و پێشەوای مەزن ( أبو فَتح الشاوی) لە مەککەی موکەڕڕەمە کە ئەفەرموێت:

چومە حەرەمی پیرۆزی مەکەوە، حاڵێکی تایبەتی ڕوی تێکردم، نەمدەتوانی لە سەر پێ خۆم ڕابگرم، یان لە هیچ جێگایەکدا ئۆقرە بگرم و دابنیشم، ناچار لە سەر تەنیشتی ڕاستم و ڕوو لە کەعبەی پیرۆز بە دەست نوێژەوە پاڵکەوتم و، هەوڵم دەدا خەو لە خۆم دوور خەمەوە، لە بەینی خەو و بێداریدا بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەیشتم، لە جوانترین شێوە و ڕوخسار و بەرگ و مێزەردا، هەر چوار پێشەواکەم بینی ئیمامەکانی شافیعی و مالیك و ئەبوحەنیفەو ئەحمەد

---

(١) تعریف الاحیاء بفضائل الاحیاء، الاتحاف ج/١ ص٨-٩.

(خودایان لێ ڕازی بێت) مەزهەبەکانی خۆیانیان یەك لەدوای یەك پیشانی پێغەمبەر ئەدا و ئەویش پەسەندی دەکردن.

لە پاشان پیاوێکی سەرکردەی بیدعەسازەکان هات بۆ ئەوەی لەو ئەڵقەیەدا جێگەی خۆی بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فرمانی دا دەری بکەن و سوکایەتی پێ بکەن، منیش چومە خزمەتی و عەرزم کرد، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم کتێبەم پێیە، مەبەستم (ئیحای ئیمامی غەزالییە) جێگەی بڕوا و عەقیدەی خۆم و ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، ئەگەر ڕێگەم بدەی کە بیخوێنمەوە لە خزمەتتدا، ئەویش ڕێگەی دام و دەستم کرد بە خوێندنەوەی لە کتێبی (قواعد العقائد)وە:

**بسم الله الرحمن الرحيم: كتاب قواعد العقائد و فيه أربعة فصول الفصل الاول في ترجمة عقيدة أهل السنة.**

واتە: لە بارەی بیر و باوەڕی ئەهلی سوننەتەوە، نووسراوەکەی ئیمامی غەزالیم بۆ خوێندەوە، هەتا ئەگاتە ئەو جێگایەی کە فەرموویەتی: خودای گەورە پێغەمبەری نەخوێندەواری قورەیشی حەزرەتی محەممەدی ﷺ ڕەوانە کردووە بۆ سەر هەموو نەتەوەکانی عەرەب و عەجەم و گرۆی ئینس و جین.

بینیم ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ داگیرسا و فەرەحییەکی زۆری کەوتە دەم و چاو و، لای کردەوە و فەرمووی:

ئەی غەزالی لە کوێیە؟

بینیم غەزالی یەکسەر لە بەینی دوو دەستیدا پەیدا بوو، عەرزی کرد ئامادەم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ و سەلامی کرد و حەزرەتیش ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و دەستی موبارەکی دابە دەستی غەزالییەوە، ئەویش کەوت بە سەر دەستیا و ماچی دەکرد و دەیهێنا بە سەر چاویدا، هیچ کەسێکم نەدیوە کە شتێکی بۆ بخوێنرێتەوە بەئەندازەی پێغەمبەر ﷺ

شادومان بووبێت، کە من ئەو بەشەی ئیحیام بۆ خوێندەوە.

لە پاشان بە ئاگا هاتمەوە فرمێسك لە چاوەکانم دەهات، ئاساری ئەو ئەحواڵ و کەراماتەی کە پیشانم درابوو، وە ڕازی بوونی پێغەمبەر ﷺ بەهەر چوار مەزهەبەکە و دەربڕینی شادومانی بە عەقیدەی ئیمامی غەزالی و پەسەند کردنی، گەورەترین نیعمەتی خودا بوو کە منەتباری ئەو نیعمەتەین و. داوامان لە خودایە کە لە سەری بژین و بمرین .پشتیوان بە خودا [1].

کۆمەڵێ لە زانا ناودارەکان، حافیظی گەورە (ابن عساکر) یەکێکە لەوان کە فەرموویەتی:

دەربارەی ئەو فەرمودەی کە هەموو صەد ساڵێك خودای گەورە یەکێك دەنێرێت دین تازە دەکاتەوە، کە لە سەری صەد ساڵی یەکەمداحەزرەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو، وە لە سەری دوو صەد ساڵەدا حەزرەتی شافیعی بووە و، لە سەدەی سێیەمدا شێخ ئەبولحەسەنی ئەشعەری بووە و، لە چوارەمدا پێشەوا ئەبوبەکری باقلانی بووە و، لە سەدەی پێنجەمدا ئیمامی غەزالی بووە و، ئەوەندە ئیمامی غەزالی نازی بووە و نزای وەرگیراو بووە، تەنانەت ئەگەر کەسێك بیکات بە وەسیلە و تکا کار بۆ حزوری خودا، خودا داواکەی جێبەجێ دەکات، وە ئەگەر کەسێکیش لە دژی بووبێت خودای گەورە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەزیەتی داوە،

هەروەها ئیمامی یافیعی لە (إبنُ المُلقِن)وە دەگێڕێتەوە لە یاقوتی عەرشیەوە کە لە ئەبی العباسی مورسی بیستووە، ئەویش لە شێخ ئەبولحەسەنی شازلی کە بۆ خۆی شێخ (إبنُ حُزرهُم)ی بینیوە کە:

ڕۆژێکیان دێتە ناو هاوڕێکانی و کیتابێکی بە دەستەوە دەبێت، ئەفەرموێت:

---

(١) ینظر: تعریف الاحیاء بفضائل الاحیاء، ص١١-١٢ .

دەزانن چ کتێبێکە؟

ووتیان: ئەوە ئیحیای غەزالییە.

ئەویش کە پێشتر قسە و ڕەخنەی هەبوو بەرامبەر ئیحیا و خەریك بوو هەمووی بسوتێنێت، پشتی خۆیی بۆ هەڵماڵین و سەیریان کرد بە دار لێی دراوە و ئاسەوارەکەی پێوە دیارە، فەرمووی:

غەزالی لە خەو دا هاتە لام و بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و لەبەر دەمیدا شکاتی لێ کردم فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە وا گومان دەبات کە من بە دەم تۆوە شتی وام هەڵبەستووە کە تۆ نەتفەرمووە، ئەویش فرمانی دا کە لێم بدەن و بەم شێوە لێیان دام.

هەروەها عاریفی خوداناس (ابن عربی) لە بارەی خۆیەوە فەرموویەتی:

لە ناو مزگەوتی حەرام و لە پاڵ کەعبەی پیرۆز کتێبی ئیحیای غەزالیم دەخوێندەوە. [1].

عاریف و خوداناس سەید موستەفای بەکری فەرموویەتی:

بە خزمەت حەزرەت ﷺ گەیشتم، زۆر لوتفی لەگەڵ کردم، عەمامەیەکی سەوزی بە سەرەوە بوو، زیارەتی دەستی پیرۆزیم کردو خۆی دانەواند لە گەڵمدا تا شەرەفیاب ببم بە زیارەت کردنی، فرمانی پێدام کە لااله الا الله و زیکری (الله) بکەم، منیش عەرزم کرد:

بە سەر سەرو بە سەر چاو ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ.

لە پاشان فرمانی پێدام کە قەصیدەکەی غەزالی بخوێنمەوە.

---

(١) الطبقات الكبرى للمناوي: ب/٢ ل٢٩٤.

زانیم کە مەبەستی قەصیدەی (مونفەریجە)یە، وە سێ بەیتیشی لێ زیاد بکەم چونکە باسی ئەصحابەی تێدا نەکرابوو، منیش زیادم کرد و خوێندمەوە لە خزمەتیداو، فەرمووی:

لە کوێوە ئەمەت وەرگرتووە؟

عەرزم کرد لە تۆوە، فەرمووی: وایە، لە پاشان فەرمووی:

قەصیدەکەی غەزالی بخوێنەوە.

ئیتر لە خزمەتیا بووم تا خۆی کرد بە ڕەوزەی پیرۆزدا و منیش دڵنیا بووم کە ناڕەحاتییەکم دێتە ڕێگا، بۆیە فەرمووی:

ئەو قەصیدەی غەزالییە بخوێنەوە، هەروایش دەرچوو [1].

هەروەها شێخی نەبهانی فەرموویەتی:

شێخ محیّدینی عەرەبی لە کتێبی (روح القدس) دا فەرموویەتی:

لە شاری (ئیشبیلییە) ئەبو عەبدوڵلای زین کە پیاوێکی زۆر گەورە بوو، بەردەوام کتێبەکانی ئیمامی غەزالی دەخوێندەوە، شەوێکیان پەڕاوێکی (أبی القاسم بن أحمد)ی خوێندەوە کە بەرپەرچی غەزالی دابوویەوە، یەکسەر چاوەکانی کوێر بوون! .

ئیتر کەوت بە ڕوودا و سوجدەی برد بۆ خودا و، زۆر پاڕایەوە و سوێندی خوارد کە هەرگیز ئەو کتێبە نەخوێنێتەوە و دوریشی بخاتەوە، ئیتر خودا لوتفی لەگەڵدا کرد و چاوەکانی بۆ گێڕایەوە. [2].

کەواتە ئێمە ژیاننامەی زاتێکی گەورە دەنووسینەوە کە مامۆستاکەیشی سەری لێی سوڕمابوو بۆیە دەیفەرموو:

---

(١) جامع كرامات الاولياء يوسف بن اسماعيل النبهاني. ب/١ دار المعرفة بيروت. ل١٨١.

(٢) نفس المصدور ١/١٨٠

**الغزالي بحرٌ مغدقٌ** وەك باسمان كرد[١].

واتە: غەزالی دەریایەكی بێ پەیە، كە لە هەمو لایەكەوە شەپۆل دەدات.

قوتابییەكەیشی محەممەدی كوڕی یەحیای بەناو بانگ لە بارەیەوە فەرموویەتی:

**الغزالي هو الشافعي الثاني.**

واتە: غەزالی شافیعی دووهەم بووە [٢].

وە زانای گەورە (إبنُ السُّبْكی) لە بارەیەوە فەرموویەتی:

**حُجَّة الإسلام و محجة الدّين التي يتوصّلُ بها إلى دار السّلام.**

لە پاشان تاریفی دەكات كە غەزالی كۆكەرەوەی هەمو زانستە جیاجیاكانە.

شارەزای زانستی وەرگیراوو زانراو و بەدەس گەیشتووە. شێری مەیدانی زانستی، كە هەمو شێرەكان لە بەر دەمیا چۆكیان دائەدا و. نێوەندیان بە جێ دەهێلا، ئیمامی غەزالی كە مانگی چواردە بوو بەلام لە ڕۆژی ڕۆشنایشدا ڕێنومایی هەموانی دەكرد، مەشخەڵێكی هەڵكراو و گەوهەرێكی ناوازەی نەبینراوبوو[٣].

هەروەها خەطیبی نیشابور (عبدالغفار فارسی) لە بارەیەوە فەرموویەتی:

شێخی غەزالی پێشەوا و دەریای بێ پایان، دانسقەی زەمان و بەڵگەی دروستیی ئیسلام، كەسێك كە هیچ كەس وێنەی ئەوی بە چاوی نەدیوە، لە بوارەكانی زوبان پاراوی و قسە ڕەوانی و گوفتار و بەیان و زیرەكی و هزر و فیكری بەر فراوان و سروشتی بەرزدا[٤].

---

(١) طبقات الشافعية لابن السبكي ١٩٦/٦

(٢) هەمان سەرچاوە ٢٠٢/٦ .

(٣) طبقات الشافعية لابن السبكي ١٩١/٦ .

(٤) تأريخ دمشق لابن عساكر ٢٠٠/٥٥ .

هەروەها ئیمامی زەهەبی دەربارەی فەرموویەتی:

**الشيخُ الإمامُ البَحر حجَّةُ الإسلام أُعجُوبةُ الزَّمان صاحِبُ التَّصانيف و الذَّكاء المُفرِط .** [1]

پێری خودا ناس و پێشەوای بەرزو دەریای زانست و بەڵگەی زیندوویی و درووستی ئیسلام و جێگای سەرسوڕمان و بێ هاوتای چەرخ و زەمان زیرەکی بێ وێنەو خاوەنی دانراوو نوسراوی زۆر نایاب.

وە زانای گەورە (إبن الدمیاطي) لە بارەیەوە فەرموویەتی:

پێشەوای فوقەهاکانی ئیسلام بە ڕەهایی، ئیمامی ڕەببانی لای هەموان، موجتەهیدی زەمان و چاو وچاوگەی ئیسلام، کە شۆرەت و ناو بانگی هەمو وڵاتانی گرتەوە و هەموان دانیانناوە بە فەضل و گەورەییدا[2].

هەروەها بنوارە بۆ فەرمودە و ستایشی (إبن العمادي)حەنبەلی[3].

وە شێخی ئەزهەر شێخ موستەفای مەراغی و عەللامە ئەبولحەسەنی نەدەوی و زانا گەورەکانی سەردەم کە هەریەکێك بە زوبانی خۆی سەرسامییان دەربڕیوە لەو گەورە زانایەی کە دینی تازە کردەوە و، لە قاڵبێکی پڕ لە ڕەسەنایەتی و ئەصالەتدا ئایینی پیرۆزی ئیسلامی پاراست و، وەك خۆی نیشانی هەموانی دایەوە.

---

(١) سير الاعلام النبلاء (الامام الذهبي) ٣٢٢/١٩ .

(٢) ابن الدمياطي: المستفاد من ذيل تأريخ بغداد ٣٨/١٩ .

(٣) اتحاف السادة المتقين ب/١ /٢٧ .

# کتێبی (إحیاء علوم الدّین)

شێخ عبدالوهاب ی شەعرانی لە (لطائف المنن و الاخلاق)دا فەرموویەتی:

شێخی شازلی فەرمویەتی:

کتێبی ئیحیا عیلم و زانستیت فێر دەکات، وە کتێبی (قوت القلوب) نوورت پێ دەدات[1].

(ابن السُّبکی) فەرموویەتی:

ئیحیا کتێبێکە پێویستە گرنگی و بایەخی پێ بدرێت، وە بڵاو بکرێتەوە، کەم وا ڕێ دەکەوێت کەسێك خوێندبێتیەوە و یەکسەر بە ئاگای نەهێنابێتەوە.

حافیظی عێراق لە بارەی ئیحیاوە فەرموویەتی:

بەناو بانگ و بەپێزترین کتێبی ئیسلامە لە ناسینی حەڵاڵ وحەرامدا.

ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی:

**کاد الإحیاء أن یکون قرآناً**[2].

وەك چۆن حەزرەتی عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) لە تاریفی پێغەمبەردا ﷺ فەرمووی:

**کانَ خلقُهُ القُرآن!**

کتێبی ئیحیای غەزالیش ڕەوشت و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە ڕوانگەی جێبەجێ کردنی تەواوی قورئانە وە بەرجەستە دەکات، بۆیە ئیمامی نەوەوی بەو شێوە تاریفی کردووە.

شێخ ئەبو محەممەدی کازرونی فەرموویەتی:

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) تعریف الاحیاء بفضائل الاحیاء ب/١٣/١٤ للشیخ عبدالقادر بن شیخ العدروس.

ئەگەر هەمو زانستەکان بسڕینەوە ئەوا لە کتێبی ئیحیا دەریان دەهێنینەوە. ئەوەندە قوطبە گەورەکان گرنگیان پێداوە.

زاتێکی وەك (تاج الأولياء) شێخ عەبدوڵڵای عیدرەوسی خەریك بوو هەموویی لە بەر دەکرد و دەیفەرموو:

چەندین ساڵ متاڵای ئیحیام دەکرد، هەمو فەصڵ و بابەت و پیتەکانیشی بە بایەخەوە دەمخوێندەوە و بە وردی سەرنجم دەدان، هەموو ڕۆژێك زانستێکی نوێ و ئەسرارێکی گەورەترم بۆ دەردەکەوت، جیاواز لەوەی ڕۆژانی پێشوو لێی حاڵی بووبوم. وە هیچ کەس بە قەدەر ئەم قوطبە گەورەیە تاریفی ئیمامی غەزالی نەکردووە،کە فەرموویەتی:

ئەوەی زۆر متاڵای بکات دەکەوێتە بەر نەزەر و مەرحەمەتی پەروەردگارەوەو، کەسبی محەببەتی خودا و پێغەمبەر ﷺ و فریشتەکان دەکات و، شەریعەت و طەریقەت و حەقیقەت بەیەك دەگەیەنێت.

یەکێك لە فەرمودە نایابەکانی لەم بارەوە فەرموویەتی:

**لو بَعَثَ اللهُ المَوتَى لَما أَوصَوا الأَحياءَ اِلَّا بِما في الإِحْياء !**

ئەگەر خودای گەورە مردووەکانی زیندوو بکردایەتەوە و، وەصیەتییان بکردایە بۆ زیندووەکان، ئەوا ڕوبەڕوی ئیحیای ئیمامی غەزالی‌یان دەکردنەوەو داوای جێبەجێ کردنی فەرموودەکانی ناو ئیحیایان لێ دەکردن.

وە دەیفەرموو:

من شایەتی دەدەم بە ئاشکرا و پەنهانی، ئەوەی متاڵای بکات ئەوا ڕێنومایی کراوە و هیدایەتی دراوە، ئەوەندە هانی موسوڵمانان دەدا لەسەر بڵاوکردنەوە و خوێندنەوەی کتێبی ئیحیا.

تەنانەت هەندێك لە نەخوێندەوارەکان کە توانای مادییان هەبوایە یەکێکیان دەگرت بە کرێ و ئیحیای بۆ دەخوێندنەوە، تا لە ژیاندا بوو بیست و

پێنج جار ئیحیای به سەردا دەخوێندەوە و هەمو جارێك كه خەتمێكی دەكرد میوانداریەكی گەورەی بۆ ساز دەكرد و، خەڵكانی بۆ كۆ دەكردەوە.

هەر بەم شێوەیە شێخ عەلی دەیخوێندەوە بۆ برا نەخوێندەوارەكەیشی و فرمانیشی دەدا بە كوڕەكەی كه بەو شێوە بیخوێنێتەوە بە سەرخۆیدا، ئەویش تا له ژیاندا بوو بیست و پێنج جار تەواوی ئیحیای به سەر باوكی دا خوێندەوە[1].

عاریفی خوداناس عەلی كوڕی ئەبی بەكری سەقفاف فەرمویەتی:

ئەگەر بێ باوەڕێك پەڕەكانی ئیحیا هەڵبداتەوە ئەوا موسوڵمان دەبێت چونكه سیرێكی تایبەتی تێدایە، دڵەكان ڕادەكێشێت، مەبەستی ئەوانەیە كه ئاگاداری عەیب و عارەكانی خۆیان نین، دڵیان گوشاد دەبێت و سینەیان دەكرێتەوە و ڕۆحیان بە ناوەڕۆكەكەی ئاشنا دەبێت .

بۆیە سەیردەكەیت زۆربەی نوسەر و ڕۆشنبیرە ئیسلامیەكان بە تەواوی جیاوازی بیرو ڕایشیانەوە، كه هەڵسەنگاندنی تایبەتی بۆ ئیمامی غەزالی دەكەن، لەبەردەم كتێبی ئیحیادا ناچارن كه به ڕێزەوە باسی بكەن.

تەنانەت ئەوانەش كه له قوتابخانەی سەلەفی دا پەروەردەبوون زۆرێكیان شایەتی ڕاستی بۆ دەدەن، چونكه كه دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە و پێشەواكانی خۆیشیان وەك ئیبن وتەیمییەو قوتابیەكانی، سەیردەكەن له گەڵ هەندێك سەرنج و تێبینی له سەر تێكڕای كتێبەكە، ڕایەكی زۆر باشیان دەربڕیوە بەرامبەری، تەنانەت هەندێكیشیان ناچاریش بوون كه كورتیان كردۆتەوەو بڵاویان كردۆتەوە.

---

(١) ايضاً، ص١٧-١٨ بهامش اتحاف السادة المتقين ج/١ .

# تەصەووف و غەزالی

لە دوای شەش مانگ لە حاڵەتێکی بیر کردنەوەی زۆر تایبەتی، کە هەمو شکۆمەندییەکانی و ژیانی جاهـ و دەستەڵات وسامان و خێر و بێری ناوو شۆرەتی لە بەر چاو کەوتبوو، بە دوای ڕێگای حەقیقەتدا وێڵ بوبوو، نەك وێڵی سەر گەردانی، بەڵکو وێڵی ڕێگای ڕێنومایی، چونکە دەروازەکەی دۆزیبویەوە و، کلیلی دەرگاکەی خستبووە ناو دڵیەوە و، ئاسۆی داهاتووی لا ڕون و ئاشکرا بوو.

بۆیە بەر چاوی ڕون بوو، دەیزانی چۆن هەنگاوەکانی ژیانی دەنێت، دوای ئەوەی دە ساڵی تەواو بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕا، نەك بیدۆزێتەوە، بەڵکو پێی بگات و خۆیی لەسەر پێبگەیەنێت، هەمو دەروازەکانی تری تاقی کردەوە، لە ناو شارێگەی (**فَفِرُّوا اِلَى اللهِ**) دا خۆیی دۆزیەوە، کە هیچ کۆڕ و کۆمەڵێك نەما تاقی نەکاتەوە، خەڵوە و کەنارگیری نەما نەیکێشێت، ئێش و ئازاری سەخت نەما نەیچێژێت، هیچ بیر و هزر و قسە و ڕاو ڕاوێژێك نەما لە بێژنگی تێڕامان و لێکدانەوە و وردبینی و توێژینەوە دا دای نەبێژێت و کۆزەرەکەی فرێ نەدات و پوختەکەی بە دڵیدا نەنێژێت[1].

لە پاشان چاوی دڵی کرایەوە و ئاسۆی ژیانی لێ ئاشکرا بوو، خۆری ڕاستی و حەقیقەتی لە سەر هەڵهات، نووری خوداوەندی کردە هاوڕازی هەمیشەیی، ڕێگای ڕاستی و خوداناسی هەڵبژارد، متمانەی تەواوی پەیدا کرد.

بۆیە گەیشتە ئاسودەیی و دامەزرانی تەواو، ئامانجی ژیانی دۆزیەوە، دوای لێکۆڵینەوە و سەرنجدان و تێڕامان و قووڵ بۆ داچوونێکی زۆر، ئینجا گەیشتە ئەو بڕوا بە هێزەی کە بفەرموێت:

---

(١) رجال الفكر و الدعوة في الاسلام، الندوي ل/٢٤٠ .

**وَانْكَشَفَ لِي فِي أَثْنَاءِ هذه الخَلوات أمُورٌ لا يُمكِنُ إحصاءُها واستِقْصاءُها والقدر الذي أذكرهُ يُنتَفعُ بهِ** [1]. واته: له ماوەی ئەو دە ساڵ خەڵوە و ڕیازەت کێشانەدا، فرمان و نهێنی وام بۆ ئاشکرا بوو، ناکرێت هەمووی باس بکرێت، یان بەئەوپەڕیان بگەیت بکرێت، بەڵام ئەو ئەندازەی کە دەکرێت باسی بکەم و سوودی هەبێت. **إنّي عَلمْتُ يَقيناً أنَ الصُوفيةَ هُم السَّالِكونَ لطَريقِ اللهِ خاصَّةً، و إنَّ سيرَتَهُم أحسَنُ السِيَرِ و طَريقتَهُم أصْوَبُ الطُرُقِ، و أخلاقَهُم أزكَى الأَخلاق. بَل لَو جُمِعَ عَقلُ العُقلاء و حِكمةُ الحُكماءِ و عِلمَ الواقِفينَ عَلى أسرارِ الشَّرعِ مِنَ العُلماءِ ليُغيِّروا شَيئاً مِن سِيَرِهِم وَ أخلاقِهِم وَ يُبَدّلوهُ بما هُوَ خَيرٌ مِنهُ لمْ يَجِدُوا إليهِ سَبيلاً، فإنّ جميعَ حَركاتِهِم و سَكَناتِهِم (فِي ظاهِرهِم و باطِنِهِم) مُقتَبَسةٌ مِنْ نُورِ مِشكاةِ النُبوَّة،و ليسَ وَراءَ نُورِالنُّبوَّةِ عَلى وَجهِ الأَرضِ نُورٌ يُستَضاءُ بهِ** [2].

پێش ئەوەی ڕاڤەی ئەم دەقە تایبەتیە بکەم، کە دواچۆڕی گوشراوی پڕ لە تاقی کردنەوەی دەیان ساڵ تەمەنی پڕ بەرەکەتی ئیمامی غەزالی بووە، کە ئەو ئەنجامە پیرۆزەی لێ کەوتۆتەوە، کە ڕێبازی تەصەووفی بە هەمو شێوەیەکی متمانە و دامەزراوی لە گیان و ڕۆحیدا هەڵبژارد و، کۆتا بڕیاری دا کە بیکاتە ڕێبازی ژیان و مردنی. بەڵام جێگەی سەرسوڕمانە کە هەندێك لەو توێژەرانەی شتیان لە سەر غەزالی نووسیوە، بە گیانێکی دوور لە بەرپرسیاریەتییەوە یان دور لە ئەمانەتی ئەدەبی‌یەوە لێکدانەوەیان بۆ قۆناغەکانی ژیانی غەزالی کردووە لە ڕوانگەی بیر و هزری خوێندەوارێکی نیمچە سەلەفییەوە، کردارەکانی پێشەوا غەزالی‌یان دادگایی کردووە و، بە هەندێك پێودانگی خۆیان لێپرسینەوە

(١) المنقذ من الضلال ص/١٣١ .

(٢) المنقذ من الضلال ص/١٣٢-١٣١.

یان لەگەڵدا کردووە، کە هەر لە بنەڕەتدا خۆیان حەزیان بە چارەی ئەهلی تەصەووف نایەت و، باوەڕیان بە بنەما و ئەرکانەکانی ڕێبازەکە نییە، کە لە جۆری پەروەردەکردن و ڕیازەتکێشان و کەسبی واریدات و چۆنیەتی بەرز بوونەوەی مورید لە پلە و بڕینی مقامەکاندا، لە گەڵ بیر و بۆچوونی وشکەڵانی سارای پان و بەرینی بێ ئاو و، ئاواشتە بوونی دوور لە ڕۆحییەتی ئەواندا ناگونجێت، ئیتر چۆن دەتوانن بەو کەرەستە و بنەما فەلسەفیانەی کە بۆخۆیان بڕوایان پێیەتی، حوکم بدەن بە سەر بیر و باوەڕی تەصەووفیدا، کە ئەمە هەمووی هەڵێنجراوە لە دەقە پیرۆزەکان و، گۆشکراو و ئاواشتەیە بە تەواوی بنەما و پرسە ڕۆحییەکان و، وەرگیراو و پتەو کراو و چنراوە بە مەدەد و فەیز و بابەتە مەعنەویەکانەوە، کە دوور و نزیك لەگەڵ ڕەوتی ماددی و چەپڕەویی بە ناو سەلفییەتی (ئیسلامیدا) ناگونجێت.

بۆیە دوورن لە بیر و هزری ئەوان و، ڕوبەڕوبوونەوە و بەرپەرچدانەوە و زیاتر شیتەڵ کردنەوەی بۆچوونە نادروستەکانیان، کات و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، کە نابێ ئەو کەشە ڕۆحییەی پێ تێك بدەین، کە بە هۆی باسکردنی زاتێکی وەك ئیمامی غەزالییەوە چاوەنواڕی فەیز و مهر و تەجەللیاتی خودایی دەکەین، کە برژێ بە سەر دڵەکانماندا و، بە نووری ئیمان زیاتر ئاواشتەیان بکاتەوە... کەواتە دەمکوتکردنی ئەوانە تەنها بە خستنە ڕوی بابەتە تەصەووفیەکانە، کە بنەما جوانەکانی ڕێبازی تەصەووف، ئەگەر بە پوختی و ڕەسەنایەتی خۆی پێشچاو بخرێت، ئیتر هەمو بیر و هزرە نەزۆکەکان دەفیان دەنگی نایەت و لە شوێنی خۆیاندا دەپوکێنەوە.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو بۆ من، کە پێشەکی یەکێك لە چاپە نوێکانی(إحياء علوم الدين)م خوێندەوە، زۆر بە جوانی و وردە کاریەوە لایەنەکانی ژیانی ئیمامی غەزالی ڕوون کردۆتەوە. بەڵام کە دێتە سەر لایەنە

تەصەووفیەکەی، دیسان دەکەوێتە هەمان هەڵەی، با بڵێین سەر پێی ئەوانی‌ترەوە، کە لە ڕوانگەی ڕێباز و بەرنامەی ئیبن و تەیمیە و هاو ڕاز و قوتابیەکانی کە تێی کەوتوون، ئەویش بەو ئاوازەوە سەرنجەکانی تۆمار دەکات. کە ڕەخنە لە ئیمامی غەزالی دەگرێت و دەڵێت[1]:

ئەوەی لە غەزالی دەگیرێت، چوونیەتی بۆ ناو تەصەووف وەك کەسێکی شەیدا و عاشقێکی ئەویندار، نەك وەك کەسێك کە بە وردبینی و چاوی ڕەخنەوە بچێتە ناویەوە، سەرنجی زانستەکانی تەصەووفی نەداوە بە چاوی ڕەخنەگری، وەك چۆن سەرنجی زانستەکانی فەلسەفە و زانایانی عیلمی کەلام و باطینیەکانی داوە، بەڵکو بە چاوی ڕەزامەندییەوە سەیریان دەکات.

لە پاشان دەڵێت: غەزالی هەڵسوکەوتی لەگەڵ تەصەووفدا بە هۆی دڵیەوە کردوویەتی نەك بە هۆی عەقڵیەوە، یان بە هۆی حەز و زەوقەوە پێش ئەوەی لە ڕێگەی فیقهەوە بێت، ئەمەش وای کردووە کە هەندێك شتی لێ وەرگرتوون کە بۆتە ڕەخنەیەکی سەرنج ڕاکێش لە سەر ئەهلی تەصەووف، لە ڕوی فیکر و سلوکی صۆفیەتییەوە، بێ ئەوەی بەراوەردی بکات بە یاساکانی فیقە، یان لۆژیك و ژیر بێژی. هەر بەم هۆیەوەیە کە عەللامە (ابن الجوزی) و کەسانێکی‌تر ڕەدیان کردۆتەوە و، زۆربەی بیر و فیکرە تەصەووفیەکانیان بەر پەرچ داوەتەوە، لەگەڵ کردەوە و ئەحواڵەکانیان، کە گوایە پێچەوانەی یاساکانی شەرعە و، لە کیتاب و سوننەت لایان داوە.

لە سەر ئەم بابەتە، وە لەو توێژینەوە سەر پێیەی خۆی تێی کەوتووە، هەمان قسە و بیر و بۆچوونی نەیارانی تەصەووف دوبارە دەکاتەوە و، زۆربەی بیر و بە رنامەی تەصەووف ڕەد دەکاتەوە و غەزالیشی پێ لەکەدار دەکات ...

---

(١) بنوارە:إحیاء ج/١ بەلێکۆڵینەوەی علي محمد و سعید المحاسبي، دار الفیحاء، دمشق: ١٤٣١/٢٠١٠

## پشت به خودا له وەڵامی ئەم بەڕێزەدا دەڵێین:

**یەکەم:** ئەگەر بۆ خۆی تۆزێك وردتر بگەڕێتەوە دواوە و،چەند لاپەڕەیەك لە نووسینەکەی خۆی بە چاوی ئەقڵ و وردبینی‌یەوە بخوێنێتەوە، ئەوا لەم هەمو قسانەی پەشیمان دەبێتەوە، چونکە خۆی سەلماندویەتی کە ئیمامی غەزالی چەندێك زانا و بیرمەند و هوشیار و تێگەیشتوو بووە، وە دوای لێکۆلینەوە و توێژینەوە لە سەر هەمووو زانستەکانی عیلمی کەلام و بیر و فیکری باطنیەکانەوە و، تێگەیشتن لە فەلسەفە و رەخنە لێگرتنیان، ئیمجا بڕیاری خۆیی داوە.

باشە ئەو کە خاوەنی ئەو هەمووو توانا خاریقەیە بووە، ئیتر چۆن هەروا بە ئاسانی خۆی تەسلیمی فیکرەی تەصەووف کردووە و، وەك کەسێکی شەیدا و دور لە هەمو حاڵەتێکی ژیر بێژی و ئەقڵانی هەڵیبژاردووە، کە ئەمە بە ڕاستی تۆمەتێکی زۆر ناڕەوایە کە ڕوبەڕوی ئیمامی غەزالی بکرێتەوە.

**دوهەم:** غەزالی هەمو بنەما فیکری و فەلسەفیەکانی تاقی کردۆتەوە، فیکرەی باطنیەکان و هەمو بیر و هزرە جیاوازەکان کە توێژینەوەی لە سەر کردوون و، شارەزایی خۆیی تیاندا چەسپاندووە و، دوا جاریش بڕیاری ڕاست و دروستی بەرامبەر هەمویان داوە، کەواتە هیچ هەنگاوێکی بە بێ بەرنامە و توێژینەوەی تەواو نەناوە. باشە ئایا دەگونجێت بۆ بەر پەرچدانەوەی زانستی فەلسەفە، لە سەرەتاوە تەواو خۆیی لێ شارەزا بکات و، لە پاشاندا کتێبێك دابنێت بە ناوی ( مَقاصِدُ الفَلاسِفَة) تا بە جوانترین شێوە فەلسەفە بناسێنێت بە هەمو زانا و هەوادارانی، کە لە سەرەتاوە وەك ئەوەی ڕایانکێشابێت بۆ ناو ڕیزی خۆیان، ئاوا دڵیان بە دانراوەکەی ئیمامی غەزالی خۆش دەبێت، لە پاشان کە هەموویان دڵنیا دەکاتەوە، ئیمجا بنج و بنەوانی فەلسەفەکانیان هەڵدە تەکێنێت و، بەرپەرچی هەمو فیکر و بیر و باوەڕە فەلسەفەکانیان دەداتەوە و ،

به سەرکەوتوویی ڕووبەڕوی میتۆدی فەلسەفی و هزر و فیکرەکانیان دەبێتەوە. هەر بەم شێوەیە کە بەرامبەر باطینییەکانیش جۆلاوەتەوە.

ئایا بۆ پرسێکی ئاوا، کە هەرگیز بە ئەندازەی عەقیدەو بیروباوەڕ گرنگ نییە، کە چارەنووسی ژیانی داهاتووی خۆیی پێوە بەندە، چۆن دەبێ بەو گرنگییە ئاوا کە لە ڕویاندا ڕابوەستێت و، هەمو بیر و ئەقڵ و فیقە و تێگەیشتنەکانی بەکار بهێنێت بۆ ڕەد دانەوەیان. ئەگونجێت بڵێین غەزالی بۆ دابین کردنی ژیانی داهاتوی خۆی، کە ملیارەها ساڵی قیامەتی لەسەر بەندە و پێی بەستراوەتەوە، بڵێن: هیچ ئەقڵ و زانست و لۆژیکی بۆ نە خستۆتەکار و ، تەنها شوێن عەشقێکی ڕۆحی و شەیدابوونێکی دەرونی خۆی کەوتووە و، چارەنووسی هەتا هەتایی قیامەتی خۆی داوەتە دەستی قەدەر و، هەروابە ئاسانی و بێ لێکدانەوەی تەواو تەصەووفی بەو هەمو کەموکوڕیانەوە (وەك دەڵێن) وەرگرتووە و، پابەندیشی لێ کردووە و، چاویشی لە حەنای هەڵە و فیکرە پوچەکانیدا نوقاندووە و، کردویەتی بە ژێر کەڕەگەڵاوە؟ ئایا دەگونجێت ئەم هەمو بێ ویژدانییە ڕەوا ببینین بەرامبەر زاتێکی زانای دانای پەندیاری بلیمەتی شەرع ڕەوی زاهیدی خوداناسی وەك ئیمامی غەزالی ؟!

**سێیەم**: با گوێ لە ئیمامی غەزالی و ڕاڤەی فەرموودەکەی خۆی بگرین، کە دوابەدوای توێژینەوەکانی لە سەر باطینیەکان و فەلسەفە و لایەنە ئەقلانییەکان، ڕێبازی تەصەووف هەڵدەبژێرێت و فەرموویەتی:

**بەمتمانە و دڵنیایی تەواوەوە هاتومەتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەهلی تەصەووف تەنها ئەوانن بە تایبەتی ڕێگای خوداپەرستییان گرتۆتەبەر، سالیکی ڕێگای حەقیقەتن،شیمەو ڕەفتاری ژیانیان جوانترین ڕەوشتە و، طەریقەت و ڕێبازەکەیان باشترین و ڕاسترین ڕێگایە و، ئاکاریان بەرزترین و پاڵفتەترین ڕەوشتە. بەڵکو ئەگەر ئەقڵی هەرچی ئاقڵ و داناکان و پەندیاری**

**هەمووحەکیم و تێگەیشتووەکان کە هەمو نهێنی و ئەسرارەکانی شەریعەتیان لەبەر چاو دایە، هەموی کۆ بکەیتەوە و، لەو ڕێگایەوە هەوڵ بدەیت گۆڕانکاری بە سەر تاقە ڕەوشت و ئاکارێکیان بهێنیت، وە بیگۆڕیت بە شێوەیەکی باشتر، ئەوا دۆش دادەمێنیت و هەرگیز ڕێگایەك بۆ ئەو گواستنەوەیە نابینێتەوە.** چونکە هەرچی جوڵە و بزواندن و بێ دەنگی و وەستانێکی ظاهیری و باطینی ئەهلی تەصەووف هەیە، هەمووی سەرچاوەکەی لە نووری حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە. وە لە سەر ڕوی زەویدا نورێکیتر نیە کە خۆیانی پێ ڕۆشن بکەنەوە، جگە لەو نووری پێغەمبەرە نەبێت ﷺ.

لە پاشان حەزرەتی غەزالی زیاتر باسی تێگەیشتنی خۆی لە بەرزی تەصەووف و طەریقەتەوە دەکات، بۆیە خۆی تەسلیم دەکات و فەرموویەتی:

ئەوانەی قسە لە سەر تەصەووف دەکەن دەتوانن چی لە بارەیەوە بڵێن: کە یەکەم مەرجی تەصەووف طەهارەت و پاکبونەوەی ئەوەیە کە دڵەکانیان بە تەواوی پاك ببێتەوە لە غەیری خودا و، دووربکەوێتەوە لە هەموو(ماسوی الله) و، کلیلەکەیشی کە لە جێگەی (الله اکبر)ی دابەستنی نوێژی فەرزدایە، ئەوەیە کە دڵیان بە تەواوی ڕۆچوبێت و غەرق بووبێت لە زیکری خودادا و، کۆتاییەکەیشی بە وەدێت کە مورید بە تەواوی فەنا ببێت لە خودادا و، هەمو دونیا و ئارەزوات لە بیر بکات و، تەنها خودای لە بیر بمێنێت.

ئەم پلەی فەنایەش بەدەر لەوەی کە دەکەوێتە ژێر ئیرادە و تاقی کردنەوەو کەسبی بەندەکانەوە، بەڵام بەرزبوونەوەی بەردەوامە، تا ئەوەندەی کۆتا دێت بۆ پلە بەرزەکان، کە باسکردن و لێدوان لەو بابەتە زۆر تەنگ و بەر تەسکە، وە هەر کەسێکیش بیەوێت تەعبیر لەو هەست و بۆچون و پلە تایبەتیانە بداتەوە، ئەوا بە دەگمەن نەبێت، دەکەوێتە هەڵەیەکی نەخوازراوەوە،کە ناتوانێت خۆیی لێ بپارێزێت.

## پوختەی ئەم بابەتە بەوە دەگات:

کە فرمانەکە دەگات بەو ئاستەی کە جۆری نزیك بونەوەکە، لەوانەیە هەندێك بە شێوەی (حلول) و تێکەڵ بوون لێکدانەوەی لە سەر بکەن، یان بە واتای (ئیتتیحاد) و یەکبوون (پەنابە خودا)، یان لە ڕوانگەی تاقمێکی تریشەوە بە (وصوول) و گەیشتن لێکدانەوەی بۆ بکەن، کە هەمویشی هەڵەیە و دەبێت خۆیانی لێ لابدەن.[1]

ئەگەر تەنها بە وردی سەرنج لەم دەقەی ئیمامی غەزالی بدەین، کە مامۆستای پێشەکی نووس بۆ خۆی گواستویەتیەوە لێیەوە، ئایا ئەوە ناگەیەنێت کە غەزالی چ کاتێك خۆی بە دەستەوە داوە؟ئایا وەك (حلولی و یەکبوون وگەیشتووەکان) بیری کردۆتەوە و تەصەووفی ناسیوە؟!

یان خۆیشی لە تەصەووفی ڕاستی حاڵی بووە، کە سەرەتا و ناوەراست و کۆتاکەی بە ڕونی بەیان کردووە و، هەمو کارو بیرو هزری لە ڕێ لادەرەکانیشی بە هەڵە و تاوان ژماردووە.

**چوارەم**: ئەگەر سەرنج لە هەمو نووسراو و ڕێنومایی و مەرجە پەروەردەییەکانی ئیمامی غەزالی بدەین، کە بونیاتی تەصەووفی ڕاستەقینەی لە سەر دامەزراوە، بۆمان دەردەکەوێت، نەك هەر لەگەڵ شەریعەتدا بە مەرجی زانیوە کە یەك بگرنەوە و لێی لانەدەن، بەڵکو بە پێویستیشی زانیوە کە سنووری ئەقڵ و زاهیری شەرع نەبەزێنن، تا توانا و ئارەزویان لە ژێر دەستدا بێت، لە زاهیری شەرع لانەدەن و خۆیشیان تووشی پرسیار و وەڵامی خەڵکێکی نەشارەزا نەکەنەوە. بۆیە دەبینین تەنانەت جەزبەی ڕاستەقینەی صۆفی کە لە ژێر دەستەڵات و ئارەزوی موریددا نییە، دەبێت ئەوپەڕی خۆڕاگر بێت و،

---

(١) المنقذ من الضلال ص/٤٩-٥٠.

تابشتوانێت نابێت ئاشکرای بکات، مەگەر وەك پژمە بە زۆرەملێ خۆی فەرز بکات بەسەریداو هیچ چاری نەمێنێت.

**پێنجەم:**

ئەو نمونە تایبەتیانەی کە حەزرەتی غەزالی دەیهێنێتەوە و، بە لای نەیارانییەوە جێگای ڕەخنەیە، کارێکی سەرسوڕهێنەر نییە، چونکە ئەوانە هەمو متمانەیەکیان بەو کار و ڕوداوانەیە لە سنوور ی بیر و هەستیاری هەر پێنج حاسسەکەیاندا جێگای دەبێتەوە، بەڵام هەرکەسێك ئەو سنوورەی بەزاند، ئەوانە یەکسەر بڕیار دەدەن کە ئەوە نادروست و بێ شەرعییە، ئیتر هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە ئەوە سنووری ئەقڵ و بیرکردنەوەی ئەوان بەرتەنگە و ئەو دیوی مەبەست و قەدەرە شاراوەکان نابینن.

بۆ نموونە: مورێدێکی پێگەیشتوو ئەگەر لە جێگەیەکدا سوننەتێکی ڕاستەقینەی نەکرد و گرنگی پێ نەدا، یەکسەر تۆمەتی بۆ درووست مەکە، کێ دەڵێت نیەتی ئەو لە نەکردنەکەی، زۆر باشتر نییە لە ئەنجامدانی سوننەتەکە، ئەگەر یەکێك ڕیشێکی درێژی بەردابێتەوە، ئەوە لە ڕوانگەی چواردەورەکەیەوە سوننەتێکی (مؤکدة)ی بە جێهێناوە، ئەگەر لە پڕێکدا ئەو ڕیشەی تاشی، ئەوەی شارەزا بێت چاوەنوارِ دەکات تا هۆکارەکەی بۆ دەردەکەوێت، ئەوەش کە سەرپێیی بڕیار دەدات، یەکسەر تۆمەتی ناجۆری بۆ دروست دەکات.

باشە کێ دەڵێت کاتی خۆی ئەم ڕیشەی لە بەر مەرامێکی دونیایی، سیاسی، فریودانی خەڵکی، یان تەنها جوانی نەهێڵاوەتەوە، ئەمڕۆ کە دەزانێت خێری ناگات بڕیاری تاشینی دەدات و، لە نییەتیشیدا هەیە کە ئەمجارە بەری دایەوە تەنها بە نیەتی سوننەت بهێڵێتەوە. هەر کارێك حیکمەتەکەیت زانی سەرسوڕمانیشت لێی نامێنێت. ئەگەر زانایەك واز لە مەلایەتی یان دەرس ووتنەوە یان وتار بێژی و قەزاوەت و دادوەری بهێنێت، کە بە ڕواڵەت ڕۆڵێکی

چاكسازی زۆر گرنگی بوبێت، ئایا نابێته جێگای ڕەخنە و گلەیی و سەرزەنشتی دەوروبەرەكەی؟ ئەی بۆ كاكی ڕەخنەگر لە ئیمامی غەزالی، بۆ خۆی ژیاننامەكەی دەنووسێتەوە و دەڵێت: وازی لە مەدرەسەی نیظامییە هێنا كە چوارصەد مامۆستای تێدابوو كە لێی بەهرەمەند دە بوون، چونكە حیكمەتەكەی دەزانێت و توێژینەوەی لە سەر ژیانی كردووە، بە كەمی و عەیبەی لە سەر ناگرێت، بەڵكو دەڵێت وازی لە دونیا هێناوە و ڕوی لە ئاسۆیەكی دینداری جیاوازتر كردووە. ئەی بۆچی ئەگەر ئەم زانا و (حجة الاسلام) ە شارەزایە، ئەگەر وەرزش و ڕیازەتێكی ڕۆحی بۆ یەكێك دیاری بكات، یان هەڵسەنگاندنێك لە سەر حاڵەتی یەكێك بكات و، كارەكەی ئەوی بە لاوە پەسەند بێت، با بە ڕواڵەتیش لەگەڵ زاهیری شەرعدا نەگونجێت، بۆ یەكسەر ڕوبەڕوی تۆمەتی دووریی لە شەرع و بەرنامەی فیقهی دەدەیتەپاڵ؟ باشە بە چ پێوەرێكی زاهیری شەرعی هەمو پێغەمبەرانی خودا، كوشتنی منداڵێكی بێ تاوان و، كون كردنی كەشتییەكی بێ زیان و، ڕوبەڕوبوونەوەی مەترسی غەرق بوون و خنكاندی بەلاوە پەسەندە.؟!باشە ئەگەر ئەو بەسەرهاتە دروستە قورئان نەیگێڕایەتەوە، چۆن دەچووە ژێر سنووری ئەو شەرعە زاهیرییەی كە ئەو ڕواڵەت خوازانە تەنها توێكڵەكەی دەبینن و ئاگایان لە ناوئاخن و كاڵكەكەی نییە؟

باوەڕتان هەبێت زۆرێك لەو وشكە موسوڵمانانە ئەگەر دەستەڵاتیان هەبێت ئەو چیرۆكەیان لە ناو پەڕەكانی قورئان دەردەهێنا، بەڵام هیچیان پێ ناكرێت، ئەینا ئەگەر قورئان نەبوایە و فەرمووده بوایە: لە صەد لاوە تێی بەر دەبوون و بە زەعیف و لاواز و نەگونجاو و پچڕاو لە قەڵەمیان دەدا.

نابینی فەرمووده دروستەكانی بوخاری و موسلیمیشیان داوەتە بەر نەشتەری زوبانی بەد زوبانییان و، ئەوەی نەچێتە سنووری ئەقڵیانەوە تۆمەت بۆ ئەقڵەكەیان دروست ناكەن، كە نابینایە و بێ توانایە و، لە هەمو شت

ناتوانێت حاڵی ببێت، بەڵکو تۆمەت بۆ دروستیی فەرمودە صەحیحەکەی پێغەمبەرﷺ دادەنێن و، بە ڕەوا و دروستی نازانن.

باشە ئەگەر یەکێك شارەزا لە زاراوە و (موصطەلەحاتی) تایبەتی دەستە و تاقمێك نەبێت، چۆن دەبێت دەم بخاتە کارێکەوە کە لێی شارەزا نییە و، لە خۆیەوە لێکدانەوەیان بۆ بکات، بە پێی هەواو ئارەزواتی نەفسی.

بۆ نمونە: شێخ موحیددینی عەرەبی ڕوی لە کۆمەڵێك کرد و پێی ووتن: ئاییی ئێوە ئەوەتا لە ژێر پێی مندایە، (دينكُم تحتَ قدَميَّ هذا) ئەگەر یەکێك شارەزا نەبێت، کێ لە واتای ئەم ڕستەیە دەگات، کێ ڕازییە دینی ئەو لە ژێر پێی یەکێکیتردا بێت. دوایی دەرکەوت کە مەبەستی شێخی گەورە ئەو دینەیە کە ئەوان کردبویان بە پەرستراوی خۆیان، واتە پارەو پوڵتان کردووە بە دینی خۆتان(دينكُم دينارُكُم) ئەویش فەرموویەتی:

ئەو دینار و پارە و زێڕەی کە ئێوە دەیپەرستن لە ژێر پێی مندایە. دوای دەیان ساڵ ئەو جێگەیان هەڵدایەوە کە ئەو قسەی تێدا کرابوو، سەیر دەکەن کوپەیەکی تێدایە پڕپەتی لە ماڵی دونیا.

بە پێی ڕواڵەتی فرمانەکانی شەرعی ئیسلامی لە سەر هەندێك قسەی لەو بابەتە کە لە واتاو و مەبەستەکانیان حاڵی نەبوون، یان بە زاهیر پێچەوانەی فرمانی شەریعەتی ئیسلام بوو، بۆیە حەللاج و هاووێنەکانیان سزادا و کوشتنیان، بەڵام دەرکەوت کە ئەوان لە هەموو یەکتاپەرستەکان پابەندتر بوون بە تەوحید و خوداپەرستی ڕاستەقینە.

پرسیار لە دکتۆری شارەزا و لێزان ناکرێت چ جۆرە دەرمان و چارەسەرێك دیاری دەکات، ئەبێ بۆ پرسیار لە دکتۆرەکانی دڵ (أطباء القلوب) بکرێت کە بۆ ڕیازەت کێشان و موجاهەدە چارەسەرێکی تایبەتی و ناوازەی بۆ بنوێنێت.

تۆ سەرت ئێش دەکات، ئەو لە ژێر پێتەوە چارەسەرت بۆ دادەنێت.

ئەی ئەوەی تووشی نەخۆشی ئیرەیی و عوجب و خۆپەسەندی و خۆ بەشت زان و نەسەق زلی دەبێت، یان فیز و دەمارێکی یەکجار زۆری هەبێت و، لووت بەرزکاتەوە بە سەر دروست کراوانی خودادا و، نەشتوانێت خۆی لەو دەردە کوشندانە لابدات، ئەی پسپۆڕی شارەزا چۆن ڕوبەڕوی ئەو دیاردە دەبێتەوە.

ئەگەر مورشیدی ڕەببانی پێی باش بێت کە موریدەکەی ڕیشە پێشووەکەی بتاشێت و لە سەر بنەمای تەقوا ئەمجارەیان ڕیش بهێڵێتەوە، یان پێی باش بێت کە نەفسی خۆی بشکێنێت، وەك ئەوەی کە کارێك بکات لە ناو خەڵکەکەدا بە خراپەکار و دز و تاوانبار ناوی بڵاو ببێتەوە، بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشییەکی سەختی ناو دەرونی بکات، کە خۆی وادەزانێت زۆر خوداناس و تەقواکارە، یان خەڵکی بەو شێوە سەیری دەکەن، کە ڕێگای بەرز بوونەوەی پلەی خوداناسی لێ گیراوە و، بەو موجاهەدە و ڕیازەت کێشانە چارەسەری ئەو حاڵەتە تایبەتیانە دەکات .

ئیتر چۆن دەبێت دژ بە ئیمامی غەزالی قسەیەك بکەن. چونکە بەسەر هاتی کابرایەك دەگێڕێتەوە، ئەو چارە سەرەی جێبەجێ کردووە و، بۆ قۆناغێکی تایبەتی ژیانی دەیەوێت ناوی خۆی بە دز و خراپەکار بزڕێنێت، تا موعجەب نەبێت بە خۆی و، ڕێگای ئیخلاصی لەعیبادەت لەسەر والا بکرێتەوە، بۆیە دەچێتە ناو گەرماوێك و بەرگی یەکێك لە ئامادە بوان دەدزێت و، خەڵکەکە پێی دەزانن و لێی دەکەن بە هەڵلاو، ئەو متمانەی خەڵکە کە لە دەست دە- دات کە بە پیاوێکی صاڵحیان زانیوە. ئەویش تەنها مەبەستی ئەوەیە کە خە- ڵکەکە بە باشی نەزانن و سەرقاڵی بەندایەتی و ڕیازەت کێشانی خۆی بێت.

ئەگەر مورشید ئەم کارە بە پەسەند بزانێت. چونکە شارەزایە و لێزانە، کابرایەکی بێ ئاگا لە دورەوە چۆن ڕێگە بە خۆی دەدات ڕەخنەی ڕوبەڕوبکاتەوە.

هەروەك چۆن دەزانین کە هەنگوێن شیفایە و قورئان فەرمویەتی، بەڵام ئەگەر سروشت و جۆری نەخۆشی کەسێك لێی قەدەغە بکرێت، نیشانەی خراپیی هەنگوین نییە، بەڵکو ئەو کەسە لەو قۆناغەی ژیانیدا مادام زیانی لێ دەدات دەبێت وازی لێ بهێنێت. ئەگەر دروست نەبێت ئەم کارە ناوازانە ئەنجام بدرێن ، ئەی چۆن دروستە حەزرەتی خالید (رەزای خودای لێ بێت) پەرداخێك زەهری کوشندە دەخواتەوە، کە خواردنەوەی ژەهر بە هەمو پێوەرێکی زاهیری شەرع حەرامە، بەڵام دەبینیت بۆ ئەو کات و زەمانە دەبێتە بەشێك لە چارەسەرو، کەسیشمان نەبینی بە ناڕەوای بداتە قەڵەم.

هەروەها ڕوخاندنی مزگەوت لە ڕوی زاهیری شەرعەوە کارێکی زۆر ناڕەوایە، ئەی ئەگەر خودای گەورە فرمانی دا ( **مَسجِدُ الضِّرار**)ی ڕوخاند، زانی کە ئەو بەناو مزگەوتە بۆ دژایەتی و تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانە و بۆ بنکەی جاسوسی و شێواندن و نانەوەی فەسادە....ئەگەر طەبیبێکی دڵ و بەرچاوی ڕون بێت و بڵێت: ئەو جێگایە بڕوخێنن،'ئەوەی متمانەی پێ دەکات بە بێ سێ و دوو فرمانەکەی جێبەجێ دەکات، ئەوەش کە متمانەی نییە ئەوا تۆمەتی ڕوخاندنی مزگەوتی دەداتە پاڵ، کەواتە لە هەمو ڕوداوەکاندادەبێت بەوردبینییەوە بە دوای ڕاستی وعیللەت و هۆکاری فرمانەکان بکەوین و لێی حاڵی ببین، لە پاشان بڕیاری دروست یان نادروستی لەسەربدەین.

**شەشەم:** ئیمامی غەزالی هەر چەندە ڕێگای ئەهلی تەصەووف بە باشترین و گونجاوترین و تاقە ڕێگای خوداناسی و سە رفرازی دەزانێت، بەڵام پێچەوانەی ڕای ئەوانەی کە دەڵێن ئەقڵ و هەستیاری نەخستۆتە کار، دەبینین پێشەوا غەزالی لە هەمو کەسێك زیاتر بە چاوی ڕەخنەوە دەڕوانێت بۆ خودی تەصەووف، تا ئەوەی لەملا و لاوە تێکەڵی بوبێت لێی دوور بخاتەوەو بە پوختە و پاکی پیشانی هەوادارانی بدات.

له لایەکی تریشەوە بنوارە چ هێرشێك دەکاتە سەر ئەوانەی کە خۆیان بە تەصەووفدا هەڵسپاردووە و، ڕێبازی صۆفیەتیان کردووە بە بەهانەی وە دەست هێنانی کەسبی ماددی و، دەسکەوتی دونیایی، وە بزانە چەند بە وریایی دەردە کوشندەکانی ناو کۆمەڵگا دیاری دەکات و، ئەرکی پیرۆزی زانایان و هاوڕێبازانی تەصەووف دەست نیشان دەکات و، چۆن جیاوازی دەخاتە میانی زانایانی دونیا و زانایانی ئاخیرەت، کە زۆربەی زۆری زانا و فەقیە و دادوەر و وانەبێژەکانیش دەخاتە بەر نەشتەری ڕەخنەی توندی خۆی، بە بێ ئەوەی لە هیچ کەس سڵ بکاتەوە، یان بیر لەوە بکاتەوە کە بۆ یەك ساتە وەختیش حەق و ڕاستی بکات بە ژێر لێوەوە و بیانشارێتەوە. ئایا دروستە بە کەسێکی بلیمەتی ئاوا بووترێت عەشقی خستۆتە پێش عەقڵی و، زەوق و ئارەزواتی خستۆتە پێش فیقە و تێگەیشتنەکانی لە دین؟! (**سُبحانَكَ هذَا بُهتانٌ عَظيم**) جا لەکوێ بێنم هەمو جارێ پێغەمبەر گیان ﷺ بە دار و لیستی عەدالەتی خۆی و، بە قەمچی دادوەری حەزرەتی فاروق لە پشتی ئەو کەسانە بدات کە تۆمەتی ناڕەوا دروست دەکەن و (حەددی ئیفتیرایان) لە سەر واجب دەبێت.

**حەوتەم:** یەکێکی‌تر لەو هەڵانەی کە توێژەرانی ژیانی ئیمامی غەزالی کە تێی کەوتوون ئەوەیە: کە وایان زانیوە بە بێ مورشید کاری کردووە!! بەڵکو پێیشیان خۆشە ئەم بۆچوونە بچەسپێنن، کە مورید و بەندەی خودا تەنها کیتاب و سوننەت دەبێت مورشیدی بێت و، هیچ پێویستی بە مامۆستای مەعنەوی نییە. ئیتر خۆیان لادەدەن لەو هەمو زانیاریانەی باس لە پێگەیشتنی صۆفی دەکات، کە ناتوانێت ڕێگای خوداناسی بگرێتە بەر و بە ئەنجام بگات، بەبێ مورشیدێکی ئاشکرا، کە دەستگیری مەعنەوی بێت و، لە هەمو کۆسپ و تەگەرە و بەرزی و نشێوی ڕێگا سەختەکانی سەیر و سلوکی صۆفیەتیدا هاوڕێیەتی بکات و، ئاگاداریشی بکات و، دەرمانی سارێژکەری ناخۆشییەکانیشی

بۆ دیاری بکات. بۆ وڵامدانەوەی ئەم بابەتەش، خوێنەری بەڕێز دەگێڕمەوە بۆ سەرەتای ئەم پێشەکیەی لە سەر ژیاننامەی پێشەوا غەزالی نوسیومانە کە لە ژێر ناونیشانی: (هەڵگۆڕانی گشتی و سەرەکی بە سەر ژیانی غەزالیدا)، لە کۆتایی باسەکەدا دوو نموونەی بەرجەستەمان هێناوەتە، کە حافیظی زوبەیدی باسیان دەکات و حەزرەتی عەبدولوەهابی شەعرانی دەیگێڕێتەوە کە ئیمامی غەزالی باسی ئەو کاتانەی دەکات، کە هێشتا مورشیدی نەبووە چۆن خەڵوەی کێشاوە و، باسی ئەو کاتانەش دەکات کە شێخ (**یوسف النساج**)ی کردووە بە مورشیدی خۆی و، بە هۆی (تەوەججوهاتی) ئەو زاتەوە، چۆن گەیشتووە بەو ئاستەی کە خودا (ﷻ) فرمانی پێداوە کە صوحبەتی صاڵحان بکات و، لەگەڵ پیاوچاکاندا ژیان بەسەر بەرێت و ئەویش فرمانەکە جێبەجێ دەکات و، زیاتر لە طەریقەتدا پێشڕەوی دەکات. بیریش لەوە ناکەنەوە کە لە زۆربەی نووسراوەکانی غەزالیدا ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە بە بێ مورشید و مامۆستا مورید و زانا ناگەنە ئامانج... سەیر ئەوەیە هەر دوای ئەوەی کە باس لەوە دەکات کە غەزالی مورشیدی نەبووە، ئەم دەققەی خوارەوەی ئیمامی غەزالیش دەهێنێتەوە کە ڕەخنەی لە زانایان گرتووە، فریو خواردووی شەیتان بوون و، بە بێ عیلم و زانستی موجاهەدەی نەفسیان کردووە، بە بێ شوێن کەوتن و چاو کردن لە مورشیدێکی ڕەببانی شارەزا لە دین و زانستدا کارەکانیان کردووە، وەك ئیمامی غەزالی فەرموویەتی:

**(وكلُّ ذلكَ بناءً عَلى أغاليطَ وَ وَساوِسَ يخدَعُهُم الشّيطان بها، لاشتغالِهِم بالمُجاهَدَة قبلَ إحكام العلم، و مِن غَيرِ إقتداءٍ بشَيخ مُتقِن في الدِّين والعلمِ صالِحٍ للإقتداءِ به)**[1].

---

(١) احياء علوم الدين، ب/٣/ ٤٠٤ .

بە پێی هەڵسەنگاندنی ئەوانە لەوە دەچێت ئیمامی غەزالی ئاگای لە بەر و دوای قسەکانی خۆی نەبێت و، ئەو کۆدەنگی زانایان و ئەقطابی طەریقەتیشی نەبیستبێت کە دەفەرموون: **(من لا شَیخَ لهُ فشیخُه الشَّیطان)** ئەوەی کە مورشیدێکی نەبێت، ئەوا شەیتان وەسوەسە دەخاتە دڵی و، خۆیشي لێ دەکات بە ڕابەر و شێخی ئەو ..کەواتە ئەوانەی دەڵێن غەزالی بە خۆ بەسەری و بێ مورشید پێگەیشتووە، تەنانەت لەوەش حاڵی نین کە دوو جۆر پەروەردەکردنی تایبەت هەیە بە نیسبەت سالیکانی طەریقی ئاخیرەتەوە:

یەکێکیان موریدە و ڕێگای خوداناسی دەگرێتەبەر، لە ڕێگەی پەیوەندی و بەیعەتکردنیەوە بە مورشیدیکی کامڵەوە، ئەویشیان پێی دەوترێت موراد، واتە: خودا ئەو بەندەی خۆیی دەوێت و، لە خۆیی نزیك دەکاتەوە.

ئەگەر ئیمامی غەزالی موراديش بێت بە بێ ڕێنومایی پەروەردگار ناگاتە ئامانج، جگە لەوەی کە باسمان کرد، کە دوای سەرەتای قۆناغی صەحوەو بە ئاگاهاتنەوە، ئیمامی غەزالی چووە خزمەتی شێخی گەورە، فەضڵی کوڕی محەممەدی فارمەزی کە قوتابی پێگەیشتووی مەدرەسەی ئەبوقاسمی قوشوری بووە، کە لە چەرخی خۆیدا زۆر بە ناو بانگ بووەو، هەوارگەی دڵانی سالیکانی ڕێگای خوداناسی بووە.[1]

ئەگەر حەزرەتی غەزالی بە متمانەوە ڕێگای زوهد و تەصەووفی نەگرتبێتەبەر، چۆن بەو شێوە گۆڕانکاری دێنێت بە سەر هەموو جۆرێ ژیان و بەرگ و پۆشاك و خواردن و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیدا؟ دیمــان چۆن بەرگێــکی شــڕی لە بەردایەو گۆپاڵێکی بەدەستەوەیەو، بەهەمو شێوەیەك هەست بە سەر بەرزیەکی ڕۆحی دەکات و، بەهەموو دەسکەوتێکی دونیایی ناگۆڕێتەوە.

---

(١) طبقات الشافعية / السبكي ب /٦ ل٢٠٩، ب/٥ ل٣٠٤ .

# کاریگەری
# ئیمامی غەزالی
# لە سەر تەصەووف

پێشەوا غەزالی ( خودای لێ ڕازی بێ) لە هەموو ڕوویەکەوە کاریگەری بەرچاوی هەبووە لە سەر ڕێبازی تەصەووف، لە ڕوی پاراستن و پوختە کردن و ئاسان کردن و هەندێك بنەمای گشتی و پێویست کە بەرنامەڕێژی بۆ کردووە کە دەبێت ئەهلی تەصەووف پابەندی لێ بکات.

**یەکەم:**

ڕایگەیاند کە سالیکانی طەریقەت و تەصەووف بە بێ گەڕانەوە و پابەند بوون بە زانستی شەرعی هەرگیز ناگەن بە ئامانج، وەك لە پەیامی:

منهاج العابدین و، نامیلکەی (أیها الولد)وە، پێویستی زانست و کارپێکردنی دووپات دەکاتەوە، نابێت بە بێ زانست ڕێگای تەصەووف بگیرێتە بەر، هەر بۆ ئەم مەبەستەش بوو کە کتێبی ئیحیای کردە پەیرەو و مینهاجی داهاتوی سالیکانی طەریقی ئاخیرەت.

**دووهەم:**

ڕەددانەوە و بەر پەرچدانەوەی هەمو بیر و تەئویلە نادروستەکانی باطینیەکان کە دەقەکان لە ڕواڵەت و زاهیری واتای شەرعی لا دەدەن بۆ واتایەکی دووری نەگونجاوی نادروست.

**سێیەم:**

تەصەووفی کردە زانستێکی ئەخلاقی،کە نەك تەنها لە سەر بنەمای حاڵ و چێژو

شەیدا بوون و شەطەح و هاووێنەکانی نەناسرێت، بەڵکو وەکو مەدرەسەیەکی زانستی و ڕەوشتی و پەروەردەیی بناسرێت، کە چارەسەری نەخۆشییە دەرونیەکان بکات و، ڕێگەچارەی هەنگاوەکانی ژیانی داهاتووی مورید دیاری بکات

## چوارەم:

هەوڵی دا واتای زوهد لە مانا تەقلیدیەکەی دووربخاتەوە، بەڵکو بۆ واتای شیاوی خۆی ڕاستی بکاتەوە، کە ئەمە تەنها قۆناغێکی سەرەتایی ژیانی پەیرەوانی طەریقەتە و، لە دواییدا دەبێت ببنە خاوەن کەماڵی مەعنەوی و، تێکەڵی خەڵکی ببن و، خەڵوەکانیان لە ناو خەڵکەکەدا پەرە پێ بدەن و ڕێگای نوور و هیدایەتیان بۆ ئاشکرا بکەن، نەك بەو شێوەی کە هەمو دونیا بگرێت بە باوەشیەوە، یان هەمو دونیا بخاتە ئەولاوە و، تا لە ژیاندا بێت بە کەنارگیری بژی و، کەس لێی سوودمەند نەبێت. بەم شێوەیە غەزالی ڕێگای دروستی مەدرەسەی جونەیدی بەغدادی و ئەقطابە بەرزەکانی زیندوو کردەوە و، ژیانی کردەوە بە بەریاندا [١].

کاتێك کە لە مەدرەسەی نیظامییە بوو لە بەغدا دەرسی دەووتەوە نرخی ئەو بەرگەی لە بەریدا بوو مەزندە دەکرا بە پێنج صەد دیناری ئەو کاتە، کە ئەو کاتە زانایەکی مەزهەبی بوو، بەڵام کاتێ ژیانی زوهد و نەویستی هەڵبژارد هەموو بەرگەکانی بە تەنها پانزە قیراط دەخەملێنرا، کە دراوێکی کەم بایەخی ئەو سەردەمە بوو. ئەوەندەی کە پەیوەندار بوو لە حزوری خالیقەکەی بەو ئەندازەش بێ منەت بوو لە هەموو دەستەڵاتدارەکان.

لە کاتێکدا (ئەنەوشیروان) وەزیری خەلیفە بوو لە (طوس) هات بۆ خزمەتی،

---

(١) بنوارە: پێشەکی چاپی یەکەمی (إحياء علوم الدين) لا / ٥٠ -٥٣

پێشەوا غەزالی پێی فەرموو:

(ئەو کاتەی لە دەستت دەڕوات لە سەرت حیسابە، تۆیش وەك کرێچی وایت،ئاگات لە کاتەکانت بێت بە فیڕۆ لە دەستت نەڕوات باشترە لە وەی بێیت و سەردانی من بکەی!!) وەزیر هاتە دەرەوە و دەیووت:

**لا اله الا الله**، هەر ئەم کەسە بوو کە لە سەرەتای تەمەنیدا هەندێك نازناوە تایبەکانی پێ دەدام و بەرگی زێڕ و ئاوریشمی لە بەر دەکرد و ئێستەش لە سەر ئەو حاڵەتەیە کە دەیبینیت!![1].

ئەمەش بڕیارێکی هەڕەمەکی نییە! بەڵکو بڕوایەکی پڕ لە پابەندییە و تێگەیشتنی تەواوە لەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: **إذا رأيتَ شُحّاً مُطاعاً و هَوىً مُتّبعاً و دُنياً مُؤثِرة و إعجابَ كلِّ ذي رأي برأيهِ فعَليكَ بخاصَّةِ نَفسِكَ وَ دَع مِنْ أمرِ العامَّة**. [2]. ئەگەر ئەو خەڵکەت بینی خولیای تەماح و ڕژدی و ڕەزیلی بوو، دەس کراوە نەبوو بۆ خێرو چاکەو هەمیشە شوێنی هەواو ئارزواتی نەفسی دەکەوتن و وێڵی دوای حەزو ئارەزوات بوون و هەکەسە بەڕای خۆی هەڵس و کەوتی دەکردو گوێی بۆ کەسی تر نەدەگرت، ئەوا تۆ لەسەرتە کە ئاگات لە خودی خۆت بێت و واز لە کارو فرمانی تێکڕای خەڵکەکە بهێنە.

کەواتە لە ناو ئەو ژیانە ئاڵۆزە و هەڵپەکردنە دابۆ دونیا، دەبێت ڕێبازێکی‌تر بۆ خۆی هەڵبژێرێت و لە هەموو کارەکانی پاشەکشێ بکات و کەنارە گیری بکات .

---

(١) انظر: هكذا ظهر جيل صلاح الدين، د. ماجد الجيلاني، دار القلم بيروت: ٢٠٠٩/ص١١٠ .

(٢) رواه الحاكم بمعناه في المستدرك ٣٤٩/٦. برقم ٧٩١٢ورمز لصحة الحديث وكذا الإمام الذهبي رمز لصحته وانظر ايضاً: ص/١٠٨المصدر السابق .

# بۆچی پێشەوا غەزالی وازی لە کاروباری گشتی هێنا و بڕیاری دا گرنگی بە نەفسی خۆی بدات

دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون پاشەکشێیان بە پێشەوا غەزالی کرد لە هەمو کارە گشتییەکانی و سەرەتای چاکسازی لە خۆیەوە دەستی پێکرد و بەم شێوەی خوارەوە کە باسی دەکەین:

**یەکەم**: سەرنجدان و توێژینەوەیەکی کارا و نەبەردانە بۆ هەمو ئەفکار و بیر و باوەڕ و بۆچونەکان کە پێشتر لە کۆمەڵگاکەیەوە وەری گرتبوون، کە پڕی بوو لە تاقم و گرۆی جیاواز و مەزاهیب و ڕێبازی جیاجیا، کە ئەرکێکی گرانی کەوتەسەر لە جیاکردنەوەی ئەو ئیسلامەی کە دەستێوەردان و گۆڕانکاری تێداکراوە، کە هەوڵێکی زۆری دەوێت تا بخرێتە سەر سککە و ڕەسەنایەتی و ئەصاڵەتی خۆی، بە گرتنە بەری ڕێگایەکی سەختی پڕ لە پەندیاری، تا گرۆی ئیسلامی بگێڕێتەوە بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە و، هێزی نوێبوونەوە و تازە کردنەوە و ئیجتیهاد و ڕوبەڕوبوونەوەی گەندەڵکارانی پێ بداتەوە، بە بێ لادان لە سەرچاوە بنەڕەتیەکانی ئیسلام.

**دووهەم**: پێداچونەوەیەکی زاتی و خۆیەتی بۆ ئەو لایەنە دەروونی و ئامانجە سەرەکیانەی کە لە ژیان و چالاکی سەردەمی دەرس وووتنەوە و نوسینەوەی پەڕاو و کتێبەکانیدا لە سەری بووە و، لە هەندێك کاتدا شوێن کەوتنی هەواو ئارەزواتی نەفسی جێگەی بەندایەتی ڕاستەقینەی گرتبویەوە و، کێبڕکێی خاوەن مەرام و تەماحەکان بۆنی ئیخلاص و ڕەزامەندیی خودایی لە کردەوەکانیاندا نەهێڵابوو، یان بە تەواوی کەمی کردبوویەوە.

بۆیە دەبێت پێشەوا غەزالی لە خۆیەوە دەست پێ بکات تا بتوانێت کاریگەری هەبێت لە سەر دەوروبەر و چواردەورەکەی.

بۆیە ڕەفاقەتی شێخ فەضڵی کوڕی محەممەدی فارمەزی کرد و لە پاشان وازی لە هەمو پلە و مەنسەبەکانی هێناو خۆی یەکلایی کردەوە، تا بەرنامەکەی خۆی جێبەجێ بکات و بگات بە ئاواتەکەی...

لەو قۆناغە هەستیارەدا کەگەیشتە ترۆپکی ئاسودەیی نەفسی، توانی کتێبی (**المنقذ من الضلال**) دابنێت، واتە چۆن فریاڕەسێك بخاتە بەرچاوی هەموان، کە لە ژیانی گومڕایی و سەرلێشێوان ڕزگاریان بکات. [1].

دوای ئەوەی گەشتێکی ڕۆحی و پڕ لە تاقی کاری و پڕ لە ئێش و ئازار و موجاهەدە و ڕیازەت کێشانی کرد، وە بووە خاوەنی فەرهەنگێکی زانستی و مەعنەوی، وە شاکاری گەورە و بەناو بانگی (احیا علوم الدین)ی دانا و لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە و لە بەغدا بڵاوی کردەوە.

لە پاشان گەڕایەوە بۆ (طوس) و داوایەکی لە ( فخرالدینی کوڕی نیزامول مولك) پێ گەیشت کە لە مەدرەسەی نیشابور دەرس بڵێتەوە، ماوەیەك لە وێ مایەوە و لە پاشان هاتەوە بۆ (طوس)، چونکە ڕازی نەبو لە هەڵس و کەوتی دەستەڵاتداران بەرامبەر بە هاووڵاتیانی شارەکە، بۆیە گەڕایەوە و هەوڵی دا مەدرەسەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروست کرد و خانەقایەکیشی دامەزراند، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو ئامانجەی کە باسی دەکەین بە هۆی خانەقا و مەدرەسە کەی خۆیەوە پێیان بگات، کە لەم دوو ئامانجەدا ڕەنگ دەداتەوە:

**یەکەم:** پێگەیاندن و پەروەردەکردنی نەوەیەکی نوێ، ڕاستگۆ، زانا و موخلیص و بێ مەرام و بێ تەماح، کە دروستیان بکات و بیانخاتە کار بۆ ئەوەی بە هەموو لایەکدا بگەڕێن و پەیامە نوێ کەی پێشەوا غەزالی بڵاوبکەنەوە.

---

(١) هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ص١٠٩-١١٠ .

**دووهەم**: زیاتر پەنجە بخاتە سەر نەخۆشییە کوشندەکان و، مەترسیە ناوەکی و دەرەکییەکان،کە ڕوبەڕوی جەستەی ماندوو شەکەتی گرۆی ئیسلام بوبویەوە، تا بتوانێت لە پرۆژە چاکسازییەکەیدا چارەسەری تەواویان بۆ دیاری بکات و، موسوڵمانان لە خۆخۆری و کێبرکێی سیاسی و مەزهەبی و لایەنبازی بپارێزێت و بیانخاتەوە سەر پەیڕەوە پیرۆزەکەی خاوەنی ڕسالەت حەزرەتی محەممەد ﷺ .

# کۆتایی بە ژیانی خەڵوەتی هێنا

ئیمامی غەزالی لە ژیانی خۆشی و ناوبانگ و پلە و پایەی دونیاییەوە، خۆی هاوێشتە ناو ژیانی خەڵوەت و کەنارگیری، دوای ئەوەی گەیشت بە ئاواتەکانی وازی لە کەنارگیری هێنا و کەوتەوە ناو کۆمەڵگاوە، لەگەڵ وەبەرهەم هێنانی قەڵەمێك کە ئاگری عەشق و ئەوینی خوداپەرستی لێ دەتکا، زوبانێك کە هەوێنی ئیمانی لێ بەرهەم دەهات، دڵێك کە عەرشی خودای تێدا جێگیر دەبوو، دەرونێك کە بوبوو بە کێوی طوری موناجات و هێمای سۆز و ئەوین و خۆشەویستی و پێکەوە ژیان ...

دیارە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە میانی ئەم قۆناغەی هەستانەوەی ئیمامی غەزالی، بەراورد لەگەڵ قۆناغە پێشووە کان، ئەوسا بەرنامەیەکی بە ڕواڵەت ئایینی و لە ڕاستیدا دونیایی پیادە دەکرد و، بە ناوی پلە و کەسایەتی و زانست و مامۆستاییەوە ڕۆڵی خۆی دەبینی، بەڵام ئێستا بە ناوی خوداوە کارەکانی ئەنجام دەدات، ئێستا ناوو شۆرەت و جاه و مەقام و بەشی نەفس و شەیتانی خستۆتە ئەولاوە و، خۆی یەکلایی کردۆتەوە کە بانگخوازی ڕاستەقینەی خودایی بێت و، بە نووری خودا سەیری ڕوداوەکان بکات و، بە ناوی خوداوە کارەکان ئەنجام بدات و، بە فەیز و تەجەللی پەروەردگارەوە ئاگر بەر بداتە دڵە ساردەوەبووەکان.

ئێستا بانگەشە بۆ زانستێك دەكات، هەمو هێما و ئاسەواری قۆناغە پێشووەكانی ژیانی خۆی بسڕێتەوە و، دڵەكان یەك بخات و، ڕیزەكان پتەو بكات و كۆمەڵگایەكی ئیمانی دروست بكات، تا دەگاتە ئەوەی كە فەرموویەتی:

من بۆ خۆم نەجوڵاومەتەوە تا جۆڵاندومیانەوە، كارم نەكردووە تا منیان خستە سەر ئەم كار و هەوڵدانەو، نازانم تا چ ئاستێك سەركەوتوو دەبم یان نا، پشت و پەنام هەر بە خودایە و، داوای یارمەتیش هەر لەو دەكرێت.[1].

بۆیە دەبینین حەزرەتی غەزالی شۆڕشێكی هەڵسانەوەی بیر و باوەڕی بەرپا كرد و، سەنگەرێكی پڕ لە كەرستەی خۆپارێزی و بڕوا پارێزی دامەزراند و، ڕوبەڕوی هەمو بیر و فەلسەفە باوەكان و بیردۆز و فیكرە بە میرات هاتووەكان و بەرپەرچدانەوەی فیكرەی پوچی باطینیەكان بوویەوە، بە دانانی چوار كتێبی ناوازە و بە ناوبانگ، كە جگە لە كەسایەتیەكی مەزنی وەك حەزرەتی غەزالی، كێ دەیتوانی وەك خۆیان لە فیكرەكەیان شارەزا ببێت، كە بە چەكی هاو وێنەو بە هێزتری خۆیان، بیر و هزر و بڕواكانیان پوچەڵ بكاتەوە و، ڕاستییەكان ئاشكرا بكات. كێ دەیتوانی لەو چەرخەدا ڕوبەڕوی زانایانی عیلمی كەلام ببێتەوە، كە وایان دەگەیاند: ئەوەی بەتەواوی لە زانستەكەیان شارەزا نەبێت و، لە هەر پرس و مەسەلەیەكدا شوێنیان نەكەوێت، یان ڕوبەڕویان ببێتەوە، ئەوا ئیمان دەرنابات و دژایەتی ئیسلامی كردووە. بەڵام ئیمامی غەزالی گرۆی ئیسلام دەهێنێتەوە سەر ڕاستە شەقامی دینداری، كە كەس پارێزراوو (مەعصوم) نییە جگە لە خاوەنی شەریعەت نەبێت، لەگەڵ ئەوەدا كە خۆی لەسەر عەقیدەی ئەشعەری و مەزهەبی شافیعی‌یە، بەڵام لە وردەكاریەكاندا موناقەشەی زانا ئەشعەریەكانیش دەكات، نەك تەنها تەسلیم بە دەسپێك و

---

(١) المنقذ من الضلال، بە دەست كاریەوە: لا ١٥٣-١٥٤ .

بەڵگەو ئەنجامەکانی ئەوان نابێت، بەڵکو دەتوانێت لە ڕوانگەی سەرچاوە هەمیشە زیندووەکانەوە، ئەقڵ و زانست و شارەزایی و وردبینی خۆی بخاتە کارو، بە دواداچوونێکی ژیرانە و زانستیانە و بە ئینصافەوە بکات، بۆ تەواوی پرسە تایبەتیەکانی پەیوەندار بە (عیلمی کەلامە)وە، وەك موجتەهیدێکی شارەزا کە لەو بوارەدا بۆی دروست نییە تەنها تەقلید بکات، وەك حەکیم و پەندیارێکی ناوازە، کە لە هەموان زیاتر دەتوانێت سارێژی برینەکان بکات و، چارەسەری بۆ نەخۆشییەکان بدۆزێتەوە.

دیسان پەرەی دا بە زانستی (عەقیدە)، بێ ئەوەی موویەك لادانی هەبێت لە پەیڕەوی سوننەت و جەماعەت، بەڵام پۆشاکێکی نوێی کرد بە بەری ئەم عیلمە تەقلیدی یەدا، بە زوبانێکی ئاسان و ڕەوان، وە بە هیممەتێکی بەرز و نایاب، وە بە سۆز و ئەوینێکی بەتین و پڕ لە ڕۆحانی بەهێزتر، کە تێکڕای خەڵکەکە لە زانستی کەلام بەهرەمەند ببن، نەك بە زوبانێك بنوسرێت و بووترێتەوە، کە تەنها زانا گەورەکان و هەندێك کەسی تایبەتی لێی شارەزا ببێت و،پاشماوەکەش هەروەك مەتەڵێکی نارەحەت سەیری بکەن و بە تەواوی بۆیان لێك نەدرێتەوە.

بۆیە بە زوبانێکی زۆر هەستیارانە ڕوبەڕوی ئەوانەش بویەوە کە ئیرەییان پێدەبرد و، ناو و ناتۆرەی خراپیان پیا هەڵدەدا و، تەنانەت گومانیان دروست کردووە بەرامبەر بە عەقیدە و بیر و باوەڕەکەی.

وە بە بەرنامەو پەیڕەوێکی پاراو ڕەخنەی لە هەندێك زانایانی (موتەکەللمین) دەگرت، کە باوەڕیان وابوو هەمو ڕەشە خەڵکەکە بێ باوەڕن، چونکە وەك ئەوان شارەزای عیلمی کەلام و بەڵگەکانیان نین، کە ڕەحمەتی خودایان بەرتەنگ کردۆتەوە و، ئاگایشیان لەوە نییە کەلەچەرخی پێغەمبەردا ﷺ و صەحابەکانیشدا، حوکم بە موسوڵمانێتی عەرەبە دەشتەکییەکاندا دراوە ، کە

پێشتر بتپەرستییان دەکرد و لە دوایشدا بۆ ڕۆژێکیش خۆیان بە زانستیی و بەڵگەکانەوە خەریك نەکردووە،ئەگەر خەریکیش بوونایە لێی حاڵی نەدەبوون[1]

دواچۆڕی تاقی کردنەوە زانستیەکانی پێشەوا غەزالی گەیشتە ئەو ڕاستییەی، کە قورئانی پیرۆز لە ڕوی سوود و گشتگیری و ئاسانی و متمانە و ڕەوانبێژی و، بۆ هەمو ئاستەکانی بیر کردنەوەی تەواوی چین و توێژەکان شیاوتر و گونجاوترە و، دەبێت شێوازی قورئانی بکرێتە هەوێنی هەمو دەرس و وانە و ئامۆژگاری و بانگخوازییەك، چونکە بەڵگەکانی قورئان وەك خواردەمەنی وان، هەمووکەس پێویستی پێیانە، بەڵام بەڵگەی زانایانی عیلمی کەلام وەك دەوا و دەرمان وایە، سوود بە تاکەکان دەگەیەنێت و، زۆربەی خەڵکیش زیانی لێ دەبینن.

بەڵکو بەڵگەکانی قورئان وەك ئاو وایە، کە منداڵی شیرەخۆرەیش لێی سوودمەندە، هەروەك چۆن پیاوێکی بەهێزیش پێویستی پێی هەیە، بەڵام پاشماوەی بەڵگەکانی‌تر وەك ئەو جۆرە خواردنانە وایە، کە جارێك پیاوەکان سوودیان پێ دەگات لێیان و، جارێکیش زیانیان پێ دەگەیەنێت، وە منداڵیش بە هیچ شێوەیەك سوودی لێ وەرناگرن.

کەواتە بە هۆی عیلمی کەلامەوە هەندێکی زۆر زیانیان لێ بینی و، ئەو سینە صافی و پاکی دەروون و بێ‌کێشەییان لە دەست دا کە لە چەرخی ئەصحابدا لە سەری بوون[2].

(١) فیصل التفرقة بین الاسلام و الزندقة: للغزالي. مطبعة الترقي. ص٧-٨ .

(٢) الجام العوام عن علم الکلام: المطبعة المیمنة. ص٢٠ .

# ڕۆڵی چاکسازی ئیمامی غەزالی

بەڕاستی پێشەوای مەزن غەزالی ڕەچاوی کۆمەڵێ بنەمای سەرەکی کردووە لەوەدا کە چۆن بتوانێت ڕۆڵی چاکسازی ڕابگەیەنێت و بەرپای بکات و لە سەری بڕوات بەڕێوە:

## بنەمای یەکەم:

تاکە بنەمای سەرەکی بۆ سەلماندنی بوونی ئوممەتی ئیسلام ئەوەیە، کە بێتەوە ناو نێوەندی مەیدانی چالاکیەوە، کە شیاوە بۆ هەڵگرتنی قورسایی ئەو ئەمانەتەی کە لە سەریەتی، ئەویش گەیاندنی ئیسلامە بە هەمو جیهان، ئەگەر موسوڵمانان لەم ئەرکە خۆیان دوور بگرن، ئەوا زەوی پڕی دەبێت لە فیتنە و تێکدانی زۆر و، موسوڵمانانیش دەبنە قوربانی بۆ ئەو دارمان و شکستی و فەسادیە.

## بنەمای دوهەم:

دەبێت بزانین هۆکاری سەرەکی چییە کە موسوڵمانانی دووچاری شکستی و بێ ورەیی هێناوە و، ناتوانن بە ئەرکی گەیاندنی ئیسلام هەڵبستن، کە ئەمەش دەبێ توێژینەوە لە سەر خودی موسوڵمانەکان بکرێت بۆ وایان لێ هاتووە.

## بنەمای سێیەم:

مەبەست لە دۆزینەوەی هۆکاری ئەو گرفتەی کە موسوڵمانان پێیەوە دەناڵێنن ئەوەیە:

کە نەخۆشیەکەیان دیاری بکرێت و، چارەسەریان بۆ بدوزرێتەوە و هەنگاوی خێراییان بۆ بنرێت، نەك تەنها تۆمەت لە یەکتری بدرێت و، بابەتە سیلبیەکان باسی بکرێت و چارەسەریش نەکرێت.

## چۆنییەتی بەرنامە و پەیڕەوی غەزالی لە هەنگاوی چاکسازیدا

ئیمامی غەزالی بە شێوەیەکی تر هەوڵی چاکسازی دەدات، کە موسوڵمانان سەرقاڵی خۆیان بن‌و، تێیشیان بگەیەنێت، با نەیار و دوژمنی زۆریشیان لە دەرەوە هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەمان خۆیان چاك بکەن، ئەوا هەموو کۆسپ و تەگەرەکانی‌تر لە ڕێگەدا نامێنێت و، نەیارەکـــانیش دەپوکێنـــەوە، کە بەرنامە کەیشی بۆ چاکسازی بەم شێوە دارِشتووە:

**یەکەم**: نووسراوەکانی دوور بوو لە هاندانی خوێنەر و هەوادارانی بۆ بەربەرەکانێ و جیهادی خاچ پەرست و مولحیدەکان لەو قۆناغەدا.

دووهەم: زیاتر پشتی بەوە دەبەست، کە مرۆڤی خوداناس لە سەر بنەمای ڕەخنەی زاتی بونیاتی بنێت، نەك هەمو شکستییەکان بکاتە خەتای دوژمنە هێرشبەرەکان، بەڵکو بەرپرسیاریەتی ڕوبەڕوی موسوڵمانان ببێتەوە، کە لاوازی و بێ ئەزموونی و نەبوونی ئیرادەی بە هێزی ئەمان، دوژمنانی زاڵ کردووە بەسەریاندا و، تووشی ئەو کارەسات و بەڵا گەورانە بوون، لە ڕوانگەی ناوەرۆکی فەرموودەی قورئانی پیرۆزەوە کە فەرموویەتی:

(وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ) الشورى/٣٠.

کەواتە ئیمامی غەزالی کێشەکە لەو فەراغ و بۆشاییە ڕۆحی و مەعنەوی و لاوازی ئیرادە و نزمی فیکر و نەفسییەتی بێ هێزی موسوڵمانەکانەوە دەبینێتەوە، لە ڕوی عەقیدە و باری کۆمەڵایەتی‌یەوە کە تووشی شکستی هێناون و، چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە ناوخۆییانە بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی ڕزگاربوونیان لە هەموو دەردە کوشندەکانی‌تر.

**سێیەم**: خەصڵەتی سێیەم لەشێواز و بەرنامەی غەزالی، دەست پێ کردنە بەلایەنی چـــاکسازی فیکری و نەفســی و، لە خــۆیشیەوە دەستی پێکرد و، لە پاشان لە چوار دەوریدا ڕەنگ بداتەوە لە سەر بنەمای:

(إنَّ اللهَ لا يُغَيِّرُ ما بِقَوْمٍ حَتَّي يُغيِّروا ما بأنفُسِهم) الرعد/١١. بەم هۆيەوە نەوەيەكى بە توانای پەروەردە كرد، كە چەندین سەركردەی مەزنی وەك نورەددینی زەنكی و صەلاحەددینی ئەیوبی لێ وەبەرهەم هات.

**چوارەم** خەصڵەتی بەرنامە بە پێزەكەی ئیمامی غەزالی ئەوەیە: كە بە بیری هەموانی بهێنێتەوە، كە دروشمی فرمان بە چاكە و بەرگری لە خراپە دەبێ هەموو چین و توێژەكان بگرێتەوە و، كێشە و گرفتەكانیش لە سەر ئەو بنەما چارەسەر نە كراوە كە موسوڵمانەكان نەتەوەیەكی جیاوازن و كێشەیان لەگەڵ نەتەوەكانی تردا هەیە، بەڵكو هۆكاری شكستییەكان بێ دەنگییانە لە ئەرك و فرمانی خودایی،كە خێر و چاكە بڵاو بكەنەوە و، بەرگریش لە خراپە و فەساد بكەن[1]. بۆیە پێشەوا غەزالی هەمو جەمسەرەكانی هۆشیاری و یەكرِیزی و هاورِازی و هاوكاری بە یەكەوە بەستەوە و، دەستنیشانی هەموو نەخۆشیە سەرەكیەكانی كۆمەڵگای ئیسلامی كرد و، هەوڵیدا چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە و، لە ماوەیەكی قیاسیدا گەیشت بە ئاواتەكانی خۆی و، بوو بە یەكەم سەركردە و مورشید و مامۆستا و پەروەردەكار، كە دەستی ئیصلاح و چاكسازی هەمو لایەنەكانی ژیان بگرێتەوە و، بەرنامەكەیشی ئەوەندە تۆكمە و بەرِبڵاو و سەركە وتوو بێت، كە بۆ هەموو كات و زەمان و نەتەوە موسوڵمانەكانیتریش شیاو و گونجاو بێت كە پێی هەڵبستن و، لە كێشە سەرەكییەكان خۆیانی پێ رزگار بكەن.وەك دەبینین ئەو بەرنامەی پێش نۆ صەد ساڵ لەمەوبەر دایرِشتووە ئەمرِۆش بە زیندویی ماوەتەوە و هەمان كەڵك و گرنگی خۆیی لەدە ست نەداوە.

---

(١) بنواره: دولة السلاجقة: د. علي محمد الصلابي ص٤٨٤، و هكذا ظهر جيل صلاح الدين، د. ماجد الگيلاني ص١١٢-١١٣ .

# نەخۆشییەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی

لە خوێندنەوەماندا بۆ بەرگەکانی مەوسوعەی بەربڵاوی ئیحیای ئیمامی غەزالی، ئەو بابەتانەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە چۆن دەستنیشانی نەخۆشیەکانی کردووە و لە چەندین خاڵدا نەخۆشیەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی بەیان کردووە، کە بە کورتی باسیان دەکەین:

١- تێکچوونی ئەو پەیامە پیرۆزەی کە زاناکان هەڵیان گرتبوو، لە پەیامێکی خوادۆزی و خوداناسی‌یەوە، بۆ پەیامێکی دونیاویستی، کە نەبوونی دکتۆرەکان جەستەی کۆمەڵگای بەرەو شەلەلی گشتی بردووەو،پادشا ودەستەڵاتدارەکانیش کە بەرەو خراپی دەڕۆن، زیاتر بەرپرسیارێتی ڕوو لە خراپی زانایان دەکات، بۆیە بە تێر و تەسەلی کەموکوڕییەکانی باس کردووە و، یەکەیەکە چارەسەریشی بۆ داناون، کە زانایان ببنە ڕێنومایی ڕێگای هیدایەت و، سەرچاوەی بەیانی ڕاستییەکان و، سەرمەشقی ڕێگای زاهید و سالیکانی طەریقی ئاخیرەت.

٢- گەورەترین نەخۆشی کە ڕوی لە کۆمەڵگا کردووە، گۆڕینی واتای زانست و وشە پیرۆزەکانە، لە مانا ئەصڵییەکانەوە بۆ مەبەست و مەرامێکی نەوباوی نارەوا، کە تەنها غەزالی بە کورتی و پوختی ئەو کێشە سەرەکییە دەخاتە بەرچاو، کە وشەکانی ((**فیقهو عیلم و تەوحید و تەزکیر و حیکمەت**))، کە لە سەرەتاوە بۆ مەبەستێکی زۆر پیرۆز دانرابوون، بەڵام ئێستا دابڕاون بە سەر واتایەکی تردا، کە زۆر لە ئامانجەکانی خۆیان دووریان خستونەتەوە.

بۆ نموونە: **فیقهـ** : بۆ عیلمی ئاخیرەت دانراوە کە لێی شارەزا ببیت، بە هەموو لق و پۆکانیەوە، بەڵام ئێستا دابڕاوە بە سەر زانینی مەسئەلە فەرعی و لاوەکییەکاندا، دەربارەی ڕا جیاوازەکان و بابەتە دەگمەنەکانی‌تر. .

**عیلم:** بۆ کەسێك بەکار دەهات کە زانا بوایە بە خودا و صیفەتەکانی و ئایەت وناوە جوانەکانی، ئێستا کەسێك لە مەسئەلە فیقهییەکاندا دەردەشە و

مونازەرەو دەمەدەمێ زۆری لە سەر بکات، بە عالم ناو بانگ دەردەکات.

**تەوحید:** ئەوەیە هەمو کارێك تەنها بۆ لای خودا و لە خوداوە بیناسێت و، لا بە لای هۆکارەکاندا نەکەیتەوە، ئێستا عیلمی کەلام و موجادەلە کردن و، زاڵبوون و بۆڕدانی خەصم و، سەرکەوتنی قسە و بابەتەکان، کراون بە عیلمی تەوحید و، لە واتا ئەصڵییەکەی دووریان خستۆتەوە.

**تەزکیر:** ئەوەیە خودای گەورە وە بیری خەڵکی بهێنرێتەوە، ئێستا قسە و چیرۆك و بە سەرهات وحەکایەتخوانی، کە بە داخەوە جێگەی وەعزی ڕاستی گرتۆتەوە. **هەروەها وشەی حیکمەت**: کە قورئان باسی دەکات: (**يُؤتِي الحِكْمَةَ مَنْ يَشاءُ وَمَنْ يُؤتَى الحِكمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيراً كَثيراً**) البقرة/٢٦٩ . حیکمەت چەند واتایەکی پیرۆزی هەیە، بەڵام لەو زەمانەدا دابڕابوو بە سەر ئەوانەدا کە پزیشك و شاعیر و ئەستێرەناس و تەنانەت هەندێك جار فاڵگرەوەکانیش دەگرێتەوە.[١] بۆیە گێڕانەوەی ئەم وشە پیرۆزانە بۆ واتا و مەبەستە ئەصڵییە کانی خۆیان، ئەرکی گرنگی حەزرەتی غەزالی بووە، کە بە هۆی نوسراوەکانی و ئیرشادە بە تواناکەیەوە ئەم کۆششە پیرۆزەی بە ئەنجام گەیاند.

٣- ڕێگەیەکی تریشی گرتەبەرو زۆر بوێرانە ڕەخنەی لە دەستەڵاتدارە زاڵمەکان دەگرت و، لە سەرەتاوە ئامۆژگاری دەکردن و، لە پاشاندا ڕەخنەی توندی لێ دەگرتن و، لە داهاتویشدا نان و خوانی حەرام دەکردن و، تەنانەت ماڵ و سامانیشی بە حەرام ناو دەبردن، لە پاشان فتوایشی دەدا کە نزیك بوونەوە لێیان و نان خواردن و هاوڕێیەتی و هاوکاری کردنیان لە ڕووی شەرعەوە قەدەغەیە و، دەبێ موسوڵمانان بە گشتی و زانا و پیاوچاکان بە تایبەتی خۆیانیان لێ بپارێزن. ئەگەر سەیری ئیمامی غەزالی بکەین دەبینین زۆر

---

(١) احياء علوم الدين ج١ ص/٢٨-٣٤ .

بوێرانە فرمان و ڕەخنە وئامۆژگاریەکانی دەگەیاند، لە بەر چەند خاڵێك:

**یەکەم**: متمانەی تەواوی بەو هێزە مەعنەویە هەبوو کە پێی سپاردووە دەبێ هەڵسێت و ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت.

**دووهەم**: هیچ پێویستیەکی بە خەڵات و بەراتی دەستەڵاتدارەکان نەبوو، تا نەتوانێت قسەی حەقیان بۆ بکات، چونکە ئەو لە لوتکەی دەستەڵاتی دونیاییدا کە هەمو عیززەتێکی دونیایی لە بەردەستیدا بوو، هەموی بە جێ هێڵا کە لەو کاتەدا هێشتا نەگەیشتبووە دوا قۆناغی نزیك بوونەوە لە پەروەردگار، ئەو کاتە ئەگەر بێ منەتی لە دەستەڵاتداران نیشاندا بێت، ئەی ئێستا کە ئەو هەمو پلە و مەقامە بەرزەی بڕیوە، چۆن دەچێتە ژێر منەتی ئەو جۆرە کەسانەوە، بۆیە زیاتر بە سەربەستی و بوێریەوە دەتوانێت قسەی ڕاستیان بۆ بکات و، هەڵوێستی درووستیان لەگەڵدا بنوێنێت و ڕوبەڕویان بکاتەوە.

لێرەدا دەتوانین ئەو ڕاستیەش زیاتر ڕوون بکەینەوە کە ئیمامی غەزالی بوێرانە هاتەوە مەیدانی تێکۆشان، کە بە زوڵمێکی گەورە دەژمێررێت ئەو ڕەخنە نابەجێ یە ڕوبەڕوی غەزالی بکرێتەوە، کە ڕێگای صۆفی یە وشکەکانی گرتبێت و، حەزی لە کەنارگیری بوبێت. نەخێر ئەو زاتە چەند ساڵێك ژیانی کەنارگیری بۆیە هەڵبژارد، بۆ ئەوەی بتوانێت کۆتا ساڵەکانی ژیانی بە تەواوی و بە کراوەیی لەگەڵ خەڵکیدا بژی، بۆ ئەوەی دەنگی بگەیەنێت بە هەمو ئەو جێگایانەی کە پێشتر نەیدەتوانی پێیان بگەیەنێت، ئەوانەی غەزالی بەگۆشەگیر تۆمەتبار دەکەن، یەك قۆناغی ژیانی لەبەرچاو دەگرن، یان بە شێك لە جۆری بیرکردنە وەی ئەو زاتە دەکەنەسەرەتا و کۆتایی بیر و بڕیاردانیان لە سەر دیاری کردنی کەسایەتی ئەو زانا ماندوو نەناسە، چونکە شارەزای بەرنامە و پەیڕەوکاری غەزالی نەبوون و، وەك پێویست توێژینەوەیان لە سەر تێکڕای ساڵ و قۆناغە کانی ژیانی نەکردووە، لەلایەکی تریشەوە نەمانبینی کەسێك ڕەخنەی لێ بگرێت

لە سەر چەندین ساڵ کە بۆ خوێندنی تەرخان کردبوو، ئەی بۆ پەیداکردنی ئیخلاص لە عیبادەتدا ئایا لەوە زیاتری پێویست نییە؟ ئیتر چۆن دەبێت جێگای ڕەخنەیان بێت؟! بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستیانە ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیە:

١- پێشەوا غەزالی(خودای لێ ڕازی بێت) دوای ئەو چەندین ساڵەی پاشەکشەی کردبوو لە ژیان و کەنارگیری هەڵبژاردبوو، دوای ئەوە زۆر بە توندی و ئیرادە یەکی بە هێزترەوە برەوی بە ژیانداو هاتەوە ناو کۆڕی تێکۆشان و لێبڕانەوە.

٢- سەرچاوەکانی ژیانی غەزالی ئەو ڕاستیەش ئاشکرا دەکەن، کە لە هەر جێگایەکدا هەستی بەوە کردبێت کە بوونی ئەو پێویستە، یان حاکم و دەستە ڵاتداری ئیسلام پێویستی بە ڕێنومایی و پشتگری ئەو هەیە، هەرگیز کەمتەرخەمی لێ نەکردووە. بۆ نموونە: کاتێك کە بیستی سوڵتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی یوسفی کوڕی تاشەفین سوڵتانی مورابیطەکان پادشایەکی داد پەروەرە، هەوڵی دا کە بچێت بۆ لای تا هانی بدات (دار الإسلام) ڕابگەیێنێت و ڕۆڵی خەلافەتی گشتگیری دابمەزرێنێتەوە، بەڵام ئەم لە شاری ئەسکەندەریەدا بووکە هەواڵی وەفاتی سوڵتانی بیست و ناچاری کرد کە نەڕوات و بگەڕێتەوە[١].

٣- کاریگەری غەزالی لە سەر دامەزرێنەری دەوڵەتی (مووەحیدین) محەممەدی کوڕی (تومرت) لەمەغریب، کە خۆی گەیاندە بەغدا و، بوو بە قوتابی ئیمامی غەزالی و، کاریگەری تەواوی ئەو زاتە لە سەری پەیدا بوو، وە بەو شێوە فرمانڕەوایی دەکرد لە مەغریب دا کە حەزرەتی غەزالی بەرنامەڕێژی بۆ کردبوو. عەللامە ئیبن و خەلدونیش لە مێژووەکەیدا هێما بۆ ئەو ڕاستییە دەکات، کەچۆن گەیشتووە بە ئیمامی غەزالی و ڕێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام داوە و کاریگەری لە سەری بووە[٢].

---

(١) طبقات الشافعية السبكي،ج٤/١٠٥ .

(٢) تأريخ ابن خلدون، بيروت، مؤسسة الأعلمي ص٢٢٦ و (العبر و ديوان المبتدأ و الخبر)ج/١ .

## (ئیمامی غەزالی و سوڵتان و دەستەڵاتدارەکان)

جگە لەوەی کە بە هەمو توانایەوە ڕەخنەی لە سیاسەتی زاڵم و دەستەڵاتدارە خراپەکان دەگرت، زیاتر ئەو بابەتەیشی ڕوون دەکردەوە، کە هۆکاری سەرەکی بۆ لە ڕێ لادانی زاڵم و دەستەڵاتداران سیاسەتی گەندەڵی زانایانە، بۆیە زۆر بە توندی دژ بەو زانایانە قسەی دەکرد کە لە فەرمانڕەواکانەوە نزیك دەبوونەوە، یان تێکەڵاوییان لەگەڵدا دەکردن، چونکە ماڵەکانیان حەرامە و، هەموی وەك بەرتیلێك وایە کە دەبێ ئیسلام زەرەرەکەی بژێرێتەوە. **بۆیە لەم بوارەدا بە ئاشکرا ڕای خۆی دەردەبڕیت و بڕیار دەدا:**

١- حەرامە هەڵسوکەوت لەگەڵ سوڵتانە زاڵمەکاندا بکرێت.

٢- هەڵسوکەوتیشی قەدەغە کردووە لەگەڵ هەمو قازییەکاندا کە پەیوەنداری سوڵتانە زاڵمەکانن.

٣- هەروەها بە حەرامی داناوە کە سوود لەو دامو دەزگا ڕەسمییانە ببینن کە بە ماڵی حەرام دروست کراون.

دیارە فتواکانی ئیمامی غەزالی کاریگەری زۆری بووە لە سەر زانایان و جەماوەری موسوڵمان، بۆیە سوڵتانەکانیش بە بایەخەوە بۆیان نواڕیوە و لێی ترساون، چونکە هەرگیز لە قسەی ڕاست خۆی کەنار نەداوە.

**نامەکانی بۆ ئەمیر و سوڵتانەکانیش نیشانەی نەترسی و بوێری بووە کە لە لۆمە و سزای هیچ کەسێك نەترساوە.**

نامەیەك بۆ (فخر الملك) دەنوسێت و دەڵێت: بزانە! کە ئەم وتانەی بە تۆ دەگات زۆر تفت و تاڵ و توند و ڕەقە، کەس ناتوانێت ڕوبەڕوی تۆیان بکاتەوە مەگەر کەسێك کە بێ هیوا بێت لە دەستی هەمو مەلیك و ئەمیرەکان و تەماحی پێیان نەبێت، بۆیە دەبێ ڕێز لە ناوەڕۆکی نامەکەم بگریت، ئەم قسە حەققانە لە کەسی تر نابیسیت کە بۆت بکات جگە لە من، هەر کەسێك پێچەوانەی ئەم

قسانەی من شتیترت بۆ باس بکات، ئەوە بزانە تەماحێکی هەیە پێت،کە بووەتە پەردەیەك لە میانی ئەوو ووتنی قسەی حەق و ڕاستیدا.

وە نامەیەکی تریشی نووسی بۆ (مُجبرالدین) و دەڵێت:

فریاڕەسی و فریاکەوتنی ئەو خەڵکە واجبی سەرشانتانە، زوڵم و ستەم هەموو سنووڕێکی بەزاندووە، منیش نەمتوانی بەردەوام شایەتی ئەم زوڵمە بم، بۆیە لە (طوس)ە وە کۆچم کرد، ساڵێك چاوەنواڕیم کرد تاوەکو ئەو زوڵم و ستەمە نەبینم کە هیچ سۆز و ڕەحمەتێك لە چاویاندا نییە. هەندێك پێشهاتی پێویست وای کرد کە جارێکیتر بگەڕێمەوە و سەردانی ئێرە بکەم، بەڵام دەبینم زوڵمەکان هەروا بەردەوامن و بە کۆتا ناگەن [1]. لە کۆتایی نامەکەدا پێشەوا غەزالی فەرموویەتی: زوڵم و ستەم گەیشتۆتە سەر ئێسقان، خەریکن موسوڵمانەکان ڕیشەکێش دەکەن، فەرمانبەرەکان ئەو کەمە پارەی کە دابەشیان کردووە بە سەر خەڵکەکەدا، چەندین جار زیاتریان لە خەڵکە هەژارەکە وەرگرتووە و سەرانەی زیادەیان لێ وەرگرتوون، زاڵم و جەردە و نەفامەکان سەروماڵی هەموانیان تالان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان نەگەیاندووە بە سوڵتان.

بەم شێوە غەزالی بوێرانە ڕوبەڕوی زاڵمەکان دەبویەوە، ڕوبەڕوی زانا دونیا خۆرەکان دەبویەوە، ڕوبەڕوی شێخە بەتاڵەکان دەبویەوە، بەرهەڵستی کۆمەڵگایەکی پڕ لە فەسادی دەکرد، وازی لە هەموو چێژ و خۆشیەکی ژیان هێنابوو، خۆی یەکلایی کردەوە بۆ بەندایەتی و گەیاندنی پەیامی خودایی:

کەم ژیا، بەڵام بەڕاستی وەك شێری مەیدان و نەهەنگی دەریاکان و کەڵی سەربەرزی سەر چیابڵندەکان ژیا، دوا ڕۆژەکانی ژیانیشی بەردەوام خەریکی تەدریس و ئیرشاد و پەروەردەکردنی موریدەکانی بوو، لە پاڵ خانەقا و

---

(١) رسائل الامام الغزالي بالفارسية،و رجال الفكر و الدعوة في الاسلام. ب/١ للعلامة الندوي: ل/٢٧٩

مەدرەسەکەیدا بەسەربەرزی  و دونیا نەویستییەوە، تا دوا هەناسەی ژیانی مایەوە، تا ڕۆژی وەفات کردنی هاتە پێشەوە. دوا ڕۆژەکانی ژیانیشی هەمیشە خەریکی دیراسە کردنی فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺبوو. بانگی (أبا الفتیان) عومەری کوڕی ئەبولحەسەنی ڕوواسی کرد کە بە ناوبانگە بە(الحافظ الطوسي) زۆر ڕێزی لێ گرت، لە پاشان صەحیحی بوخاری و موسلیمی لێ بیست و خوێندیشیەوە لە خزمەتیدا. [1]. هەروەها (عبدالغفاری) فارسی کە خەطیبی نیشابور بوو، فەرموویەتی: دواڕۆژەکانی ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ فەرمودەکانی حەزرەتﷺ و دانیشتن لە خزمەت زانایانی ئەهلی حەدیسدا، وە خوێندنەوەی بەردەوامی هەر دوو صەحیحی بوخاری و موسلیم، کە هەردووکیان سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن [2].

(إبن الجَوزی) لە شێخ ئەحمەدی برایەوە چۆنیەتی وەفاتکردنی دەگێڕێتەوە و فەرموویەتی: کە ڕۆژی دوشەممە هاتە پێشەوە کاتی گزنگی بەرەبەیان بوو، براکەم (غەزالی) دەستنوێژی گرت و نوێژی بەیانی خوێند و فەرمووی:

ئادەی کفنەکەم بۆ بهێنن، کفنەکەیان بۆ هێنا و لێی وەرگرتن و ماچی کرد و داینا لە سەرچاوی و فەرموی: سَمعاً و طاعةً للدّخول على الملك! بەسەر چاو ئامادە باشم بۆ ئەوەی بچمە حزوری پادشای پادشایان، لە پاشان قاچەکانی ڕاکێشا و ڕوی کردە قیبلە و هەناسەی دایەوە و گیانی پیرۆزی سپارد و، چوو بۆ حزوری دلۆڤانی پەروەردگار. ڕۆژی وەفاتی دوشەممەبوو، چواردەی(جمادی الآخرة) ساڵی ٥٠٥ کۆچی،لە(طابران)بەخاك سپێردرا[3].خودای گەورە دەرەجاتی عالی بکات ئێمەش لە پەنای پیاوچاکانداحەشر بکات (آمین)

---

(١) طبقات الشافعية الكبري: ج/٤ ص/١١٢ .

(٢) تبيين كذب المفتري، ص/٣٩٦، طبقات الشافعية الكبري، ج/٤: ص/١٠٩ .

(٣) اتحاف السادة للمتقين/١/١١، نقلا عن كتاب الشباب عند الممات لابن الجوزي .

# بەرنامەی بەندە لە چۆنیەتی وەرگێڕانی ئیحیادا

خوێنەری بەڕێز! وەك لە سەرەتاوە باسم کرد، ئەم کتێبە پیرۆزە هەر چەندێك ئامادە باشی بۆ بکرێت هێشتا هەرکەمە. بە ئەندازەی پیت و وشەکانی لە هەموو لایەکی جیهانەوە گرنگی پێ دراوە، زۆرم بە لاوە پێویست بوو کە لە کوردوستانی خۆیشماندا بایەخی تەواوی پێ بدرێت و، زوتر ئەم کارە بکرایە و پێشکەش بە گەلی موسوڵمانپەروەری کورد بکرایە، کە صەدان ساڵە کوردوستان بووەتە ناوەندی دۆستانی خودا، لە هەمو جیهانەوە خەڵکی دەهاتن و هەوادارانی طەریقەت ڕێگای هات و نەهاتیان دەگرتە بەر، بۆ ئەوەی لەم وڵاتە پڕ لە خێر و بێرەی ئێمەدا بەهرەمەندی ڕێبازی تەصەووف بن، ئەگەر بۆ چەندین سەدە هاووڵاتیانی ئێمە لە ناوەندی هەڵاتنی خۆری ئیسلامەوە خۆیان سوودمەند کردبێت و زانست و ئایین وڕەوشت و بەهاپیرۆزەکانیان وەرگرتبێت، ئەوا سوپاس بۆ خودا صەدانساڵیشە ئەم خاکی کوردستانە ئەو ڕۆڵەگرنگەی لە میللەتانی چوار دەوری خۆی وەرگرتۆتەوە و. بووە بە میراتگری ڕاستەقینەی گەیاندنی ئیسلام، بە تایبەتی خاکی وڵاتەکەمان دەیان و صەدان ئەولیای خوداناسی پێگەیشتووی پێ گەیاند، کە هەر یەکەیان مەشخەڵێکی هەڵکراو و خێمەیەکی هەڵدراوبوون، بۆ تەواوی میللەتانی ئیسلامی، بوون بە سەرمەشقی ڕێگا و، ژیانی پڕ لە دینداری و ئاسودەییان بەو خەڵکە دەبەخشی و، بۆ جارێکی تر نووری ئیمانیان دەکردەوە بە دیاری، لە دڵی گڕگرتووی پڕ لە ئەوینی خوداپەرستییەوە، بۆ دەرونی تینووی پڕ لە چاوەنواڕی و تەماداری.

دەیان ئەولیای بەرزی وەك حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی خزمەتیان بە ئیسلام و موسوڵمانان دەکرد، زنجیرە خولەفا و مورشیدەکانی یەك لەدواییەکی ڕشتەی ئەم قوطبە گەورانە تا ئەم سەدەی بیست و یەکەمەیش هەر خزمەتیان بە ئیسلام کردووە، مەلایین موریدیان پەروەردە

کردووە.ڕێبازە پیرۆزەکانی طەریقەتی قادری و نەقشبەندی و ریفاعی و سوهرە وەردی و ڕێبازە دروستەکانیتریش لە ولاتی ئێمە دا پشکی شێریان هەبووە.

بۆیە خزمەت کردن بە ڕێبازی تەصەووف، گرنگی دانە بە ڕێبازی ئەولیا و خوداناسان، کە صەدان ساڵە ئەو چرۆی هیوایە لە کوردوستاندا گەشەی کردووە و نەکوژاوەتەوە، ئێستایش ئومێدمان زۆرە کە هەوادارانی طەریقەت خۆیان بە ڕێبازی تەصەووف زیاتر ئاشنا بکەنەوە، بۆ ئەوەی تەنها لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانی تەصەووفەوە ئەم ڕێبازە شیرینەیە وەربگرن.

کتێبی پیرۆزی ئیحیای ئیمامی غەزالیش سەرچاوەیەکی بە پێزی نەبێزراوی بە کەڵکی متمانە پێکراوە، کۆ دەنگی زانایانی بەڕێزی بڕواداری لەسەرە، کە پابەندییان بە عەقیدەی ئەشعەری هەیە و، مەشرەبیان هەڵێنجراوی طەریقە تە و مەزهەبیشیان پابەندییە بە یەکێك لەو چوار مەزهەبە پیرۆزەی ئیسلام، کە شوێن کەوتنی هەمو ڕێگە و ڕێچکەیەکی تر جگە لەو چوار مەزهەبە، هە-مووی باطیل و سەرگەردانییە و، دەبێ ئەهلی سوننەت و جەماعەت خۆیان لە نزیکیی ئەو کەسانەش بپارێزن کە لەو ڕێبازە دروستانە لایانداوە . بۆ خزمەتی ئەم کتێبە پیرۆزەش بە پەسەندم زانی هەموو بەرگێکی بە جیا کە وەریدە-گێڕمەوە سەر زوبانی شیرینی کوردی، ئەوا بیخەمە بەردەستی خوێنەرانی بە-ڕێزەوە،

**بە پێی ئەم بەرنامەی خوارەوە:**

**یەکەم:** لە بەر ئەوەی زۆر درێژ نەبێتەوە دەقە عەرەبیەکانم نە نووسیوەتەوە، بەڵکو تەنها بە کوردی ڕاڤەم کردوون و مەبەستەکانیم ڕوون کردۆتەوە.

**دوهەم:** هەموو فەرمودەکانی خودا(ﷻ) و پێغەمبەری خودا ﷺ لە میانی دوو کەوانەدا لەگەڵ ڕەچاو کردنی تایبەتمەندی خۆیان وەك خۆیان نووسیومنەتەوە و، لە پاشان لە میانی دوو کەوانەدا وەرگێرانەکەیانم لە خوار ئایەت و فەرموودەکانەوە نووسیوەتەوە .

**سێیەم**: ئەو فەرموودە و ئەخبارو ئەسەرە پیرۆزانەی کە تیایدا نووسراوە، مەگەر زۆر بە دەگمەن، ئەینا دەقەکانیانم نەنووسیوەتەوە، بەڵکو یەکسەر بە وەرگێڕراوی بڵاوم کردونەتەوە.

**چوارەم**: تەخریجی ئایەت و فەرموودەکانم کردووە. بۆ فەرموودەکانی حەزرەتیش ﷺ سوودم بینیوە لە هەمو ئەو سەرچاوانەی لە بەر دەستمدا بوون ، بە تایبەتی ئەو تەخریجانەی لە لایەن حافظی عێراقی کراوە، کە لە کتێبی (التخریج الکبیر)دا تۆماری کردووە. هەروەها سوودی تەواوەتیم بینیوە لە تەخریجەکانی حافظی زوبەیدی، کە بە ڕاستی زۆر خۆی ماندوو کردووە لە شوێن کەوتنی فەرموودەکانی پێغەمبەردا و دۆزینەوەی سەنەدەکانیان. بۆ خۆیشی زۆر وریاو شارەزا و زانا بووە لەو بوارەدا. هەروەها سوودم لە چەند چاپێکی نوێی ئیحیا وەرگرتووە کە لە پەراوێزەکاندا دەستنیشانم کردوون، ئەوەی پێویست بێت لە دیاری کردنی ڕاویی حەدیسەکان و سەنەدە جیاجیاکان، یان هاو وێنەکانیان ئەوا تۆمارم کردووە، چونکە زۆر لەو فەرمودانەی کە حافظی عێراقی فەرموویەتی: سەنەدەکەیم نەدۆزیوەتەوە، سوپاس بو خودا شێخی زوبەیدی یان لێکۆڵەرەوەکانی تر، بە دوا گەڕانی تەواویان بۆ کردووە و گەیاندویانەتەوە بە سەنەدی خۆی، ئەوەی بۆیان دەر کەوتبێت کە بە هێزە ئەوا بەیانیان کردووە ، یان لاوازە ئەوا دیاریان کردووە.

**پێنجەم**: سەرچاوەکان و تەخریجی فەرموودە و بەیانی سەنەدەکان هە-مووی بە زوبانی عەرەبی نووسیومنەتەوە، چونکە ئەوەی پێویستی بەو بابەتە هەبێت بۆ خۆیشی ئەوەندە عەرەبی دەزانێت کە سوودمەند ببێت لێیان.

**شەشەم**: هەندێك فەرموودەی پیرۆزی قورئان هەیە، کە بەشێکی ئایەتەکەی نووسیوە یان ئەمسەرە و سەری ئایەتەکەی گواستۆتەوە، بۆ زیاتر خزمەت کردن بە ئایەتەکە و ڕاڤەکردنیان بە کوردی، ئەگەر پێویست بووبێت

هەمویم نووسیوەتەوە و هێمایشم پێ کردووە .

**حەوتەم**: زۆر لەو بابەتانەی کە زاراوەی زانستین، یان زاراوەیەکی تەصەووفین و، پێویستیان بە شەرح و بە دوادا چوون هەبووە، ئەوا بە پەراوێزێکی تایبەتی واتاکەیانم ڕون کردۆتەوە، وە سوودم لە سەرچاوە تەصەووفیەکان وەرگرتووە، بە تایبەتی لە (إتحاف السادە المتقين) کە شەرحی ئیحیایە، کە بە ڕاستی لەم بوارەدا خزمەتێکی زۆر گرنگی بە شاکاری ئیحیا کردووە، خودا جەزای بە خێری بداتەوە.

**هەشتەم**: هەندێك لەو بابەتانەی کە پێویستی بە باس کردنی زیاتر بوبێت ئەوا لە میانی دوو کەوانی تایبەتیدادامناوە ئەو زیادە نووسینانەم خستۆتە پاڵ وەرگێڕانەکەی ئیحیا، بۆ ئەوەی بابەتەکە دەوڵەمەندتر ببێت.

**نۆیەم**: هەندێك وشەی عەرەبی هەیە چەندین واتایان هەیە، یان چەندین وشەی کوردی بەرامبەر وشەیەکی عەرەبی هەیە، ئەوا بۆ زیادە ڕونکردنەوە جاری وا هەیە دوو وشەی کوردیم نووسیوە، یان بە وشەیەکی کوردی و عەرەبی ڕاڤەیم کردووە، بۆ ئەوەی ئاسانتر واتاکەی ئاشکرا ببێت.

**دەیەم**: زۆربەی ئەو زاراوە شەرعی و فیقهی و تەصەووفیانەی کە لەنێوە ندی ئیحیادا هاتووە، ئەوا هەوڵم داوە وەك خۆیان بیان نووسمەوە، چونکە زاراوەیەکی تەصەووفی ئەگەر هەموو جارێك تەرجەمەی بکرێت، دەبێ چەند دێڕێکی لەسەر بڕوێت، تا واتاکەی خۆی ئاشکرا دەکەیت، هەر بەو شێوەش ئاسانترە کە خوێنەری بەڕێز لە زاراوە تەصەووفی و فیقهیەکانیش شارەزا ببێت.

**یازدە** : بۆزیاتر خزمەت کردن بەم کتێبە پیرۆزە لەناوەرۆکی باسەکانی ئیمامی غەزالییوە سەرباسی نوێم بۆ داناوە تا ئاسانترو مەبەستەکان ڕونترین.

**دوازدە**: هەوڵیشم داوەشیعرە عەرەبیەکان وەرگێڕم بە شیعری کوردی.

خوێنەری بەڕێز: پشت بەخودا ئەوەی لەمەولا دەیخوێنێتەوە وەرگێڕراوی فەرمودەکانی ئیمامی غەزالی یە، خودا پشت و پەنامان بێت:

بسم الله الرحمن الرحيم

و به نستعين

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

داوای کۆمەکی تەنها لە خودا دەکەین

پیشەوای ناوداری کەم وێنە، جێگای شانازی پێشەواکان

(*حجة الأسلام و المسلين*)

موحەمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی موحەمەدی غەزالی

بەناوبانگە بە

# ئیمامی غەزالی

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی دانەر (ئیمامی غەزالی)

**سەرەتا** حەمدو سەنای بەردەوام و بێ کۆتا، بۆ خودای گەورەو باڵادەست، هەرچەندە ستایشی هەمو ستایشکاران لاوازو کەم دەنوێنێت لە بەرامبەر شایستەیی و شکۆمەندی ئەو زاتە پیرۆزو گەورەیەدا.

**دوهەمجار**: صەلات و سەلامی بێ پایان لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری خودا، کەلەپاڵ ئەو گەورە سەردارەدا هەمو پێغەمبەرانیش بگرێتەوە.

**سێیەم جار** داوام لە خودایە کە دڵم یەکلاو ساغ بکاتەوە و یارمەتیم بدات، لە سەر ئەوەی بڕیارم داوە کە کتێبێك بنوسم بەمەبەستی ژیانەوەی زانستە ئاینیەکان، بە ناوی ((إحياء علوم الدين)).

**ئامانجی چوارەمیشم ئەمەیە**: کە ڕێگای سەر سوڕمانت لێ ببڕمەوە، ئەی لۆمەکەری گۆشەگیر؛ کە هەمو سنوورێکت بەزاندووەو دەشتەوێت ڕاستیەکان پەردەپۆش بکەیت و، زوبانی زبرو ڕەخنە بە هەمو لایەکدا وەگەڕخەیت و، خۆیشت لە ڕیزبەندی یەکەمی بێ ئاگاو خۆ پەسەندو مونکیراندا بمێنیتەوە.

ئەوا گرێ و کۆڵی بێ دەنگی لە سەر زوبانم لادراو کرایەوە، گەردن لەغی وشەسازی و ڕەوانبێژی گەمارۆی زوبانیان دام و ناچاریان کرد کە لێت بێتە دەنگ، لەبەرامبەر ئەوەی کە تۆ خۆت بۆ ئەوە ساغ کردۆتەوە کە چاو لە حەنای ڕاستیەکاندا دابخەیت و زوبانیشت وەگەڕخەیت بۆ سەرخستنی کاری پوچ و ناڕەوا. چونکە دەتەوێت پەردەی جوانکاری بهێنیت بەسەر نەزانینداو، ئاڵۆزییەك دروست بکەیت بەرامبەر ئەوانەی کە دەیانەوێت کەمێك ڕێو شوێنە تایبەتیەکان ببەزێنن، وە لە حاڵەتە ڕووکەشیەکان خۆیان دەربازبکەن و هەنگاوەکانیان بەرەو زانست و زانیاری ببەن ، بە هیوای گەیشتن بە ئاستی بەندایەتی ڕاستەقینە، بە پاڵفتەکردنی نەفس و هەوڵدانی چاکسازی وپاکسازی

له دڵ و دەروونـدا. تا هەرنا هەندێك لەو تەمەنە بەفیرۆ لەدەست دراوانە قەرەبوو بکرێنەوە و نەکەوینە بەر شەپۆل و ناو شەپۆلی ئەو لادراوانەی کە خاوەنی شەریعەت دەربارەیان فەرموویەتی:

**( أَشدُّ النّاسِ عذاباً يومَ القِيامةِ عالِمٌ لَم يَنفَعهُ اللهُ سُبحانهُ بِعلمه )**[1].

(واتە: ئەوەی لە هەموان زیاتر و توندتر لە دوا ڕۆژدا سزای دەدرێت: زانایەکە خودا سوودمەندی نەکردبێت بەو زانستەی کە پێی بەخشیوە)

سوێندبێ! هیچ هۆکارێك نییە کە دوچاری ئینکاریی کردویت، جگە لەو دەردە کوشندەی کە هەموانی گرتۆتەوە، بەڵکو تێکڕای جەماوەریشی بەلاڕێدا بردووە، کە کەمتەرخەمییان هەیە بەرامبەر فرمانە پڕ بایەخ و لوتکەکان، وە نازانن کە ئەمە یەکجار ترسناکەو بابەتێکی زۆر گرنگ و هەستیارە.

واکە دەبینین ئاخیرەت ڕووی لێ کردون و دونیاش پشتی تێکردوون! وادەی مردن نزیکەو سەفەرێکی دوور و گرانیشمان لە پێشە، توێشویەکی کەم و مەترسییەکی گەورە، ڕێگاکان بەربەستە و گیراوەو، کارو کردەوەکانیش وەرناگیرێن، چونکە مەبەستیان پێی بۆ ڕەزامەندی خودا نەبووە، بۆیە لە لایەن چاودێری بیناو شارەزاوە دەدرێتەوە بە سەریاندا.

گرتنەبەری ڕێگای دوارۆژیش بەبێ دەسگیرو ڕێپیشاندەر، وە بەبێ هاوڕێی ڕاستەقینە زۆر سەخت و ئەستەمە، لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و تەگـــەرەو دژوارییەی کە لەرێدایە. کەواتە میرات گری پێغەمبەران زاناکانن، کە ڕێپیشاندەری ڕێگان، خەریکە دونیاش لێیان خاڵی دەبێتەوە، هەندێکی کاراو شارەزا ماون، ئەینا زۆربەیان شەیتان هەوڵی داوە بەلاڕێیاندا ببات، ڕێگای

---

(١) رواه الطبراني في (الصغير) (١/ ١٨٢) والقضاعي في (مسند الشهاب) (١١٢٢)، والبيهقي في (الشعب ) (١١٦٢).

دونیای لاشیرین کردوون،وە دوچاری یاخی بوونی کردوون، هەریەکەیان ئەودالّی وەدەستهێنانی بەشە دونیای خۆیەتی، ڕەوا بەناڕەوا دەبینێت و، ناڕەواش بە ڕەوای دێتە بەرچاو، تاوای لێ هاتووە، زانستی دینی خەریکە دەپێچرێتەوەو، ڕێگای مەشخەلانی نووری ڕێنومایش بەرەوکزی و کوێربوونەوە دەڕوات.

ئەوانە وایان خستۆتە هزرو مێشکی خۆیان و خەڵکیشەوە، کە زانست بریتییە لەو فەتوادانەی بەهۆی ڕوداوە تازەو پەیدابووەکانەوە دراوەو نوسراونەتەوە، کە قازی شەرعی چارەسەری کێشەو گرفتەکانی پێ بکات. ئەوکاتەی کە خەڵکە نەفام و گێرە شێوێنەکان بەرئەبنە یەکتری، یان توانای ڕوبەڕوبونەوەو دەمە دەمێیان بۆ پەیدا دەبێت، کە بەدوای زاڵبون و شۆرەت و ناوبانگ دا دەگەڕێن، بەمەبەستی بۆڕدان و بێ دەنگ کردنی بەرامبەرەکانیان.

یان وا دەزانن زانست تەنها بریتییە لەو کێش و سەرەواو وشە ئارایییەی کە واعیزێك فێڵ لە نەخوێندەوارەکان دەکات و بۆ لای خۆیان ڕادەکێشێت، کە بەڕاستی جگە لەم سیانە، ڕێگەیەکی تریان نەبینیوەتەوە ڕاوە حەرامی پێ بکرێت، وەك تۆڕێکی ڕاخراو پۆخڵەواتی دونیای پێ کۆبکرێتەوە. بەڵام زانستی بە سوود و ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای دواڕۆژ، کە سەلەفی صالحی لە سەر بوون و خودای گەورەش بە ناوو نازناوی فیقهو تێگەیشتن و پەندیاری و حیکمەت و زانین و تیشک و نورو ڕۆشنایی و ڕێنومایی و ڕوشد و ئیستیقامەت ناوی بردووە، ئەوا لە ناو خەڵکی دا پێچراونەتەوە و، ئەوەندە بێ بایەخ سەیریان دەکرێت، وەك ئەوەی بەتەواوی لە بیرکرابن.

بەڕاستی ئەمەش درزو کەلێنێکی لە دین دا دروست کردووە، فرمانێکی سەخت و گەورەیە کەوەك تاریکی باڵی کێشاوە بەسەر هەمواندا، بۆیە نوسینەوەی ئەم پەرتوکەم بەلاوە گرنگ بوو، بەناوی ژیاندنەوە ی زانستە ئاینیەکان، کە پەیام و پەیڕەوی پێشەوایان ئاشکرا بکات و، ڕونکردوەیەکێش

بێت بۆ دیاری کردنی زانستە سوود بەخشەکان بەلای پێغەمبەران و پێشینە خوداناس و صاڵحەکانەوە، سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت بە تێکرایی.
بۆیە بنەمای ئەم کتێبە لەسەر چوار پایە و بناغەی سەرەکی دامەزراوە:

کە بریتین لە: پایەکانی بەندایەتی و، عادات و نەریتەکان و، ئافەتە کوشندکان و،پایە رزگار کەرو سەرفرازییەکان.

وەلەدەستپێکی هەموویاندا باسی پەراوی زانین و زاستم کردووە، چونکە کۆ ئامانجی گرنگی هەموو بابەتەکانە، بۆ ئەوەی هەر لەسەرەتاوە ئەو زانستە ئاشکرا بکەم کە خودای گەورە بە پێویستی داناوە کە هەموو کەسە دیاریکراوەکانی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ)بەدوایدا بگەرێن و پێغەمبەریش(ﷺ) بە زوبانی خۆی فەرموویەتی «**أطلُبوا العِلمَ ولَو بالصِّين**»[1] واتە:

(هەموو موسوڵمانێ فەرزە لە سەری بەدوای زانستدا بگەرێت و فێری ببێت بالە وڵاتێکی دووری وەك چین یش بێت.)

وە بۆ ئەوەی زانستە بە سوودەکانیش جیا بکەمەوە لە زیانبەخشەکان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(( **أعوذُ بالله مِن عِلمٍ لاينفع**))[2] واتە:

(پەنا ئەگرم بە خودا لە زانستێك سوودی نەبێت).

بۆ ئەوەی بشتوانم زیاتر بکۆڵمەوە لەوانەی کە بەدوای روکەش و رواڵەت و سەرابدا دەگەرێن و، وازیان هێناوە لە گەران بەدوای ناخ و ناوەرۆك و پوختەی زانستی دا، کە خۆیان فریوداوە بە توێکڵێ زانستەوەو، وازیان لە کاکڵەو ناوەرۆکەکەی هێناوە.

---

(١) رواه ابن الماجة(٢٢٤)

(٢) مسلم(٢٧٢٢)

## باسی چواریەکی عیبادەت
## کە دە پەڕوای سەربەخۆ دەگرێتەوە

کتێبەکانی: زانست، بنەماکانی بیروباوەڕ، نهێنیەکانی پاکوخاوێنی، نهێنیەکانی نوێژکردن، نهێنیەکانی زەکاتدان، کتێبی نهێنیەکانی بەڕۆژووبوون، نهێنیەکانی حەجی ماڵی خودا، چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، کتێبی زیکرو نزاکان، کتێبی ویردو پاڕانەوەکان لە کاتی جیاجیادا.

## باسی چواریەکی نەریت و عادەتەکان
## کە دە کتێبی سەربەخۆیە

وەك کتێبەکانی:چۆنیەتی خواردن، ئادابی نیکاح و مارەبڕین، ئەحکامی کەسابەت، باسی حەرام و حەڵاڵ. ئادابی صوحبەت و پێکەوە ژیان لەگەڵ چین و توێژەکانی خەڵیکدا، کتێبی خەڵوەت و گۆشەگیری، ئادابی گەشت و سەفەر، باسی بیستن و وەجدو گوێ گرتن. فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە، ئادابی ژیان و گوزەران و ڕەوشتی پێغەمبەران.

## باسی چواریەکی مەترسی و ئافەتە کوشندەکان
## ئەمەش دە کتێب دەگرێتەوە

وەك کتێبەکانی: ڕاڤەو نهێنییە سەر سوڕهێنەرەکانی دڵ، ڕاهێنان و ڕیازەتی نەفس و ئادابەکانی، مەترسیەکانی هەوەس و ئارەزواتی نەفسی و جینسی، مەترسی و ئافاتەکانی زوبان، زیانەکانی توڕەیی و غەرەزو کینەو ئیرەیی، خراپە و ئافاتی دونیاویستی، سەرکۆنەکردنی ماڵ و سامان، بەخالەت و چاوچنۆکی، خراپەی لە خۆبایی بوون و سەرکەشی.

## باسی چواریەکی پایە ڕزگارکەرو سەرفرازیەکان

کە ئەمەش لە دە کتێبدا خۆی دەبینێتەوە، وەك کتێبەکانی:

تەوبەو پاشگەزبوونەوە، خۆڕاگری و شوکرانەبژێری و سوپاس گوزاری ، پلەکانی خەوف و ڕەجا (ترس و بیم بەهیوابوون)، باسەکانی هەژار دۆستی و دونیا نەویستی، یەکتاپەرستی و پشت بەستن بەخودا، خۆشەویستی و کامگاری و شەوق و تاسەو ئونس و پلەکانی ڕەزامەندی، بابەتی نییەت و ئیخلاص و ڕاستگۆیی، چۆنیەتی حاڵەتی موراقەبەو چاودێری کردەوەکان و لێپێچینەوەیان، هەروەها کتێبەکانی بیرکردنەوەو یادکردنەوەی مردن.

لە درێژی باسی چواریەکی عیبادەتدا، باس لە ئادابە شاراوەکانی دەکەم، لەگەڵ وردەکاری سونەتەکانی، وە نهێنی واتا و مەبەستەکانی، کە زانایان ناچارن و پێویستە بە باشی لێیان شارەزا ببن ئەگەر بیانەوێت کار بە زانستەکەیان بکەن.

وە ئەگەر بە وردی نەیانخوێننەوە ئەوا لەڕیزی زانایانی ئاخیرەت ئەژمار ناکرێن، چونکە ئەم بابەتە گرنگانە لە کتێبە فیقهییەکاندا بایەخیان پێ نەدراوە.

## دەربارەی چواریەکی عادات و نەریتەکان:

باسی نهێنیەکانی ئەو کڕین و فرۆشتنە دەکەم کە لەمیانی خەڵکی دا ڕوودەدات، هەروەها وردەکاری و سوننەتەکانی، وە زیاتر ڕۆچوون لە ناو بازاڕی سەوداگەری و شاراوەیی بابەتی خۆپاراستن و خۆپارێزی لە هێڵ و لق و پۆکانی دا. کە شك نابەم هیچ کەسێکی بڕوادار هەبێت و پێوسیتی پێیان نەبێت.

## وە چواریەکی ئافەتە کوشندەکانیش

بە باس کردنی هەموو ئاکارە ناجۆر و نەشیاوەکان دەوڵەمەند دەکەم، کە لە قورئاندا فرمانمانپێدراوە دوور بخرێنەوەو مرۆڤەکان نەفسی خۆیانی لێ

پوختەو خاوێن بکەنەوە، وە دڵیان پاك بکەنەوە، وە بە درێژیش باسی تاریف و پێناسەو هەقیقەتی ئەو دەردە کوشندانەدەکەم، کە چۆن دروست بوون و سەریان هەڵداوە، وە چەندەها ئافەت و نەهامەتی بەدوای خۆیاندا دێنن و بەچی بیانناسین و لێیان شارەزا ببین و، ڕێکاری چارەسەری و خۆ لێ دەربازکردنیان بگرینە بەر، بەپێی بەڵگەی ئایەت و فەرموودە و ئاسارو ئەخباری دروستی پسپۆڕانی ئەو مەیدانە.

## وە چواریەکی پایە ڕزگارکەرەکان:

باسی هەموو ڕەوشتە شیاوو پەسندەکان دەکەم، وەئەو خەصڵەت و چاکانەی ڕاستگۆیان و نزدیکانی ڕێگای خوداناسی لێی بەهرەداربوون، وە بەهۆیانەوە گەیشتوون بە دەرگای پەروەردگار، لەگەڵ باسکردنی یەکە یەکەی تاریف و حەقیقەت و پێناسەکان، وە بەچی دەبیتە خاوەنی ئەو کار و ڕەوشتە بەرزانە، وە چۆن لەبەرهەمەکانی بەهرەوەر دەبیت، بەچیدا دەیانناسیتەوە، ئەبێ چ گەورەیی و پیرۆزییەکی تێدابێت کە ئەوەندە حەزو مەیلی خوداناسانی لەسەرە ؟!

لەگەڵ باس کردنی بەڵگەی شەرعی و عەقڵی و وتەی حەکیم و پەندیاران کە زیاتر ڕونیان بکەینەوە. هەرچەندە لەم باس و خواسانەی کە باسمان کردن، هەندێك نوسراوو کتێب دانراون[1]

---

(١) وەك کتێبەکانی (قوت القلوب) ی ئەبو طالیبی مەککی وە (الرعاية)ی ئیمامی موحاسیبی و (منازل السائرين) و.( الرسالة) و ( التعريف ) و زۆرێکی تر بنوارە: إتحاف السادة المتقين بشرح إحياء علوم الدين(١/٦)

**بەڵام ئەم کتێبەی ئێمە بە پێنج خەصڵەتی تایبەتی لەوان جودا دەبێتەوە:**

**یەکەم:** ڕاڤەو شیتەڵ کردنەوەی بابەتە گرانەکان و باس کردنی ئەو بابەتانەی شاردویاننەتەوە یان بە کورتی باسیان کردوون.

**دووهەم:** یەکخستنی بابەتەکان کە لێرە و لەوێ باسیان کراوە، وە ڕێکخستنەوەی بابەتە جیاجیاکان .

**سێیەم:** ئەو بابەتانەی زۆر بە درێژی باسیان لێوەکراوە کورت کراونەتەوە

**چوارەم:** سڕینەوەی دووبارەکان و جێگیرکردنی نوسراوە بەپێزەکان

**پێنجەم:** لیکۆڵینەوەو توێژینەوەی زیاتر لە بارەی چەندین بابەتی شاراوە، کە بەئاسانی لێیان تێناگەیت و، ئەو کتێبانەش دوور و نزیك نەچوون بەلایاندا. هەرچەندە هەموو توێژەرەکان لەسەرپەك پەیڕەوو بەرنامە ڕۆیشتوون، بەڵام ئاساییە کە هەریەکەیان گرنگی و بایەخی بەبابەتێک زیاتر دابێت، کە سالیکانی ڕێگای خوداناسی لەسەری بن و، ڕەنگە هاوڕێبازەکانیان کەمتر بایەخیان بە باسکردنی دابێت، یان لێی ئاگاداربووبن، بەڵام بیریان چووە باسی بکەن، یان هۆکارێکی تایبەتی ڕێگەی نەداون کە لێیان بدوێن.

کەواتە ئەمە تایبەتمەندیەکانی ئەم کتێبەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو زانستە بە پێزانە دەگرێتەوە.

*****************

**وە دوو هۆکاری تایبەتی هانی دام کە ئەم کتێبە بکەم بە چوار بەشەوە:-**

**یەکەمیان: هۆکارێکی سەرەکییە:**

کە ئەم ڕێکخستن و یەکخستنی بابەتانە لە لێکۆڵینەوەدا بۆ لێ تێگەیشتن زۆر گرنگ و پێویستن. چونکە ئەو زانستەی کە بەرەو ئاخیرەتت ببات ئەوا دەکرێت بەدوو بەشەوە:

## زانستی موعامەلات ... وە زانستی موکاشەفە

مەبەستم لە **زانستی موکاشەفە** ئەوەیە: کە بەهۆیەوە زانیاریەکانی پێ دەردەکەوێت ، و نەزانراوەکانیشی پێ ئاشکرا دەبێت.

وەمەبەستیشم لە **زانستی موعامەلە** ئەوەیە:

کەلەگەڵ ئاشکرا کردنی زانیاریەکان کاریشیان پێ بکرێت و جێ بەجی بکرێن. وەمەبەستیشم لەم کتێبە تەنها بایەخدانە بە زانستی موعامەلەو هەڵسوکەوتەکان کە کار بە زانستەکان بکرێت، چونکە زانستی ئاشکراکردنی نهێنیەکان واتە:(عیلمی موکاشەفە) ڕێگەمان پێ نەدراوە بیخەینە دوو توێی پەڕاوەکانەوە، هەرچەندە دەبێت ئەوەش بزانین:

کە ئامانجی سەرەکی ئەوانەی بە دوای زانستدا دەگەڕێن و تەماحیان ئەوەیە بکەونە بەر نەزەری صددیق و ڕاستگۆیانی دەرگای خوداناسی، وەزیاتر مەبەستیانە لە زانستی عیلمی موکاشەفە حاڵی بوونە لە نهێنی و شاراوەکان.

وە زانستی کردارو موعامەلەو هەڵس و کەوتەکان دەروازەیەکە بۆ گەیشتن بە(عیلمی موکاشەفە)، ئەوەندە هەیە پێغیمبەرانیش(صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر)تەنها لە بارەی زانستی ڕێگاو ڕێنومایی و هەڵسوکەوتی ژیانەوە لەگەڵ خەڵکیدا دواون و بۆیان ڕوونکردونەتەوە.

وەبابەتی زانستی موکاشەفەو پەردەلادان لەسەر نهێنیەکان، تەنها بەشێوەی ڕەمز و هێما و نمونە هێنانەوە وە بەکورتی بۆی چوون و باسیان لێوەکردووە.

چونکە دەزانن تێکڕای خەڵکەکە توانای وەرگرتنی ئەو بابەتە گرنگانەیان نییە، وە لە ئاستی هەڵگرتنی ئەو بارگرانیەدا نین، زاناکانیش میرات گرەوەی پێغەمبەرانن، نابێت لە ڕێگاو ڕێسای پێغەمبەرەکان لابدەن، بەڵکو تەنها دەبێ ڕێچکەو ڕێبازی ئەوان بگرنە بەر و شوێن ئەوان بکەون.

لەپاشان ئەوەی پێویستە بیزانین: زانستی موعامەلە وکارە دیارو ئاشکراکان

دەکرێن بە دوو بە **زانستی ظاهیرو(ئاشکرا)**، واتە: عیلم و ئاگـاداریت هەبێت بەو کارانەی کە بەکۆ ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێن.

**وە زانستی باطین و(شاراوە):-**

کە شارەزابوون و زانینی ئەو کردارانەیە کە پەیوەندییان بە دڵەوە هەیە، ئەوەش کە بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێن:

یان عیبادەتە یان عادەت و کردارە ئاساییەکانە. ئەوەیش کە دێتە ناو دڵەوە، چونکە هەست و حاسسە هەستیارەکانی مرۆڤ لێیان بێ ئاگایە، ئەوە لە جیهانی مەلەکوتی[1] ئەژمار دەکرێت. ئەویش یان پەسەند کراوە یان زەمکراوو ناپەسەندە، کەواتە بەپێی پێویست ئەم زانستە بووە بە دوو بەشەوە:

**ظاهیر و باطن ، بەشە زاهیرەکەی**؛ پەیوەنداره بە ئەندامەکانی لەشەوە، بەشەکانی عیبادەت و عادەت و نەریتەکانی لێ دەکەوێتەوە.

**وەبەشە باطینەکەشی**؛ پەیوەنداره بە ئەحواڵی دڵ و ئاکارو ڕەوشتی نەفسەوە، ئەمیش بەشی پەسەندو ناپەسەندو زەمکراوی لێ دەکەوێتەوە.

کەواتە هەموویان دەبن بە چوار بەشەوە، وە زانستی موعامەلە لەم چوار بەشە بەدەر نییە و زیادیش ناکات.

## هۆکاری دووەم:

من دەبینم حەزو ئارەزووی ئەوانەی کە بەدوای زانستی فیقهو شەریعەتدا دەگەڕێن، تەنانەت ئەوانەش کە لە خودا ناترسن و دەیانەوێت پۆشاکی زانست لەبەر بکەن و خۆیانی پێوە هەڵبکێشن و لە پاڵیدا بمێننەوەو کێ بڕکێی تایبەتی پێوە بکەن، بە هۆی ئەوەی زانستی( فیقه) کراوە بە چوار بەشەوە، حاڵی

---

(١) **عالەمی مەلەکووت**: جیهانە غەیب و نادیارەکانە، کە تایبەتە بە جیهانی ڕۆحیانەتی نەفسـ کانەوە واتا (جێگای گیانە پیرۆزەکان): فەرهەنگی مەردۆخ ب ٢ ماددەی مەلەکووت.

ئەوانەیشی چاك كردووە، چونكە ئەوەی بەرگی خۆشەویستێك بپۆشێت خۆیشی پێوە خۆشەویست دەبێت. منیش بەدوورم نەزانی كەوێنەكێشیی ئەم كتێبەم لەسەر شێوەی كتێبە فیقهیەكان بێت، تازیاتر دڵەكان ڕابكێشێت و كاریگەریی لە سەریان هەبێت.

هەروەك دەبینن: ئەوانەی ویستویانە دڵی سەركردەكان ڕابكێشن بەلای (عیلمی پزیشكی دا) زانین و نوسراوەكانیان لەسەر شێوەی رۆژنامەو ئەستێرەناسی و بەپێی بابەت و ژمێریاری داناوەو ناویان ناوە (( رۆژنامەی تەندروستی))[1] بۆ ئەوەی ئالودەیی و مەیلی دڵیان بەلای ئەو بابەتەوە ڕابكێشێن وە مەیلیان بچێتە سەر متالاكردنی كتێبەكان و، دڵیشیان دابێت بە ناوەرۆكی(عیلمی طەبابەت) لە دوو توێی كتێبەكاندا، كە ڕاهێنانی دڵە لە سەر ڕاكێشانی بۆ لای عیلمەكە، كە ژیانی جاویدانی و هەتاهەتایی بۆ دابین دەكات، ئایا ئەوە گرنگتر نییە لە ڕاكێشانی دڵ بۆ( زانستی پزیشكی)، كەتەنها بۆ تەندروستی لەشولار كەڵكی لێ دەبینێت.

كەواتە: بەرهەمی ئەم زانستەیە: چارەسەرو دەواكردنی دەردی دڵ و رۆحەكانە، بۆ ئەوەی پێی بگاتە ژیانێكی نەبڕاوەی هەتاهەتایی ، ئەمە لە كوێ بەراورد دەكرێت لەگەڵ زانستی پزیشكەوانیدا، كە ڕوبەڕوی فەسادو تێك چوون دەبێتەوە و دوای ماوەیەكی كورت ئیتر دەپێچرێتەوە.

داوامان لە خودایە كە ڕینوماو یارمەتی دەرمان بێت بۆ گرتنە بەری ڕێگەی ڕاستی و دامەزراوەیی و پێگەیشتنی تەواو، چونكە هەر خۆی بەخشندەو دەستكراوەو میهرەبانە.

---

(١) وەك كتێبەكانی (مختار بن حسن) و (إبن جزلة و إبن بیطار)، كە ناوی كتێبەكانیان ناوە (( تقویم الصحة)) بنوارە إتحاف(٦/١).

# پەڕاوی زانست (کیتابی عیلم)

پەڕاوی یەکەم لە چواریەکی بەشی عیبادەتەکان لە کتێبەکانی ناو ئیحیا علومی دین (ژیانەوەی زانستە ئاینیەکان)

## بابەتی یەکەم

## زانست و زانیاری

ئەم بابەتە حەوت بەش لە خۆ دەگرێت:

**بەشی یەکەم**: باسی گەورەیی زانست و فێربوون و فێرکردن.

**بەشی دووەم**: ڕونکردنەوەی(فەرزی عەین) کە پێویستە لە سەر هەموو کەسێك ئەنجامی بدات. وە(فەرزی کیفایە) کە هەندێك بیزانن لە سەر ئەوانی تر دەکەوێت و لادەچێت. وەڕوون کردنەوەی تاریف و پێناسەی فیقهی و کەلام لە زانستە ئاینیەکان، وە بەیانکردنی زانستی پەیوەندار بە دونیا و بە دوا رۆژەوە.

**بەشی سێیەم**: باسکردنی ئەو عیلمانەی کە تێکڕای خەڵکەکە بە (علومی دینی)یان ئەژمار دەکەن و وایش نییە، هەروەها لەم بەشەدا باسی ڕەگەزی ئەو عیلمانە دەکرێت کە زەمکراون و ناپەسەندن

**بەشی چوارەم**: ئافەتی موجادەلەو شەڕەقسەو قسەبەزۆراندان و، هۆکاری خەریك بوونی خەڵکی بە بابەتی خیلافی و دەمەدەمێ کردنەوە.

**بەشی پێنجەم**: بەشی ئادابی مامۆستای فێرکەر و قوتابی فێرخواز

**بەشی شەشەم**:

ئەو ئافەتانەی کە ڕو لە زانست و زانایان دەکەن، وە باس کردنی نیشانە جیاکرەوەکان لە میانی زانای دونیاویست و زانای ئاخیرەتی دا.

**بەشی حەوتەم**: باسی گەورەیی ئەقڵ و بەشەکانی، لەگەڵ باسکردنی ئەو فەرموودەو هەواڵ و ئەخبارانەی لەسەری هاتووە.

# بەشی یەکەم

## گەورەیی
## زانست و زانیاری و فێرکردن
## وفێربوون و
## باسی بەڵگە نەقلّیەکان
## (قورئان و سوننەت و
## ئەخبار و ئاسارەکان )
## وە باسی بەڵگە ئەقلّیەکانیش

# بەشی یەکەم:

گەورەیی زانست و زانیاری و فێرکردن وفێربوون و، باسی بەڵگە نەقڵیەکان(قورئان و سوننەت و ئەخبار و ئاسارەکان ) وە باسی بەڵگە ئەقڵیەکانیش

## گەورەیی زانست

بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆزەوە: خودای گەورە ﷻ فەرمووبەتی

﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ آل عمران/ ٨﴾

واتە ( خودا بۆ خۆی ئاگادارە و فریشتەکانی ئەویش و زانایانی بە ئینصافیش باش دەزانن، کە هیچ کەسێك غەیرەز (جگە لە)خودا شایەنی پەرستن نی یە)[١]

بنوارە چۆن پەروەردگار بەشەهادەتی خۆی دەستی پێ کردووە، دووهەم جار بەشایەتی دانی فریشتەکان، جاری سێیەم بەخاوەن زانستەکان، کە ئەمە بۆ خۆی شەرەفمەندییەکی گەورەیە بۆ ئەهلی زانست و نیشانەی بەهاو پیرۆزی و پێشەنگیی زانایانە.

وە خودای گەورە ﷻ فەرمووبەتی:

﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ. المجادلة/ ١١﴾

واتە: (ئەوانەی خاوەن باوەڕو خاوەن زانستن، خودا بەچەندین پلە بەرزیان دەکاتەوە)[٢]ئیبن و عباس(خودایان لێ ڕازی بێت)

---

(١) قورئانی پیرۆز وەرگێڕانی مامۆستا هەژار شەرەفکەندی ل ٥٢،چاپی یەکەم،چاپخانەی آسوە.

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی ل(٥٤٣) مەلا عبدالکریمی مودەریس. چاپی یەکەم. ناوەندی ڕاگەیاندی ئارا.

فەرموویەتی: پلەو پایەی زاناکان حەوصەد پلە لەسەرو باوەڕدارەکانەوەیە، نێوانی هەر پلەیەك تا ئەوی تر ڕێگەی پێنج سەد ساڵە.[1]

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ** الزمر/٩﴾

واتە:( پێیان بڵێ ئاخۆ زاناو نەزانەکان بەرامبەرن؟ هەر ئەوانن بەدڵ زیندوون و دەتوانن بیربکەنەوە.)[2]

وە خودا ﷻ فەرموویەتی: ﴿**إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ.** فاطر/٢٨﴾

واتە: ( لە ناو بەندەکانی خودادا، هەر زانایان لەخودا دەترسن، چونکە ئەوان باش شارەزای کاروکردەوەی خودان و پەی بەگەورەیی خودا دەبەن)[3]

[ ئەبوو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە، لە بارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: ئەوەی لە خودا نەترسێ زانا نییە، نابینی حەزرەتی داوود(علیه السلام) ڕوی لە خودا کرد و فەرمووی: تۆ زانستت بەوە لێکداوەتەوە، کە لەتۆ بترسن، ئەوەی لە تۆ نەترسێ واتە: زانا نییەو نەزانە ][4]

وە فەرموودەی خودا ﷻ:

﴿**قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ** الرعد/٤٣ ﴾

واتە: ( خودا بەسە بۆ شاهیدی لە نێوان من و نێوەدا و ئەو کەسەش کە بە ئیعجازو گەورەیی و پایەبەرزی قورئان دەزانێت.)[5]

وە خودا فەرموویەتی:

---

(١) بنوارە: قوت القلوب ی ئەبوطالبی مەککی (١٣٩/١)

(٢) قورئانی پیرۆز. مامۆستا هەژار ل (٤٥٩)

(٣) خولاصەی تەفسیری نامی ل(٤٣٧).

(٤) بنوارە: قوت القلوب ی ئەبوطالیبی مەککی ل: ٢٤٧ بەرگی یەکەم.

(٥) بنوارە: خوڵاصەی تەفسیری نامی ل/٢٥٥

﴿ قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ النمل/ ٤٠ ﴾
واتە: ( ئەوەی زانیاری نهێنیەکانی (لوح المحفوظ)ی هەبوو، فەرمووی: من لە چاو تروکانێکدا ئەیهێنمە بەردەستت.)[١]
وە خودا ﷻ فەرموویەتی:
﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا القصص/٨٠﴾

واتە: (ئەوانەش کە ئەیانزانی خودا لەو دونیا چی بۆ پیاوچاکان و خاوەن بڕواکان داناوە، ووتیان: هەی بەدبەختینە! پاداشتی چاکی خودا چاکترە بۆ کەسێك باوەڕی بەخوداهەبێ و کرداری چاك بێت) کەواتە ڕوونی کردۆتەوە، کە بە عیلم و زانست گەورەیی و قەدرگرانی قیامەت دەزانرێت.
وە خوداﷻ فەرموویەتی:
﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ العنكبوت/٤٣﴾
واتە: (پیاوە زاناکان لەو نمونانەی دەیهێنینەوە و لێی ورد دەبنەوە ئەوانە لێی حاڵی دەبن.)
وە خودا فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ النساء/٨٣﴾
واتە:

( ئەگەر دەنگ و باسێکیان بیست هەروا بڵاوی دەکەنەوە، بەڵکو با بیگێڕنەوە لای پێغەمبەر و لای کاربەدەست و تێگەیشتوانیان.)[٢]کەواتە خودای گەورە لە بەرامبەر ڕووداوەکاندا ، هەڵێنجانی ئەحکامی داوەتە دەست زاناو حەکیمەکانیان، وە پلەی ئەوانیشی پێچاوە بە پلەی پێغەمبەرانەوە، لەوەدا کە

(١) خولاصەی تەفسیری نامی ل(٣٨٠).
(٢) خولاصەی تەفسیری نامی ل(٩١)

دەتوانن حوکمی خودا ئاشکرا بکەن.

وە لەبەرامبەر فەرمودەی خودا:

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ الأعراف/٢٦﴾

واتە:(پۆشاکێکمان بۆ دروستکردوون خۆتانی پێ پۆشتە بکەنەوە)، دەڵێن مەبەست لەو پۆشاکە زانستە.)

{وَرِيشٗاۖ} واتە: (یەقین و متمانە کە پێم داون).

{وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ} واتە: پۆشاکی( شەرم و حەیا)[1] ئەوە خێرو شایستەیە، وەخودا فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم بِكِتَٰبٖ فَصَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ عِلۡمٍ الأعراف/ ٥٢﴾ واتە: ( خۆمان ئەزانین چۆن و بۆچی ئەم کیتابەمان بۆ ناردون و بۆ ڕوونکردونەتەوە).

وەخودا فەرموویەتی: ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖ﴾

واتە:( لە زانین و ئاگادارییەوە هەموو شتێکیان بۆ ئەگێڕینەوە.)

وە خودا فەرموویەتی:

﴿بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ﴾ العنكبوت/ ٤٩

واتە:( بەڵکو قورئان نیشانە گەلێکی ئاشکرای تیدایە، لە سینەی ئەو کەسانەدا کە زانستیان پێ دراوە.)

وە خودا فەرموویەتی:

﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ، عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ. الرحمن/ ٣ ، ٤﴾

واتە: (مرۆڤی دروستکردووە فیری ئاخاوتن و دەربڕینی کردووە.)

بۆیە باسی ئەو قسەکردن و بەیانە دەکات، وەك منەتێك وایە کە دەیکات بەسەریاندا

---

(١) قوت القلوب(١/٢٤٩)

# بەڵگەی فەرموودەکان

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خيراً يُفقِهُ في الدِّين ويُلهِمهُ رُشدَه))**[١]

(کەواتە ئەگەر خودا مەیلی وابوو یەکێك تووشی خێر بکات، لە فیقهو زانستی شەریعەت شارەزای دەکات و چاوی دڵی دەکاتەوەو ڕێگای ڕاست و پێگەیشتنی دەخاتە دڵەوە.)

هەروەها فەرموویەتی(ﷺ) : **((العُلَماءُ ورثةُ الأنبياء))** واتە:

( زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن) وەك ئاشکرایە هیچ پلەو پایەك وەك پلەو مەقامی پێغەمبەرێتی گەورەو مەزن نییە، وە هیچ قەدرو ڕێزێکیش لەو شەرەفە بەرزترو گەورەتر نییە کە زانایان میراتگرەوەی پلەو مەقامی پێغەمبەران بن[٢].

وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((يَستَغفِرُ لِلعالِم ما في السَّماواتِ و الأرض))**[٣]

چ پلەو پایەیەك لەوە بەرزو باڵاترە، کە فریشتەی ئاسمانەکان و زەوی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن، ئەو زانایەی کە بە خۆیەوە خەریکەو فریشتەکانیش سەرقاڵی کاری ئەون و، داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەن.[٤]

---

(١) رواه البخاري(٧١). و مسلم (١٠٣٧) و زيادة: (ويُلهِمهُ رُشدَه) عند الطبراني في (الكبير ٣٤٠/١٩. وأبو نعيم في الحلية (١٠٧/٤).

**(٢) واتە لە ژێر سێبەرو (ظيلليەتی) ی حەزرەتی پێغەمبەردا دەبن و ماقامەکانیان لە ژێر سایەی ئەودا دەبێت.**

(٣) بەشێکە لە هەمان حەدیسی صەحیحی سەرەوە کە بەیانمان کرد

(٤) لەبەر ئەوەی کە زانای ڕاستەقینە هەمیشە لە هەوڵدایە کە گیانی خەڵکی بپارێزێت، وە لە کردەوە خراپ و کوشندەکان دوریان دەخاتەوە، وە هەمیشە هەوڵەکانی لەو

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**[ إنَّ الحِكمةَ تَزيدُ الشَّريفَ شرَفا، و تَرفعُ المملوكَ حتّى يَجلس مَجالس الملوك]**[1] واتە:

(حیکمەت و پەندیاری و دانایی، ڕێزو قەدری شەریفەکان زیاتر دەکات و، بەندەو کۆیلەیش ئەوەندە بەرزدەکاتەوە هاونشینی پاشاکانیان دەکات.)

[بۆنمونە: شێخی زوبەیدی لە شەرحی ئیحیادا ئەفەرموێت:

**وەك دینەوەری بەسەنەدی خۆی دەیگێڕێتەوە کە ئەبولعالیە فەرموویەتی:**

من دەچومە لای(ابن عباس) قورەیشیەکان بە چوار دەوری دابوون، دەستی منی دەگرت و لەسەر تەختەکەی دای دەنام، قورەیشیەکان سەیری یەکتریان دەکرد، ابن عباس بە پسکە پسکی ئەوانی زانی، فەرمووی:-

زانست ئاوایە، پیاوی شەریف بەرزتر دەکات و بەندە و کۆیلەش دەخاتە سەر تەختی بەرزو هاوشانی پاشاکان.

---

بازنەدایە، وە ڕزگاربوونی بەندەکانی خودا لە سەر دەستی ئەو دایە، بۆیە بەپێی جینس و ڕەگەزی کارەکەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە، بۆیە هەموو فریشتەکانی سەر زەوی و ئاسمانەکان تەرخان کراون و پێیان سپێراوە کە هەوڵ بدەن نزاو پاڕانەوەی بۆ بکەن و ڕزگاری بکەن... بنواڕە: إتحاف (٧١/١).

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (١٧٣/٦) و القضاعي في(مسند الشهاب) (٩٧٩)، و قال الحافظ أخرجة أبو نعيم و ابن عبدالبر في بيان العلم، بلفظ: **حتى يدرك مدارك الملوك.** و عبدالغنى الإزدي في أدب المحدث. من حديث أنس بأسناد ضعيف أهـ وقال الزبيدي قلت: أورده الجلال في ذيله و عزاه فيه إلى أبو النعيم، و في الصغير إليه و إلى ابن عدي، و كلاهما من طريق أنس بلفظ: الحكمة .. الخ. قال المناوي هو من حديث عمر بن حمزة... عن أنس، وقال العسكري ليس هذا من المرفوع بل من كلام الحسن و أنس. و أخرج الدينوري في المجالسة شواهد كثيرة على صحة هذه الرواية عن ابن عباس و آخرين. ينظر: إتحاف السادة المتقين(٧٢/١)

هەروەها (عطاء بن أبي رباح) یەکێ بوو لە (مەوالی)، هاتە مەجلیسی خەلیفە هاشمی کوڕی عەبدولمەلیك، کراس و جبەیەکی پیس و خوودەیەکی چڵکنی بەسەرەوە بووە، لە سواری کەرەکەی دابەزی و یەکسەر هیشام بە گەرمی مەرحەبای کردو بانگی کرد بۆ سەرەوە، هێنایە پێشەوە تا ئەژنۆی کەوت لە ئەژنۆی هیشام. ئەشرافە کانیش لە چواردەوری بوون، هەموو بێ دەنگ بوون. ئیبراهیمی حەربی فەرمویەتی:

عەطاء کۆیلەیەکی ڕەش پێست بوو، لووتی پان بوبوویەوە بوو، سولەیمانی کوڕی عبدالملك خۆی و هەردوو کوڕەکەی هاتن بۆ لای، لەلایدا دانیشتن تا نوێژەکەی تەواو کرد، ئیتر ڕویان لێ کردو پرسیاریان لێ کرد لە بارەی حەجەوە، ئەویش پشتی لێ یان کردبوو وەڵامی ئەدانەوە، لە پشان کوڕەکانی هەڵسان و سولەیمان پێی ووتن: نەکەن کەمتەرخەمی بکەن لە فێربوونی زانست، من هەرگیز ئەوە لە بیر ناکەم لەبەردەم ئەم عەبدە ڕەشەدا چەندێك خۆمان بەزەلیل دەهاتە بەرچاو.

هەروەها (محەممەدی ئەوقەص) ملی خوس بوو، هەردوو شانیشی دەرچووبوو، دایکی ووتی:

ڕۆڵە دەبیتە گاڵتەجاڕی خەڵکی، زانست فێرببە با بەرزت بکاتەوە، بە هۆی فێربوونی عیلمەوە ئەم پیاوەیە بیست ساڵ لە مەککەی پیرۆزدا بوو بە قازی ، لە ڕۆژی دادگاییدا کە داواکراو لە بەردەمیدا دادەنیشت هەموو گیانی ئەلەرزی][1] ئەمەش تەنها باس کردنە لەبەرهەمی زانستی لە دونیادا، ئاشکرایە کە لە دوا ڕۆژدا چاکتر و بەردەوام تر دەبێت.

---

(١) ئەم نمونانە زانای گەورە محمد حسین الزبیدی لە شەرحی ئیحیادا هێناویەتیەوە بنوارە: إتحاف السادة المتقین(١/٧٢)

وەفەرموویەتی(ﷺ):-

**((خصلَتان لا تكونانِ فى مُنافق، حُسنُ سَمتٍ، و لا فِقهٌ في الدِّين))**[1]

واتە:( دوو چاکە خەصڵەت لە دووڕوو مونافقدا کۆنابنەوە:

جوانی شکڵ و ڕوخسار و قەدو باڵا، لەگەڵ شارەزابوون لە دیندا.)

گومانت نەبێت لە دروستی ئەم فەرموودەیە، لە کاتێکدا کە هەندێك فوقەهای زەمان دەبینیت، چونکە ئەوانە دونیا زاڵ بووە بەسەر دڵیانداو حەزیان لە سەرداریی و جاهو دەسەلاتەو، وای دەگەێنن کە مەبەستیان زوهد و وەرع و تەقوایە، چونکە ئەو شارەزا بوونەیان لە فیقە بەو شوێوەیە دەبێت کە دواتر باسی دەکەین، نزمترین پلەی فەقیە ئەوەیە: کە بزانێت دوارۆژ چاترە لە دونیا، وەئەم زانینە ئەگەر زاڵ بوو بەسەریدا و ڕاست بکات لەگەڵیدا، لە نیفاق و دووڕویی و ڕیاکاری دووری دەخاتەوە و دەیپارێزێت.

وەفەرموویەتی(ﷺ):- **((أفضلُ النّاس المُؤمنُ العالِم، الَّذي إن احتيج إليه نفَع، وإن استُغْني عنهُ ، أغنَى نفسَهُ))**[2]

واتە: (گەورەترین کەس بڕوادارێکی زانایە ، ئەگەر خەڵکی کاریان تێی بکەوێت سوودیان پێ دەگەیەنێت ، ئەگەر نیاز و کاریشیان پێی نەبێت خۆی بێ نیاز دەکات و پێویستی پێیان نابێت و زیاتر هەوڵدەدات خۆی پێ بگەیەنێت.)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:-

---

(١) رواه الترمذي (٢٦٨٤) فى الكتاب العلم. من حديث أبي هريرة، وقال: حسن غريب. [قال الزبيدي ٧٢/١: قال السيوطي في الجامع الصغير ٣٦٦/١،(٣٩١٤): حسن، وأخرجه ابن مبارك في الزهد ١٥٥/١ (٤٥٩) من رواية محمد بن حمزة بن عبدالله بن سلام مرسلا]

(٢) رواه البيهقي: في (الشعب)(١٥٩١) عن أبي الدرداء موقوفا عليه. بإسناد ضعيف ولم أره مرفوعاً. [قال الزبيدي ٧٣/١: و في معناه أخرجه الخطيب في تأريخه ٣١١/١،عن عبدالله بن عمر:**أفضل المؤمنين إيماناً الذي إذا سئل أعطى، وإذا لم يُعطَ إستَغنى**،وسنده ضعيف أيضاً]

**((الإيمانُ عُريانٌ، و لباسُه التَّقوى، و زينتهُ الحَياء، و ثَمرتُه العِلمُ))**[1]

واته:( ئیمان و بڕوا به تەنها ڕوتەڵەیە، تەقوا دەبێتە پۆشتەکەرەوە و پۆشاک بۆی، شەرم وحەیا جوانی دەکات و، وەك خشڵ دەیڕازێنێتەوە ، بەرهەمەکەیشی زانستە).

وەفەرموویەتی(ﷺ):-

**((أقربُ الناسِ مِن دَرجةِ النبُوَّة أهلُ العِلم وَالجهاد، أمَّا أهلُ العِلم .. فدَلّوا الناس عَلى ماجاءَت بهِ الرُسُل، و أمَّا أهلُ الجهادِ ... فجاهَدو بِأسيافِهم عَلَى ماجاءَتْ بهِ الرُسُل))**[2]

واته:( زانایان و موجاهیدانی ئیسلام نزیکترین کەسن لە پلەی پێغەمبەرایەتی، چونکە زانایان ئەوە پیشانی خەڵک دەدەن کە پێغەمبەران هێناویانە، وە موجاهیدەکانیش بە شمشێرەکانیان دەجەنگن و جیهاد دەکەن لە سەر ئەوەی کە پێغەمبەران هێناویانە و فەرمویانە.)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**(( لَموتُ قَبيلةٍ أيسَرُ مِنْ مَوْتِ عالِم ))**[3] واته:

---

(١) رواه ابن أبي شيبه في(مصنفه) (٣٦٣٨٣) من كلام وهب بن منبه. وكذا ابن عساكر في(تأريخ دمشق)(٣٨٩/٦٣) و قال أبوطالب في( القوت) (١٣٨/١): وقد أسنده حمزة الخراسانى عن الثوري فرفعه إلى عبدالله. عن النبي (ﷺ) وكذا هو عند الخطيب في ( الفقه و المتفقه)(١٢٩ ـ ١٣٠ ) مرفوعا موقوفا.

(٢) رواه الترمذي (٢٦٨٤) في الكتاب العلم. وأخرجه ابو نعيم في فضل العالم العفيف من حديث ابن عباس، بإسناد ضعيف، [قال الزبيدي ٧٣/١: وأورده صاحب القوت ٢٤١/١، فقال: وقد روينا عن عبدالرحمن بن غنم عن معاذ بن جبل. فذكره، ويُروى إنَّ أقرب الناس،وأخرجه إبن القيم هكذا، فجعله من قول إسحاق بن عبدالله إبن أبي فروة]

(٣) رواه البيهقي في (الشعب)(١٥٧٦)، و ابن عبدالبر في ( جامع بيان العلم و فضله)(١٧٩) و ابن عساكر في (التأريخ دمشق)(١٧٨/٢). و قال الحافظ العراقي: أخرجه الطبراني و ابن عبدالله

( مردنی هۆزێك بەتەواوی ئاسانترە لەو ئێشەی بە هۆی مردنی زانایەکەوە پەیدا دەبێت). پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**(( النَّاسُ كمَعادِن الذَّهب و الفِضَّة، فَخيارُهم في الجاهليَّة خِيارُهم في الإسلام إذا فَقِهوا))**[1] واته:

(ئەو خەڵکە وەك کانگای ئاڵتون و زیو وان، ئەوانەیان لەچەرخی نەفامیدا بژاردەو هەڵبژێردراویان بوون، لە دوای موسوڵمان بوونیشیان ئەگەر لە دین و شەرع شارەزابن ئەوا دبسان هەڵبژاردەن)

وەفەرموویەتی(ﷺ):-

**(( يُوزنُ يومُ القيامةِ مِدادُ العُلماءِ و دَمُ الشهداء))**[2]

---

من حديث أبي الدرداء. [قال الزبيدي: الذي رواه الطبراني عن أبي الدرداء ورفعه: **((موت العالم مصيبةٌ لاتجبر** ، أورده السخاوي في المقاصد ص ٩٥، (٧٩) وقال: وله شواهد، منها ما أورده الزبير بن بكار في الوقفيات، عن محمد بن سلام الجمحي عن علي ابن أبي طالب من قوله: **إذا مات العالم انثلم في الإسلام ثلمة و لا يسدها شيئ إلى يوم القيامة**، وهو معضلٌ، وأخرج أبوبكر بن لال من حديث جابر مرفوعاً: **موت العلم ثلمة في الإسلام، لاتسد ما اختلف الليل والنهار**، وأخرج الديلمي ٧٣/٤(٦٢٢٧)**عن ابن عمر بلفظ: ما قبض الله عالما إلا كان ثغرة في الإسلام لاتسد**. وأخرج البيهقي في شعب الإيمان ٣٦٧/٢(١٦١٤) من حديث معروف بن خربوذ عن أبي جعفر أنه قال: **موت عالم أحب إلى إبليس من موت سبعين عابدا**. وأخرج الحاكم في المستدرك ٣٨١/٢(٣٣٣٤)من حديث عطاء عن ابن عباس في قوله تعالى: **أولم يروا أنا نأتي الأرض ننقصها من أطرافها، الرعد ٤١**، قال: موت علمائها، قلت (أي الزبيدي): وأخرج أبو يعلي في مسنده بمثل ما قدمناه عن الطبراني، وفيه زيادة، ولكن في الإسناد رجل لم يسم]

(١) رواه البخاري(٣٣٥٣) و مسلم(٢٦٣٨).

(٢) أخرجه ابن عبدالبر في (العلم، ٣١/١)، من حديث أبي الدرداء بسند ضعيف.[ قال الزبيدي: ٧٤/١، قلت وأخرجه الشيرازي في الألقاب من طريق أنس بزيادة: فيرجح مداد العلماء على دم الشهداء، وأخرجه الذهبي عن عمران بن حصين ، وابن الجوزي في العلل٨١/١، (٨٥)

واته:

(لەڕۆژی قیامەتدا ئەوەندە نوسینی زانایان پاداشتی هەیە مرەکەبی نوسینی زانایان ئەکێشرێت لەگەڵ خوێنی شەهیدەکاندا.)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((من حَفِظ عَلى أمَّتي أربعينَ حديثاً مِن السُنَّة، حتى يُؤدِيها إليهِمْ، كانَت لهُ شَفيعاً و شَهيدا يَوم القيامَة))**[1]

( واته: هەر کەسێك چل حەدیسی من بەدەقق و بەسەنەدەکەیەوە وەربگرێت و ڕایبگەیەنێت بۆ ئوممەتەکەم و پێیان بگەیەنێت، من دەبمە شەفاعەتکار و شایەتی بۆ دەدەم لە ڕۆژی قیامەتدا.)

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((من حَمِل مِن أمَّتي أربعينَ حَديثا، لَقِي الله عزَّ و جلَّ فقيهاً عالما))**[2]

واته:

( هەریەکێك لە ئوممەتی من چل فەرموودە هەڵبگرێت و پارێزگاری لێ بکات، کاتێك بە خودای خۆی دەگات دەبێتە زانا و شەرع زان و شارەزا).

---

عن النعمان بن بشير ، والديلمي عن ابن عمر، قال ابن الجوزي: حديث لايصح، وهارون بن عنتر أحد رجاله، قال ابن حبان في المجروحين ٩٣/٣(١١٦٣) لايجوز الإحتجاج به، يروي المناكير، ويعقوب القمي ضعيف، وفي الميزان متنه ضعيف.]

(١) رواه أبو النعيم فى ((تأريخ أصفهان))(٢/ ١٧٨) و ابن عبدالبر فى (الجامع البيان العلم و فضله))(١٥٣) من حديث عبدالله بن عمر و أبى الدرداء(رضى الله عنها).وانظر الإتحاف(١/ ٧٤).

(٢) رواه ابن عبدالبر في (جامع بيان العلم و فضله)(٢٠٤)و تمام في(فوائده)(١٠١)و أخرجه ابن عدي في (الكامل)(١/ ٧-٧٧)من هذا الطريق أيضا، وقد ضعفه أكثرية رواة الأحاديث، و ينظر إلى الإتحاف.٧٤،٧٥/١،فهناك طرق و روايات و مختلفة في نقل رواية هذا الحديث وكلها ضعيفة.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَن تفقَّه في دين الله عزَّ و جَل، كفاهُ الله تعالى همَّهُ، و رزَقَه مِن حَيثُ لا يَحتسِب))[1]**

واتە:

( ئەوەی خۆی خەریك بكات و لە دینی خودا شارەزا ببێت، خودای گەورە كەفالەتی خەم و مەرامەكانی دەكات و لەو ڕێگەیشەوە كە پەیی پێ نابات و چاوەنوڕای نەكردووە ڕزق و بژێوی ژیانی بۆ دابین دەكات)

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((أوحَى الله إلى إبراهيم عليه السلام: يا إبراهيم، إنِّي عليمٌ أحِبُّ كُلَّ عَليم))[2]**

واتە:

( خودای گەورە نیگای بۆ ئیبراهیمی خەلیل كرد(سەلامی خودای لەسەر) ڕوی لێ كردوو فەرموی:

ئەی ئیبراهیم، من زۆر زاناو ئاگادارم، هەموو زانایەكیشم خۆش دەوێت).

(١) رواه ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله)) (٢١٦) والخطيب في ((تأريخ بغداد)) (٢٤٢/٣) و جمع الزبيدي روايات و طرق أخرى أكثرتها ضعيفة و بعضها في موضع من القبول(٧٧/١) فيقول:[وأخرج البيهقي في الشعب ٢٨٩/٧(١٠٣٤٠)عن ابن مسعود رفعه من جعل الهم هما واحدا هم آخرته، كفاه الله عز وجل ما همه من أمر دنياه، وأخرجه الرافعي من طريق أبي يوسف ، عن أبي حنيفة نبّه عليه السيوطي في الجامع الكبير ١٣٦/٣(٧٧٥١) وهو عادل شاهد لحديث ابن جزء]

(٢) ذكره ابن عبدالبر تعليقا في(( جامع بيان العلم و فضله))٢٣٦.

وه پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: **((العالِمُ أمينٌ في الأرض))**[1]

واته: ( زانا ئەمینداری خودایه لەسەر زەوی).

وه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((صِنفانِ مِن أُمَّتي إذا صَلحوا .. صَلحَ الناسُ، و إذا فسَدوا.. فسَدَ الناسُ: الأُمَراءُ و الْفُقَهاءُ))**[2]

واته: (دوو تاقم و کۆمەڵ هەن له ئوممەتی من، ئەگەر ئەوانه چاك بوون هەموو خەڵکی چاك دەبن و بێ کێشه دەبن، وه ئەگەر خراپ بوون خەڵکەکەش چاویان لێ دەکەن و شوێنیان دەکەون و خراپ دەبن، ئەوەش هەردوو پێری فەرمانده و ئەمیرەکان و فەقیهو شارەزاکانه)

---

(١) فيض القدير للمناوي (٥٦٥٥) كنز العمال(٢٨٦٧١) جامع البيان علم (٥٢/٢) رواه ابن عبدالله ومن شواهده: مارواه القضاعي في((مسنده)) (١١٥) و ابن عساكر في (( تأريخ دمشق)) (٢٦٧/١٤) **((العلماءُ أمناءُ اللهِ علَى خَلقه ))** [قال الزبيدي: وأخرج الحسن بن سفيان ، والعقيلي عن أنس أيضاً: **العلماء أمناء الرسل مالم يخالطوا السلطان، ويداخلوا الدنيا**.

وأخرج الديلمي في مسند الفردوس٧٦/٣(٤٢١١) عن عثمان بن عفان: **العلماء أُمناء أُمتي**، وأخرج العسكري عن علي:

**الفقهاءُ أمناءُ الرُسل ما لم يدخلوا في الدنيا ويتبعوا السلطان، فإذا فعلوا ذلك فاحذروهم**.]

(٢) رواه تمام فی (( الفوائد))(٩٠١)وأبو نعيم في(الحلية)(٦٩/٤) و ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١١٠٨) و اللفظ له. وقال الزبيدي ٧٨/١: روياه من روايه محمد بن زياد، **عن** ميمون بن مهران، عن ابن عباس، ولفظ أبى نعيم فى الحلية: **صنفان من أمتى إذا صلحا صلح الناس، وإذا فسدا فسَد الناس: العلماء والأمراء**، وأخرجه الديلمي في الفردوس ٤٠٢/٢(٣٧٨٤) عن ابن عباس بهذا اللفظ ومحمد بن زياد هذا كذَّبه الإمام أحمد في (العلل) ٢٩٧/٣).]

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((إذا أتَى عليَّ يومٌ لا أزداد فيه عِلما يُقَرِّبُنى إلى الله عزَّوجل، فلا بُورِك لِي في طلُوع شَمسِ ذلِك اليَوم))** [1] واتە:

( ئەگەر ڕۆژێکی نوێم لەسەر هەڵبێت و زانستم زیاد نەکردبێت، کە لەخوداوە نزدیکم بکاتەوە،[مەبەست زانستی یەکتاپەرستي یە نەك ئەحکامەکان] ئەوا بێ بەشبم لە بەرەکەتی ئەو ڕۆژەی لەسەرم هەڵهاتووە ، ئەمە بەواتای دڵنیایی پێغەمبەرە(ﷺ) کە هەموو سات و چرکەیەکیش زانستی زیادی کردووە، بۆیە بەرەکەتیش بەردەوامە لە سەری، وە هەرگیز ڕووی نەداوە بەرەکەتی لێ پچرابێت)[2].

وە لەبارەی فەزڵ و گەورەیی زانستەوە لەسەر بەندایەتی و شەهیدبوونی مەیدانی جیهاددا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((فضلُ العالِم عَلى العابدِ كَفضلي علَى أدنى رَجلٍ مِن أَصحابي))**[3]

واتە: ( گەورەیی و قەدرگرانی زانایەك بەسەر عابید و خوداپەرستێکدا، وەك فەزڵ و گەورەیی من وایە بەراورد لەگەڵ نزم ترین پلەی پیاوێ لەهاوڕێ و صەحابەکانم)

بنوارە چۆن زانستی ئەوەندە بەرزداناوە، بەراوردی کـــــردووە لـــەگەڵ پلەی پێغەمبەرایەتی، وە سەرنج بدە چەندێ پلەی ئەو عابیدانەی دابەزاندووە

---

(١) رواه ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله))(٣١٨)، و أبو نعيم في ((الحلية))(١٨٨/٨)، والطبراني في ((الأوسط) و له شواهد كما نقله الزبيدي(٧٩/١) و أجرجه الديلمي في الفردوس عن علي مرفوعا... الخ

(٢) إتحاف السادة المتقين (٧٩/١) زیاتر باسی کردووەو بەڵگەی تری بۆ هێناوەتەوە.

(٣) رواه الترمذي (٢٦٨٥)، قال العراقي: أخرجه الترمذي في كتاب العلم(٤/٤٨) من حديث { أبي أمامة} وقال حسن صحيح. ولفظ الترمذي: كما يقول الزبيدي ٧٩/١: **كفضلي على أدناكم.**

كه بەندايەتى زۆر دەكەن و شارەزاى فيقهو زانست نين، هەرچەندە كردەوەكانى عابيديش ئەوەندە زانستى تێدايە، كەبتوانێت بەردەوام بێت لەسەرى، خۆ ئەگەر خاڵى بێت لە عيلم، چۆن دەتوانێت بەردەوام بێت لە عيبادەت.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى:

**((فضلُ العالِم علَى العابدِ كفَضل القَمر ليلة البَدر علَى سائِر الكَواكِب))**[1]

واتە: (گەورەيى و جياوازى پلەى زانايەك و عابيدێكى ڕووت، وەك فەزڵى مانگێ چواردەيە بەسەر باقى ئەستێرەكاندا)[2]

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى:

**((يشفَع يَوم القِيامة ثلاثةٌ: الأنبياءُ، ثمَّ العلماءُ، ثمَّ الشُّهداء))**[3]

واتە:

( سێ كۆمەڵ لە ڕۆژى قيامەتدا تكاكارن و شەفاعەت دەكەن بۆ خەڵكى، پێغەمبەران، پاش ئەوان زاناكان، لە پاشان شەهيدەكان).

كەواتە ئەو پلەيە زۆر بەگەورەى دابنێ، كە لەدواى پلەى پێغەمبەران و لەسەرو پلەى شەهيدەكانەوە بۆيان دانراوە، كە چەندێك باسى پلە بەرزى شەهيدەكانيش كراوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى:

**((ماعُبِدالله تعالى بشَيئ أفضلَ مِن فقهٍ في الدِّين، ولَفقيهٌ واحدٌ أشدُّ على**

---

(١) رواه أبو داود (٣٦٤١)، والترمذي(٢٦٨٢) و ابن ماجه (٢٢٣).

(٢) لەو ڕووەيشەوە كە سوودى مانگ زياتر هەستى پێ ئەكرێت بۆ خەڵكى لەسوودى ئەو ئەستێرانەى كەدوورن لێمانەوە و ڕۆشنايمان پێ نادەن.

(٣) روه ابن ماجه (٤٣١٣).من حديث عثمان بن عفان باسناد ضعيف، قاله الزبيدي١ /٨٠.

الشيطان مِن ألفِ عابد، وَ لِكلِّ شيئ عِمادٌ وعِمادُ هذا الدِّين الفِقه))[1]
واته:

( هەرگیز لەوە باشتر بەندایەتی نەکراوە بۆ خودا کە ئەو کەسەی دەیکات شارەزاو زانابێت لەدیندا، وەبەتێگەیشتنەوە بیکات، تەنها یەك فەقیهو شەرع زان زیاتر لە هەزار عابید کاریگەری هەیە لەسەر شەیتان، وە هەموو شتێك کۆڵەکەیەکی هەیە، کۆڵەکە و پایەی ئەم دینی ئیسلامەیش فیقهو تێگەیشتن و شارەزابوونە).

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((خيرُ دينكُم أيسَرُه، وخَير العِبادة الفِقهُ))[2]

واتە: ( باشترین دینەکەتان ئاسانەکەیەتی [واتا گرانی نەکات لەسەر خۆی] وە باشترین عیبادەتیش شارەزابوونە لە دین، واتە: بەشارەزایی و تێگەیشتنەوە بەندایەتی بۆ بکرێت).

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((فضْلُ المُؤمن العالِم علَى المُؤمنِ العابدِ سَبعونَ دَرجة))[3]

واتە:(مەزنی و گەورەی بڕوادرێکی زانا بەسەر بڕوادارێکی عابیددا حەفتا پلەیە).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

---

(١) رواه الطبراني في ((الأوسط)) ١٩٤/٦ (٦١٦٢)، وأبو نعيم في ((الحلية))(١٩٢/٢) و البيهقي في ((الشعب))(١٥٨٣).

(٢) رواه ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله))(٩١) بلفظه، والشطرالأول منه في ((مسند أحمد)) (٤٧٩/٣)، و أسناده صحيح.

(٣) رواه ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله)) (٩٥)، وهو عند أبي يعلى في((مسندأحمد) (٤٧٩/٣)، وأسناده صحيح.

**((إنكُم أصبَحتُم في زَمانٍ كَثيرٌ فُقَهاءُه، قليلُ خُطباءُه ، قليلٌ سائِلوهُ كثيرٌ مُعطوهُ، العَملُ فيهِ خيرٌ من العِلم، و سَيأتي علَى الناسِ زَمانٌ قليلٌ فُقَهاءُه، كثيرٌ خُطَبائُه ،قَليلٌ مُعطوُه، كثيرٌ سائِلوهُ ،العِلْم فيهِ خيرٌ منَ العَمل))**[1]

واته:

(ڕووی لە صەحابەکان کردوو فەرمووی: ئێوە کەوتونەتە ڕۆژێکەوە، تێگەیشتوو شارەزاتان لە دین زۆرە، وە قسەکەرو وتاربێژتان کەمە، کەمتان پرسیاردەکەن و زۆرن ئەوانەی کە زانست دەبەخشنەوەو بڵاوی دەکەنەوە، ئێستا کارکردن چاکترە لە دەرخستنی عیلم و زانیاری، بەڵام زەمانێك دێت بەسەر ئەو خەڵکەدا، فەقیهو شارەزاکان کەم دەبنەوەو وتاربێژەکان زۆر دەبن،

---

(١) رواه الطبراني في ((مسندالشاميين))(١٢٢٥). وابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله)) (١٠٣)، و ابن عساكر في ((تأريخ دمشق))(٣٠٣/١٢).وأخرجه الطبراني في الكبير ١٩٧/٣(٣١١١) من حديث حزام بن حكيم عن عمته، وقيل عن أبيه ، وإسناده ضعيف.

[قال الزبيدي:٨٣/١-٨٤،رواه كذلك ابن عبدالبر في العلم، ٢٣/١، وأبو نعيم في كتاب رياض المتعلمين، كلهم من رواية صدقة بن عبدالله عن زيدبن واقد، عن حرام بن حكيم، عن عمه عن رسول الله ﷺ و صدقة بن عبدالله ضعيف، وحرام مختلف فيه، وفي مسندالإمام أحمد (٢٠٨٦٤) عن أبي ذر أن النبي ﷺ قال:

**إنكم في زمان علماءه كثير، وخطباءه قليل، من ترك فيه عشر ما يعلم هوى، أو قال: هلك، وسيأتي على الناس زمانٌ يقل علماءه، ويكثر خطباءه، من تمسك فيه عُشر مايعلم نجى.** وللحديث المذكور شواهد، منها عند الترمذي، كتاب الفتن (٢٢٦٧) من حديث أبي هريرة....وعند الطبراني في الأوسط ٣١٩/٣،(٣٢٧٧) والحاكم في المستدرك، ٥٠٤/٤،(٨٢١٢) عن أبي هريرة أيضاً:

**سيأتي زمان تكثرُ فيه القراء، وتقل الفقهاء، ويقبض العلم ويكثر الهرج، ثم يأتي من بعد ذلك زمان يقرء القرآن رجال من أمتي، لا يجاوز تراقيهم، ثم يأتي بعد ذلك زمان يجادل المشرك بالله المؤمن في مثل مايقول.]**

کەمن ئەوانەی زانست دەبەخشنەوە و ئەوانەش کە پرسیاردەکەن زۆرینەن، لەوکاتەدا زانست باشترە لە کارکردن، واتە:

دەرخستنی زانست باشترە لەوەی کردارەکان ئاشکرا بکرێت).

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (**بینَ العالِم و العابدِ مئةُ درجةٍ، بینَ کُلِّ درَجتینِ حُضْرُ الجَوادِ المُضَمَّر سَبیعنَ سَنة**))[1]

واتە: ( لە میانی زاناو عابیددا صەد پلەو جیاوازی هەیە، لە میانی هەموو دووپلەیەکدا بە ئەندازەی حەفتا ساڵ غارکردنی ئەسپێکی ئامادەباش کە لە کاتی ڕۆیشتنا قەڵەم بازبدات وبەرزببێتەوە).

عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا چ کردەوەیەك لە هەمووان گەورەترە؟ فەرمووی(ﷺ):

**((العلم بالله عزَّوجَل، فقیلَ: أيُّ العِلمِ ترید؟ فقال(ﷺ): العلمُ بالله سبحانَه و تَعالَى، فقیلَ: نَسألُ عَنِ العَمَلِ وَ تُجیبُ عَنِ العِلم، فقالَ(ﷺ): إنَّ قَلیلَ العمَلِ یَنفَعُ مَعَ العِلم، وإن کَثیرَ العمَلِ لایَنفعُ مَع الجَهلِ))**[2]

---

(١) رواه الطبراني في ((مسند الشامين)) (١٢٩) حضر الجواد المضمَّر: مُقدّر عَدوِ الجَواد المهيأ للركض، والحضر أرتفاع الفرس في عدوه. ورواه الأصفهاني في الترغيب والترهيب من حديث إبن عمر، عن أبيه، وقال سبعون درجة. بسند ضعيف، وكذا رواه صاحب مسند الفردوس، [هو في المسند ١٢٨/٣(٤٣٤٤) من رواية عبدالرحمن بن عوف، و١٢٨/١،(٤٣٤٥) من رواية عبدالله بن عمر، من حديث أبي هريرة. [قال الزبيدي:٨٤/١ -٨٥.: قال السخاوي في المقاصد ص ٥٣٥، ولأبي يعلى ١٦٣/٢، (٨٥٦) وابن عدي ١٣٤/٤، عن أبي هريرة بهذا اللفظ مرفوعاً، ولفظ العراقي ذكره ابن عبدالبر في العلم، ٣٧/١، من غير أن يوصله بالإسناد، وقول العراقي: رواه صاحب الفردوس وإسناده ضعيف....]

(٢) رواه ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله))(٢١٤)، و أخرج الحاكم و الترمذي في الأصل(٢٦٦) من نوادر الأصل بسنده عن أنس بن مالك بنفس الصيغة تقريبا، عن رسول الله (ﷺ) إذ يقول: **إن العلم ينفعك معه قليل العمل و كثيره، و إن الجهل لا ينفعك معه قليله و لا كثيره**. وقال الزبيدي: وأخرجه الترمذي في نوادر الأصول١٠١/٤، ومن شواهده ما

واتە:

( عیلم و زانینت هەبێت بە خودای گەورە و باڵادەست، عەرزیان کرد پرسیاری کردەوەمان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

زانست و عیلم بە خودا، عەرزیان کرد: ئێمە پرسیارت لێ دەکەین چ کارو کردەوەیەك خێری زیاتر دەداتەوە و تۆیش لە بارەی عیلم و زانین وەڵاممان دەدەیتەوە! پێغیمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

کردەوەیەکی کەم لەگەڵ عیلم و زانیندا بێت، سوود بەخش دەبێت، بەڵام کردارێکی زۆر لەگەڵ جەهل و نەزانیندا بێت، بێ سوود دەبێت).

[شێخی زوبەیدی دەفەرمووێت:

کردەوەی کەم لەگەڵ زانین بۆیە سوودی هەیە:

چونکە زانینەکە ڕاستی دەکاتەوە، بەڵام بەبێ زانست کردەوەی زۆریش بێت، بێ بەهرە دەبێت][1]

---

أخرجه ابن عبدالبر في العلم ١/٢٣. عن أبي هريرة ( **العلم خير من العبادة، وملاك الدين الورع**) وأخرجه ابن أبي شيبة في مصنفه، ٨٢/٧، والحكيم في نوادر الأصول ٣٠٣/٢ الحسن مرسلا، والخطيب في تأريخ بغداد، ٣٤٦/٤. عنه عن جابر. **العلم علمان فعلم في القلب، فذلك العلم النافع، وعلم في اللسان فذلك حجة الله على ابن آدم**].

(١) بنوارە: إتحاف (٨٥/١) وە فەرموویەتی: أخرج إبن أبي شيبة والحكيم عن الحسن مرسلا. و الخطيب عنه عن جابر: **العلم علمان: فعلم في القلب فذلك العلم النافع، و علم اللسان فذالك حجة الله على ابن آدم**. کەواتە زانستێك لە دڵا هەڵقوڵاو بێت ئەوە سوود بەخشە، زانیاری سەرزارەکیش ئەوە تەنها دەبێتە بەڵگەیەك بەسەر ئادەمیزادەوە و لێی بەرپرسیار دەبێت، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) تەنها باسی عیلم دەکات چونکە عیبادەتێك بە عیلمەوە بێت و لە دڵا هەڵقوڵابێت، تەنها ئەوە سوود بەخشە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((يَبعَثُ الله عزَّوجَل، العِبادَ يومَ القيامَةِ، ثُمَّ يبعَث العُلماءَ ثمَّ يَقول: يا مَعشر العلماء: إنيّ لم أَضعْ عِلمي فيكُم إلا لِعِلمي بكُم، ولَم أضَع عِلمي فيكم لأعَذبكُم، إذهبُوا فقَد غَفرتُ لكُم))**[1] واتە:

خودای گەورە بەندەکانی زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا،لە پاشان گیان ئەکاتەوە بەبەرزی زاناکانداو دوایی پێ یان دەفەرمووێت:

ئەی گرۆی زانایان:

من کە زانستی خۆمم لە ناو سینەی ئێوەدا داناوە، چونکە ئێوەم ناسیوە و لێتان بە ئاگابووم، ئێوەم نەکردووە بەزانا بۆ ئەوەی سزاتان بدەم، بڕۆن ئازاد بن، ئەوا لێتان خۆش بووم).

داوا لەخودا دەکەین ئاخیرمان بە خێر بگێڕێت... ئامین.

---

(١) رواه البيهقي في ((المدخل)) (٥٦٧)، و ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله (٢٣٢). ورواه الطبراني في الأوسط ٣٠٢/٤(٤٢٦٤) من حديث أبي موسى بسند ضعيف.[ قال الزبيدي.٨٥/١:

وأخرجه يعقوب بن سفيان في تأريخه، ٣٨٣/٣، قلت: أخرجه الطبراني في الصغير ٣٥٤/١،(٥٩١) من رواية عمر بن أبي سلمة التنيسي، وابن عبدالبر في العلم، ٤٨/١، وبروى أيضا من حديث ثعلبة بن الحكم، أخرجه الطبراني في الكبير ٨٤/٢(١٣٨١) من رواية سماك بن حرب عنه رفعه:

**يقول الله عزوجل للعلماء يوم القيامة إذا قعد على كرسيه لفصل عباده، إني لم أجعل علمي وحكمي فيكم إلا وأنا أريد أن أغفر لكم على ما كان فيكم ولا أبالي.**
ومن شواهده ما أخرجه ابن عدي في (الكامل) ٤١٢/٢، والبيهقي في شعب الإيمان ٢٦٨/٢،(١٧١٧) بسند ضعيف عن جابر رفعه، **يبعث الله العلم والعبد، فيقال للعابد أدخل الجنة ويقال للعالم: اثبت حتى تشفع للناس بما أحسنت من أدبهم.**]

# بەڵگە ئاسارەکان

لەم بارەیەوە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی طالیب خودالێ ڕازی بێت بە (کومەیل)ی فەرموو: ئەی کومەیل: زانست چاترە لە ماڵ و سامان، زانست دەتپارێزێت و ئێشکت بە دیارەوە دەگرێت، بەڵام تۆ ئەبێ پارێزگاری و حەراسەتی ماڵەکەت بکەیت، زانست فرماندارو دادوەرە، بەڵام ماڵ فرمان بەردارو حوکم لەسەر کراوە، وە ماڵ ئەگەر لێی خەرج بکەیت کەم دەکات، بەڵام زانست تا لێێ سەرف بکەیت زیاد دەکات.[1]

پلەی زانا گەورەترە لە کەسێك بەڕۆژو بێت و شەو نوێژ بکات و موجاهیدیش بێت، ئەگەر زانایەك بمرێت کەلێن و درزێك لە ئیسلامدا دروست دەبێت مەگەر یەکێك جێگەی بگرێتەوە و پڕی بکاتەوە.[2]

هەروەها حەزرەتی عەلی(رەزای خودای لێبێت) فەرموویەتی بەهۆنراوە:

ما الفخرُ إلاَّ لأهلِ العِلْم إنَّهـمُ     علـى الهُدى لِمـن استَهدى أدلاَّءُ
وقَدْرُ كلِّ امرىءٍ ما كان يُحْسِنُه     والجَاهِلُـون لأهْل العلم أعَـداءُ
ففُزْ بعلمٍ تَعِشْ حيـاً به أبــداً     النَّاسُ مَوتَى وأهلُ العِلْمِ أحْياءُ.[3]

---

(١) رواه الخطيب في ((التأريخ بغداد))(٦/٢٧٦) و بنحوه أبو نعيم في (( الحلية))(١/٧٩). وهو في ((قـوت القلـوب))(١/١٣٤) وقولـه: (( والمـالُ تَنقصُـه النفقــة)) لاينــافي قولــه (ﷺ): (( مانقَصَت مِن مال)) ماڵ ئەگەر لێی سەرف بکرێت کەمێکێ لا ئەچێت و لە پاشان دێتەوە شـوێنی بەبەرەکەت و خێـرو زەکات دانەکە، بەڵام زانسـت هەتـا لێـی سـەرف بکەیت کانیاوی زانست لەناو دەروندا زیاتر هەڵدەقوڵێت و هەرگیز کەم ناکات، بەڵکو لەزیاد بووندایە. بنوارە: إتحاف(١/٨٧).

(٢) قوت القلوب (١/١٤٣) و رواه الخطيب في((الجامع لأخلاق الراوى و آداب السامع)) (٣٥٠).

(٣) ديوان سيدنا علي الموسوم: ب ((أنوار العقول لوصي الرسول ﷺ)) (ص ٣٠) في بحر البسيط.

واتە:

**شـانـازی بـکا، بێجگە لە زانا ئەبـێ کــێ بــێ**

**چاو ساغ و دەلیلە، کە دەبێ عیلمـی لە جـێ بێ**

**ڕێزی هەموو کـەس بەندە بەوەی چاکی دەزانێ**

**جاهیل لە دژی عیـــلمە، دەبێ ڕێزی لە کوێ بێ**

**زانــــین بـــەرەوە، تاکو ژیـــانت ئەبـــەدی بێ**

**زانا نەمـرە ، وا کە شـاهـەدەی دەبـــێ پـێ بێ** [1]

هەروەها أبو الأسود دەڵێت:

هیچ شتێك لە زانست باڵا دەستر نییە، پاشاکان بە سیاسەتی ئاشکرا لەگەڵ خەڵکەکەدا فەرمانڕەوای ئەوانن ، زاناکانیش فەرمانڕەوان بەسەر پاشاکاندا، کە فێری یاسای شەرع و حوکمڕانیان دەکەن.[2]

ئیبن و عباس (ڕەزای خودای لێبێت) فەرموویەتی:

بژاردە و ئارەزو خرایە دەستی حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داوود( سەلامی خودایان لە سەر بێ) لە میانی زانست و ماڵ و دەسەڵات و پاشایەتی کامیان هەڵدەبژێرێت، ئەو زانستی هەڵبژاردوو ماڵ و موڵکیشی پێ بەخشرا.[3]

وە پرسیار کرا لە عەبدوڵلای کوڕی موبارەك: کێ لەناو ئەو خەڵکە بە مرۆڤی تەواو دەژمێرێت؟ فەرموی زاناکان (واتە: ئەوەی زانا یە بە خودا ﷻ)،

وتیان: ئەی لەناو پاشاکاندا؟

---

(١) وەرگێرڕاوی بەندە ((ئەحسەن))موفتی.

(٢) ذکره ابن قتیبه في ((عیون الأخبار)) (١٢١/١) و ابن عبدالبر في ((جامع بیان العلم و فضله)) (٣١١) تعلیقا.

(٣) (تأریخ دمشق)(٢٧٥/٢٢)و هو عن عبدالله بن المبارك في ((جامع بیان العلم و فضله)) (٢٦٦).

فەرموی: زاهیدو دونیا نەویستەکان، ووتیان:

ئەی چینە نزم و دابەزیوەکان کێن؟

فەرموی: ئەو کەسەی نانی لەسەر دینەکەیەتی، واتا بەسەر دینەکەیەوە دەژی.

کەواتە تەنها زاناکانی بەمرۆڤی تەواوی ناساندووە، چونکە ئەو تایبەتمەندییەی مرۆڤی لە تێکڕای گیانلەبەران پێ جیادەکرێتەوە زانستە، مرۆڤ بەچی مرۆڤە؟

بەو خەصڵەتەوە کە پێی بەرزبۆتەوە، ئەمەش بەهۆی هێزو بازوی خۆیەوە نییە، دەبینین وشتر بەهێزترە لە مرۆڤ، وە بەهۆی گەورەیی ئێسکەوە نییە، چونکە فیل ئێسکی گەورەترە، وە بەهۆی ئازایەتیشەوە نییە، چونکە دڕندەکان ئازاترن لێی، وە بەهۆی خواردنیشەوە نییە، چونکە گامێش ورگی لەمرۆڤ زل و گەورەترە، وە بەهۆی(دروست بوونیشەوە) نییە، چونکە بێ نرخترین وکەمترین شت پەلەورە، کەچی لە بارەی پەڕینەوە بەهێزترە، بۆیە مرۆڤ تەنها بۆ زانست لەلایەن خوداوە دروستکراوە.[1]

هەندێك لە زاناو پەندیارەکان ووتویانە:

خۆزگە ئەمزانی کەسێك ئەگەر زانستی لە کیس چوبێت، یان هەر نەیبێت، ئیتر ئەبێ بەچی گەیشتبێت؟! وە ئەگەر زانستی وەرگرتبێت و لێی بەهرەمەندبوبێت، ئیتر ئەبێ چی تری لەکیس چووبێت؟!!....

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

---

(١) خودا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ (الأنفال/٢٢) ، واتە: تەنها نەفام و نەزانەکانن دوورن لە حەقیقەتی مرۆڤایەتی، کە لە هەموو گیانلەبەرەکانی تر جیایان دەکاتەوە. بنوارە: إتحاف(٨٩/١). کەواتە مرۆڤ تەنها بۆ عیلم و زانست دروستکراوە: چونکە خودا دەفەرمووێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّالِيَعْبُدُونِ](الذاريات/٥٦)

هەركەسێك قورئانی پێ درابێت و لێی شارەزابووبێت، ئەگەر وابزانێت كەسێكی تر شتێكی لایە باشترە لەو، ئەوە بێ نرخ و بێ بایەخ سەیری زانستی كردووە كە خودابە گەورە ئەژماری كردووە.[1]

فەتحی موسڵیش[2]. فەرموویەتی:

ئایا نەخۆشێك كە خۆراك و ئاوو دەوای لێ قەدەغەبكرێت ، مەگەر ئەو كەسە بۆ خۆی نامرێت؟ لەوەڵامدا ووتیان: بەڵێ؟ فەرمووی:

دەیسا دڵیش هەر بەو شیوەیەو هەركاتێك سێ رۆژ حیكمەت و زانیاری و زانینی لێ بگریتەوە دەمرێت.[3]بەڕاستیجوان و چاكی فەرمووە و ئامانجێكی پێكاوە، چونكە بژێوی گیان و خواردنی دڵ زانست و پەندیارییە، وە ژیان بەوانەوە بەستراوەتەوە، وەك چۆن بژێوی تەن و لاشە بە خۆراكەوە بەندە، هەكەسێكیش زانستی ون كردبێت، ئەوە دڵی نەخۆش و كرمۆڵە و بەرەو مردن ئەیبات، بەڵام بۆ خۆی هەستی پێ ناكات، چونكە ئالودەبوونی بە دونیاو سەرقاڵی پێیەوە بێ هەست و شعوری كردووە، وەك چۆن ئەگەر ترس و بیم زاڵ ببێت بەسەر مرۆڤدا ئەو كاتە هەست بە ئازاری برینەكانی ناكات، كە لە راستیشدا بەئازارە، هەركاتێك مردن پەردەی لەسەر هەڵدا و قورسایی دونیای لەسەر لادا، ئەو كاتە هەست بە فەوتان و ئازار دەكات، ئاخ و حەسرەتی زۆری بۆ هەڵدەكێشێت و سوودیشی پێ ناگەیەنێت، وەك چۆن كەسێك ترسەكەی بڕەوێتەوە، یان سەرخۆشێك هۆشی بێتەوە بە خۆیدا، چۆن هەست بەو برین و ئازارە دەكات كە لەكاتی ترس و سەرخۆشیەكەیدا دوچاری بووە.

---

(١) رواه البيهقي في ((شعب الأيمان))(٢٣٥٢) و الخطيب في تأريخ بغداد(٩،٣٩٦)

(٢) فەتحی موصلی: یەكێكە لە ئەولیا گەورەكان و ڕەفیقی بیشری حافی و سەرِیی سەقەطی بووە.

(٣) انظر: ((مفتاح دار السعادة))(١/١٧٥) و أورد بعضها الشعراني في (طبقاته)(١/٨٠).

پەنا ئەگرین بەخودا لەو رۆژەی پەردەی سەراسەری لەسەرمان هەڵدەدرێتەوە، بەڕاستی ئەو خەڵکە وەك نوستوو بێ ئاگا وان، ئەوکاتەی دەمردن ئینجا ڕادەچڵەکن و هۆشیان بەخۆیاندا دێتەوە **(الناسُ نيامٌ إذا ماتُوا انتبهوا)**[1] حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

مرەکەب و حیبری سەرفرکراوی دەستی زاناکان ئەکێشرێت بە خوێنی شەهیدەکاندا کە ڕژاوە، مرکەبی زاناکان قورسترە لە خوێنی شەهیدەکان.[2]

هەروەها ئیبن و مەسعود (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

پێویستە فێری زانست بن پێش ئەوەی هەڵبگیرێت لەناوتانا، مردنی زاناو ڕاویی فەرمودەکان هەڵگرتنی عیلمە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، کەسانێك هەن لە ڕێی خودادا شەهیدکراون، حەز دەکەن خودا بە پلەی زاناکان زیندوویان بکاتەوە، کە دەبینن چەندێك ڕێزیان لێ گیراوە، هیچ کەسێکیش بە زانایی لە دایك نابێت، زانست بە کەسب و فێربوون دەست دەکەوێت.[3]

هەروەها ئیبن و عەباس (خودا لێیان ڕازی بێت) دەفەرمێت:

باسکردن یان وتنەوەی زانست لە بەشێك لە شەودا، لەلام چاکترە لەوەی

---

(١) ((كشـف الخفـاء)) (٤٣٢/٢). هەروەهـا ئیمـامی سـەخاوی سـەلماندویەتی کە فەرمـوودی حەزرەتی عەلی یە(خوای لێ ڕازی ببێت)، بنواڕە: إتحاف(٩٠/١).

(٢) رواه أبـو النعيم في (( تـأريخ أصـفهان))(١٧٨/٢) و ابـن عبـدالبر في(( جـامع بيـان العلـم و فضله))(١٥٣) من حديث عبدالله بن عمرو و أبي الدرداء، رضي الله عنها مرفوعا و أخرجه الشيرازي في ((الألقاب) عن أنس مرفوعا، فلعل الحسن سمعه من أنس((إتحاف)) (٩٠/١).

(٣) روى مغرقـا الا قولـه ((فوَالـذى... الخ) في الزهـد (٨٩٩) لأحمـد . ((سـنن الـدارمي)) (١٤٤)، و ((جامع بيان العلم و فضله))(١٠١٧).

تەواوی شەوەکە بە عیبادەت زیندوی بکەیتەوە.[1]

هەرواش دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێت)[2] هەروەها لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە ڕەحمەتی خودای لێ بێت.[3]

وە حەسەنی بەصریش فەرموویەتی:

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾(البقرة/٢٠١). واتە: حەسەنە و چاکەی دونیا، زانین و بەندایەتی‌یە ، چاکەی دوارۆژیش بەهەشتە[4]

وتیان بە هەندێك لە حەکیمەکان:

چ توێشوویەک هەڵبگرین و پاشەکەوتی بکەین؟

فەرمووی: ئەو شتەی بەکەڵکت بێت، کاتێك کەشتیەکەت لە دەریا ڕۆچوو فریات بکەوێت، ئەوەش هەڵگرتنی زانستە لەناو سینە و دڵدا، دەڵێن مەبەست لە غەرق بوونی کەشتی مردن و تیاچوونیەتی[5]

وەهەندێك لە داناکان دەفەرموون:

ئەوەی لغاوی حیکمەت و پەندیاری لە دەونا(خستیە ناو دەمیەوە)، خەڵکی بەرزی دەکەنەوەو دەیکەن بە پێشەوا، ئەوەش بە ووتەی پەندو حیکمەتەوە ناسرا، چاوەکان بە سام و ڕێزەوە سەیری دەکەن.[6]

حەزرەتی شافعیش خودای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی:

---

(١) رواه عبدالرزاق في ((المصنف)) (١١/٢٥٣).

(٢) حلية الأولياء (٢/١٩٢).

(٣) بنوارە: ((جامع بيان العلم و فضله)) (١٠٨) و ((مفتاح الدار السعادة)) (١/١٧٤).

(٤) الترمذي(٣٤٨٨).

(٥) جامع بيان العلم و فضله(٢٨٠).

(٦) جامع بيان العلم و فضله(٢٨١).

نیشانەی نرخ و شەرەف و بەهای زانستی ئەوەیە لە شتێکی کەمیشدا بدرێتە پاڵ هەرکەسێك پێی دڵخۆشە، ئەگەر لێیشی لابرێت و نیسبەتی لەبیر چونەوە و نەزانین بدرێتە پاڵی، ئەوا خەفەتبار و نیگەرانە.[1]

حەزرەتی عەمەریش (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

لەسەرتانە خۆتان فێری زانست بکەن، خودای گەورە پۆشاکی خۆشەویستی هەیە، ئەوەی بەدوای دەروازەیەکی زانست دا بگەڕێت، بە پۆشاکی خۆشەویستی خۆی دای دەپۆشێت، ئەگەر گوناهێکی کرد داوای لێ دەکات لێی بگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، بۆ ئەوەی پۆشاکەکەی لێ نەکاتەوە، با ئەو گوناهەش درێژە بکێشێت و تا مردن لێی نەبوبیتەوە.[2]

ئەحنەفی کوڕی قەیس(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

خەریکە زاناکان وەك پادشاو سەیدەکان سەیریان بکرێت، وەهەموو شکۆو سەربەرزیەك پاڵپشتی نەگیرا بە زانست و تۆکمە نەکرایەوە پێی، ئەوە سەری لە زبللەتەوە دەردەچێت.[3]

سالمی کوری ئەبو جەعدی تابیعی فەرموویەتی:

گەورەکەم منی بە سێ صەد دیرهەم کڕی، وە ئازادی کردم، بەخۆمم ووت: چ پیشەیەك بکەم و خەریکی چی بم؟ خوم دایە پیشەی زانستی، ماوەی ساڵێکی نەخایەند(ئەوەندە ناوبانگی زانستیم بڵاو بویەوە) فەرمانداری مەدینە هات بۆ سەردان بۆ لام، ڕێگەم نەدا بێتە ژوورەوە.

زوبەیری کوڕی ئەبوبەکر (قازی مەککە فەرمویەتی):

---

(١) ذكر حافظ الزبيدي: بأنه روى عنه بأسناد (حسن) . ((إتحاف))(٩٢/١) وهو في ((الجامع بيان العلم و فضله))(٢٩٥) بغير نسبة.

(٢) ((جامع البيان العلم و و فضله))(٣٠٠) . و ((إتحاف))(٩٢/١).

(٣) رواه الدينوري في ((المجالسة))، ((و جوهر العلم)) (٣٢٩)

باوکم له کاتێکدا له عێراق بوو نامەیەکی بۆ نوسیم و فەرمووی:

پێویستە خۆت بە زانستەوە خەریك بکەیت، ئەگەر کەم دەس بویت دەبێتە ماڵ و سامان بۆت، ئەگەر دەوڵەمەندیش بوویت و زانا بیت ئەوە دەبێتە جوانی و زیاتر دەترازێنێتەوە.[١]

لەوەسێتەکانی حەزرەتی لوقمان بۆ کوڕەکەی دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی:

ئەی کوڕم:

لەگەڵ زاناکاندا دابنیشە، ئەژنۆ گیر بکە لە ئەژنۆیان

(واتە: بە چۆکا لەبەردەمیاندا دابنیشەو لێیان نزیك بکەوەرەوە) چونکە خودای گەورە دڵەکان ئاوەدان دەکاتەوە بە نووری حیکمەت و پەندیاری خۆی، وەك چۆن زەوەی وشکانی بەڕێژنەی بارانی ئاسمان دەژیێنێتەوە.[٢]

وە هەندێك لە حەکیمەکان فەرموویانە:

ئەگەر زانایەك بمرێت نەهەنگی دەریاو پەلەوەری ئاسمان بۆی دەگرین، لاشەیان لەبەرچاودا نامێنێت، بەڵام ناوو شۆرەتیان هەمیشە لەسەر زوبانەو یادیان دەکرێتەوە.[٣]

وە هەروەها ئیمام زوهەری فەرموویەتی:

زانست نێرەو گەورەیە، پیاوە بەهێزو بەتواناکان خۆشیان دەوێت.[٤]

---

(١) المدخل الى السنن الكبرى(٣٩٩).

(٢) الموطاء(١٠٠٢/٢) بلاغا. و عند البيهقي في (( المدخل إلى السنن الكبرى)) (٤٤٥). عن عبدالله بن عمر رضى الله عنها.

(٣) انظر((إتحاف)) (٩٣/١)

(٤) رواه أبو نعيم في الحلية(٣٦٥/٣) و ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله))(٢٩٦).

# گەورەیی و بەهای
# خوێندن و فێربوون

## (ئایەتە پیرۆزەکان)

خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾التوبة/ ١٢٢

واتە:

(با لە ناو هەر کۆمەڵگایەك دەستەیەکیان بچنە دەرێ، تا لە دین شارەزا دەبن و کە گەرانەوە ناو هۆزیان بیانترسێنن: بەشکو خۆیان بپارێزن)[١]

هەروەها خودای بەدەسەلات فەرموویەتی:

﴿فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾النحل/ ٤٣

واتە:

( ئەگەر نازانن، لە ئەهلی قورئان بپرسن تاحاڵیتان بکەن و تێتان بگەیەنن)[٢]

---

(١) قورئانی پیرۆز: وەرگێرانی هەژار ل ٢٠٥.

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی: ل ٢٧٢.

# هەواڵ و فەموودەکان

وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((مَنْ سلَكَ طَرِيقاً يطلُبُ فيهِ عِلماً، سلكَ اللهُ بِهِ طريقاً الى الجَنَّة))[١]

واتە:( هەر کەسێک ڕێگا بگرێتە بەرو مەبەستی وەرگرتن و فێربوونی زانست بێت، خودای گەورە بەهۆی زانستەکەوە دەیخاتە سەر ئەو ڕێگایەی بەرەو بەهەشتی دەبات.)

هەروەها فەرموویەتی(ﷺ):

((إنَّ الملائكَة لتَضعُ أجنَحتَها لطالبِ العِلم رِضاً بما يَصنَع))[٢]

واتە: (فریشتەکان باڵەکانیان ڕادەخەن بۆ فێرخوازو ئەوانەی بەدوای زانستدا دەگەڕێن، وەك نیشانەی دەربڕینی ڕەزامەندی لە هەوڵەکەیان.)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((لأن تَغدُوَ فتَعلَمَ باباً مِن العِلم، خَيرٌ مِن أَن تُصلِّي مِئَةَ رَكعَةٍ))[٣]

واتە: ( ئەگەر بەیانیان زوو هەستیت و بەشێك لە زانست فێر ببیت، چاکترە بۆت لەوەی صەد ڕکات نوێژ بخوێنیت.) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((بابٌ مِن العِلم يتَعلَّمُه الرَّجلُ خيرٌ لهُ مِن الدُّنيا و ما فيها))[٤]

---

(١) رواه مسلم(٢٦٩٩) من حديث أبي هريرة باب فضل الإجتماع على تلاوة القرآن، كتاب الذكر.

(٢) رواه أحمد في مسنده (٢٣٩/٤) (١٧١٢٣) وابن حبان في صحيحه،١٤٨/٤(١٣١٩) والحاكم في المستدرك،١٨٠/١(٣٤١) وصححه من حديث صفوان بن عسَّال.و هو بتمامه عند الترمذي.

(٣) رواه ابن عبدالبر في (( جامع بيان العلم و فضله))(١١٤) و بنحوه عن ابن ماجة(٢١٩)

(٤) له فەرموودەکانی ئیمام حەصەنی بەصری یە. بنوارە (( روضة العقلاء)(٤٠) و ((جامع بيان العلم و فضله))(٢٥٥).

واته: (ئەگەر کەسێك بەشێك لە زانست فێر ببێت، باشترە بۆی لە هەموو دونیا وئەوەیشی کە لەناویایەتی).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **((طلبُ العِلم فَريضةٌ على كُلِّ مُسلِم))**[1]

واتە: ( فێربوون و گەڕان بەدوای زانستدا، فەرزو پێویستە لە سەر هەموو موسوڵمانێك).

وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: **((أُطْلُبُوا الْعِلْمَ و لَو بالصِّين))**[2]

واتە:( ڕێگای دوور بگرنە بەر بۆ فێربوونی زانست، با لەوڵاتی چینیش بێت.)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((العلمُ خزائنٌ مِفتاحُها السُؤالُ، فاسألوا،فإنَّه يُؤَجَّر فيه أربعةٌ: السائِلُ، والعالِمُ، والمُستَمِعُ، والمُحِبُّ لهم))**[3]

واتە: ( زانست گەنجینەیە، کلیلی کردنەوەی دەرگای گەنجینەکان پرسیار کردنە، کەواتە پرسیار بکەن، چوار کەس بەو پرسیارکردنە پاداشت وەردەگرن: ئەوەی پرسیار دەکات و، ئەو زانایەی کە پرسیاری لێ دەکرێت و، کەسانێکیش کە گوێ بیستی پرسیارو وەڵامەکە دەبن و، ئەوەش کەخۆشی لێیان دێت).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((لايَنبَغي للجاهِل أَن يَسكُتَ عَلى جَهلِه، ولا للعالم أنْ يَسكُت عَلى عِلمهِ))**[1] واتە: (نابێت نەزان بەو نەزانییەی خۆی دابکەوێت و بێ دەنگ بێت،

---

(١) رواه ابن ماجة(٢٢٤)، وانظر: الإتحاف(٩٧/١)

(٢) رواه البيهقي في ((المدخل)) (٣٢٤) و ((الشعب)) ( ١٥٤٣) و ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله))(٢٠).

(٣) رواه أبو نعيم في ((الحلية))(١٩٢/٣). وقال الزبيدي: و أخرجه العسكري في ((الأمثال)) بمثل رواية الحلية، وأورده صاحب ((القوت)) إتحاف(٩٩/١).

وە نـابێت زانسـتـەکەی بشـارێتەوە و بێ دەنـگی لێبکات، بەڵکو دەبێت نەزان پرسیار بکات و زاناش عیلمەکەی بڵاوبکاتەوە.)

وە لە فەرموودەی ئەبوزەری غەفاریدا( خودای لێ ڕازی بێت ) هاتووە:

**((حضُور مَجلِس عالِمٍ أفضلُ مِنْ صَلاة ألفِ رَكعةٍ وعِيادَة ألفِ مَريضٍ وَشُهودِ ألفِ جَنازة) فقيل: يا رسول الله،ومِن قراءة القرآن؟**

**فقالﷺ: (وهل يَنفعُ القرآن إلا بالعِلم))**[٢]

واتە: (ئامادەبوون لە دانیشتنێک کە زانست و زانینی تیا وەربگیرێت چاکترە لە کردنی هەزار ڕکات نوێژی سونەت و سەردانی هەزار نەخۆش و حازربوون بۆ ئەسپەردە کردنی هەزار جەنازە. عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا، لە خوێندنەوەی قورئانیش گەورەترە؟ فەرموی(ﷺ):

ئایا بەبێ عیلم و زانست قورئان هیچ سوودێك دەگەیەنێت؟!).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَن جاءَهُ المَوتُ وهُو يَطلُب العِلمَ ليُحيِي بهِ الإسلام فَبينَه وبَين الأنبياءِ في الجَنة درَجةٌ واحِدَة))**

واتە: (ئەوەی خەریکی فێربوونی عیلم بێت بەمەبەستی ژیانەوەی ئیسلام لەناکاودا مردن ئێخەی پێ بگرێت، میانی ئەو و پێغەمبەران لە بەهەشتدا تەنها یەك پلەیە).

---

(١) رواه الطبراني في الأوسط ٢٩٨/٥(٥٣٦١): وابن مردوية في التفسير، كما في الدرر للسيوطي، ١٣٣/٥، وابن السني وأبو نعيم في رياضة المتعلمين. من حديث جابربسند ضعيف. وانظر تخريجه ((إتحاف))(٩٩/١)

(٢) بۆیە باسی ڕیوایەتی ئەبو زەڕی کرد چونکە پێشتر باسی ئەو حەدیسە کراوە کە دەڵێت: ياأباذر.... بنوارە: قوت القلوب(٦٧/١) الإتحاف: (٩٩/١). وسنده غير صحيح.

# (بەڵگەی ئاسارەکان)

عبداللەی کوڕی عباس (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

**(ذَلَلْتُ طالِباً فعَزَزْتُ مَطلوباً)**[1]

واتە:

(خۆم هیلاك کرد و هەموو نارەحەتیەکانم قەبوڵ کرد لە پێناوی وەرگرتنی زانستدا، تا وام لێهات بەشکۆمەندییەوە بەدوامدا دەگەڕان.)[2]

هەروەها حەزرەتی عبدالله فەرمویەتی:

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، ووتم بە پیاوێکی(ئەصحاب) بابچین لە صەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زانست فێرببین، ئەوان زۆرن.

ووتی:

وەڵڵاهی سەرم لێت سوڕماوە ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس! ئایا وادەبینی کە ئەو خەڵکە پێویستیان بە تۆ هەبێت، کە ئەو هەموو ئەصحابانی پێغەمبەرە لە ژیاندان و دەیانبینیت؟ ئەفەرموێت:

منیش وازم لەو هێناو دەستم کرد بە پرسیار کردن( بەدوای زانین دا) یەك لەدوای یەك دەگەڕام بەدوای هاوەڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ، جاری واهەبوو بە عەباکەم خۆم دادەپۆشی لەبەردەم دەرگای یەکێ لەو صەحابانەی کە بیستبوم فەرمودەیەکی پێغەمبەری لایەو لێی بیستووە، خۆم لە باو (تەپوتۆز) دەپاراست تا دەهاتە دەرەوە، کە منی دەبینی دەیفەرموو:

---

(١) رواه الدينوري في (( المجالسة و جواهر العلم)) ص(٢٨٤)

(٢) إتحاف (١/١٠١).

ئەی کوڕی ئامۆزای پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ کارێکت هەیە؟ئەمووت:

فەرمودەیەکە کە دەڵێن تۆ لە پێغەمبەری خودات بیستووە، ئەمەوێ لە خۆتی ببیستم، ئەیووت بۆچی نەتنارد بەشوێنمدا با من بهاتمایە بۆ لات، منیش ئەمووت:

ئاخر هەقی منە بێم بۆ لات (چونکە (ئیبن و عەبباس) دەیەوێت لەوەوە فێر ببێت بۆیە دەبێ بچێت بۆلای) ئەو پیاوەش کە باسمان کرد منی ئەبینی، پاش ماوەیەك صەحابەکان بەڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن و، خەڵکەکەش پێویستیان بە من هەبوو، کابراش دەیووت:

بەڕاستی تۆ لە من زاناتر بویت( کە کۆڵت نەداو ئەمڕۆ هەمو پێویستییان پێت هەیە).[1]

هەر بەم شێوەیە(ئیبن و ئەبی مەلیکە) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەڵێت:

کەسم نەدیوە وەك ئیبن و عەبباس ، ئەگەر بتبینیایە روخسارێکی لە هەموو کەس جوانترت دەبینی، گەر قسەی بکردایە .. لەهەموو کەس زوبان پاراوتر بوو، ئەگەر فتوایشی بدایە لە هەموو کەس زاناتر بوو.[2]

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی:

سەرم لەو کەسە سوڕماوە کە بەدوای زانستدا نەگەڕاوە، ئیتر چۆن بەتەما بێت نەفسی خۆی بەرەو ئاکارو ڕەوشتی بەرز ببات.[3]

هەندێك لە حەکیمەکان دەڵێن:

---

(١) أخرجه الحاكم في المستدرك و الطبراني بسندها عن عكرمة عن ابن عباس (رضي الله عنها) أنظر إلى تخريجه في الإتحاف (١٠١/١).

(٢) أورد ابن عبد ربه في ((العقد الفريد))(٨/٤).

(٣) جامع بيان العلم و فضله(٢٨٦)، و (( سير أعلام النبلاء)) (٣٩٨/٨)

من بەزەیم بە هیچ کەسێکدا نایەتەوە ئەوەندی کە بەزەییم بەیەکێك لەم دووپیاوەدا دێتەوە:

پیاوێك ئەودانی دوای فێربوون و زانستە و لێی تێ ناگات.

وە پیاوێکیش کە تێگەیشتنی هەیە بەڵام بەدوایدا ناگەڕێت.[1]

ئەبو دەرداء( خودای لێ ڕازی بێ) فەرموویەتی:

ئەگەر بابەت و پرسیارێکی شەرعی فێربیم، پێم خۆشترە کە شەوێ تا بەیانی بە عیبادەت زیندوی بکەمەوە.[2]

هەروەها فەرموویەتی:

زاناو فێرخواز هەردوکیان بەشدارن لە خێر و چاکەدا، تێکرای خەڵکەکەی تر وەك مێش و مەگەز وان (نرخ بەهایان نییە)، وە خێریان تیا نییە.[3]

هەروەها فەرموویەتی:

یان زانا بە، یان بەدوای زانستا بگەرێ و فیرخواز بە، یان گوێ گربەو (قسەی باش ببیستە)، چوارەمیان مەبە، چونکە کەڵکی نابێت و تیا دەچیت و تەمەنت بە زایە لە دەست دەدەیت.[4]

عەطاء (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی:

یەك دانیشتن سازکرابێت بۆ زیکری خودا، حەفتا مەجلیسی گەمەو گاڵتە دەسڕێتەوە و دەشۆرێتەوە.[5]

حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بیت) فەرموویەتی:

---

(١) جامع بيان العلم و فضله (٦٤٢) و نسب للفراء....

(٢) ((الفقيه و المتفقه)) (٥٥).

(٣) جامع بيان العلم و فضله (١٣٤) و روي مرفوعا كما هو عند (ابن ماجه)(٢٢٨).

(٤) جامع بيان العلم و فضله (١٤٢-١٤٤).

(٥) قوت القلوب(١/١٤٩)

مردنی هەزار عابید و خوداپەرست کە شەو بێداربێت و شەو نوێژبکات و، ڕۆژیش بەرۆژوو بێت، ئاسانترە لە مردنی پیاوێکی ژیری بەرچاو ڕوونی شارەزا لە حەرام و حەڵاڵ.[1]

هەروها شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت): فەرموویەتی:

بەدوا گەڕانی زانین و زانست خێری زیاترە لە سوننەت(نافیلە).

**(طلبُ العِلمِ أفضَلُ مِنَ النَّافِلَةِ)**[2]

ئیبن و عەبدولحەکیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێت)فەرموویەتی:

لە خزمەت ئیمامی مالیك دابوم، کتێبە علیمیەکانم بۆ ئەخوێندەوە، وەختی نیوەڕۆ داهات، کتێبەکانم کۆکردەوە نوێژبکەم؛ فەرموی:

فلانی ئەوەی بۆی هەڵدەستیت لەوەخێری زیاترو گەورەتر نییە کە تیایدا بویت، بەمەرجێك نیەتێکی دامەزراوت هەبێت.[3]

هەروەها ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

هەرکەسێك وابزانێت کە ڕۆیشتنی بەرەبەیان بۆ وەرگرتنی زانست لە جیهاد گەورەتر نییە، ئەوە کەموکوڕی لە ڕاو بیر و بۆچونی دا هەیە.[4]

---

(١) زوائد مسند الحارث (٢ ، ٨١٣)

(٢) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء))(١١٩/٩)، و البيهقي في ((مناقب الشافعي))(١٣٨/٢).

(٣) شرف الأصحاب الحديث (١٢٧) بنحوه، و أنظر((الإتحاف)).

(٤) ((جامع بيان العلم و فضله))(١٥٩).

# گەورەیی فێرکردن

## بەڵگەی ئایەتەکان

فەرموودەی خودا ﷻ:

﴿ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ ﴾التوبة/١٢٢

واتە:( کاتێك گەڕانەوە بۆ ناو هۆزو نەتەوەکەیان بیانترسێنن و بێداریان بکەنەوە). مەبەست لەوەیە فێریان بکەن و ڕێنومایی خێریان بکەن.

فەرموودی خودا ﷻ:

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾آل عمران /١٨٧،واتە: ( ئەوسا خودا بەڵێنی لەو کەسانە ساند کە کتێبیان بۆ هاتووە، بە مەردمی ڕاگەیەنن و نەیشارنەوە).[١] ئەمەش نیشانەیەکە پێویستە فێریان بکەن.

وە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾البقرة/ ١٤٦

واتە:( دەستەیەکیان هەرچەندە دەزانن هەق چییە، دەیشارنەوە).[٢]

واتە: حەرامە حەق و ڕاستیەکان بشارنەوە. وەك چۆن خودای گەورە لە بارەی شایەتی دانیشەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ﴾البقرة/٢٨٣

---

(١) قورئانی پیرۆز مامۆستا هەژار ل ٧٥.

(٢) قورئانی پیرۆز مامۆستا هەژار ل ٢٣.

واتە:( هەر کەسێك لە شایەتی خۆ ببوێرێ بەدڵ، خۆی توشی گوناح دەکات). پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

**(ما آتَى اللهُ عالِماً عِلْماً إلاَّ وأَخَذَ عليهِ مِنَ المِيثاق ما أَخذَ علَى النَبيّينَ أن يُبَيّنوُه للنَّاس ولا يَكتُموُه))**[1] واتە:

(خودای گەورە زانستی بە هەر زانایەك دابێت، پەیمانی ڕاستەقینەی لێ وەرگرتووە وەك ئەو پەیمانەی کە لە پێغەمبەرەکانی وەرگــرت، کــە دەبێ نەیشارنەوەو ڕونی بکەنەوەو ڕایبگەێنن بەخەڵکیدا)

[واتە: ئەگەر ئەو پەیمانەی لێ وەرنەگرتبێ زانستی پێ نەداون]

وە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾فصلت/٣٣.

(واتە: کێ قسەو گوفتاری لەوکەسە جوانتر و بەپێزترە کە کردەوەی چاکە بکات و خەڵکیش بانگ بکات بۆ لای خودا، بانگەشەی دین بکات و بە ئەرکی خۆی هەڵبستێ).

وەخودای گەورە فەرمویەتی:

﴿ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ﴾النحل/١٢٥

واتە:(بە دانایی و پەندیاری و شارەزاییەوە خەڵکی بانگ بکە، بۆ سەر ڕێگای خوداناسی).

هەروەها فەرموویەتی:

﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ الجمعة/٢

واتە: (لە کتێب و لە کارزانی ڕایان بهێنێت و فێریان بکات).

---

(١) رواه ابن عدي في(الكامل) ٢٨٧/٢) وابن عساكر في (تأريخ دمشق) ٣٦٨/٥٥)

# بەڵگەی فەرموودەکان (ئەخبار)

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) حەزرەتی معازی نارد (خودای لێ ڕازی بێت)بۆ یەمەن، پێی فەرموو:

((لأن يَهدي اللهُ بِكَ رَجُلاً واحِداً خَيرٌ لكَ مِنَ الدُّنيا وَما فيها))[1]

واتە:(ئەگەر خودای گەورە بە هۆی ڕێنومایی تۆوە تاقە یەك كەس هیدایەت بدات و بكەوێتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەوە بۆ تۆ لە هەموو دونیاو ئەوەش لەناو دونیادایە باشترە ).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((مَن تعَلَّم باباً مِنَ العِلم ليُعلِّم الناسَ أُعطِيَ ثَوابَ سَبعينَ صِدِّيقاً))[2]

واتە:

(هەر كەسێك فێری بەشێک و دەرگایەك لە زانستی ببێت، بەو نیيەتەی خەڵكی لێ فێربكات، ئەوە پاداشتی حەفتا ڕاستگۆ و صدديقی پێ دەدرێت.).

هەروەها حەزرەتیعیسی(عليه السلام) فەرمویەتی:

---

(١) رواه ابن المبارك في ((الزهد)) (١٣٧٥) بلفظه، و أصله في البخاري(٣٧٠١) ومسلم (٢٤٠٦) قاله لعلي رضي الله عنه.

(٢) نسبه الحافظ المنذري في ((الترغيب و الترهيب))(١٢٦/١) للديلمي في ((مسند الفردوس))، [وللطبراني في المعجم الكبير،١٢٩/٨(٧٥٩٠)، عن أبي إمامة رفعه: **أي ناشىء نشأ في طلب العلم والعبادة حتى يكبر، أعطاه الله يوم القبامة ثواب سبعين صديقاً**. ويوسف بن عطية الصفار منكر الحديث، ورواد الطبراني في مسند الشاميين، ٣١٩/٤(٣٤٢٣) من رواية أبي سنان الشامي عن مكحول، مقتصرا على ذكر العبادة، وقال: أجر تسعة وتسعين صديقا، وأبو سنان مختلف فيه، انظر: الإتحاف السادة المتقين(١٠٦/١)].

**((مَن عَلِمَ وعَمِل وعَلَّمَ، فذلِكَ يُدعَى عَظيماً في مَلكوُت السَّماوات))**[1]

واته:(هەرکەس فێربیێت و کاری پێ بکات و خەڵکیش فێربکات، ئەوە لە ناو نشینگەی ئەولیاو گەورەیانی ناو ئاسمانەکاندا زۆر بە گەورە و مەزن ناوی دەبرێت).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی:

**((إذا كانَ يومُ القيامةِ يَقولُ اللهُ سُبحانه للعابدينَ والمُجاهدين:**

**ادخلوا الجنَّة، فيقولُ العُلماءُ بفَضلِ عِلمِنا تَعبَّدُوا وجاهَدوا، فيَقولُ اللهُ (عزَّوجَل) أنتُم عِندي كبَعض مَلائِكَتي،اشفَعوا تُشفَّعُوا، فيَشفَعُونَ ثُمَّ يُدخَلونَ الجنَّة))**[2]

واته: (کاتێك رۆژی قیامەت دێتە پێشەوە، خودای گەورە بە بەندە تایبەتیەکانی و موجاهیدەکان دەفەرموێت: بچنە ناو بەهەشتەوە، زاناکانیش دەڵێن:

بەهۆی زانستەکەی ئێمە بوو کە عیبادەتیان دەکرد و لەرێی خودادا جیهادیان دەکرد، خودای گەوەرش پێیان دەفەرموێت:

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٦/٩٣). و ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله)) (٧٩١، ١٠١٦). [قال الزبيدي: لم يخرجه العراقي، وقد أخرجه أبو خثيمة النسائي في كتاب العلم، وأخرج إبن الجوزي في كتاب ترجمة سفيان الثوري بسنده إلى سفيان قال:
**من علِمَ وعمل وعلَّم دعي عظيماً في ملكوت السماء.**
و ذكر الترمذي(٢٦٨٥) عن فضيل بن عياض قال: **عالمٌ عاملٌ معلمٌ يُدعى كبيرا في ملكوت السماء]**

(٢) قال العراقي: (رواه المرهبى في ((العلم)) عن رواية محمد بن السائب عن أبي صالح عن ابن عباس)، و بحث فيه الزبيدي، أنظر ((الأتحاف))(١/١٠٧).

ئێوە لای من وەک هەندێك لە فریشتە (نزیکەکانم) وان، تکاو شەفاعەت بۆ کێ دەکەن دەبن بە تکاکاریان و ڕجاتان وەردەگیرێت، ئەوانیش چ تکایەکیان هەبێت دەیکەن و لە پاشان دەچنە ناو بەهەشتەوە).

ئەمەش تەنها بەو زانستە دەبێت، کە وەرگیرابێت و گەێنرابێت بە کەسانی تر، نەك زانینێك کە پێیەوە لکابێت و لێی جیانەبوبێتەوەو کەس سوودی لێ وەرنەگرتبێت.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

**((إنَّ الله (عزَّوجَل) لا يَنتَزِعُ العِلْـمَ انتِزاعاً مِن الناس بَعدَ أن يُؤتيهُم إياهُ، ولكِن يَذهبُ بذَهاب العُلَماء، فَكلَّما ذَهبَ عالِمٌ ذهَب بما مَعهُ مِن العِلم، حَتَّى إذا لَم يَبقَ إلاَّ رُؤَساءَ جُهالاً إنْ سُئِلوا أفتَوا بغَير عِلمٍ فيَضِلُّونَ ويُضَلُّون))**[1]

واتە: (خودای گەورە کاتێك کە عیلم و زانستی دا بەو خەڵکە، هەروا لەبن دەستیان دەرناهێنێت و ڕایبکێشێ و لەسەریانی هەڵبگرێت، بەڵکو بەرۆیشتنی زاناکان زانستەکانیش دەڕوات، هەرکاتێك زانایەك کۆچ دەکات، ئەو ئەندازە زانستەی کە پێیەتی لەگەڵیا سەردەنێتەوە، تاوای لێ دێت زانا (ناودارەکان) نامێنن، خەڵکەکەش بۆ خۆیان سەرانێکی نەزان دەکەنە مەرجەعی پرسیارەکانیان، کە پرسیاریان لێ بکرێت بەبێ زانین وەڵام دەدەنەوە و خۆشیان گومرا دەبن و خەڵکەکەش سەرگەردان و گومڕادەکەن).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَن عَلِم عِلماً فكتَمَه ألجَمَه اللهُ يَوم القِيامَة بلِجام مِن نار))**[2]

---

(١) (فضلوا وأضلوا) و رواه البخاري (١٠٠) و مسلم (٢٦٧٣).

(٢) رواه أبو داود(٣٦٥٨)، والترمذي(٢٦٤٩)، و ابن ماجة(٢٦١).

واته: (ئەوەی زانستێك فێرببێت و بیشارێتەوە (پرسیاری لێ بکەن و بڵاوی نەکاتەوە) لە ڕۆژی قیامەتدا لغاوێکی ئاگرین دەخرێتە ناو دەمیەوە).

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی:

**((نِعمَ العَطِيَّة ونِعمَ الهَدِيَة كَلِمَة حِكمَةٍ تسمَعُها فَتَطوي عَليها، ثُمَّ تَحمِلُها إلى أخ لَكَ مُسلِمٍ تُعَلِّمُه إياها، تَعدِلُ عِبادَة سَنة))**[1]

واتە: (باشترین بەخشین و چاکترین دیاری، وشەیەکی بەسوود و پەندیارە، کە دەیبیستیت و لولی دەدەیت و دەیپێچیتەوەو، لە پاشان هەڵی دەگریت و بە دیاری دەیبەیت بۆ برایەکی موسوڵمانت، وە فێری دەکەیت ، بە ئەندازەی عیبادەتی ساڵێك خێرت بۆ دەنوسرێت).

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:

**((الدُّنيا مَلعوُنةٌ ملعُونٌ ما فيها، إلاّ ذِكرَ اللهِ سُبحانه وما والاهُ، أو مُعلِّماً أو مُتَعَلِّماً))**[2]

واتە:

(دونیا دەرکراو دورخراوەیە لە ڕەحمەتی خودا، ئەوانەش کە لە دونیا دان بەرین لە ڕەحمەت، لەوەتەی خودا دونیای دروست کردووە بە نەزەری ڕەحمەت سەیری نەکردووە، تەنها ئەوەی کە خودا خۆشی بوێت: دڵ بیداری و زیکری خودایە، لەگەڵ خۆشەویستی لە ناخی تاکەکاندا، یان لە میانی یەکتریدا، یان کەسێك فێرکەر بێت و زانستیان فێر بکات یان فێرخواز.)[3]

---

(١) رواه الطبراني في الكبير ،٤٣/١٢(٣٤٤) من حديث إبن عباس نحوه بسند ضعيف، [قال الزبيدي١ /١١٠: قال العراقي رواه إبن عدي في العلم، ٢٢/١، بهذا اللفظ. وقد أسنده الطبراني وفيه عمرو بن الحصين، تركه أبو حاتم وغيره.]

(٢) رواه الترمذي: (٢٣٢٢) و ابن ماجه (٤١١٢)عن أبي هريرة، قال الترمذي: حسن غريب.

(٣) بنوارە شەرحی ئیحیا، إتحاف السادة المتقين(١/١١٠).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

**((إن اللهَ سُبحانَه ومَلائِكتَه وأهلُ سَماواتِه وأرضهِ حتَّى النَّملةُ في جُحرِها، وحتى الحُوت في البَحر ليُصَلُّون عَلى مُعلِّم الناس الخَير))[1]**

واتە:(خودای گەورە ڕەحمەت ئەڕێژێت و، فریشتەکان و دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی، تەنانەت مێرووله لە هێلانەکەیداو نەهەنگی ناو دەریاش، داوای سۆزو ڕەحمەتی خودا دەکەن بۆ ئەو کەسەی کە خێرو چاکە فێری خەڵکی دەکات).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویە تی:

**(( ما أفادَ المُسلم أخاهُ فائِدةً أفضلَ مِن حَديثٍ حَسنٍ[2] بَلَغَهُ فبلَّغَه))[3]**

---

(١) رواه الترمذي(٢٦٨٥).وقال حسن غريب. [قال العراقي ويروي عن أبي هريرة أيضاً، قلت: وحديث أبي هريرة أخرجه الطبراني في الكبير. كما في مجمع الزوائد للهيثمي١٢٤/١، وسياقه كسياق حديث أبي أمامة]

(٢) قسەی جوان کە بە نادیاری باسی کردووە، لە ڕیزی یەکەمدا هەموو فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە، کە ببیستێت و وەری بگرێت و بیگەیێنێت، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

فەرمودەیەکی جوان(حسن)، مەبەستی پلەی حەدیسەکە نییە، کە (حسن) بێت، چونکە ناگونجێت بە فەرمودەی خۆی بفەرموێت قسەیەکی صەحیحە یان حەسەنە. بەڵکو مەبەستی هەموو وتەیەکی جوانە بە پێی فەرمودەی:

**( الحكمة ضالَّةُ المُؤمنِ أنَّى وجَدها أخذَها)** کە بیستی دەبێت بڵاوی بکاتەوە.

(٣) رواه ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله)) من رواية محمد ابن منكدر، ٤٣/١،(٢٠٢). قال الزبيدي: قال العراقي: وهو مرسل حسن الإسناد].وللمزيد ينظر:الإتحاف ١١١/١].

واتە:(هەرگیز نەیتوانیوە موسوڵمان سوودو قازانجی بە برا موسوڵمانەکەی بگەیەنێت، چاکتر لەوەی کە فەرموودەیەکی جوانی پێ بگات و ئەویش بە دیاری بە براکەی بگەیێنێت).

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی:

**((كلمةٌ مِنَ الخَيرِ يسمَعُها المُؤمِنُ فيُعَلِّمُها ويَعمَلُ بها خيرٌ لهُ مِن عِبادةِ سَنة))**[1]

واتە: (وشەیەکی خێر کەباوەڕدارێك بیبیستێت و کاری پێ بکات و خەڵکیشی لێ فێربکات، باشترە بۆی لەوەی ساڵێك بەندایەتی بکات و تەنها بۆ خۆی بێت).

ڕۆژێکیان پێغمەبەر(ﷺ) چووە دەرەوە، دوو کۆڕی بینی دانیشتبوون، **تاقمێکیان** نزایان بۆ حزوری خودا دەکرد و خەڵکیان هان دەدا بۆ لای خوداپەرستی.

**دووهەمیان** خەڵکیان فێر دەکرد، فەرمووی:

**((أما هَؤلاءِ فَيسأَلونَ اللهَ تَعالى، فإنْ شاءَ أعطاهُم وإنْ شاءَ مَنَعهُم، وأما هؤلاء فيُعلِّمونَ الناسَ، وإنَّما بُعثتُ مُعلِّماً، ثمَّ عَدل إليهم وجَلسَ مَعهُم))**[2]

واتە: (ئەوانەیان کە خەریکی عیبادەتن و نزا دەکەن، داوا لەخودا دەکەن ئارەزووی لێ بێت پێ یان دەدات، ئارەزویشی لێ بێت داواکەیان جێ بەجێ ناکات. بەڵام ئەوانەی تر خەڵکی فێر دەکەن، کە منیش تەنها بەوە ڕەوانەکراوم کە

---

(١) رواه ابن المبارك في ((الزهد والرقائق)) ٤٨٧/١(١٣٨٦) وتقدم بنحوه عند الطبراني. وفي مسند الفردوس[كما في جامع الأحاديث للسيوطي]٤٥٥/٥(١٥٩٣٩) من حديث أبي هريرة بسند ضعيف(**كلمةُ حِكمةٍ يَسمَعُها الرَّجلُ خيرٌ لهُ مِن عِبادَة سَنَة**).

(٢) رواه ابن ماجة(٢٢٩).

فێریان بکەم و تێ یان بگەیەنم، لە پاشان لای دا بۆ لای ئەمان و لەگەڵیاندا دانیشت).

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:

**((مثلُ ما بَعثَنيَ اللهُ عزَّوجَل بهِ مِنَ الهُدى والعِلمِ، كمَثلِ الغَيثِ الكَثير أصابَ أرضاً فكانَت مِنها بُقعَةٌ قَبِلَت الماءَ، فأنبَتَتِ الكَلأَ والعُشبَ الكثير، وكانت مِنها بُقعةٌ أمسكَت الماءَ، فنفَع اللهُ عزَّ وجَل بها النَّاسَ، فَشَرِبوا مِنها وسَقَوا وزَرَعُوا، وكانَت مِنها طائفَةٌ قيعانٌ لا تُمسِك ماءً ولا تُنبِتُ كلأ))**[1]

واتە: (نمونەی من کە خودای گەورە ناردومی بۆ ڕێنومایی کردنی خەڵك و فێرکردنیان، وەك نمونەی لێزمەبارانێکی زۆرە کە بکەوێت بەسەر زەویەکدا، بەشێك لەو زەویە پاك و پوختە، ئاوەکە وەردەگرێت، پوش و پەڵاش و رووەکێکی زۆر ئەڕوێنوێت، هەندێکیش لە زەویەکە ئاوەکە گلدەداتەوەو خەزنی دەکات، خودا دەیکاتە هۆی سوودبەخشی بۆ خەڵکەکە، لێی دەخۆنەوەو ئاوی پێ دەدێرن و زەرعاتی لەبەر دەکەن، وە لەو ئاوەی بۆ ڕادەکێشن، بەشێکیش لەو زەویە تەپۆڵکە و لا پاڵە، ئاو هەڵناگرێت و گژو گیایش سەوز ناکات.

کەواتە پێغەمبەر(ﷺ):

نمونەی خۆی کە بەزانست و ڕێپیشاندەر ڕەوانەکراوە، وەك بارانێکی بەبەرەکەتە، کە سوود بەهەموو شتێك دەگەیەنێت، دڵەکانیشی وەک زەوی داناوە، کە ئاوەکە هەڵدەگرێت و هەموو سوودێکی لێ دەبینرێت، وەك چۆن دڵ زانست وەردەگرێت و بەرهەمەکەیشی ئاشکرایە،

---

(١) رواه البخاري في كتاب العلم، باب فضل من علم وعمل، (٧٩) و مسلم(٢٢٨٢) من حديث أبي موسى.

# کەواتە خەڵکیش سێ جۆرن:

## یەکەمیان:

تێ دەگەن و لەبەری دەکەن، سوودو ئەحکامیشی لێ هەڵێنجێنن، نمونەی ئەمانە وەك ئەو زەویە وایە، کە ئاو گلدەداتەوە و، ڕووەك و درەختیش سەوزدەکات، ئەمانەش فوقەهای ئیسلامن و خێر دەدەنەوە.

## بەشی دووهەمیان:

شت و بابەتەکان وەردەگرن و لەبەری دەکەن، بەڵام لەواتا و مەبەستەکانی حاڵی نابن و ناتوانن حوکمی لێ وەربگرن، نمونەی ئەمانەش وەك ئەو کەسە وایە کە بەچاکی دەخوێنێت بەڵام لێی تێ ناگات، یان کەمێکی لێ تێ دەگات، ئەمەش وەك ئەو زەویەیە کە ئاوەکە هەڵدەگرێت و خەڵکی سوودی لێ دەبینن، بەڵام ڕووەکی لێ سەوزنابێت،

## بەشی سێیەمیشیان:

نە لەبەری دەکەن و نەتێیشی دەگەن، وەك ئەو بارانەی کە دەبارێت بەسەر زەویەکی ڕەق سەر بەرەو خواری وشکانی، نە زەویەکە سوودی لێ وەردەگیرێت کە ڕووەکی تیا شین ببێت، نەخەڵکیش سوودی لێ دەبینن و ئاوی لێ بخۆنەوە، یان ئاودێری زەرعاتی لێ بکەن.)[1]

**یەکەمیان**: نمونەیە بۆ ئەوانەی سوود لە زانستییەکەیان وەردەگیرن،[2]

---

(١) بنوارە إتحاف (١/١١٣-١١٤).

(٢) وەك لە تەواوکردنی فەرموودەکەی بوخاری هاتووە: (( **فذلك من فقه في دين الله و نفعه ما بعثنى الله به، فعلم و علم، ومثل من لم يرفع بذالك رأسا، ولم يقبل هدى الله الذى أرسلت به** )) البخاري(٧٩). وەك ڕونمان کردەوە.

**دوهەمیان**: نمونەی ئەوانەیە کە تەنها سوود دەگەیێنن.

**سێیەمیشیان**: بۆ ئەوەی بێ بەشە لەهەردوو خەصڵەتەک

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی:

**((إذا ماتَ ابنُ آدمَ انقَطعَ عمَلُه إلّا مِن ثَلاثْ، علمٌ يَنتَفِعُ بهِ ...الحديث))**[1]

واتە: (یەکێك لەوانەی کە دوای مردن سوود بە مردو دەگەیێنێت، ئەو زانستەیە کە بڵاوی کردۆتەوە و، دوای خۆی خەڵکانێك سوودی لێ وەردەگرن و، بۆ ئەمیش خێر دەداتەوە).

هەروەها (ﷺ) فەرمویەتی:

**((الدَّالُّ عَلَى الخَيرِ كَفاعِلِه))**[2]

واتە:

(ئەوەی خێرو چاکە پیشانی خەڵکی بدات، وەك ئەوە وایە کە خۆی بیکات).

هەروەها(ﷺ) فەرمویەتی:

**(( لاحسَدَ إلاَّ في اثنَتين، رَجلٌ آتاهُ اللهُ عزَّ وجَل حِكمةً فَهوَ يَقضي بها وَيُعلِّمها النَّاس، ورَجُلٌ آتاهُ اللهُ مالاً فهو يُنفِقُ منهُ سراً وجَهراً))**[3]

واتە:

(بە دوو کەس دەتوانی ئیرەیی پێ بەرێت: پیاوێك خودای گەورە زانست و پەندیاری پێ دابێت، ئەویش پێی بجوڵێتەوە و کاری پێ بکات و فێری خەڵکیشی

---

(١) رواه مسلم (١٦٣١).وأخرجه أيضاً في كتاب الذكر والدعاء باب كراهية تمني الموت(٢٦٨٢).

(٢) رواه الترمذي(٢٦٧٠) بلفظه، و أصله عند مسلم(١٨٩٣).

(٣) رواه البخاري (٧٣) و مسلم(٨١٦) ولفظه: **(( مالا فسلَطه اللهُ على هَلكَته في الحق))**

بکات، وه پیاوێکی تر که خوداماڵێــکی باشی پێ دابێت به ئاشکـراو پـەنهانی لـێـی ببەخشێتەوه و خێری لێ بکات ).

هەروەها (ﷺ) فەرمویە تی:

**((علَى خُلفائي رحمَةُ اللهِ، قيلَ: وَمَن خُلفاؤُك؟ قال: الَّذين يُحْيوُنَ سُنَّتي ويُعَلِّمُونَها عِبادَ الله))**[1]

واته:

( ڕەحمەتی خودا له جێنشینەکانم.

عەرزیان کرد: کێن ئەوانەی جێ نشینی تۆن؟

فەرموی: ئەوانەن کە سوننەتەکانی من زیندوو دەکەنەوەو بەندەکانی خودایان لێ فێردەکەن ).

---

(١) رواه الرامهورزي في المحدث الفاصل، (١) ورواه أبو نعيم في تأريخ أصفهان، ١١١/١]. [قال الزبيدي: قال العراقي: جعله الهروي متصلاً، وقال ابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله٤٦/١ ، إنه من مرسلات الحسن، فجعله البصري وهو الصواب.

وفي الباب عن علي ابن أبي طالب رواه الطبراني في الأوسط ٧٧/٦، (٥٨٤٦)، والرامهورزي في المحدث الفاصل، ٢/١٦٣، والهروي في ذم الكلام، ٢٣١/٤(٦٩٨) من رواية إبن عباس قال: سمعت علي ابن أبي طالب يقول: خرج علينا رسول الله ﷺ فقال:

**اللهم ارحم خلفائي، قلنا يارسول الله من خلفاءك؟ قال: الذين يأتون من بعدي يرون أحاديثي وسنَّتي ويُعَلِّمونها الناس**) وفي إسناده أبو طاهرأحمد بن عيسى، وهو كذاب كما قال الدرقطني، (كما في لسان الميزان للإبن حجر، ٢٤١/١).

قلت أما حديث علي فقد أخرجه الخطيب في شرف أصحاب الحديث، ص/٣٠، وقال الطبراني في الأوسط: بعدما أخرجه تفرد به أحمد بن عيسى العلوي، وفي الميزان ٢٤١/١. هذا الحديث باطل وأحمد كذاب. ]

# بەڵگە ئاسارەکان

حەزرەتی عومەر( خودای لێ ڕازی بێت)فەرمویەتی:

هەرکەسێك فەرمودەیەکی پێغەمبەر باس بکات و ڕایبگەیەنێت و کاریشی پێ بکرێت ، ئەوا هەمان خێری ئەوانەی پێ دەگات کە جێ بەجێی دەکەن و کاری پێ دەکەن.[١]

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

ئەوەی خەڵکی فێری خێر و چاکە دەکات، هەموو شتێك داوای لێ خۆش بوونی بۆ دەکەن، تەنانەت نەهەنگ و ماسی ناو دەریاش.[٢]

هەندێك لە زاناکان فەرموویانە: زانا دەچێتە میانی خەڵك و خوداوەندەوە، با سەرنج بدات و بزانێت چۆن ئەچێتە بەینیانەوە.[٣]

ئەگێڕنەوە سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) گەیشتە عەسقەلان، ماوەیەك لەوێ مایەوە، کەس پرسیاری لێ نەدەکرد، فەرمووی: وڵاخێکم بۆ بگرن بەکرێ با لەم شارە دەرچم، ئەم شارە زانستی تیا دەمرێت،

---

(١) رواه الحاكم في(( المدخل إلى الصحيح))(٨٧). و ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله))(٢٥٦) عنه مرفوعا.[قال الزبيدي: وشاهده حديث بلال بن الحارث المتقدم،١١٨/١]

(٢) رواه الدرامي في ((سننه))(٣٥٥) ابن عبدالبر في(( جامع بيان العلم و فضله))(١٨٠).[قال الزبيدي مر في أثناء حديث أبي أمامة فيما رواه الترمذي: **إن الله وملائكته وأهل السماوات والأرض**، وفي حديث أبي الدرداء( **وصلّت عليه ملائكة السماء وحيتان البحر**)]، وذكر الأجهوري في شرح صحيح البخاري ما نصه: بۆیە بە تایبەتی باسی حوت(نەهەنگ) کراوە چونکە ئەو ماسییە زوبانی نییە، ئەوەش زوبانی نەبێت لەوانەیە وا گومان ببرێت کە ناتوانێت داوای لێخۆشبوون بکات وەك گیانلەبەرەکانی تر، کە چەندێ بچوکیشن زوبانیان هەیە.

(٣) سنن الدارمي (١٣٩) و حلية الأولياء (١٥٣/٣) عن محمد بن المنكدر.

چونکە کەس پرسیار ناکات و ئەمیش توشی خێر نابێت

مەبەستی ئەوەیە گەیاندنی زانست زۆر گەورەیە، مانـەوەی زانســـت لـــە ناو خەڵکدا بڵاوکردنەوەیەتی.[1]

عەطاء(خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

چومە خزمەتی سەعیدی کوڕی موسەییب دەگریا، ووتم چی دەتگرێنێت؟!

فەرمووی: کەس نییە پرسیاری شتێکم لێ بکات.[2]

هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

زاناکان چراخانی هەموو کاتەکانن، هەریەکەیان گڵۆپی زەمانی خۆیانن، هاو چەرخەکانیان سوود لە ڕۆشناییان وەردەگرن.[3]

حەزرەتی حەسەنی بەصری فەرمویەتی: ئەگەر زاناکان نەبوونایە ئەو خەڵکە وەك ئاژەڵ و وڵاخیان لێ دەهات، واتە: بەفێرکردن ئەو خەڵکە دەرباز دەکەن لەو سنوورەی کە تایبەتە بە گیاندارانەوە، وە دەیانخەنە ڕیزی مرۆڤەکانەوە.

عیکریمە فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو زانستەی کە خودا پێی داویت نرخی خۆی هەیە، ووتیان: چییە؟ فەرمووی: ئەبێ لای کەسێك دایبنێیت و بەکەسێکی تری بڵێیت پارێزگاری لێ بکات و زایەی نەکات.[4]

یەحیای کوڕی معاذ فەرمویەتی:

زاناکان بەبەزەیی ترن بە ئوممەتی حەزرەت(ﷺ) لە باوك و دایکەکانیان، ووتویانە: ئەمە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: چونکە باوك و دایکیان لە ئاگری دونیا دەیانپارێـــزن، بەڵام زاناکان لە ئـــاگری دۆزەخ و دوارۆژ ڕزگاریان دەکەن.[1]

---

(١) جامع بيان العلم و فضله(١٠٤٦).

(٢) رواه ابن أبي شيبه في (المصنف) (٢٦٩٤٣) عن عطاء عن سعيد بن جبير.

(٣) رواه ابن بطة في ((الإنابة)) (٤١).

(٤) المحدث الفاصل(٥٧٥).

ووتــراوە: یەکەم قۆناغی زانین بێ دەنگییە، پــاشان گــوێ گــرتن، ئینجا لەبەرکردن لەپاشاندا کارپێ کردن و لە دوایشدا بڵاوکردنەوەی.[2]

ووتویانە: خۆت فێری ئەو زانست و زانیاریانە بکە کە نایزانیت، وە خۆت فێربکە لای ئەوانەی کە زانستیان لایە، ئەگەر ئەم کارەت کرد، ئەوەی نایزانیت فێردەبیت و، ئەوەیشی دەیزانیت لەبەری دەکەیت[3]

وقال معاذُ ابن جبلٍ في التعليمِ والتعلُّمِ ورأيتهُ مرفوعاً:

**(( تعلَّموا العلم فإنَّ تَعَلُّمَهُ للهِ خشيةٌ، وطلَبَهُ عِبادةٌ، ومُدارَسَتَهُ تَسبيحٌ، والبَحثَ عنهُ جِهادٌ، وتَعليمَهُ مَن لا يَعلَمهُ صَدقةٌ، وبَذلَهُ لأَهلهِ قُربَةٌ، وهوَ الأنيسُ في الوَحدةِ، والصّاحِبُ في الخَلوَةِ، والدَّليلُ على الدِّينِ، والمُصَبِّرُ على السرَّاءِ والضَّرَّاء، والوَزيرُ عِندَ الأَخِلّاءِ، والقَريبُ عِند الغُرَباء، ومَنارُ سبيلِ الجَنَّةِ، يَرفَعُ اللهُ بِهِ أَقواماً، فيَجعلَهُم في الخَيرِ قادَةً سادةً هُداةً، يُقتَدى بِهِم، أَدِلَّةً في الخَيرِ تُقتَصُّ آثارُهُم، وتُرمَقُ أَفعالُهُم، وتَرغَبُ المَلائِكةُ في خِلَّتِهِم، وبأَجنِحَتِها تَمسَحهُم، وكلُّ رطبٍ ويابسٍ لَهُم يَستَغفِرُ،حتّى حيتــانُ البَحرِ وهَوامهُ، وسِبــاعُ البَرِّ وأَنعــامهُ والسَّماءُ و نُجومُها))**[4]

حەزەتی معاز فەرموویەتی: خۆیشم دیومە کە ئەم فەرموودە بەرزکراوەتەوە و نیسبەتیان لە پێغیمبەردراوەﷺ کە فەرمویەتی:فێری زانین ببن، کە بەڕاستی بە دەستهێنــانی زانست لە ڕێی خودادا چاکەوترسانە لەخودا، بەدووکەوتنی

(١) ذكره السخاوي في المنهل العذب الروي (ص٨٥ ) و الشعراني في طباقاته(١/٨٠)

(٢) حلية الأولياء (٢/٣٦٣) و بنحوه من قول محمد الحارث (٨/٢١٨).

(٣) جامع بيان العلم و فضله (٦٤٧) و رواه عن الأحنف ابن عساكر في تأريج دمشق(٢٤/٣٤٤).

(٤) رواه أبو نعيم في الحلية (١/٢٣٨) موقوفا، و ابن عبدالبر في ((العلم)) مرفوعاً وقال إنه حديث حسنٌ جداً. (٢٦٨).قال الزبيدى ورواه أيضاً أبو طالب المكي في القوت،١/٢٣٣، والخطيب في الفقيه والمتفقه، ١/١٠٠.

عیبادەتە دەردەشە کردنی تەسبیحاتە، بەدواداگەڕان و شەونخونی کێشان بەدوایدا جیهادە، فێرکردنی بۆ ئەوانەی نایزانن خێراتە، فێرکردنی خاو خێزان مایەی نزیکی یە لە خودا، هەر زانستە کە بۆ خۆی لە تەنهایی دا هاودەنگە، لە خەڵوەت و خۆبەخۆدا هاوەڵە، ڕێپیشاندەرە لە سەر دین، ئارامی بەخش و مایەی خۆڕاگرییە لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا، پاڵپشتی بەهێزە لە ناو دۆستەکاندا، لە ناو غەریباندا دەبێتە خزم، ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای بەهەشتە، بەهۆی زانستەوە چەندین هۆز بەرزدەبنەوە، خودا دەیانکاتە سەرمەشقی چاکە و دەبنە سەرکردەو گەورە و ڕێپشاندەر، کە خەڵکی شوێن پێیان هەڵگرن، چاو لە کردەوەکانیان بکەن. شوێن ڕەوت و شوێنەواریان بکەون، سەرنج لە کردەوەکانیان بدەن، فریشتەکان حەز بەدۆستا یەتیان بکەن و باڵیان بەسەردا بکێشن، هەموو تەڕو وشکەکان داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکەن، تەنانەت نەهەنگ و ماسی و گیانداره وردیلەکانی ناو دەریاکان و دڕندەی دەشت و، چوارپێ و گیانداره کانیش. لەگەڵ ئاسمان و ئەستێرەکاندا.

چونکە بەڕاستی زانست و زانیاری ژیاندنەوەی دڵە لە کوێری و کوێرەوەری، نور و سۆمای چاوو دیدەیە لە تاریکیدا، هێزی لاشەیە لە حاڵەتی لاوازیدا، بە هۆی زانینەوە مەنزڵگا بەرزەکانی پیاوچاکان و پلە بەرزەکان دەبڕدرێت، تەنها بیرکردنەوە لە زانین خێری ڕۆژوی هەیە، توێژینەوەو باسکردنی وەك شەونوێژە، بەزانست دەتوانین خوداناسی بکەین، بەهۆی زانستەوە بەندایەتی و یەکتاپەرستی و خۆپارێزی لە گوناه و تەمجید و پێ هەڵدانی پەروەردگارت بۆ دەکرێت، دەتوانی سیلەی ڕەحم بە جێ بهێنێت، حەرام و حەڵاڵ لە یەك جودا بکەیتەوە، زانین پێشەوایەو، کارپێکردنیشی شوێن کەوتنیەتی،ئەوانەی بەختیارن خودا زانست دەخاتە دڵیانەوەو بەدبەختە کانیش لێی بێ بەش دەبن.

داوادەکەین لەخوداڕێگای سەرفرازیمان پێ ببەخشێت.

# شایەت و بەڵگە عەقڵییەکان

بزانە! ئەوەی لێرەدا پێویستە بزانرێت، گەورەی و بەنرخی و قەدرگرانی زانستە، ئەگەر لە سەرەتاوە نەزانرێت تاریف و فەزیلەتی چییە و لێکۆڵینەوە لە بنج و بناوانی نەکرێت، ناتوانی کە بیکەیتە خەصلەت و پێناسە و بیدەیتەوە پاڵ زانین یان هەر بەشێکی تر، ئەوانەی بەتەمان بیسەلمێنن کە ئایا زەید حەکیمە یان نا، بەهەڵەدا چوون کە بەتەمابن ئەمەیان بۆ دەربکەوێت و ، هێشتا لەواتا و ناوەرۆکی حیکمەت و پەندیاری تێنەگەیشتبن.

فەزیلەت وەرگیراوە لە (فەزڵ)، بەواتای زیاد بوون، ئەگەر دوو شت لە فرمانێکدا هاوبەش بن یەکێکیان تایبەتمەندییەکی زیاتری هەبوو لەو بوارەدا ئەوا پێی دەڵێن بارسەنگی هەیە، فەزڵی زیاترە، ئیتر ڕێژەی ئەو زیاد بوونە لە هەر ئاستێکدا بێت، ئەوە زیادەیەکی بەسەریدا هەیە، وەك دەوترێت:

ئەسپ لە گوێدرێژ باشترە، بەواتای هاوبەشییان لە بار هەڵگرتندا و بە هێزی و زیاتر باشی ئەسپە لە خێرایی هاتوچۆو دیمەن و لەش و لاردا.

تەنانەت ئەگەر کەرێکیان بینی کاڵایەکی زیاتری لێ بارکرابوو، یان تایبەتمەندییەکی تری هەبوو، ناوترێ ئەو باشترە، چونکە ئەوە جۆرە زیادەیەکە لەتەن و لاشەداو، کەم و کوڕییەکە لە واتا و ناوەڕۆکدا، ناکرێت بەکەماڵ بۆی ئەژمار بکرێت، ئەوەی گیاندارێك جیادەکاتەوە، خەصڵەت و تایبەتی ناوەکی و صیفەتە باشەکانیەتی، نەك تەنها تەن و لەش و لاری.

ئەگەر لەمە گەیشتیت، ئەوکات لێت شاراوە نابێت کە زانست بۆخۆی زیادە فەزڵ و خەصڵەتێکی جیاوازە، بەدەر لە تێکڕای تایبەتمەندییەکانی تری، وەك چۆن ئەسپ زیادەیەکی هەیە بەبەراورد لە گەڵ گیاندارەکانی تردا، بەڵکو تیژڕەوی و بەهێزی خەصڵەتێکی باشە لە ئەسپدا، بەڵام ناتوانرێت بەڕەهایی بە فەزیلەت ئەژمار بکرێت، بەڵام زانست لە خودی خۆی دا بە شێوەیەکی ڕەهایی

به فەزیلەت و زیادە خەصڵەت حیساب دەکرێت ، تەنانەت ئەگەر پەیوەستیش نەبێت بە هیچ شتێکی ترەوە، یان نەیخەیتە پاڵ کەسێکی ترەوە، چونکە زانین بۆ خۆی وەصفە بۆ کەماڵی خودی پەروەردگار، وە بەزانین فریشتەو پێغەمبەرەکانیش شەرەفیاب کراون.

بەڵکو (ئەگەر سەرنج بدەین) ئەسپی ئازا و تازی چاترە لە لاواز و بێ هێز، ئەمەش فەزڵێکی ڕەهایی یە، ئەگەر نەیپێچی بە هیچ شتێکیشەوە.

وە بشزانە! شتێکی پڕ بەهاو بەنرخ، کاتێك کە دڵت دەچێتە سەری، یان لەبەر خودی خۆیەتی، یان لەبەر شتێکی ترە کە تۆ حەزت لێیەتی، یان لەبەر خودی خۆیشی و غەیری خۆیشیەتی. کەواتە ئەوەی لای تۆ تەنها لەبەر خودی خۆیەتی کەبەنرخەو پڕ بەهایە ، ئەوە لە هەمویان گەورەو مەزن و بەنرخترە.

ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت و لەبەر خودی خۆیشی نییە، وەك ئەوەی حەزت لە دینار و دیرهەمە، بۆ خۆیان بەرد و سکەیەکی بێ سوودن، ئەگەر خودای گەورە کار ئاسانی خەڵکی پێ نەکردنایە، ئەوان و بەردەکانی تر چ جیاوازییەکیان نەدەبو.

بەڵام ئەوەی لەبەر خودی خۆی دەتەوێت، وەك بەختیاری ڕۆژی دوایی و تام و چێژی سەیرکردنی ڕوی پەروەردگار .. بەڵام ئەوەی دەتەوێت و لەلات بەنرخە لە بەر هەردو حاڵەتەکە، ئەمە وەك لەش ساغی، بۆ نمونە: تۆ مەبەستتە کە پێیەکانت باش بن، لەبەر ئەوەی کە دوور بن لە ئێش و ئازار، وەلەبەر ئەوەش کە بتوانیت بە هۆی پێ یەکانتەوە ئیش و کارەکانتی پێ ئەنجام بدەیت.

لەم ڕوانگەوە ئەگەر سەیری زانست و زانین بکەیت، دەیبینیت کە هەر بۆ خۆی شیرینەو لەبەر خودی خۆیەتی کە حەز دەکەیت پێی ئاشنا ببیت، وەك دەبینیت زانین هۆکارە بۆ دابین کردنی ژیانی بەختەوەری لە ڕۆژی دواییدا، وە وەسیلەی نزیکبونەوەیە لە خوداوە، کە هەرگیز ناتوانیت پێی بگەیت لە ڕێگەی

زانستەوەنەبێت. کەمادەم گەورەترین پلەو سەرمایەی ژیان بۆ ئادەمیزاد دابین کردنی بەختەوەری هەتا هەتاییە، هەرچیبەکیش هۆکار بێت بۆ گەیشتن بەو مەرامە، ئەوە زۆر گرنگە، بۆیە تەنها بە هۆی زانست و کارو لێبڕانەوە بەو مەرام و ئامانجە دەگەیت، ئەگەر زاناو شارەزایش نەبیت، ئەوا هەرگیز ناتوانیت بگەیتە ئەو ئاستەی کە کارەکانت شەرعی بن، کەواتە بنەمای بەختەوەری دونیا و پاشەرۆژ تەنها زانستەو لە هەموو کردەوەکانیش گەورەترە.

چۆن وانییە! هەندێك جار فەزڵی شتێك بەهۆی مەزنی ئەنجام و بەرهەمەکەیەوە دەزانرێت، وەکو دەشزانیت کە بەرهەمی زانست نزیك بونەوەیە لە پەروردگاری مەزن، وەگەیشتنە بە ئاسۆی بەربڵاوی فریشتەکان و، هاونشینی لە گەڵ دانیشتوانانی جێگا بەرزەکانی (ملأُ الأَعلی)، ئەمە بەرهەمی دوارۆژە، هەروەك لە دونیاشدا دەبێتە خاوەنی شکۆی بەختەوەری و ڕێز و متمانەو فرمانڕەواییش، تەنانەت بەسەر پاشاکاندا، وەبەشێوەیەکی ئاسایی و سروشتیی ڕێز لێ گیراو دەبێت، کەسەیری نەفام و تەبیعەت وشەکەکانی تورك و عەرەبیش دەکەیت بە ناچاری دەبێت ڕێز لە شێخەکانیان بگرن کە هەندێك زانیاریان وەرگرتووە، ئەگەر بە هۆی پەڕاو خوێندنیشەوە نەبێت، بە تاقیکردنەوە بەوە گەیشتوون کە ڕێز لە گەورەکانیان بگرن. تەنانەت گیانلەبەریش بە شێوەیەکی سروشتی ڕێز لە مرۆڤ دەگرێت، کە هەستەکات مرۆڤ کەماڵاتێکی جیاوزی هەیە لەو پلەی کە خۆیان تیایدا دەژین.

**ئەمە باسی گەورەیی زانستە بە ڕەهایی، زانستەکانیش هەریەکەیان جیاوازییان هەیەو، لە پلەو ئاستێکی تایبەتیدان.** بەڵام گەورەیی فێر کردن و فێربوون و فێرخوازی، وەک باسمان کرد زۆر ئاشکرایە مادەم زانین لە هەموو فەرمانەکان گەورەتر بێت، کەواتە فێر بوون هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە گەورەترین شت، وە فێرکردنیش گەیاندنی گەورەترین سوود و قازانجە.

# ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە:

ئەو مەبەستانەی کە خەڵکی بەدوایدا دەگەڕێن، لە دین و دونیادا کۆکراونەتەوە، کاری ئاینیش ڕێك ناخرێت مەگەر بە یاسا و ڕیسای دونیا، چونکە دونیا کێڵگەی وەبەرهەمهێنانە بۆ دوارۆژ، ئامێرێکی گەیێنەری بەندەیە بە خودای گەورە، بۆ ئەوانەی کەبە ئامرازو نشینگەیەکی کاتی سەیری دەکەن، کە نابێت وەك نیشتیمان و ئارامگای هەتا هەتایی بۆی بنوارن، کاری دونیاش بە کرداری ئادەمییەکان ڕێکدەخرێن، **کار و پیشەو صنعەتکاری ئادەمیزادیش تەنها لەسێ بەشدا خۆی دەبینێتەوە.**

**یەکەمیان**: بنەما سەرەکیەکانە، کە هەرگیز دونیا بەبێ ئەوان راناوەستێت، کە ئەمەش **چوار بەشە**:

**چاندن و ڕواندن**، کە پەیوستن بە دابین کردنی خۆراکەوە.

**ڕستن و چنین و دورین**: کە پەیوەنداریان بە پۆشاك لەبەرکردن و ماڵ و خانوو هەیە بۆ نیشتەجێ بوون.

**سیاسەت و چاودێری فرمانەکان**، بۆ کاری کۆمەڵایەتی پێکەوە ژیان، لەگەڵ **هاوکاریکردنی یەکتر** بۆ دابینکردنی هۆکارەکانی ژیان و ڕێکخستنیان.

**دووهەم:**

ئەوەیە کە ئامادەکراوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاری هەریەکێك لەو چوار بەشەی سەرەوە، بۆ خزمەت کردنیان، وەك:

ئاسنگەری؛ کە کاروباری چاندن و ئاشتنی ڕووەك و بەروبومی پێ دەکرێت، وە کۆمەڵێك پیشەسازی تر، کە ئامێرەکانی بۆ دەڕەخسێنێت. یان هەلاجی و خوری و لۆکە و کەتان، بۆ کاروباری چنین و ڕستن و ئامادەکردنی شوێنەکانیان.

## سێیەم:

ئەوانەی کە تەواوکەری جوانکاری بنەما سەرەکیەکانی ژیانن، وەك ئاش وساج و پەرەمێزو ئامێری نان کردن، بۆ دوای دورینەوەی بەرهەمەکان، هەروەها مقەست و مەکینەی درومان و ڕستن و چنین.

وێنەی ئەمەش لەگەڵ ڕێکخستنی کاروباری پەیوەندار بە جیهانی سەر زەوی کە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤە، بەبەراورد لەگەڵ تێکڕای لاشەیدا.

## هەروەها ئەمەش دەبێت

## بە سێ بەشەوە:

**یان بەشە سەرەکییەکانی لاشەیە:** وەك دڵ و جگەر و دەماغ

**یان لەخزمەتیاندایە:**

وەك گەدەو ڕەگەکان و شادەمار و بۆری و دەمارە وردەکانی لاشە.

**یان تەواوکەریانە و دەیانڕازێنێتەوە:**

وەک نینۆک و پەنجەکان و برۆکان ...

لەهەموویان پڕبایەختر بەشە سەرکییەکانە، وە لەناو بەشە سەرەکییەکاندا چاودێری فرمان و پێکەوە گونجان و هەڵکردن و هەوڵی چاکسازی لەهەمووان بایەخدارترە.

بۆیە ئەم ئامێر و دەزگا تایبەتیانە، داوای زیاتریان لە خاوەنەکەیان هەیە، کە بیانگەێننە ئەو پەڕی کەماڵ، کە ئامێر و دەزگاکانی تر ئەوەندە پێویستییان پێی نییە، بۆیە خاوەنی ئەو دەزگا سەرەکیانە پاشماوەی ئامێر و بەشەکانی تر بەکاردەهێنن و خاوەنداریەتیان دەکەن. وە **بۆ چاکسازی و ئیخلاصی ئادەمیەکان و ڕێنومای کردنیان بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست، کە مایەی سەرفرازی دونیا و دواڕۆژیان بێت، بۆ گەیشتن بەم مەرامانە:**

## چوار جۆر سیاسەت و فرمانڕەوایی پێویستە:

**یەکەم:** سیاسەتی باڵا، کە پێغەمبەران بەڕێوەی دەبەن (سەلامی خودایان لەسەر) وەفەرمانی ئەمانە بەجێ یەو دەڕوات بەسەر تێکڕای خەڵکیدا، بەتایبەتیەکانیشیانەوە، فرمانیان بەسەر دەرەوەو ناوەوەیاندا بەجێ یە.

**دووەم:** جێنشین و پادشاو سوڵتان و دەسەڵاتدارەکان، خۆ حوکمی ئەمانیش بەسەر تێکڕای خەڵکدا دەڕوات و، کەسانی تایبەتیش دەبێت فەرمانبەردار بن، بەڵام دەسەڵاتیان تەنها بەسەر لایەنی دەرەوەیاندا هەیەو، ناتوانن فەرمانڕەوای ناخ و دەرونیان بن.

**سێیەم:** زانا ناودارەکان، کە زانان بە خودا و بە دینە پیرۆزەکەی، کە میرات گری پێغەمبەرانن، حوکم و دەسەڵاتی ئەمان، کاریگەری بەسەر دەروونی کەسایەتییە تایبەتیەکاندا هەیە، تێکڕای خەڵکەکە لەو ئاستەدا نین کە بتوانن لێیان حاڵی ببن و سوودیان لێ وەربگرن، وەتوانای زاهیری ئەم زانایانە ئەو شێوە دەسەڵاتەیان نییە کە بەهێزو توانا ملکەچیان بکەن و کاریگەریان لەسەر دەرەوەیشیان هەبێت.

**چوارەم:** بەهۆی ئامۆژگارییەوە، دەتوانن کاریگەریان لەسەر دەرەوەو ناوەوەی عەوام و نەخوێندەوارەکاندا هەبێت.

کەواتە مەزنترینی ئەم چوار حاڵەتە دوای سیاسەتی پێغەمبەران، سوودی عیلم و زانستی یە کە نەفسەکان پاڵفتە دەکات، خووڕەوشتە کوشندەکانینان لێ دوور دەخاتەوەو ڕێنومایی ڕەوشتی پەسەندو دڵخۆشکەریان دەکات.

مەبەستیشمان لە فێرکردن و فێربوونی زانست تەنها بۆ ئەو ئامانجەیە:

[ كە ئەمەش مقامێكی پیرۆزە، مەگەر پلە و مەقامی پێغەمبەر و صدديق و خاوەن پەیامەكان لەسەریانەوەبن، ئەوانە زانستی شەریعەت و حەقیقەتیان كۆكردوەتەوە، بەهۆی عیلمی زاهیرەوە فێریان دەكەن و، بە زانستی حەقیقەتیش پاڵفتەیان دەكەن و، دەرونیان بەرەو بەهاو ڕەوشتە قورئانیەكان بەرزو پەروەرش دەكەن][1]

بۆیە ووتمان كاری زانست لە هەموو پیشەو صنعەتەكانی تر گەورەو كاریگەرترە

## چونكە شەرەف و پێشەنگی هەر دەزگایەك بەسێ شتدا دەناسرێت:

١- بەگەڕانەوەی بۆ فیطرەت و غەریزەی ئاسایی مرۆڤ، كە بەپێی بەڵگە دەتوانێت بگاتە ئامانج، وەک ئەوەی: كە زانستییە عەقڵیەكان گەورەترن لە زانستی یە زمانەوانیەكان، چونكە كاری پەندیاری بە ئەقڵ لێك دەدرێتەوە، بەڵام زانستی زمان بە هۆی بیستنەوە لێك دەدرێتەوە، ئاشكرایە ئەقڵ فەزڵی زیاترە بەسەر بیستن دا.

٢- یان لەڕووی قازانجی گشتییەوە هەڵی دەسەنگێنێت:

وەك فەزڵی چاندن بەسەر زەڕنگەریدا...[2]

٣- یان بەسەرنج دان لەو جێگەی كارەكەی تیا ئەنجام دەدرێت، دیارە شوێنێك زەڕنگەریی تیا بكرێت، زێڕ و ئاڵتونی تیا دابنرێت، بەنرخترە لە جێگایەك كە پێستی گیاندارانی تیاخۆشەو(دەباغ) بكرێت.

شاراوە نییە، كە زانستە دینیەكان(كە شارەزا بوونە لە ڕێگەی دوارۆژ) تەنها بە

---

(١) بنوارە: إتحاف السادة المتقين(١/١٢٧).

(٢) زەڕنگەریی سوودەكەی تایبەتییە، بەڵام چاندن بەرهەمی دەبێت و تێكڕای خەڵكی پێوستیان پێی هەیە.

کەماڵی ئەقڵ و دانایی و زیرەکی یەوە هەستیان پێ دەکرێت، بەرێزترینی بەهای مرۆڤیش ئەقڵە، وەك لەمەودوا ڕونی دەکەینەوە، چونکە بەهۆی ئەقڵەوە مرۆڤ ئەمانەتی خودای وەرگرت و دەشتوانێت کە بگات بە پلەی نزدیکی و دراوسێیەتی پەروەردگار.

لەرووی قازانجی گشتیشەوە، هیچ کەس گومانی لەوەدا نی‌یە کە سوودو بەرهەمە کەی بەختیاریی ژیانی دوارۆژە.

فەزڵی هەڵگری زانستیش نابێ شاراوە بێت، کە (محەلل و شوێنەکەیەتی) ، کە مامۆستای فێرکەر، دەست دەخاتە ناو دڵ و دەرون و گیانی مرۆڤەوە، کاریگەری هەیە لەسەریان، کە مرۆڤیش بەرێزترینی دروستکراوەنە لە سەرگۆی زەوەی، وە بەنرخترین بەش لە گەوهەرستانی لاشەی مرۆڤ دڵیەتی، مامۆستای فێرکەریش سەرقاڵە بە تەواوکاری و پاڵفتەکردن و پاراستنی دڵ لە ڕەزیلی و، پوختەکردن و ئاراستەکردن و گەیاندنی بە حزوری پەروەردگارە(جلَّ جَلالُه).

کەواتە فێرکردنی زانستی، لەو ڕووەیەوە عیبادەتە بۆ خودا، لە ڕویەکی ترەوە واتای جێنشینی یە بۆ خودای مەزن، کە ئەمەش دیاری ترین شێوەی خەلافەتە، چونکە خودای گەورە زانستی خرۆشاندۆتە ناو دڵی زاناکانەوەو، دەرگای دڵیانی کردەوە و لە تایبەتمەندی صیفەتی زانینی خۆی بەشی داون، کەواتە: زانا وەك خەزنەداری بەنرخ ترین کانزاکانە. لەلایەکی تریشەوە، ڕیگەی پێ دراوە کە لێی سەرف بکات و، خاوەن پێداویستیەکانیشی لێ بەهرەمەند بکات، کەواتە چ پلەیەك لەوە بەرزترە، کە بەندە ببێتە ئەڵقەی گەیاندن لە میانی پەروەردگار و دروستکراوەکانی دا، کە لەخودای باڵادەستیان نزیك بخاتەوە، وە پێشڕەویان بکات، تا دەیانخاتە ناو بەهەشتی بەرینەوە.

**خودا بە لوطف و کەرەمی خۆی بمانگێرێت لەوان، وەصەڵات و ڕەحمەتی خودا لەسەر هەموو بەندەیەکی دڵ صەفادراو.**

# بەشی دووەم

## زانستی باش و زانستی خراپ و بەش و حوکمەکانیان

### لەگەڵ ڕونکردنەوەی ئەو زانینەی کە فەرزی عەینە یان فەرزی کیفایەیە[1] وە ڕونکردنەوەی عیلمی کەلام و فیقە لە چ سنوورێکی زانستییە دینیەکان دەیانبینیتەوە لەگەڵ باسی گەورەیی و فەزڵی زانستی دوارۆژدا.

---

(١) فەرزی عەین، واتە: هەموو کەس کە فرمانەکە بیگرێتەوە و ئەنجامی بدات. فەرزی کیفایە: ئەگەر کەسانێک هەڵبستن لەسەر ئەوانی تر ئەکەوێت کە ئەنجامی بدەن.

# ڕونكردنەوەی ئەو زانستەی كە
# (فەرزی عەینە)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((طلبُ العِلمِ فَرِيضَةٌ علَى كُلِّ مُسلِمٍ))[1]
واتە: (فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێك بەدوای زانستدا بگەڕێن).
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((أُطلبُوا العِلمَ ولَو بالصِّين))[2] واتە: (بەدوای زانستدا بگەڕێن با لە وڵاتێكی دووری وەك چینیش دەستتان بكەوێت).
ڕای جیاواز هەیە لەسەر ئەو زانینەی كە لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرزە، زیاتر لە بیست ڕای جیاواز هەیە لەم بارەوە، درێژە بەباسی ڕاكانیان نادەین، **بەڵام پوختەكەیان ئەمانەیە:**
هەموو تیم و تاقمێك فەرزو پێویستیەكەی دابڕیوە بەسەر ئەو زانستەدا كە ئەو بایەخی پێداوە...
**زانایانی عیلمی كەلام دەڵێن:** تەنها بە هۆی زانستی كەلامەوەیە باسی یەكتاپەرستی و زانستی تایبەت بەزات و صیفاتی خودا (ﷻ)دەزانرێت.
**فوقەهاكان دەڵێن:**
ئەوە زانستی فیقهە، كە عیبادەت و حەڵاڵ و حەرام و، كڕین و فرۆشتنی دروست و قەدەغەكراوی پێ دەزانرێت، مەبەستیشیان ئەو بابەتانەیە كە تاكەكان پێویستیان پێی دەبێت، نەك ڕوداوە دەگمەنەكان.
**زانایانی ئەهلی تفسیر و ئەهلی حەدیسیش دەڵێن:**

---

(١) رواه ابن ماجه(٢٢٤).قال الزبيدي تقدم الكلام عليه في الباب الأول مفصلاً.١٢٩/١.
(٢) رواه أبو نعيم في الحلية(١٩٢/٣). وتقدم الكلام عليه في الباب الأول أيضاً !١٢٩/١. والحديث وإن كان إسناده ضعيف فالمعنى صحيح.

ئەوە زانستی کیتاب و سونەتە: کە بەهۆی قورئان و فەرمودەوە دەگەینە تێکڕای زانستەکانی تر.

**زانایانی ئەهلی تەصەووفیش دەڵێن:**

مەبەست عیلمی تەصەووفە، هەندێکیشیان دەڵێن:

فەرزی عەین ئەو زانستەیە کە بەندە ئاگادار دەکاتەوە لە حاڵ و مەقامی خۆی لەحزوری پەروەردگاردا.[1]

وەهەندێکی تریشیان دەڵێن:

شارەزا بوونە لە چۆنییەتی ئیخلاص و نیەت پاکی، وە لە ئافەت و دەردەکوشندەکانی نەفس، وە جیاکردنەوەی خاطیرە و خورپەی فریشتەکان لەوەی کە لەشەیتانەوە سەرچاوەی گرتووە.[2]

وەهەندێکی تریان دەڵێن: ئەوە زانستی باطین و شاراوەیە، کە خەڵکانێکی زۆر تایبەت، ئەهل و شایستەن بۆ ئەو زانستە[3] واتای وشەکەیان لە شێوەی گشتگیرییەوە لاداوە بۆ مانایەکی تایبەت.

**ئەبوطالیبی مەککیش فەرموویەتی:**

---

(١) ئەبو طالیبی مەککی لە ((قوت القلوب)) (١/١٢٩) دەیخاتە پاڵ سەهلی تەستوری وە هەموو ووتەکانی کە لێرەدا هاتوون باسی کردوە.

(٢) وەباسی جیاوازی ئەوەی دەکەوێتە ناو دڵەوە لەگەڵ وەسوەسەی نەفس و شەیتانی و عیلمی یەقین و لەمپەرەکانی ئەقڵدا، کە ئەمە ڕای مالیکی کوڕی دینارو حەسەنی بەصری و هەندێکی زۆرە لەگەورەیانی ئەهلی تەصەووف، بنواڕە (( قوت القلوب))(١/١٢٩)

(٣) واتە ئەهلی ئەو عیلمەن،وەك لەفەرمودەدا هاتووە(**تعلموا اليقين**) حلية (٦/٩٥) إتحاف (١/١٣٠)

ئەو عیلمە فەرزی عەینە: کە ناوەڕۆکی ئەوفەرمودەیە بیگرێتەوە، کە بنەماکانی ئیسلامی تیا باس کراوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((بُنِي الإسلامُ علَى خَمسٍ، شَهادةِ أَن لا إلهَ إلاّ اللهُ، إلى آخر الحديث))**

واتە ئیسلام لە سەر پێنج پایە بیناکراوە(شایەتومان، نوێژ، ڕۆژو، حەج و زەکات) کەواتە پێویستە بزانیت: چۆن ئەو پێنج ڕوکنە ئەنجام دەدەیت، چۆن واجب دەبن لەسەرت، بەڵام ئەوەی کە ئەم بابەتە یەکلایی دەکاتەوە و لە گومان دوورمان دەخاتەوە ئەوەیە کە باسی دەکەین:

زانست وەك لەسەرەتای دەسپێکی ئەم نوسراوە باسمان کرد، دەکرێت بە دوو بەشەوە، زانستی موعامەلە و زانستی موکاشەفە. ئێمەش مەبەستمان تەنها عیلمی موعامەلەیە( کە بەدڵ و جەستە ئەنجام دەدرێت،

**ئەوەی بەدڵە:** وەك چاکسازی دەروون.

**ئەوەش بە جەستەیە:** وەك عیبادەتەکان کە بە لاشە ئەنجام دەدرێن).

**ئەو کاروبڕواو هەڵسوکەوتەی کەبەندەی ئاقڵی باڵغی پێ سپێرراوە بیکات سێ بەشە:**

# بیروباوەڕ، کردار، نەکردن

ئەگەر پیاوێکی عاقڵ بەهۆی ئیحتیلامەوە باڵغ بوو، یان بەهۆی تەمەنەوە (کە پانزە ساڵێ تەواو کردبێت) لە کاتی بەرەبەیاندا کە هەتاو بەرزدەبێتەوە یەکەم پێویستی کە ڕووی لێ دەکات فێربوونی دوو کەلیمەی شەهادەت و تێگەیشتنە لە ماناکەی، کە ووتەی ( **لا اله الا الله مُحمَّدٌ رَسولُ الله**).

واتە: (بڕوام هەیە کە تەنها (الله) خودایەو پەروەردگاری منە و حەزرەتی موحەمەدیش(ﷺ) نێرراوی خودایە).

ئیتر پێویست ناکات بەخۆی، یان بەهۆی سەرنج و تیڕامان و لێکدانەوە و هێنانەوەی بەڵگە، ئەم بڕوابوونەی بۆ جێگیر ببێ لە دڵیدا، بەڵکو تەنها ئەوەندەی بەسە بڕوای پێبکات و گومان لە دڵیدا دروست نەکات و، تووشی دڵەڕاوکێ نەبێت لە شەهادەتەکەیدا.

ئەمەش پێك دێت بەشوێن کەوتن و بڕواکردن بەوەی فێری دەکات، پێویستی بە باس و بەڵگەی زیاتر نییە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەوەندە وازی دەهێنا لە عەرەبە دەشتەکیەکان کە بەزوبان شەهادەت بهێنن و بەدڵیش دانی پێدا بنێن، بێ ئەوەی داوای لێ کردبن هیچ بەڵگەیەك لە سەری فێربن.[1]

ئەگەر ئەم کارەی ئەنجامدا، ئەوە پێویستیی ئەو کاتەی جێ بەجێ کردووە، ئەو زانستەی فەرزبووە لەسەری تەنها فێربوونی دووکەلیمەی شەهادەتەو لێ تێگەیشتنیەتی.

ئیتر هیچ ئەرکێکی تری لەسەر نییە، بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر لە دوای ئەو کاتە مرد، بەگوێڕایەڵ دەژمێررێت و بە نایاخی دانانرێت لە حزووری خودادا، جگە لەمە هەرشتێکی تر پێویست بگەڕێت لەسەری، ئەوە بەهۆی ڕوداو و پێشهاتێکی ترەوەیە، مەرج نییە روبەڕوی هەموو کەسێک ببێتەوە، بەڵکو لەوانەیە لێی جیاببێتەوە.

ئەو پێشهاتانەی کە ڕوو دەدەن، یان لە کردارێکدا پەیدا دەبن، یان لە وازهێنان و (نەکردن)دا دروست دەبن، یان پێشهاتەکە لە بیروباوەڕدا دەبێت.

---

(١) کحدیث إیمان ضمام بن ثعلبة(رضي الله عنه) في((البخاري))(٦٣)و غیره. انظر:(الإقتصاد))(٢٨٣)

# پێشهاتی کرداری:

بەوەی کە لە بەرەبەیانەوە بژی تا کاتی نیوەڕۆ، یان ئەو کاتە بە هاتنە پێشەوەی نوێژی نیوەڕۆ پێویست دەبێت لەسەری، کە فێری خۆپاك کردنەوەو تارەت و دەست نوێژ گرتن و نوێژ کردن ببێت، جائەگەر تەندروست و لەش ساغ بوو، وە تا ئەو کاتەی کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات ئەگەر پەلەپەلی نەکردایە، نەیدەتوانی فێربوونەکە و کار کردنەکە لەوەختی خۆیدا تەواو بکات، بەڵکو وەختەکەی لە دەسدەدا ئەگەر سەرقاڵی فێربوون بوایە، ئەو کاتە دورر نابێت کەبڵێین:

وادەردەکەوێت کە وەك خۆی بمێنێتەوە، واتە:

پێویستە لە سەری پێش ئەوەی کاتی نوێژ فەرزبوون لەسەری واجب ببێت، ئەو خۆی فێربکات، وە ئەشگونجێت کە بووترێت: پێویستی ئەو زانستە، کە مەرجی سەرەکی کارکردن و(نوێژکردنەکەیە) دوای پێویستی کارەکە فێربوونەکەی لەسەر فەرزدەبێت، کەواتە پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان فێربوونەکە فەرز نەدەبوو، هەرواش تەواوی نوێژەکانی تر.

ئەگەر ژیا تا مانگی ڕەمەزان، ئەوە پێویستیەکی تر تازە دەبێتەوە، کە دەبێ فێری ڕۆژو گرتن ببێت، کە بزانێت کاتەکەی لە بەیانیەوە تا کاتی خۆرنشینە، پێویستە نییەت بهێنێت کە بەڕۆژو دەبێت و، خۆی بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە و دروست بوون، ئەمەش بەردەوامە تا بینینی هیلالی شەوال. هەروەها ئەگەر ماڵێکی هاتە بەردەست، کە ئەمە (پێشهاتێکی نوێ یە) یان کاتی باڵغ بوونی ماڵیشی هەبوو، ئەوە دەبێت فێری ئەوەش ببێت کە لەسەری پێویستە لە بارەی زەکاتەوە، بەڵام مەرج نی یە بە خێرایی بێت، بەڵکو ئەو کاتە فەرز دەبێت لە سەری ، کە لە کاتی ئیسلام بونیەوە ساڵ بەسەر ماڵەکەیدا

چوبێت. ئەگەر تەنها وشتری هەبوو، پێویست ناکات فێری چۆنیەتی زەکاتی مەڕ و مالات ببێت، هەروەها هەموو بەشەکانی تر.

ئەگەر مانگەکانی حەج هاتنە پێشەوە، پێویست ناکات یەکسەر پەلە بکات بۆ فێربوونی ئادابی حەج کردن، چونکە کاری حەج لەسەر پشتەو بە خێرایی نییە. کەواتە پێویست ناکات بە خێرایی فێری ببێت، بەڵام پێویستە زانایانی ئیسلام بێداری بکەنەوە کە فەریزەی حەج واجبە، بەڵام یەکسەر نییە، وە لەسەر کەسێکە کە خاوەنی مەسرەف و بژێوی و هۆکاری سوار بوون بێت، ئەگەر خۆی خاوەنیان بێت، [بەمەرجێك زیاد بێت لە بژێوی و پێداویستیەکانی ماڵەوەی لەگەڵ مەسرەفی هاتوچۆ و ماڵ و منداڵ].[1]

تا ئەو کاتەی کە ئیرادەی بەهێز لە خۆیدا دەبینێت بۆ ئامادەکاری، لەو کاتەدا ئەگەر بڕیاری فەریزەی حەجی دا، ئیتر پێویستە مەرج و چۆنیەتی حەج کردن فێر ببێت و ئەوەش کە پێویستە:

تەنها فێربوونی ئەرکان و واجباتەکانیەتی، نەك سونەتەکانی،

چونکە ئەنجام دانی ئەو کارانەی سوننەتن، فێربوونیشیان سوننەتە، کەواتە نابێتە فەرزی عەین.

وە لەبارەی بەحەرام کردنی بێدەنگ بوونی(زاناکان) لەسەر بێدارکردنەوەی واجب بوونی ئەصڵی حەج کردنەکە، بە خێرایی کە لێی بیدەنگ بن، سەرنجێکی لەسەرە، کە دەشێت لە کتێبە فیقهیەکاندا باس بکرێت، وە هەروەها هەموو کردارەکانی تر کە فێربوونیان فەرزی عەینە، بەم پێیە بەبێ خێرایی، بە پێی پێشهاتەکان ناوناوە واجب دەگەڕێن لە سەری کە فێریان ببێت.

---

(١) إتحاف(١/٤٠).

# پێشهاتی نەکردن

**لەبارەی تەرك كردن و نەكردنی كارەكان:**

زانینی ئەم بابەتە پێویستە، بەپێی تازەبوونەوەی لەوكاتەدا، ئەمەش دەگۆڕێت بەپێی حاڵی تاكەكان، چونكە كەسێكی كەڕ پێویست نىیە لەسەری كە بزانێت لە قسەكردن چی حەرامە كە بكرێت، هەروەها كوێرێك لەسەری نىیە كە فێری ئەوە ببێت چ نەزەرێك حەرامە، كابرای دەشتەكی و لادێیی لەسەری نییە وەك كابرایەكی شارستانی فێر ببێت لەچ جێگایەكدا حەرامە دابنیشێت، كەوایە بەپێی پێوستی حاڵ و مەقام ئەو جۆرە زانست و فێربوونە پێویست و واجب دەبێت.

ئەگەر بزانرێت كە بابەتێک لێی جودا دەبێتەوە، پێوست ناكات كە خۆیی لێ فێربكات.

بەڵام ئەوەی پێیەوە دەلكێت و لێی جودا نابێتەوە، پێویستە لەسەر زانایان كە ئاگاداری بكەنەوەو ڕێنومایی بكەن.

بۆ نمونە:

كاتی موسوڵمان بوونی ئەگەر ئاوریشمی لەبەردا بێت، یان لەزەوییەكی داگیركراودا دانیشتبێت، یان سەیری نامەحرەمێك بكات، ئەبێ ئاگاداربكرێتەوە.

بەڵام ئەوەی پێ یەوە نەلكابوو، بەڵام لەوانەبوو كە بەونزیكانە ڕوبەڕووی ببێتەوە، وەك خواردن و خواردنەوە، ئەوە پێویستە فێربكرێت، تەنانەت ئەگەر لە شارێكدا بوو ئارەق تیا دەخورایەوە و گۆشتی بەرازی تیا دەخورا، پێویستە فێربكرێت و لەم هەموو پێشهاتانە ئاگادار بكرێتەوە، ئەوەش كە پێویستە فێری ببێت، پێویستیشە لەسەری كە فێریان بكات.

# پێشهاتە باوەڕییەکان و ئەو کردارانەی بەدڵ دەکرێن
# (أعمال القلوب)

چەندێك گومان و خەتەرەی خراپ بکەوێتە ناو دڵەوە، ئەوەندەش دەبێ لە بارەی عەقیدەو بیرو باوەڕەوە خۆی ئاشکرا بکات.

ئەگەر گومانی بۆ پەیدابوو لەوەی کە دوو کەلیمەی شەهادەت چ واتایەك دەبەخشن، ئەوا پێویستە لەسەری ئەوەندە فێر ببێت کە گومانەکانی برەوێنێتەوەو لای ببات.

ئەگەر پێش ئەوەی هیچ گومانێکی بۆ دروست ببێت مرد، وە هێشتا باوەڕیشی وانەبوو کە کەلامی خودا قەدیمە، یان لە دوارۆژدا دەبینرێت، وەنەیشی دەزانی کە نابێ خودای گەورە (شوێن و جێگابێت) بۆ شتە پەیدابووەکان، واتە هێشتا ئەو بابەتانەیشی نەدەزانی کە لە بارەی بیروباوەڕەوە باسیان کراوە [کە مادام هیچ گومانێکی بۆ دروست نەبووە، با لەسەر ئەم نەزانینەش بمرێت] ئەوە بە پێی کۆ دەنگی زانایانی ئیسلام وا دادەنرێت کە لەسەر ئەو دینە وەفاتی کردووە.

ئەوەندە هەیە ئەو گومان و خەتەرانەی ڕوبەڕووی عەقیدەو بیروباوەڕیان دەبێتەوە:

**هەندێکیان سروشتیەو**، هەر لە ناخی خۆیەوە بۆی پەیدادەبێت، **هەندێکیشیان** بە هۆی بیستنی لە ئەهلی شارەکەوە بۆی دروست دەبێت.

ئەگەر لە شارێکدا بوو زانستی(کەلام) ی تیا بڵاوبوو، خەڵکەکەش دەمیان لە قسەی نەپاسەندو بیدعە دەدا، ئەوە پێویستە هەر لەسەرەتای باڵغ بوونیەوە بپارێزرێت و، ڕاستیەکان بخرێتە مێشکیەوە.

چونکە ئەگەر قسەیەکی پوچ و نارەوای بۆ کرابێت، پێویستە بە خێرایی لە دڵیدا لایبرێت، رەنگە ئەمەش ئاسان نەبێت...

هەر وەك چۆن ئەگەر ئەو موسوڵمانە بازرگان بوو، وە کاری سووخۆری لە ناو ئەو شارەدا زۆر بڵاو بوو، پێویستە ئەوە فێرببێت کە چۆن خۆی لە سوو بپارێزێت،

ئەمەیە رێرەوی راستی لە زانست دا کە (فەرزی عەینە) و دەبێ هەموو کەس بیزانێت.

## واتاکەیشی:

دەبێت زانابیت بەچۆنیەتی ئەو کارەی کە پێویستە لەسەرت. ئەگەر هەرکەسێك زانا بوو بەسەر ئەو کارەی کە پێویستە ئەنجامی بدات، وە دەیزانی و ئاگادربوو چ کاتێك لەسەری دەبێتە واجب، ئەو کاتەیە زانینی ئەو عیلمە لە بارەی ئەوەوە دەبێتە (فەرزی عەین).

ئەوەش کە صۆفییەکان دەیڵێن:

لەوەی کە لەگومان و وەسوەسەی شەیتان حاڵین و، ئاگادارن بەوەیش کە فریشتەکان دەیخەنە ناو دڵیانەوە، ئەوە راستەو کەسانێکی دەوێت کە خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کردبێت.

ئەگەر مرۆڤ نەیدەتوانی بە ئاسانی خۆی دوربخاتەوە لە ئاسەوارەکانی شەرو ریاکاری و ئیرەیی بردن، ئەوە پێویستە چواریەکی بەشی کارە کوشندەکان فێرببێت و ئەو بابەتانەش فێر ببێت کە وایان دەبینێت پێویستن بۆی، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**سێ شت هەن مرۆڤ تیا دەبەن و بە هیلاکیا دەبەن:**

**ثلاثٌ مُهلِكات: شُحٌ مُطاع، وَهَوًى مُتّبَع، وإعجابُ المَرء بِنَفسِه.**

واتە: بەخالەتی تیا بێت و گوێڕایەڵیشی بێت، هەروەها شوێن کەوتوی

ئارەزووەکانی بێت.( واتە هەرچی حەزی لێ کرد جێ بەجێی بکات) وە زۆر خۆیی بەلاوە پەسەند بێت.[1] کە ئەم مەترسیانە لە مرۆڤ نابێتەوە.

وە هەموو ئەوصیفەتە ناپەسەندانەی کە پەیوەندارن بە دڵەوە وەك:

خۆ بەگەورەزانین و خۆپەسەندی و هاووێنەکانیان، ئەمانەش دەبنە لق و پۆی ئەم سێ خەصڵەتە نابار و کوشندەیە، وە لابردنیان دەبێتە فەرزی عەین، ئەمەش ناگونجێت، ئەگەر تاریف و سنوور و پێناسەو هۆکاری پەیدابوون و نیشانەکانیان نەزانرێت، لەگەڵ زانینی ڕێگەی چارەسەرکردنیان، چونکە وەك ووتراوە:

ئەوەی شەڕو خراپەکان نەزانێت، ناتوانێت خۆی لابدات لێیان و دەکەوێتە ناویانەوە.

چارەسەریش بەوەدەبێت کە ڕوبەڕووی هۆکارەکەی ببێتەوە بە دژەکەی، ئەوەش هەرگیز نابێت ئەگەر تەواوی هۆو هۆکارەکانی نەزانێت.

زۆربەی ئەوەی لەبەشی چوارەکی خەصڵەتە کوشندەکان باسمان کردووە زانینیان فەرزی عەینە و، دەبێت هەموو کەس لێیان شارەزا بێت، بەڵام خەڵکەکە خۆیان بەشتێکی لابەلاوە خەریك کردووە و وازیان لە بابەتە گرنگەکان هێناوە.

وە ئەوەی کە پێویستە خێرایی بکرێت لە فێرکردنی، ئەگەر لەناو میللەت و دینێکی ترەوە نە هاتبووە ناو ئیسلامەوە:[2]

---

(١) رواه الطبراني في(الأوسط) (٥٤٤٨)وأبو نعيم في (الحلية) ٣٤٣/٢) والبيهقي في(الشعب) (٧٣١).

(٢) چونکە ئەگەر ئەهلی کیتابی بێت ، ئەوا بڕوای بە بەهەشت و جەهەنەم بووە، ئیتر پێویست ناکات خێرا بکرێت و ئەو بابەتانەی کە زانیویەتی لێی فێربکرێت.

باسی بڕوابوون بە بەهەشت و ئاگر و زیندوبونەوە و نامەی کردەوەکانە، وە دڵی دابمەزرێت لەسەریان، ئەمەش تەواوکەری دوو کەلیمەی شەهادەتە، وە دوای ئەوەی کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرێتی حەزرەت(ﷺ) دەبێت واتای ڕیسالە و پەیامی ئیسلام حاڵی بکرێت کە ئەو زاتە گەێننەریەتی.

کە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر ببێت (ﷺ)، ئەوە پاداشتی بەهەشتە، ئەوەیش یاخی بێت ئەوا دۆزەخ جێگەیەتی.

ئەگەر لەم شێوەی پلەپلەی شارەزا بوونە تێ گەیشتیت، دەزانیت کە ئەمە پەیڕەوی حەقق و ڕاستی‌یە، وە دەگەیتە ئەو ئەنجامەی:

کە هەموو بەندەیەك لە ژیانی ڕۆژانەی‌دا کە شەو ڕۆژ دەگوزەرێنێت، هەر جارەی ڕوداوێکی بۆ پەیدا دەبێت: لەبارەی عیبادەت و ئەحکامی موعامەلاتەوە، کە بابەتی تازەو نوێ بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن.

بۆیە پێویستی بە پرسیارکردن هەیە لەو ڕوداوە ناوازانە، وە لەسەریەتی فێری ئەو بابەتانەش ببێت کە لەوانەیە زوتر ئێخەی بگرن و ڕوبەڕوی ببنەوە.

کەواتە: دەردەکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی لە وشەی(العلم)، کە ئەلف و لامی تەعریفی پێوەیە، لە فەرموودەی:

((طَلَبُ العِلمِ فَرِيضَةٌ عَلى كُلِّ مُسلِمٍ))[1]

ئەو زانستەیە:

کە چۆن بتوانیت کار بە زانینەکەت بکەیت، ئەو زانینەی کە پێویستە موسوڵمان بیزانێت، ئەمەش نەك یەکجار، بەڵکو بە پێی پێویستی ڕووداوەکان کە دێنە پێشەوە یەك لەدوای یەك بیانزانێت... والله أعلم.

---

(١) ابن ماجه( ٢٢٤).

# ڕونکردنەوەی ئەو زانستانەی کە فەرزی کیفایەیە

بزانە: ناکرێت فەرز لە غەیری خۆی جیابکرێتەوە ئەگەر پێشتر باسی بەشەکانی زانستەکان نەکرێت، جگە لە باس کردنی فەرز کە دەمانەوێت پێناسەی بکەین، **زانستەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:**

**زانستی شەرعی و غەیرە شەرعی:**

مەبەستم لە زانستی شەرعی ئەوەیە:

کە لە پێغەمبەرانەوە(ﷺ) وەرگیراو بێت، کە ئەقڵ ناتوانێت پەییان پێ ببات، وەك بابەتی ژمێریاری کە بە ئەقڵ دەزانرێت، هەروەها بە تاقیکردنەوەش نازانرێت، وەك: پزیشکی، وە بە بیستنیش نازانرێت، وەك زمانەوانی.

ئەو زانستانەش کە نا شەرعین،(لە پێغەمبەرانەوە وەرنەگیراون) چەند بەشێکیان هەیە:

**پەسەندو، ناپەسەند و خراپیان هەیە،** ئەوانەش کە موباحن (واتە: دروستە بیانکەیت ، بەڵام نە لە ڕیزی پەسەندەکاندایە و نە لە ڕیزی خراپەکاندا).

**زانستی پەسەند کراو:**

ئەوەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دونیادا یەك بگرێتەوە، وەك زانستی پزیشکی، ژمێریاری، ئەمەش دوو بەشی هەیە:

هەندێکیان فەرزی کیفایەیە، وە بەشێکیشیان پەسەند و چاکە بەڵام فێربوونی پێوست نییە.

ئەوەی کە **فەرزی کیفایەیە:**

هەموو ئەو زانستانە دەگرێتەوە، بۆ ڕاگیرکردن و ڕاپەڕاندنی کاروباری دونیا پێویستمان پێیانە، وەك پزیشکی ، چونکە(عیلمی طیب) زۆر پێویستە بۆ

مانەوەی لاشە بە تەندروستی، هەروەها زانستی حیساب ئەمیش پێویستە بۆ کڕین و فرۆشتن و بەشکردنی میرات و وەسێت و شتە گرنگەکان.

ئەم جۆرە زانستانە ئەگەر لە وڵاتدا (بە پێی پێویست) کەسێک نەبێت پێیان هەڵبستێت، ئەوا کاروباری خەڵکەکە ڕادەوەستێت، ئەگەر یەکێك پێیان هەستا، ئەوا فەرزەکە لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت.

لەوەش سەرت سوڕنەمێنێت کە ووتمان: عیلمی طەبابەت و حیساب لەبەشی فەرزی کیفایەن، بەڵکو بنەماکانی صنعەتکاریش لە فەرزی کیفایەن، وەك جوتیاری و ڕستن و سەرکاری و چاودێری ژێردەستەکان.

تەنانەت کەڵەشاخ گرتنیش کە ئەگەر ناو شار کەسێکی تیا نەبێت لە کەڵەشاخ بزانێت، ئەوا روبەڕوی نارەحەتی دەبنەوە و لەوانەیە دووچاری لەناوچوونیش ببنەوە، چونکە ئەوەی دەردو نەخۆشی ناردووە دەواو چارەسەریشی بۆ ناردووەو بۆی داناوە، وە ڕێنومایی کردوون بۆ بەکارهێنانی، و هۆکاریشی سازاندووە بۆ خواردنەوەی، کەواتە ئیتر چۆن دروستە کەمتەرخەمی بکەن و خۆیان بە هیلاکدا ببەن.

بەڵام ئەوانەی کە فەرز نین و بەباش دادەنرێن و فێربوونیان خێری تیدایە، وەك ڕۆچون لە وردەکاری زانستی حیساب ، نهێنی و حەقیقەتەکانی پزیشکی و ئەو شتانەی تریش کە ئەوەندەش پێویست نین، بەڵام سوود بەخشن و زیادە هێزێك دەبەخشن بەو ئەندازەی کە پێویستیان پێیەتی.

ئەوەش کە خراپە و ڕێگەی پێ نەدراوە بیزانن، وەك فێربوونی سیحرو جادووگەری و تەلیسم و نهێنییە شاراوەکان، یان فرت و فێڵ و لێ شێواندن و شەعوزە. ئەوەش کە دروستە فێری ببن، وەك:

شارەزابوون لەو هۆنراوانەی کە شتی ناجۆرو نەشیاوی تێدا نییە، یان مێژووی ڕوداوو بەسەرهاتەکان و هاو وێنەکانیان.

# زانستە شەرعی‌یەکان

ئەوەی مەبەستمانە کە باسی بکەین، زانستە شەرعیەکانە، کە هەمووی پەسەندە، بەڵام هەندێك جار تێکەڵییەك، دروست دەبێت لە هەندێك زانستـدا کەوا دەزانرێت شەرعی‌یە بەڵام وانی‌یە، بۆیە ئەمیش دەکرێت بە دوو بەشەوە: پەسەندکراو ، وە بێ‌خێر و ناپەسەند. **پەسەندەکانیان بنەماو لق و** پۆو سەرەتاو تەواوکاریان هەیە، کەواتە دەکرێن بە چوا بەشەوە:

**بەشی یەکەم: بنەماو ئەصڵەکان:**

ئەمیش چوارئەصڵە: قورئانی پیرۆز، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، **کۆدەنگی** ئوممەتی ئیسلام، ئاثارو پاشماوەی صەحابەکان

**ئیجماع (کۆدەنگی)**، بە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکان دەناسرێت، چونکە بەرەو سوننەت دەتگەڕێنێتەوە ، کەواتە لە پلەی دووهەمدایە، **هەروەها** ئاسار و فەرموودەکان ئەمیش دەتباتەوە بەرەو لای سوننەت.

چونکە صەحابەکان (خودایان لێ ڕازی بێ) بە خۆیان لە ناو حاڵەتی نیگاو هاتنە خوارەوەی وەحی بوون، بەهۆی حاڵ و مەقام و قەرینەوە هەستیان بە زۆر شت کردووە کە خەڵکیکی تر بەر چاویان نەکەوتووە، زۆر شت هەیە بە بەڵگەو سەلیقەو قەرینەدا دەزانرێت، کە ناچنە ژێر دەستەواژەکان، لەم ڕوانگەوەیە کە زاناکان بەلایەنەوە پێویستە کە چاویان لێ بکرێت و شوێن پێیان هەڵبگیرێت، بەو مەرج و شێوەو ڕوانگە تایبەتیەوە کە دیاریان کردووە، کە لێرەدا جێگەی ئەوەنی‌یە زیاتر لەسەری بدوێین.

## بەشی دووهەم: لق و پۆکان:

لقەکان لە ئەصڵەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، نەك بە پێی دەق و واتای ڕستەکان ، بەڵکو بەو واتایانەی کە ئەقڵ دەرکی پێ کردووە و ئاستی بیرکردنەوەو تێگەیشتنی زیاد کردووە، تا لەو (کەلیمەوە) کە وتراوە، واتایـــەکی

تریان لێ وەرگرتووە، وەك چۆن لە واتای ئەم فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (**لايَقضِي القَاضي وَهُوَ غَضبان**)[1]. واتە: (دادوەر نابێت لە کاتی توڕەییدا قەزاوەت بکات و فرمان دەربکات ، ئەو ماناشیان لێ وەرگرتووە کە ئەگەر میزی گیرابوو، یان برسی بوو، یان بە نەخۆشییەکەوە دەتلایەوە نابێت قەزاوەت بکات).

***ئەمەش لەسەر دوو بەشە:***

**یەکەمیان**: پەیواندارە بە بەرژەوەندییە دونیاییەکان، کە هونەرو زانستی فیقە دەیگرێتەوە، فوقەهاکان پێی هەڵدەستن، زاناکانی ناو دونیا لەم بەشەن.[2]

**دووهەم**: پەیوەندارە بە بەرژەوەندییەکانی دوا ڕۆژەوە:

ئەمەش ئەو زانستەیە کە پەیوەندی بە ئەحواڵی دڵەکانەوە هەیە، وە ڕەوشتە بەرزو پەسەندو، ڕەوشتە نەشیاو و زەمکراوەکان، لەوانەی کە جێگای ڕەزامەندی خودان، یان لای خودا نەخوازراون، کە دوا بەشی ئەم کتێبە دەیگرێتەوە. مەبەستم تێکرای کتێبی (إحياء علوم الدين)ە.

هەروەها باسی ئەو زانستیانەی لە دڵەوە دەخرۆشێت و دەرژێتە سەر ئەندامەکان لە بەشەکانی عیبادەت و عادەتیدا، ئەمەش ئەو زانستەیە کە نیوەی یەکەمی ئەم کتێبە چارەسەری دەکات

## بەشی سێیەم: دەسپێکەکان:

واتە: زانستە سەرەتاییەکان، وەك ئامێرەکان وان بۆ ئەوەی کاری تریان پێ بکرێت، وەك زمانەوانی و زانستی(نەحو) کە ئەمانە ئامێر و هۆکارن بۆ

---

(١) رواه البخاري(٧١٥٨) و مسلم(١٧١٧)

(٢) هەرچەندە ئەوەشی ڕون کردۆتەوە کە عیلمی فیقە هیچ کەسێك نییە کە پێویستی پێی نەبێت بە تایبەتی لەوانەی کە سالیکی ڕێگای ئاخیرەت و دوا ڕۆژن.

فێربوونی کیتابی خودا ﷻ و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، خۆ هیچ کام لەم دوو زانستە(نەحو و زوبانەوانی) لە ڕیزی زانستی‌یە شەرعیەکاندا نین، بەڵام بەهۆی شەرعەوە پێویست کراون، کە هەموو شەریعەتێکیش دەرناکەوێت، مەگەر زوبانێ(پاڵپشتی بکات) کەواتە فێربوونی ئەو زوبانە دەبێتە هۆکار و ئالەتی گەیشتن بەو مەبەستە. هەروەها فێربوونی نوسین بە هەمان هۆکار دەزانرێت، هەرچەندە ئەو فێربوونە زۆر پێویستمان پێی نی‌یە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نەخوێندەواریش بووە، ئەگەر بکرایە بیانتوانیایە بەبێ نوسین هەموو کەس بە سەربەخۆیی هەموو بیسراوێك لەبەربکات ئەوە پێویستمان بە نوسینیش نەدەبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە زۆربەی خەڵك بەبێ نوسین ناگاتە ئامانج بۆیە ئەویش لە حوکمی پێویستدایە و دەبێ فێری ببن.

## بەشی چوارەم: تەواوکاریەکان

ئەمەش لەناو زانستی قورئاندا کە چەند بەشێك لە خۆی دەگرێت:

ئەوەی پەیوەندارە بە لەفزو پیتەکانەوە، وەك: زانینی خوێندنەوەی قورئان و دەنگ دەرچوونی پیتەکان. یان پەیوەندارە بە واتای قورئانەوە، وەك زانستی تەفسیر و لێکدانەوەی، کە زیاتر پاڵپشتە بەو ئاسارو ڕیوایەتانەی کە پێیان گەیشتووە، چونکە زمان بە تەنها ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە، یان پەیوەستە بە فرمان و ئەحکامەکانی قورئانەوە، وەك زانینی(ناسیخ و مەنسوخ)(عام وخاص)و (نەص وظاهر)[1] وەچۆنەیتی بەکارهێنانی هەندێک و بەکارنەهێنانی هەندێکی تر ئەمەش ئەو زانستەیە کە پێ دەوترێت(أصول الفقه) وە سوننەتیش دەگرێتەوە.

---

(١) نەسخ: لادانی حوکمێکی شەرعی‌یە لەسەر ئایەتێك یان فەرمودەیەك بەئایەتێ یان فەرموودەیەکی تر کە دوای ئەو هاتووە.

عام: وشەیەکی دانراوە بۆ زۆرێکی بێ سنوری نەژمێراو و هەموو ئەفرادەکانی بگرێتەوە.

# تەواوکارییەکان لە ئاسارو فەرموودەکان

پێویستە ناسینی پیاوەکان و ڕیوایەتکاران و ناویان و ناوی صەحابەو صیفەتەکانیان و، عەدالەت و دادپەروەری ڕاویەکان و شارەزابوون لەحاڵیان، بۆ ئەوەی فەرمودەیەکی بێ هێز لە بەهێز جودا بکرێتەوە، هەروەها زانینی تەمەنیان، بۆ ئەوەی ئەوانەی سەنەدەکانیان نەپچڕاوە جیابکرێنەوە لەگەڵ پچڕاوو مورسەلەکاندا، وە بابەتە پەیوەندارەکانی تر.

ئەمانە هەموو بە زانستی شەرعی ناو دەبرێن و هەموویان پەسەندکراون، بەڵکو زانینی هەر هەموویان بەشێکە لە فەرزی کیفایە.

ئەگەر بڵێیت: بۆچی فێربوونی(فیقە)ت وەك زانستە دونیاییەکان داناوە، فوقەهاکانیشت لە زانایانی دونیا ژماردووە؟!

بزانە: خوای گەورە حەزرەتی ئادەمی لەگڵ دروست کردووە، وە ئەولادەکانیشی لە پوختەی گڵ و نوطفەی باوکە ئادەمەوە دروست کردووە، لە پشتی باوکەوە بۆ ڕەحەمی دایکەکان و لەوێیشەوە بۆ سەر زەوی، لە پاشان بۆ گۆڕو پاشان بۆ پیشاندانیان لە (گۆڕەپانی مەحشەر)، پاشان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر، ئەوە سەرەتایانەو، ئەوەش ئەنجامیانە کەڕوبەڕویان دەبێتەوە، مەنزڵگای دواجاریشیان بەهەشت یان دۆزەخە. دونیایشی دروست کردووە کە زادو توێشووی قیامەت بێت، تا لـەدونیادا لـەوەنـدەی بخـوات کە بەکەڵکی

---

خاص: لە فزێکە دانراوە بۆ واتایەکی تایبەتی سنوردار.

نەص: ئەو دەقەیە کە زۆر بە ڕونی دەلالەت لەسەر واتاکە دەکات، واتە ئەو کەلامە بۆیە هێنراوە،تا ئەو واتا تایبەتییە بگەیەنێت، کە دەلالەت کردنەکەی لە وشەی (زاهیر) ئاشکراترە.

ظاهر: ئاشکرای لەفزەکە ئەو واتایە دەگەیەنێت، بەڵام لە ڕونی و ئاشکراییدا ناگاتە دەق.

هەڵگرتن دێت، ئەگەر بەشێوەیەکی دادپەروەری لە بەروبومی دونیای بخوار دایە، ئیتر دەمەقاڵێ و کێشە نەدەماو، شەرع زانەکانیش بێ کار دەبوون.

بەڵام ئەوان بە ئارەزوات دونیایان خواردووە، بۆیە کێشەو گرفت و دەمەقاڵێی لێ کەوتۆتەوە، وە پێویستی کردووە کە دەستەڵاتدارێک چاودێریان بکات، سوڵطانیش پێویستی بە یاسای ڕێکخستنی کارەکانیان دەبێت.

کەواتە: (فەقیە) زاناو شارەزایە بە یاسای چۆنیەتی هەڵس و کەوت و ڕێگەی میانگری لە میانی خەڵکەکەدا، کاتێك بەهۆی ئارەزواتەوە کێشەیەك دەکەوێتە میانیانەوە. کەواتە فەقیە مامۆستاو ڕێنومایی کەری سولطانە، کە چۆن کاری خەڵکی ڕێك بخات و هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات، تا کاروباری دونیایان بۆ ڕێك بخات.

**سوێن بێت!** ئەوە پەیوەندارێشە بە دینەوە، بەخودی خۆیەوە نا، بەڵکو بە هۆی دونیاوە، دین ئەصڵەکەیە، سوڵطانەکەش پاسەوانیەتی، ئەوەی بنەما و ڕەچەڵەکی نەبێت بۆ خۆی دەڕوخێت، ئەوەش کە پاسەوانی نەبێت ون دەبێت و لەدەستدەچێت، خاوەندارێتی و ڕێکخستنی کارەکانیش بە بێ سوڵطان ناکرێت، تەنها چارەش بۆ چارەسەرو لادانی کێشەکان لە ڕێگەی فیهقەوە دەبێت. وەك چۆن بەڕێوەبەرێتی کاروباری خەڵکی لە وڵاتدا بە پلەی یەکەم بە زانستی ئاینی ناژمێررێت، بەڵکو یارمەتی دەرێکە، کە بەبێ ئەو بەڕێوەبردنە دین تەواو نابێت، هەروەها شارەزابوونیش لە ڕێگەی سیاسەتی بەڕێوەبردن، ئاشکرایە کە ناتوانێت فەریزەی حەج ئەنجام بدەیت بە بێ پاسەوان و بوونی ئێشکگر، کە (کاروانی) یەکە بپارێزێت لە عەرەبی سەر ڕێگا.

بەڵام حەج بۆ خۆی شتێکە و گرتنە بەری ڕێگای حەجیش شتێکی ترە و، هەڵسان بە دابین کردنی پاسەوانی، کە حەجەکە تەواو نابێت بە بێ ئەو، ئەمەش فرمانی سێیەمە و چوارەمیش شارەزابونە لە چۆنیەتی ئێشکگرتن و

پلان و پاساکانی پاسەوانی. پوختەی ڕۆڵی زانستی(فیقه) زانینی ڕێگەکانی فرمانداری و پاسەوانی‌یە . بەڵگەشمان ئەم فەرمودەیە کە بەسەندەوە پێمان گەیشتووە: ((**لا يَفتِي النَّاسُ إلَّا ثَلاثَةٌ: أَميرٌ ،أوْ مَأمُور، أَو مُتَكَلِّفٌ**))[1]واتە: (جگە لەم سێ کەسە نابێت کەسی تر بۆ خەڵکی فتوا بدات: فرمانڕەوا، جێگرەکەی، کەسی دیاری کراو دامەزراو بۆ ئەو مەبەستە).

**فرمانڕەوا**: پیشەوای موسوڵمانانە کە کاتی خۆی ئەوان فتوایان دەدا.

**فرمان پێ کراویش جێگرەکەیەتی ، کەسی دیاریکراویش** نە پێشەوایەو نە جێگری، بەڵکو کەسێکە بە بێ داوای خۆی، ئەو فرمانەی دەدرێت بەسەردا کە ئەنجامی بدات. کاتێك صەحابەکان(خودایان لێ ڕازی بێت) زۆر خۆیانیان دەپاراست لە فتوادان، ئەگەر پرسێك بهاتایەتە پێشەوە، هەریەکێك دەینارد بۆ لای یەکێکی ترو لە خۆیی دوور دەخستەوە. بەڵام ئەگەر لە بارەی زانستی قورئان و ڕێگای دواڕۆژەوە هەر پرسیارێکیان لێ بکرایە وەڵامیان دەدایەوە.

لە هەندێك ڕیوایەتی تردا: لە جیاتی (المتكلف): المرائي[2] هاتووە، چونکە هەر کەسکێك بە بێ ئەوەی دیاری کرابێت بۆ فتوا، بۆ خۆی ئەو کارە ئەنجام بدات، ئەوە تەنها مەبەستی خۆ هەڵکیشان و خۆ دەرخستن و ماڵ کۆکردنەوەیە.

**ئەگەر پرسیارت کرد**: بەڵێ ئەگەر ئەم قسەت بۆ چووە سەر لە ئەحکامەکانی حدود (تۆڵەی سەرپێچی کەران)و بریندارەکان و،باج و غەرامەکان و یەکلایی کردنەوەی کێشە و گرفتەکان، ( کە پێویستیان بە فوقەهای ئیسلام

---

(١) كذا في (القوت) (١/١٣١)حيث قال: (وقد روينامسندا) وذكره، وقد رواه بنحوه أحمدفي((المسند)) (٢٢/٦) و الطبراني في الكبير(٧٦/١٨) و أوله (( **ولا يَقُصُّ إلاَّ أمير** .)) وله روايات أخرى. وأخرجه ابن ماجه بإسناد حسن، [كتاب الأدب، باب القصص] (٣٧٥٣).

(٢) رواه ابن ماجه(٣٧٥٣)بهذااللفظ، وأولَه كماتقدَّم عِند أحمد والطبراني ونحوه عند أبي داود(٣٦٦٥)

هەیە)، ئەوا بۆت ناچێتە سەر دەربارەی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە چواریەکی عیباداتەوە هەیە لە نوێژو ڕۆژو، یان ئەوەی چواریەکی عادات و موعامەلات دەیانگرێتەوە لە ڕونکردنەوەی حەڵاڵ و حەرام؟!

کەواتە بزانە: نزیکترین باس وبابەت کە فەقیهەکان قسەی تیادادەکەن، لەو کردارانەی کە پەیوەندارن بە کردەوەکانی دوارۆژەوە سێ بابەتە:

(ئیسلام و نوێژو حەڵاڵ و حەارم) لەم سێ بابەتەدا ئەگەر سەرنج لە ئەو پەڕی تێڕامان و سەیرکردنی فەقیهەکە بدەین، سنووری دونیا نابەزێنێت بۆ سنووری قیامەت،کە ئەمەت زانی بۆ ئەوانی تر ئاشکراترە.

## فەقیە: چۆن سەیری ئیسلام بوون دەکات:

فەقیهێك کە باسی ئیسلام بوونی یەکێك دەکات، باسی چۆنیەتی دامەزراندنی ئیمانەکەی دەکات و چۆن هەڵدەوەشێتەوە، مەرجەکانی چی‌یە، تەنها لا بەلای زوباندا دەکاتەوە، ئەو فەقیهە پەیوەندی بە دڵەوە نی‌یە، دڵ لە دەرەوەی سەرپەرشتیاری و دەستەڵاتی ئەودایە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دەستەڵاتەی سەندۆتەوە لە خاوەن شمشێر و فرمانڕەواکان، کە فەرمویەتی:

((هَلاَّ شَقَقْتَ قَلبَه؟))[1] بەوکەسەی فەرمووە کە لە شەڕدا کابرایەکی کوشت، کە ڕایشیگەیاندبوو موسوڵمانە، بەو بەهانەی کە ئەو کەسەیە لە ترسی ئەوەی شمشێری لەسەر بەرزکراوەتەوە شایەتومانی هێناوە.

کەواتە (فەقیە) حوکم دەدات بەدروستیی موسوڵمان بوونی ئەو کەسەی کە لە ژێر سێبەری شمشێریشدا ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاندووە، کە دەشزانێت شمشێرەکە گومانەکانی نارەوێنێتەوە، وە پەردەی نەزانین و دوودڵی و

---

(١) رواه البخاري(٤٢٦٩) و رواية مسلم(٩٦) (عن قلبه) والأمر لأسامة بن زيد رضي الله عنه

سەرسامیی لەسەر هەڵناگرێت، بەڵام هێما دەکات بۆ خاوەن شمشێرەکە، کە شمشێری درێژکردووەتە لەسەر ملی، وە دەستی درێژ کردووە بۆ ماڵەکەی، تەنها ووتەی ئیسلام بوون و (کەلیمەی شەهادەت) گەردنی لە برین و ماڵی لەبردن دەپارێزێت، ئەگەر ماڵ و گەردنی هەبێت، ئەمە لە دونیادا...بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((**أمِرتُ أن أُقاتِلَ النّاس حَتّى يَقُولوا لا إلهَ إلاّ الله، فَإذا قالُوها فَقَد عَصَمُوا مِنّي دِماءَهُم وأموالَهُم**))[1]واتە: (فرمانم پێ دراوە(ئەوانەی شەڕمان لەگەڵ دەکەن) ڕوبەڕوویان ببمەوە و شەڕیان لەگەڵدا بکەم هەتا دەڵێن: **لا إله إلا الله**، ئەگەر دانیاننا بە یەکتاپەرستی دا، ئەوا خوێن و سەرو ماڵیان پارێزراو دەبێت) کەواتە (وشەی شەهادەت) کاریگەری بە دوای خۆیدا دەهێنێت، کە سەر و ماڵیان پارێزراو دەبێت.

# فەقیە: چۆن سەیری نوێژ دەکات:

کاتێك (فەقیە)ێك بە ڕەواڵەت دەبینێت کا برا نوێژ دەکات و، مەرجە دیار و ئاشکراکانیشی لە خۆ گرتووە، ئەوا حوکم دەدات بە دروستی نوێژەکەی، با لە سەرەتای نوێژەوە تا کۆتاییەکەیشی دڵی غافڵ بووبێت، یان بیری لای ژماردن و سەوداو کڕین و فرۆشتنی ناوبازاڕەوە بووبێت، تەنها یەك مەرجی داناوە کە لە کاتی دابەستنی نوێژدا (ألله أکبر) دڵی ئاگای لە نوێژەکەی بێت، ئەینا نوێژەکەی دانامەزرێت. ئەم نوێژەی کە پڕەتی لە غەفڵەت، لە دوا ڕۆژدا سوودی بۆی نابێت، وە ئەو کە لیمەی شەهادەت و موسوڵمان بوونەش تەنها بە زوبان دەری بڕیوە سوودی پێ ناگەیەنێت بەڵام فتوای بۆ دەدرێت کە موسوڵمان بوون و نوێژەکەیشی دروستە.

---

(١) رواه البخاري (٢٥) و مسلم(٢١) من حديث أبي هُريرة.

واته فەرمانبەرداری ئەو فرمانە خودایيە بووە کە پێویستی کردووە لە سەری نوێژ بکات، وە لەوەی دوورخستۆتەوە کە بکوژرێت یان تەمێ بکرێت، بابەتەکانی تر پەیوەندارن بە خشوع و گەردن کەچی و ملکەچی و بێداری دڵەوە، کە هەموویان لەو کردارانەن کە بە ئەعمالی ئاخیرەت ئەژمار دەکرێن، وە بەهۆی ئەو بێداری و گەردن کەچییەوە کردوەکانیان سوودبەخش دەبێت، ئەمانە هیچیان لای فوقەهای ئیسلام باسیان لێوەنەکراوە، چونکە لە دەرەوەی سنووری کاری ئەوانە.

# چۆن (فەقیە) سەیری زەکات دەر دەکات

ئەوەندەی پەیوەندی بە دەستەڵاتدارەوەیە: داوای لێ دەکرێت زەکات بدات و بەرپرسی ئەو فرمانەی پێ بێدەنگ بکات، تەنانەت ئەگەر بە ئارەزووی خۆیشی نەبێت و بە زۆر لێیان وەرگرتبێت، ئەوە لە ڕوانگەی فەتوای شەرعییەوە هیچی لەسەر نامێنێت و کەس ناتوانێت داوای زەکاتی تری لێ بکات.

ئەگێڕنەوە کە ئەبویوسفی قازی پێش ئەوەی ساڵی تەواو بەسەر مانەوەی ماڵەکەیدا تێپەر ببێت، ماڵەکەی دەبەخشیت بە خێزانەکەی، لە پاشان ئەویش پێی دەبەخشیەوە، بۆ ئەوەی زەکاتیان لەسەر واجب نەبێت، ئەم بابەتەیان گەیاندە ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموی:

( ئەمە نیشانەی تێگەیشتنیەتی ) .

ئیمام ڕاست دەکات! نیشانەیە کە زانیویەتی چۆن لە دونیادا خۆی ڕزگار دەکات.

بەڵام زیانی ئەم جۆرە زانینە لە دوارۆژ دا ئەوەندە زۆرە لە هەموو تاوانکاریەك گەورەترە.بە نمونەی ئەم جۆرە زانینە دەوترێت زانینی زیان بەخش.

# ئەی چۆن (فەقیە)
# سەیری حەرام و حەڵاڵ دەکات

خۆ پارێزی لە حەرام بەشێکە لە ئاین، بەڵام وەرع و خۆ پارێزی چوار پلەی هەیە:

## پلەی یەکەم:

ئەو وەرعەی کە(شایەت) لە مەرجی عەدالەت و دادوەری دور دەخاتەوە واتە: ئەگەر وەرعی نەبێت، شایستەیی ئەوەی نامێنێت کە بتوانێت شایەتی یان قەزاوەت یان ویلایەت و سەرپەرشتی کاروباری موسوڵمانانی پێ بسپێررێت، وەرعیش بەو واتایە دێت کە خۆی لە حەرامی ئاشکرا بپارێزێت.

## دووهەم: وەرعی پیاوچاکان:

ئەوەیە کە خۆی لە شتێکی گوماناوی بپارێزێت،کە هەردوو لایەنی حەڵاڵی و حەرامی هەڵبگرێت، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:

(**دَع ما يَرِيبُكَ إلى مَالا يَرِيبُك**)[1] واتە:

(خۆت لەو شتە بپارێزە کە دەتخاتە گومانەوە، بۆ لای ئەو شتەی کە گومانت بۆ دروست ناکات)

---

(١) رواه الترمذي (٢٥١٨) وصححه، و النسائي في السنن الكبرى(٥٧١١) وابن حبان في صحيحه ٤٩٨/٢،(٧٢٢)من حديث الحسن بن على.[وقال الزبيدي: زاد الترمذي (**فإنَّ الصِدق طمأنينةٌ، وإنَّ الكذب ريبةٌ**، وأحمد في مسنده٢٧٨١٩) والدارمي(٢٥٣٢)، وأبو يعلي في مسنده، ١٣٢/١٢(٦٧٦٢) والطيالسي في مسنده،ص/١٦٣(١١٧٨)، وعند الطبراني في الكبير٧٥/٣) والبيهقي في الشعب،٥٢/٥(٥٧٤٧)والحاكم في المستدرك،١٥/٢(٢١٦٩): **وأنَّ الشرَّ ريبة** و ذكر تفصيلا أكثر.]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((الإثمُ حَوازُّ القُلوُب))[1]

واتە: (گوناه ئەو خورپەیەیە کە دەکەوێتە ناو دڵەوە، کەنەی لێ دەکات، یان وای لێ دەکات لە کارەکەی دڵنیا نییەو، لێی بەدگومانە)

## سێیەم: وەرعی تەقواکاران

ئەمانە واز لە حەڵاڵی ڕوتیش دەهێنن، کە بترسن لە ڕێی ئەو حەڵاڵەوە بەرەو حەرامیان ببات،

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

((لا يَكوُنُ الرَّجُل مِنَ المُتَّقين، حَتَّى يَدَع ما لا بأسَ بِهِ مَخافَةً مِمَّا بِهِ بأسٌ))[2]

واتە:

(ئەو پیاوە بە تەقواکار ناناسرێت، مەگەر واز لەو شتانەش بهێنێت کە هیچ ڕێگریەکیان لەسەر نییەو (بەکردنیان گوناه بار نابێت) لە ترسی ئەوەی نەوەکو بکەوێتە ناو کارێکی نەشیاوو قەدەغەکراوەوە) وەك ئەوەی کە خۆی دەپارێزێت

---

(١) رواه الطبراني في الكبير(١٤٩/٩) و البيهقي في ((الشعب))٤٥٨/٥(٧٢٧٧)(٦٨٩٢) وهو موقوف على عبدالله بن مسعود(رضى الله عنه).قال الزبيدي: ١٥٩/١. قال العراقي: رواه الطبراني في الكبير. ١٤٩/٩(٨٧٤٨_٨٧٤٩)موقوفاً. قلت: وأخرجه أبو نعيم في الحليةكذلك موقوفا على عبدالله بن مسعود قال: **إيّاكم وحزائز القلوب،وما حزَّ في قلبك من شيئ فدَعه.**]

(٢) رواه الترمذي(٢٤٥١)وحسنه و ابن ماجه(٤٢١٥). في باب الورع والتقوى. والحاكم في المستدرك، ٣٥٥/٤(٧٨٩٩)وصححه. من حديث عطية السعدي. [قال الزبيدي ١٥٩/١: وأخرجه كذلك الطبراني في الكبير١٦٨/١٧(٤٤٦) والبيهقي في السنن الكبرى٣٣٥/٥(١٠٦٠٢) والشعب٥ /٥٢(٥٧٤٥) بهذا اللفظ]

له باس کردنی کاروباری ژیانی خەڵکی، لەترسی ئەوەی نەوەکو ڕایبکێشێت بۆ غەیبەت کردنیان، وە خۆی دەپارێزیت لە خواردنی هەندێك شتی خۆش و وزە بەخش، لە ترسی وروژانی چالاکیەکانی کە توانای بەرگەگرتنی ئەو خۆراکەی نەبێت و مافی خۆیی پێ نەدات و لەوانەیە دووچاری کاری نەشیاوو قەدەغەکراوی بکات.

## چوارەم: وەرعی ڕاستگۆیان

ئەوانەی بە صدديق و ڕاستگۆ ناسراون، پشت دەکەنە هەموو شتێك جگە لە خودا(ﷻ) نەوەکو ساتێك لە تەمەنیان لە کارێکی بێ سووددا بەسەر بەرن، کە ڕێگر بێت لەنزیك بونەوەی زیاتریان لە خوداوە، هەرچەندە ئەشزانێت و دڵنیایشە کە ئەم کارە بۆ کاری حەرام و ناڕەوا نایبات، بەڵام هەر خۆیی لێ دەپارێزێت.

ئەم چوار پلەیە هەموویان لە دەرەوەی سەرنج و بینینی فەقیهەکانەوەیە، مەگەر پلەی یەکەم، کەوەرعی شایەت و قازیەکانە، یان ئەوەی کە گومان لە دادپەروەریان دروست بکات، وە هەستان بەم کارە گوناهی دوارۆژ ڕەد ناکاتەوە. پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی:

((اسْتَفْتِ قَلبَكَ وإنْ أفْتَوكَ وإن أفتَوك))[1]

واتە: ( با چەندین جاریش فتوات بۆ بدەن بۆ کردنی کارێک، تۆ بۆ خۆت داوای فتوا لە دڵی خۆت بکە)، دەی (فەقیە) هەرگیز باسی ئەو خورپەو دڵە ڕاوکێیانە ناکات کە چۆن کاریان پێبکرێت، بەڵکو تەنها باس لەو خەصڵەتە دیارانە دەکات کە تەنها تانە لە دادپەروەری دەدات.

---

(١) رواه أحمد (مسنده)(٢٢٨/٤)

کەواتە هەموو سەرنج و تیبینیەکانی (فەقیە) ، پەیوەندارە بە دونیاوە، کە بەهۆی ئەو دونیایەوە ڕێگەی دوار ڕۆژی بۆ ساز دەکرێت.

کەواتە ئەگەر باس لە گوناهو صیفەتەکانی دڵ و ئەحکامەکانی دوارۆژ بکات، ئەوە لەسەر شێوەی بەدواداچونەو بەس، وەك چۆن هەنێ جار، هەندێك بابەتی پزیشکی و ژمێریاری و ئەستێرەناسی و عیلمی کەلام تێکەڵ بە قسەو بۆ چوونەکانیان دەبێت، وەهەندێك جاریش لەناو شیعر و(نەحو) دا حیکمەت و باسی پەندیاریان تێکەڵ دەبێت.

حەزرەتی سوفیانی سەوری کە پێشەوای عیلمی زاهیرە فەرمویەتی:

بە ڕاستی بەدوا گەڕانی ئەم بابەتە پەیوەندی بە زاد و توێشوی دوارۆژەوە نییە[1] ئەمەچۆن وادەبێت؟

کە هەموو لەسەر ئەوە کۆکن، کە شەرەف و بەهای زانین لە فێربوونی زانستدا بۆ ئەوەیە کە کاری پێ بکەن، ئیتر چۆن وایان گومان بردووە کە ئەوە زانستی(**لیعان و ظهار و سەلەم و ئیجارە و صەرف**)ە، وە هەرکەسێك ئەم فەرمانانە فێر ببێت، وە مەبەست و ئامانجی ئەوەبێت کە بیانگەێنێت بەخودا، ئەوە شێت بووە؟!

کەواتە پێویستە کار بە هەردوو لا بکرێت، بە بەشداری ئەندامەکانی خۆی لەگەڵ ئامادەباشی تەواو بە دڵ و دەرون پێکەوە طاعەت و بەندایەتی ئەنجام بدەن، ئەوە ئەو زانستە شەرەفمەندەیە کە بە دڵ و ئەندامەکان دەکرێت و شایستەیە بە زانستی بەهادار ناو ببرێت.

ئەگەر پرسیارت کرد:

---

(١) ذكره في ((قوت القلوب))(١/١٣٥) و روى ابن عبد البر في((جامع بيان العلم و فضله))(١٩٥٦) عن سفيان الثوري نحوه.

بۆچی یەکسانیت خستۆتە میانی زانستی فەقیهو تەندروستی یەوە؟ خۆ چارەسەری نەخۆشییەکان پەیوەندی بە دونیاوە هەیە کە تەندروستی جەستەیە، وە زانینی (فیقە) لەگەڵ ڕێکخستی کارو باری دونیایشدا پەیوەندیی بەچاکی و مانەوەی دینیشەوە هەیە، کەواتە ئەم یەکسانی‌یە لە میانیاندا پێچەوانەی ڕای زانایانە.

لەوەڵامدا بزانە:

لە هەموو ڕوویەکەوە یەکسان نین، بەڵکو جیاوازی هەیە لە میانیانداو،

## عیلمی (فیقە) گەورە و مەزنترە لە سێ ڕووەوە:

### یەکەم:

چونکە زانستییەکی شەرعی‌یەو لە زانستی پێغەمبەرایەتییەوە وەرگیراوە، بەڵام پزیشکی لە زانستی پێغەمبەرایەتی ناژمێردرێت.

**دووهەم:** هیچ کەس نی‌یە لە وانەی بەدوای گرتنەبەری ڕێگای ئاخیرەتدا دەگەڕێن پێویستییان بە(فیقە) نەبێت، ئەوەی لەش ساغەو ئەوەیش کە نەخۆشە[1] بەڵام پزیشکی تەنها نەخۆشەکان پێویستیان پێی دەبێت کە ئەوانیش کەمینەن.

**سێیەم:** بەڕاستی زانستی(فیقە) نزدیکە لەگەڵ زانستی ڕێگای دوارۆژدا، چونکە بەهۆی فیقهەوە سەیری کردەوەی ئەندامەکـانی لـــەش و، ســـەرچـــاوەی کردەوەکان دەکرێت و، بنەماکەیشی لە خەصڵەت و صیفاتی دڵەکانەوەیە..

---

(١) انظر((الأقتصاد)) ص(٧٩)

کردەوەیەکی پەسەندکراو لە ڕەوشتێکی پەسەندکراوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە لە دوارۆژدا مایەی ڕزگارییە ، خراپیش لە خراپەکانی دەروونەوە پەیدادەبێت، شـــاراوە نیيە کـــە پەیوەندی زۆرە لـــە میانی ئەندامەکـــانی لـــەش و دڵی مرۆڤدا[1]

بەڵام لەش ساغی و نەخۆشی، پەیوەندی بە مەزاج و تێکەڵ بوونی سروشتەکانەوە هەیە، کە لاشەی مرۆڤی لەسەر دامەزراوە، ئەمانەش لە خەصڵەتەکانی لاشەن و ناکرێنە صیفاتی دڵ.

کەواتە هەرچەندێك بەراوردی زانستی تەندروستی لەگەڵ فیقهدا بکەین بەرزی و فەزڵی زانستی فیقە زیاتر دەردەکەوێت، وە ئەگەر فیقهو زانستی ئاخیرەتیش بخەینە پاڵ یەکەوە، شەرەف و بەرزی زانستی ڕێگای دوارۆژیش باشتر ئاشکرا دەبێت.

ئەگەر پرسیارت کرد:

کەواتە بەدرێژی باسی عیلمی ئاخیرەتم بۆ بکە، ئەگەر نەشگونجێت باسی یەکە یەکەی بابەتەکانی بەدرێژی بکەیت. ئەوەندەی واتای زاراوەکان ڕون بکرێتەوە باسیم بۆ بکە:

## کەواتە بزانە: زانستی ڕۆژی دوایی(عیلمی ئاخیرەت)

## دوو بەشە:

## زانستی موکاشەفە و زانستی موعامەلە

(١) سەرچاوەی هەموو چاکەو خراپەیەك لەڕیگەی دڵەوەیە: وەك لە ڕیوایەتی بوخاریداهاتووە (٥٢): ((ألاَ و إنَّ في الجسَدِ مُضـغَةٌ إذَا صَلَحَت صَلَح الجَسَـدُ كُلُّه، و إذا فَسَدَت فسَـد الجَسَدُ كُلُّه ألاَ وهيَ القَلبُ))

# بەشی یەکەم:

# زانستی موکاشەفە

(واتە هەڵدانەوەی پەردە لەسەر شتە نادیارەکان) کە ئەمەش بە عیلمی باطین و شاراوە ناسراوە کە ئامانجە بۆ تەواوی زانستەکان.[1]

هەندێك لە عاریف و خوداناسان فەرمویانە:-

هەرکەسێك لەم زانستە بێ بەش بێت، ترسم هەیە کۆتایی ژیانی بە ئیمانەوە نەڕوات(توشی سوونی خاتیمە ببێت) وە نزم ترین بەش کە لێی بەهرەمەند ببێت سەلماندن و باوەڕ پێ کردنیەتی، کە خۆی لێی نازانێت ڕوبەڕوی ئەهلی خۆیی بکاتەوە.[2]

یەکێکی تر دەڵێت:

هەرکەسێك یەکێك لە صیفەت و خەصڵەتەکانی بیدعەت و خۆ بەشت زانینی تیابێت، هەرگیز دەروازەی ئەو عیلمی ئاخیرەتەی بۆ ناکرێتەوە و لێی فێرنابێت.[3]

---

(١) هیممەتی عاریف و دۆستانی خودا ڕو لە عیلمی ئاخیرەت دەکات، هەمووی چاوی بڕیوەتە شارەزا بوون لەو زانسیتیە، بۆیە ئیمامی غەزالیش(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە دوای توێژینەوەی بابەتیانەی خۆی لە کتێبی (المُنقذُ مِنَ الضَّلال) دا گەیشتۆتە ئەو ئەنجامە کە عیلمی ئاخیرەت دوا ئامانجی عورەفا و خواناسانە.

(٢) قوت القلوب(١٧٣/١)

(٣) نفس المصدر

ووتراوە:

ئەوەی خۆشەویستیی دونیا زاڵ ببێت بەسەریدا و سوور بێت لەسەر ئارەزوات، ناتوانێت بگات بەو عیلمە، کە لەوانەیە بە هەر یەکێك لە زانستە زاهیرەکانی تر بگات.

ئەوەش زانستی باطین ڕەد بکاتەوە، کەمترین تۆڵە بەرامبەری ئەوەیە: کە هەرگیز بەشی نابێت تیایدا.

لە سەر ئەم فەرموودەیەش وتراوە

وارضَ لِمَنْ غابَ عَنكَ غَيبَتَه    فَـذاكَ ذَنـبٌ عِقـابُهُ فيه[1].

بەندەش لەم ڕوانگەوە دەڵێم:

**غائیب کە دەڵێن عوزری لەگەڵ خۆیە، بە هـۆیە!**

**نــازانی بە حــاڵی کــە برینـــیشی بەســۆیە**

**گەر بێـت و بڵێ: ســـیڕری غیابی: کە لە کوێیە**

**ئەو کــاتە پەشیمـــانە، کە ئەســراری لە گــوێیە**

**زانینــێ کە لێـت دوورە، کــە نایـــزانی بەجێیە**

**مونکیـر مەبە، بــەو ڕازو نیـــازەی کــە لــەوێیە**

**بێ بەش کە بــەجێ ماوە، هــەتا مـــاوە لـەڕێیە**

**پــەڕگاری نهێــنی دڵــە، هەر سیــڕرە لــەتـوێیە**

**توێ تــوێی دڵــی ئەهلــی دڵە، عیلمێکــە لە نوێیە**

**(ئەحسەن) دەڵێ: نا حاڵی لە کوێ خوانی بە خـوێیە][2]**

---

(١) ابن نباته (ديوان)(٥٧٤).

(٢) دانراوی ((ئەحسەن)) موفتی.

# زانستی شاراوە:

واتە: عیلمی صددیق و نزیکانی دەرگای خودایە، مەبەستم پێی عیلمی موکاشەفەیە:

کە بریتیە لەو نورەی لە دڵدا دادەگیرسێت، لە دوای ئەوەی دڵی لە صیفەتە ناباڕەکان پوخت و پاك و پاڵفتە کردەوە، لە ناو ئەو نوورەدا چەندین فرمانی بۆ دەردەکەوێت، کە پێشتر تەنها ناوەکانیانی بیستووە، بۆ خۆی واتایەکی کورتی نادیاری بۆ دادەنا، کە دواتر بۆی ڕون دەبێتەوە، کە پەیوەندی و زانیاری تەواو بە زاتی(حەق تەعالا) وە چۆنە،(واتە: **مَعْرِفَةُ اللّه**)ی بۆ حاصل دەبێت و ئاشنا دەبێت بە صیفەتە تەواوەکانی خودا و کەماڵاتی بەردەوامی پەروەردگار.

وە بەهۆی عیلمی باطینەوە حاڵی دەبێت لە حیکمەت و نهێنی ئەفعالی خودا، دەربارەی: دروست کردنی دونیا و پاشەڕۆژ، وە بۆچی بەم ڕیزبەندییە هێناویەتی (لە پێشەوە دونیا کە کێڵگەی دوارۆژە و لە پاشان قیامەت).

وە زانیاری دەبێت لە مانای پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەرﷺ، وە مانای وەحی و نیگاو وشەی مەلائیکەو شەیتانەکان و چۆنیەتی دوژمنکاری شەیتان بۆ گرۆی ئادەمیزاد، وە چۆنیەتی دەرکەوتنی فریشتەکان بۆ پێغەمبەران، وە چۆن دەتوانن وەحی و نیگا لەخوداوە وەربگرن، وە شارەزابوون لە جیهانی مەلەکوتی، لە ئاسمانەکان و سەرزەوی، وە ناسینی دڵ و چۆنیەتی بەگژاچون و، بەربەرە کانێی سەربازەکانی مەلائیکەت و شەیتانەکان .

(کە دڵ بە ئەنوار و فیوضاتی خودایی ئاوەدان دەبێتەوەو، بەقسەو خەصڵەتە نابار و نەشیاوەکانیش دڵەکان وێران دەبن).

هەروەها جیاوازی دەخاتە میانی خەواطیر و بەڵینی فریشتەکانەوە، کە (بەڵینی خێر و چاکە و ڕاستییان پێ دەدەن) لەگەڵ درۆو دەلەسەو فیشاڵی

شەیتانەکان[1] هەروەها جیهانی دوارۆژو بەهەشت و دۆزەخ و، سزای ناوگۆڕ و پەڕینەوەی پردی صیراط و کێشانە و پێوانە و لێ پێچینەوەو لە کردەوەکانی بۆ دەردەکەوێت، حاڵی دەبێت لەوەی کە خودای گەورە فەرمویەتی:

﴿ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا﴾الأسراء/١٤.

واتە: (پەڕاوی کردەوەکانی خۆت بخوێنەرەوە و بزانە چیت کردووە؟ ئەمڕۆ خۆت بەسیت بۆ لێپرسینەوەی خۆت) [2].

هەروەها لەواتای ئەم ئایەتەش کە فەرمویەتی:

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾العنکبوت/٦٤واتە:

(بەڕاستی ماڵی قیامەت ماڵی ژیانی ڕاستەقینەیە، ئەگەر ئەم کافرانە بیانزانیایە، ژیانی دونیایان لەم ژیانە ڕاستەقینەیە پێ باشتر نەدەبوو).[3]

هەروەها لە واتای گەیشتن بە حزوری خودا دەگەن، کەچۆن سەیری ڕوی جوانی پەروردگار دەکەن، وە چۆن لێی نزیك دەبنەوە، لەوەش کە مەنزڵیان لەپاڵیا دەبێت، وە دەزانن مانای بەختەوری چیە، کە هاوڕێیەتی(ملأُ الأَعلى) دەکەن، لەگەڵ بەراوردکردنی فریشتەکان و پیغەمبەران، وە حاڵی بوون لە جیاوازی پلەکانی ئەهلی بەهەشت: کە هەندێکیان هەندێك دەبینن وەك چۆن ئەستێرەی پرشنگداری نێو ئاسمان دەبینرێت، زۆر شتی تریش دەبینن و دەزانن کە بە باسکردنیان درێژە دەکێشێت.

وە خەڵکەکەش دوای ئەوە باوەڕیان بە ئەصەکانیان هەیە، لە تێگەیشتن لە

---

(١) وەك قورئان فەرموویەتی: الشيطانُ يَعِدُكُم الفَقرَ ويأمُرُكُم بالفَحشاء... البقرة/٢٦٨)

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی ل (٢٨٣)

(٣) خولاصەی تەفسیری نامی: ل (٤٠٤).

واتای ئەم فرمانانەدا چەندین پلەو مەقامی جیاوازیان هەیە!
هەندێکیان وای دەبینن هەموو ئەمانەی کەوتراوە تەنها هێنانەوەی نمونەیە، چونکە بەڕاستی ئەوەی خودا بۆ بەندە صاڵحەکانی ئامادەکردووە، نە چاو بینیویەتی، نە گوێ بیستویەتی، نە بەخەتەرەش هاتووە بەدڵی کەسدا، کەواتە ئەوەی لەلای ئەو خەڵکەیە لە نهێنیەکانی بەهەشت تەنها ناوو صیفەتەکانە.
وەهەندێکی تریان وای دەبینن: کە بەڵێ هەندێکی تەنها نمونەیە، بەڵام هەندێکیشی لەگەڵ حەقیقەتی تاریف و پێناسەکانیان یەك دەگرنەوە.

## هەندێکیشیان دەڵێن:

ئەوانەی دەگەن بە ئەوپەڕی حاڵەتی(مَعْرِفَةُ الله) و خوداناسی، ئەوانەن کە دان ئەنێن بە وەی کە ناتوانن لە مەعریفەت و ناسینی خودا حاڵی بن.
وەهەندێکیشیان دەعوای گەورە گەورەیان هەیە لە بارەی ناسین و مەعریفەتی پەروردگارەوە ﷻ.
**وە هەندێکیشیان دەڵێن:** سنووری ناسینی خودا ئەوەیە کە بیروباوەڕو عەقیدەی خەڵکە عەوامەکە پێی گەیشتووە و لێی راوەستاوە، کە ئەو زاتە گەورەیە بوونی هەیەو، زانایە و بەتوانایەو، دەبیستێ و دەبینێ و قسە دەکات.
کەواتە مەبەستمان لە عیلمی موکاشەفە ئەوەیە:
پەردەی بەینی بەندەو خالیق هەڵبدرێتەوە، تا بەئاشکرا لەو هەموو فرمانانەدا دەستی قودرەتی ڕاستەقینەی پەروەردگاری بۆ دەربکەوێت ، بەوشێوەیەی کە ئەگەر بەچاوی سەریش ببینێت هەر ئەوەندە لێی دڵنیا دەبێت.
بۆ جەوهەری هەموو مرۆڤێک دەشێت ئەم ڕاستیانە ببینێت، بەڵام ئاوێنەی دڵەکان بەهۆی پۆخڵەواتی دونیاوە ئەوەندە گەرد و تاوان و ڕەشاییان لێ نیشتووە ئەو پەردەی لەسەر دروست کردووە.

مەبەستیشمان لە زانستی ڕێگەی ئاخیرەت:

زانینە بە چۆنیەتی پاك كردنەوەی ئەو ئـاوێنەی دڵـەیە، لـەو پۆخڵـەواتەی كە پەردەیەكی دروست كردووە لە میانی بەندەو خالیقەكەیدا، ئەو پەردە ڕێگرە لە ناسینی خودا و شارەزابوون لە صیفەت و كردارەكانی، پاڵفتەو پوختكردنەوەیشی، بەواز هێنان دەبێت لە ئارەزووە خراپەكان، وە شوێن كەوتنی پێغەمبەرەكانە ﷺ لە هەموو حاڵەتەكانیاندا (صەڵات و سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت)، بەئەندازەی ڕۆشنایی كە بۆ دڵ پەیدا دەبێت و، دەتوانێت زیاتر ڕوی لە حەقق و خوداوەندی بكات، حەقیقەتەكان زیاتر لە دڵیا دەدرەوشێتەوە، ئەمەش زیاتر بەو ڕیازەتی ڕۆحییە دەبێت كە لە جێگەی خۆی دا بەدرێژی باسی دێت، هەروەها بە فێربوون و فێركردنی خەڵكی[1] ، ئەمەش ئەو عیلمەیەكە كە ناگونجێت لە نێو كتێبەكاندا بنوسرێتەوە.

(چونكە ئەمانە علومێكی زەوقین، واتە بەتام و چێژی تایبەتی ئەم زانستیانە وەردەگیرێن، دوای گەیشتن بە حاڵەتی موشاهدەی قەلبی، ئینجا سالیك هەستی پێ دەكات، نەك لەڕێگەی بەڵگەو دەلیلەوە. وە ئەوەش كە لەناو كتێبدا بنوسرێتەوە، ئەوا دەكەوێتە دەستی شیاو و نا ئەهلەوە، ئەگەر ئەهلی ئەم زانستە نەبێت دەكەوێتە حاڵەتی سەر سوڕمان و دودڵیەكی زۆرەوە، لەوانەیە دوچاری مەفسەدەو هەڵدێرەی زیاتری بكات)[2]

ئەوەش كە شارەزایەتی و، خودای گەورە هەندێك لەو نیعمەتانەی ڕژاندووە بەسەریدا، ناتوانێت باسی لێوە بكات، مەگەر لەگەڵ كەسێكدا كە

---

(١) ئەم فێـربوونەش لەژێـر دەسـتی مورشـیدێكی حەقـدا وەك لەمەودا باسـی لێ دەكـات وفەرمومویەتی: **ولابد من شیخ یربك شخوصها.**

(٢) بۆ ئەم بابەتە بەدرێژی بنوارە((الإتحاف))(١/١٦٦).

شایستەی ئەو فەزڵە بێت، کە هاوڕێ و هاوبەشی بێت، بەشێوەی دەردەشە کردن و بەڕێگەی ئەسراری مەعنەوی‌یەوە لێی بدوێن.

ئەمە ئەو زانستە شاراوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە کردووە بەم فەرمودەی:

**((إنَّ مِنَ العِلمِ كَهَيئَةِ المكنُونِ لا يَعلَمُهُ إلاَّ أهْلُ المَعرفَةِ بالله تَعالى، فإذا نَطَقُوا بهِ لَمْ يَجْهَلْهُ إلاَّ أهلُ الإغتِرارِ بالله تَعالى، فَلَا تُحَقِرُوا عالماً آتاهُ اللهُ تعالَى عِلماً مِنهُ، فإنَّ اللهَ (عزَّ وجَلَ) لَم يَحْقِرهُ إذا آتاهُ إيَّاهُ))** [1] واتە:

( بەڕاستی هەندێك زانست هەیە، وەك گەوهەری شاراوە وایە، مەگەر کەسانێك بیانزانن کە خوداناسن و لەو پێرەن کە بە(مَعرِفةُالله) ئاشنا بوون، ئەگەر بدوێن و بەو عیلمەوە قسە بکەن، تەنها ئەوانەی سەرکەش و مەغرور بوون نایزانن و لێ یان حاڵی نین، بەسووك سەیری ئەو زانایە مەکەن کە خودا زانستێکی پێ داوە، خودای گەورە کە ئەو زانستەی پێ داوە مانای وایە بە سووك سەیری نەکردووە.

---

(١) بلفظه في ((قوت القلوب))(١٧٥/١) معلقا، و قال الحافظ المنذري في الترغيب والترهيب (١٣٥/١) رواه أبو منصور الديلمي في المسند(٨٠٢) و أبو عبدالرحمن السلمي في الأربعين التى له في التصوف.

[وقال الزبيدي: أورده السيوطي في اللآلى المَصنوعة، وقد أورد القطب القصطلانى هذا الحديث في كتاب له في التصوف و قال: له شاهدا من مرسل سعيد بن مسبب. قال الحافظ العراق و يذكر راوية آخر الحديث بسند فيه ضعف كما يقول: وقال الحافظ الزبيدى: قلت: وأخرجه ابن عدي في الكامل في ترجمة طلحة بن زبر من حديث أبو موسى الأشعرى رفعهُ:

**أن الله تبارك و وتعالى يقول: لا تحقروا عبداً آتيته علماً، فإنىّ لم أحقِرهُ حين علّمته**

و طلحة بن زيد متروك. و قال السيوطي وقد أخرجه الطبراني أيضا، وقد ذكروا له أسانيد أخرى، تقوى بعضها بعضا ((الأتحاف)) (١٦٧/١)

# بەشی دووهەم

## عیلمی موعامەلە

واتە: ئەو زانستەی کە پەیوەندارە بە ئەحواڵی دڵەکانەوە، **ئەوەی کە ستایش دەکرێت وەك:** خۆڕاگری و شوکرانەبژێری و، خۆف و ڕجاو، ڕەزامەندی و دونیا نەویستی و، تەقواکاری و قەناعەت و سەخاوەت و زانینی فەزڵ و منەتی خودا لە هەموو حاڵەتەکاندا و، چاکەکردن و ، گومانی باش بردن و، خورەوشتی جوان و هەڵسوکەوتی شیرین و ڕاستگۆیی و ئیخلاص و دڵسۆزی.

ناسین و زانینی حەقیقەتی ئەم حاڵەتانە و سنوور و پێناسەو هۆکارەکانیان کە بەهۆیانەوە پەیدادەبن، وە بەرهەم و نیشانەکانیان و چارەسەری حاڵەتی لاوازی هەندێکیان تا بەهێزیان بکرێت، ئەوانەی کە ڕۆیشتوون بگەڕێنرێنەوە.

لە زانستی ئاخیرەت و دوارۆژ، ئەمانە زانینی پەسەندکراون.

**ئەوانەش کە بەنەشیاو دەدرێنە قەڵەم و زەمیان دەکرێت، وەك:**

ترسی هەبیت لە هەژاری و ، ناڕازی بێت لە قەدەری خودا و، صیفەتی خیانەت و فێڵ کردن و، کینەداری و ئیرەیی و، غەش و خیانەت کردن و، گەڕان بەدوای گەورەیی و ،حەزکردن لەپیاهەڵدانی خەڵکی و، حەز کردن لە زۆر مانەوەی لە دونیادا بەمەبەستی ڕابواردن، وەخۆبەشت زانین و، ڕیاکاری و تووڕەبوون و، لوتبەرزی و، دوژمنایەتی و، ڕق هەڵگرتن و تەماح و، بەخالەت و خۆ دەرخستن و توندی و تونڕەوی و، قسەی قەڵەو کردن و خۆ گیف کردنەوە و قسەکردن بەفیز و دەمارەوە، لەگەڵ کوفرانەی نیعمەت و هەق داپۆشین، وە زیادە ڕێزگرتن لەدەوڵەمەندەکان لەبەر سامانەکەیان و، بەسووك

سەیرکردنی هەژارەکان و، شانازی و خۆهەڵکێشان و، کۆ برکێی خراپ و، نازین بە پارەو ماڵ و، سەردانەنەواندن بۆ حەق و، رۆچون لە کاری پوچەڵ و بێ سوود، وە زۆربلێی و قسە زۆر کردن و چەنەبازی و ، زیادەڕەوی لە پیاهەڵدانی خۆی و، خۆ جوانکردن لەبەردەم خەڵکدا و، نەرمی نوادن بۆ نائەهل و، خودپەسەندی و، باس کردنی عەیبی خەڵك و، لەبیرکردنی کەموکوڕییەکانی خۆی و، نەمانی حاڵەتی حوزن لە دڵداو، دەرچوونی (خَشيَةُالله) تیایداو، هەرکاتێکیش نەفسی دووچاری شکستی هات زۆر لە سەری بکاتەوەو، کەمتر لە سەر حەق بێتە جواب و، پەیداکردنی ئەوانەی بە رواڵەت دەبنە برا بۆ دژایەتی کردنی نهێنییە شاراوەکان، وە نەمین بوونەوە لە مەکری خودا، کە بوغرا ببێت و نەترسێت کە خودا لێی بسەنێتەوە، وە پشت بەستن بە طاعەت و عیبادەتەکەی خۆی، هەروەها فێڵ و خیانەت و هەڵخەڵەتاندن و فریودان و، طولی ئەمەل و هیوا درێژی و دڵ ڕەقی و، دڵخۆشی بە دونیاو، خەفەت خواردن لە لەدەستدانی شتی دونیایی و، دڵداهاتن بە مەخلوقات و ، بێ تاقەتی و بێزاری لە جیابونەوە لێان و ، وشکی و دوریی لە نەرم و نیانی و، طەبیعەت سووکی و پەلەکردن و، بێ شەرمی و نەبوونی بەزەیی و میهرەبانی.

ئەمەو هاوێنەکانیان لە [حیرص و زوڵم و یاخی بوون و غەیبەت و دووزبانی] هەموویان لەو صیفەتە نالەبارانەی دڵن، کە بەروبومی فاحیشەو خراپەکاری لە دڵ دەڕوێن و جێگای چاندنی کردەوە قەدەغەکراوەکان دەبن. دژەکانیشیان کە کردەوە پەسەند کراوەکانە، سەرچاوەی گوێڕایەڵی و نزدیکییە لە پەروەردگار.

کەواتە ئەگەر ئەحواڵ و سنوور و حەقیقەت و هۆکارو بەرهەم و چارەسەری ئەم کاروبارانە بزانیت و لێیان شارەزا ببیت، ئەوە عیلمی ئاخیرەتت هەیە

بەفتوای زانایانی شارەزا لەم زانستەدا، ئەم عیلمە فەرزی عەینە، ئەوەش پشتی تێ بکات بە دڵنیاییەوە لە ڕۆژی ئاخیرەتدا لەناو دەچێت، بەدەستەڵات و قەهری پادشای پادشایان ، وەك چۆن کەسێك لە دونیادا کردەوە ئاشکراکان نەکات ، بە پێی دەستەڵات و شمشێری تۆڵەی سوڵطانەکانی دونیا بە هیلاکیدا دەبەن و، بە حوکمی فتوای فوقەها و دادوەرانی دونیا تۆڵەی لێ دەسێنرێت.

کەواتە فوقەهای دونیا لێکدانەوەیان بۆ فەرزی عەین لە پاڵ سازبوونی ئەو کردەوە دونیاییانەدایە کە باسمان کردن، لەگەڵ سەرنج دان لەو هەموو جۆرە فرمانانەو صەلاح و ساز بوونی کار و فرمانەکانی دوارۆژو ڕێکخستنیان، بەشێوەیەك ئەگەر پرسیار کرا لە(فەقیهێك) لەبارەی یەکێك لەو واتایانەی کە باس کرا، تەنانەت ئەگەر بپرسن دەربارەی ئیخلاص، یان پشت بەستن بە خودا، یان چۆنیەتی خۆپاراستن لەڕیا، ئەوە فەقیهەکە لەوەڵامدانەوە دەوەستێت، کە دەشزانێت زانستی ئەمانە فەرزی عەینە و، ئەگەر کەمتەرخەمیشی بەرامبەر بکرێت ئەوا دەبێتە هۆی لە ناوچونیان لە دوارۆژدا، بەڵام ئەگەر لەهەمان(فەقیە) دەربارەی (لیعان و ظیهار و پێشکەوتن و تیرەندازی).. پرسیار بکەیت، ئەوا چەندین بەرگی گەورەی کتێبت بۆ پڕدەکاتەوە و، لق و پۆی زۆری لێ دەکاتەوە، ئەوەندە بەوردبینی وەڵام دەداتەوە، سەیرەکەیت هەموو دونیا کۆتایی پێ دێت، لەوانەیە پێویستت بە یەکێ لەو ئەگەرانە نەبێت، (کە ئەوان نوسیویانە و دایان ناوە و فتوایان لەسەر داوە) وە ئەگەر پێویستیشیان پێی هەبێت، خۆ شارەکە کەسێکی وای تیادەبێت کە وەڵامیان بداتەوە، ئیتر ئەو هەموو خەرجی و ماندوو بوونەیشی بۆ دەگەڕێتەوە، کە شەوو ڕۆژ و بەردەوام خۆی ماندودەکات و لەبەری دەکات و بەدەرس دەیلێتەوەو خەڵکی لێ فێر دەکات، بەڵام هێشتا غافڵە لە زانینی ئەوەی کە بۆ خودی خۆیشی زۆر بایەخدارو گرنگە.

ئەگەر بشلێن بۆچی وادەکەیت؟ دەڵێت:

بۆیە خۆمم بەم بابەتە شەرعیانەو(مەسائیلە فیقهیانە)وە خەریك کردووە، چونکە ئەمە زانینی دینە و فەرزی کیفایەیەو، دەبێت کەسانێك پێی هەڵبستن تا لە کۆڵ باقیەکەی بکەوێتەوە.

بەم شێوەیە بەو عوزر و بەهانەی دەیهێنێتەوە فێڵ لە خۆیشی دەکات و، سەرلە خەڵکیش دەشێوێنێت.

(واتە: بایەخ و گرنگی زیاتر دەدات بەزانینێك کە فەرزی کیفایەیە، لەو زانستیەی کە بۆ خۆی و خەڵکی تریش فەرزی عەینە، کە عیلمی ئاخیرەتە) مرۆڤی زیرەك دەزانێت : ئەگەر مەبەستی جێ بەجێ کردنی ئەو فرمانەبێت کە پێویستە پێی هەڵبستێت، بۆ ئەو زانستەی کەفێربوونی فەرزی کیفایەیە، دەی دەبوایە فەرزی عەینەکەی لێ پێش بخستایە، بەڵکو ئەو زۆر لە فەرزە کیفایەکانی لەسەر پێش خستووە، زۆر شار هەیە جگە لە(ئەهلی ذیممە) دکتۆرێکی تیا نی‌یە، خۆ شەهادەتیان دروست نیيە لەو بابەتانەی لە ئەحکامی(فیقە) دا پەیوەندی بەشایەتی دکتۆرە وە هەیە.

کەچی نابینین کەسێك خۆی پێوە خەریك بکات، بەڵام کێ برکێ و گەلەکۆمە دەکەن لەسەر فێربوونی عیلمی(فیقە) بە تایبەتی پرسە جێ ناکۆکەکان و جەدەلییەکان( کە بە بەڵگە خەصمەکانیانی پێ بێ دەنگ دەکەن) ئەوەندە فتوای زۆریان لەسەر دراوە، لەو فەقیهانەی کە سەرقاڵن بە فتوادانەوە، وەڵامی ڕوداوەکان دەدەنەوە، خۆزگە دەمزانی چۆن فوقەهای ئیسلام ڕێگە بە خۆیان دەدەن کە خۆیان سەر قاڵی ئەو بابەتانە بکەن، کە زانیویشیانە فەرزی کیفایەیە و، کەسانێکی زۆریش پێی هەڵساون، لەگەڵ ئەوەشدا کەمتەرخەمی تەواو بکەن لەو زانستانەی کە کەس خەمی لێ نەخواردووە؟!

ئایا هۆکارێك هەیە کە نامانزانیبێت؟

دیارە خۆ خەریك کردن بە زانستی تەندروستی(لەوکاتەدا) بە ئاسانی نایگەیەنێت بەوەی کەسەرپەرشتیاری ئەوقاف و وەصێت نامەکان و، هەڵگرتنی ماڵی هەتیوو چونە سەر کورسی قەزاوەت و حکومەتی دەسبکەوێت، وە پێش بکەوێت بەسەر هاوڕازەکانیدا و زاڵیش ببێت بەسەر نەیارانیدا.

بەڕاستی ئەمە زۆر دوورە و کارێکی بێ ئامانجە! بەداخەوە زانستی دینی پێچرایەوەو ئاساریشی نەما، بەهۆی عولەمای سووئەوە کە ڕاستیەکانیان شێواندووە (بابەتەکانیان تێکەڵ کردووە، کە باطیل و پوچەکانیان بەشێوەی ڕاستیەکان خستۆتە بەر چاو) ئەبێ داوای یارمەتی لە خودا بکەین، پەنا تەنها بەو بەرین، کە لەم غرورو سەرکەشیە بمانپارێزێت، کە مایەی توڕەبون و قەهری پەروەردگارە و ،شەیتانیش بە خۆیان پێ دەکەنێن.

لەکاتی خۆیدا زانایانی(عیلمی ظاهیر) دانیان دەنا بە ڕێز و فەزڵی زانایانی(عیلمی باطین) و خاوەن دڵە زیندوەکاندا:

ئیمامی شافیعی خودای لێ ڕازی بێت، لە بەینی دوو دەستەی(شەیبانی ڕاعی) دا دادەنیشت[1] وەك چۆن منداڵێك لە قوتابخانەکەی دادەنیشێت، وە پرسیاری لێ دەکرد لەو بابەت و فرمانانە چی بکات،

---

(١) شەیبانی شوان: یەکێکە لە ئەولیاء و عاریفە بەناوبانگەکان، حاکمی ذەهەبی فەرموویەتی: شەیبانی ڕاعی: عەبدێکی صاڵحی زاهیدە، بەردەوام خۆی تەرخان کردووە بۆ بەندایەتی خوا، أبو نعیم باسی کەرامەتێکی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: شەیبان ئەگەر ئیحتلامی ببوایە و ئاوی لانەبوایە، داوای دەکرد و هەورێ دەهات، دای دەپۆشێت و بەبارانەکەیشی خۆی دەشۆرد، کە دەشچوو بۆ جومعە، هێڵێکی بەدەوری ناژەڵەکەیدا دەکێشا، هەتا دەهاتەوە هیچ یەکێ لەو مەڕو ماڵاتە سنوری هێڵەکەیان نەدەبەزاند، زوبەیدیش دەفەرموێت: لە میصردا وەفاتی کردووە، لە نزیك زانای گەورە(موزەنی) دا بەخاك سپێرراوە. هەروەهامەناوی لە(طبقات)ەکەیداباسی کردووە(إبن سینا)ی بەناوبانگیش ڕوی

پێیان دەووت:چۆن دەبێ نمونەی وەك تۆ پرسیار لەم كابرا دەشتەكییە بكات؟!

ئەیفەرموو: **إنَّ هَذا وُفِّقَ لِماَ عَلِمْناهُ**[1]واتە:

( ئەوەی ئێمە فێری بووین، یان لێی غافڵ بووین، شەیبان خودا تەوفیقی داوە و لە خۆی دا جێ بەجێ كردووە). [واتە: پەردەی لەسەر لادراوە، زانیاریەكانی ئەو متمانە پێ كراوەو دڵنیایی دەبەخشت][2]

هەروەها ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و یەحیای كوڕی موعین دەچـــونە زیارەتی مەعـروفی كەرخی كە لە عیلمی زاهیردا نەدەگەیشتەوە بەماندا،كەچی ئەمان پرسیاریشیان لێ دەكرد[3] ئەگەر وانی‌یە چۆن لەوەڵامی

---

نوســـینێكی تـــایبەتی لـێ كـــردووە. كە نەیشـــی دیـــوە. بنـــوارە: إتحـــاف الســـادة المتقين(١٧٢/١)...

(١) قوت القلوب(١٥٨/١) وفي نسخة أخرى(**أغفلناه**) بدل (**علمناه**)

(٢) ئیمـامی زەهەبی سـەلماندوویەتی كە حەزرەتی شـافیعی و ئەحـمەدی كـوری حەنـبەل كۆبونەتەوە لە خزمەتیداو شێخی گەورە لە فتوحاتی مەككیدا (قُدِّسَ سِرُّهُ) باس لەوە دەكات پرسیاریان لە شەیبان كردوە دەربارەی زەكاتی مەڕ؟

فەرمـووی لەسـەر مەزهەبی ئێمە یـان مەزهەبی خۆتـان، چـونكە لە مەزهەبی ئێمەدا هەمـوو شتێك هی خـودایە كەس موڵكی نی‌یە تـا زەكاتی لێ بـدات، چـونكە (نابێ هیچی ببێ و هیچی لا بمێنێتەوە) وە، لەسـەر مەزهەبی ئێوەش لەهەمـوو چل سـەرێك دەبێ سەرێك بدات، وە لەبارەی كەسێكەوە كە لە پێنج فەرزە نوێژێكی بیربچێت؟ فەرموی: ئەوە دڵـێكە غافـڵ بـووە لە خـودا، دەبـێ هەر پێـنج فەرزەكە بكـاتەوە،(ئەمە لەسـەر مەزهەبی ئەهلی عیرفان)بنوارە إتحاف(١٧١/١).

(٣) بنوارە: قـوتُ القلـوب١٥٨/١،، وە خـاوەنی قـوت القلـوب دەفەرموێـت: عبـدالله كـوڕی ئەحـمەدی كـوڕی حەنـبەل فەرمویەتی: ووتـم ئەی بـاوكە بیسـتومە تـۆ دەچیـت بـۆ لای مەعروفی كەرخی، ئایا حەدیسێكی لابووە لێی وەربگریت؟ فەرمووی كوڕم:

پرسیارێکدا کە عەرزی پێغەمبەریان کرد(ﷺ) چی بکەین ئەگەر پێشهاتێ ڕوویداکە لە قورئان و سوننەتدا حوکمەکەیمان دەست نەدەکەوت؟

فەرموی(ﷺ):

((سَلُوا الصَّالِحِينَ واجْعَلُوهُ شُورَى بَينَهُم))[1] واتە:

(پرسیار لە صاڵح و تەقواکاران بکەن کۆیان بکەنەوەو بەڕاوێژ لەگەڵ یەکتریدا با ڕایەك دەرببڕن و بەگوێیان بکەن). بۆیە ووتراوە:

زانایانی عیلمی ظاهیر، زینەت و جوانی موڵک و دەستەڵاتی سەر زەوین، وە

---

(کانَ عِندَه رأسُ الأَمر، تَقوَى الله عزَّ وجَل... ئەوەی لای ئەوە تەقوای خودایە، کە لەسەرو هەموو شتێکەوەیە. شەعرانی لە (الأجْوبَة المُرضيَّة)دا لە (عیززی کوڕی عبدالسلام)ەوە دەیگێڕێتەوە:

کە ئەوەی بۆ ئەوان جێ بەجێ دەبێت لە خەواریق و کەرامات بۆ هیچ زانایەکی تر ڕوی نەداوە، کە لەسەرەتاوە ئینکاری عیلمی تەصەوفی دەکرد، تا کۆبوویەوە لەگەڵ شێخ أبی الحسن شاذلی دا و ڕاستی بۆ دەرکەوت.

وە ئیمام الحرمین یش لە پێشەوە ئینکاری دەکردن، تا ڕاستی بۆ دەرکەوت. لە پاشان شەعرانی دەفەرمووێت: ئیمام ئەحمەد ئەگەر شتێکی لێ بگیرایە، پرسیاری لە ئەبو حەمزەی بەغدادی دەکرد، ئەیفەرموو: لەم مەسئەلەدا تۆ چی دەڵێیت ئەی صۆفیَ؟ لێکدانەوەی ئەوی وەردەگرت. هەروەها(إبنُ سُرَيج) دەچوو بۆ خزمەتی( شێخ جونەیدو شبلی) و ئەیفەرموو:

زۆر سوودو عیلمی تایبەتیم لەوانە وەرگرتووە کە لە کەسی ترمان وەرنەدەگرت.

بۆ زیادەی ئەم بابەتە بنواڕە: إتحاف(١٧٢/١).

(١) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١٦/٢) بلفظ: **إجمَعوا لَهُ العابدين مِنَ المُؤمنين، و اجعَلوُه شُورَى بَينكُم ، ولا تَقضُو فيهِ برأيِ واحد.** ولفظ المصنف عند صاحب القوت (١٥٨/١) وروى الخطيب في(الفقيه والمتفقه)(١١٥٤) نحوه كذالك.

زانایانی عیلمی باطینیش زینەت و جوانی ئاسمانەکان و مەلەکوتی خودان.[1]
حەزەتی جونەید(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:-
(سەریی سەقەطی) کە شێخی منە فەرمووی:
ئەگەر لای من هەڵسایت لە گەڵ کێدا دادەنیشیت؟
ووتم: لە گەڵ موحاسیبی، فەرموی: بەڵێ، لە عیلم و ئەدەبی ئەو وەربگرە، واز لە باس و خوداسەکانی بێنە، [لەسەر عیلمی کەلام و ڕەددانەوەی موتەکەللیمین] لە پاشان کە ڕۆیشتم گوێم لێ بووکە فەرموی:
خودا بتگێڕێ بەخاوەنی فەرمودەو صۆفیش بیت لە پاڵیدا، نەك صۆفی بیت و ئەهلی حەیسیش بیت لە پاڵیدا[2]
هێما دەکات بەوەی کە هەرکەسێك شارەزابوو لە فەرموودەکان و، زانستەکانی وەرگرت لە پاشان بوو بە صۆفی، ئەوە کەسێکی سەرفرازە، بەڵام کەسێك لە پێش ئەوەی ببێتە زانا خۆی کردە صۆفی، ئەوە خۆی هاوێشتۆتە مەترسیەکی گەورەوە.
ئەگەر پرسیارت کرد:
کەواتە بۆچی عیلمی کەلام و فەلسەفە لەبەشی زانستیەکان دایان ئەنێیت، کەچی ڕونیشی دەکەیتەوە کە ئەو دوانە زەم کراون یان پەسەند کراون نین؟
کەواتە بزانە:
کورتەی ئەوەی کە عیلمی کەلام دەیگرێتەوە، لەو بەڵگانەی کەسوودیان لێ دەبینرێت، قورئانەو ئەخبارو فەرموودەکانە، ئەوەی لە و دوو سەرچاوەیە

---

(١) قوت القلوب(١٥٧/١)
(٢) قوت القلوب(١٥٨/١)

دەرچوو، ئەوە یان دەبێتە قسە بەزۆردانێکی نەشیاو، لەو داهێنراوە خراپانەیە کە لە پاشان دێینەوە سەریان، یان دەبێتە دەمەقاڵێ و بەربەرەکانێی یەکتری کە هەریەکە باسی ئەو تاقمانە دەکات، کە کەوتونەتە ڕای جیاواز و بە نوسراوەکانیان ئەوەندەی تر قسەکان درێژ دەکەنەوە، کە زۆربەیان بێ هودەو پوچەڵن و، وەکو وڕاوەکردن وایە، کە سروشتی مرۆڤ نەفرەتی لێ دەکات و حەز ناکات گوێ بیستی ئەو کاوێژکاریانە ببێتەوە...

وە هەندێکیان، ڕۆچونە لە بابەتێکدا کە هیچ پەیوەندیەکی بە دینەوە نیەو، لە چەرخی یەکەم دا هەرگیز باسیشیان لێوەنەکراوە، هەرکەس لەو مەسەلانە بکۆڵایەتەوەو قووڵ بۆی دابچوایە، بە بیدعەکاریان ئەژمار دەکەرد، بەڵام ئێستا حوکمی ئەم جۆرە باس کردنانە گۆڕاوە، چونکە هەندێك بیدعەی گەورەتر پەیدا بووە ، کە لە ئەصڵی دەقەکانی قورئان و فەرمودە لات دەدات، وە دەتبەن بەلای جۆرێکی تر لە واتادا، کە لەفزەکە بە زەرورەت و ناچاری ئەو واتایە دەگەیەنێت، وەهەندێکی تریش پەیدا بوون بۆ ئەو شوبهەو گومانانەی دروستیان کردووە، گەڕاون و بەڵگەیان بۆ تاشیوەو، نوسراوو دانراوی تایبەتیان بۆ ڕێکخستووە و بۆ داناوە، کە خەڵکی دەیانخوێنێتەوە، ئەمەش وای کرد ئەوەی لە پێشەوە ڕێگە نەدەدرا باسیان لێوەبکرێت، بە حوکمی زەرورەت ڕێگابدرێت کە باسیان لێ بکرێت، بەڵکو هانی زانایانیش بدرێت وەك فەرزی کیفایەی لێ هاتووە.

بەو ئەندازەی کە ڕوبەڕوی بیدعەکاران ببێتەوەو بەر پەرچیان بداتەوە، ئەگەر ئەوان سووربوون لەسەر بانگەشە بۆ بیدعەکەیان.

ئەمەش تا سنوورێکی دیاری کراو کە لە سەرباسی ئایندەدا پشت بە خودا دێینەوە سەری .

# دەربارەی فەلسەفە:

**فەلسەفە بۆ خۆی زانستێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو چوار بەشی هەیە:**

**یەکەمیان:** ***ئەندازیاری و ژمێریاری،***

کە هەردووکیان ڕێگەیان پێ دراوە و موباحن، قەدەغەنەکراون، مەگەر بۆ کەسێك سنووری زانستەکە ببەزێنێت و، سەر لە زانستی تری خراپەوە دەربکات. چونکە زۆربەی ئەوەی کە بە فیعلی ئەو کارانە دەکەن، لێی دەرچوون و لە بیدعەوە ئاڵاون، کەواتە بۆیە پێویستە ئەوەی عەقیدەی لاوازە دەبێ بپارێزرێت لێی، ئەمەش لەبەر ئەصڵی عیلمەکە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە توشی بیدعە نەبێت، وەك چۆن منداڵێك لەسەر کە ناری ڕوبارێک دەپارێزرێت، لە ترسی ئەوەی نەوەکو بکەوێتە ناو ڕوبارەکەوە، یان تازە موسوڵمان بوویەك دەپارێزرێت لەوەی تێکەڵیی کافرەکان بکات، تا زیان لە عەقیدەکەی نەدەن، تەنانەت زانایەکیش کە عەقیدەکەیشی بەهێز بێت باشتر وایە بۆی کە تێکەڵییان نەکات.

**دووهەم:** ***لۆژیك و ژیر بێژی:***

ئەوەش باس و بابەتێکە لەسەر شێوەکانی هێنانەوەی بەڵگەو، مەرجەکانی و جۆری تاریف و پێناسەکان و مەرجەکانیان، کە هەردوکیان لە ناوەڕۆکی عیلمی کەلامدا جێگەیان دەبێتەوە.

**سێیەم:** ***ئیلاهییات:***

کە باس کردنە لە زاتی خوداو صیفەتەکانی(سبحانە و تعالی) ئەمەش پەیوەندارە بە زانستی کەلامەوە.

فەیلەسوفەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ و زانستێکی جیاواز باسیان نەکردوە، بەڵکو هەندێك مەزهەبی تریان پێوە لکاندوە، کە هەندێکیان کوفرەو

هەندێکیشیان بیدعەیە. وەك چۆن کەنار گرتنی موعتەزیلەکان بۆ خۆی زانستێکی سەربەخۆ نی‌یە، چونکە هەڵگرەکانی کۆمەڵێ لە زانا موتەکەللیمەکانن، ئەوانیش کە ئەهلی باس و تێرامانن، کەچەندین مەزهەبی پوچەڵیان لێ جیابۆتەوە. فەلسەفەیش هەربەو شێوەیە.

## چوارەم: *طەبیعیەکان(سروشتیەکان):*

هەندێک زاسنتی سروشتی هەیە هەر لە بنەماوە پێچەوانەی شەرع و دینی ڕاستەقیەنەیە، کەواتە ئەوانە بە جەهل ئەژمار دەکرێن، نەك بە زانست و بەشەکانی زانست، تا لەو ڕیزەدا جێگایان بکرێتەوە، وە هەندێکیشیان باسەکەیان چڕ کردۆتەوە لە سەر صیفەتی تەن و لاشەکان و تایبەت مەندییەکانیان، وە چۆنیەتی گۆڕان و هەڵگوڕان بەسەریاندا.

سەرنجدانی ئەمانیش بۆ لاشەی مرۆڤ، وەك توێژینەوەی پزیشکەکان وایە، ئەوەندە هەیە دکتۆر بە تایبەتی کە سەیری لاشەکەی دەکات، لە ڕوی نەخۆشی و تەندروستی‌یەوەیە، بەڵام سروشتیەکان سەیری تەواوی جەستەی مرۆڤ دەکەن لەڕوی گۆڕان و جوڵەکردنەوە، ئەوەندە هەیە سەیرکردنی پزیشکی بەکەڵك ترە، چونکە ئەو لاشەیە پێویستی پێ‌یەتی، بەڵام زانستەکانیان کە پەیوەندی بە بابەتە سروشتیەکانەوە هەیە پێویستیان پێ‌ی نییە.

دەرکەوت کە عیلمی کەلام بۆتە یەکێك لەو هونەرە زانستیانەی کە فێربوونی فەرزی کیفایەیە، تا ببێتە پاسەوانی دڵی نەخوێندەوارەکان، لەوەی توشی خەیاڵ و گومانی بیدعەچیەکان ببن، لەو کاتەوە کە بیدعە پەرەی سەندو زەق بووەتەوە، ئەم هەڵگوڕانەش ڕویداوە لەسەر پێویستی فێربوونی عیلمی کەلام، وەك چۆن لەم دواییەدا بۆ سەفەری حەج پێویست بوو کە پاسەوان و خاڵی ئێشکگرتن و حیراسەت دیاری بکرێت، بەهۆی پەیدا بوونی جەردەو ستەمی عەرەبەکان لە ڕێگەدا، خۆ ئەگەر عەرەبەکان وازیان لە دەستدرێژی

سەر کاروانە حاجیەکان بهێنایە، ئەو کاتە بەکرێ گرتنی پاسەوان، نەدەبوو بە یەکێك لە مەرجەکانی ڕێگەی حەج کردن.

هەروەها ئەگەر بیدعەکارانیش واز لە وڕاوە و گومانە پوچەڵەکانیان بهێنن، ئەوکاتە پێوست بە عیلمێکی تر نەدەبوو زیاد لەوەی کە لە چەرخی ئەصحابی کیرام دا پێوست بووە(خودایان لێ ڕازی بێ).

کەواتە زانای عیلمی کەلام لەڕوانگەی دینەوە با سنووری خۆی بزانێت ، شوێن و جێگای ئەو وەك ئەو پاسەوانە وایە کە لەڕێگەی حەج دا دانراوە، ئەگەر کارەکەی تەنهاو تەنها بۆ حەراسەت بێت، ئیتر ناوی لەڕیزی حاجیاندا دەسڕێتەوە، زانای ئەهلی کەلامیش: ئەگەر تەنها خۆی ساغ کردەوە بۆ دەردەشەو دەمەقاڵێ و بەرهەڵستی کردن و، هیچ کاتێکی خۆی نەدەدا بە گرتنەبەری ڕێگەی ئاخیرەت، وە خۆی خەریك نەدەکرد بە بایەخدان و چاکسازی لە دڵیدا، ئەوکاتە هەرگیز لە ڕیزی زانایانی دین ناژمێررێت، چونکە ئەو کاتە ئەم زانا (موتەکەللیمە) تەنها عەقیدەکەی ماوەتەوە، کە عەوامە ئاساییەکەش هاوبەشە لەگەڵیدا (ئیتر هیچ رۆڵیکی چاکسازی دینی بۆ خۆی و خەڵکی نەبینیوە) چونکە شارەزایی لە (عیلمی کەلامدا) بەشێکە لەو کردەوانەی پەیوەندییان بە ڕواڵەتی دڵ و زوبانەوە هەیە، تەنها ئەوەندە جیاوازیان لەگەڵ کەسێکی ئاسایی دا هەیە، کە ئەمانە توانای باس و دەردەشەو دەمەقاڵەو پاسەوانییان هەیەو ئەوان نییانە...

بەڵام زانستی(مَعرِفَةُ الله)، وە ناسینی صیفات و ئەفعالەکانی پەروەردگار، وە هەموو ئەو حاڵەتانەی هێمامان پێ کردن لە عیلمی موکاشەفەدا، هیچیان بە هۆی زانستی کەلامەوە دەست ناکەون، بەڵکو عیلمی کەلام خەریکە بڵێین دەبێتە کۆسپ و ڕێگر و پەردە لەو میانەدا، وە گەیشتن بە ڕیگای ئاخیرەتیش تەنها لە ڕیگـــەی هەوڵ و جیهـــاد و خۆ ماندوکردنەوەیە، کە خودای گـــەورە

کردویەتی بەسەرەتایەك بۆ ڕێنومایی ئادەمییەکان وەك فەرمویەتی:

﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾العنكبوت٦٩.

واتە: (ئەوانەی تێکۆشاون لەڕیگەی ئێمەو لە پێناوی ئێمەدا، ئەوا ئێمە ڕێنومای ڕێگەی خێریان دەکەین.)

ئەگەر ووتت:

بەڕاستی زانای(موتکەللیم)ت دابەزاندە ئەو ئاستەی کە تەنها بیرو باوەڕی عەوام دەپارێزێت لە گومان دروستکردنی بیدعەچی یەکان ، وەك چۆن پێناسەی پاسەوانە ئێشك گرەکانت بەوەکرد: کە تەنها پارێزەرێکن بۆ بەرگ و خۆراکی کاروانیەکانی ڕێگای حەج، لە دەستی تالانچێتی عەرەبەکان، وە ئاستی فەقیهەکانت دابەزاندە ئەوەی: کە تەنها پارێزەرێکی یاساکانن، کە بەهۆیانەوە دەستەڵاتداری وڵات دەست درێژی و دوژمنکاری هەندێک لەسەر هەندێك ئەرەوێنێتەوە، ئەمەش دوو پلەی تایبەتین کەتۆ داتبەزاندوون، ئەم دوو پلەیەش کە دابەزیون ڕو لە زانستی دین دەکەن، وەك پلەی زانستی ئاینت دابەزاندبێت ئاوایە، چونکە زانایانی ئوممەتی ئیسلام کە بەناوبانگن بە فەزڵ و گەورەیی، ئەوانە فوقەهاو مەوتەکەللیمەکانن(زانایانی عیلمی کەلام) ئەوانەش لە لای خودا لە هەموو کەس لە پێشترن، ئیتر چۆن پلەکانیان ئەوەندە نزم دەکرێتەوە بۆ ئەو ئاستە نزمەو، ئەم نزمییەش بخرێتە پاڵ زانستی ئاینەوە؟

لەوەڵامدا بزانە:

ئەگەر کەسێك حەق و ڕاستی بەهۆی پیاوەکانەوە ناسی، ئەوە تاماوە لە گێژاوی گومڕاییدا دەخولێتەوە، تۆ پێویستە لە سەرەتاوە حەق و ڕاستی بناسیت و بزانیت، لە پاشان ئەگەر سالیکی ڕێبازی ڕاستی بیت، ئەهلی حەققیش دەناسیت. وە ئەگەر قایل بویت بە تەقلیدو شوێن کەوتن و سەرنج دانی ئەو کەسانەی کە لەناو خەڵکدا ناوبانگی پلە بەرزیان بڵاوبۆتەوە، ئەوا

خۆت بێئاگا مەکە لە صەحابەو پلەو پایەی بەرزیان ، خۆ هەموو ئەو زانا و فوقەهاو زانایانی عیلمی کەلامەی کە باس لەبەرزی پلەو پایەیان دەکەیت(کە بۆچی نزم کراونەتەوە) هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کەس ناتوانێت بگاتە ئاستی بەرزی ئەوان، یان تۆزی ڕێگەیشیان بگرێتەوە، دەی خۆ پێشکەوتنی ئەوان بەهۆی عیلمی کەلام و فیقهەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی عیلمی ئاخیرەت و گرتنە بەری ڕیگا سەختەکەی بووە.

گەورەیی حەزرەتی ئەبوبەکر(بەسەر هەموو ئوممەتدا) بە زۆریی نوێژکردن و بەڕۆژوبونی زۆرەوە نەبووە، وەبەهۆی زۆری ڕیوایەتی فەرمودە و قسەو فتوایشەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی شتێکەوە بووە کە خراوەتە ناو دڵیەوە، وەك چۆن گەورەی ئادەمیزاد شایەتی بۆ داوە.(١)

کەواتە با سووربونت لەسەر ئەوەبێت کە بەدوای ئەو سیڕرەدا بگەڕێیت، ئەوەیە گەوهەری بەهادارو دوڕری شاراوە، واز لەوە بێنە کە زۆربەی خەڵکی یەك دەنگ بووبن لەسەر گەورەیی و مەزنی کەسێکی تایبەتی، لەبەر چەند خواست وهۆکارێکی ڕواڵەتی کە باسەکە درێژدەکاتەوە ئەگەر ڕونتری بکەینەوە.

---

(١) قال الحافظ العراقي: أخرجه الترمذي الحكيم في((نواد الأصول))(٣١) من قول أبي بكر بن عبدالله المزني: إحياء علوم الدين: طبقة دار الأرقم بيروت. تحقيق: د عبدالله الخالدي، وقال الزبيدي في شرح الأحياء: قلت و لفظ الحكيم: **ما فضل أبوبكر بكثرة الصلاة، ولا بكثرة صيام، ولكن بسرّ وقَر في صدره.** و بكر بن عبدالله المزني ثقة، سمع من ابن عباس و ابن عمر و عنه سليمان التميمي، و مبارك، و خلف،توفي سنة ١٨٠هـ و عزاه ابن القيم إلى أبي بكر بن عياش من قوله: ولفظه: **ما سبقكم أبو بكر بكثرة صوم و لا صلاة، و لكن بشئ وقر في قلبه.** قال: وهذا موضع المثل المشهور: **من لي بمثل سيرك المذلل تمشى رويدا و تجى بالأول** أورد ذلك في أفضلية العلم، **و الصدِّيقُ أفضلُ الأمة و معلوم أن فيهم من هو أكثر عملا و حجا و صوما و قراءة** . إتحاف(١٨٧/١)

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)ڕۆحی کێشرا، هەزاران صەحابەی لێ بەجێ ما(خودایان لێ ڕازی بێت) هەموو زانا بوون بەخودا، عالمی ڕەببانی بوون، پێغەمبەر(ﷺ) تاریفی زۆری دەکردن کەسێکیشیان تیدا نەبوو کە هونەری کەلام و زانستی زانایانی ئەو بوارە بزانێت، کەسێکیش لەوان خۆی نەخستە سەر کورسی فتوادانەوە لە بارەی عیلمی کەلامەوە مەگەر ئەو دە پانزە پیاوە نەبێت.[1]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ڕەزای خودایان لێ بێت) لەوانە بوو، ئەگەر بۆ فتوادان پرسیارێکی لێ بکرایە: ئەیفەرموو پێی: بڕۆ بۆ لای ئەو ئەمیرەی کاروباری خەڵکی گرتۆتە ئەستۆ، ئەم پرسیارەش بخەرە گەردنی ئەووەوە[2] هێما بەوەی کە فتوادان بۆ ڕوداوو ئەحکامەکان بەشێکن لە ئەحکامی دەستەڵات و ویلایەت.

کاتێك حەزرەتی عومەر وەفاتی کرد، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود فەرموی: ئەوا نۆ لەسەر دەی زانست مرد، وتیان پێی چۆن وا دەڵێیت، گەورەیانی ئەصحابیش هێشتا لەناوماندان؟! فەرمووی: مەبەستم زانستی فتواو ئەحکامەکان نی‌یە، بەڵکو مەبەستم عیلم بە خودایە (**العِلْمُ باللهِ سُبْحانَه**)[3] ئایا وا دەبینیت کە مەبەستی هونەری قسەکردن و دەمەقاڵێ و دەردەشە کردن

---

(١) ئەوانەی فتوایان دەدا لە صەحابەکان: چوار خولەفای ئیسلام و معاذی کوڕی جەبەل و عەبدوڵلای کوڕی مەسعو د،عەممار و عەبدوڵلای کوڕی عەباس و زەیدی کوڕی ثابت و ئەنەسی کوڕی کەعب و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و حوزەیفە و أبو موسای ئەشعەری و سلمان ی فارسی و حەزرەتی عائیشە خوایان لێ ڕازی بێت. إتحاف(١٨٨/١)

(٢) قوت القلوب (١٣١/١).

(٣) قوت القلوب (١٣٩/١). و بنحوه رواه الطبراني في (المعجم الكبير)(١٦٣/٩)

بووه؟ کەواتە بۆچی ئێستاش سورنابیت لەسەر دەسخستنی ئەو عیلمەی کە بە مردنی حەزرەتی عومەر نۆ بەشی بفەوتێت، (کە عیلمی لەدوننیيە) هەر ئەو بوو کە دەرگای قسەو گومان دروست کردن و جەدەلی داخست و بە دارەکەی (دوڕرەکەی) لە (صەبیغی) دا کاتێك پرسیاری ئایەتێکی کرد، کە بەڕواڵەت یەکیان نەدەگرتەوە لەگەڵ ئایەت و فەرمودەیەکی تری خودای (عزَّ وَجَل)دا، لە پاشان دوری خستەوە و فرمانیشی دا خەڵکی لێی دوربکەونەوە.[1]

وەڵامی ئەو قسەیشت کە دەڵێیت:

فەقیهو زانایانی عیلمی کەلام لە هەموو کەس بەناوبانگ ترن لە عیلمی زانست دا، بزانە ئەو فەزڵەی لە لای خوداوە دەستیان دەکەوێت شتێکەو، ئەوەش کە لەناو خەڵکدا شۆرەت پەیدا دەکەن شتێکی ترە.

ناوبانگی ئەبوبەکری صددیق بەهۆی خەلافەتەوە بوو، بەڵام فەزڵ و پلەبەرزی لای خودا بەهۆی ئەو سیڕرو نهێنیيەوە بوو کە خرایە ناو سینەیەوە. ناوبانگی حەزرەتی عومەر(خودای لێ ڕازی بێ) بەسیاسەتەوە بوو، بەڵام فەزڵ و مەزنی ئەو زاتە بەوەبوو کە عیلمی خودایی هەبوو(عالِمٌ بِالله) بوو، کە بەوەفات کردنی نۆ لەسەر دەی زانست لە دەست چوو، هەروەها گەورەییەکەی بەو نیيەتە پاکەیەوە بوو، کە مەبەستی نزیك بوونەوە بوو لە خودا، بەهۆی خەلافەت و دادوەری و سۆزو میهرەبانیەکانی بۆ ژێر دەستەکەی، کە ئەمەش فرمانێکی شاراوەیە و پەیوەندی بە سیڕری ئیمانەوە هەیە.

بەڵام پاشماوەی کردەوە ئاشکراکانی وا گومان دەکرێت کە لە کەسێکی دونیاویستەوە دەرچووبێت، کە بەدوای جاه و ناوو شۆرەتدا بگەڕێت و حەز لە

---

(١) (صبیغ)عادەتی وابوو پرسیاری لەو بابەتانە دەکرد کە چەند واتاو مانایەکیان هەڵدەگرت واتە(موتەشابیهاتی قورئان) بنوارە: (الدارمي في (سُننه)(١٤٦))

ناوبانگ بکات، کەواتە ئەوەی کە بەرەو تیاچونی دەبات شۆرەت و ناوبانگە کەیە، فەزڵەکەشی لەوەدایە کە خاوەنی ئەو(سیرڕە)یە کـە جگـە لـە خودا کەس بە حاڵی نازانێت.

کەواتە فوقەهاو زانایانی عیلمی کەلام، وەك خولەفا و قازیەکان و زاناکان وان، ئەمانیش چەند بەشێکن: هەیانە لە فتواو فێربون و فێرکردنی زانستدا، تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خوداو بەرگری کردن بووە لە ڕێگای خوداناسی، بەبێ مەبەستی خۆ دەرخستن و ڕیاکاری.

ئەوانە شایستەن لە ژێر سایەی رەزامەندی خودادا بن، فەزڵیشیان لای خودایە، چونکە کار بەزانستەکانیان دەکەن، وە مەبەستیشیان لە فتواو سەرنجەکانیان تەنها ڕەزامەندی خودا بووە.

بەڕاستی هەموو زانستێک بەکارو کردار دەژمێررێت، چونکە کارێکە بەهۆی هەوڵ و فێربونەوە کەسب کراوە، بەڵام هەموو کردارێك بە عیلم و زانست نەناسراوە[1]

دکتۆریش بەزانینەکەی دەتوانێت لە خوداوە خۆی نزیك بکاتەوە، لەو لایەوە کە لەبەر خودا زانستەکەی وەگەڕخستووەو لە لایەنی خودایشەوە پاداشت وەردەگرێت، سوڵطانیش کاتێک لە بەر خودا میانگیری خەڵك دەکات ئەوە ڕەزامەندی خودا دەپچرێت بۆ خۆی و پاداشتیش وەردەگریت، نەك لەو لایەنەوە کە زانستی ئاینی گرتۆتە ئەستۆ، کە بڵاوی بکاتەوەو پێ‌ی هەستاوە، بەڵکو لەو ڕووە وە کە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکەکەی لە ئەستۆ گرتووە و مەبەستیشی ڕەزامەندی پەروردگاربووە.

---

(١) چونکە هەندێ کردەوە نییەتی باش و ئیخلاصی تیا نییە، کەواتە ناو نابرێت بە عیلم: (إتحاف)(١/١٩٠)

## ڕونكردنەوەی ئەو بەشانەی كە خاوەنەكەی پێ نزیك دەبێتەوە لە خوداوە (عزَّ و جَل) كە سێ بەشن:

**١- زانستی ڕووت**

(واتە: عەمەلی لەگەڵدا نەبێت) ئەوە: عیلمی موكاشەفەیە.

**٢- كردەوەی ڕووت**(واتە: زانستی لەگەڵدا نەبێت) وەك دادپەروەری سولطان و ڕێكخستنی كاروباری خەڵكی بەباشی.

**٣- ئەوەی كە پێك دێت لە عیلم و عەمەل.**

ئەوەش زانستی دابین كردنی ڕێگای دوارۆژە، خاوەنی ئەم زانستی‌یە ، لەو زانایانە ئەژمێررێن كە كار بە عیلمەكەشیان دەكەن.

كەواتە سەیری خۆت بكە: ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێزِ و تاقمی ئەوانەی كە كاریان بۆ خودا كردووە، یان ئەوانەی كە زانستەكەیان بۆ خودا بووەو بەخودا بووە،(ﷻ)، یان لە هەردوو پێڕەكەدا دەبیت، بەشی خۆت لە هەردوو پێڕەكە دەبەیت؟ ئەمە زۆر بایەخدارترە بۆ تۆ، لەوەی كە شوێن یەكێ بكەویت تەنها لەبەر ئەوەی كە ناوبانگی دەركردووە.

**خُذ ما تَراهُ ودَع شَيئاً سَمِعْتَ بِهِ فِي طَلعَةِ الشَّمسِ ماَ يُغنيكَ عَنْ زُحَلِ**[١]

واتە:

**واز بێنێ لەوەی بیستوبە ناوی بگرێ بە دەستی، بینی بەچاوی**
**گەر هەتاو هەڵبێ، زوحەل بێ چارە تیشكی نامێنێ،لە تاوی تاوی**[٢]

لەسەرو ئەمانەیشەوە لە ژیاننامەی ڕێبازی فوقەهای سەلەفی(صاڵیحین)

---

(١) دیوان المتنبي بشرح العسكری(٨١/٣)

(٢) وەرگێڕراوی بەندە (ئەحسەن)موفتی.

هەندێکیان باس دەکەین، ئەوەندە کە پێی دڵنیا ببین ئەوانەی نیسبەتی خۆیان دابێت لە مەزهەبەکانی ئەوان، زوڵمیان لێ کردوون و قەدریان کەم کردونەتەوە، بەڕاستی پێشەواکان لە هەموو کەس توند تر دەبنە خەصمیان و لە قیامەتدا ڕوبەڕویان دەبنەوە، چونکە ئەو پێشەوایانە مەبەستیان لە عیلمەکەیان تەنها ڕەزامەندی خودا بووە، ئەوەی لێیان بینراوە لە ئەحواڵ و کردەوەکانیان، بەڵگەیە بۆیان کە ئەمانە زانای عیلمی ئاخیرەتن، وەك لە مەودوا لە نیشانەکانی زانایانی دوارۆژدا باسیان دەکەین، وە بەڕاستی ئەو پێشەوایانە خۆیان یەکلا نەکردبویەوە تەنها بۆ خزمەتی فیقهی(ئیسلامی)، بەڵکو ئەوانە زۆر بە گەرمی خەریکی پەیداکردنی زانستی بوون لەسەر دڵ(**عِلمُ القُلوبْ**)، وە هەمیشە چاودێر بوون بەسەر دڵەکانیانەوە، بەڵام ئەوەی کە صەحابەکانی لادا، کە نەتوانن نوسراوو دانراویان هەبێت و دەرس بڵێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شارەزا و شەرع زان و زانستی سەربەخۆیان هەبووە لە فتوادا، ئەوەی(ئەمانیشی لادا)و ئەوەی هەمووانی لاداوە، هۆکارەکان زانراون و پێویست ناکات بچینە ناویانەوە.[1] بۆیە ئێمەش لێرەدا باسی ژیاننامەو ئەحواڵی فوقەهای ئیسلام دەکەین، کە بزانیت ئەوەی لەبارەیانەوە ووتومانە، مەبەستمان ڕەخنەو پلارگرتن نی‌یە لێیان، بەڵکو تانەدانە لەوانەی وای دەگەیێنن کە شوێن کەوتووی ئەو پێشەوایانەن، نیسبەتی خۆیان داوە لە مەزهەبەکەیان، کەچی پێچەوانەی زانست و ژیان و ئەحواڵی ئەوان دەجوڵێنەوە، ئەو فوقەها بەرزانەی کە سەرکردەی بێ وێنەو پێشەوای فیقهی ئیسلامین، مەبەستمان ئەوانەیە کە شوێن کەوتوانیان لە هەموو لایەکەوە

---

(١) ئەصحابی کیرام ئەوەندەیان گرنگی بە قورئان ئەدا، نەوەك بفەوتێت، یان تێکەڵ ببێت تەنانەت پێیان باش نەبوو فەرمودەی پێغەمبەریش بنوسرێتەوە.

زۆرن ئەو پێنج کەسەن: شافیعی، مالیك ، ئەبو حەنیفە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، سوفیانی سەوری[1](ڕەحمەتی خودایان لێ بێت بەگشتی) هەریەکەیان سەیر بکەیت خوداناس و دونیا نەویست و زانا بە علومی ئاخیرەت و فەقیهو شارەزا بوون بە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی بوون لە دونیاداو، نییەت پاکیشیان کە تەنها لەبەر ڕەزای خودا کاری فیقهیان ئەنجام داوە.

ئەوە پێنج خەصڵەتە، بەڵام فوقەهاکانی ئەم سەردەمە لەو کۆمەڵە خەصڵەتە تەنها لە یەکێکیاندا شوێنیان کەوتوون، کە هەوڵ و کۆششیان ڕوی لە وردەکاری و لق و پۆی بابەتە فیقهیەکانە، چونکە چوار خەصڵەتەکەی تر تەنها بۆ دوارۆژ بەکاردێت،

بەڵام ئەم خەصڵەتی پێنجەمە( کەشارەزایی و وردەکارییە لە فیقهدا بۆ دونیا و دوارۆژیش دەشێت، بەمەرجێك لە پێناوی خزمەتی ئاخیرەتدا بێت.

بۆیە تەنها بۆ ئەم بەشەیان چاکیان لێ کرد بەلاداو هەوڵیان بۆ داوە تالێی شارەزا بن، تەنها بۆ کار بەڕێخستنی دونیاش بەکاریان هێناوە، لەولایشەوە وا دەگەیێنن کە چاو لە کارو کردارەکانی ئەو پێشەوا بەرزانە دەکەن، بەڵام تەشبیهو لێکچواندنی بەم شێوەیە زۆر دورە لە ڕاستیەوە، چۆن دەبێ فریشتەکان و ئاسنگەران لەگەڵ یەکدا بەیەك شێوە بپێورێن. کەواتە با ئێستا بەیانی ئەحواڵیان بکەین، وە لەبارەی ئەو چوار خەصڵەتەوە زیاتر لەسەریان بدوێین ، چونکە زانیاری بەرچاو هەیە لە ڕوی شارەزاییان لە فیقە دا.

---

(١) ئەو مەزهەبە بڵاوە باوەڕپێکراوەنەی کە ئێستا ماونەتەوە، تەنها چوار مەزهەبەکەیە، مەزهەبی حەزرەتی سوفیان ئەو کاتەش کە ئیمامی غەزالی ئەم کیتابەی داناوە شوێن کەوتووی خۆی هەبووە. بەڵام دواتر نەماوە، واتا: تا سەدەی پێنجەمیش ئەو مەزهەبە مابوو... (١٩١/١)إتحاف السادة المتقين.

## باسی ئیمامی شافیعی(خودای لێ ڕازی بێت)

بەڵگە لەسەر ئەوەی بەڕاستی عیبادەتی زۆری کردووە:

ئەگێڕنەوە کە شەوی دەکرد بە سێ بەشەوە، سێ یەکی بۆ زانست، سێ یەکیش بۆ نوێژ، سێیەکیشی بۆ نوستن.[١]

ڕەبیع فەرموویەتی: شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە ڕەمەزاندا شەصت خەتمەی قورئانی دەکرد، هەمویشی لە ناو نوێژدا.[٢]

بووەیطی یەکێ بوو لە هاوڕێکانی دەڵێت، شافیعی هەموو ڕۆژێك خەتمێکی قورئانی دەکرد.[٣]

هەروەها حسینی کەرابیسی دەڵێت: چەندین شەو لەگەڵ شافیعی دا دەمامەوە تابەیانی(ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) نزیکەی تا سێ یەکی شەو نوێژی دەکرد، نەمدەبینی لە پەنجا ئایەت زیاتر بخوێنێت، ئەگەر زیادی بکردایە صەد ئایەتی دەخوێند، ئەگەر ئایەتێکی ڕەحمەتی بخوێندایە، داوای لە خودا دەکرد کە ڕەحمەت بڕێژێت بەسەر خۆی و هەموو بڕواداراندا، و بیدایە بەلای هەر ئایەتێکی عەزابدا یەکسەر پەنای دەگرت بە خودا لە سزای ئاگرو، داوای ڕزگاربونی دەکرد بۆ خۆی و ئیمانداران، وەك ئەوە وابوو کە هەمیشە لە میانی خەوف و ڕەجادابێت و، هەردووکیانی بۆ کۆبوبێتەوە.[٤]

بنواڕە چۆن لە سەر پەنجا ئایەت ڕادەوەستێت و هەر ئەوەندە دەخوێنێتەوە کەنیشانەیە لەسەر قووڵی بیر و تێڕامان و گەڕان، وەك مەلەوان

---

(١) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي)) (٢/١٥٧).

(٢) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي)) (٢/١٥٨).

(٣) رواه ابن عساكر في ((تأريخ دمشق))(٥٥/٣٩٣)

(٤) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي)) (٢/١٥٨).

به دوای نهێنیه کانی قورئاندا دەگەڕێت لەو دەریا پان و بەرینەدا.

شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی:

ماوەی شازدە ساڵ دەبێت تێرم بەسکی خۆم نەخواردووە، چونکە تێربوون لاشە قورس دەکات، دڵ ڕەق دەکات، زیرەکی لا دەبات، خەو ڕادەکێشێت، توانای خاوەنەکەیشی لە عیبادەت لاواز دەکات.[1]

بنواڕە چەند داناو پەندیارە لەوەی هەموو ئافەتە کوشندەکانی تێربوونی باس کردووە، وە خۆیی چالاك و یەکلا کردۆتەوە بۆ بەندایەتی، بۆیە خۆی تێر ناکات تا بتوانێت باشتر بەندایەتی بکات، وە ترۆپکی بەندایەتیش کەمکردنەوەی خۆراکە.

شافیعی رەحمەتی خودای لێ بێت فەرموویەتی:

هەرگیز نە بەڕاست و نەبەدرۆ سوێندم نەخواردووە.[2]

بنواڕە چەند خودای گەورەی لەلا پیرۆز و قەدرگرانە، کە ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە شافیعی زانایە بە بەرزی و شکۆمەندی پەروەردگار(ﷻ)...

پرسیاریان لە بارەی پرسێکی شەرعیەوە لە شافیعی کرد(رەحمەتی خودای لێ بێت) بێ دەنگ بوو، ووتیان پێی(رەحمەتی خودات لێ بێ)وەڵام نادەیتەوە؟!

فەرمووی: با جارێك بزانم خێرم لەوەدایە بێدەنگ بم یان وەڵام بدەمەوە.[3]

بنواڕە چۆن چاودێری زوبانی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا زوبان لەهەموو ئەندامەکانی تر زاڵ و دەستەڵاتدارترە بەسەر فوقەهاکانەوە، وە لەهەموویان یاخی و سەخت ترە، بۆ ئەوەی بچێتە ژێر باری ڕێکخستن و فەرمانبەرداریدا،

---

(١) رواه إبن أبی حاكم في((آداب الشافعي و مناقبه))(١٠٥)

(٢) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي)) (٢/١٦٤).

(٣) ذكره إبن الصلاح في ((مناقب الشافعي))(٢,١٦٤)

هەر بەو هۆیەشەوە دەردەکەوێت کە قسەکردن و بێ دەنگ بوونی، تەنها بۆ ئەوەبووە کە چی خێری زیاترەو پاداشتی تێدایە ئەوە بکات.

ئەحمەدی کوڕی یەحیای کوڕی وەزیر دەڵێت:

ڕۆژێك شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە بازاڕی چرافرۆشەکان دەرچووە دەرەوە، ئێمەش شوێنی کەوتین، بینیمان پیاوێك دابەزیوەتە سەر یەکێکی ئەهلی عیلم و جنێوی پێ دەدات، شافیعی لای کردەوە بەلاماندا و فەرمووی:

گوێتان بپارێزن لەوەی کە جنێوو قسەی ناشرین ببیستێت، وەك چۆن زوبانتان دەپارێزن لەوەی قسەی ناشرین بکات، چونکە گوێگر هاوبەشی گوناهی جنێوفرۆشەکەیە، کابرای نەفامیش سەیری پیسی ناو دڵی دەکات دەیەوێت کامەیان پیسترە خاڵی کاتەوە لەناو دڵتاندا، ئەگەر وەك خۆی بەرپەرچی نەفام بدرێتەوە، دڵی ئەوی پێ خۆش دەبێت و ئەوەش کە وتویەتی پێی بەدبەخت دەبێت[1]

هەروەها شافیعی فەرمویەتی: داناو پەندیارێک نوسراوێکی بۆ لای حەکیمێکی تر نوسی: ئایا زانستیت هەیە؟

زانینەکەت پیس و چەپەڵ مەکە بە تاریکی گوناە، کە لەو ڕۆژەی ئەهلی زانست بە هۆی نووری عیلمەکەیانەوە ڕێگای پێ دەردەکەن، تۆش لەنێو تاریکیدا دەمێنیتەوە.[2]

---

(١) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (١٢٣/٩).

(٢) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (١٤٦/٩).

## زوهدی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێ)

حەزرەتی شافیعی(خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

ئەوەی وا دەربخات کە توانیویەتی خۆشەویستی دونیا و خۆشەویستی خالیقەکەی لە دڵی خۆیــدا کـۆ کردۆتەوە .. ئەوە درۆ دەکات.[1]

حەمیدی دەڵێت: شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لەگەڵ هەندێك لە والیەکاندا ڕۆیشت بۆ یەمەن، لە پاشان گەڕایەوە بۆ مەککەو دەهەزار دیرهەمی پێ بوو، لەدەرەوەی مەککە خێمەکەی هەڵداو خەڵکەکە دەهاتن بۆ لای، لە شوێنی خۆی هەڵنەستا تا هەموی بەخشیەوە[2]

کەڕەتێکیش لە گەرماو هاتە دەرەوە، ماڵێکی زۆری بەخشی بە حەمام چی‌یەکە. وە جارێک دارەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە، یەکێ بۆی بەرزکردەوە، لە پاداشتی ئەوەدا پەنجا دیناری پێدا

## سەخاوەتی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)

زۆر لەوە دیارترە کە بگێڕڕێتەوە، چڵە پۆپەی دونیا نەویستیش سەخاوەتە،چونکە کەسێك شتێکی خۆش بوێت لای خۆی گلی دەداتەوە و لێی جودا نابێتەوە، کەواتە کەسێك ماڵی لەدەست دەبێتەوە کە دونیای لە بەرچاودا بچوك بوبێتەوە ، ئەمەش واتای زوهدە، بەڵگەش لەسەر بەهێزی گیانی دونیا نەویستی و، زۆریی خۆف و ترس لە خودای(عزوجل) کە هەمیشە دڵ و خەفەتی لای دواڕۆژ بوو ئەوەیە:

---

(١) أنظر: الأنتقاء في فضائل الثلاثة الأئمة الفقهاء(١٦٠) چونکە دوو شت دژ بەیەك لە یەك شوێندا کۆنابێتەوە.

(٢) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (١٣٠/٩). و البيهقي في مناقب الشافعي(٢٢٠/٢) و فيهما (خارجا من مكة)

که سوفیانی کوڕی عویەینە لەبەشی دڵ ناسککەرەوەکاندا (الرَّقائق) فەرموودەیەك ریوایەت دەکات: شافیعی بێ هۆشیەك هات بەسەریدا.

وتیان پێی:

بەڕاستی ئەوە مردا ئەویش فەرمووی:

ئەگەر مرد... ئەوا گەورەترینی ئەهلی زەمانی خۆی وەفاتی کردووە.[1]

عەبدوڵلای کوڕی موحەمەدی بەلەوی ئەیگێڕێتەوە و دەڵێت:

من و عومەری کوڕی نەباتە دەنیشتبوین، یاد و باسی بەندایەتی عابیدو زاهیدەکانمان دەکرد، عومەر فەرموی:

کەسم نەدیوە واریع و خۆپارێزتر و زوبان پاراوتر لە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت).

من و ئەوو حاریثی کوڕی لوبەید دەرچوین بەرەو (صەفا) حاریث قوتابی صالح ی (مەری) بوو، دەنگی خۆش بوو، بە قورئان دەستی پێ کرد تا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿هَذَا يَوْمُ لَا يَنْطِقُونَ، وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾[2]

واتە:

( ئەمە ڕۆژێکە ناتوانن قسە بکەن و، ڕیگەشیان پێ نادرێت پۆزش بهێننەوە و خۆیان دەربازبکەن.)

بینیم شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ڕەنگ و ڕوخساری گۆڕا، پێستی گرژبوو، ئاڵۆزیەکی زۆر ڕوی تێ کرد، کەوت بەڕوداو بێ هۆش کەوت، کاتێك بە ئاگا هاتەوە ئەم نزایەی دەوتەوە:

---

(١) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (٩٥/٩). و البيهقي في مناقب الشافعي(١٧٥/٢)

(٢) المرسلات(٣٥-٣٦)

**(أعُوذُ بِكَ مِنْ مَقامِ الكاذِبين، وَإعْراضِ الغافِلِين اللّٰهُمَ لَكَ خَضَعتْ قُلوبُ العارفين، وذلَّت لَكَ رِقابُ المُشتاقين، إلهي هَبْ لِي جُودكَ وجَلِّلني بِسَترِكَ واعْفُ عَن تَقصيرِي بكَرمِ وَجهِكَ )**

واته: (پەنا ئەگرم بە تۆ خودا لە مەقامی درۆزنان لە بەردەمتا، وە پشت هەڵکردنی ئەوانەی بێ ئاگان لەتۆ، خودایە دڵی عاریفەکان بۆ تۆ ملکەچ بووە، سام و هەیبەتی موشتاقەکان بەتۆ زەلیل بووە، ئەی خودایە: کەواتە لە جودو سەخاوەتی خۆتم پێ ببەخشە، بە پەردەی ڕەحمەتی خۆت دام بپۆشە، کەم و کووڕیەکانم ببەخشە ،لە بەر خاتری ڕێز و کەرەمی خۆت لێم ببورە).

ئەڵێت:

لە پاشان لەو جێگە هەڵساین گەڕاینەوە بۆ مەککە، کاتێك کە من هاتمەوە ناو بەغداو ئەویش لە عێراق بوو، لە کەناری ڕوباری دیجلە دانیشتم دەست نوێژم دەگرت بۆ نوێژی نیوەڕۆ، پیاوێ لەپڕ دای بە لامداو ووتی:

ئەی غوڵام: جوان دەستنوێژەکەت بگرە(خودا باشت بۆ بکات لە دونیا و دوارۆژدا) لام کردەوە، پیاوێکم بینی کۆمەڵی شوێنی کەوتبوون، منیش بە خێرایی دەست نوێژەکەم تەواوکرد، شوێن پێیم هەڵگرت، لای کردەوە بەلامدا و فەرموی: ئایا پێویستیەکت هەیە؟ ووتم بەڵێ:

لەوەی خودا فێری کردویت فێری منیشی بکە، فەرموی:

بزانە ئەوەی لەگەڵ خودادا ڕاست بکات ڕزگاری دەبێت، هەرکەس لە دینەکەی بترسێت ، خودا لە تیاچون دەیپارێزێت، ئەوەی لە دونیادا لەسەر زوهدو دونیانەویستی خۆی ڕابهێنێت، سبەینێ چاوی گەش دەبێتەوە بەو هەموو پاداشتی خوداییەی بۆی دانراوە، ئایا زیاترت بۆ بڵێم؟

وتم: بەڵێ، فەرمووی:

هەرکەسێك سێ خەصڵەتی تیا هەبوو مەرجی بڕوا و ئیمانی تەواو کردووە:

یەکێك فرمان بە چاکە بکات خۆیشی فەرمانبەردار بێت، بەرگری لە خراپە بکات و خۆیشی وازی لێ بهێنێت، پارێزگاری لە سنوورەکانی خودا بکات و نەیانبەزێنێت..

لە پاشان فەرموی:

زیاترت پێ بڵێم؟

ووتم: بەڵێ، فەرموی: لە دونیادا زاهیدو دونیا نەویست بە، حەزو ئارەزوت بۆ دوارۆژ بێت، لە هەموو فەرمانەکانتدا ڕاست بکە لە حزوری خودای خۆتدا، لەگەڵ رزگاربووندا تۆیش ڕزگارت دەبێت، لە پاشان ڕۆیشت.

پرسیارم کرد ئەمە کێ بوو؟ وتیان شافیعی[1].

بنوارە چۆن بێ هۆش کەوت و کەوتبەڕودا، لە پاشان سەرنج لە ئامۆژگاریەکانی بدە کە بەڵگەیە لەسەر زوهدو ترس و خۆفی لە پەروەردگاری، ئەم ترس و دونیا نەویستییەش تەنها بە ناسینی خودای گەورە (مَعرِفَةُ الله) پەیدا دەبێت، چونکە تەنها زاناکانن کە دەتوانن بە چاکی لە خودا بترسن و (خَشْيَةُ الله) لە دڵیاندا جێگیر ببێت.

دیارە شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەم ترسان لە خوداو زوهدەی لە زانینی کتێبەکانی:

(سەلەم و بەکرێ) دان و باقی کتێبە فیقهیەکانی ترەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو بەهۆی زانستی ئاخیرەتەوە کە لە قورئان و فەرمووەکان دەری هێناوەو پابەندی لێکردووە، چونکە هەرچی پەندیاری و حیکمەتە سەرەتایەکانی ژیان و دواییەکان هەیە هەمووی تیایاندا دانراوە و هەڵگیراوە.

---

(١) مناقب الشافعي (٢/١٧٦- ١٧٧) و انظر ما قاله الزبيدي في الأتحاف(١/١٩٧).

# زانایی و شارەزایی شافیعی
# لە ئەسراری قەلب و زانستیە دوارۆژیەکان

ئەمەش بەهۆی ئەو ووتە پڕ لە حیکمەتانەی دەزانین کە لەوەوە وەرگیراوە و بۆمان ماونەتەوە:- دەگێڕنەوە: پرسیاریان لێ کرد دەربارەی حەقیقەتی ڕیا بازی:

یەکسەر بەخێرای وەڵامی دایەوەو فەرمووی:

ڕیاکاری فیتنەیەکە ئارەزوات دایمەزراندووە، لە ڕوانگەی چاوی دڵی زاناکانی(ئەهلی بەصیرەتەوە) سەرنجیان لەو فیتنەداوە، کە خراپی هەڵبژاردنی نەفس و هەناسەکانە، کە خێری کردەوە چاکەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە.[1]

شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی:

ئەگەر ترسایت بەهۆی کردەوەکانتەوە توشی عوجب و لە خۆبای بوون ببیت، بنوارە مەبەستت ڕەزامەندی کێیە، داوای چ نیعمەتێک دەکەیت، ترست لە چ تۆڵەو سزایەك هەیە، سوپاسی چ عافیەت و لەش ساغیەك دەکەیت، چ جۆرە بەلایەك وەبیر خۆت دەهێنیتەوە، تۆ ئەگەر بیر لە یەکێ لەم خەصڵەتانە بکەیتەوە، بەراستی کردارەکانی خۆتت لە بەرچاودا زۆر بچوك و بێ بەها دەمێنێتەوە.[2]بنوارە چۆن باسی حەقیقەتی ڕیاو چارەسەری عوجب و بەخۆدا نازینت بۆ دەکات، کە لە ئافەتە گەورەوگرانەکانی دڵە.

شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت)فەرمویەتی:

**(مَنْ لَم يَصُنْ نَفسَهُ لَمْ يَنفَعْهُ عِلمُه)**[3]واتە: هەر کەسێك نەفسی خۆی نە پارێزێت ، زانستەکەی فریای ناکەوێت و سوودی پێ ناگەیەنێت).

---

(١) رواه ابن عساكر في ((تأريخ دمشق))(٥١/٣٣٤).

(٢) رواه ابن عساكر في ((تأريخ دمشق))(٥١/ ٤١٣).

(٣) رواه الخطيب في ((تأريخ بغداد)) (٧/٢٨٦).

هەروەها (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویە تی:

(مَنْ أطاعَ اللهَ تَعالَى بالعِلمِ نَفَعَهُ سِرُّه)[1]واتە: (ئەوەی بە عیلم و شارەزایی گوێڕایەڵی خودا بكات، سیرو نهێنیەكانی دڵی سوودی پێ دەگەیێنن).

وەفەرموویەتی: هیچ كەسێک نییە كە تاقمێ نەبێت خۆشیان بوێت و كەسانێكیش نەبێت ڕقیان لێی بێت، مادام ئەمە كارێكی سەلماوە، تۆیش لەگەڵ ئەوانەدابە كە ئەهلی گوێڕایەڵی و عیبادەتن.[2]

ئەگێڕنەوە عەبدولقادری كوڕی عەبدولعەزیز پیاوێكی صاڵحی خۆپارێز بوو لە پرس و بابەتی وەرع و خۆپارێزی پرسیاری لە ئیمامی شافیعی دەكرد و ئەویش(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لەبەر خۆپارێزییەكەی ڕوی تێ دەكرد و دەچوو بەدەمییەوە، ڕۆژێكیان ووتی بەشافیعی: كامیان گەورەترە خۆڕاگری و ئارامی، یان تاقیكردنەوەی تاڵ و بەرگەگرتنی كاری نارەحەتی، یان تەمكین واتە: (سەنگینی و شكۆداری)؟ شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموی:

تەمكین پلەی پێغەمبەرانە، لە دوای كەوتنە ناو تاقی كردنەوەو نارەحەتیەوە حاڵەتی تەمكین پەیدا دەبێت، ئەگەر تاقی كرایەوە خۆڕاگردەبێت، كە صەبری گرت هێزو شكۆی پێ دەدرێت، نابینی خودا(ﷻ) حەزرەتی ئیبراهیمی تاقی كردەوە، لە پاشان دەستەڵات و سەنگینی پێدرا، حەزرەتی موسای تاقی كردەوە، لە پاشان هێزو ووزەی پێ بەخشیەوە و دەستەڵاتی بۆ گەڕاندەوە، حەزرەتی سولەیمانی تاقی كردەوە، لە پاشان شكۆداری كردو كردی بە مەلیك و موڵكی تایبەتیشی پێ بەخشی. كەواتە تەمكین بەرزترین پلەكانە.

خودای بەدەستەڵات فەرمویەتی:﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾يوسف(٥٦).

---

(١) رواه الخطيب في ((تأريخ بغداد)) (٢٨٦/٧).

(٢) رواه أبو نعيم: في((الحلية الأولياء))(١١٧/٩).

واتە: (شوێنمان بۆ یوسف خۆش کردو دەستەڵاتمان دا پێی، لە هەموو زەویدا شکۆمەندو خاوەن بڕیاربێت).

وە حەزرەتی ئەییوبیش دوای ئەو ناڕەحەتی و تاقیکردنەوە سەختە، هێزو تواناو تەمکینی پێ درایەوە ﴿وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ﴾الأنبياء(٨٤)

واتە: (خێزانەکەیمان دایەوە و هێندەی تریش وێڕای ئەوان).[١]

ئەم فەرموودەی ئیمامی شافیعی یە نیشانەیە لەسەر ڕۆچونی ئەو بە قوڵی لە نێو دەریای نهێنیەکانی قورئانداو ، شارەزایی شافیعی لەسەر مەقامەکانی ڕێبواران و سالیکانی ڕێگای بەرە و لای خودا(ﷻ)، لە پێغەمبەران و ئەولیا و دۆستانی خودا، ئەمانەش هەموویان لەبەشەکانی زانستی دوارۆژن.

وتیان بە شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت): کەی پیاو دەبێتە زانا؟

فەرموی: ئەگەر لەو زانستەدا کە فێری دەبێت لێکۆڵینەوەی تەواوی لەسەر بکات، وە زانستیەکانی تریش بەسەر بکاتەوە، ئەو کاتە دەبێتە زانا.

ووتیان بە گالینۆس: تۆ بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشیەك چەندین دەرمانێکی بۆ دەنوێنێت کە سروشتەکانیشیان جیاوازن، ووتی:

مەبەستی سەرەکی یەکێکە لەدەرمانەکان، بۆیە ئەو تێکەڵە دەرمانەی لەگەڵدا دەنوێنم بۆ ئەوەی تیژی و هێزەکەی کەم بکاتەوە، بەڕاستی نواندنی تاکە دەرمانێک کوشندەیە.[٢]

---

(١) قورئانی پیرۆز مامۆستا هەژار(٣٢٧).

(٢) چونکەبەهێزە،ئەگەر دەرمانی تریشی لەگەڵدا بێت ئەو تیژییەی کەم دەبێتەوە نەخۆشەکەش بەرگەی دەگرێت... هەروەهاش یەك جۆر زانستی مێشکی فێرخواز ماندودەکات، بەڵام چەند عیلمێکی تریش لەپاڵدا بێت ئەو کارىگەری و تیژییەی ناهێڵێت و زیاتر پێی ئاشنا دەبێت.

ئەم نمونانە و هاو وێنەکانیان کە ئەوەندە زۆرن ناژمێرڕێن، بەڵگەن لەسەر پلە بەرزی و بوونی(مَعرِفَةُالله) و، شارەزابوونی شافیعی لە زانستەکانی دوارۆژدا.

مەبەستی لە (عیلمی فیقهو) ڕوبەڕوبونەوەکانیشی لەگەڵ ڕکابەرو خەصمەکانی تەنها ڕەزامەندی خودا بووە، ئەمەش بەڵگەیە کە فەرموویەتی:

(وَدِدْتُ أنَّ الناسَ انتَفَعُوا بِهذا العِلم وَما نُسِبَ إليَّ مِنهُ شيئ)[1]

حەزم دەکرد خەڵکەکە بەگشتی سوودیان لەم زانستە وەربگرتایە هیچیشی نەدرایەتە پاڵ منەوە.

بنواڕە کە چەندێك شارەزایە لە مەترسی و ئافەتەکانی زانست، کە ناوو شۆرەت پەیداکردنە، چەندێك دڵی پاك و بێ گەردە و لاناکاتەوە بەلای ناوبانگ دا، تەنها بەنییەت پاکی خۆی مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگارە.

شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی:

هەرگیز لەگەڵ یەکێکدا ڕوبەڕوی نەبومەتەوە حەزم کردبێت کە هەڵە بکات[2] یان من زاڵ ببم بەسەریدا، وە فەرموویەتی[3]:

قسەم لەگەڵ هەرکەسێك کردبێت،حەزم کردووە سەرفرازو دامەزراوو سەرکەوتوبێت، خودا یارمەتی بدات و بیپارێزێت و چاودیریشی بکات، وە قسەشم لەگەڵ هەرکەس کردبێت (ڕوبەڕوبونەوە بە بەڵگەوە) گوێم بەوە نەداوە کە خودای گەورە راستییەکە لەسەر زوبانی من یان لەسەر زوبانی ئەو ئاشکرا دەکات.

وە دەفەرمووێت:

---

(١) رواه أبو نعيم في (حلية الأولياء)(٩/١١٨)

(٢) رواه ابن حبان في صحيحه(٢١٢٥) البيهقي في (المدخل)(١٧٢).

(٣) رواه أبو نعيم في((الحلية) (٩/١١٨).

ئەگەر ڕاستی و بەڵگەم بۆ یەکێك ڕونکردبێتەوە و لێی وەرگرتبم، ئەوا سام و ڕێزی لە دڵمدا پەیدابووە و بڕوام بووە بە خۆشویستنی، بەڵام هەر کەسێك بەڵگەکانی لەڕوی نەسەق زلییەوە ڕەدکردبێتەوە و پێی قایل نەبووبێت، ئەوا لەبەر چاوم کەوتووەو دوورم خستۆتەوە.[1] ئەم نیشانانە بەڵگەی دروستن کە لە زانست و ڕوبەڕوبوونەوەکانیدا تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خودا بووە.

بنوارە ئەم خەڵکەیە، لە کۆی ئەو پێنج خەصڵەتە نایابە، تەنها لەیەك صیفەت و چاکەیدا شوێن شافیعی کەوتوون ( کە زیاتر ڕۆچونیانە لە لق و پۆکانی فیقهو کونەقەیدەکان و ئیهمالکردنیان بۆ علومی ئاخیرەت) لەم خەصڵەتەشدا وەك ئەو نەجوڵاونەتەوە، بەڵکوپێچەوانەی مەیل و ئیرادەی شافیعی بوون..

بۆیە (ئەبوثەور)(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)فەرمویەتی:

( نەخۆم دیومە و نە کەسێکی تریش نمونەی شافیعی بینیوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت).[2]

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

ماوەی چل ساڵە هیچ نوێژێکم نەکردووە کە دۆعای خێرم بۆ شافیعی نەکردبێت(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)[3]بنوارە ئەمانە داعیەی دینن چ ئینصافێکیان هەیە، سەیربکە ئەوەی نزای بۆ دەکەن خاوەنی چ پلەیەکی بەرزە.

بەهەمان پێوەر بنوارە بۆ هاوڕازو هاو وێنەکانی ئەمان لەزانایانی ئەم چەرخانەی

---

(١) رواه أبو نعيم في (حلية الأولياء)(١١٧/٩).

(٢) رواه البيهقي في (( مناقب الشافعي))(٢٦٤/٢). قال ابن حبان: كان أبو ثور(البغدادي) أحد أئمة الدنيا فقها وورعا و علما ، توفي سنة(٢٤٠). ينظر: إتحاف(١٩٩/١).

(٣) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي))(٢٥٤/٢).

کە ئێمەی تێداین، سەیرکە چ ڕق و کینەو دوژمنایەتیەك لە میانیاندا هەیە، ئەو کاتە دەزانیت کە هۆکارەکەی ئەوەیە:

کەمتەرخەم بوون لە شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو پێشەوا مەزنانە.

(ئیمامی حەنبەلی) ئەوەندە دۆعای بۆ شافیعی دەکرد، کوڕەکەی پێی دەووت: ئەرێ ئەو شافیعی‌یە چۆن پیاوێك بووە تا ئەوەندە دۆعای خێری بۆ بکەیت؟ ئیمامی ئەحمەد پێی دەفەرموو:

ڕۆڵەکەم! شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) وەك خۆر وابوو بۆ دونیا، وەك تەندروستی و لەش ساغیش وابووە بۆ خەڵکی، ئایا هیچ شتێک جێگەی خۆر و عافیەت دەگرێتەوە؟[1]

ئیمامی ئەحمەد فەرمویەتی: هەرکەسێك قەڵەم و (حیبردان)جێمرەکەبی بەدەستەوە گرتبێت، قەرزارو منەتباری شافیعی‌یە(رەحمەتی خودای لێ بێ).[2]

یەحیای کوڕی سەعیدی قەطان فەرمویەتی:

ماوەی چل ساڵە هەر نوێژێکم کردبێت نزام کردووە تیایدا بۆ شافیعی، چونکە خودا دەروازەی زانستی لەسەر کردبویەوە و بەڕاست و ڕێکی پێی هەڵدەستاو دامەزراویشی کردبوو لەسەری[3]

با ئەوەندە بەس بێت لەباسی کورتەیەك لە ژیانی، چونکە ناتوانین سەر ژمێری هەموو ئەحواڵەکانی بکەین، زۆربەی ئەم مەناقیب و تاریفانەمان لەو کتێبە دەرهێناوە کە شێخ نەصری کوڕی ئیبراهیمی مەقدیسی(ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دایناوە لە مەناقیبی شافیعی دا (ڕەزای خودای لێ بێ).

---

(١) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي))(٢/٢٥٤).

(٢) رواه البيهقي في ((مناقب الشافعي))(١/٢٢٣-٢٢٤).

(٣) رواه أبو نعيم في الحلية (٦/٣١٩).

## باسی پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ)

بەڕاستی ئەویش ئەو پێنج خەصڵەتەی تێدا بووە، پرسیاریان لێ کرد:
ئەی مالیك! لەبارەی فێربوون و بەدواگەڕانی زانستدا چی دەڵێیت؟! فەرمووی:
باشەو جوانە، بەڵام بنواڕە چیت لەسەر پێویستە لە بەرەبەیانەوە تا ئەو کاتەی
کە ئێوارەت بەسەردادێت، ئەو شتانە بکە و پابەندییان لێ بکە. [1]

ئیمامی مالیك زۆر بەگەورەو قەدر گرانییەوە سەیری زانستی دەکرد و زیاد
لە پێویست بە گەورەی دەناساند، تەنانەت ئەگەر لەبارەی فەرمودەوە قسەی
بۆ خەڵك بکردایە، دەستْ نوێژی دەگرت و لەسەر جێگاکەی دادەنیشت و
ڕیشی بۆ دادەهێناو، خۆی بۆن خۆش دەکرد و لەو پەڕی ویقار و سام و
هەیبەتدا بەچۆکەوە دادەنیشت و لەپاشان وەڵامی دەدانەوە.

ووتیان: بۆچی وادەکەیت، فەرمووی:
پێم خۆشە زۆر بەگەورەیی حیساب بۆ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەم. [2]

مالیك(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی:
زانست نووری خودایە، خودا دەیخاتە ناو دڵی ئەو بەندانەی کە مەیلی
لێیەتی، وەدەست خستنی عیلم بە زۆری ڕیوایەت و گێڕانەوە نی‌یە.

ئەم جۆرە ڕێزلێنان و بەگەورە زانینە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە (ئیمامی
مالیك) زۆر شارەزاو ئاگادار بووە بە شکۆداری و جەلال و هەیبەتی
پەروەردگار(ﷻ).[3] لە زانستەکەیدا تەنها مەبەستی پێ خودا بووە:

بەڵگەش بۆ ئەمە، فەرموودەی ئیمامی مالیك خۆیەتی کە:

---

(١) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء))(٣١٩/٦).

(٢) رواه أبو نعيم في((حلية الأولياء))(٣١٨/٦).

(٣) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء))(٣١٩/٦).

دەمەدەمێ و شەڕەقسەی بەباش نەزانیوە لە دین دا.[١]

هەروەها فەرمودەی شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بەڵگەیە لەسەری کە فەرمویەتی: من لە خزمەت مالیك دا ئاگاداربووم چل و هەشت پرسیاری لێ کرا لە سی و دوو پرسیاردا فەرموی: نازانم![٢]

کەسێك لەوەڵامدانەوە مەبەستی غەیری خودای لەدڵدا بێت، نەفسی ڕێگای پێ نادات کە خۆی بشکێنێتەوە و بڵێ: نازانم، بۆیە ئیمامی شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی: ئەگەر باسی زاناکان بکرێت، مالیك ئەستێرەی پرشنگدارە وپێشەنگی کاروان و(بەرندەیە). هیچ کەس نییە بەقەدەر مالیك من منەتباری بم.[٣]

ئەگێڕنەوە کە ئەبو جەعفەری مەنصور لە بارەی طەلاقی موکرەهەوە (زۆر لێ کراو) لە مالیکی قەدەغەکردبوو ڕیوایەتی فەرمودە بکات و(فتوا بدات)، لە پاشان بە نهێنی یەکێکی نارده لای و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو فەرمودە: ئەویش بەبەرچاوی هەمووانەوە ڕیوایەتی ئەم حەدیسەی کرد کە فەرموویەتی: (لیسَ عَلَى مُستَكرَهٍ طَلَاقٌ) واتە: ئەوەی بەزۆر طەلاقی ژنەکەیان پێ دابێت، طەڵاقی ناکەوێت، ئەویش بەدار لێی دا(چونکە بێ فەرمانی کردبوو) بەڵام ئیمام وازی لە ڕیوایەتی فەرمودەکە نەهێنا.[٤]

ئیمامی مالێك فەرموویەتی: ئەوەی درۆ نەکات و بەڕاستگۆیی قسەکانی بکات خودا بەعاقڵی دەیهێڵێتەوە و لە پیربوونیدا هۆشی لە لای خۆی دەبێت و توشی دەرد و خەڵەفاوی نایەت.[١]

---

(١) رواه البيهقي في ((المدخل))(٢٣٨).

(٢) رواه ابن عبدالبر في((التمهيد))(٧٣/١).

(٣) رواه ابن عبدالبر في ((التمهيد))(٧٤/١). و ابن فرحون في الديباج المذهب(٦٣/١).

(٤) رواه أبو نعيم في ((حلية الأولياء))(٣١٦/٦). ئەوەش کەلیی دا، (والي) مەدینە. جەعفەری کوڕی سولەیمان بوو لەچەرخ و خەلافەتی ئەبو جەعفەری مەنصوردا.

# زوهدی ئیمامی مالیك

بەڵگە لەسەر دونیا نەویستی (ئیمامی) مالیك ئەوەیەکە:

مەهدی(أمیر المؤمنین) پرسیاری لێ کرد: ئایا هیچ خانوویەکت هەیە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام قسەت بۆبکەم: بیستوومە لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عەبدوڕڕەحمان کە فەرموویەتی: نەسەبی پیاو خانوەکەیەتی.[2]

هەروەها هارونە ڕەشید پرسیاری لێ کرد:

ئایە خانووت هەیە؟ فەرمووی: نەخێر.

سێ هەزار دیناری پێ بەخشی، ووتی خانوویەکی بۆ خۆت پێ بکڕە، ئەویش لێی وەرگرت و سەرفی نەکرد، کاتێك ڕەشید ویستی لە حیجازەوە دەربچێت و بگەڕێتەوە بەرەو عێراق دوای مەراسیمی حەج، ووتی:

پێویستە لەگەڵ ئێمە بێیت ، من بڕیارم داوە کە بە خورتی خەڵکەکە وا لێ بکەین شوێن (کتێبی)(مُوَطَّأ) بکەون، وەك چۆن (حەزرەتی)عوسمان(خودای لێ ڕازی بێ) خەڵکەکەی ناچار کرد لە سەر یەك قورئان بمێننەوە.

مالیك فەرمووی:

ئەوەی کە خەڵکەکە بە زۆر وایان لێ بکەین کە شوێن(موطأ) بکەون و، تەقلیدی بکەن، ئەمە هەرگیز ڕێگەی پێ نادەم، چونکە ئەصحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە وڵات و شارەکاندا بڵاو بوونەوە و فەرموودەیان بۆ خەڵك باس کردووە، لای ئەهلی هەر شارێك جۆرە عیلمێکی تێدایە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: (إختِلافُ أمَّتي رَحمَةٌ)[1]

---

(١) رواه ابن عبدالبر في ((التمهيد))(٧٠/١).

(٢) رواه ابن عبدالبر في ((الإنتقاء في فضائل الثلاثة الفقهاء))(٧٩).

واتە: ( ڕای جیاوازی موجتەهیدەکانی ئوممەتی من لە فروع و لق و پۆکانی مەسەلە شەرعیەکاندا ڕەحمەتە، نەك لە مەسەلەی (ئوصُول و عەقیدەدا)).[٢]

مالیك فەرموی:

ئەوەش کەلەگەڵ تۆدا دەرچم ناتوانم، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

((المدينَةُ خَيرٌ لهُم لَو كانُوا يَعلَمُون))[٣]

واتە: (شاری مەدینە بۆیان باشترە ئەگەر بیزانن).

هەروەها دەفەرمووێت (ﷺ):

((المدينَةُ تَنفِي خُبثَها كَما يَنفِي الكِيرُ خُبثَ الحَديدْ))[٤]

واتە: (مەدینە چڵك و پیسییەکەی تورِ دەدات، وەك چۆن ئاگری کوورە چڵکی ئاسن لا دەبات و(بەزاخاو چڵك و پیسی زێڕ پاك دەبێتەوە).

ئەوەش دینارەکانتانە (تا ئەو کاتە دەستی لێ نەدابوو)وەك خۆی ماوەتەوە ئەگەر ئارەزوتانە بیبەنەوە، وە ئەگەر ئارەزوشتانە ئەوا لێی گەڕێن).[١]

---

(١) رواه البيهقي في المدخل (١٥٢) بلفظ:(( **إختلاف أصحابي لكم رحمة**)) قال الأمام النووي في(شرح صحيح المسلم)(٩١/١١) قال الخطابي: وقد روى عن النبي(ﷺ) أنه قال: إختلاف أمتي رحمة، فاستوصب عمر ماقاله كلام راجعٌ لأصل الحديث المشروع. قال: وقد اعترض على حديث: ((**اختلاف أمتي رحمة**)) رجلان أحدهما: مغموص عليه في دينه و هو عمرو بن بحر الجاحظ والآخر معروف بالسخف و الخلاعة وهو إسحاق بن إبراهم الموصلي.

(٢) وەك ئیمامی السبکی فەرموویەتی: ڕەحمەتەکەش بەڕەهایی نییە، بەڵکو جۆرە ڕەحمەتێکی تێدایە لە کاتێکی وادا لەسەر حاڵەتێکی تایبەتی لەسەر حاڵەتی جیاواز... نیبن و قودامەی حەنبەلیش فەرموویەتی: **إختلاف أمتي رحمة و إتفاقهم حجة** . بنوارە: إتحاف(٢٠٥/١-٢٠٦)

(٣) رواه البخاري (١٨٧٥)، و مسلم(١٣٨٣).

(٤) رواه البخاري (١٨٧١-١٨٨٣) و مسلم (١٣٨٢-١٣٨٣).

مەبەستی ئەوە بوو:

تۆ بۆیە داوام لێ ئەکەیت هاورێ یەتیت بکەم لەم سەفەرەدا، چونکە چاکەت بەسەرمەوە هەیە، من فەزڵی ماڵی دونیا نادەم بەسەر شارەکەی پێغەمبەردا(ﷺ).

زوهدو دونیا نەویستی مالیك بەم شێوەیەك بوو.

لەکاتێکدا لە هەموو لایەکی دونیاوە ماڵی زۆری بۆ دەهێنرا( بەتایبەتی لەئەو پەڕی مەغریبەوە) کە ناوبانگی زانستی بڵاو بوبوویەوە لەگەڵ هاورێ و (قوتابیەکانیدا) ئەو شتانەی لای خۆی هەڵنەدەگرت، بەڵکو لەڕێگەی خێرا هەمووی دابەش دەکرد، سەخاوەتیشی نیشانەی زوهدو دونیا نەویستیبوو.

زوهد ئەوە نی‌یە ماڵت نەبێت، بەڵکو زوهدی ڕاستەقینە ئەوەیە دڵت خاڵی بێت لە خۆشەویستی ماڵ.

بۆیە حەزرەتی سولەیمان(علیه السلام) ئەو موڵکە گەورەی هەبوو، بەڵام لە پێڕی زاهیدەکاندا ناوی هاتووە.

بەڵگەی تر کە دونیای زۆر لا سووك و بێ نرخ بووە:

ئەگێڕنەوە لە شافیعی‌یەوە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرموویەتی:

بینم لەبەردەرگای ئیمامی مالیکدا کۆمەڵێکی زۆر لە ئەسپ و سیلاحەکانی خوراسان و هێستری میصر کە بەدیاری بۆی هاتبوون، لەوانە جوانترم نەدیبوو، ووتم پێی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)

ئای کە جوان و نایابن!!

یەکسەر فەرمووی:

---

(١) رواه أبـو نعـيم في حليـة الأوليـاء(٦/٣٣١) ووقـع فيهـا (المأمون) بدل(الرشـيد) والمثبَّـتُ هـو الصواب والله أعلم

ئەی باوکی عبدالله! هەمووی دیاری بێ لە منەوە بۆ تۆ!
ووتم یەکێ لەو ولاخانە بهێڵەرەوە بۆ خۆت با سواری بیت.
فەرمووی:
بەڕاستی شەرمەکەم لە حزوری خودادا کە پاشوو و سمی وڵاخ بهێنم بە سەر زەویەکدا کە پێغەمبەری خودای تێدا بێت(ﷺ).[1]
بنوارە چۆن ڕێز لە جێگا و توربەو ڕەوزەی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێت و چەندێکیش سەخی طەبعە کە بەیەکجار هەموو ماڵەکەی دەبەخشێت.
هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەستی لە زانست تەنها ڕەزامەندی خودا بووە و دونیاش زۆر سوك و بێ نرخ بووە لەبەرچاوی، ئەوەی کە دەگێڕنەوە لێیەوە کە فەرموویەتی:
چووم بۆ لای هارونەڕەشید، پێی ووتم:
ئەی باوکی عەبدوڵلا! پێویستە جار جارێ بێی بۆ لامان، تا منداڵەکانمان کتێبی (مُوَطَّأ) ت لێ ببیستن.
ئەڵێ: ووتم خودا فەرماندەی باوەڕداران سەربەرزکات، ئەم زانستە لە ئێوەوە دەرچووە، ئەگەر ئێوە بەڕێزو قەدرگرانیەوە بۆی بنوارن زیاتر عیززەت پەیدا دەکات، ئەگەر ئێوەش لە ژێرەوە و بێ نرخ حیسابتان بۆ کرد، ئەوا بەهای خۆی لەدەس دەدات، زانست دەبێت بێن بۆ لای نەك بچێت بۆ لای کەس!!
فەرمووی:
ڕاستەکەیت ..( بەمنداڵەکانی ووت) بڕۆن بۆ مزگەوت، تا ئێوەش لەگەڵ خەڵکەکەدا ببیستن و بخوێنن.[2]

---

(١) ترتيب المدارك(٩٣/١).
(٢) رواه البيهقي في المدخل(٦٨٦).

# باسی ئیمام ئەبو حەنیفە(خودای لێ ڕازی بێ)

بەڕاستی ئەمیش خوداپەرست و دونیا نەویست و خوداناس و لە خودا ترس بوو، تەنها لەبەر خاتری خودا زانستی ئەویست و بڵاوی ئەکردەوە.

نمونەی خوداپەرستی بەوە ئەزانرێت کە عەبدوڵلای کوڕی موبارەك فەرموویەتی: ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) نەفسییەت و هیممەتێکی زۆر بەرزی هەبوو، وە شەو نوێژیشی زۆر بووە.[1]

حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان دەگێڕێتەوە کە ئەبو حەنیفە هەموو شەو تا بەیانی بە عیبادەت زیندوی دەکردەوە.[2]

دەگێڕنەوە هەموو شەوێ نیوەی بە عیبادەت زیندوو دەکردەوە، ڕۆژێ بەڕێگەیەکدا تێپەڕی، یەکێ هێمای بۆ کردو بەهاوڕێکەی ووت:

ئەمە ئەو پیاوەیە کە شەو هەمووی بە عیبادەت زیندوو دەکاتەوە، ئیتر بەردەوام شەوی بە عیبادەت دەبردەسەر و فەرمووی: من شەرمەکەم لە خودا(ﷻ) کە بەشتێ وەصفدار بکرێم و تیامدا نەبێت.[3]

## زوهدو دونیا نەویستی ئەبو حەنیفە:

دەگێڕنەوە لە ڕەبیعی کوری عاصیمەوە کەفەرموویەتی:

یەزیدی کوڕی عەمری کوڕی هوبەیرە منی نارد بە شوێن ئەبو حەنیفەدا کە چوینە لای، داوای لێ کرد کە بیکات بە خازینی(بیت المال) (یان بیکات بە قازی شەرع)، ئەبوحەنیفە ڕەددی کردەوە، ئەویش ..............................

---

(١) تأريخ بغداد(٣٥٢/١٣) من قول سفيان بن عيينه، کە ناو ئەبرا بە(وتد) واتە: وەك مێخ چۆن دای بوکتیت، ئاوا بە پێوە تابەیانی شەونوێژی دەکرد.

(٢) رواه ابن عبدالبر في الأنتقاء في فضائل الثلاثة الأمة الفقهاء (١٩٤).

(٣) رواه الخطيب في تأريخ البغداد (٣٥٣/١٣).

بیست داری لێ دا[(١)]

بنواڕە چۆن لەویلایەت ڕای کردووە و سزاو ناڕەحەتیەکانی قەبوڵ کردووە ( بەمەرجێك تووشی مەنصەبی گەورە نەبێت).

حەکەمی کوڕی هیشامی سەقەفی دەڵێت:

دەربارەی ئەبو حەنیفە بۆیان باسکردم کە یەکێ بووە لە گەورە پیاوان لە بارەی پاراستنی ئەمانەتەوە، سوڵطان ویستی سەرپەرشتیاری و کلیلی خەزنەکانی بخاتە بەردەست، ئەگەر وەری نەگرت بە دار لێیبدات، ئەبو حەنیفە سزاکەی ئەوانی هەڵبژارد بە سەر سزای خودای گەورەدا.[(٢)]

ئەگێڕنەوە باسی ئەبوحەنیفە لە پاڵ عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دا کرا فەرمووی: ئایا ناوی کەسێك(بەخراپە) دەبەن ، کە هەموو دونیایان خستە بەردەستی و لێی رادەکرد و قەبوڵی نەدەکرد.[(٣)]

هەروەها دەگێڕنەوە لە موحەممەدی کوڕی شوجاعەوە لە هەندێك هاوەڵانی[(٤)]:

ووتیان بە ئەبو حەنیفە: ئەبو جەعفەری(مەنصور) ئەمیری باوەڕداران فرمانی داوە کە دەهەزار دیرهەمت پێ بدرێت، فەرموی: ئەبو حەنیفە ڕازی نەبوو، کاتێك ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کەوای دەخەملاند ماڵەکەی بۆ بهێنن،

---

(١) رواە ابن عبدالبر في ((الأنتقاء)) (٢٥٥). چەند جارێکی تر لێیان داوە کە ببێ بە قازی و نەیکردووە، جارێکیان ١٠ رۆژ لەسەر یەك هەموو رۆژی ١٠ داریان لێ دەدا، تاوای لێ هات سوفیانی سەوری دای بە لایدا و فەرمووی: دڵنیابووم کە فێربوونی عیلمت بۆ دونیا نەبووە بەڵکو بۆ خوا بووە... بنواڕە إتحاف(١/٢١٠-٢١١).

(٢) رواە ابن عبدالبر في الأنتقاء في فضائل الثلاثة الأئمة الفقهاء (٢٥٥).

(٣) رواە ابن عبدالبر في الأنتقاء في فضائل الثلاثة الأئمة الفقهاء (٣٢١)

(٤) مەبەست لە هاوەڵەکانی: الحسن بن عمارە، أبو محمد الكوفي إتحاف(١/٢١١).

نوێژی بەیانی کردو، خۆی بە لیباسەکانی داپۆشی و قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، نێرراوی حەسەنی کوڕی قەحطە ماڵەکەی بۆ هێنا، چووە ژورەوە بۆ لای، قسەی لەگەڵ نەکرد، ئەوەی لەوێ ئامادە بوو پێی ووت:

کەلیمە کەلیمە نەبێت قسەش لەگەڵ ئێمە ناکات، (واتە ئەمە نەریتی ئەوە).

لەپاشان (ئەبو حەنیفە)فەرموی: ئەو ماڵە بخەنە ناو ئەو کیسەوە، لە سوچێکی ماڵەکەدا بۆی دابنێن، لە پاشان ئەبو حەنیفە وەسیەتی دەکرد بە هەموو ماڵەکەی، فەرمووی: ئەگەر مردم و منتان ئەسپەردەکرد، ئەو کیسە هەڵگرە و بیبە بۆ لای حەسەنی قەحطەبەو پێی بڵێ:

ئەمە ئەو ئەمانەتەی تۆیە کەلای ئەبو حەنیفەت دا نابوو، کوڕەکەی دەڵێت:

منیش وەسێتەکەی باوکمم ئەنجام دا، حەسەن ووتی: (رەحمەتی خودا لە باوکت بێ)، بەڕاستی زۆر بە توندی دینەکەی خۆی گرتبوو...

ئەگێڕنەوە کە بانگیان کرد بۆ ئەوەی ببێتە قازی، فەرمووی: من بۆ قەزاوەت ناشێم، پێیان ووت: بۆچی؟ فەرمووی: ئەگەر قسەکەم ڕاست بێت ئەوە دیارە من ناشێم، ئەگەر درۆیش بێت، ئەوا درۆزن نابێ بکرێت بە قازی.[1]

**دەربارەی شارەزایی ئەبو حەنیفە** بە کاروباری ئاخیرەت و ڕێگای دین و زانایی و شارەزایی ئەو لە بارەی(معرفة الله) وە.

ئەو هەموو ترسان لە خودا و هەڵبژاردنی دونیا نەویسیە، نیشانەیە لەسەر ئەوە کە باسمان کرد، ئیبن و جورەیج فەرموویەتی:

ئەوەی کە پێمگەیشتــووە دەربارەی ئەو شەخصە(کوفی)یە، نوعمانی کوڕی ثابت،کە زۆر لەخوداترسە(ﷺ)[2]

---

(١) رواه ابن عبدالبر في الأنتقاء في فضائل الثلاثة الأئمة الفقهاء (٣٢١)

(٢) رواه الخطيب في ((تأريخ بغداد))(٣٢٩/١٣)

ئەمە ڕون و ئاشكراترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەبوحەنیفە عیلمی باطینی هەبووە، وە هەمیشە سەرقاڵی كارە گرنگەكانی دین بووە، هەر كەسێك زوهدو بێدەنگی پێ درا بێت، كەواتە هەموو زانستەكانی تری پێ دراوە، ئەمە كورتەیەك بوو لە ژیان و ئەحواڵی هەرسێ ئیمامەكە.

ئەو دوو ئیمامەكەی تر:

## ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و سوفیانی سەوری

(ڕەحمەتی خودایان لێ بێت). شوێن كەوتوانیان كەمترن لە شوێن كەواتوانی ئەوان، شوێن كەوتوانی سوفیانیش كەمترە لە شوێن كەوتوانی ئەحمەد، بەڵام ئەمانە زیاتر بەناوبانگ بوون بە خۆپارێزی و زوهدو دونیا نەویستی، وە هەموو ئەم كتێبەی كە لەبەر دەستدایە پڕیەتی لە بەسەر هات و كردارو گوفتارەكانی ئەمان، پێویست ناكات لێرە درێژەی پێ بدەین، كەواتە بنواڕە لە ژیاننامەی ئەو چوار پێشەوایە، وەسەرنج بدە، كە بەڕاستی ئەو ئەحواڵ و گوفتار و كردارانەیان لە چۆنیەتی پشت كردنە دونیاو خۆیەكلایی كردنەوە بۆ لای خودا(ﷻ) ئایا دەكرێت بەرهەمی تەنها ئەوە بێت كە ئەم زاتانە شارەزابوون لە عیلمی(فقه) داو بەس، وەك(سەلەم و بەكرێ دان و ظیهار و ئیلاء و لیعان و....)یان لە عیلمێكی ترەوە بەرهەمدێن كە زۆر گەورەو مەزنترن لەو زانینەیە.

وە بنواڕە ئەوانەی وادەگەێنن كە شوێنی ئەم زاتانە كەوتوون، ئایا ڕاستەكەن لە دەعواكانیان، یان ڕاست ناكەن؟ والله أعلم

# بەشی سێیەم

## باس کردنی ئەو عیلمانەی کە زۆربەی خەڵکەکە بە پەسەند کراوی دەزانن و وایش نی یە!
## لەچ ڕویەکەوە هەندێك لەو زانستانە نەشیاو و زەم کراو دەبن؟
## ڕونکردنەوەی گۆڕینی ناوی زانستەکان وەك: فیقهو عیلم و تەوحید و تەذکیر و حیکمەت، واتە: ( تێگەیشتن لە دین و زانست و عیلمی کەلام و بیرخستنەوە و پەندیاری).

وە ڕونکردنەوەی ئەو ئەندازەی کە لەزانستە شەرعیەکان خوێندنیان پەسەندەو، ئەو ئەندازەش کە ڕێگەی پێ نەدراوە و (ناپەسەندە).

ڕونکردنەوەی ئەو هۆکارانەی کە بۆچی زەممی عیلمی ناپەسەندو نەشیاو کراوە.

# بۆچی عیلمی نەشیاوو ناپەسەند زەمکراوە؟!

لەوانەیە تۆ بڵێیت:

زانست واتە: ناسینی شتێکە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە پێیەوەیەتی و پێیەوە لکاوە، کە یەکێکە لە صیفەتەکانی خودا، ئیتر چۆن دەبێ شتێك بەزانست لەقەڵەم بدرێت و لەولایشەوە بە زەمکراو وەصف بکرێت؟!

لەوەڵامدا بزانە: زەمکردنی زانست ڕوبەڕوی خودی زانستەکە نابێتەوە، بەڵکو لە ڕوی پەیوەندی زانستەکەوەیە بە عەبدەکانەوە، کە ئەویش لەبەر یەکێ لەم سێ هۆکارەیە:

## هۆکاری یەکەم:

ئەو زانستە هۆکاری گەیاندنی زیانێك بێت بە خاوەنەکەی، یان بە کەسێکی تر، وەك چۆن عیلمی سیحرو تەڵەکەبازی و جادوگەری زەمکراوە، کە بۆخۆیان بوونیان هەیە و ناتوانرێت ئینکاریان بکرێت، چونکە قورئان شایەتی دەدات کە سیحر هەیەو دەبێتە هۆکاری جیاکردنەوەی ژن و مێرد لە یەکتری، وە پێغەمبەریش(ﷺ) سیحری لێ کراوە و بەهۆیەوە نەخۆش کەوتووە، تا حەزرەتی جوبرەئیل هەواڵی پێ دا، وە جێگایان پێ نیشان داو سیحرەکەیان لەناو بیرێکدا لە بن بەردێکدا کە شاردبویانەوە دەریان هێنایەوە .[1]

سیحر جۆرێکە بەهۆی شارەزابوون بەتایبەتمەندیی جەوهەرو حەقیقەتی شتەکانەوە دەزانرێت، بەهۆی حیسابات و لێکدانەوە لە شوێنی دەرکەوتنی ئەستێرەکان، کە لە جەوهەری ئەو حەقیقەتە زانراوانەو لەسەر شکڵ و شێوەی سیحر لێکراوەکە پەیکەرێکی پێ دروست دەکەن، وە چاوەنوارێ کاتێکی

---

(١) رواه البخاري(٣١٧٥) و مسلم(٢١٨٩)

تایبەتی دەکەن، لەکاتی هەڵاتنی ئەستێرەکان، وەچەند وشەیەکی پێوە دەلکێنن، کە هەموویان وشەی کوفرو بێ ئابڕویی و پێچەوانەیە لەگەڵ شەرعدا، بەهۆی(ئەو جەوهەرە پیسانە و ئەوکاتە تایبەتیانە و ئەو کەلیماتە کوفرانەوە) دەتوانێت بگاتە ئەوەی کە کۆمەک و یارمەتی لەشەیتان وەربگرێت، بە کۆی هەموو ئەم هۆکار و کارە خراپانەوە، چەندین حاڵەتی نامۆ لەسەر ئەو سیحر لێ کراوە دەردەکەوێت(( بەحوکمی عادەتی پەروەردگار کە کاری خراپیش ئاسەواری خراپی لێ دەکەوێتەوە)). سیحرەکەش کاری خۆی دەکات.

لەڕوی ئەوەوە کە تۆ ئەم شتانە بزانیت، کە زانینەکە خراپ نی‌یە، بەڵام هیچ چاکەیەکی نی‌یە جگە لە زیان گەیاندن نەبێت بەخەڵکی.

کەواتە هۆکاری شەڕپەیداکردن خۆیشی خراپە.

ئەمەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە زەممی کراوە و پەسەند نی‌یە.

بەڵکو ئەگەر کەسێك کەوتبێتە دوای دۆستێکی خودا کە بیکوژێت، ئەویش لە جێگایەکی قایم خۆی حەشار دابێت، ئەگەر زاڵمەکە پرسیار بکات لە جێگاکەی، دروست نی‌یە ڕاستی پێ بووترێت، بەڵکو پێویستە بە درۆ وەڵامی بدرێتەوە، خۆ باس کردنی جێگاکەی و (ووتنی ڕاستی شوێنەکەی) ئەوە زانستێکی گەیاندووە وەك خۆی چۆنە ئاوا، بەڵام ئەو زانستە ناپەسەندو قەدەغەکراوە، چونکە زەرەرێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە( کە کوشتنی کابرایە).

## هۆکاری دووهەم:

ئەو زانستەیە زیاتر وا ڕێکەوتبێت کە زیان بە خاوەنەکەیشی بگەیێنێت، وەك ئەستێرەناسی، کە بۆ خۆی بە زانستێکی زەمکراو دانانرێت، چونکە ئەستێرە ناسی دووبەشە:

**بەشی حیساب و ژمێریاری**، کە دەزانین قورئان ڕایگەیاندووە کە ڕێڕەوی خۆر و مانگ ژمێرراوەو دیاری کراوە وەك فەرمویەتی:

﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾الرحمن/٦.

واته: ( خۆر و هەیڤیش(مانگ) بە ئەندازە دێن و دەچن).[١]

هەروەها خودای مەزن و باڵادەست فەرمویەتی:

﴿ وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾[٢] واتە:

( مانگیش (هەیڤ) ئێمە بۆمان دانا، بەچەن قۆناغدا تێپەڕێت، تاوای لی دێت وەك پەلی وشەکەڵ و کۆنی دارخورمای دێتە بەرچاو).[٣]

## دووهەمیشیان ئەحکام:

خوڵاصەو پوختەکەیشی ئەگەڕێتەوە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕوداوەکان، بەهۆی هۆکارەکانەوە، ئەمەش وەك ئەوە وایە کە پزیشکێك سەرنجی لێدانی دڵ ئەدات، کە بەهۆیەوە بزانێت چی بەسەر نەخۆشەکە دێت، ئەمەش زانینی(سوننەتێکی خودایی‌یە) کە عادەتی خودا(ﷻ) وایە بەرامبەر دروستکراوەکانی، بەڵام شەرعی خودا ڕەخنەی لێ گرتووە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

((إذا ذُكِرَ القَدَرُ فَأَمْسِكُوا. وَإِذَا ذُكِرَتِ النُجوُم فَأَمسِكُوا، وإذا ذُكِرَ أَصحابي فأَمْسِكُوا))[٤]

---

(١) قورئانی پیرۆز مامۆستا هەژارل ٥٣١.

(٢) یس(٣٩)

(٣) قورئانی پیرۆز مامۆستا هەژارل ٤٤٢.

(٤) رواه الطبراني في الكبير ١٠/١٩٨(١٠٤٤٨) من حديث إبن مسعود بإسناد حسن. و أبو نعيم فى الحليـة(٤/١٠٨).(٢/٩٦) [قـال الزبيـدي١/٢٢٢: ورواه الطبراني أيضـأ في الكبيـر٢ /٩٦ (١٤٢٧)من حـديث ثوبـان مـولى رسـول الله ﷺ ، وابـن عـدي في الكامل٦/١٦٢، عـن عمـر بـن الخطاب بسند ضعيف. وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ٧/٢٠٢: فيه يزيد بن ربيعة وهـو ضعيف، وقد رمز السيوطي في الجامع الصغير ١/٩٦: لحُسنه. ولعله إعتضد]

واته: (ئەگەر باسی قەدەری خودا کرا خۆتان بگرنەوە لە قسەکردن و لەسەرچوونی، هەروەها ئەگەر باسی ئەستێرەناسی کرا خۆتان بگرن و بێدەنگ بن، هەروا ئەگەر باسی ئەصحابی من کرا زوبانتان بگرن و باسیان مەکەن).[1]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: لەدوای خۆم لەسێ شت دەترسم کە ئوممەتەکەمی پێ گیرۆدە بێن.. زوڵم و ستەمی پێشەواکان، باوەڕهێنان بە(ئەستێرەناسی) وە بەدرۆخستنەوەی قەدەر.[2]

---

(١) مەبەست لەوەیە باسی قەزاو قەدەرو چۆنیەتی و بۆچی ئەمەی تەقدیر کردووە یان نەیکردووە؟ وە باسی ڕۆچون لە زانستی ئەستێرەناسیدا و بەهۆی ئەو عیلمەوە وابزانیت شتەکان ڕودەدەن و کاریگەری حەقیقییان بیر بچێتەوە، وە باسی ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەخراپی بیانکەن و ناویان ببەن و ڕەخنەیان لێ بگرن، ئەوا پێویستە خۆتان بگرن، وەك ئیمامی المناوی ئەفەرموێت: چونکە ڕۆچون لە باس کردنی ئەم سێ بابەتە خراپەو زیانی زۆری لێ دەکەوێتەوە کە ناژمێررێت. بۆ بەهێزی سەنەدەی فەرموودەکەش بنوارە: إتحاف السادة المتقين(١/٢٢٠).

(٢) رواه ابن عبدالبر في (جامع بيان العلم و فضله)(١٤٨٢).ونص الحديث: **أخافُ على أُمَّتي بعدي ثلاثاً: حيفَ الأئمَّةِ، والإيمانَ بالنُّجومِ، والتكذيبِ بالقَدَر**.[قال الزبيدي:١/٢٢٢، أخرجه ابن عسكر ٥٨/٤٠١،وأخرج الطبراني في الكبير، ٢٨٩/٨(٨١١٣) من حديث أبي أمامة رفعه: **إن أخوف ما أخاف على أمتي في آخر زمانها النجوم، وتكذيبٌ بالقدر، وحيف السلطان**، وأخرج أحمد في مسنده، ٢٠٣٢١، والبزاز في مسنده١٠/٢٠١(٤٢٨٧)، وأبو يعلي في مسنده١٣/٤٥٥(٧٤٧٢)، والطبراني في معاجيمه الثلاثة، في الكبير٢/٢٠٨(١٨٥٣)، والأوسط٢/٢٣٨(١٨٥٢)، والصغير ١/٨٥(١١٢)، من حديث جابر بن سمرة بلفظ: **أخاف على أمتي إستسقاء بالأنواء، وحيف السلطان وتكذيب بالقدر**، ومن شواهد الحديثين، ما أخرجه الديلمي في الفردوس ٥/٦٤(٧٤٧٠)، عن عمر بن الخطاب مرفوعاً:

**لاتسألوا عن النجوم، ولاتماروا في القدر، ولاتفسروا القرآن برأيكم، ولاتسبّوا أحداً من أصحابي، فإنَّ ذلك الإيمان المحض**، هكذا أخرجه السيوطي في المعجم الكبير ٨/٢٢٤(٢٥٦١٦)].

هەروەها حەزرەتی عومەر کوڕی خەطاب(خودای لیّ ڕازی بیّ)فەرموویەتی: ئەوەندە لە ئەستێرەکان فێربن؛ کە لە دەشت و دەر و ناو دەریاکاندا بەهۆی ئەستێرەکانەوە ڕێگاکان دەربکەن و ئامانجتان بدۆزنەوەو ئیتر خۆتان بگرن و لەوە زیاتر فێر مەبن.[1]

## نەهی لە (ئەستێرەناسی) کراوە لەبەرسێ هۆ:

**یەکەمیان:** زیان بەخشە بەزۆربەی خەڵکەکە. چونکە ئەگەر بخرێتە دڵیانەوە کە ئەم ئاسەوار و ڕوداوانە دوای گەشتی ئەستێرەکان پەیدادەبن، وا دەکەوێتە دڵیانەوە کە ئەستێرەکان کاریگەری ڕاستەقینەبن لەو ڕوداوانە، یان ئەوانن کە خودایەکی فەراهەم هێنەری ئەو کارانەن، چونکە ئەوانە کۆمەڵە جەوهەرێکی بەرزو ڕەسەن و مەزنی ئاسمانین، بەمە زیاتر دەکەونە سەر دڵەکانەوە و دڵیش بەردەوام لا بەلای ئەم کاریگەریە دا دەکاتەوەو، وا دەبینێت خێر و شەڕ لەو لایەنەوە توشیان دەبێت یان لێیان ڕزگاری دەبێت، وای لێدێت زیکری خودا دەسڕێتەوە لە دڵدا، چونکە کەسێکی لاواز(لەبیرو باوەڕدا) تەنها چاوی لەسەر هۆکارەکانە، بەڵام زانای دامەزراوی پێگەیشتوو تێدەگات لەوەی کە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بەپێی فەرمانی پەروەردگار دێن و دەچن(سُبحَانَهُ و تَعَالی).

---

(١) رواه ابن أبى شيبه في (المصنف) (٢٦١٦٢). وقال الزبيدي:لم يتعرض العراقي لتخريجه، وقد روى ذلك مرفوعا عن ابن عمر،أخرجه ابن مردوية في التفسير، والخطيب البغدادي في كتاب ذم النجوم، كما في الجامع الكبير للسيوطي٩٨/٤(١٠٤٢١). وكنز العمال للمتقي الهندي١٠/٦٢(٢٨٧٢١)، ولفظهم: **تعلموا من النجوم ما تهتدون به في ظلمات البر والبحر ثم انتهوا.** قال المناوي في الفيض القدير: ٢٥٦/٣ قال ابن الحق وليس إسناده مما يحتج به، وقال إبن قحطان:فيه من لاأعرف.

نمونەی کەسێکی لاوازی کورتبین کە سەیری پەیدابوونی تیشکی هەتاو دەکات، پاش هەڵاتنی خۆر. وەك ئەو مێرووە وایە ئەگەر ئەقڵی پێ بدرایەو لەسەر ڕوبەری کاغەزێك بووایە، کەسەیری ڕەشایی خەتەکەی بکردایە کە زوو زوو تازە دەبێتەوە، ئەو وادەزانێت کێشانی ئەو هێڵە لە کرداری قەڵەمەکەیە ، سەیرکردنی ئەو ئەوەندە بەرزنابێتەوە تا پەنجەکان و لە پاشان دەست و مەچەکی قەڵەم بەدەستەکە ببینێت ، پاشان ئەو ئیرادەیەی کە دەستەکە ئەجوڵێنێت. لە پاشان تا دەگاتە نوسەرە بەتوانەکەی، کە دەیەوێت بنوسێت، لەوێیشەوە بۆ ئەو زاتەی کە دەست و توانا و ئیرادەی لەو کەسەدا دروست کردووە، کەواتە زۆربەی بینینی خەڵکەکە هۆکارە نزم و نزیکەکانە، پچڕاوە لەوەی چاوی بەرزبێتەوە بۆ بینینی ئەو هێزەی کە هۆکارەکانی سازکردووە، ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە نەهی کراوە لە خۆخەریك کردن بە ئەستێرەناسی.

## دووهەمیان:

ئەو حوکم و فەرمانەی لە ئەستێرەکانەوە دەزانرێت، تەنها گۆترەکاری و خەملاندنێکە و تاکە کەسەکان ناتوانن بیزانن و هەستی پێ بکەن، نە بەشێوەی دڵنیایی و نەبەگومانیشەوە، کەواتە حوکمدان پێی: فەرمانکردنە بە جەهل و نەزانین، بۆیە نەهی لێ کراوە، چونکە ئەوە جەهل و نەزانینە، نەك لەو لایەنەیەوە کە بۆخۆی بە عیلم دەژمێررێت، بەڵام زیان دەداتەوە.

وەك دەگێڕنەوە: ئەمە کاتی خۆی موعجیزەیەکی حەزرەتی ئیدریس بووە (سەلامی خودای لەسەر)[1].

---

(١) ئەو فەرموودەیان دابڕیوە بەسەریا کە ئیمامی موسلیم لە(صحيح)یەکدا بەژمارە (٥٣٧) ڕیوایەتی کردووە: **كان نبيٌ من الأنبياء يخَطُ فمَن وافق خَطه فذاك**. واتە: هێڵێکی دەکیشا واتە بە ئەستێرەناسی یان بە (عیلمی ڕەمز) مەشهورە( کە دەگەڕێت بە دوای ڕوداوە نەزانراوەکاندا بۆ بەکارهێنانیان بەچەند خاڵێك کە دەیکێشن لەسەر پەڕاوەکە، وەك دەنکی ڕمڵ وایە کە باطیلە. بنوارە قاموسی المعتمد ل ٢٣٢ ماددەی: الرمل، هەروەها بنوارە: فيض القدير(٤/٥٤٥) شەرحی: جامع الصغير.

دوای وەفاتی خۆی ئەو زانستە پێچرایەوە و نەما.

ئەستێرەناسەکان بە دەگمەن ڕێیان لە ڕاستی‌یەکان دەکەوێت، وە تەنها بەڕێکەوتیش، چونکە ڕێدەکەوێت کە هەندێك هۆکاری بەرچاو بکەوێت، بەڵام ڕوداوەکە وەك ئەوەی ئەو دیاری دەکات نایەتەدی، ئەوەش کە هەردوکیان یەکانگیربن مەرجی زۆری هەیەو لە توانای ئادەمیزاددا نییە، کە گەمارۆی ئەو هەموو زانستیە بدات. ئەگەر وا ڕێکەوت و، خودای گەورەش بەو شێوەی تەقدیر کردبوو کە پاشماوەی هۆکارەکانی بۆ هێنایە دی، ئەوە یەك دەگرنەوەو بەڕاست دەگەڕێت، ئەگەر تەقدیریشی نەکردبوو ئەوا بەهەڵەدا دەچێت.

وەك ئەوەی کە کەسێك سەیری هەورو هەڵای ئاسمان دەکات وا کۆ دەبنەوە و بەسەر چیاکاندا بەرزدەبنەوە، ئەمیش گومانی بۆ دروست دەبێت کە لەو ڕۆژەدا باران دەبارێت، لەوانەیشە هەورەکە بڕەوێتەوەو خۆریش ئەوەندەی تر ئەو تاقە گەرم بکات، لەوانەیشە پێچەوانەی ئەمە بێت، کەواتە تەنها بینینی هەور بەس نی‌یە بۆ هاتنی باران، دەی خۆ ئەو هۆکارەکانی تر نازانێت، کەشتیەوانێکیش کە وای داناوە کەشتیەکەی پارێزراو دەبێت، بەهۆی کەشناسی و شارەزایی خۆی لە ڕەوتی هەوا، بەڵام خۆ ئەو نازانێت حەرەکەتی هەوا هۆکاری شاراوەی هەیە، جاریوا هەیە لە خەملاندنەکەیدا سەرکەوتوو دەبێت، جاری وایش هەیە ڕاستی ناپێکێت، لەبەر ئەم هۆکارەیە کە لە کەسە بەهێزەکانیش قەدەغەکراوە سەیری ئەستێرە بکەن.

(واتە ئەوانەیش کە لە ڕووی بڕواو ئیمانەوە بەهێزن).

## سێیەمیان:

هەروەها نجوم گەڕێتی هیچ سوودێکی نییە، کەمترین حاڵەتی ئەوەیە کە ڕۆچوونە لە شتێکی زیاد و بێ هودەدا. وە بەنرخترین سەرمایەی مرۆڤ لە

ژیاندا تەمەنیەتی، کە بەهۆیەوە بەزایە دەچێت و کاتی بەفیڕۆ لەدەس دەردەچێت و توشی ئەو پەڕی خەسارەت دەبێت.

پێغەمبەر(ﷺ)دای بەلای پیاوێکدا، خەڵکەکە لەدەوری کۆدەبوونەوە فەرموی: ئەمە چییە؟ وتیان: پیاوێکی زۆر زانایە، فەرمووی: زانایە بەچی؟ ووتیان بەشیعر و ئەنسابی عەرەب، فەرمووی: ( زانینێکە کە سوود بەخش نییە، وە نەزانینەکەیشی زیانبەخش نی‌یە) (**عِلمٌ لایَنفَع، وجَهلٌ لایَضُر**)[1]

وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((إنَّما العِلمُ آيةٌ مُحكَمَة أو سنةٌ قائِمة أو فريضةٌ عادلة))**[2]

واتە: ( عیلمی ڕاستەقینە بریتیە لە ئایەتە موحکەمەکان(کەواتاکانیان دیارن و موتەشابیهات نین) یاسوننەتێکە بەخۆیەوە ڕاوەستاو بێت، یان فەریزە دیاریکراوەکانە(لە میرات بردن) کە بەدادوەری جێبەجێ دەکرێن).

کەواتە ڕۆچون لە زانستی ئەستێرەناسی و هاووێنەکانی مەترسیەکی زۆری تێدایە، سوڕانەوەیە لە جەهالەتدا بەبێ ئەوەی سوودێکی هەبێت، چونکە ئەوەی خودا تەقدیری کردبێت دەبێت، خۆ ناتوانێت لە تەقدیری خودا لا

---

(١) رواه: ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١٣٨٥). مەبەست لەوەیە ڕۆچون لە عیلمی ئەنسابدا، زۆر خۆ پێوە مەشغوڵ کردنی باش نی‌یە، ئەینا فەرمودەی تر هەیە کە هانی مرۆڤ دەدات فێری ببێت((**تعلَّموا مِن أنسابِكُم ما تَصِلونَ بهِ أرحامَكُم**... الخ أخرجه أحمد في مسنده و الترمذي ، و صحيحه الحاكم .. إتحاف(١/٢٥٥).

(٢) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١٣٨٤-١٣٨٦) و أصله عند أبى داوود(٢٨٨٥) و ابن ماجه(٥٤).[قال الزبيدي:١/٢٢٤، وفي القوت: ٢٢٧/١، **وقد روينا عن رسول الله من طريق مرسل أنه مر رجل والناس مجتمعون عليه، فقال: ماهذا؟ قالوا رجلٌ علاّمة، قال: بماذا؟ قالوا بالشعر، والأنساب وأيام العرب، قال: هذا علمٌ لايضرُ جهله، وفي لفظ آخر: علم لاينفع،وجهلٌ لايضر**، الخ.]

بدات، بە پێچەوانەی زانستی پزیشکی، چونکە خەڵکەکە پێویستیان پێ یەتی، زۆربەی بەڵگەکانیش لەوەیە کە دەتوانێت لێی ئاگاداربێت، هەروەها جیاوازە لەگەڵ خەونامەدا، هەرچەندە تەعبیری خەو بە مەزندەی ئەقڵ و خەملاندن دەکرێت، بەلام( خەو بینینی جوان لە پیاوی صالحەوە) بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی و هیچ مەترسیەکی نییە.(١)

## هۆکاری سێیەم:

ڕۆچون لە یەکێ لە زانستەکان، کە نەتوانێت قورساییەکەی هەڵبگرێت ئەوە شتێکی خراپی کردووە، چونکە لەسەرو توانای خۆیەوە خۆی بارگران کردووە، وەك فێربوونی ئەو زانستانەی کەزۆر وردەکاریان تێدایە، پێش فێربوونی پرسە ڕون و ئاشکراکانی.

هەروەها وەك باس و لێکۆڵینەوە لە نهێنیە شاراوەکانی خودایی، کە فەیلەسوف و زانایانی عیلمی کەلام سەریان پێوە ناوە کە لێی حاڵی ببن و، نەیان توانیوە سەربەخۆ پێی بگەن(چونکە ئەو زانستانە زانستێکن بەزەوق و عیلمی موکاشەفە دەزانرێن، کە ئەوان کەرەستەکانی ئەو زانستەیان پێ نییە)

بەڵکو تەنها پێغەمبەران و ئەولیاکان دەتوانن پێی بگەن و لەهەندێك ڕێگاکانی شارەزابن.

کەواتە پێویستە خەڵکەکەی لێ دوربخرێتەوە ، کە بەدوایدا نەچن و بیانگێڕنەوە بۆ ئەو بابەتانەی کە شەرع باسی کردوون و ڕێنومایان کردووە لەسەری بن، ئەوەندە بەسە بۆ کەسێك خودا تەوفیقی دابێت.

---

(١) رواه البخاري(٦٩٨٣) و مسلم (٢٢٦٤): **الرُؤيـا الحَسـنةُ مِنَ الرَّجُل الصَّالِح، جزءٌ مِن سِتَة و أربعينَ جُزءاً مِنَ النُبوَة.**

زۆر هەبوون ڕۆچوون لەو عیلمانەدا و زیانیان لێ کـەوتووە، خـۆ ئـەگەر خـۆی بەوانەوە خەریك نەکردبایە لەڕوی دینەوە حاڵی باشتر دەبوو لەوەی بەسەری هات.

نابێت باوەڕ بەوەنەکەیت، کە خەریك بوون بەهەندێك زانستەوە بۆ هەندێك کەس زیان بەخشە، نابینی گۆشتی پەلەور و هەندێك شیرینەمەنی ناسك ئەگەر بدرێت بە منداڵی شیرەخۆرە زیانی لێ دەدات، بەڵکو کەسانێکی واهەیە قازانجی زیاتر لەوەدایە کە هەندێك شت هەیە هەر نەیزانێت.

گێڕاویانەتەوە کە: کابرایەك سکاڵای خۆی بردە لای دکتۆرێك کە ژنەکەی نەزۆکە و منداڵی نابێت، پزیشکەکە لێدانێکی دڵی بۆ گرت و پێ‌ی ووت:

تۆ پێویستیت بە دەرمانی منداڵ بوون نی‌یە، دوای چل ڕۆژی تر دەمریت، نەبزی دڵت وانیشان دەدات، ئافرەتەکە ترسێکی زۆری بۆ پەیدا بوو، خۆشی ژیانی لێ تێك چوو، هەموو ماڵ و سامانی دەرهێناو بەخشییەوە، وەسێتی کرد، تەنها ئاوو نانی دەخوارد تاچل ڕۆژەکە تەواو بوو مایەوە و نەمرد، مێردەکەی هاتەوە بۆ لای دکتۆر، ووتی ژنەکەم نەمردووە، پزیشکەکە ووتی:

ئەمزانی نامرێت، ئێستا لەگەڵیا دروست ببە، منداڵی دەبێت، ووتی: ئەمە چۆن دەبێت؟!

ووتی: بینیم زۆر قەڵەو بوو، بەز دەرگای منداڵ بوونی گرتبوو، زانیم کە لاواز نابێت و ئەو بەزە ناتوێتەوە مەگەر بە ترسان لە مردن، بۆیە منیش ترساندم، ئێستا چاك بووە و ڕێگری نەماوە لە بەردەم منداڵ بونی‌دا.

ئەم نمونەیە بێدارت دەکاتەوە لەسەر مەترسی هەندێك زانست، وە تێت دەگەێنێت واتای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((**نَعُوذُ باللّه مِنْ عِلْمٍ لا يَنفَع**))[1]

---

(١) رواه مسلم(٢٧٢٢).

واتە: ( پەنا دەگرم بە خودا لە زانستێک کە سوود نەگەیێنێت)، پەند لەم چیرۆکە وەربگرە و، زۆر مەگەڕێ بەدوای زانستێکدا شەرع زەممی کردبێت و نەهی لێ کردبێت، بەردەوام پابەندبە بە چاو لێ کردن لە صەحابەکان(خودایان لێ ڕازی بێت) تەنها شوێن سوننەت بکەوە، سەلامەتی لە شوێن کەوتندایە، مەترسیش لە گەڕان و کارکردنی سەربەخۆ دایە، زۆر شانازی مەکە بە ڕای خۆت و ئەوەی لای خۆت پەسەندە، بەڕێنیشاندانی خۆت و بەڵگەو گومانی خۆت مەکە لەوەی کە بڵێیت:

من بەدوای ڕاستی و بنج و بنەوانی شتەکاندا دەگەڕێم، وەك خۆیان بیانزانم، کەواتە چ زیانێکم لێ دەکەوێت کە من بەدوای عیلم دا بگەڕێم؟!

بەڕاستی ئەو زیانەی لەو کارەت بەسەرتا دەگەڕێتەوە، زۆر زیاترە لە سوودەکەی. چەندین شت هەیە کە لێی شارەزا دەبیت، ئەوەی کە زانیوتە دەبێتە زیانێکی گەورە بۆت، خەریکە لە دوا ڕۆژدا بەهیلاکتدا ببات، ئەگەر ڕەحمەتی خودا فریات نەکەوێت.

وەبزانە! وەك چۆن پزیشکێکی پسپۆر و شارەزا ئاگادارە لە نهێنی چەند جۆری چارەسەرکردن کە ناچێتە عەقڵی کەسانێکی نەشارەزاوە، هەروایش پێغەمبەران طەبیبی دڵەکانن، وە زاناکانیش بە هۆکارەکانی ژیانی دوارۆژ ئاگادارن، کەواتە بە تەنها عەقڵی خۆت حوکم مەدە بەسەر سوننەت و ڕێسای ئەواندا، کە وادەرنەچێت و بەهیلاکدا بچیت.

چەندین کەس هەن کە نەخۆشیەك ڕو لە پەنجەیان دەکات، بەپێی عەقڵی خۆی بێت دەبێ پەنجەی بهەنوێت و چەوری بکات و(بیبرێتەوە) تا پزیشکێکی لێزان ڕێنومایی دەکات، کە پێویستە لای شانی ئەولای بهەنوون، ئەویش ئەم چارەسەری دکتۆرە زۆر بەدوور دەزانێت، چونکە بێ ئاگایە لە وەی

که ڕەگەکانی جەستە پرش و بڵاون و جێگاو سەرچاوەکانیان کەسێکی شارەزا دەتوانێت بیاندۆزێتەوە، کە چ ڕەگێك پەیوەندی بە چ ئەندامێکەوە هەیە.

هەر بەم شێوەش (ڕێگەی دوارۆژ) هەموو کەس لێی شارەزا نییە جگە لە زاناکانی ئاخیرەت نەبێت.

لەبارەی وردەکاریەکانی سوننەتە شەرعیەکان و ئادابەکانی، وە لەو عەقیدەو باوەڕانەی کە پێویست کراوە لەسەر بەندەکان بیانزانن، چەندین وردەکاری و نهێنی و فەرمانی سەرسوڕهێنەری تێدایە، کە پەیوەندارانی ئەو کارو فەرمانەش لێی شارەزانین، بۆ نمونە:

کەسێکیش تا ئێستا هۆکاری ئەوەی نەزانیوە کە بۆچی موگناتیس ئاسن ڕادەکێشێت!

خۆ ئەو کارە سەرسوڕهێنەرو نامۆ و بێ وێنانەی کە پەیوەندارن بە عەقیدەو کردارەکانەوە، وە سوود بەخشن بۆ صەفای دڵەکان و پاك و پوختەکردنەوەیان بۆ ئەوەی بەرزببنەوەو نزیك ببنەوە لە خودای خۆیان، وە نەفەحات و فەزڵ و فیوضاتی خودایی بیانگرێتەوە، ئەوانە زۆرتر و گەورەترن لەو نهێنیانەی کە لەدەواو دەرمانەکاندا هەیە.

هەروەك چۆن بەتەنها ئەقڵ ناتوانێت هەست بە قازانج و سوودی دەرمانەکان بکات، وە پێویستی بە تاقی کردنەوە هەیە تا لێیان دڵنیا ببێت، هەروایش بزانە کە ئەقڵ ناتوانێت بزانێت چی سوودی پێ دەگەیێنێت بۆ ژیانی ئاخیرەت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگای تاقیکردنەوەیشت لەبەردەستدا نییە تا بەکاری بهێنیت، مەگەر هەندێك لە مردووەکانمان بۆ لا بگەڕانایەتەوەو تاقی کردنەوەیان لەسەر بکرایە، ئەو کات هەواڵیان پێ بدانایە، کەچ کارو کردارێك سوود بەخشەو، بەندە لە خوداوەندی خۆی بەخێرایی نزیك دەخاتەوە، وە بۆیشیان دەرئەخستین کە چی دووریان دەخاتەوە،

هەروەها دەربارەی عەقیدەکانیش، دیارە کەسیش تەماحی لەوەدا نییە لەڕێگەوە ئەو زانیاریانەی دەسبکەوێت.

بۆیە ئەوەندەت بەسە کە سوودت لە ئەقڵ وەرگرتبێت کە ڕێنومایی کردبیت بۆ ڕاستگۆیی حەزرەتی پێغەمبەر(ﷺ)، وە تێت بگەیەنێت لە هێماو ئیشارەتەکانی کە کێ و چی دەگرێتەوە.

کەواتە عەقڵ بخەرە کەنارەوە، بابەسەر بەخۆیی دەست وەرنەداتە هەموو فەرمانێکەوە، وای لێ بکە کە تەنها شوێن کەوتووبێت، تەنها بەم شێوە سەلامەت دەبێت.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((إنَّ مِنَ العِلمِ جَهلاً وإنَّ مِنَ القَولِ عِيًا))**[1]

واتە:( هەندێك لە زانست چونکە لەو بەشەیە کە نەهی لێ کراوەو ناپەسەندە، ئەوە نەزانینەکەی چاکترە لەو زانینە، وەهەندێك قسەش هەیە گرانەو دەبێت بە بار بەسەر قسەکەردا).

یان بۆ زاناکان مەلەل و ماندووبون و بێ تاقەتی دروست دەکات یان بۆ نەخویندەوار کە لێی تێناگات ماندوی دەکات.[2]

ئاشکرایە کە زانست بۆ خۆی ناکرێت بەراوردبکرێت لەگەڵ جەهل و نەزانیندا بەڵام چۆن نەزانین و نەزاندویی زیان بەخشە، ئەویش ئاوا زیان دەدات.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

---

(١) رواه أبوداود (٥٠١٢)من حديث بريدة، وفي إسناده يُجهل.[ قال الزبيدي ٢٢٩/١: أخرجه أبو داوود بلفظ (عيالا) بدل عيا، وفي القوت ٢٢٧/١، وروينا في خبر: وذكره، ]

(٢) وەك حافظی مەناوی لە (التيسير) دا(٣٤٥/١) ڕاڤەی کردووە. عەیال: بەوەش دەڵێن: کە نەزانێت ڕو لە کوێ بکات.

**((قليلٌ مِنَ التَّوفيق خَيرٌ مِن كَثيرٍ مِنَ العِلم))**[1] واته:

( کەمێ لە سازان و کار ئاسانی خودایی، باشترە لە زۆرێك لە زانست).

هەروەها حەزرەتی عیسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:

**((ما أكثَرَ الشَّجَرِ وليْسَ كُلُّها بمُثمرٍ وما أكثَرَ الثَّمرِ وليسَ كُلُّها بطَيِّب، وما أكثَرَ العُلومَ ولَيسَ كلُّها بِنافِعِ))**[2]

واته:

( ئای کە درەختەکان زۆرن و هەموشیان بەردارنین، بەردارەکانیش زۆرن بەڵام هەموویان بۆن خۆش و پاك نین، ئای کە زانستەکانیش زۆرن بەڵام هەموویان سوود بەخش نین..

---

(١) كذا أورده صاحب القوت(١/١٣١) بقوله: وفي الخبر الآخر و ذكره، المصنف تبعه على ذلك، و بنحوه رواه ابن عساكر في (تأريخ دمشق) (٦٠/٣٤٨) بلفظ: **قليل التوفيق خير من كثير العقل**. قال الزبيدي وأخرجه ابن عساكرفي تأريخ دمشق،٦٠/٣٤٩، عن أبي الدرداء بمثل ما في الفردوس، وزاد: **والعقلُ في أمرِ الدنيا حُقرةٌ، والعقلُ في أمرِ الدينِ مسرَّة**. وروى الطبراني في الأوسط، ٧/٣٠٢(٨٦٩٨(، عن ابن عمر: **قليل الفقيه خيرٌ من كثير العبادة، وكفى بالمرء فقهاً إذا عبدالله، وكفى بالمرء جهلاً إذا أعجبَ برأيهِ**.

وأورده ابن عبدالبر كذلك في العلم١/٢١]

(٢) رواه الخطيب فى أقتضاء العلم و العمل(٦٨)(١٠٦) بلفظ:

**ويلكُم يا عبيدَ الدنيا، ماذا يغنى عن الأعمى سعة نور الشمس و هو لا يبصرها؟! كذلك لا يغنى عن العالم كثرة علمه إذا لم يعمَل به، ما أكثر أثمار الشجر و ليس كلها ينفع، ولا يؤكل!! و ما أكثر العلماء و ليس كلهم ينتفع فما علم ...**) و أورده بلفظه الزمخشرى في ربيع الأبرار(٤/١٢٣).

# ڕونکردنەوەی ئەو وشە گشتییانەی کە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە

هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو تێکەڵ بوونەی لە میانی زانستە زەمکراوو زانستە شەرعیەکاندا هەیە، دەسکاری کردنی ناوە پەسەندکراوەکانەو گۆڕینیانە بە ناوێکی تر، وە لەبەرمەبەستێکی نادروست ناوەکان واتایەکی تریان بۆ دابنێن، جیاواز لەو واتاو مەبەستانەی کە پێشینە خوداناسەکانی سەدەی یەکەم بۆیان داناوە و لێکیان داوەتەوە، ئەمەش پێنج وشەیە: الفقه(تێگەیشتن لە دین)، العلم (زانست)، التوحید (یەکتاپەرستی) زانستی کەلام، التذکیر (یادو بیر خستنەوە) الحکمة (پەندیاری). ئەم ناوانە بۆ خۆیان پەسەندو شیاون، خاوەن پلە و پایەن لە دیندا، ئەوانەن بە یەکێك لەم صیفەتانە پێناسە دەکرێن، بەڵام ئێستا گوازراونەتەوە بۆ چەندین واتای نابەجێ، کە دڵەکان دەتەکێنەوە لە خراپی ئەو کەسانەی کە ئەو واتا زەمکراوانەیان پێوە لکاوەو بۆتە صیفەت بۆیان، چونکە بەوناوانە ناوبانگیان بڵاوبۆتەوە.

## وشەی یەکەم: الفقه (تێگەیشتن لە دین):

دەسکاری ئەم ناوەیان بە(تەخصیص)[1]وتایبەتمەندێتی کردوە، نەك بە گواستنەوە و هێنانی وشەیەکی تر. چونکە تایبەتییان کردووە بە زانینی کۆمەڵێ

---

(١) تەخصیص: وشەیەك کە واتایەکی عام و گشتگیری هەبێت، تایبەتی بکەیت بە هەندێك لە بەش و ئەفرادەکانی، بەبەڵگەیەکی سەربەخۆ کە لکابێت پێ یەوە.

لێرەشدا تەخصیص مەبەستی ئەوەیە:

لە کۆی ئەو واتاو ئامانج و مەبەستانەی ك لەفزەکە دەیگرێتەوە تۆ داینەبڕیت بەسەر هەندێکیدا، کە حەزرەتی غەزالی هێمای بۆ کردوە.وەرگێر

لق و پۆی نامۆ لە فەتواکاندا، وەگەڕان بە دوای وردەکاری عیللەت و هــۆکاری ئەو فتوایانە، وە قسەی زۆریان لە سەر هێناوەتەوە، هەموو بابەتە پەیوەندارەکانیان پاراستووەو کۆیان کردۆتەوەو، هەر کەسێکیش لە هەمووان زیاتر ڕۆچوبێت لەو بابەت و وردەکاری و(کونەقەیدا)نەدا کە خۆیی پێوە خەریك کردبێت، ئەوە لە هەمووان بە (فەقیە) تر، واتە: (أفقە) و شارەزاتر ناسراوە.

بەڕاستی وشەی(فەقیە) لەچەرخی یەکەمدا بەوانە دەوترا کە زانای عیلمی ئاخیرەت بوون، وەشارەزا بوون لەوردەکاری و ئافەتەکانی نەفس و ئەوئافەتانەی کردەوە چاکەکان پوچەڵ دەکەنەوەو، زیاتر بێ نرخی و ڕیسوایی دونیایان بۆ ئاشکرا بوبێت، وە بەتوندتر خۆیان ئامادە کردبێت بۆ گەیشتن بە نیعمەتەکانی دوارۆژ، بەشێوەیەکیش کە ترس و خۆف زاڵ بوبێت بەسەر دڵیاندا، بەڵگەش بۆ ئەم پێناسەیە فەرموودەی خودایە(ﷻ):

﴿لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ ﴾التوبة ١٢٢

واتە: (کەواتە دەبێت ئەو کۆمەڵە لە دین تێ بگەن و شارەزابن، وە کاتێك گەڕانەوە بۆ ناو هۆزەکەیان ئاگاداریان بکەنەوەو هەڕەشەیان لێ بکەن).

بە عیلمی(فیقە) دەتوانیت خەڵکیی لێ ئاگادار بکەیتەوەو بیانترسێنیت بە سزای خودایی، نەك بە لقەکانی ئەم زانستە، وەك: طەلاق و ئازادکردن و لیعان و سەلەم و بەکرێ دان و هاوشێوەکانیان، چونکە ئەو بابەتانە هیچ هەڕەشەو ترساندنێکیان پێ ناکرێت، بەڵکو ئەگەر خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆیان، دڵی ڕەق دەکات و ترس و خۆفی تێدا هەڵدەگرێت، وەك چۆن کەسانی ئەمڕۆ دەبینین کە تەنها خۆیان بە وردەکارییە بێ بەهاکانەوە خەریك کردووە، خـودای تەعالایش فەرمویەتی: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾الأعراف/١٧٩.

مەبەستی واتا ئیمانیەکانە کە لێی تێ ناگەن، نەك مەسەلەی فتوادان...

سوێند بێ! (فیقە) و فەهم( تێگەیشتن) لە زمانەوانیدا دوو ناون بۆ یەك واتا،

له کۆن و نوێدا که ئەم وشەانە بە عادەت بەکار هێنراوە، ئەوەمان مەبەستە کە خودا فەرموویەتی: ﴿**لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ**﴾الحشر/١٣. واتە: (بێ گومان ئەوان دڵیان لە ئێوە بتر دەترسێت تا لەخودا، چونکە ئەوان کەسانێکی وان کە تێ ناگەن).[1]

بەهۆی کەمی تێگەیشتنیان لە دین، ترسیان کەم بۆتەوە لە خوداو، ترس و بیمیان لە خەڵکی زاڵ بووە بەسەریاندا، کەواتە بنوارە:

ئایا ئەو حاڵەتەی پێی گەیشتوون بەهۆی ئەوەوەیە کە بەش و لقەکانی فتواو وردەکاریەکانیان لەبەر نەکردووە، یان لە ئەنجامی ئەوەوە دێت کە باسمان کردو لە عیلمی ئاخیرەت حاڵی نەبوون.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((**عُلماءٌ، حُكماءٌ، فُقَهاء**))[2]بەرامبەر ئەو وەفدەی کە هاتن بۆ خزمەتی فەرمووی:

ئەوانە زانان ، پەندیارو دانان ، تێگەیشتوون لە دین.

پرسیاریان کرد لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمی زوهەری: ئەهلی کام شار لە هەمووان فەقهیو تێگەیشتوترن لە دین، فەرمووی:

ئەوانەی لە هەمووان زیاترلە خودا دەترسن.[3]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((أَلاَ أُنبِّئُكُم بالفَقيهِ كُلَّ الفَقيه، قالُوا بلَى. قال: مَن لَم يُقَنِّطِ النّاسَ مِن رَحمَةِ الله، ولمْ يُؤَمِّنهُم مِن مَكرِ الله، ولَم يُؤْيِسْهُم مِن رَوحِ الله، ولَم يَدَعِ القُرآنَ رَغبَةً عَنهُ إلى ما سِواهُ))**[1]

---

(١) قورئانی پیرۆز وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار ٥٤٧.

(٢) رواه أبو نعيم في(الحلية)(٢٧٩/٩) و ابن عساكر في(تأريخ دمشق)(٢٠٠/٤) بلفظ (**علماء حكماء فقهاء كادو مِن صِدقهم أن يكونوا أنبياء**).

(٣) قوت القلوب(١٣٨/١).

واته: ( ئایا هەواڵتان پێ بدەم بەوەی کە لە دین حاڵی بووە و لە هەموو کەس شارەزاترە؟ ووتیان: بەڵێ، فەرمووی:

کەسێکە خەڵکی بێ بەش و بێ هیوانەکات لەڕەحمەتی خودا، وە ئەمینیان نەکاتەوە لەمەکرو تۆڵەی خودا، وەمەئیوس یان نەکات لەڕەحمەتی خودا (کە ناڕەحەتیەکانیان لەسەر هەڵناگرێت) وە واز لە قورئان نەهێنێت بەشێوەیەك کە کاری پێی نەمێنێت و ڕو لە غەیری قورئان بکات).

کاتێك ئەنەسی کوڕی مالیك(خودای لێ ڕازی بێت) ئەم فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ)ی گێڕایەوە:

**((لأَن أَقعُد مَع قَومٍ يَذكُرونَ اللهَ تَعالَى مِنْ غَدوَةٍ إِلَى طُلوعِ الشَّمسِ أحَبُّ إلَيَّ مِنْ أَن أَعتِقَ أَربعَ رِقاب))**[٢]

واته: ( ئەگەر لە بەرەبەیانەوە تا خۆر کەوتن لەگەڵ کۆمەڵێکدا دابنیشم زیکری خودا بکەن(ﷻ) باشترە لەلام کە چوار گەردن ئازاد بکەم).

دەفەرموێت: لای کردەوە بەلای زەیدی رەققاشی و زیادی نومەیری داو

---

(١) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم٢/٤٤(١٥١٠) مرفوعا و هو في(سنن الدرامي)(٣٠٥) ورواه أبوبكر بن لال في مكارم الأخلاق، وأبوبر بن السني في رياضة المتعلمين وغيره وقال ابن عبدالبر أكثرهم يوقفونه على علي ابن طالب(رضي الله عنه). [قال الزبيدي١/٢٣٣: وفي رواية الثلاثة تقديم: لم يؤيسهم علي (لم يؤمنهم، مع زيادة في آخره وهي: **أَلا لاخيرَ في عبادةٍ لَيس فيها تفقهٌ، ولا في علم ليس فيها تفهمٌ، ولا في قراءة ليس فيها تدبُرٌ**، وهكذا هو في الفردوس ١/١٣٥(٤٧٤) بتلك الزيادة]

(٢) راه أبو داود (٣٦٦٧). باب القصص بإسناد حسن. [وقال الزبيدي(١/٢٣٣). تبع المصنف صاحب القوت في السياق، والحافظ العراقي سكت عليه، وعزّاه بهذا السياق إلى أبي داود، ورواه أيضاً أبو نعيم في المعرفة، ١/٢٣٨.(٨٢٨) والبيهقي في السنن، ٨/١٥(٧٣٨٣٨) والضياء المقدسي في المختارة، ٧/٣٢(٢٤١٨) كلهم عن أنس، .........]

فەرمووی: دانیشتنەکانی زیکری ئێمە وەك مەجلیسی زیکرەکانی ئێوە نەبوو، کە یەکێکتان هەڵدەستێ و چیرۆك و بەسەرهاتیان بۆ ئەگێڕێتەوە و ووتاریان بۆ ئەدات، قسەکان درێژ دەکاتەوەو دەیانداتە دەم یەك، بەڵکو ئێمە حاڵمان وابوو کە دادەنیشتین زیکرو یادی ئیمانمان دەکرد، بیرمان لە واتاکانی قورئان دەکردەوە، خۆمان لە دین شارەزا دەکرد، وە نیعمەتەکانی خودامان بەیاد دەکردەوە کە لە ژماردن نایەن.[1]

کەواتە بیرکردنەوەو تێڕامان لە قورئان و ژماردنی نیعمەتەکانی بە(فیقە) و تێگەیشتن لە دینی داناوە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ): فەرموویەتی: ((**لا يَفقهُ العَبدُ كُلَّ الفِقهِ حَتَّى يَمقُتَ النَّاسَ فِي ذاتِ اللهِ، وحَتَّى يَرىَ لِلقُرآنِ وُجُوهاً كَثِيرَةً**)) واتە:

(بەندەی خودا کاتێك لە دین تێ دەگات و بەتەواوی لێی حاڵی دەبێت، کە لە پێناوی خودادا ڕقی لە خەڵکی خراپ ببێتەوە، وە دەبێ بۆ واتای قورئان چەندین ڕێگاو مانای تر ببینێتەوە.)

وە هەروەها ئەم فەرموودەیە لە ڕێگەی ئەبوو دەردائەوە (خودای لێ ڕازی بێت) بە(موقوف) ی هاتووە، واتە بەرزنەکراوەتەوە کە فەرموویەتی: لە پاشان ڕو بکاتە نەفسی خۆی و بە هەمو توانا سەرزەنشت و سەرکۆنەی بکات.[2]

فەرقەدی سەبەخی پرسیاری لە حەسەنی بەصری کرد لە شتێک، وەڵامی دایەوە، ئەویش وتی: فەقیهەکان ڕایان جیاوازە لەگەڵ تۆدا.

حەسەن فەرمووی: دایکت لەبارت ببات ئەی(فورەیقید)!!

ئایا فەقیهێکی ڕاستەقینەت بینیوە،(فەقیە) تەنها ئەو زانایەیە کە زاهیدو دونیا

---

(١) قوت القلوب(١/ ١٥٠).

(٢) رواه ابن عبدالبر في(جامع بيان العلم (١٥١٥- ١٥١٦) مرفوعا و موقوفا. على أبي الدرداء.

نەویست بێت، دڵی بۆ لای دوارۆژ بڕوات و ، چاوی دڵی لەبارەی دینەکەیەوە کراوەبێت، بەردەوام بێت لەسەر عیبادەت و خۆپارێز بێت و، وازی هێنابێت لە باس کردنی شەرەف و ناموسی موسوڵمانان و، دەست ڕانەکێشێت بۆ ماڵەکانیان و ئامۆژگاری تێکڕایان بکات[1] (هانیان بدات بەیەکەوە بمێننەوە).

وەك دەبینیت لە هەموو ئەو مەرج و باسانەدا هێمای بۆ ئەوە نەکردووە کە پێویستە: فروع و مەسەلە وردەکاریەکانی فەتوادانیشی لەبەر بێت.

منیش نەمووتووە ناوی (فیقە) ئەو جۆرە فەتواو ئەحکامە زاهیرانە ناگرێتەوە، بەڵام بەشێوەی گشتگیری و جێبونەوە لە ناویدا، یان لە ڕێگەی شوێن کەوتن

(واتە: عیلمی فتوا تابیع و شوێن کەوتەی باقی زانستەکانی ئاخیرەت بێت).[2]

بۆیە زیاتر ناوی(فیقە) یان ببردایە، دایان ئەبڕی بەسەر عیلمی ئاخیرەتدا.

لەم تایبەتمەندی‌یەوە جۆرە تێکەڵ کردنێك ڕوی دا، وای لە خەڵکەکە کرد کە خۆیانی بۆ یەکلابکەنەوە، وە پشت بکەنە زانستی دوارۆژ و ئەحکامەکانی دڵ، لە سروشتی خۆیانەوە یارمەتی و هاوکاریان بینی، چونکە (عیلمی باطین) نادیار و شاراوەیە، کار پێ کردنیشی ئاسان نی‌یە، بەهۆی ئەم عیلمەشەوە ناتوانن دەستیان بگات بە کورسی و ویلایەت و قەزاوەت و شکۆمەندی و ماڵ و سامان.

شەیتانیش ئەم بابەتەی زیاتر لە دڵدا جوان کردوون و ناوی( فیقە) ی لە واتاو ناوەرۆکە گشتی‌یەکەی دابڕیوە و، تایبەتیشی کردووە بەو کەسانەی کە وابیر دەکەنەوە، ئەم ناوەش لە شەرعدا پەسەندکراوەو (ئامانجی خۆیانیان لێ پێکاوە)

---

(١) قوت القلوب(١/١٥٠).

(٢) إتحاف(١/٢٣٥).

## وشەی دووهەم: زانست (العلم):

کاتی خۆی باسی زانست بکرایە، تەنها دابڕابوو بەسەر زانین بەخودای گەورە و ئایەتەکانی، وە ناسینی کردارەکانی لە ناو بەندەو دروستکراوەکانیدا، بۆیە کاتێك کە حەزرەتی عومەر(خودای لێ ڕازی بێ) وەفاتی کرد.. عبدوڵلای کوڕی مەسعود(خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموی:

نۆ لەسەر دەی زانستی مرد، ئەلفولامی خستە سەر عیلم (العلم) بۆ ئەوەی بیناسێنێت، لە پاشان بەوە لێکی دایەوە کە مەبەستی (**العِلْمُ باللّه**) بووە وەك باسمانکرد، کە دەسکاریەکی تری عیلمیان کردو، ئەوەندەی تر بەرتەسکیان کردۆتەوە، کە زیاتر ئەوانە بگرێتەوە خەریکی دەمەدەمێ و باس کردنی پرسەو ڕا خیلافیەکانن لەگەڵ ڕکە بەرەکانیان، بەوانە دەڵێن:

زانای حەقیقی، نێرە پیاوی زانست.

ئەوەیش کە خەریکی ئەو دەمەقاڵێ و کێبڕکێ یە نەبێت، بەلاوزو ترسنۆکیان دادەنێن. بەڵام لەڕاستیدا ئەو باس و خواسانەی لەسەر فەزڵ و گەورەیی عیلم و زاناکان هاتووە، زۆربەیان ئەوانە دەگرێتەوە کە(خوداناس و زانان بەخودا) وە زانان بە ئەحکام و کردار و صیفەتەکانی(ﷻ).

بەڵام مخابن ئێستا عیلم دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی کە (گەمارۆی زانستیە شەرعیەکانیان نەداوە) بەڵکو تەنها لە هەندێك ڕێسای جەدەل و پرسی جیاوازو شارەزایی لە دەمەدەمێ کردندا بەرندەن، ئەوانە بەزانا هەرە گەورەکان دادەنرێن، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەزانن بەرامبەر عیلمی تەفسیرو فەرمووده و زاسنتی مەزهەب و زۆری تریش.

ئەمەش هۆکارێکی نەخوازراوە کە خەڵکێکی زۆری فێرخوازی تووشی لەڕێلادان و سەرگەردانی کردووە.

# وشەی سێیەم: التوحید(عیلمی کەلام)

ئێستا وشەی تەوحید لەبەرامبەر عیلمی کەلامدایە، کە چۆن شارەزابێت لە بەڵگە هێنانەوە و قسە بە زۆراندن و دەمەقاڵێ و بەرپەرچدانەوەی ڕکابەرەکەت. وەتوانای داڕشتنی دەستەواژەی قەڵەوت هەبێت، لە ڕێگەی زۆر پرسیار کردن و گومان دروست کردن و کۆسپ و تەگەرە خستنە سەر ڕێگای بابەتەکە، تا هەندێکیان نازناویان لە خۆیان ناوە (ئەهلی عەدل و تەوحید)[1] .

ئەوانەی قسە زان و عولەمای کەلامن ناونراون بە :

زانایانی تەوحید، لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو ئەو تایبەتمەندیانەی ئەم کۆمەڵەی پێ ناسراوە، لە چەرخی یەکەمدا باس لە هیچی نەدەکرا، بەڵکو زۆر بە توندی نارەزاییان دەردەبڕی بەرامبەر کەسێک کە دەرگای دەمەقاڵێ و کێ برکێ بکاتەوە. بەڵام ئەو بەڵگە ئاشکراو دەمکوتکەرانەی کە زاهیری قورئانی پیرۆز دەیانگرێتەوە، کە مێشکی مرۆڤ هەر بە بیستنیان خێرایە لە وەرگرتنیان، ئەوە بۆ هەموان ڕون و ئاشکرابوو.

ئەوەی قورئانی بەچاکی بزانیایە، مانای وایە هەموو زانستەکانی زانیوە، بەلای ئەوانەوە تەوحید بریتی‌یە لە شتێکی تر ، کە زۆربەی زانایانی عیلمی کەلام لێی تێ ناگەن، ئەگەر تێیشی بگەن تیایاندا نەهاتۆتە دی، ئەویش ئەوەیە:

**تەوحید:** واتە: هەموو فەرمانەکانی تەنها لە خوداوە ببینێت، بەشیوەیەك ڕێگری لێ بکات کەلا بەلای هیچ هۆکارو دەلیلێك بکاتەوە، هیچ خێرو شەڕێك نابینێت لە غەیری خوداوە(ﷻ)[2] ئەمەش پایەیەکی بەرزو پیرۆزە.

---

(١) ئەمەش کۆمەڵی موعتەزیلەن کەوا لە خۆیان گەیشتوون.

(٢) ئەمەش بەرزترین پلەی یەکتاپەرستەکانە، کە سالیکی ڕێگای ئاخیرەتن و ئەهلی محەببەت و عیلمی لەدوننین، دوا پلەی نزدیکی‌یان بڕبوە بۆ حزوری پەروەردگاریان.

یەکێك لە بەرهەمەکانی ئەوەیە: کە تەوەککول پەیدا دەکات، وەك چۆن لە کیتابی تەوەککول دا باسی دەکرێت.

وەیەکێکی تر لەبەرهەمەکانی ئەوەیە: کە واز دەهێنن لە سکاڵا بردن بۆ لای خەڵک، یان تورەبوون لێیان، وە ڕازی دەبن و هەمیشە فەرمانبەرداری حوکمی خودای خۆیان دەبن.

یەکێکی تر لە بەرهەمەکانی فەرموودەکەی حەزرەتی ئەبوبەکری صددیق بوو(خودای لێ ڕازی بێ) کاتێك لە نەخۆشیەکەیدا پێیان ووت: ئەرێ دکتۆرت بۆ بانگ نەکەین؟ فەرمووی: دکتۆر بۆ خۆی نەخۆشی خستووم.[1]

فەرموودەیەکی تر کاتێك کە لێیان پرسی لە نەخۆشیدا: پزیشکەکە چی پێ ووتی لە نەخۆشیەکەتدا، فەرمووی: پێی ووتم:

(( إني فَعَّالٌ لِمَا أُرِيدُ))...

(کەواتە پزیشکەکە خودایە و ئەویشی نەخۆش خستووەو پێشی دەڵێت: من بە ئارەزوی خۆم دەکەم..)[2] بەڵگەی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە لە کیتابی(توکل) دادێت.

---

(١) ئەم ووتەیە دراوەتە پاڵ زۆرکەس لە صەحابە. ڕاویەکان داویانەتە پاڵ حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(خوای لێ ڕازی بێت): (کما روی البیهقي في الشعب) ٢٢٦٧.[و قال الزبیدی(٢٣٧/١): القول الأخیر(قال إني فعَّالٌ لِما أُرید) هو المروي الثابت عن حضرة الصدِّیق، أخرجه أبو نعیم في الحلیة٣٤/١، وأما القول الأول فلم أره لحضرة الصدیق، وقد أخرجه البیهقي في الشعب ٤٩١/٢(٢٤٩٧) وابن عبدالبر في التمهید،٢٦٩/٥.وأخرج أبو نعیم في الحلیة ٢١٨/١، حدثنا معاویة بن قرة أن أبا الدرداء إشتکى فدخل علیه أصحابه، فقالوا: ما تشتکي؟ قال: أشتکي ذنوبي، قالوا: فَما تشتَهي؟ قال: أشتَهي الجنة، قالوا: أولا نَدعو لكَ جَلیساً؟ قال: هوَ أَفجَعني.]

(٢) رواه أبو نعیم في حلیة الأولیاء(٣٤/١).

## بەڕاستی عیلمی تەوحید گەوهەرێکی زۆر بەنرخە،

## دوو توێکڵیشی هەیە:

یەکێکیان لە کاکڵەکەی دوورترە لەویان، ئیتر خەڵکەکە ناوەکەیان دابڕی بەسەر ئەم توێکڵە دووهەمەدا، کە پاسەوانی کاکڵەکە دەکات، وە هیچ خەمیان بۆ کرۆک و کاکڵە سەرەکییەکە نەخواردووە.

***توێکڵی یەکەم:*** ئەوەیە بە زوبانت بڵێیت: ( لا إلهَ إلاَّ اللهِ) ئەمە بە تەوحید و یەکتاپەرستی ناودەبرێت و عەقیدەی(تَثليثْ)سیانیەکە بەتاڵ دەکاتەوە کە گاورەکان باوەڕیان پێیەتی. بەڵام جاری واهەیە ئەم ووتەی یەکتاپەرستی‌یە مونافق و دوڕوویەکیش دەیڵێت کە بڕوای شاراوەی پێچەوانەی ئەوەیە کە ئاشکرای دەکات.

***توێکڵی دووهەم:*** نابێت لە دڵدا پێچەوانەی ئەم وتەیەی تێدا بێت یان ئینکاری بکات. بەڵکو ڕواڵەتی دڵەکەی وابگەێنێت کە ڕازیبە بەو عەقیدەیەو دانی پیادا ناوەو لەسەریەتی، ئەمەش پێی دەوترێت تەوحیدی عەوام و نەخوێندەوارەکانی تێکڕای خەڵك.

زاناکانی عیلمی کەلامیش وەك(باسیان کرا) دەبنە پاسەوانی ئەو توێکڵە (دژ بەو گومان و هانی هانیەی کە ئەهلی بیدعە دەینێنەوەو سازی دەکەن).

***سێیەم کاکڵە:*** ئەو کەسەیە کە هەموو فەرمانەکان تەنها لە خوداوە بیانبینێت، لا بەلای هیچ وەسیلە و هۆکارێکدا نەکاتەوە ، تەنها بەندایەتی بۆ خودا بکات و کەس نەکاتە هاوبەش، لەم یەکتاپەرسی‌یەدا ئەوانە ناگرێتەوە کە شوێن هەوا و ئارەزوات دەکەون، ئەوەی شوێن ئارەزواتی کەوتبێت، ئەوا دەبێتە هەواپەرست وەك خـودای گـەورە فەرمویەتی: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ

هَوَاهُ﴾الجاثية واتە: ( نابینی ئەوانە هەوڵو ئارەزواتی خۆیانیان کردووە بە پەرستراوو بەندایەتی بۆ دەکەن.) هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ): فەرمویەتی:

((أَبغَضُ إلهٍ عُبِدَ فِي الأرضِ عِندَ الله تعَالى هُو الهَوَى))[1] بەڕاستی هەرکەسێك باش سەرنج بدات، دەزانێت کە بتپەرست ئەوەنیيە کە بەندایەتی بۆ بتەکان دەکات، بەڵکو لە ڕاستیدا هەواو ئارەزواتی خۆی دەپەرستێت، چونکە نەفسەکەیەتی کە رایدەکێشێت بۆ لای دینی باب و باپیری، ئەویش شوێنی ئەو مەیلە دەکەوێت، مەیلی نەفسیش بۆ ئەو شتانەی کە لەسەری ڕاهاتووە، یەکێکە لەو واتایانەی کە بەهەواو ئەرەزوات لێك دەدرێتەوە.

ئەوانەش لەو ڕیزی تەوحیدەدا جێگایان نابێتەوە، کە لە خەڵکی توڕە دەبن و تەماداری دەستیانن و لایان بەلادا دەکەنەوە، چونکە ئەوەی هەموو فەرمان و کردارەکان بەتەواوی لە خوداوەی ببینێت، چۆن ڕقی لە خەڵکی دەبێتەوە، یان لێیان توڕە دەبێت؟! کاتی خۆی یەکتاپەرستی بریتی بوو لەم پایەو مقامانە کە باسمان کرد، کە لە پلەو پایەی صددیقەکانە. بنواڕە ناوی(عیلم) بە چ لایەکدا سوڕاندیان و بەچ توێکڵێك قایل بوون و، چۆن کرایە پەناگەیەکی بەهێز بۆ سەناو ستایش و خۆ هەڵکێشان بەشتێک کە ناوەکەی(مەحمود) و پەسەندکراوە، بەڵام ناوەرۆکەکەی خاڵیيە لە هەموو واتایەك کە شیاوی ئەوە بێت بەڕاستی پەسەند کراو بێت. ئەمەش وەك مایە پووچی کەسێکە لە بەرەبایاندا هەڵدەستێت و ڕوو لە قیبلە دەکات و دەڵێت: [ وَجَّهْتُ وَجْهِيَ

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في (السنة) و الطبراني في (الكبير)(١٠٣/٨)(٧٥٠٢) بنحوه من حديث أبي إمامة بسند ضعيف. [قال الزبيدي٢٣٨/١: ورواه أبو نعيم في الحلية ١١٨/٦، من رِواية بقية، عن عيسى بن إبراهيم، عن راشد وعيسى متروكٌ]

**لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ حَنِيفًا]** ئەمەش یەکەم درۆیە لەسەری تۆمار دەکرێت، کە هەموو ڕۆژێك دەرگای قسەکردن لە گەڵ خودادا بەوە دەکاتەوە (کە ئەوا ڕوم کردە خالیقی ئەم بونەوەرە) ئەگەر بەتایبەتی ڕوی دڵی نەکردبێتە خوداوەندی مەزنەوە، ئەوە بەدرۆ لەسەری دەنوسرێت، ئەگەر مەبەستی ڕوگەی زاهیری بێت، ئەوا بەڕواڵەت ڕوی لە کەعبەکردووە، کەواتە ڕوی لەلایەنەکانی تری مەککە نەکردووە، دەی خۆ کەعبە نابێتە جیهەت و لایەك بۆ زاتێك کە زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە، تا ئەو کەسەی ڕوی لە دیواری کەعبەبێت ڕوی لە خودا کردبێت، خودا لەوە بەرزو مەزنترە کە جێگاو لایەن و شوێنەکان بیگرێتەوە. وە ئەگەر مەبەستیشی ئەوەبێت و بڵێیت:

ئەوا ڕوی دڵم کردە خوداوە، کە تەنها ئەمەیان لێ داوا دەکرێت لە بەندایەتیدا، دەی چۆن قسەکەی بەڕاست دادەنرێت، کە دڵی خەریکە بە پێویستی و کارە دونیاییەکانیەوە، وە بەدوای پلەی ئەوەدا دەگەڕێت کە چۆن ماڵ و شکۆ و جاهی دەست بکەوێت و، هۆکاری وەدەستهێنانیان زیاد بکات و، بەتەواوی ڕوی دڵی بکاتە ئەو خواستە دونیاییانە، ئیتر چۆن ڕاست دەکات کە بڵێت: ئەوا ڕوم کردە ئەو زاتەی کە ئەرزو ئاسمانەکانی دروست کردووە؟!

ئەم ووتەیە خەبەر و هەواڵدانێکە لە حەقیقەتی یەکتاپەرستی، چونکە یەکتاپەرستی ڕاستەقینە دەبێت کەس نەبینێت جگە لە خودای تاك و تەنها نەبێت، ڕوی دڵی تەنها بەلای ئەودا بێت، ئەو فەرمانە جێ بەجێ بکات کە خودا فەرمویەتی: ﴿**قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ**﴾الأنعام ٩١.

مەبەست ئەوە نییە بە زوبان بڵێت ئەڵلاه، بەڵکو زوبان تەرجومانی دڵە، هەندێك کات ڕاست دەکات (کەلە دڵەوە بێت) هەندێك جاریش درۆ دەکات، خودای گەورەش سەیری زوبان ناکات، بەڵکو سەیری دڵ دەکات کە زوبان تەعبیر لەو بداتەوە، کە دڵ کانگاو سەرچاوەی تەوحیدو یەکتاپەرستییە.

## وشەی چوارەم: یادو بیرخستەنەوە:

بەڕاستی خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾الذاريات/٥٥. واتە: ( تۆ هەر بیریان بخەرەوە، بیرەوەری بەهرە دەدات بەوانەی خاوەن باوەڕن[١] لە بارەی ستایش کردنی مەجلیسی زیکرەوە چەندین فەرمودەی لەسەر هاتووە: وەك دەفەرمووێت(ﷺ): (( إذا مَرَرْتُم بِرِياضِ الجَنَّةِ فارْتَعُوا)) قيل وما رياضُ الجَنَّة؟ قال: (( مَجالِسُ الذِّكرِ))[٢]واتە:

( ئەگەر داتان بەلای باخچەی بەهەشتدا ئەوا لابدەن و لێی بەهرەمەندبن، ووتیان باخچەی بەهەشت کامەیە؟ فەرمووی(ﷺ): حەلقەی زیکرە...[٣]

لە فەرموودەشدا هاتووە: ((إنَّ للهِ تَعالَى مَلائِكَةً سَيَّاحِينَ في الدُّنيا سِوَى مَلائِكَة الخَلقِ، إذا رأَوامَجالِسَ الذِّكرِ يُنادِي بَعْضُهُم بَعضاً،ألاَ هَلمُّوا إلَى بُغيَتِكُم،فيأتُونَهُم ويَحُفُّونَ بِهِم ويَسْتَمِعُونَ، ألاَ فاذكُروا اللهَ وَذَكِّرُوا أنفُسَكُم))[٤] واتە: ( خودای گەورە فریشتەی گەڕۆکی هەیە بە هەوادا دێن و دەچن،جگە لە فریشتەکانی ناو خەڵك، ئەوانە ئەگەر دانیشتنی زیکر ببینن، هەندێکیان ئەوانی تر بانگ دەکەن، وەرن ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێن لێرەیە، ئەوانیش دێن و چوار دەوریان لێ دەگرن و دەست دەکەن بەگوێ گرتن لێیان، کەواتە: دەی ئێوەش زیکری خودا بکەن و وە بیری خۆتانی بهێننەوە و لێی غافڵ مەبن. ئەم جۆرە زیکرە لەم چەرخەدا گۆڕا بەوەی کە زۆربەی واعیزەکان بەردەوامن لەسەری،ئەویش (چیرۆك و شیعر وشەطەحاتی صۆفی و طامّاتە، واتە: ((بەڵاو موصیبەتەکان))

---

(١) قورنانی پیرۆز مامۆستا هەژار ٥٢٣ سورة الذاريات

(٢) رواه الترمذي(٣٥١٠).

(٣) فارتعوا واتە: بلەوەڕێن، لادان و بەهرەمەندی لە مەجالیسی زیکردا ئەوەیە کە بڵێت: سبحان الله و الحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبر. إتحاف(١/٢٤٠).

(٤) رواه البخاري(٦٤٠٨) و مسلم(٢٦٨٩) بنحوه.

# باسی چیرۆك و چیرۆك خوانەكان

ئەمە بۆخۆی شتێكی داهێنراوە، پێشینە چاكەكان ڕێگریان كردووە كە لە لای چیرۆك خوانەكاندا دابنیشن [1] و دەڵێن:

لە چەرخی حەزرەتی پێغەمبەر(ﷺ) و حەزرەتی ئەبوبەكرو عومەر نەبووە (خودایان لێ ڕازی بێت)، تا فیتنە پەیدابوو، ئیتر چیرۆك خوێنەكانیش دەركەوتن.[2] ئەگێڕنەوە عەبدوڵلای كوڕی عومەر(خودایان لێ ڕازی بێت)

---

(١) قال الزبيـدي١/٢٤١: أخرجه العقيلي في الضعفاء، ١٨٦/٢، وأبو نعيم في الحلية، ١٩٣/٤ بسند صحيح عن عاصم بن بهدلة قال:

**كنا نأتي أبا عبدالرحمن السلمي ونحنُ غِلمةُ أيفاع، فيقول: لاتُجالسوا القصاص.**

وأخرج العقيلي من وجه آخر عن عاصم قال: كان أبو عبدالرحمن يقول: إتَّقوا القصاص.

وقال العلامة إبن الحاج في المدخل١٤٤/٢: **سئلَ مالك رحمه الله عَنِ الجلوس إلى القصاص، فقال: ما أرى أن يُجلسَ إلَيهِم. وإنَّ القصَصَ لَبِدعة، قال ابن رشد رحمه الله: كراهة القصص معلوم من مذهب مالك رحمه الله، وقال الإمام الطرطوشي: قال مالك: ونَهيتُ أبا قُدامة أن يقوم بعد الصلاة فيقول: إفعلوا كذا وكذا، وقال أبو إدريس: لأَن أرى في ناحية المسجد ناراً توَجَّج، أحب إليَّ مِن أن أرى في ناحيةالمسجد قاصَّاً يقص.]**

(٢) رواه ابن ماجه (٣٧٥٤)وفي مسند أحمد(٣/٤٤٩) **إن أول من قصَّ تميم الداري رضي الله عنه، داوای ئیزنی كرد لە حەزرەتی عومەر ڕێگەی پێدا كە بەپێوە هەڵسێتەوە و چیرۆكیان بۆ باس بكات**، بەڵام ئەو چیرۆكانەی كە نەهیان لێ كراوە ئەوە دوای فیتنەی گەورە پەیدا بوو دوای شەهید كردنی حەزرەتی عوسمان خوای لێ ڕازی بێت. وأخرج إبن أبي شيبة ٢٩٠/٥(٢٦١٩١)، عن ابن عمر رضي الله عنهما، قال: **لم يقص على عهد رسول الله ﷺ ولا زمان أبي بكر (رضي الله عنه) ولا عهد عمر (رضي الله عنه) ولا عهد عثمان (رضي الله عنه) إنَّما كان القصص حين كانت الفتنة.** وروى الحاكم في مستدركه٢١٨/١(٤٤٣) **عن أبي عامر عبد يحيى قال: حججنا مع معاوية بن أبي سفيان (رضي الله عنه) فلمّا قدِمنا**

دەرچوو لە مزگەوت و فەرموی: حیکایەت خوانەکان منیان لە مزگەوت دەرپەڕاند ئەگەر وانەبوایە دەرنەدەچووم.[١]

ضەمرە فەرموویەتی: ووتم بە سوفیانی سەوری: ئایا بەڕوخسارمان پێشوازی بکەین لە حیکایەت خوانەکان؟ فەرموی: پشتتان بکەنە بیدعە چییەکان.[٢]

موحەمەدی کوڕی عەونی خوراسانی دەڵێت: چوومە خزمەت ئیبن و سیرین، فەرمووی: ئەمڕۆ هەواڵی چیت پێیە ؟ ووتم: ئەمیر لە حیکایەت خوانەکانی قەدەغەکردووە کە ئیتر چیرۆك بگێڕنەوە.[٣]

ئەعمەش(خوای لێ ڕازی بێ) چوویە مزگەتی بەصرەوە، بینی حیکایەت خوانێك چیرۆکیان بۆدەگێڕێتەوە لە ناوەڕاستی حەلقەکەدا دانیشت و دەستی کرد بەهەڵکەندنی مووەکانی بن باڵی، چیرۆك خوانەکە ووتی:

یا شێخ! ئەوە شەرم ناکەیت؟! فەرمووی: بۆچی؟ من سوننەتێ جێ بەجێ دەکەم و تۆیش لە درۆدایت، من (ئەعمەش)م ئەوەیش بۆم باس کردن هەروایە.[٤] ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی:

لە هەموو کەس درۆزنتر حیکایەتخوان و سواڵکەرانن.[١]

---

مكةَ، أخبر بقصاص على أهل مكة، مَولى بني فَروخ، فأرسلَ إليه، فقال: أُمِرتَ بهذا القِصص؟ قال لا، قال فَما حمَلكَ على أن تقُصَّ بغير إذنٍ ؟ قال نُفسِّرُ عِلماً عَلَّمنا اللهُ (عزَّوجلَّ) قال معاوية: لو كنتُ تقدمت عليكَ لَقطعتُ منكَ طائفة]

(١) قوت القلوب(١/١٥١).

(٢) قوت القلوب(١/١٥١).

(٣) قوت القلوب(١/١٥١).

(٤) قوت القلوب(١/١٥١). هەموو خەڵکەکە زانیان نەوە پێشەوا (ئەعمەشە) لە چیرۆك خوانەکە تەکینەوە.

حەزرەتی عەلی(خودای لێ ڕازی بێت) چیرۆك خـوانەکانی لە مزگەوتی بەصرە دەرکـــردە دەرەوە ، بەڵام کاتێك گــوێی بەقسەکانی حەسەنی بەصری یەوە بوو ئەوی دەرنەکردەدەرەوە.[2]

چونکە ئەو باسی عیلمی ئاخیرەتی بۆ دەکردن و مردنی بیردەخستنەوە، بێداری دەکردنەوە لەسەر ئافەت و عەیبەکانی نەفس و کردارو خەتەراتی شەیتان و ، چۆنیەتی خۆپاراستن لێیان، هەروەها نیعمەتەکانی خودای وەبیر دەهێنانەوە، کە چەندێك زۆرن، بەندەکانیش چەند کەمتەرخەمن لە شوکرانەبژێری، هەروەها پێناسەی بێ نرخی و ڕیسوایی دونیاو عەیبەکانی، وە پچڕان و نەمانی دونیا و کەمیی پەیمانەکانی، لەگەڵ باس کردنی مەترسیەکانی دوارۆژو ئەحواڵ و نارەحەتیەکانی.ئەمە جۆری بیرکردنەوەی پەسەندو مەشروعە، کە لەفەرمودەی ئەبو زەڕدا(خودای لێ ڕازی بێ) باس کراوە، کە خۆیانی لەسەر ڕاهێنن و دەفەرمووێت:

**((حُضُورُ مَجلِسِ ذِكرٍ أَفْضَلُ مِنْ صَلاةِ أَلفِ رَكعَة، وحُضُورُ مَجلِس عِلمٍ أفضَلُ مِنْ عِيادَة ألفِ مَرِيضٍ، وحُضُور مَجلِس عِلمٍ أفضَلُ مِن شُهُودِ ألفِ جَنازَة، فقيل: يا رَسولَ الله، ومِن قِراءَةِ القُرآن، قال: وهَل تَنفَعُ قِراءَةُ القُرآن إلاَّ بالعِلمِ))**[3]

واتە: (ئامادەبوونی مەجلیسی زیکر خێری زیاترە لە هەزار ڕکاتی نوێژ، وە ئامادەبوونی دانیشتنێکی زانستی خێردارترە لە سەردانی هەزار نەخۆش، وە ئامادەبوونی دانیشتنێک بۆ عیلم، خێردارترە لە ئامادەبوون بۆ ئەسپەردەکردنی

---

(١) قوت القلوب(١/١٥١).

(٢) قوت القلوب(١/١٤٨).

(٣) كذا أورده صاحب القوت،(١/١٤٩) وانظر لسان الميزن(١/٤٩٥) وانظر الإتحاف(١/٩٩).

هەزار مردوو، وتیان ئەی پێغیمبەری خودا ! لە خوێندنەوەی قورئانیش گەورەترە؟ فەرمووی: ئایا قورئان هیچ سوودێك دەگەیێنێت بەبێ عیلم و زانست.

عەطاء خودای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: دانیشتنێك بۆ زیکرکردن گوناهی حەفتا مەجلیسی گەمەو گاڵتە دەسڕێتەوە و دەشۆرێتەوە.[1]

ئەوانەی زڕکەفتی ئەو فەرمودانەیان بۆ خۆیان کردووە، کردویانەتە بەڵگە لە سەر ئەوەی خۆیان خاوەنی نەفسێکی پاڵفتە کراون، ناوی یاد و بیرخستنەوەیان بۆ لای ئەو ڕیوایەتە پووچانە ڕاکێشاوەو، وازیان لە ڕێبازی دروستی زیکری پەسەندکراو هێناوەو، خۆیان سەرقاڵی چیرۆك و بەسەرهاتەکانی پڕ لە جیاوازی و کەم کردنەوەو زیادەڕەوی لە قسەکاندا کردووە، لە دەقی چیرۆکەکان لا دەدەن کە لە قورئاندا هاتووە، زیادەیشیان خستۆتە سەر، زۆر چیرۆك هەیە دروست نی‌یە بیبستی، وە هەیانە باڕاستیش بێت گێڕانەوەیان زیان دەبەخشێت ، هەرکەسێك ئەو دەرگایە لەسەر خۆی بکاتەوە، ڕاست و درۆی لێ تێکەڵ دەبێت، قازانج و زەرەری لێ دەشێوێت، بۆیە نەهی کراوە لەو جۆرە چیرۆکانە، بۆیە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی:

ئەو خەڵکە زۆر پێویستیان بە چیرۆك خوانێکی ڕاستگۆ هەیە.[2]

ئەگەر چیرۆکەکە لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەران بوو(سەلامی خودایان لێ بێت) دەربارەی کاروباری دینەکەیان، وە چیرۆك خوانەکەش زیرەك و ڕاستگۆ بوو، ڕێگای ڕیوایەتەکانی دروست بوو، نابینم هیچ زیانێکی هەبێت. با خۆی لە

---

(١) قوت القلوب(١/١٤٩)

(٢) قوت القلوب(١/١٥١).

گێڕانەوەی درۆ بپارێزێت، هەروەها خۆی دور بخاتەوە لە گێڕانەوەی ئەو ئاسانکاری و هەڵە سەرزارەکیانەی ڕابــردووەکان کــە قسەیەکیان لــەدەم دەرچووبێــت کــە عەوام و نەخوێندەوارەکان لێیان حاڵێ نەبن و دەمیشیان لێ بکەنەوە.

یان هەست بەوەنەکەن کە ئەوە هەڵەیەکی دەگمەنە کە کردویانە و چەندەها چاکەیان بەسەردا کردووە کە گوناهەکەیان بسڕێتەوە. یا خێری وایان کردووە کە ئەو هەڵەیان لەسەر لا بردبێت، چونکە کابرایەکی(هەرەمەکی) دەیکاتە ڕێخۆشکەر بۆی بۆ ئاسانکاری و ژیان لە سەر هەڵەو خوێچ و خواری، ئەوەش دەکاتە دەسپێکێک بۆ ئەوەی بەهانە بێ بەدەستیەوە و دەڵێت:

هەمان شتیان لە فلان کەسەوە بەو بابەتەوە گێڕاوەتەوە، وە لە هەندێك مەشایەخ و گەورەکانیشەوە، کەواتە هەموومان تاوانمان لەرێدایەوە جێگای سەرسوڕمان نی‌یە ئەگەر من تاوانێکیش بکەم، خۆ کەسانێکی زۆر لە من گەورەتر ئەو تاوانەیان کردووە!

بەم شێوەیە بەرامبەر بەخودایش(ﷻ) شێوە جورئەتێك پەیدا دەکات، کە بە خۆی نازانێت کەوتۆتە داوی خۆیەوە.

ئەگەر خۆی لەم دوو مەترسی و لەڕێلادانە پاراست، ئەوا قەیناکە ئەو بەسەرهاتانە بگێڕێتەوە، ئەوکاتە چیرۆکە دروستە پەسەنکراوەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو حاڵەتەی کە ناوەرۆکی قورئان بیانگرێتەوە، یان بەڕیوایەتێکی دروست لە کتێبە صەحیحەکانی فەرموودەدا بوونیان هەبێت.

هەندێك کەسیش هەیە، بەدروستی زانیوە چیرۆکی هەڵبەستراو دابنێت کە هانی خەڵکی تیا بدات بۆ طاعەت و گوێ ڕایەڵی، وایش دەگەێنێت کە مەبەستی ئەوەیە خەڵکی بانگ بکات بۆ ڕێگای حەقیقەت و ڕاستی، ئەمەش لە خەتەرەو وەسوەسەکانی شەیتانە، خۆ ئەوەندە شتی ڕاست هەیە کە پێویست نەکات لا

بکەیتەوە بەلای گێڕانەوەیٰ چیرۆکە هەڵبەستراوەکاندا، ئەوەش کە خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) باسیان لێوەکردوە، پێویستەیەکی نەهێڵاوەتەوە کە داهێنان بکات لەوەعز و ئامۆژگاریدا، ئەی نابینی تەنانەت ووتنی(سەجع)و قافیە ئارایشیان بەلاوە پەسەند نییەو، بەزۆرەملێ لەقەڵەمیان داوە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص فەرمووی بە عومەری کوڕی، کە بۆ ئیشێك هاتبوو بۆلای ، کە بیستی قسەکانی بەشێوەی سەجع و وشە ئارایی داڕشتووە پێی ووت: ئەمە ئەو شتەیە کە تورەو ڕق ئەستورم ئەکات بەرامبەرت، شەرتە هیچ کارێکت بۆ جێبەجێ ناکەم تا تەوبە نەکەیت لە وتنی سەجع (لە داڕشتنەکانتدا).[1] پێغەمبەریش(ﷺ) بە عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەی فەرموو: ((**إِيَّاكَ والسَّجعَ يا ابنَ رَواحَةَ**))[2].

واتە: نەکەی خۆت بەسەجعەوە خەریك بکەیت ئەی کوڕی ڕەواحە! ئەوەی کە نەهی لێ کراوە سەجعێکە زیاتر بێت لەدوو وشە لەبارەی دانی خوێن بۆ منداڵێکٰ کە لە سکی دایکیدا بەمردوویی لە دایك بوبوو، ئەوەی لەسەری بوو خوێنی بدات و بیبژێرێت ووتی: خوێنی چی بدەین، کەسێك نەخواردویەتی و نەخواردویەتیەوەو نە هاواری کردوە و نەیەک جاریش دەنگی لێ وەهاتووە کە کەوتۆتە خودارەوە، نمونەی ئەمە دەبێت خوێنی بە هەدەر چێ و نەدرێت: **كيفَ نَدي مَن لا شَرِبَ ولا أَكَلَ ولا صاحَ ولا استهَلَّ ومِثلُ ذلِك يَطل**، بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

تۆیش وەکو خەڵکی ساراو عەرەبە دەشتەکیەکان بەسەجع قسە دەکەیت.[3]

---

(١) كذا أورده صاحب القوت،(١٦٩/١) و هو عندا أبى يعلى(٤٤٧٥) من قول عائشة بنحوه

(٢) ئەصلی سەجع لە دەنگی خوێندنی کۆترەوە هاتووە، لە پاشان بەکار هاتووە لەو ڕێکخستنە تایبەتیەدا لە میانی کەلیمەکان یەك بەدوای یەك بەبێ وەزن و قافیە.

(٣) رواه مسلم(١٦٨٢).

# له بارەی شیعرەوە:

زۆر وتنی هۆنراوەش له ناو ئامۆژگاریەکاندا پەسەند نیيە، خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾الشعراء/ ٢٢٤

واته: (شاعیرانیش، کێ لەدوویان دەچن ئەوانە گومڕان. مەگەر نەتدیوە (بەشێواوی سەر بەهەر شوێنێکدا دەکەن))[١]

خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ﴾

واته:( ئێمە ئەومان فێری شیعر نەکردووە و هیچ پێویستیشی پێی نییە)[٢]ئەوەی زیاتر واعیزەکان به شاهید دەیهێننەوە، ئەو شیعرانەن لەبارەی عیشق و جوانی دولبەر و ئاسودەیی دڵەوە، له کاتی بەیەك گەیشتن و شەوق لیقاو ئازاری جیابونەوە، مەجلیسەکەش تەنها نەفام و عەوامە دەشتەکەیەکانی تێدایە، که دەرونیان پڕیەتی له ئارەزواتی دونیایی و نەفسانی، دڵیشیان هێشتا نەتەکیوەتەوە له سەیرکردنی وێنەی جوان و شیرین، کەواته شیعرەکان دڵیان دەهەژێنێت بۆ لای ئەو وێنه خەیاڵیانەی که تیا گیرساوەتەوە، بۆیه ئاگری ئارەزوات له گیانیاندا دادەگیرسێنێت، ئەو کاته هاوار دەکەن و سەمادەکەن و( شەیتانیش پێ یان پێ دەکەنێت) زۆربەی ئەم حاڵەته، یان هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ یەك جۆره فەساد که نابێت له شیعرەکاندا بەکار بێت، جگه له ئامۆژگاری و پەندیاری، تەنها ئەوەندەی وەك شایەت و بەڵگه و ڕێ خۆش کردنێك بێت بۆ ئەو حوکمانەی که له پاشدا بۆیان باس دەکات.

---

(١) قورئانی پیرۆز م. هەژار ل ٣٧٦.

(٢) قورئانی پیرۆز ماموستا هەژار ل ٤٤٤.

بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:

((إنَّ مِنَ الشِّعْرِلحِكمَة)).[1]

واتە: (بەڕاستی هەندێك شیعر هەیە لێوانە لە حیکمەتدا و سوودی لێ دەبینرێت).

ئەگەر مەجلیسەکە خاسانی دەرگای خودای تێدا بوو، کە دڵیان دامەزراوەو لەناو دەریای خۆشەویستی خودای تەعالادا مەلە دەکەن، وەکەسی غەیرەش لەناویاندا نەبوو( کە لێیان حاڵی نەبن) ئەوانە زبانیان بەرناکەوێت، ئەگەر شیعر بەکار بهێنن، کە ڕواڵەتەکەی باس لە دروستکراوەکان بکات، چونکە گوێ گر هەموو ئەوانەی دەیبیستێت دایئەبرێت بەسەر ئەوەی کە دڵی داگرتۆتەوە و( لە نێو بازاڕی خۆیدا مەشغوڵ دەبێت) لێکدانەوەی ئەم بابەتە لە (کتێبی سەماعدا) بە درێژی دێت.

بۆیە حەزرەتی جونەید(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) تەنها بۆ دە پازدە کەس قسەی دەکرد، هەرگیز ئەهلی مەجلیسەکەی نەدەگەیشتە بیست کەس[2] (چونکە قسەکانی ئەو بۆ خەواص و تایبەتمەندەکانە)

کۆمەڵێك هاتنە بەردەم دەرگای ئیبن و سالمی بەصری، عەرزیان کرد قسە یان بکە هاوڕێکانت وا گەیشتن، فەرمووی:

ئەوانە هاوڕێی من نین، ئەوانە هاوڕێی دانیشتن و مەجلیس ئاراپین(واتە: خەواصەکان و تایبەتمەندەکان هاوڕێی منن.[3]

---

(١) رواه البخاري(٦١٤٥).

(٢) القوت (١/١٥٥)

(٣) قوت القلوب(١/١٥٥). ئیبن و سالم مورشیدی ئەبوطالیبی مەککیە

## دەربارەی شەطەح و قسەفڕێدان [1].

مەبەستمان دوو جۆرە لە قسەکردن، کە هەندێك لە صۆفیەکان دایانهێناوە:-
یەکێکیان: قسەو دەعوای پان و بەرین لەبارەی عیشق و ڕۆچون لە خۆشیەویستی لەگەڵ خودادا(ﷻ)، کە (بەمەزەندەی خۆیان)گەیشتوون بە قۆناغی ویصال و بەیەك گەیشتن، ئیتر پێویستیان بەکردەوەی زاهیری نەماوە، هەندێکیشیان لەوە گومڕاتر دەبن و پەنا بەخودا دەعوای لادانی حیجاب و یەکبوون لەگەڵ مەعشوقدا دەکەن، وە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەتوانن بەچاو ببینن و بەدەمیش ڕوی قسەی لەگەڵدا بکەن.

دەڵێن: وای پێ وتین و ئێمەش وامان ووت، خۆیان دەشوبهێنن بە حسەینی کوڕی مەنصوری حەللاجەوە کە هەڵیانواسی لەبەرئەوەی شێوەی ئەم قسانە هەندێکی کردبوو، بەتایبەتی ئەوەی کەووتی: ( أنا الحق) بەبەڵگە دەیهێننەوە، یان ئەوەی لە ئەبویەزیدی بەسطامی دەگێرنەوە کە ووتویەتی:

(سُبحانی سُبحانی)[2] ئەمە جۆرە عیلم و بابەتێکە، زیانی لەسەر عەوام زۆرە، تەنانەت هەندێك لە جوتیارەکان زەوی و زاریان بەجێ هێڵاوە و دەستیان

---

(١) **شـەطەحات**: بەو جـۆرە قسـانە دەوترێـت کە زوبـان بەشـێوەیەکی تـایبەتی دەری دەبڕێـت و ئەوە دەگەێنێـت کە خـاوەنەکەی جـۆرە دەعـوایەکی هەیە و ئەهلـی طەریـقەت بەوقسـانە ڕازی نـین باڕاسـتیش بێـت. إتحـاف(١/٢٥٠) شـەطەحاتی صـۆفی زۆر جـار ڕاسـتە بەڵام لە ئاسـتی تێگەیشـتنی ئەو خەڵـکەدا نـیە، بـۆیە زبانیان لێ دەدات و نابێ بکرێت و بووترێت.

(٢) ووتنـی (أنـا الحـق) و هاووێنەکانی لە ئەولیـا گەورەکانەوە کە لەسـەر حـاڵەتێکی تایبەتی ژیان و، لە قۆنـاغی فەنـا دابـوون و هێشـتا نەگەیشتونە دوا پلەی کەماڵ، ئەوە وەك شـێخی زوبەیـدی لە إتحافـدا باسـی دەکات: مەشایخەکانی عوزریـان بۆ

کردووه بە ووتنی ئەم جۆرە دەعوایانە، چونکە سروشتی ئادەمیزاد چێژی تایبەتی لێ وەردەگرێت، لەلایەکەوە کار ناکات و بە بەتاڵی دەیباتەسەر. نەفسی خۆیشی پاڵفتە دەکات کە گوایە حاڵ و مەقامی زۆری بڕیوە، تەنانەت نەفامەکانیش ڕیگەیان لێ ناگیرێت کە ئەم جۆرە دیعایە و داوایانە بۆ خۆیان بکەن و، فێری هەندێك کەلیمەی بریقەدار ببن کە چەند واتایەك بگەیێنێت، وە هەرچەندیش بەرپەرچیان بدرێتەوە، دەستەوستان ناوەستن و دەڵێن:

ئەمە جۆرێکە لە ئینکاری، کە ئەمانە باوەڕ بە ئێمە ناکەن، سەرچاوەکەی لە زانیاری ظاهیری و جەدەلەوە سەری هەڵداوە، ئەو جۆرە زانینەی ئەوان بۆ خۆی پەردەو حیجابەو، بەکاردانەوەی نەفسی و دەمە دەمێمان لەگەڵدا دەکەن، ئەم

---

هێنـابونەتەوە، کە لەوانەیە لە حـاڵەتی سـەکرو بـێ ئاگاییـدا ئەو قسـانەیان کردبێت، کە خـوای گەورە لەو کاتەدا تەکلیفیـان لەسـەر هەڵـدەگرێت. ئەوەی کە نابێـت ئەو قسـانە بکـات ئەوانەن کە لە حـاڵی فەنـاو سـەکردانین و ئاگایشـیان لە خۆیـانەو بەعەمـدی ئەو جـۆرە قسـانە دێ بەسـەر زاریانـدا. کەواتە: بەنیسـبەت کەلامـی حەلاج و بەسـطامی و گەورە پیـاوانی طەریـقەت وەك ئیمـامی سـیوطی فەرموویەتی:

پێویسـتە حوسـنی ظەنیـان پێ ببرێـت و، بـۆ تاکەتـاکەی خەڵـك دەبێـت تـۆ گومانــت بــاش بێــت، ئەی بــۆ ئەوانەی کە بەشــێوەی تەواتــور پێمــان گەیشـتووە، کە هەمـووان شـایەتی فەزڵ و گەورەیـی و خواناسـی بـۆ داون، چۆن دەبێ گومانی خراپیان پێ ببرێت.

حەزرەتی عومەری فاروق فەرموویەتی:

ئەگەر برایەکت قسەیەکی کرد کە بەزاهیری خراپ بوو، گومانی خراپی پێ مەبە، مـادام دەتوانیـت بیخەیـت بە بـارێکی چاکـدا، واتە: بتوانیـت تەئـویلی بـۆ بکەیـت. إتحاف السادة (٢٥١/١).

قسانه دەرناکەوێت مەگەر کەسێك شارەزای عیلمی باطین بێت و نووری خوداوەندی بۆ دەرکەوتبێت.[1]

ئەم جۆرە قسەو باسانە پرشنگی شەرو زیان بەخشیان لەوڵاتدا بڵاوە، لەهەموو لایەکەوە دێت، لەناوچینی نەخوێندەوارا زۆر زیان دەبەخشێت، هەرکـەسێك باس لە شتێ لەم بـابەتانە بکـات کـوشتنی ئەو کەسە لە دینی

---

(١) قـوطبی گەورە قەسـطەلانی لە کتێبـی إقتـداء الفاضـل بإقتـداء العاقـل دا دەفەرموێت:

کە دەڵێن عیلمی حیجابی خوادایی‌یە، داوا کردنیشی گەورەترین پەردەو حیجابە، ئەوە ووتەیەکی ڕاستەو بەنیازێکی پوچ و نارەوا، صیفەتێکی ناتەواوە لە کەسێکدا کە نەگەیشـتۆتە ڕوتـبەی کەمـاڵ، ئەهلـی طەریقەتـیش باسـی ئەم بابەتایـان بـۆ یەکردووە مەبەستیان تاقمێکە لی بڕابن و ئەوەندەیان شارەزایی پەیداکردووە کە لەلای زانایـانی ئەم بـوارە جیـاکراونەتەوە و توانیویـانە هەڵگـری شـەریعەت و طەریقەت بن.

ئەوانە لە جیهـانی نادیـارە وە ئلهـامی دڵیـان کـراوە، کە شـایەت بـێ لەسـەر ڕزگاربوون و بێ گەیشـتنیان، ئەوانە زانسـت و حـاڵ و ژیانیـان بە خـودایەو لەبەر خـودایەو هەمیشـە لە حـزوردان، ئیتـر هەرگیـز سـەیری صـیفەتەکانی خۆیـان ناکەن، بەڵکو سەیری ویستی خالیقەکەیان دەکەن، جا ئەوەی بگاتە ئەو ئاستە، ئەوە ڕاسـتە سـەرقاڵی ئەو حـاڵەیە کە خـۆیی تیـادەژی و، نـایپەرژێتە سـەر عیلمی زاهیـر، بـۆیە ئەو جـۆرە عـیلمە بە حیجـاب و پەردە دەزانێـت، بەڵام ئەم خـاوەن دەعوایـانە کە ڕوتـن لە عیلمی ظاهیرو بـاطین، حەق وایە جارێك فێـری سـلوکی ڕێبـازی طەریـقەت بـبن، ئەگەر یەکێ فیـزو دەمـار ڕێـگەی پێ‌نەدات، ئەوە دوور و دەرکراوە و هەرگیز ناگات بە بەرنامەو سەعادەت و بەختیاری.

بنوارە إتحاف:( ١/ ٢٥١).

خودادا باشتره له زیندوکردنەوەی دەکەس..[1]

ئەوەش کە دراوەتە پاڵ حەزرەتی بایەزیدی بەسطامی، ئەوە ڕیوایەتێکی نادروستە و شیاو نی‌یە ، ئەگەر لە ڕاستیشدا لێی بیسترا بێت.

ئەوە لە وانەیە لەسەر زوبانی قودرەتی پەروەرگار قسە بکات و لە(حاڵەتی ئیستغراق و فەنادا) ئەو تەنزیهەی خودا بۆ خۆی(سُبْحاني) دەفەرموێت، بەسەر زوبانی ئەمیشا بێت و لێی ببیسترێت. وەك چۆن ئەگەر لێیان بیست کە دەڵێت:

﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي﴾طه/١٦.

واتە: (بەڕاست و دڵنیایی من خودام، هیچ پەروەردگارت نی‌یەو کەشیاوی پەرستن بێ بێجگە لەمن)...

(ئەگەر یەکێك ئەم ئایەتە بڵێتەوە و لێی ببیسترێت، خۆ نابێت یەکسەر پێی بووترێت ئەوە ئیدعای خوایەتی کردووە) تەنها لەسەر شێوەی گێڕانەوە لە خوداوە باسی دەکات و نابێت بەشێوەیەکی تر لێکدانەوەی بۆ بکرێت.[2]

---

(١) چونکە ئەم خاوەن دەعوا پوچ و باطیلانە کە بەناوی عیلمی ئەسرار و غەیبەوە دەم لەشت دەکوتن و، زانا بە نەزان و، کەسێك ئینکاریان بکات بە فاسق و زندیق لە قەڵەم دەدەن، زەرەرو زیانی ئەمانە بۆ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە زۆرە، بۆیە ئیمامی غەزالی ئەفەرموێت: کوشتنی یەکێ لەوانە باشترە لەوەی دەکەس لە مردن ڕزگار بکەیت و زیندوی بکەیتەوە.

(٢)بنوارە: مشکاة الأنوار(ص ٤) ، والمقصد الأسنى (ص ١٢٨)، چەندەها وەڵامدانەوەو لێکدانەوەی تریان بۆ کردووە جگە لەوەی لێرەدا باسکراوە،

شێخی زوبەیدیش دەفەرمووێت: یان (ئەو قسەیە) لە دوژمنێکی سەرسەختەوە بەدەمیەوە هەڵبەستراوە، یان لە مولحیدێکی خوانەناسەوە بو بێت.

شێخی سوهرەوردیش لە عوارف المعارفدا دەفەرمووێت:

# بەشی دووهەمی شەطەح و قسەکردن

## چەند ووتەیەکی نادیارە، ڕواڵەتیکی ڕازاوەو قەشەنگیان هەیە، بە چەندین دەستەواژەی قورس و گران دەری دەبڕن و هیچ سوودێکیشی لێ نابینرێت.

---

ئەو جۆرە قسانە ئەگەر زاتێکی وەك ئەم خواناسانە لێشیان بیسرابێت کە کردبێتیان، ئەبێ وای تەئویل بکەین کە بە حیکایەت لەخوداوە ئەیگێڕنەوە، ئەگەر هەرکەسێك قسەیەك بکات و مەبەستی(حلول) بێت پەنا ئەگرم بەخودا، ئەوا ئەدرێتەوە بەسەریداو لێی قبوڵ ناکرێت.

ئیمامی سیوطی لە: (تأييد الحقيقة) دا کۆمەڵێ تەئویل و وەڵامی پەسەند دەداتەوە، کەسێكهەمویان دەڵێت: ئەو قسانەی کە کەوتۆتە سەر زاریان و داویانەتە پاڵ خۆیان، ئەوە دەبێ بدرێتەوە پاڵ خودا و هەرگیز مەبەستیان ئەوە نیيە کە بیدەنە پاڵ خۆیان، بەڵام حیکایەت لە خوداوە دەیگێڕنەوە و وا دەرکەوتووە... نمونەی ڕاستی ئەم بابەتەش: ئەو فەموودەیە کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە [عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: ((**مالِعَبدي المؤمِنُ عِندي جَزاءٌ إذا قَبضتُ صَفيَّهُ مِن أهلِ الدُّنيا، ثم احتَسَبَهُ إلاَّ الجَنَّة**))، ئەم فەرمودەی خودایە پێغەمبەر(ﷺ) بەزاهیری داویەتە پاڵ خۆی کە دەفەرموێت: پاداشتی عەبدی من چییە ئەگەر خۆشەویستەکەیم لێ سەندەوە و ئەویش داوای پاداشتی لای خودا کرد، پاداشتی چییە ئەگەر نەیکەمە بەهەشتەوە! خۆ ئێمە عەبدی پێغەمبەر نین(ﷺ)، کەواتە لەسەر شێوەی گێڕانەوەیە لە خوداوە. هەروەها خودا ﷻ فەرموویەتی:

(**وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ**) بەناوی خۆیەوە دەفەرموێت مەبەستیشی گێڕانەوەیە لەسەر زوبانی مەلائیکە: یان (**وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ** مريم ٦٤ ) ئەوەش لەسەر زوبانی جوبرەئیلە، وەك بەدرێژی باسم کردووە لە(الإتقان)دا، کەواتە بادۆس

تانی خودایش قسەیەك بکەن و لەڕاستیشدا حیکایەتیان لە خودایانەوە کردبێت. بۆ درێژی ئەم بابەتە بنواڕە: إتحاف (٢٥٢/١).

ئەمەش بەو شێوەیە، یان هەر لەسەرەتاوە ئەوەی دەیڵێت خۆیشی نازانێ چی ووتووە، بەهۆی شێوان و تێکچونی عەقڵەوە، یان خەیاڵ پڵاوی، یان قسەیەکی بیستبێ و لێی تێنەگەیشتبێت و بیڵێتەوە، کە ئەمەیان زۆربەی حاڵەتەکانە، یان خۆی لێی تێگەیشتووە، بەڵام ناتوانێ ئەوەی لە دڵیایەتی بە جوانی دەری ببڕێت و لێی تێ بگەن، چونکە کەمتر شارەزایی لەو عیلمەدا هەیە، وە فێری ئەوە نەبووە بەشێوازێکی جوان و وشەی ناسك، تەعبیر لەو واتا و بابەتانە بداتەوە. بەڕاستی ئەم جۆرە قسانە هیچ سوودێکیان نابێت، ئەوەندە هەیە گومان دروست دەکەن بۆ دڵ و، ئەقڵ تووشی سەرسوڕمان دەکەن و، بیرومێشکی پێ سەرسام دەکەن، یان دەبێت قسەکانیان وا لێک بدرێتەوە:

کە مەبەستێکی تریان هەبووەو بەم شێوە بۆیان دەربڕاوە، وە هەرکەسەش بەپێی خواست و ئارەزووی خۆی لێی تێ دەگات..

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((ما حدَّثَ أحَدُكُم قَوماً بحَديثٍ لا يَفقَهُونَه إلاّ كانَ فِتنةً عَليهم))**[1]

واتە: (هەرکەسێك وتەیەکی باس کرد بۆ کۆمەڵێک و ئەوانیش لێی حاڵی نەدەبوون و لەواتاکانی نەدەگەیشتن، ئەوە ئەو قسانە دەبێتە فیتنەو مایەی تێکدان و بشێوی بەسەریانەوە).پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: **((كلِّمُوا الناسَ بِما يَعرِفوُن، ودَعُوا ما يُنكِرونَ، أتُريدُونَ أن يُكَذَّبَ اللهُ ورَسُولُه))**

واتە: ( ئەوەندە قسەیان بۆ بکەن لێی تێ بگەن و باوەڕی پێ بکەن، وازلەو

---

(١) رواه مسلم في مقدمة (صحيحه)(١١/١) بنحوه موقوفا على ابن مسعود(رضى الله عنه)، ورواه العقيلي في الضعفاء(٩٣٧/٣) و٢٠١/٣(١٢٠٠)مرفوعا بنحوه. وابن السني وأبو نعيم في الرياء، من حديث ابن عباس بإسناد ضعيف، [قال الزبيدي ٢٥٣/١: قال العراقي في التخريج الكبير: إنما يصح هذا الحديث موقوفاً على ابن مسعود كما رواه مسلم في مقدمة صحيحه، وساقه كسياق حديث ابن عباس بعينه]

بابەتانەبهێنن کە ئینکاری دەکەن،[1]

بۆچی دەتانەوێت خوداو پێغەمبەری خودا بەدرۆ بخرێنەوە) ئەمە لە قسەیەکدایە کە خاوەنەکەی بۆ خۆی لێی تێگەیشتبێت و نەتوانێت بیگەێنێتە گوێی بیسەرەکەی(یان حاڵی بکات). ئەی ئەگەر خاوەن قسەکە خۆی لێی تێنەگەیشتبێت؟! کەواتە ئەگەر بوێژەکەی لێی حاڵی دەبوو، بەڵام بیسەرەکە تێی نەدەگەیشت ئەوە دروست نییە باسی لێوەبکات. حەزرەتی عیسا سەلامی خودای لەسەر فەرمویەتی:

**((لا تَضَعُوا الحِكمَةَ عِندَ غَير أَهلِها فتَظلِمُوها، ولا تَمنَعُوها أَهلَها فتَظلِمُوهُم، كونُوا كالطَّبيبِ الرَّفيقِ يَضَع الدَّواءَ في مَوضِعِ الدَّاء))**[2]

واتە: (حیکمەت و قسەی پەندیاری لای نا ئەهل و ناشایستە دامەنێن کە زوڵم لە حیکمەتەکە بکەن، وە لە ئەهلی شایەستەی خۆیشی مەشارنەوە تاوەکو زوڵمیان لێ نەکەن، وەك پزیشکێکی نەرم و دڵسۆز بن، کە دەرمان دەخاتە سەر شوێنی برینەکە).

لە ووتەیەکی تردا هاتووە: کە هەرکەسێك حیکمەتی خۆی بخاتە لای نا ئەهلەوە ئەوە نەیزانیوە، ئەوەی لە ئەهلی شایستەی خۆی بیگێڕێتەوە ئەوە زوڵمی کردووە، حیکمەت و پەندیاری مافی خۆی هەیە، بەڕاستی کەسانی شایستەی خـۆی هـەیە کە لایـان باس بکـرێت، کـەواتە هــەمـوو حـەقق و ڕاستیـەکان بدە بە خاوەن مافەکان.[1]

---

(١) رواه البخاري (١٢٧) موقوفا على علي ابن طالب رضي الله عنه، رواه الطبراني مرفوعا في الأوسط(٨١٩٢) والبيهقي في (الشعب)(١٦٣١) بنحوه. ورفعه أبو منصور الديلمي في مسند الفـردوس [١٢٩/٢(٢٦٥٦)] مـن طريـق أبـي نعـيم. وقـال ابـن السـبكي في طبقـات الشافعية،٢٨٨/٦: لم أجد له إسنادا.

(٢) تأريخ دمشق (٦٣،٦٨) ضمن حديث طويل.

# باسی الطامّات (بەڵا گەورەکان)

هەموو بابەتەکانی پەیوەندار بە(شەطەحاتەوە) لێرەدا جێی دەبێتەوەو شتێکی تریش هەیە تایبەتە پێیەوە،

هەوڵدەدەن هەر لەفزێك مەعنایەکی زاهیری هەبێت، لەو واتایە لای دەدەن بۆ واتایەکی شاراوە، کە هیچ سوودێکی ئاشکرایشی نەبێت، وەك کۆمەڵی(باطيني)یەکان خەریکی تەئویلات دەبن، ئەمەش کارێکی حەرامە، زیانەکەشی زۆر گەورەیە، چونکە ئەگەر لەفزەکان واتایەکی تایبەتی ببەخشن، وەبەبێ بەڵگەو بەبێ پشت قایمی بە فەرمودەی خاوەنی شەریعەت(ﷺ) یەکسەر لەو مەعنا لای بدەن بۆ واتایەکی تر، یان بەبێ بەڵگەیەکی عەقڵی و پێویستیەکی تایبەتی لە مەعنا ئەصڵیەکەی لا بدرێت بۆ واتایەکی شاراوە، کەواتە ئیتر متمانە لەسەر وشەو واتاکانیان نامێنێت، وەکەلامی خودا(ﷻ) وە فەرمودەی پێغەمبەریش(ﷺ) سوودی خۆیان ناگەێنن، چونکە ئەو لەفزەی یەکەم جار چ واتایەك دەگەێنێت، ئیتر متمانەی لەسەر نامێنێت، واتای شاراوەش(باطيني) ڕێک نەخراوە تا دەلالەت لەسەر مانایەکی دیاریکراو بکات، بەڵکو خەتەرەو خەیاڵاتی هەر یەکێك لەوانەی لێکی دەدەنەوە جاری وا هەیە دژایەتی لە بیرکردنەوەکانیاندا پەیدا دەبێت، بەچەند شێوەی جیا جیا لێکدانەوەی بۆ دەکرێت. ئەمەش داهێنراوێکی بەربڵاوی پڕ لە مەترسی‌یە، کە زیانێکی زۆر دەبەخشێت، خاوەنی ئەم لێکدانەوە شاراوانە بۆیە ئەو کارە دەکەن، چونکە نەفسی مرۆڤ بەدوای واتای نامۆ و نادیاردا دەگەڕێت و چێژی لێ دەبینێت.

هەر بەم ڕێگەیەش بوو کە( باطيني)یەکان گەیشتنە ئەوەی بینای شەریعەت

(١) قوت القلوب(١٥٦/١) و بنحوه: جامع بيان العلم وفضله(٧٠٣- ٧٠٤).

بروخێنن، به تەئویلی (ظاهیری لەفزەکان) که له مەعنا ئەصڵیەکەی لای بدەن، وه واتایەکی تری بۆ دابتاشن با ئارەزوی خۆیان، وەك بەدرێژی باسی مەزهەبه کەیانمان کردووه له کتێبێکی خۆمان بەناوی(المُستَظهري)[1]که دانراوه له ڕەددانەوەی باطینیەکاندا، نمونەی جۆری تەئویل کردنی ئەهلی (طامّات) که به بەڵایەکی گەوره دانراون ئەوەیه: که تەئویلی فەرمودەی خودا دەکەن که فەرمووپەتی: ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى، طه/٢٤﴾ واته:

(برۆ بۆ لای فیرعەون چونکه یاخی بووەو لەسنوور دەرچووه). دەڵێن:

ئەوه مەبەستی له دڵی خۆیەتی، که فیرعەون و دەسته ڵاتداری زاڵمی سەر هەموو کەسێکه. یان خودا که فەرموویەتی: ﴿وأن أَلْقِ عَصَاك، القصص/٣١﴾

واته: ( عەصاکەت فڕێده). ئەوان تەئویلی دەکەن بەهەموو شتێك که خۆتی بدەیت بەسەردا، وه پشتی پێ ببەستی غەیری خودا، ئەوه دەبێ هەمووی فڕێ دەیت.

یان له فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((تسَحَّروا فإنَّ في السُّحورِ بَركَة))[2]

واته: پارشێو بکەن، ئەوان دەڵێن: مەبەستی پێی داوای لێ بوردنه له خودا: واته(أستغفرالله) کردن له بەربەیاندا. وه نمونەی ئەمانه، تاوایان لێ دێت تەحریفی قورئان دەکەن لەسەرەتاوه تا کۆتایی له مانا ئاشکراکەی لای دەدەن، بۆ تەئویلێکی خۆیان، وه لەو تەفسیرەی که له(ئیبن و عەباسەوه) (خودای لێ ڕازی بێت) نەقڵی دەکەن یان له زاناکانی ترەوه.

هەندێك لەو تەئویل کردنانه به دڵنیاییەوه دەزانرێت که پوچه و باطیله، وەك ئەوەی که دڵیان خستۆته شوێنی فیرعەون، چونکه فیرعەون کەسێکی

---

(١) ناوی ناوه (المستظهری) بەناوی خەلیفه(مستظهر بالله)ی عەباسی، که بەدیاری بۆی ناردبوو.

(٢) رواه البخاري (١٩٢٣) ومسلم(١٠١٩).وتأكيد استحباب تأخيره (١٩٠٥) من حديث أنس.

هەست پێکراوە و بەتەواتور پێمان گەیشتووە کە بوونی هەبووەو، موسا (علیه السلام) بانگی کردووە، ئەویش کابرایەکە وەك ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب و کافرەکانی تر، خۆ لە ڕەگەزی شەیتان و فریشتە نی‌یە تا بە یەکێك لە ئەندامە هەستیارەکان پێی نەزانرێت، تا بە ناچاری تەئویل ڕوبکاتە لەفزەکانیەوە.

هەروەها(سحور) بەواتای پارشێو، دایبرێت بەسەر(أستغفِرُالله) کردندا، دەی ئەوە پێغەمبەری خودایە(ﷺ) نانی پارشێوی دەخودارد و دەیفەرموو:

**(تسَحَّروا)[1] ( هَلُمُّوا إلى الغِذاءِ المُبارَك)[2]**

(باس لە خواردن دەکات کەی باسی لە (أستغفِرُالله) کردووە) ئەم فەرمانانە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوون و دەزانین کە تەئویلەکانیان مایە پوچە، وە هەندێك لەو تەئویلانەی دەیکەن، گومانێکی قایمیان بۆ پەیدا دەبێت کە قسەکانیان نارەوایە، ئەمەش لەو فەرمانانەیە کە پەیوەندیان بە حاسسە و هەستەوە نی‌یە.

ئەمانەش هەموویان حەرام و گومڕایین، تێکدان و لادانی دینە لە بەهای ڕەوشت. لە صەحابە و تابیعین گەورەیانی وەک حەسەنی بەصری نەبیسراوەکە

---

(١) پێغەمبەر (ﷺ): لەگەڵ زەیدی کوڕی ثابتدا پارشێوی کردوە، (خوایان لێ ڕازی بێت) وەك لە بوخاری داهاتووە (٥٧٦).١١٣٤.

(٢) رواه أبو داود(٢٣٤٤)، والنسائي (٢١٦٣)، والنسائي(١٤٥/١) و هو عند أحمد فى المسند (١٢٦/٤) بلفظ(الغذاء) عندهما. وابن حبان في صحيحه٢٤٤/٨(٣٤٦٥) من حديث العرباض بن سارية، وضعفه ابن القطان. [قال الزبيدي١ /٢٥٦: أي لضعف رواية الحارث بن زياد، وقال ابن عبدالبر في العلم: ١٨٢/٢،هو مجهول، ولكن ذكره ابن حبان في الثقات ١٣٣/٤، وقوله يعني: السحور، كأنه مدرج من الراوي، أخرجه كذلك الإمام أحمد في مسنده(١٦٦٤٤) وابن حبان في صحيحه٨ /٢٣٤،(٣٤٦٤) من حديث العرباض، وفي الباب عن المقداد، وعتبة، وأبي الدرداء، وعمر بن الخطاب و عائشة]

هەمیشە خەریکی بانگەشەی حەق و ڕاستی و ئامۆژگاری موسوڵمانان بوون.
فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ):
(( مَن فسَّرَ القرآنَ برأيِهِ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّار))[1]
واتە: (ئەوەی بەڕای خۆی واتای قورئان لێك بداتەوە باشوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخ دا دیاری بکات). واتای ئەم فەرمودەیە تەنها ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە لەسەر ئەو شێوەی تەئویل کردنە بێت، کە دەیەوێت فەرمانێك باس بکات و جێگیری بکات، ڕایدەکێشێت بۆ بەڵگەیەکی قورئانی و، ئایەتێك یان وشەیەك وا لێك دەداتەوە کە خۆی مەبەستیەتی، بێ ئەوەی شایەتێك پشتگیری لێ بکات، نە دەلالەتی لەفظیی وشەکە، نە دەلالەتی زمانەوانی یان ئایەت و فەرموودە. ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە کە لەم دەستەواژە وا حاڵی ببین، کە ئیتر دروست نییە تەفسیری قورئان بکرێت، بە پێی بیرمەندیی زانایان و توانای هەڵێنجانی ئەحکامی شەرعی(لە لایەن موجتەهیدەکانەوە).
بەڕاستی ئایەتی وا هەیە کە لە صەحابەو موفەسیرەکانەوە پێنج واتا تا شەش و حەوت واتایان لێك داوەتەوەو هیچ کام لەو واتایانەش لە پێغەمبەریان(ﷺ)

---

(١) رواه الترمذي(٢٩٥١).(٢٩٥١) من حديث ابن عباس وحسنه، وهو عند أبي داود[كتاب العلم، باب الكلام في كتاب الله بغير علم](٣٦٥٣)من رواية ابن العبد، وعند النسائي في الكبرى(٣١/٥( ٨٠٨٦)، [قال الزبيدي٢٥٧/١: صححه الترمذي ، وأخرجه البيهقي في الشعب ٢/ ٤٢٣(٢٢٧٥ -٢٢٧٦ )عن ابن عباس بلفظ: من قال في القرآن بغير علم، وأخرجه أبو داود، كتاب العلم، ٣٦٥٢، والترمذي كتاب تفسير القرآن، (٢٩٥٢)، وقال غريب، والنسائي في الكبرى ٣١/٥(٨٠٨٦)، وابن جرير في تفسيره، ٣٥/١، والبغوي في شرح السنة، ١٥٨/١(١٢٠) وفي التفسير ٣٥/١، وابن عدي في الكامل ٤٥٠/٣، والطبراني في الكبير ١٦٣/٢،(١٦٧٢)، والبيهقي في الشعب٤٢٣/٢(٢٢٧٧)، عن جندب بن عبدالله **من قال في القرآن برأيه فأصابَ فقد أخطأ**.]

نەبیستووە. هەندێك جار ئەو واتایانە لەگەڵ یەك كۆ نابنەوەو ناگونجێن.

كەواتە پێویستی بەوردبینی و بیركردنەوەی زۆر و تێگەیشتنی باش هەیە.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای خێر بۆ عەبدوڵلای كوڕی عەباس دەكرد و دەیفەرموو:

(( اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ))[1]

واتە: (خودایە لە دین تێی بگەیێنەو شارەزای بكەو فێری تەئویلی دروستیشی بكە) ئەوانەی ئەم جۆرە تەئویلە فاسید و پوچەڵانە بە دروست دەزانن لەم پێڕەن كە بەبەڵاو (طامَّة) ناوزەدكراون.

بشزانن كە مەبەستی زاهیری لەفزەكە ئەوە نییە كە ئەوان بۆی چوون[2] لە گەڵ ئەوەشدا وا دەزانن كە بەو كارەیان بانگەشەی ڕاستی پێ دەكەن و خەڵكی بۆ ڕێگای حەق پێ دەگێڕنەوە، كاری ئەمانەش دەشوبهێت بەكاری ئەوانەی كە بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) قسەو داهێنانیان هەڵبەستووە، چونكە بەلای خۆیەوە بەڕاستی دەزانێت و شەریعەتیش باسی ڕەوایی ئەو كارەی نەكردووە. وەك ئەوەی هەركەسێك پرسێكی تایبەتی بەلاوە ڕاست بێت، ئیتر حەدیسێكی بۆ هەڵببەستێ و بەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕای بگەیێنێت!!

ئەمەش ستەم و گومڕاییە، دەچێتە خانەی ئەو هەڕەشە سەختەی كە ناوەڕۆكی فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) دەیگرێتەوە كە دەفەرمووێت:

---

(١) رواه البخاري(١٤٣) دون قوله: وعلمه التأويل، و هو بهذه الزيادة عند أحمد (٣٠٢٤) فى (المسنده) (٢٦٦/١). وابن حبان في صحيحه ٥٣١/١٥(٧٠٥٥)وقال الحاكم صحيح الإسناد، في المستدرك (٦١٥/٣(٦٢٨٠): وانظر: الإتحاف(٢٥٨/١).

(٢) واتە: ئەزانن كە بەمەیل و هەوای نەفسی خۆیان ئەو جۆرە لێكدانەوە باطیلانەیان كردووە.. إتحاف(٢٥٨/١).

((مَن كَذَب عَلَيَّ مُتعَمِداً فَلْيتبَوَّأ مَقعَدَهُ مِنَ النَّار))[1]

•واته:

(ئەوەی بە قەصدی و بە عەمدی درۆ بەدەم منەوە بکات، باجێی خۆی لەناو ئاگردا ساز و ئامادەبکات).

بەڵکو شەڕی ئەو کەسانە گرانترو مەزنترە کە تەئویلی لەفزە دیارەکان دەکەن بۆ واتایەکی دورو نادروست، چونکە متمانەی وشەکان بۆ گەیاندنی واتاکانیان لە دەست دەدەن، ئیتر بەتەواوی ڕێگەی تێگەیشتن و سوود وەرگرتن لە ئایەتەکانی قورئان دەپچڕێت و متمانە لەسەر ماناو واتاکانی نامێنێت.

بەمەدا دڵنیابویت چۆن شەیتان خەڵکەکەی فریودا، لە زانستە پەسەندکراوەکانەوە وەریان بگێڕێت بۆ ناپەسەندەکان، ئەمەش بە هۆکارو بەکارهێنانی زانا خراپە تاوانکارەکانە، کە ناوەکان دەگۆڕن و ناوەڕۆکەکان تێک دەدەن، حەق و باطیل تێکەڵی یەکتری دەکەن، ئەمەش بەگۆڕینی ناوەکان و تەفسیرکردنەوەیان بەپێی ئارەزوی خۆیان.

جا ئەگەر بکەویتە شوێن ئەو جۆرە کەسانەو، پشتیشت بە ناوبانگی ئەوانە بەستبێت، یان ئەو ناوەی ئەوان بڵاویان کردۆتەوە، بێ ئەوەی لابکەیتەوە بەلای ئەوەی کە لە چەرخی یەکەمدا زانراوە، ئەوە وەك ئەو کەسە وایت بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کەشەرەفمەندبێت بە حیکمەتی خودایی، بەڵام لە ڕێگەی ئەوکەسەی کە ناوی خۆی ناوە حەکیم.

بە تایبەتی لەم چەرخەدا کە ناوی حەکیم دراوەتەپاڵ پزیشك و شاعیرو ئەستێرە ناسەکانەوە، ئەمەش بەو غەفڵەتەی کە دوچاری هاتوون لە گۆڕانکاری لە ناوەکاندا.

---

(١) رواه البخاري:(١١٠)في كتاب العلم،و مسلم(٣)في المقدمة باب تغليظ الكذب على رسول الله.

# باسی حیکمەت (پەندیاری) کارزانی

بەڕاستی ئێستا ناوی حەکیم خراوەتە پاڵ پزیشك و شاعیر و ئەستێرە ناسەکان، تەنانەت بەو کەسەش دەوترێت حەکیم کە قورعەکە سوڕ دەداتە ناو لەپی کابرای جوتیار لەسەر جادە و بانەکان.

بەڵام لە ڕاستی حیکمەت ئەوەیە کە خودا(ﷻ) زۆر ستیاشی کردووە و فەرمویەتی ئەفەرموێت:

﴿وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾البقرة/٢٦٩ واتە:

( کارزانیی بە هەر کەسیش بدرێت، ئەوە بەڕاستی خێری زۆری پێ دراوە).

وەپێغەمبەریش(ﷺ): فەرمومویەتی:

((كلمَةٌ مِنَ الحِكمَةِ يَتعلَّمُها الرَّجُل خيرٌ لَه مِنَ الدُّنيا وَما فيها))[١] واتە:

( وتەیەك لە کارزانی و پەندیاری پیاو فێری ببێت، باشترە لە دونیاو ئەوەی لە ناو دونیادایە).

بنوارە کاتی خۆی وشەی حیکمەت چی دەگەیاند، وە دوایی گوازرایەوە بۆ چ مانایەکی تر، هەروەاش وشەکانی تری پێ بپێوە. خۆیشت بپارێزە لەوەی بکەویتە داوی زانا خراپە دونیاییەکان، چونکە شەڕو خراپەی ئەوان لە زیان و زەرەری شەیتان زیاترە، چونکە شەیتان لە ڕێگەی ئەوانەوە دەتوانێت دینی پیرۆز لە دڵی خەڵکەکە هەڵبکێشێت.

لەبەر ئەمە بوو کە پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی خراپترینی خەڵکەوە وەڵامی نەئەدایەوە و دەیفەرموو:

خودایە داوای لێ خۆش بونت لێ دەکەم، تا دوپاتیان کردەوە لێی، لە پاشان

---

(١) أنظر الإتحاف(١/٢٦٤).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی:

**((هُم عُلَماءُ السُّوء))**[1] واتە: (ئەوانە زانا خراپەکانن).

کەواتە زانستی پەسەندکراو و زەمکراوت زانی و ئەوەش کە تێکەڵ کراوە، نارەزویش لەدەستی خۆتە، کە چاو لە پێشینەی صاڵحەکان بکەیت، یان خۆت بە حەبلی سەرکەشیدا هەڵبواسیت و خۆت بشوبهێنیت بەوانەی کە تازە پەیدا بوون.

هەموو ئەو زانستەی کە زانایانی سەلەف لەسەری بوون کوێر بونەتەوەو ناساریان نەما، ئەوەش خەڵکەکە سەریان تێ کردووە زۆربەیان داهێنراوێکی تازە پەیدا بوون، ئەو فەرموودە دروستەی پێغەمبەریش(ﷺ)بەڕاستی پێمان گەیشتووە کە فەرموویەتی:

**((بَدأَ الإسلامُ غَريباً وَسَيعُودُ غَريباً كَما بَدأ، فَطُوبَى لِلغُرباء. فقيل: وَمَنِ الغُرَباء ؟ قالَ الذين يُصلِحُونَ ما أفسَدَه النَّاسُ مِنْ سُنَّتي، والَّذين يُحيونَ ما أماتُوهُ مِن سُنَّتي))**[2].

واتە(ئیسلام بە غەریب و نامۆیی دەستی پێ کرد، لەدوایشدا دەگەڕێتەوە هەمان حاڵەتی نامۆیی کە دەستی پێ کردبوو. خۆش بەختی بۆ ئەوانەی کە غەریب دەبنەوەو لە بەرچاوی خەڵکیدا بە نامۆ ئەژمێررێن، ووتیان:

نامۆکان کێن؟ فەرموی:

ئەوانەن کە چاکسازی دەکەن، ئەوەی خەڵکانێ لە سوننەتی من تێکیان داوە ئەوان وەك خۆیی لێ دەکەنەوە، ئەوانەی تریش کە هەوڵئەدەن ئەو سوننەتانە زیندوبکەنەوەکەمراندویانەو لە بیریان بردۆتەوە،تا دووبارە کاریان پێ بکرێتەوە).

---

(١) روى بنحوه الدارمي في(سننه)(٣٨٢).

(٢) رواه مسلم( ١٤٥-١٤٦) و تمامه عند الترمذي برقم: (٢٦٣٠).

له فەرمودەیەکی ترداهاتووە:

**(هُم المتَمَسِّكُونَ بما أنتُم عَليهِ اليَوم)**[1] واتە: ( ئەوانەن کە پابەند بن بەوەی ئەمڕۆ ئێوە لەسەرینی و، لێ لانادەن. لە فەرموودەیەکی تردا:

**((الغُرباءُ ناسٌ قليلٌ صالحُون بَينَ ناسٍ كثيرٍ، ومَن يُبغِضُهُم في الخَلقِ أكثرُ مِمَّن يُحِبُّهُم))**[2]. واتە: ( غەریبەکان کۆمەڵە خەڵکیکی کەمن، صاڵح و پیاوچاکن، لەناو خەڵکیکی زۆردا دەژین، ئەوانەی کە ڕقی لێیانە زۆر زیاترن لەوەی کە خۆشی ئەوێن.

وای لێ هاتووە ئەو زانستیانە نامۆ بوونەتەوە بەشێوەیەك کە خەڵکی ڕقیان لەو کەسانەیە کە باسیشی بکەن، بۆیە سوفیانی سەوری ڕەحمەتی خودای لێ بێت، فەرموو ئەگەر زانایەکت دی دۆستی زۆر بوو، ئەوا بزانە تێکەڵی کردووەچونکە ئەگەر قسەی حەقی بکردایە ئەوا ڕقیان لێی دەبویەوەو ئەو هەمو دۆستەی نەدەبوو. [3]

---

(١) كذا أورده صاحب(القوت) (١٤٣/١) وقد روى بنحوه ابن وضاح في (البدع) (٧٢). [قال الزبيدي١/٢٦٥: ورد ذلك في تفسير الغرباء المذكور في الحديث المتقدم، قال العراقي: لم أقف له على إسناد،إلاً أن فيما أخرجه الطبراني في الكبير١٥٢/٨(٧٦٥٩) وأبوبكر الآجري في كتاب صفة الغرباء ص/٢٤،(٩) ذكر **إفتراق الأمم كلهم على الضلالة، إلاً السواد الأعظم، قالوا وما السواد الأعظم؟ قال: مَن كانَ على ما أنا عليهِ وأصحابي**...الحديث].

وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية: ٢٨٨/٦: لم أجد له إسناداً.

(٢) رواه أحمد في مسنده(٢/ ١٧٧)(٦٦١٢) من حديث عبدالله بن عمرو. [قال الزبيدي ١/ ٢٦٥، قال العراقي فيه إبن لهيعة مختلف فيه.اهـ. قالت: وهكذا أخرجه السيوطي في الجامع الكبير ١٣٩/٥(١٣٩٢٨) عن ابن عمرو، وعزاه لأحمد، بلفظ: **طوبى للغرباء، أناسٌ صالحون في أُناس سوء كثير، مَن يعصهم أكثر مِمَّن يطيعهم**] وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية: ٢٨٨/٦: لم أجد له إسناداً.

(٣) ونصه: **إذا رأيت العالم كثير الأصدقاء فاعلم أنه مُخَلِّط**: قوت القلوب(١٤٣/١).

# ڕوونکردنەوەی ئەندازەی پەسەند
# لە زانستی پەسەندکراو

بزانە:

زانست لەو ڕوانگەوە سەیری بکرێت (کە چەندێکی پەسەند و شیاوە کە وەربگرێت) ئەوە دەکرێت بە سێ بەشەوە:

بەشێکی کەم و زۆری فێری ببێت خراپە و ناپەسەندە.

بەشێکی‌تری هەرچەندێک لێ فێر ببێت، کەم بێت یا زۆر هەر باشە، چەندێك زیاتریش بێت، باشترە و خێری زیاترە.

بەشێکیشی بە ئەندازەی پێویست دەبێت لێی وەربگرێت، زیادەڕەوی و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە دوا پلەی کەماڵ لەو زانستەدا باش و پەسەند نییە.

ئەم سێ بەشە وەک لاشەی مرۆڤ وایە:

هەندێک حاڵەتی هەیە ستایشی دەکرێت، ئەو هەندەیە کەم بێت یان زۆر، وەک جوانی و لەش ساغی.

هەندێکیشی نەشیاو و زەمکراوە، کەم بێت یان زۆر، وەک دێزی ڕوخسار و ڕەوشت نزمی.

هەندێکیشی وایە ئەگەر دەستی پێوە بگریت پەسەندە ، وەک خەرج کردنی ماڵ، ئەوەی بەخشینە باشە، بەڵام دەس بڵاوی پەسەند و شیاو نییە.

هەروەها ئازایەتی:

بۆ خۆی باشە، بەڵام خۆسەپاندن و خۆ هاوێشتنە ناو هەندێك ڕوداو و گێژاوە وە بە هەڵەشەیی و بێ بیر کردنەوە، هەرچەندە لە ڕەگەزی ئازایەتی‌یە، بەڵام پەسەند کراو نییە...

## هەروەها زانستیش

## ئەم سێ جۆرەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت.

## یەکەم: ئەو عیلمەی کەم و زۆری خراپە:

ئەوەیە کە نە بۆ دین و نە بۆ دونیا سوودی لێ نەبینێت، یان زیانەکەی زیاترە لەو سوودەی لێی چاوەنوارِ دەکەیت، وەک زانستی سیحر و جادوگەری و تەلیسم و ئەستێرە ناسی و فاڵگرتنەوە، کە هەندێکیان هەر لە بنەڕەتدا هیچ سوودێک ناگەیێنن، بەڵکو بەفیڕۆدانی ئەو تەمەنە بەنرخە کە سەرمایەی مرۆڤە بە گەورەترین خەسارەت دەژمێررێت، لە دەست دانی کات و شتی بە نرخیش پەسەندکراو نییە. وە هەندێك زانست هەیە لە سەر گومانی خاوەنە کەی دەیەوێت کارێکی خۆیی پێ ساز بکات، چاوپۆشی لەو زیانە دەکات کە دوچاری دێت، ئەو جۆرە قازانجە ناکرێتە بەهانەی تووشبوونی ئەو زیانەی کە ڕووبەڕوی دەبێتەوە، بۆیە نابێت ئەنجامی بدات.

## دووهەم: ئەو زانستەی تا زیاتر هۆگری بیت پەسەند و خێردارترە

ئەوە عیلمە بە خودا ﷻ و پەیداکردنی زانیاری‌یە لە بارەی صیفەت و کردارەکانی خوداوە. هەروەها حاڵی بوون لە سوننەت و ڕەویەی پەروەردگار بەرامبەر دروستکراوەکانی، وە حیکمەت و کارزانی خودا لە ڕێکخستنی کاروباری ئاخیرەت بەسەر دونیادا.

بەڕاستی ئەمە زۆر پێویستە، خودی عیلمەکە شایستەیە بۆ ئەوەی بە دویدا بچیت، کە بە هۆیەوە دەگەیتە بەختیاری دوارۆژ، هەرچەندێك لە تواناتدا هەبێت و سەرفی بکەیت هێشتا ناگەیتە ئەو ئاستەی کە پێویستە

خۆتی بۆماندوو بکەیت، ئەوە دەریایەکی بەرفراوانە کە ناگەینە قوڵاییەکەی، ئەوەندە هەیە ئەوانەی بە چوار دەوریدا دێن و دەچن، نزیکی کەنارەکانی دەبنەوە و بە پێی توانا لێی بەهرەمەند دەبن.

وە کـەس نەیتوانیوە قووڵ بۆی دابچێت و خـۆی بهـاوێتە ناویەوە، مەگەر پێغەمبەران و ئەولیاکان و زانا پێگەیشتووە تێگەیشتووەکان، بە پێی جیاوازی پلە و پایەکانیان و بە پێی جیاوازی هێز و توانا و مەیل و تەقدیری پەروەردەگاریش بەرامبەریان. ئەمەیە کە پێی دەوترێت (عیلمی مەکنون) و دوڕری شاراوە، کە ناتوانرێت بخرێتە سەر کاغەز و، دەبێت بتوانیت فێری ببیت و بە چاوی خۆت حاڵی زانا پێگەیشتووەکانی عیلمی ئاخیرەت ببینیت، ئەو کاتە دەبێتە یارمەتی بۆ ئەوەی لەو زانستە شاراوەیە ئاگادارت بکاتەوە، وەک لە داهاتوودا نیشانەکانیان باس دەکەین. ئەمەش کە باسمان کرد سەرەتا و دەسپێکی ئەو زانستەیە[1] کە لە دواییدا دەبێت بە هەوڵ و موجاهەدەی ڕوحی و ریازەت کێشان و پاڵفتە کردنەوەی دڵ و خاڵی کردنی لە هەموو پەیوەندیە دونیاییەکان، ئەمەش یارمەتی دەر دەبێت بۆ فێر بوون و تێگەیشتن لەو عیلمە، کە خوو ڕەوشتی وەک پێغەمبەرانی خودا و ئەولیاکان لێ بکات و، تا بۆی دەردەکەوێت کە ئەوەندە بەشدارە لەو عیلمەدا بە ئەندازەی ئەوەی کە خودا ڕزقی داوە و لە ئەزەلەوە پێی بەخشیوە، نەک بە ئەندازەی تێکۆشانی خۆی.

---

(١) زەننونی میسری دەفەرموێت: لەگەڵ کەسێکدا دابنیشە کە کردەوەکانی فێرت دەکات نەک قسەکانی، زۆر لە خوداناسان دەگەڕان بە دوای کەسێکدا کە ڕەفاقەتی بکەن کە ئەهلی (معرفة الله) بوون، بۆ ئەوەی فێری ئەدەب ببن لێ یانەوە، سەرنجی ڕێنوومایەکان بدەن، با ئەوانە زانایش نەبن بەڵام، ڕەوشتیان وەک زانستی قورئان وابووە لە ناخیاندا، چونکە ئەدەب وەرگرتن بە هۆی کردارەوە دەبێت، وەک چۆن عیلم وەرگرتن بە هۆی قسە و گوفتارەوە دەبێت. اتحاف (٢٦٧/١).

(چونکە ئەم زانستە فەزڵی خودایە، لە بەرامبەر هیچ کارێکی دونیا وەدەس نایەت) لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کۆششی خۆی هەر بکات. چونکە تێکۆشان و لێبڕان کلیلی دەرگای ڕێنومایی‌یە، کە جگە لەو لێبڕانە هیچ کلیلێکی‌تری نییە.

## سێیەم: ئەو زانستانەی

## ئەندازەیەکی دیاری کراوی پەسەندە

ئەو زانستانەیە کە لە باسی (فەرزی کیفایە دا) باسمان کردن، ئەمەش بە پێی پێویست وەر دەگیرێت. هەر یەکێك لەو عیلمانەی کە زانینیان (فەرزی کیفایە)یە، یان کەمترین سنوور لێی نزیک دەبیتەوە، یان هەندێکی پێویستترە و دەبێت زیاتر زانیاریت هەبێت لە بارەیەوە، ئەمەش لە میانی کەم و زیاددا دەبینرێتەوە، یان بە تەواوی بە دوای هەموو پەڕاو و نهێنیەکاندا دەگەڕێیت، ئەمەش لە سەروی هەموبانەوەیەو، تا دوا ساتی ژیانیش ناگەیتە دوا ئامانجی تێر بوون لە فێربوون. **کەواتە تۆیش یەکێك بە لەم دوو کەسە:**

یان سەرقاڵی ژیانی خۆت بەو بە خۆتەوە خەریک بە، یان دوای ئەوەی کە خۆتت پێگەیاند مەشغوڵی کەسانێکی‌تر دەبیت، بەڵام نەخڵەتابیت بە کار و فرمانێکەوە خۆت خەریک بکەیت، خەڵکێکی‌تر چاک بکەیت و خۆیشت لە بیر بکەیت[1]. ئەگەر خەریکی کاروباری خۆتیت، ئەوا جگە لە وەدەست هێنانی عیلم کە (فەرزی عەینە) خەریکی هیچی‌تر مەبە، بە پێی ئەوەندەی بۆت ئەلوێت خەریکی زانست بە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە کار و فرمانە ئاشکراکانەوە هەیە، وەک فێربوونی نوێژ و طەهارەت و ڕۆژوگرتن..

---

(١) بۆ نموونە: ئەگەر ئامۆژگاری خەڵک بکەیت و وانەیان پێ بڵێیت و سوودیان پێ بگەیەنیت و خۆیشت کارت پێ نەکردبێت، کەواتە خەریکی خەڵکی تریت و خۆتت لە بیر کردووە.

# ئەوەی لە هەموو بابەتەکان گرنگترە و هەمویشیان لێی کەمتەرخەمن:

زانینی صیفەتەکانی دڵە، ئەوەی لەوبارەوە بیزانیت پەسەندە، یان نەشیاو و ناپەسەندە، لە بەر ئەوەی کە هیچ کەسێک نییە بە تەواوی دابڕنرێت لە هەموو صیفەتە خراپەکانی دڵ، وەک سوور بوون لە سەر ژیان و، ئیرەیی بردن و، ڕیاکاری و، فیز و دەمار و، خۆ بەشت زانین و، هاووێنەکانیان، کە ئەم صیفەتانە هەمویان کوشندە و نالەبارن.

وە گرنگی نەدان بە لادانی ئەم صیفەتانە و، خۆ خەریک کردن بە ڕواڵەتی کردارەکانەوە، وەک ئەو کەسە وایە تووشی گەڕی و دومەڵ بوبێت و، خۆی خەریک بکات بە سفت و خاوێن کردنەوەی ڕواڵەتی لەش و لاری و، نەچێت بە لای چارەسەرییە بنەڕەتیەکانەوە، کە دەبێت ئەو ماددە لا ببرێت، بە هۆی خوێن گرتن و کەڵەشاخ و دەرمانی ڕەوانی و پاک کردنەوەی ناو دەروونیەوە.

زانا ڕواڵەتیەکان [1] تەنها هانی خەڵکی دەدەن کە بۆ گرنگی دان بە کردەوە ئاشکرا و زاهیرەکان، وەک چۆن پزیشکە گەڕۆکە نەشارەزاکان لە چارە سەرکردنی لاشەدا تەنها بایەخ بە جوانکاری ڕواڵەتی دەدەن، بەڵام زانایانی عیلمی ئاخیرەت تەنها بایەخ بە پاککردنەوەی دڵ و دەرون و ڕیشەکێشکردنی هەموو ماددەیەکی شەڕ و خراپ دەدەن تیایدا. کە جێگەی چاندنی لێ تێک بدەن و، ڕیشەکانی لە نێو دڵدا هەڵبکێشن و خۆیانی بۆ یەکلایی بکەنەوە.

---

(١) کە ڕازین بە توێکڵەکان و کاکڵەکەیان ئیهمال کردووە، یان خۆیان بە ڕواڵەتی کارەکانەوە خەریک کردووە بە بێ ئەوەی گوێ بە نهێنییە شاراوەکانی بدەن. اتحاف (٦٩/١)

زۆربەی ئەو خەڵکە بۆیە پەلاماری زاهیری کردەوەکان دەدەن و وازیان لە پاککردنەوەی دڵەکانیان هێناوە، چونکە کردارە ڕواڵەتیەکان ئاسانە و (ئەعمالی قلوب)یش کە پەیوەندییان بە دڵەکانەوە هەیە زۆر گرانە، دیارە ئەوەی دەرمانێکی تاڵی ژەهراوی بۆ قووت نەچێت و نەتوانێت کە بیخواتەوە، هاوار دەبات بۆ جوانکارییەکی ڕواڵەتی و خۆی پێوە خەریک دەکات، تا ئەوەندەش خۆی ماندو دەکات کەچی کارەکەیشی بێ بەهرە دەبێت و، زیاتر نەخۆشییەکانی لە سەر گرانتر دەبن.

ئەگەر بە دوای ئاخیرەتدا دەگەڕێیت، مەبەستتە کە سەرفراز ببیت، وە لە تیاچوونی هەتاهەتایی خۆت دەپارێزیت، کەواتە خۆت بەو عیلمەوە خەریک بکە کە هۆکاری نەخۆشییە شاراوەکانت پیشاندەدات و، ڕێگەی چارەسەریشت بۆ دیاری دەکات. وەک چۆن لە چواریەکی باسی ئافەتە کوشندەکاندا درێژەمان پێ داوە.

لە پاشان ئەم هەوڵدانەت ڕاتدەکێشێت بۆ بڕینی پلەو مەقامە پەسەند کراوەکان، کە لە چواریەکی باسی پایە ڕزگار کەرەکاندا باسمان کردوون، چونکە ئەگەر دڵ ترسا و، زەندەقی لە کاری خراپە چوو، ئەو دڵە پڕ دەبێت لە شتی پەسەند کراو، هەروایشە.

زەوی ئەگەر پاک کرایەوە لە پوش و پەڵاش، جۆرەها ڕووەکی سوودبەخش و ڕیحانەی بۆنخۆشی تیا دەڕوێت، کەواتە تا بەتەواوی دڵت لەم دەردە کوشندانە خاڵی نەکەیتەوە و خۆت ئاسودە نە کەیت، ئەوا خۆت خەریک مەکە تەنانەت بە فەرزی کیفایەشەوە، بە مەرجێ کەسانێك هەبن کە پێی هەڵسابن و لە سەر تۆیان لادابێت، چونکە ئەوەی کە خۆی بە هیلاکدا ببات لە پێناوی ئەوەدا کە خەریکە ژیانی خەڵکێکی‌تر چاک ....................................

بکات ئەوە نەفامە[1]. ئای کە بێ عەقڵە ئەو کەسەی کۆمەڵێ دوپشک و مار چونەتە ناو بەرگ و پۆشاکەکەیەوە و خەریکن پێیەوە دەدەن و دەیکوژن، ئەویش مێشکوژێکی بە دەستەوە بێت و، ڕاوە مێشی پێ بکات، واتە مێش لە خەڵکیتر دوربخاتەوە، کە ئەوکارە نە فریای دەکەوێت و نە ڕزگاریشی دەکات لەو هەموو مار و دوپشکەی سەریان لە سینەی ناوە.

ئەگەر لە پاڵفتە و پاککردنەوەی نەفسی خۆت لێ بویتەوە، توانیت ڕوی دەرەوە وناوەوەی گوناە لە خۆت دور بخەیتەوە، ئەمەش بووە کارێکی ئاسایی و، سروشت وتەبیعەتی خۆت حەزی بەو خۆ پارێزیە دەکرد (کە ئەمەش بە دەگمەن جێبەجێ دەبێت)، ئەوکات خۆت بە فەرزی کیفایە خەریک بکە و، هەوڵیش بدە بە ڕێگەی پلەکاری ئەنجامیان بدەیت: دەست بکە بە خوێندنی کەلامی خوداﷻ ، لە پاشان فێربوونی سوننەتی پێغەمبەرﷺ، لە دوای ئەو زانستی تەفسیری قورئان و هەموو زانستەکانی پەیوەندیدار بە قورئانی پیرۆز لە زانینی ناسیخ و مەنسوخ و (مفصول و موصول) و (محکم و متشابە)[2].

---

(١) نەک لەبەر ئەوەی کە کاری خێر خراپە، بەڵکو لە بەر ئەوەی ئەگەر خۆی کامڵ نەبێت ناتوانێت خەڵکیتر چاک بکات و ،خوایش خۆهەڵکێشان و دەعواچی خۆش ناوێت. وەک ووتراوە: **فاقدُ الشيءِ لا يُعْطي**! (وەرگێڕ)

(٢) پێشتر باسی ناسیخمان کرد کە حوکمی ئایەتێکیتر هەڵدەوەشێنێتەوە، کە ئەم ئایەتە لە دوای ئەو هاتبێتە خوارەوە، یان ئەو ئایەتانەی کە حوکمەکانیان هەڵوەشاوەتەوە و ئەو حوکمانەی کە لەیەک جیا کراونەتەوە یان بەیەکەوە لکاون، پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە، یان ئایەتی (موحکەم) کە دەلالەت لە سەر مەبەستەکە دەکات و هیچ گۆڕانێکیشی بەسەردا نایەت، نە نەسخ و نە تایبەت کردن و نە تەئویل بۆ کردن، وەک ئەوەی خوداﷻ دەفەرموێت: (إنَّ اللهَ بكلِّ شَيْءٍ عَليمْ) ئەوە فرمانێکی سەلماوی ڕون و ئاشکرایە، هیچ تەئویل و گۆڕان و هەڵوەشاندنەوەیەک هەڵناگرێت کە موحکەمی پێ

# هەروەها زانینی دەربارەی سوننەت.

لەپاشان خۆی خەریک بکات بە لقەکانەوە، ئەوەش پێ دەوترێت زانستی مەزهەب لە (عیلمی فیقە) بە بێ ڕەچاوکردنی پرسە جیاواز و مەزهەبە جیاوازەکان، لەپاشان خەریک دەبێت بە عیلمی (أصول الفقه) و (چۆنیەتی وەرگرتن و هەڵێنجانی ئەحکامی شەرعی) بەم شێوە بەردەوام فێری یەکەیەکەی زانستەکان ببێت، تا ئەوەندەی تەمەنی ڕێگەی پێ دەدات و کاتی گونجاوی دەبێت. نابێت هەمو کاتی خۆت تەرخان بکەیت بۆ ڕۆچون و قووڵ داچوون لە یەک زانستدا، چونکە زانستەکان زۆرن و تەمەن کورتە و ئەم زانستانەش هەمویان ئامێر و هۆکار و دەستپێکی زانستەکانیترن، ئامانج زانینی خۆیان نییە، بەڵکو فێربوونی ئەوانی ترە بە هۆی ئەمانەوە، کەواتە تۆ نابێت ئـەوەندە لە نـاو عیلمی (ئالەت)دا بمێنیتەوە و ئامانجە سەرەکییەکە لە بیر بکەیت.

بۆ نموونە: لە کتێبی زمانەوانیدا، لەوەی بڵاوە و دیارە لە ناویاندا، کە زمانی عەرەبی و قسە پێ کردن و وشە نامۆکان و زاراوەکانی بزانیت، بۆ ئەوەی لە واتای قورئان و وشە نامۆکانی فەرموودەدا دانەمێنیت، ئیتر زۆر قوڵیش بۆی دامەچۆ! لە زانستی (نحو)دا، ئەوەی پەیوەندارە بە کیتاب و سوننەتەوە فێری ببە، هەموو زانستێک کورتەکەی و ناوەند و ئاستە سروشتیەکەی (واتە: لەمیانی نەکەم و نە زۆر)، وە ئەوپـەڕەکەیشـی هـەیە کە بچیتـە بنج و بنەوانی

---

دەڵێن. ئەگەر دەلالەت کردنی دەقەکە لە سەر واتاکەی بە ڕوونی دیار نەبوو، وە بە نارەحـەتیش هەوڵت بدایە هەر نە ئەزانـرا، نـە بـە ئـەقڵ و نـە بـە نـەقڵ و پاڵپشـتی فەرموودەکان نە ئەزانرا، ئەوە (موتەشابیهاتە) و حوکمی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەوە ئەو عیلمەیە کە خودا بۆ خۆیی هەڵگرتووە و واتاکەی ڕانەگەیاندووە. زۆر لێکدا نەوەیتر هەیە، بنوارە: تەفسیری قورطوبی ئایەتی ٧ آل عمران.

ئەو زانستەوە.

لێرەدا ئێمە ئەوەی پێویستە فێری ببین ئەوە باسی دەکەین، لەوەی پەیوەندارە بە زانستی تەفسیر و فەرمودە و فیقە و کەلامەوە، ئەوانیتریش بە هەمان پێوەری زانستی بۆیان بپێوە:

## کورتەی خوێندن بۆ عیلمی تەفسیر:

ئەوەیە کە دوو ئەوەندەی قەبارەی قورئان، لەو زانستی تەفسیرە شارەزا بیت کە لە سەری نووسراوەتەوە، وەک چۆن (عەلی واحیدی نیشاپوری) دایناوە بە ناوی (الوجیز). ناوەندو میانە ڕەوەکە یشی ئەوەیە:

سێ ئەوەندەی قەبارەی قورئان گەورە بێت، وەک ئەوەی تەفسیرێکی داناوە بە ناوی (الوسیط)، لەوە زیاتر سنووری بۆ نییە و، پێویستیشی پێی نییە و هەتا کۆتایی ژیانیش هەر پێی ناگات.

## لە بارەی فەرموودەوە:

**فێربوونی کەمەکەی ئەوەیە:** کە صەحیحی بوخاری و موسلیم و مەتنی فەرمودەکان لای کەسێکی زانای شارەزا بخوێنیت. ناوی سەنەد و ڕاوی و پیاوەکانیشی، ئەوانەی پێش تۆ خۆیان پێوە خەریک کردووە، بۆت هەیە پشت بە هەوڵەکانی ئەوان ببەستیت و متمانەیان پێ بکەیت، پێویست نییە لەسەرت کە مەتنی هەر دو صەحیحەکە لەبەر بکەیت، بەڵام ئەوەندەی بخوێنیت تا لێی تێبگەیت و لە کاتی پێویست بتوانیت بگەڕێیتەوە سەریان.

**ناوەندەکەیشی ئەوەیە:**

بتوانیت ئەو زیادانەی لەوان دەرچوون، کە لە موسنەدەکانی شەش کتێبە صەحیحەکەدا هەیە، فێریان ببیت.

**ئەوپەڕەکەیشی ئەوەیە:**

کە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی باسی کراون لە (بن هێزەکان و بە هێز و دروست و نەخۆش ) و زانینی هەمو ڕێگە جیاوازەکان بۆ گواستنەوەو گەیاندنی فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ناسینی ئەحواڵی پیاوەکان و ناوەکانیان و وەصف و پیشە و پێناسەکانیان.

**لە بارەی (فیقە)یشەوە کورتەکەی:**

شارەزابونە لە کتێبێکی کورتی شەرع وەک (موختەصەری موزەنی) ڕەحمەتی خودای لێ بێت؛ کە لە دو توێی کتێبی (خُلاصَةُ المُختَصَر)دا ڕێکمان خستۆتەوە و دامان ناوە[1].

**ناوەندەکەیشی ئەوەیە:** شارەزا بیت لە کتێبێک سێ ئەوەندە بێت، وەک ئەوەندەی کە لە کتێبەکەماندا (الوَسیط في المَذهَب) نووسیومانە.

**درێژ و ئەوپەڕەکەیشی ئەوەیە:** کە لە کتێبی (البسیط)دا دامانناوە. یان کتێبە درێژ و بەربڵاوەکانی فیقهی ئیسلامی.

## لە بارەی عیلمی کەلامیشەوە:

مەبەستی سەرەکی لە فێربوونی ئەم عیلمە، پاراستنی بیر و باوەڕە، ئەوەی دروستە و ئەهلی سوننە لە سەلەفی صالحینەوە بە ئێمەیان گەیاندووە، لە دوای ئەوەوە ئیتر هەوڵدانە بۆ دەرخستنی ڕاستی فرمانە شاراوەکان، ئەوەش لەم ڕێگەوە نابێت.

---

(١) لە (دار المنهاج) ئەم کتێبەی ئیمامی غەزالی بە ناوی (خلاصة المختصر و نقاوة المعتصر) لە چاپ دراوە.

## مەبەست لە پاراستنی سوننەت:

**کورتەی پێداویستی ئەوەیە:**

کە شارەزا بێت لەوەی نووسیومانەتەوە لە کتێبی (قواعد العقائد)و بنەماکانی بیر و باوەڕ، کە یەکێکە لە کتێبەکانی ئیحیا کە لەبەردەستدایە.

**ناوەندي پێویستیشی ئەوەیە:**

کتێبێکی صەد پەڕەیی بخوێنێت، وەک ئەوەی لە کتێبەکەماندا ئامادەمان کردووە بە ناوی (الإقتِصادُ في الإعتِقاد).

**ئەوەش پێویستە** بۆ ئەوەی بتوانیت بە بەڵگە ڕوبەڕوی **بیدعەچیەکان** ببیتەوە و بەرپەرچیان بدەیتەوە، کە شوبهەکانیان لە دڵی خەڵکە ئاساییەکە دەربکێشیت، ئەمەش تەنها سوود بەو کەسانە دەگەیێنێت کە هێشتا تۆخ نەبونەتەوە لە سەر عیناد و دەمارگیری.

بەڵام ئەوانەی بیدعەکارن، دوای ئەوەی هەندێك لە دەردەشە و شەڕەقسەیان زانی، ئەو کاتە بۆ ڕێنومایی کردنیان کەمتر دەتوانیت بە عیلمی کەلام بیانگێڕیتەوە، ئەگەر بە بەڵگەی زۆرەوە بێ دەنگیشی بکەیت، ئەوا کۆڵ نادات و واز لە مەزهەبەکەی ناهێنێت، دەڵێت:

من زۆر شارەزا نیم، وە دەڵێت:

وەڵامی ئەم قسانەی ئێوەم هەیە، بەڵام من ناتوانم، وای دەگەینێت کە بەرامبەرەکەی تەنها لە ڕوی جەدەلەوە بەرندەیە، ئەینا ڕاستی لای ئەو نییە.

**بەڵام خەڵکی ئاسایی:**

ئەگەر قسەیان بۆ کرابێت و بە هۆی موجادەلەوە لە خشتە برابن، ئەوا دەکرێت بهێنرێنەوە سەر ڕێگە، بە هەمان توانای قسە و بەڵگەی بەرابەر، تا ئەو کاتەی کە تۆخ دەبنەوە لە دە مارگیری بۆ بیر و ڕاکەیان، ئیتر ئەو کاتە لێیان بێ

ئومێد دەبیت، چونکە بە ڕاستی یەکێك لە هۆکاری چەسپاندنی بیر و باوەڕ لە مێشکدا دەمارگیری‌یە، ئەمەش یەکێکە لەو ئافەت و بەڵاگەورانەی ڕوڵە زانایانی خراپ دەکەن.

بە لای خۆیانەوە زۆر بەرگری لە حەق و ڕاستی دەکەن، ئیتر سەیری خەڵکانی‌تر بە چاوی قێز و بێز و سووکی‌یەوە دەکەن، داوای سنگ دەرپەڕاندن و بەرهەڵستی و ڕوبەڕوبوونەوە دەکەن و، حەز لە خۆدەرخستن دەکەن و، ڕێگەی زیاتریان دێتەپێش، کە هەوڵی سەرخستنی ڕێگا پوچ و باطیڵەکەی خۆیان بدەن، زیاتر سووردەبن لە سەر ئەو ڕێگە هەڵەیەی گرتوویانەتەبەر.

خۆ ئەگەر بە ڕێگەی نەرمی و هێمنی و بەزەیی و زوبانی ئامۆژگاری‌وە، بە بێ ڕۆحییەتی شکاندنەوە و دەمارگیری و بێ ڕێزی بەرامبەریان، ئەگەر بەم شێوە حەکیمانەیە لە گەڵیاندا بدوانایە و، وتووێژیان بکردایە، ئەوا لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو دەبوون.

دیارە دەسکەوتی جاه و مەقام بە زۆربی شوێن کەوتووانە، ڕاکێشانی دڵی ئەو خەڵکەش بە دەمارگیری و لەعنەت و جنێوفرۆشی بۆ بەرابەرەکانیان نابێت.

بەڵام ئەوان دەمارگیریان کردە ئامێری سەرکەوتن و نەریتی هەوڵ و تەقوللاکانیان و، ناویشیان لێ ناوە بەرگریکردن لە دین و تێکۆشان لەبری موسوڵمانەکان، کە بەڕاستی ئەم جۆرە لووتبەرزی و هەڵس و کەوتە نادرووستە، خەڵکیش لێی زەرەرمەند دەبن و ئەوەندەی‌تریش کاری بیدعە لە دەروونیاندا جێگیر دەبێت.

# پرسه جیاوازەکان:

ئەو پرسە تایبەتیانەی کە لە میانی مەزهەبەکاندا جیاوازی بیر و ڕایان لەسەرە، کە لەم چەرخەدا هاتۆتە ئاراوە، وە لەم دواییەدا جۆرەها پەڕاوی تایبەت و دانراو و بەرگی کتێبی گەورەیان لەسەر نووسیوە کە هەرگیز لە چەرخی سەلەفدا ئەم جۆرە پرسانە نەبوون.

دەخیلتیم نەکەی بسوڕێیتەوە لە دەوری ئەو پرسانە و، خۆت بهاویتە ناو ئەو جەنگەڵستانەوە، وریابە و وەک چۆن لە ژەهری کوشندە خۆت دەپارێزیت ئاوا لێیان دوورکەوە، ، ئەوە دەردی بێ دەرمانە. ئەوەیە کە ڕێڕەوی فوقەهاکانی گۆڕیوە بە لای خۆهەڵکێشان و کێبرڕکێی یەکتریدا، کە لە مەودوا باسی ئافەت و دەردە کوشندەکانی دەکەین.

لەوانەیە ئەم قسەیە لە خاوەنەکەی ببیستیت کە دەوترێت:

(النّاسُ أعداءُ مَا جَهِلُوا) واتە:

خەڵکی دوژمنە بەوەی کە نایزانێت! ئەڤ گومانە مەبە ئەم نموونە کە دەیهێنینەوە بە سەر کەسێکی شارەزادا کەوتووە. ئامۆژگاری لە کەسێك وەربگرە بۆخۆی تەمەنێکی زۆری لەو پرسەدا بە فیڕۆ لە دەسداوە، وە زۆر زیاتر لە پێشینەکانی پسپۆڕ لەو بوارانەدا، زمان و قەڵەمی نووسین و کتێبدانان و لێکۆڵینەوە و جەدەل و ڕونکردنەوەی خستۆتەکار، لە پاشان خودای گەورە ڕێگای ڕوشد و سەرفرازی نیشانداوەو خستوویەتیە ناو دڵیەوە، وازی لەوپرسە خیلافانە هێناوە کەڕای جیاوازیان لە سەرەو ئیتر خەریک بووە بە خۆیەوە. کەواتە نابێت قسەی ئەو کەسە فریوت بدات کە دەڵێت:

(فتوادان کۆڵەکەی شەرعە، عیللەت و هۆکارەکانیش نازانرێت، مەگەر بە فێربوونی عیلمی (ئیختیلاف)جیاوازای بیروڕا) چونکە عیللەت و شیتەڵکاری پێویست لەناو مەزهەبەکاندا هەیە و باس کراوە، لەوە زیاتر دەبێتە موجادەلە و

قسه بەزۆراندان، کە زاناکانی چەرخی یەکەم و صەحابەکانیش ئەمەیان نەزانیوە و ڕێگەیان پێ نەداوە، خۆ ئەوان لە غەیری خۆیان زۆر زاناتر بوون بە عیللەت و هۆکارەکانی فتواداں.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم جۆرە ڕوبەڕوبوونەوەو شەڕەقسەیە لە عیلمی مەزهەبدا سوودبەخش نییە، زیانیش دەگەیێنێت بە فەقیهو، زەوقی هونەریی تێک دەدات و نهێنیەکانی لێ دەشێوێنێت.

بەڵکو ئەوەی کە موفتی لە سەری دەڕوات و خووی پێوە گرتووە، ئەگەر خاوەنی زەوق و هەستێکی فیقهی بێت، ئەوا هەرگیز ناتوانێت لە زۆربەی بابەتەکاندا لەگەڵ مەرجەکانی کێبڕکێ و موجادەلەدا یەکتر بگرێتەوە، ئەو کەسەی سروشتی بیرکردنەوەی لەگەڵ ڕەسم و یاسای جەدەل و دەمەدەمێدا داهاتووە، مێشکیشی بە خواستەکانی جەدەل و پرسە جیاوازەکان ڕادێت و مل رادەکێشێت، ئیتر ترسنۆک دەبێت بەرامبەر بە زەوقی پرسە فیقهی‌یەکان و لەو بوارەشدا دوادەکەوێت.

دیارە ئەوەش کە خۆی بەو پرسە خیلافیانەوە خەریک دەکات، تەنها ئەوەیە کە بە دوای ناوبانگ و شۆرەتدا دەگەڕێت، بەهانەش بۆ خۆی دێنێتەوە کە ئەو دەگەڕێت بە دوای عیللەت و هۆکاری پرسە فیقهییەکاندا، بەڵام هەموو کاتێکی خۆیشی بە عیلمی مەزهەبەوە خەریک دەکات.

ئەوەندەی ئەم مرۆڤە شەیتان صیفەتانە مەترسیان زۆرە، تۆ وات لێ دێت کە ئەمین ببیتەوە لە شەیتانە جنۆکەکان، بە ڕاستی جنۆکەکان حەواو نەتەوە، ئەمان جێگەی ئەوانیشیان گرتۆتەوە، لە ماندوکردنی موسوڵمانان و تێکدانی بیر و باوەڕ و گومڕاکردنیان.

## پوختەی قسە ئەمەیە:

ئەوەی لە لایەن عورەفا و دانایانەوە لێت وەردەگیرێت ئەوەیە، کە وا دابنێ لەو جیهانەدا تەنها تۆ لە حزوری خودای خۆت دایت، مردن و ڕاوەستانی حەشر و لێپرسینەوەی مەیدانی قیامەت و بەهەشت وجەهەننمیشت لە بەردەمدایە، بزانە ئەوەی بە دەستەوەیەو خەریکیتی، سوودت پێ دەگەیەنێت، ئەوەی سوودبەخشە بهێڵەرەوە و، واز لە هەمو شتێکی تر بهێنە و سەلامی خودات لەسەر بێت.

یەکێك لە شێخەکان هەندێ لە زانایانی بینی لە خەودا، پێی ووت:

هەواڵی ئەو هەموو عیلم و زانینەت چی لێ بەسەر هات کە هەمیشە خەریکی دەمەقاڵێ و موجادەلە بویت لە سەریان؟

دەستی درێژ کرد و ناو لەپی کردەوە و فوویەکی پیا کردو، پاشان ووتی: هەمووی ئاوا وەک تۆزی بەربا پرش و بڵاو بوویەوە، تەنها سوودێکم وەرگرتبێت لەو دوو ڕکاتە نوێژە بووە کە لە نیوەی شەودا بەئیخلاصەوە کردبێتم[1].

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ دا هاتووە:

**ما ضَلَّ قومٌ بَعدَ هُدىً كانُوا عَليهِ إلاَّ أُوتُوا الْجَدَل**[2].

لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

**مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ** (الزخرف/٥٨).

ئەوەی خودا ڕێنومایی کردبێت هەرگیز سەرگەردان و گومڕا نەبوون، مەگەر تووشی جەدەل و بەربەرەکانێی یەکتری بوبنەوە وەک قورئانیش فەرمویەتی.

---

(١) قُوْتُ القلوب (١٣٢/١) حِلْيَةُ الاولياء (٢٥٧/١٠).

(٢) رواه الترمذي ٣٢٥٣ وابن ماجه ٤٨.

ئەمەیان هەر بۆ گێچەڵی هێنایە پێش، چون ئەمانە کۆمەڵێکن شەڕ دەفرۆشن[1].

فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتە بە جەدەل و شەڕەقسە لەیەک دەداتەوە:

{فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ (ال عمران/٧)}

واتە: ئەوانەی کە دڵیان کینەو دەخەزاری تێدایە و لە ڕاستی لایانداوە، مەبەستی خودا ئەوانەیە کە ئەهلی جەدەلن،

(فَاحْذَرْهُمْ) خۆتانیان لێ بپارێزن[2]..

هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:

**يَكونُ فِي آخِرِ الزَّمانِ قومٌ يُغْلَقُ عنهُم بابُ الْعَملِ و يُفتَحُ عليهِم بابُ الْجَدَلِ**[3].

واتە:

لە کۆتایی زەماندا هۆزێک پەیدا دەبن، دەرگای کار و کۆششیان لێ دادەخرێت و، دەرگای قسە و موجادەلەیان لەسەر دەکرێتەوە.

لە هەندێك ئەخبار و فەرموودەدا هاتووە:

**إنَّكُمْ فِي زمانٍ أُلْهِمْتُمْ فيهِ الْعَمَلُ و سَيأْتِي قَومٌ يُلهَمُونَ الجَدل**[4].

---

(١) قورئانی پیرۆز، ماموستا هەژار (٦٩٣).

(٢) البُخاري (٤٥٤٧) مُسلم (٢٦٦٥) مَرفوعاً: إذا رأَيْتُمُ الَّذينَ يَتَّبِعونَ ما تَشابَهَ مِنه ... فَأُولئِكَ الْذينَ سَمَّى اللهُ ... فأَحْذِرُوهُم.

(٣) قوتُ القُلوب (١٣٨/١)

(٤) قوتُ القُلوب (١٣٨/١) وقولُ العِراقي لم أجدْه في (تُخريجِه) فَعلى احتمالِ رفْعه ولكن الأمرُ ليس كذلِك و هو قَريب من قول الْأَوزاعىّ كما فى إقتِضاء العلمِ و العَملِ (١٢٢) إذا أرادَ اللهُ بِقَومٍ شرّاً، فَتَحَ علَيهِمُ الْجَدَلَ و مَنَعَهُمُ الْعَمَلَ

ئێوه له زەمانێکدا دەژین خودا ئیلهامی دڵی کردوون چۆن کار بکەن، دوای ئێوه قەومێك پەیدا دەبن کە تەنها فێری دەمەدەمێ و جەدەل دەبن، ئەوەیان ئیلهام کراوه. له خەبەری مەشهوردا هاتووه:

**أَبغَضُ الْخُلْقِ إلى اللهِ تَعالى الْأَلَدُّ الْخَصِمُ**[1].

خودای گەوره له هەموو دروست کراوانی ڕقی لەوانه زیاتر دەبێتەوه، که له بەرگری له باطیل و ناڕەواکانیان توند و ڕەقن و حەزیان له هونەری موجادەلەیه.

هەروەها له فەرموودەدا هاتووه:

**مَا أُوتِيَ قَومٌ الْمَنطقَ اِلَّا مُنِعوا العَمَلَ**[2]. واته:

هەر هۆز و تاقمێك هێزی وتن و ڕەوانبێژییان پێ دراوه، ئەوەیه که ڕێگریان لێدەکرێت که کار بکەن.

(۱) رواه البخاری (۲٤٥۷) مسلم (۲٦٦۸).

(۲) قال صاحبُ القُوتِ: (۱۳۸/۱) رَوىَ الحکیمُ بن عیینه عن عبدالرحمن بن ابي لیلا قال: قال رسول ﷺ: ما أُوتِیَ .... و شواهد ما سبق. وقال الزُبَیدیُ: و هو حدیثٌ مُرسَلٌ. اتحاف (۲۷۸/۱)

# بەشی چوارەم

## بۆچی ئەو خەڵکە ڕویان لە عیلمی خیلاف کردووە؟

## (زانینی ڕا جیاوازەکان)

## باس کردنی ئافەتی ڕوبەڕوبونەوە و کێشمەکێش و شەڕە قسە و مشت و مڕ

## باسی مەرجەکانی ڕێگەدان بەم کارانە

# هۆکاری ڕوکردنی خەڵکی لە عیلمی خیلاف (ڕا جیاوازەکان)[1].

بزانە: لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ خولەفای راشیدین کە پێشەوایانی ڕاستەقینەی حەق وێژی و، زانابوون بە خودا و زات و صیفەتەکانی و، تێگەیشتوو و شارەزا بوون لە ئەحکامەکانی دین‌دا، ئەمانە جێنشینی پێغەمبەرﷺ بوون، بە سەربەخۆیی بۆ ڕوداوەکان توانای فتوادانیان هەبووە، پێویستییان بە کۆمەکی فوقەهاکانی سەردەمی خۆیان نەبووە، مەگەر بە دەگمەن لەو ڕوداوانەی کە زۆر پێویستی بە ڕاوێژ هەبوبێت.

کەواتە زاناکان لەم سەردەمەدا خۆیان یەکلاکردۆتەوە بۆ وەدەست هێنانی (عیلمی ئاخیرەت)، خۆیان بە دوور گرتووە لە فتواداندا و لە هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەندارییان بە خەڵکەوە هەیە لە ئەحکامی دونیایی، وە بە هەموو تواناوحەقیقەتی ئیجتیهادەکانیان ڕویان لە خودا دەکرد، وەک چۆن لە ژیاننامەکانیان وەرگیراوە[2].

---

(١) عیلمی خیلاف: واتە زانستێکە بە هۆیەوە چۆنیەتی هێنانەوەی بەڵگە شەرعیەکان دەزانیت لەگەڵ نەهێڵانی شوبهەو کەم و کوڕی بەڵگەکان، بە هێنانەوەی بەڵگەی دروست و تۆکمە، وە بەرگری کردن لەو ڕا دروستەی کە دەیەوێت سەری بخات لە نێو ڕا جیاوازەکاندا. بۆ زانیاری زیاتر بنواڕە: اتحاف (١/٢٧٨).

(٢) وەك لە: السُنن الدَّارميَ (١٣٧)دا هاتووە کە عبدُالرَّحمن بنُ أبی لیلی فەرمویەتی: لەم مزگەوتەدا سەد و بیست زانای ئەنصاری تێدابووە، هەر کامێکیان پرسیاری حەدیس و فەرمودەیێکیان بکردایە، حەزیان دەکرد یەکێکی‌تر لە جیاتی ئەوان پرسیارەکەیان لێ بکردایە و هەر پرسیارێکیش لە یەکێکیان بکرایە لە بارەی فتواوە، حەزیان دەکرد یەکێکی‌تر فتواکەی بۆ بدانایە.

کاتێك خەلافەتی ئیسلام گەیشتە کەسانێکی‌تر کە بە مافی ڕەوای خۆیان پێی نەگەیشتبوون و، نەیاندەتوانی بە سەربەخۆیی فتوا بدەن، ناچار بوون کە کۆمەک و یارمەتی لە فوقەهاکانەوە وەربگرن و، لە هەموو بوارەکاندا لەگەڵ خۆیاندا دایان بنێن، بۆ ئەوەی لەبارەی ئەحکامەکانەوە فتوایان لێ وەربگرن.

هەندێك لە زانایانی تابیعی هەبوون کە لە سەر ڕێگاو و بەرنامەی ڕشتەی یەکەم مابونەوە و، لە سەر صەفوەت و پاکی ئەم دینە بەردەوام بوون، هاو ڕێبازی زانایانی ئەصحاب و هەڵس و کەوتی ئەوان بوون، ئەگەر داوای فتوا و قەزاوەتیان لێ بکرایە، ڕایان دەکرد و خۆیان دەرباز دەکرد، پشتیان لە مەنصەب و دەستەڵات دەکرد، تا خەلیفەکان ناچار دەبوون کە بە ناچاری یان بە خورتی و زۆرەملێ بیانخەنە ژێرباری قەزاوەتەوە.

خەڵکی ئەو چەرخ و زەمانەش دەیانبینی زاناکان چەندێك سەربەرز و ڕێز لێ گیراون، وە چۆن خەلیفە و ئەمیر و والی‌یەکان ڕویان لێ کردون و، ئەوانیش پشتیان لەوان کردووە، ئیتر مەیلی دڵیان داوە بە فێربوون و وەدەستهێنانی زانستی، بۆ ئەوەی لای ئەمیر و والی‌یەکان هەمان عیززەت و پلە و پایەیان دەست بکەوێت.

بۆیە خۆیان یەکلاکردەوە بۆ فێربوونی زانستیی فتوادان، خۆیان خستە بەرچاوی فرماندەکان، خۆیانیان پێ ناساندن، داوای پەیوەندی و وەزیفەیان لێ کردن، هەندێکیان سەرکەوتن و هەندێکیشیان بێ ئومێد بوون، ئەوەیش کە سەرکەوتووبوو لە سوکایەتی و بێ عیززەتی دەربازی نەدەبوو، حاڵ وای لێ هات فەقیهەکان کە کاتی خۆی بە دوایاندا دەگەڕان، ئەوان بە دوای والی‌یەکاندا وێڵ بوون، دوای ئەوەی عیززەتیان لە دەست دا، ئیتر ئەمان ڕویان لە دەستەڵاتداران دەکرد و قەبوڵی ژێر دەستەییان دەکردن. مەگەر کەسانێکی

کەم لە هەموو چەرخەکاندا، کە بە ویقار و عیززەتی نەفسی خۆیانەوە مابێتنەوە. زیاتر خەڵکەکە و دەستەڵاتداران ڕوویان لە زانستی فتوا و قەزاوەت بوو، بۆ دابین کردنی پێویستیەکانیان و میانگیری لە نیوانیاندا.

لە پاشان کەسانێکی‌تر پەیدا بوون لە گەورە زانایان و ئەمیرەکان، کە گوێ بیستی قسە و پرسیاری خەڵکی دەبوون دەربارەی زانستی بنەماکانی عەقیدە و بیر و باوەڕ، حەزیان دەکرد بەڵگەکانیان لێ ببیستن، گیانی ڕووبەڕووبوونەوە و کێشمەکێش و موجادەلەیان تیا دروست دەبوو .

خەڵکەکە ڕوی کردە فێربوونی (عیلمی کەلام) کتێبی زۆریان لە سەر نووسی، ڕێگەی دەردەشە و نیقاش و گفتگۆیان ڕێکدەخست و دیاری کرد، ڕێنماییان دەردەکرد بۆ چۆنیەتی هونەری بەرپەرچ و ڕەددانەوە و پرسە دژ بە یەکەکان و لەسەر نووسینیان، وایشیان دەگەیاند کە تەنها مەبەستیان بەرگری کردنە لە دینی خودا و پاراستنی سوننەت و، سەرکۆنەکردنی بیدعەچییەکان، وەک چۆن ئەوانەی پێش ئەوان بوون وایان دەگەیاند کە تەنها مەبەستیان لە زانستی فتوا و ئەحکامی شەرعی دا ڕاپەڕاندنی کاری موسوڵمانان و، بەزەیی پیا هاتنەوە و ئامۆژگاری کردنیانە.

لەپاشان کە سانێکی‌تر لە گەورە زانایان دەرکەوتن، بەلایانەوە نەشیاو بوو زیاتر ڕۆبچن لە عیلمی کەلام دا و دەرگای قسەو ڕووبەڕووبوونەوە بکەنەوە، چونکە کردنەوەی دەرگای موجادەلە و دەمەقاڵێ، دەمارگیری خراپ و بەر هەڵستی و شەڕە قسە و جنێودانی لێ دەکەوتەوە، کە خوێنی تێدا دەرژا و وولاتی ویراندەکرد، بۆیە مەیلی نەفسی ئەمانیش چوو بە لای ئەوەدا کە ڕووبەڕووبوونە وە و دەردەشەکان لە سەر پرسە فیقهیەکان بێت، وە ڕونکردنەوە-ی ڕای پەسەندتر بێت، بە تایبەتی لە مەزهەبەکانی شافیعی و ئەبی حەنیفەدا ﷺ.

ئیتر خەڵکی وازیان لە عیلمی کەلام و جۆرە زانستەکانیتر هێنا و، ڕویان کردە پرس و ڕا جیاوازەکان، بە شێوەیەکی تایبەتی لە میانی پێشەوایان شافیعی و ئەبی حەنیفەدا، وە ئاسانکاریان نیشاندەدا لە دەربڕینی خیلاف و جیاوازی لەگەڵ مالیک و سۆفیانی سەوری و ئەحمەد و ئەوانیتردا.

وایشیان دەگەیاند کە مەبەستیان تەنها وەرگرتن و هەڵێنجانی وردەکاریەکانی ئەحکامی شەرعە، لەگەڵ باسکردنی بەڵگەی (پرسە فەرعیەکانی مەزهەب) و، دیاری کردنی بنەما و چۆنیەتی فتوادان، چەندین کتێب و پەڕاو و پرسی هەڵێنجراوی شەرعیان لە سەر دانا و، جۆرەکانی موجادەلە و چۆنیەتی کتێب دانانیان ڕێکخست و، بەردەوام بوون لە سەر ئەم هەوڵەیان تا ئێستا[1]..

نازانین لە چەرخەکانی داهاتوودا خودای گەورە ﷻ چ ڕوداو پێشهاتێکمان دەخاتە بەرچاو.

ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو کە زانا و شەرع زانەکان ڕوویان کردە پرسە خیلافی و جیاوازەکان و، بابەتی ڕوبەڕوبوونەوە و موجادەلە کردن.

وە ئەگەر یەکێك لە ئەهلی دونیا و دەستەڵاتدارەکانی پێیان خۆش بوایە پێچەوانەی ڕای یەکێك لە ئیمامەکانی تر بن و، لە فتواکانیان هاوبیر و هاوڕازیان نەبن، یان حەزیان بە زانستێک لە زانستە ئیسلامیەکان نەکردایە، ئەوا فوقەها و زاناکانیش لەگەڵ ویست و مەیلی ئەواندا ئەبوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کار و بەڵگە دۆزینەوە و بەربەرچدانەوەیان بەوە دەزانی، کە خزمەتی زانستی دین دەکەن و، گوایە هیچ ئامانجێکیشیان نییە جگە لە نزیک بوونەوە لە خوداو، وەرگرتنی ڕەزامەندی پەروەردگارﷻ .

---

(١) واتە: تا ساڵی دانانی کتێبی ( إحیاءُ علومِ الدین) کە ساڵی ٤٩٨ی کۆچیە. اتحاف (١/٢٨٢).

# ڕونکردنەوەی تێکەڵکردنی زانایان دەربارەی ڕوبەڕوبوونەوەکان و، لێکچواندنیان بە ڕاویژ کردنی صەحابەکان و وتووێژی میانی سەلەفی صالحین

بزانە ئەم جۆرە زانایانە وردە وردە خەڵکی ڕادەکێشن تا پێیان بسەلمێنن، مەبەست و ڕێگەی ئێمە لەم گفتگۆیانە گەڕان و وێڵ بوونە بە دوای حەق و ڕاستیدا، چونکە دەرکەوتنی حەقمان مەبەستە، وە بە دڵ بگەڕێیت بە دوای ڕاستیەکاندا بە بیرکردنەوە و کۆکردنەوەی ڕاو بۆچونەکان، ئەوا سوود و کاریگەری خۆی دەبێت، صەحابەکانیش هەر بەم شێوە ڕاوێژەکانیان لەگەڵ یەکتر ئەنجام دەدا، وەک چۆن لە پرسی (باپیر و براکاندا) کە چەندیان بەر دەکەوێت لە میراتدا، ڕاوێژیان کردووە و، لە بارەی لێدانی (حەد) بۆ کەسێك کە ئارەق بخواتەوە، یان هەڵە کردنی ئیمام (لە فتوادا)کە زیانێکی لێ بکەوێتەوە (دەبێ بیبژێرێت)، وەک چۆن ئافرەتێك لە ترسی هەیبەتی حەزرەتی عومەر منداڵەکەی لە بار چوبوو و ئەوێش خوێنەکەی بژارد، وە هەموو ئەو پرسە تایبەتیانەی لە عیلمی میرات و ئەوانیتردا باسیان کراوە ، وە باس کردنی ڕای شافیعی و ئەحمەد و موحەممەدی کوڕی حەسەن و مالیک و ئەبو یوسف و زاناکانی تریش، بۆ دڵنیا بوونت لە سەر بوونی ئەم تێکەڵ کردنە، ئەم باسەت بۆ ڕون دەکەمەوە: **بۆ گەڕان بە دوای حەقق و ڕاستیدا، یارمەتی و هاوکاری کردن بەشێکە لە دین، بەڵام هەشت مەرج و نیشانەی هەیە:**

**یەکەم:** ئەگەر ئەو ماف و حەققەی بە دوایدا دەگەڕێت بەشێک بێت لە فەرزی کیفایە، نابێ خۆی پێوە خەریک بکات، تا لە (فەرزی عەین) و هەمو پێداویستیەکانی لێ نەبوبێتەوە. ئەوەی ئەنجامدانی کارێکی لەسەر پێویست بوو، وە ئەو کارە (فەرزی عەین) بوو، بەڵام ئەو خۆی بە کارێکی (فەرزی کیفایە)وە

سەر قاڵ دەکرد، واش بگەینێت مەبەستی ڕاستییە، ئەوە کابرایەکی درۆزنە، نمونەی ئەمە: وەک ئەو کەسەیە کە بۆ خۆی نوێژی تەرک کردووە، کەچی بازرگانی دەکات بۆ هێنان و فرۆشتن و چنینی قوماش، بەهانەیشی ئەوە بێت و بڵێت:

کە من مەبەستم ئەوەیە عەورەتی نوێژخوێنەکان دابپۆشم، تا بێ بەرگ نەبن و بە ڕووتی نوێژەکەیان نەخوێنن.

لەوانەیە ئەم ڕوداوە بگونجێت و دروست بێت کاری وا هەبێت، وەک چۆن فەقیهێک فتوا بۆ پرسێکی زۆر دەگمەن دەدات، بەو بەڵگەی کە لەوانەیە ئەو فرمانە ڕوبدات، ڕاستی ئەوەی خۆی بە دەمەقاڵێ و ڕوبەڕوبونەوەوە خەریک دەکات، کەمتەرخەمە بەرامبەر چەندین فرمان و پرسی گرنگتر، کە بە کۆی ڕای زانایان، زانینیان بە فەرزی عەین دەژمێررێت، ئەگەر کەسێك لە سەری پێویست بوو ئەمانەتێک بە خاوە نەکەی بە خێرایی تەسلیم بکاتەوە ، ئەوە دادی نادات کە هەڵستێت و نوێژ دابەستێت، کە نوێژ لە هەموو عیبادەتێکیش شیاوترە بۆ نزیک بوونەوە لە خودا، ئەم نوێژکردنەی بە تاوان لە سەر دەژمێررێت، وە ئەوەندەی بەس نییە و بۆیشی نابێت بە بەهانە کە ئەو کارەی کردویەتی هەر لە ڕەگەزی عیبادەتە و خۆ تاوانی نەکردووە، بەڵکو لە کردەوەکانیدا دەبێت چاودێری کات و مەرج و، یەک لە دوای یەکییان بکات، (ئەوەی لە پێشترە با خێریشی کەمتربێت دەبێت لە پێشەوە ئەوەیان ئەنجام بدات)

**دوهەم:** دەبێت وا نەبینێت کە فەرزی کیفایەت گرنگ ترە لە ڕوبەڕوبوو نەوە، ئەگەر شتێکی گرنگ‌تر ببینێت و کارێکی‌تر بکات ئەوە بێ گوێی خوای کردووە، نمونەی ئەمە: وەک ئەو کەسە وایە کۆمەڵێك ببینێت هەمو تینویان بێت وخەریک بێ لار ببنەوە، خەڵکەکەش لێیان نەپرسنەوە و، ئەمیش بتوانێت

ئاواشتەیان بكات و فریایان بكەوێت، بەڵام خۆی خەریک بكات بە فێربوونی حیجامە و كەڵەشاخ گرتنەوە، بڵێت ئەم فێربوونە فەرزی كیفایەیە و دەبێ پێی هەڵبستم، وە بڵێت:

ئەگەر شارەكە كەسی شارەزای تێدا نەبێت،خەڵكەكە بەهیلاكدا دەچن، ئەگەر پێیشی بووترێت: كۆمەڵێ شارەزا و لێزان هەن بۆ كەڵەشاخ گرتن، بەشی شارەكە دەكەن، ئەو بڵێت: بوونی ئەوانیش فێربونە كەی من لە پێویستی و (فەرزی كیفایە) دوورناخاتەوە. حاڵی ئەم كابرا كە بەم شێوە بیردەكاتەوە و ناشچێ بە دەم ئەو كۆمەڵە تینووەوە كەوا خەریكە گیان دەسپێرن و دەمرن، وەک ئەوانە وایە خۆیان بە موناقەشە و ڕوبەڕوبوونەوەوە خەریكدەكەن، وە لە شارەكەیشدا چەندین كاری پێویست هەیە، كە كردنیان فەرزی كیفایە یە و كەسیش پێیان هەڵنەستاوە. خۆ فتوادانەكە كۆمەڵێك پێی هەستاون و لێی شارەزا بوون، بەڵام لە ناو شارەكەدا هەندێكی باش لەو فەرزانە هەیە كە پشت گوێ خراون، وە فوقەهاكانیش لایان بەلادا نەكردۆتەوە. نزیكترینیان زانستی تەندروستییە، كە لە زۆربەی شارەكاندا پزیشكێكی موسوڵمان نییە، كە متمانەی پێ بكرێت و شەهادەتی لە ڕوی شەرعەوە وەربگیرێت، كەچی فوقەهاكان هانی كەسی‌تر نادەن خۆیان بە زانستی تەندروستی‌یەوە خەریک بكەن و ئەو بۆشاییە پڕ بكەنەوە.

هەروەها فرمان بە چاكە و بەرگری كردن لە خراپە یەكێكە لە فەرزە كیفایەكان، لە وانەیە ئەو زانایەی كە خۆی بە گفتگۆ و ڕوبەڕوبونەوەوە خەریككردووە، هەر لە مەجلیسەكەدا ببینێت كەسانێك ئاوریشمیان پۆشیوە، یان ڕایانخستووە و بێدەنگیشیان لێ بكات، كەچی لە سەر بابەتێک دەمەدەمێ و موجادەلەدەكات،كە لەوانەیە هەرگیز ڕۆشنایی نەبینێت. وە ئەگەر ڕویش بدات، خۆ هەندێك فوقەها هەن كە پێی هەڵبستن، ئەم كابراش كە خەریكی

دەردەشەو ڕوبەڕوبونەوەیەو چاو لە حەرامەکان دادەخات، بڕوایشی وایە کە بەم کارەی ڕەزامەندی خودای دەوێت، کە ئەو فەرزی کیفایەی ئەنجام داوە.

حەزرەتی ئەنەس ﷺ دەیگێڕێتەوە:

کە عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، چ کاتێک فرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە وازی لێ بهێنرێت؟ فەرمووی:**إذا ظَهَرَ الإِدهانُ في خيارِكُم، والفاحِشةُ في شِرارِكم، و تَحوَّلَ المُلكُ في صِغارِكُم، و الفِقهُ في أراذِلِكُمْ**[1].

(واتە: ئەگەر پیاوچاکە هەڵبژێرراوەکانتان نەرم ونیانی کەوتە قسەکانیانەوە[2]. وە فاحیشەکاری لە ناو خراپەکانتاندا بڵاو بویەوە، وە موڵک و دەستەڵاتیش درا بە بچوکەکانتان، وە زانستی فیقهیش کەوتە لای چینە نزم و خوارەکانتان، ئەو کاتە واز لە فرمان بە چاکە و بەرگـری کردن لە خراپە دەهێنرێت).

**سێیەم:** دەبێت ئەو کەسەی ڕوبەڕوبوونەوەکان ئەنجامدەدات، بۆ خۆی موجتەهیدبێت، واتە: بە ڕای خۆی فتوا بدات، نەک لە سەر مەزهەبی شافیعی یان حەنەفی و ئەوانیتر، تا ئەو کاتەی ئەگەر ڕاستی لە مەزهەبی ئەبوحەنیفە بۆ دەرکەوت، واز لەو ڕایەبهێنێت کە گونجاوە لەگەڵ مەزهەبی شافیعیدا و فتوای پێ داوە. وەک چۆن صەحابەکان و پێشەواکانﷺ بەم شێوە دەجوڵانەوە، بەڵام کەسێك پلەی ئیجتهادی نەبێت، کە لەم چەرخەدا ئەو حوکمەیان بە سەردا دەدرێت، کە کەسی وای تێدا نییە سەربەخۆ موجتەهید بێت ئەگەر پرسیاری لێ

---

(١) رَواه اِبنُ ماجَه (٤٠١٥) و لفظُ الإِدهانِ عند ابي نَعيم في (١٨٥/٥) و ابن عبدالله في جامِع بيانِ العِلمِ و الفَضيلة (١٠٤٨).

(٢) واتە: لە ئامۆژگاری کردن کەمتەرخەم بوون و خاترانە و بێ دەنگیان زۆر بوو، وە بەرپرسیاریەتی خۆیانیان ئەنجام نەدەدا، نەک مەبەستی ئەوەبێ کە پیاو نابێ نەرم بێت لە قسە و گوفتاردا.

کرا بە وەرگرتن و تەقلید، با لە سەر مەزهەبی پێشەواکەی فتوا بدات، ئەگەر لاوازی ڕای مەزهەبەکەیشی بۆ دەرکەوت، ئەوە بۆی دروست نییە واز لە مەزهەبەکەی بهێنێت و(تەقلیدی ڕای مەزهەبێکیتر بکات)، کەواتە چ سوودێکی تێدایە کە خەریکی ڕوبەڕوبوونەوە و گفتگۆ بێت، مەزهەبەکەیشی دیارە و نابێت لێی لا بدات، خۆیشی فتوایەکی بە دەستەوە نییە بێجگە لە ڕای مەزهەبەکەی؟! هەر بابەتێکیش گومانی بۆ پەیدا کرد، پێویستە کە بڵێت:

لەوانەیە لای پێشەوای مەزهەبەکەی من وەڵامی ئەم پرسیار و گومانە هەبێت، خۆ من بۆ خۆم سەربەخۆنیم لە ئیجتهاددا و لە ئەصڵی شەرعەکەدا تاهەمو شتێک بزانم. وە ئەگەر ئەو بابەتەی ئەو قسەی تیادا دەکرد، دوولایەنی هەبوو،یان لە لایەن پێشەواکەیەوە دووقەوڵی لە سەربوو، وەقسەکانیشی زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکبوو، ئەمیش لەوانەیە فتوا بە یەکێك لەو (وەجە و قەول)ە بدات و سوود لە باسەکە ببینێت و مەیلی دڵیشی وەلای یەکێك لە لایەنەکاندا بێت، واشبزانێت کە بەهیچ شێوەیەک لەم پرسانەدا گفتگۆو ڕوبەڕوبونەوەیان لەسەر نەکراوە، بەڵکو لەوانەیە واز لەو پرسە تایبەتیە بهێنێت کە دووڕێگە یان دوو قەوڵی لەسەرهاتووەو بە دوای پرسێکیتردا بگەڕێت، کە ڕای جیاوازی تیا نەبێت و قسەی زۆری لە سەر کرا بێت و، بەرپەرچی موخالیفەکان درابێتەوە[1].

---

(١) جیاوازی لە میانی (وەجە) و (قەول) دا: **وەجە** لە پرسێکدا ئەوەیە: مەسەلەکە ڕاستەوخۆ باسی لێ نەکرابێت لە دەققەکاندا، بەڵام ئەوەندە هەیە بە پێی قیاس و پێوەرە فیقهیەکان ئەو ڕێگە و شێوەیشی بۆ دەدۆزرێتەوە و باسی دەکرێت.

**قەول**: ئەوەیە ڕاستەوخۆ لە لایەن سەر مەزهەبەوە باسی کرابێت.

**ڕونکردنەوەیەک**: دروست نییە لە بارەی ئەحکامی شەریعەتەوە کەسێ قسەی تیا بکات وە بە ئارەزو ڕای تیا دەرببڕێت، بەڵکو تەنها لەو ڕێگەیەوە دەبێت کە (شاریع) بۆی داناوە، ئەمەش تەنها دوو ڕێگایە: **یەکێکیان** بۆ موجتەهیدەکانە. کە دەبێ سەیری

**چوارەم:**دبێت لە پرس و مەسەلەیەکدا قسەی تیا بکات و ڕوبەڕوویان ببێتەوە کە ڕویدابێت، یان زۆر نزیک بێت ڕوبدات. بەڕاستی صەحابەکانﷺ لەبارەی بابەتە تازەکانەوە کە ڕوی دەدا، یان گومانی بەهێزیان هەبوو لە ڕودانی وەک پرسەکانی بەشی میرات(فەرائیز)ئەوا ڕاوێژیان دەکرد. ئێستە دەبینیت ئەوانەی ڕوبەڕوی یەکتر دەبنەوە لە پرسە شەرعیەکاندا بایەخ بەو پرسە گرنگانە نادەن کەزۆر پێویستی بەفتواداان هەیەوهەموکەس گیرۆدەیان بوون، بەڵکو دەگەڕێن بە دوای پرسە بەربڵاوەکاندا کە دەهۆڵیان بۆ لێدەدرێت. کە زیاتر دەرفەتیان لە بەر دەستدایە بۆ موجادەلە لەسەر کردنی ئیتر بە هەر شیوەیەک ببێت[1].

---

بەڵگە شەرعیەکان بکەن، کە دەقیان لە سەر هەیە لە لایەن شاریعەوە. تا بگەن بەو حوکمەی لێی وەردەگرن و بڵاوی دەکەنەوە، وەک چۆن صەحابە و تابیعین ئاوا حوکمی شەرعیان وەردەگرت. **دووهەمیشیان ڕێگەی عەوامەکانە:** کە تەنها بۆی هەیە تەقلیدی فتوای خاوەن ئیجتهادە کان بکات وەک چۆن لە زەمانی ئەصحاب و تابیعین‌دا شوێنی ئیجتهادی گەورە زاناکان دەکەوتن.

(١) بەڵکو تەنها خۆیانی پێ دەردەخەن کە لە مەسەلەیەکی گرنگدا لێکۆڵینەوەیان لە سەر کردووەو ڕوبەڕوبوونەتەوە، زانستی خۆیان ئاشکرا دەکەن. مەسەلە(دەهۆڵی) یەکان ئەمڕۆ زیاتر لە ئارا دایە: ئەو پرسانەی کە هیچ بایەخێکیان نییە، بەڵام دەستەڵاتدار دەیهەژێنێت و دەیەوێت ئاڵۆزیەک بنێتەوە و، خەڵکی بۆلای مەبەستی خۆیان رابکێشن و، کارێکیش بکەن فتوادەری جۆراوجۆر پەیدا ببن و، ئاسانکاری دروست ببێت و، پابەندی لە مەزهەب نەکرێت و، ڕای دەستەڵاتدار بە هەند وەربگرێت و مەرامی سیاسییان پێ جێبەجێ بکرێت، وەک هەمو ئەو پرسانەی کە ئەمڕۆ دەزگا ڕەسمییەکان دەیانەوێت بیانوروژێنن و فتوای لە سەر وەربگرن، وەک مەسەلەی سوود وەرگرتن و، مافی ئافرەت و، دوونەو، خەتەنە کردن و، فتوای تەکفیرکردنی نەیارانی دەستەڵات و، گەلێ وردەکاری تر کە پەنا خوا ڕوبەڕوی بوینەتەوە. (وەرگێڕ)

لەوانەیە واز لەو پرسە بەربڵاوانەش بهێنن کە زۆر ڕوو دەدەن و بڵێن:

ئەم مەسەلە قسەی لە سەر کراوە، یان کەنار دراوە و لەو پرسە گرنگانە نییە کە ئەمرۆلە ناو دایە و دەهۆڵیان بۆ لێدابێت.

سەیر ئەوەیە ئەوەی پێویستە بەدوایدا بگەڕێین حەق و ڕاستییەکانە، کەچی واز لەو پرسانە دەهێنن چونکە باسیان کراوە (خەبەری دروستیان لە سەر هاتووە) دیارە گەیشتن بە ڕاستیش بە بێ بەڵگەو هەواڵ نابێت، ئەی بۆ وازی لێ دەهێنن و تەنها بە دووی مەسەلە بڵاوەکاندا دەگەڕێن. لەمە زیاتر لە سەری ناڕۆین، مەبەستیش لە گەیشتن بە حەق و ڕاستی ئەوەیە کە بە کورتی قسەی لەسەر بکرێت و بە نزیکی بگەیتە ئامانج و درێژتری نەکەیتەوە.

**پێنجەم:** یەکێکیتر لە مەرجەکان ئەوەیە کە:

(واتە: مەرجی دروستی ڕوبەڕویی و مونازەرە کردن)

قسە و ڕوبەڕوبوونەوەی خەڵوەتی پێ خۆشتر بێت لەوەی کە لەبەردەمی کۆڕو ئەنجومەنداو، بە ئاگاداری گەورە پیاوان و دەستەڵاتداران بێت. بەڕاستی لە خەڵوەتدا زیاتر بیر و فکریان پرش و بڵاو نابێت و، صەفای زیهن و مێشکیان دەبێت و، باشتریش هەست بە ڕاستییەکان دەکەن، بەڵام لە بەر چاوی کۆمەڵێکی زۆردا خواستەکانی ڕیا بازی لە دڵیاندا دەبزوێنێت و هەریەکەیان سوورتر دەکات کە بەڵگە بۆ قسەکانیان بهێنێتەوە و، بە دوای سەرخستنی ڕای خۆیاندا بگەڕێن.لە سەر حەق بن یان پێچەوانەکەی، تۆیش دڵنیایت، کە سووربونیان لە سەر قسە کردن لەبەر دەم کۆڕ و کۆمەڵدا بۆ خودا نییە، هەیانە چەندین کاژێر لەگەڵ هاوەڵەکەیدابەیەک گەیشتوون و قسەیەکیش لەگەڵ یەک ناکەن، ڕەنگە پیشنیاری بۆ بکات با باسێك بکەین، بەڵام ئەویان گوێی پێ نادات، بەڵام کاتێك سەرکردەیەک دەگاتە بەرەوە، یان کۆڕێکی بەرفراوانی بۆ بگیرێت، ئەوا هەر دەمەکەوانێکی بۆ کرایەوە و فرسەتی لێ هێنا،

بەزایەی نادات و ڕێگە نادات بەرابەرەکەی قسەش بکات، بۆ ئەوەی هەمیشە خۆی دەستپێشخەر و خاوەن گوتار بێت[1].

**شەشەم:** دەبێت بۆ بەدوادا چوونی ڕاستییەکان وەک کەسێك وابێت شتێکی لێ ون بووە و بە دوایدا دەگەڕێت کە بیدۆزێتەوە. ئیتر ئەوەی لێی ون بووە جیاوازی نییە لە لای خۆی بیدۆزێتەوە یان لای یارمەتی دەرەکانی، دەبێت وا ببینێت کە هاوڕێکەی هاوکاریەتی بۆ گەیشتن بە مەرامەکەی نەک دوژمن و ڕکەبەر. دەبێت سوپاسی بکات ئەگەر ئاگاداری کردەوە لە هەڵەیەک، یان ڕاستییەکی بۆ دەرخستبێت، وەک چۆن ئەو کەسەی بە ڕێگەیەکدا بەدوای ونبووەکەیدا دەگەڕێت و هاوڕێکەیشی پێی دەڵێت: لەسەر ئەم ڕێگەیانەوە بڕۆ پێی دەگەیت، ئەوە سوپاسی دەکات و لێیشی مەمنونە نەک زەممی بکات، بەڵکو بە قسەکانی دڵخۆشە و ڕێزیشی لێ دەگرێت. ڕاوێژکردنی صەحابەکان بە یەکتری بەم شێوەیە بووە. تەنانەت ئافرەتێك قسەیەکی حەزرەتی عومەری ﷺ ڕە-دکردەوە کە لە سەر مینبەر بوو، وە بێداری کردەوە لە ڕاستیەکە بە بەرچاوی هەموو ئامادەبوانەوە. ئەویش فەرمووی: **أَصابَتْ إمْرأةٌ و أخْطَأَ رَجُل**[2].واتە: پیاوێک بە هەڵەدا چوو و ئافرەتێکیش راستی کرد و حەقیقەتی پێکاوە .

---

(١) ئەوەی مونازەرەی عیلمی دەکات، لە ڕوی دینەوە ئەبێ مەبەستی دەرخستنی ڕاستی بێت، دەرکەوتنی حەقیقەت دروشمی بێت، نەک بەرگری لە نەفسی خۆی. با حەق سەربکەوێت ئەگەر لە سەر زوبانی خەصمەکەی یان دوژمنەکەیشی بێت. ئەگەر خۆیشی دڵنیا بوو کە لە سەر حەققە، وە بیەوێت نەفسی خۆی سەربخات، ئەوە ڕاستی نەپێکاوە و بەڵایەکی دوچاری خۆی کردووە، با لە بنەڕەتیشدا ڕاست بێت کە لە سەر حەقە، چونکە ئامانجی سەرەکی نابێت سەرخستنی خۆی بێت، بەڵکو دەبێت سەرخستنی حەق و ڕاستییەکەبێت . (وەرگێڕ)

(٢) المقاصِد الحَسَنة، لا ٣٢٠ .

پیاوێك پرسیاری كرد له حه‌زره‌تی عه‌لیﷺ ئه‌ویش وه‌ڵامی دایه‌وه ، كابرا ووتی: وا نییه ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران! به‌ڵكو ئاوا و ئاوایه . فه‌رموی ڕاسته‌كه‌یت و من به‌هه‌ڵه‌دا چووم له سه‌روی هه‌مو خاوه‌ن زانستێكه‌وه زاناتر هه‌یه:

**(وفَوْقَ كُلِّ ذي عِلْمٍ عَليمْ)** [1].

عه‌بدوڵلای كوڕی مه‌سعودیش له مه‌سه‌له‌یه‌كدا هه‌ڵه‌یه‌كی بۆ ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری ڕاست كرده‌وه ﷺ ، ئه‌بو موسا فه‌رمووی: له هیچ باره‌یه كه‌وه پرسیار له من مه‌كه‌ن كه ئه‌م زانا گه‌وره‌یه له ناوتاندا بێت[2].

ئه‌میش كاتێک بوو پرسیاریان له ئه‌بو موسا كرد، ده‌رباره‌ی پیاوێک له ڕێی خودادا شه‌ڕی كردبێت و بكوژرێت، فه‌رمووی:

ئه‌و كه‌سه له به‌هه‌شتدایه. ئه‌وكاته ئه‌بوموسا ئه‌میری كووفه بوو.

عه‌بدوڵلای كوڕی مه‌سعودیش فه‌رمووی: پرسیاره‌كه‌ت له ئه‌میر دوباره بكه‌وه، له‌وانه‌یه لێی تێنه‌گه‌یشتبێت. ئه‌ویش دوباره‌ی كرده‌وه و هه‌مان وه‌ڵامی دایه‌وه. له پاشان ئیبن و مه‌سعود فه‌رمووی: منیش ده‌ڵێم:

**إن قُتِلَ فَأصابَ الْحَقَّ فَهُو في الْجَنَّة**[3]. واته: ئه‌گه‌ر كوژرا و له سه‌ر مه‌رام و ئامانجی ڕاسته‌قینه‌ی جیهاد بوو[4].ئه‌و كاته ڕاستی پێكاوه و ده‌چێته به‌هه‌شته وه،ئه‌بوموسایش فه‌رمووی: ئه‌و مه‌سه‌له وایه كه ئه‌و ده‌یڵێت.

ئاوه‌ها ده‌بێت كه‌سێك كه به دوای ڕاستیدا بگه‌ڕێت، خۆ ئه‌گه‌ر نمونه‌ی ئه‌م

---

(١) رَواه ابنُ عبدِالله في جامعِ بيانِ العلمِ و الفضيلةِ (٨٢٥).

(٢) رَواه مالكُ في الموطإ (٦٠٧/٢).

(٣) قُوْتُ الْقُلوب (١٤٨/١).

(٤) وه‌ک پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێت: **مَنْ قاتَلَ لِتَكونَ كَلِمةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيا فَهوَ فى سَبيلِ اللهِ.** إتحاف (٢٩٠/١).

قسه و بەرپەرچدانەوەیە بۆ فەقیهێکی پلە نزمیش بکرێت، ئەوا پێی ڕازی نەدەبوو، وە نکوولیشی دەکرد و دەیووت:

چ پێویست بەو برگە زیادە دەکات کە دەڵێت:

(ڕاستیی پێکاوە) خۆ ئەوە هەموو کەس دەیزانێت، کە ئەو واتایە هەڵدەگرێت.

کەواتە سەیری ئەوانە بکە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە، چۆن ڕویان ڕەش‌دادەگیرسێت، کاتێک دەبینن حەقق و ڕاستی لە لای خەصمەکەیانەوە دەرکەوتووە، خۆیان بە خەجاڵەت دەزانن و بە هەمو توانای خۆیانەوە هەوڵدەدەن بە لووت بەرزیەوە لەگەڵیاندا بجۆڵێنەوە، وە چۆن دەسدەکەن بەزەمکردنی ئەو کەسەی کە بۆڕی داون و زاڵ بووە بە سەریاندا لەگەڵ ئەم هەموو صیفەتە نالەبارانەشدا شەرم ناکات و خۆی دەشوبهێنێت بە صەحابەکان (خودایان لێ ڕازی بێت)، کە چۆن هاوکاری یەکتریان دەکرد بۆ گەیشتن بە حەقق و ڕاستییەکان.

**حەوتەم:** نابێت ڕێگری بکات لە یارمەتیدەرەکەی(خەصمەکەی) لەوەی کە دەیەوێت لە بەڵگەیەکەوە بگوازێتەوە بۆ بەڵگەیەکی‌تر، یان لە ئیشکالێکەوە بۆ دژواری و سەختی و ئیشکالێکی‌تر.

ڕووبەڕووبوونەوەکانی زانایانی پێشوو ئاوا بووە، لە قسەکانیاندا خۆیان دەرباز دەکرد لە هەموو وردەکاریەکانی دەمەقاڵێ و جەدەلی بیدعەچییەکان.

کەواتە ئیتر ئەوە چییە کە دەڵێت:

ئەم بابەتە پێویست نییە من باسی بکەم، یان ئەو بەڵگەیە پێچەوانەی ڕا پێشووەکەتە بۆیە لێت وەرناگیرێت، دەی خۆ ئاشکرایە هەمیشە گەڕانەوە بۆ لای حەقق و ڕاستی دەبێت پێچەوانەی ئەو باطیلە بێت کە لە سەری بویت و دەبێت ڕاستیش وەربگریت، کەچی تۆ دەبینیت زۆربەی دانیشتنەکان کۆتایی دێت بە قسە بە زۆراندان و دەمەقاڵێ و بەریەرەکانێ، تەنانەت ئەوەی دەیەوێت

بەڵگە بهێنێتەوە لە سەر ئەصڵێک کە بە پێوەرێکی تایبەتی بیەوێت لە سەر ئەصڵەکە عیللەت و هۆکارێکی بۆ بهێنێتەوە بە پێی گومانی خۆی... پێی دەڵێن:

بەڵگەت چییە کە لە بنەڕەتدا حوکمەکە ئەو عیللەتەی هەیە کە تۆ بۆت هێناوەتەوە، دەڵێت: وام بۆ دەرکەوت، جا ئەگەر تۆ لەمە باشتر و ڕونترت بۆ دەرکەوتووە، دەی بۆم باس بکە با سەیری بکەم، بەڵام ئەوەی کە هەمیشە پیشەی ڕەخنە گرتن و نەسەلماندنە دەڵێت: جگە لەوەی تۆ باست کرد، چەند واتا و مەبەستێکی تری هەیە، بەڵام من باسیان ناکەم، دەیانزانم و نایانڵێم، لەبەر ئەوەی پابەند نیم بە باسکردنیان ! ئەوەی کە بەڵگەکەی هێناوەتەوە دەڵێت: لەسەرتە ئەوە بسەلمێنیت کە ئەوەی دەیڵێیت ڕاست دەکەیت، ئەویش سووره لەسەر قسە نەکردن و دەڵێت: پێویست ناکات ئەوەی دەیزانم بیڵێم.

بەم شێوەیە دانیشتنەکانی ڕوبەڕوبوونەوە و موناقەشەکردن دەباتە سەر و، خۆی لە ڕاستییەکان دەبوێرێت. بەڵام ئەم هەژارە نازانێت کاتێك کە دەڵێت:

من بەڵگە و واتای تر دەزانم بەڵام نایڵێم! چونکە پێویست نییە کە بیڵێم، ئەمە درۆیەکی ڕوونە بەدەم شەرعەوە دەیکات، چونکە ئەگەر واتایتر نازانێت و تەنها دەیەوێت خەصمەکەی بێدەنگ بکات و، بە درۆ ئەو قسانە دەکات.

ئەوە دادەنرێت بە کەسێکی درۆزنی لە ڕێ دەرچووی یاخی، بەرامبەر بە خودای تەعالاﷻ . وە خۆی دەخاتە بەردەم غەزەبی خوداوە، چونکە وای گەیاندووە شتێک دەزانێت و هەگبەکەیشی پووچە و هیچی پێ نییە، خۆ ئەگەر ڕاستیش بکات کە دەیزانێت و نایڵێت، ئەوە بە شاردنەوەی ئەو عیلمە دەبێتە فاسق و تاوانبار، چونکە برایەکی موسوڵمانی خۆی داوای ڕونکردنەوەی لێ دەکات و ئەمیش دەیزانێت و نایڵێت، ئەی چۆن زانست دەشارێتەوە؟

براکەی پرسیاری لێ کردووە تا تێ بگات و بە تێفکرینەوە سەرنجی دەدات، ئەگەر بەڵگەکە بە هێز و سەنگین بوو، ئەوا ئەویش دەگەڕێتەوە بۆی، خۆ

ئەگەر لاواز و بێ بەها بوو، ئەوا سستی و لاوازییەکەی پێ نیشان دەدات، لە تاریکی نەزانی دەرباز دەکات بۆ ڕۆشنایی نووری عیلم و زانست.

ئاشکرایە دوای ئەوەی پرسیارێک دەربارەی زانستی لە یەکێك کرا و ئەو کەسەش دەیزانی، ئەوە پێویستە کە ئەو زانستە نەشارێتەوە و ڕایبگەیەنێت. کەواتە کە دەڵێت لازم نییە لە سەرم کە جوابت بدەمەوە، واتە: بە پێی شەرعی خودا نییە، بەڵکو بە پێی یاسای دەمەدەمێی داهێنراوی دونیاییە، کە بە حەز و ئارەزووات و ڕێگای فرت و فێڵ و قسە بە زۆرواندانی خۆیەتی، کە دەڵێت پێویست ناکات (لایَلْزَمُنی)،ئەینا بە پێی شەرع بە دڵنیاییەوە لازم وپێویستە لەسەری کە ئەوەی دەیزانێت لە ڕاستی دەبێت نەیشارێتەوە. چونکەبەم قەدەغە کردنی باس و خواسەیە،یان بە درۆزن، یان بە فاسق ناوبانگ دەردەکات.

کەواتە بە وردبینی بنوارە بۆ ڕاوێژکردنەکانی ئەصحاب و، وتوویژ و گفتگۆی زانایانی سەلەف ﷺ، ئایا لێت بیستوون هەڵوێستێکیان هەبوبێت لەم ڕەنگ و شێوەدا، ئایا لە بەرامبەرەکانیان قەدەغە کردووە کە بە دوای بەڵگەی زیاتردا بگەڕێن لەم بەڵگەوە بۆ یەکێکیتر، لەو قیاسەوە بۆ گەڕانەوە بۆ حوکمی ئەسەرێک کە تازە بە دەستیان گەیشتبێت؟

یان لە فەرموودەیەکەوە بۆ ئایەتێکی پیرۆز ؟!

بەڵکو زۆربەی وتوویژ و ڕوبەڕوبوونەوەکانیان لەو شێوە و ڕەگەزەوە بووە کە باسمان کرد، وە باسی هەمو قسە و بیر و هزرەکانیان دەکرد، کە دەکەوتە ناو دڵیانەوە و باش سەرنجیشیان دەدا.

**هەشتەم:** زانای ڕاستەقینە دەبێت ڕوبەڕووی کەسێك ببێتەوە کە زیاتر وا گومان ببات کە سوودی لێ دەبینێت، لە وانەی کە هەمیشە خەریکی زانستن.

زیاتر ئەوانە لە ترسی ئەوەی نەوەکو بەدرۆ بکەونەوە خۆیان لە ڕووبەڕوبوونەوەی کەڵە زانا بەرز و ناودارەکان دەپاراست، نەکا حەق و ڕاستی لە سەر زاری ئەوان دەربکەوێت، دەگەڕان بە دوای زانا پلە نزمەکاندا، بەو هیوایەی ئەو باطیل و ڕا پوچانەی لە لایانە، لای ئەو نیمچە زانایانە ڕەواجی بۆ دروست بکەن.

لە پشتی یەکەیەکەی ئەم مەرجانەوە چەندین مەرجی پڕ لە وردەکاریتر هەیە، بەڵام ئەم هەشت مەرجەی کە باسمان کردن، بۆت ڕوون دەکاتەوە، کێن ئەوانەی مونازەرە و وتووێژەکانیان لە بەر خودایە، یان هۆکارێکی تایبەت بە خۆیان هەیە.

## کەواتە بە کورتی بزانە:

ئەوەی ناتوانێت ڕوبەڕووی شەیتان ببێتەوە، کە گەمارۆی هەموو ناو دڵی داوە، وە لە هەمو دوژمنێکیش سەرسەخت و نا لەبارترە، بەردەوامیش هەوڵی فەوتاندنی ئەو کەسەش دەدات، دەبینیت واز لە ڕوبەڕووبونەوەی شەیتان دەهێنێت و، لەگەڵ یەکێکیتردا لە سەر پرسە ئیجتیهادیەکان دەمەقاڵێ دروست دەکات ، کە ئایا پێکاویەتی و پاداشتی خۆی وەردەگرێت؟ یان بەشدارە لە خێری ئەوکەسەی کە پێکابێتی؟

جا ئەو کەسە بەم شێوەیە بیر بکاتەوە، خۆی دەخاتە گاڵتە جاڕی شەیتان و پێی پێ دەکەنێت. وە دەشبێتە کەسێکی وا کە دڵسۆزەکان پەندی لێ وەربگرن. بۆیە شەیتان زۆر پێی شادمانە، چونکە هەڵیکێشاوە لە قوڵایی زەلکاوی ئەو ئافەتە تاریکانەی، کە یەکەیەکەیان دەژمێرین و، بە درێژی باسیان دەکەین.

داواشمان لە خودایە بە باشی و جوانی یارمەتی دەرمان بێت و ڕێنومایی و تەوفیقمان بدات. امین

# ئافەتەکانی ڕوبەڕوبونەوە (مونازەرە)

**ئەوەش کە لێی دەکەوێتەوە و ڕەوشتی پێ لە ناو دەبات**

بزانە و دڵنیابە ! ئەو ڕوبەڕوبونەوەی ئەنجام دەدرێت، هەر لە سەرەتادا بە مەبەستی زاڵبوون و بۆڕدان و سەلماندن و دەرخستنی گەورەیی و شەرەفی لایەک بێت لە لای خەڵکەکەوە، وە بە ئامانجی شانازی کردن و خۆهەڵکێشان و قسە بە زۆراندان و ڕاکێشانی ڕاو مەیلی خەڵکی بێت، ئەوە لای خودا ﷻ دەبێتە کانگای هەمو ڕەوشتە ناپەسەند و نەشیاوەکان، وە دڵخۆشکەری شەیتانە کە دوژمنی خوایە. کە ئەگەر نیسبەتی بدەیت بە کردارە خراپ و دژوارە شاراوەکانی دەروونیی، لە خۆ بە زل زانین و خۆپەسەندی و ئیرەیی و کێبڕکێ و خۆ بە چاک زانین و، حەز لە پلە و ناو و شۆرەت و خۆ هەڵکێشان و ئەوانی‌تر، وەک نیسبەتدانی خواردنەوەی ئارەقە بە کرداری فاحیشەکارانی زاهیری، لە زینا و تۆمەت بەخشینەوە و کوشتن و دزین ... وەک چۆن کەسێك سەر پشک بکرێت لە میانی خواردنەوەی ئارەق و هەموو کارە خراپەکانی‌تردا، خواردنەوەکەی لا بچوک دەبێتەوە و سەری پێوە دەنێت، نازانێت کە سەرخۆش بوون ڕایدەکێشێت بۆ هەمو فاحیشەکاری و تاوانبارییەکانی‌تر[١].

هەروەها کەسێکیش ئەو حەزە زاڵببێت بەسەریدا کە لە ڕوبەڕوو بونەوەکاندا براوەبێت و، خەصمەکەی بێدەنگ بکات ، وە بە دوای جاهو شۆرەت و خۆ هەڵکێشاندا گەڕا، ئەمە ڕایدەکێشێت بۆ شاردنەوەی هەمو صیفەتە پیسەکان لە دەرونی‌دا، وە ڕەوشتە ناپەسەندەکانی تیا دەوروژێت و سەر هەڵدەدات، کە باس کردنی ئەم ڕەوشتانە لە مەودوا بەڵگەی ناپەسەندی و خراپییان دەهێنینەوە لە فەرموودە و ئایەتەکان، لە چواریەکی کتێبی

---

(١) بۆیە پێغەمبەرﷺ ئارەق ناو دەبات بە دایکی هەموخراپەکان(أمُّ الْخَبائِث) النَّسائي: (٣١٥/٨).

(اَلْمُهْلِكات). بەڵام لێرەدا هێما بۆ مەترسییە وروژێنەرەکانی ئەو ڕووبەڕوبونەوانە دەکەین: لەوانە وەك حەسادەت و ئیرەیی [1].

کەبەڕاستی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(اَلْحَسَدُ يَأْكُلُ الْحَسَنات كمَا تَأْكُلُ النَّار الْحَطَبَ)**[2]. واتە:

ئیرەیی و حەسادەت بردن چاکەکان دەخوات، وەک چۆن ئاگر بکەوێتەوە پوش و پەڵاش دەسوتێنێت. وە هیچ ڕوبەڕوبونەوەیەک بێ حەسادەت بردن بەڕێوە ناچێت، هەندێك جار زاڵ دەبێت و هەندێك جاریش ژێر دەکەوێت، هەندێك جار ستایشی قسەکانی دەکرێت و، هەندێك جاریش ستایشی بەرامبەرەکەی دەکرێت. کەواتە تا لە دونیادا کەسێك هەبێت لە زانست و هێزی ڕوبەڕوبونەوەدا ناوی بە گەورەیی بڵاو بوبێتەوە، یان وا گومان ببات ئەو بیرتیژو قسەڕەوان و شارەزاترە، ئەوا ئیرەیی پێ دەبات و حەز دەکات ئەو نیعمەتانەی پێوە نەمێنێت و، کەس ڕوو لەو نەکەن و، خەڵکەکە و دڵەکانیشیان ڕابکێشێت بە لای خۆیدا.

ئیرەیی ئاگرێکی سوتێنەرە، ئەوەی پێیەوە لکاو ئالودەی بوو، هەمیشە لە دونیادا لە ناو سزایەکی بە ئازار دایە و، سزای دوا ڕۆژیشی زۆر سەخت و گەورەترە، هەر بۆیەشە کە (إبنُ عبَّاس) فەرموویەتی: زانست وەربگرن لە هەر شوێن و کەسێك دەستتان دەکەوێت، قسە و شایەتی فوقەهاکان لە سەر کتر وەرمەگرن، چونکە ئەوانە غیرە لە یەک دەکەن، وەک چۆن نێرەکان لە ناو پەچەدا غیرە لەیەک دەکەن[3]

---

(١) واتە ڕقت لە ئیرادەی خودابێت و کە نیعمەتێکی بە کەسێك دابێ و چاوت پیایدا هەڵنەیەت

(٢) رَواهُ أبوداوُد (٤٩٠٣) و ابنُ ماجَه (٤٢١٠).

(٣) رَواهُ اِبنُ عبدِاللهِ فی جَامِع بَيانِ الْعِلمِ و الْفَضيلَة (٢١٢٥).

## یەکێکی تر لە ئافەتەکان (خۆبەشت زانین و نەسەق زلی)

ئافەتێکی‌تریش ئەوەیە کە تووشی خۆبەزڵ زانین و لووت بەرزی دەکات بە سەرخەڵکیدا. بەڕاستی پێغەمبەرﷺ چاکی فەرمووە: **(من تکبّر وَضَعَه الله و مَن تواضَعَ رَفَعه الله** [1]). واتە: ئەوەی دەماری هەبێت و خۆی بە زل بزانێت خودا نزمی دەکاتەوە، ئەوەش خۆی بە کەم بزانێت و خۆی بشکێنێتەوە ئەوا خودای گەورە بەرزی دەکاتەوە. پێغەمبەرﷺ لە خوداوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **(اَلْعَظَمَةُ إزاري و الْكِبْرِياءُ رِدَائي فَمَنْ نازَعَني فِهِما قصمتُه)**[2]. واتە: شکۆمەندی تایبەتە بە من، کە لە خۆمەوە پێچاوە، دەمار و گەورەیی و کیبریاش جوبەی عیززەتی منە.هەر کەسێك لە ڕووم ڕابوەستێت و نیزاع و تێکەڵچوونی ئەو دووصیفەتەم بکات، پشتی دەشکێنم.کەسێکیش کە ڕوبەڕوی ڕکەبەرەکەی ببێتەوە و واز لە فیز و دەمارو خۆسەپاندن نەهێنێت بە سەر هاووێنەو هاو ڕازەکانیدا، ئەوە هەوڵ دەدات لەسەروو شایستەیی خۆیەوە خۆی بەرزبکاتەوە، لەوانەیە لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا شەڕ لەگەڵ یەکدی بکەن لەسەر سەرووخواری دیوەخان و نزیکی دورکەوتنەوە لە پشتی و سەرینی گەورەی مەجلیسەوە، وە پێشکەوتن لە هاوڕێکەی لە جادە بەرتەسکەکاندا.

لەوانەیە بەهانەش بۆ خۆی بهێنێتەوە، بە تایبەتی فێڵباز و نەفام و پیلان گێڕەکانیان، کە (بۆیە ئەو دەمارە دەنوێنێت چونکە) پێویستە قەدری زانست بەرز ڕابگیررێت و، نابێت باوەڕدار خۆی سووک و زەلیل بکات، ئەوەی کە ناوی گەردن کەچی و تەوازوعە کە خودا و پێغەمبەران ستایشیان کردووە، ئەوە بە زەبوونی و ژێردەستەیی ناوی دەبات. ئەو فیز و دەمارەش کە لای

---

(١) رَواهُ ابنُ ماجَه ٤١٧٦ (بِنَحْوِه).

(٢) رَواهُ مُسلِم ٢٦٢٠ و أبو داوُد ٤٠٩٠ و اللفظُ لهُ .

خوداوه نەهی لێ کراوه و بێزراوه، ئەوه بە عیززەت و سەربەرزی دینی دایبنێت. ناوەکەشی دەگۆڕێت، خەڵکەکەش بە دەردی گومڕابوون دەبات، وەک ئەو دەردەی کە هێنایان بە سەروشەکانی حیکمەت و زانست و هاو وێنەکانیان.

## یەکێکی تر لە ئافەتەکان( حیقد و کینەداری):

زۆر بە دەگمەن ڕێک دەکەوێت یەکێك کە ڕوبەڕوی ڕکەبەرەکەی دەبێتەوه تووشی کینە و دەخەزاری نەبێت کە دەشزانین پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

(**المُؤمِنُ لَيسَ بِحقُودٍ**)[1]. مرۆڤی بڕوادار نابێت کینە و غەرەزی لە دڵدا هەبێت. فەرموودەو دەقی زۆر هاتووه بۆ زەمکردنی غەرەز و کینەبازی، ناشبێت کەسێك ڕوبەڕوی یەکێك بوبێتەوه و هەڵگری بەشێك لەو کینەیە نەبێت، بە تایبەتی ڕوبەڕووی کەسێك کە سەری لە حەنایدا بەرز کردۆتەوه و بەربەرەکانێی دەکات، ئیتر ڕوبەڕووی دەوەستێت و ناتوانێت بە چاکی گوێی لێ بگرێت، ئەو پەڕی خۆ ڕاگرتنیشی ئەوەیە: کە بە دووڕویی و نیفاقی خۆی نیازی دەرونی خۆی لە بەرامبەری دەشارێتەوه.

ئەینا لە ڕاستیدا کینەیەکی زۆر لە دڵی خۆیدا حەشار دەدات و، لە بەر چاوی خۆیشی ئەو حاڵەتەی جوان دەکات، وەک جامێك لەسەری بڕژێت ئاوا بە ناچاری لەو کینە و غەرەزەی دەڕژێتە خوارەوه و، پێیشی ناکرێت زیاتر حەشاری بدات.

ئیتر چۆن ئەو غەرەز و کینەی لێ دەبێتەوه، کە هەرگیز ناگونجێت هەموو

---

(١) و قد روي النَّسائيُّ (١١/٦) **ولا يَجْتَمِعانِ فِي قَلبِ عبدٍ الإِيْمَانُ و الْحَسَد**) واتە: بڕوابوون و ئیرەیی بردن لە دڵێکدا کۆنابنەوه . بۆ ڕیوایەتەکەی سەرەوەش بنوارە: کشف الخفاء (٢٩٣). کینەدار و بڕوادار بەیەکەوە کۆ نابنەوه، هەرکامیانی زیاتر هەبێت ئەویانی نامێنێت.

بیسەرەکان هاو ڕابن لەسەر سەر خستنی ئەم و پیاهەڵدان و گوتن بە باڵایدا لە هەمو ئەو قسانەی کە هاتۆتە سەری یان لێیەوە دەرچووە.
بەڵکو ئەگەر لە خەصمە ڕکەبەرەکەیەوە کەمترین هۆکاری بۆ دەرکەوێت لە بێ ڕێزی و گوێ نەدان بە قسەکانی، ئەوا ئەو نارەحەتییە دەنێژرێت لە سینەیدا و، لە بەرهەمەکەی حیقدێکی لێ پەیدا دەبێت کە تا ماوە لە دڵیدا دەمێنێتەوە و هەڵناکەنرێت.

# یەکێکی تر لە ئافەتەکان:

# غەیبەت کردنە

خودای گەورە ﷻ بە خراپ ناوبردنی کەسێکی تری وەك خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو شوبهاندووە، وە بەردەوام ئەوەی ڕوبەڕوو دەبێتەوە. خۆڕاگرە لە سەر ناو بردنی خەصمەکەی بە خراپ و خواردنی ئەو گۆشتە مردارەوە بووەی. بەردەوام باسی دەکات و ناوی دەزڕێنێت و زەممی دەکات، لەوەیش کە دەیداتە پاڵی تەنها لەوە خۆی دەپارێزێت کە ڕاست بکات، وە درۆ نەکات لە گێڕانەوە کانیدا، کەواتە ئەوەی کەم و کورتی هەبێت لە باسی تێنەگەیشتن و نەبوونی توانای دەربڕین و بێ ڕێزی ئەو شەخسەدا ئەوا باسی هەمووی دەکات. ئەمەش بە غەیبەت بۆی دەنوسرێت و درۆکانیشی کە بۆی هەڵبەستووە بە بوختان لە سەری حیساب دەکرێت، تەنانەت زوبانیشی بە خراپە وەردەگێڕێت بەرامبەر ئەوانەش کە پشتیان کردۆتە قسەکانی ئەم ، گوێیان لە ڕکەبەرەکەی گرتووەو ڕویان تێ کردووە.

بۆ ئەوانیش ناو و ناتۆرەی نەزانین و نەفامی و گەلحۆییان دەداتە پاڵ (چونکە گوێیان لەم نەگرتووە و ڕویان لە خەصمەکەی کردووە.)

# ئافەتێکی تر:

# تەزکیەکردنی نەفس (خۆپەسەندی):

خودای گەورە فەرموویەتی:

**فَلا تُزكُّو اَنفُسَكُم** (النجم/٣٢) واتە: پەروەردەی نەفستان مەکەن بە ستایش کردن و پەسەند کردنی.

وتیان بە حەکیمێک: کامەیە ئەو ڕاستییەی کە دێزو ناشیرینیشە ؟ ووتی: ئەوەیە کە پیاو باسی چاکەی خۆی بکات و بە خۆیدا هەڵبڵێت.

وە ئەو کەسەش کە مونازەرە دەکات، تاریفی بە هێزی و زاڵ بوونی خۆی بە سەر خەصمەکەیدا دەکات، کە چەند لە پێشەوەی هاوڕازەکانیەتی و، لەو کاتانەشدا فوودەکاتە خۆی و بە لووت بەرزیەکەیەوە دەڵێت:

ئەم بابەتانە ئاسانن و لای ئێمەمانان شاراوە نین!

من خۆم شارەزای هەمو گۆی هونەرە زانستیەکانم و، قورسایی بنەما ئاینیەکانم هەڵگرتووە و، فەرموودەکانی پێغەمبەرم لەبەرە و، جارێك بە مەبەستی فیز و دەمار بەسەریاندا و، جارێکیش دەیەوێت بەو خۆ هەڵکێشانە بایەخ و برەو  بە قسەکانی بدات، ئاشکرایشە هەر دوو صیفەتی خۆ بە شت زانین و پیاهەڵدانی خۆی، لە ڕوی شەرع و ئەقڵەوە زۆر نابار و ناپەسەندن.

## ئافەتێکی تری (ڕوبەڕوبونەوەکان):

# سیخوڕی وگەڕان بە دوای عەیب و عاری خەڵکیە

خودای گەورە ﷻ فەرموویەتی: (وَلا تَجَسَّسُوا) واتە:

بە سەر یەکەوە سیخوری مەکەن. ئەوەی لە ڕوبەڕوبونەوەی خەصمە کەی‌دا بێت، هەمیشە بە دوای هەڵە و کەم و کوڕی و نەنگی بەرامبەرەکەی دەگەڕێت، ئەگەر هەواڵی پێ بدەن یەکێك هاتووە بۆ شارەکەی و دەیەوێت ڕو

بەڕوی یەکتری ببنەوە، یەکسەر داوا دەکات کە کەسانێکی شارەزا لە ئەحواڵە شاراوەکانی شارەزای بکەن، تا بە هۆی پرسیار کردنەوە خراپە و نالەباری ئەوی بۆ ئاشکرا دەبێت، تا بتوانێت ڕوی هەڵبماڵێت و تووشی خەجاڵەتی بکات، بە تایبەتی لە کاتی پێویست دا.

وە ئەگەڕێت بە دوای عەیبەکانی دا لە کاتی منداڵییەوە، هەروەها چ کەم و کورتییەک لە لاشەیدا هەبێت، بەڵکو ڕێی بکەوێت لە ناتەواوییەک و لێی بکات بە دەنگ و باس، وەکو کەچەڵی یان بەڵەکی، هەر کەزانی تۆزێك ئەو بەرە و زاڵ بوون دەڕوات لە ڕوبەڕوبونەوە کەیاندا، یەکسەر بیدا بە ناوچاوانیدا و بە شێوەی پلار تێ گرتن باسی بکات، ئەمەش بە کارێکی جوان بۆی دەژمێررێت و، بەوە دادەنرێت کە دەتوانێت لە بواری تەشبیە و گەیاندندا جوانترین وردەکاری بنوێنێت، وە هیچ ڕێگەیەکیشی لێ نەگیراوە کە بە ڕاشکاوی ئەو ((توانج و پلارەی)) تێ بگرێت، بە تایبەتی ئەگەر کەسێکی زمان درێژی گاڵتەجاڕی لووت بەرز بێت، وەک دەگێڕنەوە کە ئەم حاڵەتانەی ڕوی داوە لە زۆرێک لەوانەی لە ناو خەڵکدا بە گەورە پیاوانی جەدەل و ڕوبەڕوبونەوە بە ناو بانگن.

## ئافەتێکیتری ڕوبەڕوبونەوە:

## دەربڕینی شادمانییە بە وەی کە خەڵکێک لە ناڕەحاتیدا بژین، یان خەمخواردن لەوەی کە لە خۆشیدا بن.

ئەوەی بۆ برا موسوڵمانەکەی پێی خۆش نەبێت لە خێر و چاکە وەک ئەوەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە، ئەوە زۆر دوورە لە ڕەوشت و بەهای ئیمانی، وە هەر کەسێک بە دوای فەخر و شانازیدا بگەڕێت بە وەی کە خۆی لە پلەیەکی کەماڵدا دەربخات و نیشان بدات، بێ سێ و دوو پێی خۆشە کە هاوڕێ و هاو

ڕەگەزەکانی لەوانەی لە ڕیزی ئەودان لە گەورەییدا حاڵیان خراپ بێت، ئەو کاتە ڕق و کینە لە میانیاندا پەیدا دەبێت.

وەک چۆن لە میانی ئافرەتێکی سەربەهەوێ کاتێك لە دورەوە هەوێکەی دەبینێت، هەموو گیانی دادەهێزرێت و لەرز دەکەوێتە دڵیەوە و ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت، هەر بەو شێوە کاتێك ئەوانەی حەزیان لە چەلەحانێ و ڕوبەڕوبوونەوەیە، کاتێك ڕکەبەرە بە تواناکەی خۆیان دەبینن، ڕەنگیان دەگۆڕێت و بیر و هۆشیان تێک دەچێت و ئاگایان لە خۆیان نامێنێت، هەروەک شەیتانێکی یاخی ببینن یان دڕندەیەکی زیان بەخش.

باشە ئەبێ لە دانیشتنێکی لەو جۆرەدا چ خۆشی و ئونس و ئاسوودەیی و فەرەحی و دڵشادییەک ڕویان لێ بکات؟ ئەو خۆشییەی کە کاتی خۆی لە میانی زانا ئاینیەکاندا هەبووە، وەک ئەوەی لێیان دەگێڕنەوە لە بتەوی پەیوەندی و ماڵ بەشکردن و برایەتی و یارمەتی و هاوکاری یەکتری لە خۆشی و ناخۆشیدا کە لە میانیاندا بووە، هەتا وای لێ هاتووە کە ئیمامی شافیعیﷺ فەرموویەتی:

(**اَلْعِلْمُ بَينَ أَهلِ الْعَقلِ وَ الْفَضْلِ رَحْمٌ مُتَّصِلٌ**) واتە:

زانست لە میانی ئەوانەی دارای ئەقڵ و تێگەیشتن و گەورەیین، وەک سیلەی ڕەحمی خزمایەتی نزدیکە، چۆن کەسانێك یەک سەرچاوەی ڕەحمییەت کۆیان دەکاتەوە وەك ئەوەی لە ڕەحەمێکەوە کەوتبنەوە، چۆن سۆز و خۆشەویستی لە میانیاندا هەیە، ئاواش زانست دەبێتە هەمان هۆکاری دروست کردنی سیلەی ڕەحم لە میانی گەورە پیاواندا.

ئیتر نازانم چۆن هەندێ کەس وای دەگەیێنن شوێنکەوتەی مەزهەبەکەی شافیعین، بەڵام زانستەکە سیلەی ڕەحمی کردووەتە نێزەی دوژمنکاری و پەیوەندیشی لەیەک بڕیون؟!

ئەگەر کەسێك بە دوای زۆرانبازی و مل بەرزی و شانازیدا بگەڕێت ئایا ئاسوودە یی و شادومانی و خۆشەویستی لە مەجلیس و قسەکانی چاوەنوارِ دەکرێت ؟! زۆر دوور و ئەستەمە ! ئەوە بۆ خۆی بەسە کە بەڵگەی خراپی ئەو جۆرە ڕوبەڕوبونەوەیە کە بە هۆیەوە دەبێتە میرات گری ڕەوشتی درۆزن و دوڕووەکان و دورت دەخاتەوە لە ئاکاری باوەڕدارە تەقواکارەکان.

## یەکێکی‌تر لە ئافەتەکان: نیفاق و دوڕویی[1].

پێویست ناکات بەڵگە بهێنینەوە تا بیسەلمێنین نیفاق کارێکی خراپە، ئەوانەی ڕوبەڕوی یەک دەبنەوە ناچار دەبن بە دوڕوویی هەڵس و کەوت لەگەڵ یەکتریدا بکەن، کە دەگەن بە خەصمەکانیان و هاوکار و لایەنگرانیان، بە ناچاری بە زوبانی شیرین دەدوێن لە گەڵیاندا و، باسی ئیشتیاقی بینین و پرسینەوە لە شوێن و حاڵیان دەکەن، ئەوەی قسە دەکات و ئەوەش کە قسەی بۆ دەکرێت و ئەوانەش کە گوێ بیستی بوون دەزانن ئەوە هەمو درۆ و ڕوپامایی و دوڕویی و ساختەکاری‌یە، بە زوبان خۆشی دەنوێنن و، بە دڵیش ڕقیان لە یەکە و چەقۆ لە ملی یەکتری دەسوون، پەنا ئەگرم بە خودای گەورەﷻ لێیان.

بە ڕاستی پێغەمبەرﷺ چاکی فەرمووە: (**إذا تَعَلَّمَ النَّاسُ الْعِلمَ، وَ تَرَكُوا الْعَمَلَ وَ تَحَابُّوا بِالأَلْسُنِ، و تَبَاغَضُوا بِالْقُلُوبِ، وَ تَقَاطَعُوا بِالأَرْحَامِ ... لَعَنَهُمُ اللهُ عِندَ ذَلِكَ فَأَصَمَّهُم وَ أَعْمَى أَبْصَارَهُم**) رَواهُ الْحَسَنُ[2].

---

(١) نیفاق واتە: ئەوەی لە دڵ و دەرونتایە ددیشارێتەوە و ئەوەیشی دەری دەبڕێت تەعبیر ناداتە- وە لە ناخی ناو دەرونتەوە.

(٢) رَواهُ الطَّبَرَانيُ في (اَلْكَبِير) (٢٦٣/٦) . وَ أَبُونَعِيمُ في الْحلْيَة (١٠٩/٣) وَ إِبنُ عَسَاكِر في تارِيخ دِمِشق (١٠٠/٣) مِنْ حَديثِ سَلمانِﷺ مَرْفوعاً بِنَحوِهِ، وَالْمُرَادُ بِالْحَسَنِ – وَاللهُ أَعْلَمُ –هُو الْحَسَنُ بْنُ سفْيانِ الشـعبانيﷺ صاحِبُ (الْمسـنَدِ) و غَيـرُهُ. وَ يَقـولُ الزُّبَيـدِيُ إنَّ رَاوِي الْحـديثِ هـوَ الْحَسَنُ الْبَصْـرِيﷺ (٣٠٠/١).

واتە: ئەگەر خەڵكی فێری زانست بوون و وازیان لە كار پێكردنی هێنا، بە زوبان یەكیان خۆش ویست و بە دڵ ڕق و كینەیان هەبوو بەرامبەر یەك، سیلەی ڕەحمیان پچڕاند و لەیەك دووركەوتنەوە، ئەوە خودا بەریبان دەكات لە ڕە-حمەتی خۆی و كەڕ و كوێریشیان دەكات.

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە بە چاوی خۆمان دیومانە كەهاتۆتە دی.

# ئافەتێكی‌تر: ڕەدكردنەوە و لووت بەرزی بەرامبەری بە حەق و ڕاستی

ئافەتێكی تر:

لووت بەرزی‌یە لە وەرگرتنی حەق و ڕق لێ بوني، بەڵكو سووربون لە سەر دژایەتی كردنی حەق و ڕاستی و، دروست كردنی گومان و دوودڵی بەرامبەری تاوای لێ دێت، لەگەڵ ڕكەبەرەكەیدا ئەوەی ڕوبەڕودەبێتەوە لە هەمو شت زیاتر بەوە ڕقی هەڵدەستێت كە حەق و ڕاستی لە سەر زوبانی خەصمەكەی ئاشكرا ببێت، لە هەر كاتێكیشدا دەربكەوێت خۆی لێ هەڵدەكات بۆ بەرپەرچدانەوە و ڕەدكردنەوەی و، بۆ ئەم مەبەستەیش ئەوپەڕی هەوڵ و كۆششی خۆی بۆ دەخاتە كار، بەڵكو هەموو توانای سەرف دەكات بە فێڵ كردن و پیلان گێڕان بۆ ئەوەی لای ببات.

لەپاشان وای لێ دێت دوودڵی و گومان بۆ دروست كردنی دەبێتە شتێكی ئاسایی و سروشتی، كەواتە هەر قسەیەك كە دەیبیستێت هەر لە خۆیەوە پاڵنەرێكی دەروونی لە گیانیدا داوای لێ دەكات بەرپەرچی بداتەوە، تا ئەو ئافەتە بە سەر دڵیدا زاڵ دەبێت!

وە لە سەرنجدانی بۆ ڕواڵەتی بەڵگەكانی قورئان و وتەكانی شەریعەت، ئەویشی لا ئاسان دەبێت و، هەندێكیان دەدا بە گژ هەندێكی تریاندا.

وه لە بەرامبەری باطیلدا ڕیا بازی قەدەغە کراوە، ئەوەتانێ پێغەمبەرﷺ هانی هەموان دەدات کە واز لە ڕیاکاری بهێنن، با بۆ شتێکی ڕەواش بێت، واتە: لە سەر پوچەڵ کردنەوەی باطیلێک.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

هەر کەس تەرکی ڕیابازیی بکات، لە جێگەیەکدا کە (لە سەر ناحەق بێت) ئەوە خوداﷻ لە کەناری بەهەشتدا خانویەکی بۆ دروست دەکات، وە هەر کەسێك واز لە ڕیابازی بهێنێت و خۆیشی لە سەر حەق بێت، ئەوە خودای گەورەﷻ خانویەکی لە شوێنە زۆر بەرزەکانی بەهەشتدا بۆ دروست دەکات[1].

خودای گەورە ئەو دوو کەسەی یەکسان کردووە لە سزادا، ئەوەی درۆ بە دەمی خوداوە هەڵدەبەستێت، ئەوەش کە ڕاستییەکان بە درۆ دەخاتەوە.

وەک دەفەرمووێت:

(وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ)

(عَنكَبُوت/٦٨) واتە:

کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵبەستێت و بۆختانی پێ بکات یان پێغەمبەر و قورئانیان بە درۆداناوە کە هاتوونەتەسەریان[2].

هەروەها دەفەرموێت:

(فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ) (الزُمَر/٣٢)

واتە:

سا کێ لەوە ناهەقترە (ستەمکارترە) درۆ بۆ خودا هەڵدەبەستێ و، ئەم ڕاستییەی کە بۆی هاتووە نەیبیستێ و نەی سەلمێنێت[1].

---

(١) رَواهُ التِّرمِذِيُّ (١٩٩٣)، إبنُ مَاجَه (٥١).

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی ، ٤٠٤

# ئافەتێکی تر: ڕیایە

ڕیاکردن واتە: ئەو کارەی دەیکەیت مەبەستت پێی خەڵک و ڕازی کردنی دڵیان و ڕاکێشانی مەیلیان بێت، ڕیا دەردێکی کوشندەیە کە ڕێگە خۆش دەکات بۆ گەورەترین گوناهی کەبیرە، وەک لە (کیتابی ڕیا) دا بە درێژی باسی دێت، ئەوەش کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە تەنها مەبەستی ئەوەیە لە ناو خەڵکیدا خۆی دەربخات، تا زوبانیان بە ستایش بە ڕوی‌دا بکەنەوە. ئەمەی کە باسمان کرد دە بنەمای سەرەکییە، لەوانەی کەوەك دایکی هەموو خراپە شارراوەکان دەژمێررێن، جگە لە چەندین صیفەتی ناباری تر، کە جگە لە زانا خۆڕاگرە پێگەیشتووەکان کەسانێك هەن کە گیرۆدەیان دەبن، وەک ئەوەی دەمەقاڵێ تەشەنە بکات بۆ لێدان بە بۆکس و زللــە و، بەرگ دڕاندن و ڕیش ڕاکێشان و جنێودان بە دایک و باوک و بە مامۆستا و مەشایخەکان و، تۆمەتی ئاشکرا بۆ بەرامبەرەکەی، ئەوانەی ئەم کارانەیان لێ دەوەشێتەوە، لەوانە ناژمێررێن کە تـۆزێك ڕواڵەتی پیاوەتیان تێدا بەدی بکرێت، بەڵکو گەورە و ئاقڵ و ناودارە کانیان گیرۆدەی ئەو خەسڵەتە خراپانە بوون کە باسمان کردن.

بەڵێ لەوانەیە هەندێك لەو ناودارانە پارێزراو بن لە هەندێك لەو خەسڵەتانە، بە تایبەتی بەرامبەر کەسێك کە زۆر لە خوار خۆیەوە ببینێت، یان بە ئاشکرا لە خۆی بەرزتر بێت، وە یان ئەوەندە دوور بێت لە شارەکەیەوە و هۆکاری ژیانیان پێکەوە نەبێت، کە ئیرەیی بکەوێتە نێوانیانەوە. ئەینا ئەگەر هاو ڕازو هاوڕێبازی بێت، هەرگیز ئەو صیفەتە نابارانەی لێ نابێتەوە. لە پاشان هەر یەکێك لەم دە خەصڵەتە دژوارە، دە لق و پۆی لێ دەبێتەوە، لە صیفەتی

---

(١) قورئانی پیرۆز. مامۆستا هەژار:٤٦٢ .

نزمی نادروست، درێژەمان پێنەدان کە یەکەیەکە باسیان بکەین، وەک لووت بەرزی و تورەیی و ڕق ئەستووری و، کینەداری و خۆشویستنی تەماحکاری و، بە دوای ماڵ و جاهدا گەڕان بۆ سەرکەوتن بەسەریدا، هەروەها شانازیکردن و خۆ هەڵکێشان و، کوفرانەی نیعمەت و، خۆشی دەربڕین بە دەمارەوە، لە کاتێکدا کە نیعمەتێکی بەسەردا دەڕژێت، وە بە گەورە سەیر کردنی دەوڵەمەند و دەستەڵاتدارەکان و، ڕۆیشتن بۆ لایان و، وەرگرتن لە ماڵی حەرامیان و، خۆ جوان کردن بە بەرگی حەرام و بە ئەسپ و وڵاخی سواری و، بە سوک سەیر کردنی هەژارەکان. بەوەی بە فەخر و لەنجەوە بڕوا بە لایاندا، هەروەها ڕۆچون لە ناو ئەوبابەت و شتانەی کە هیچ سوودێکیان نییە، وە زۆر بڵێ یی و، دەرچونی ترس و خۆفی خودا لە دڵیدا و، زاڵ بوونی غەفڵەت بەسەریدا، تا وای لێ دێت نوێژخوێنەکە نازانێت چ نوێژێکی کردووە و، چی تێدا خوێندووە و، لەگەڵ کێدا موناجات دەکات، وە هەست بە خشوعی دڵ ناکات و، هەمو تەمەنیشی لەوەدا بردۆتە سەر کە لە ڕوبەڕوبوونەوەدا یارمەتی بدات و، لە ڕازاندنەوەی دەستەواژەکان وسەجعکاری و دارشتنی وشەکان و، لە بەرکردنی بەسەر هات و قسە نادر و ناوازەو نەستەقەکان، لەگەڵ چەندین کەموکوڕیتر کە سەرژمێر ناکرێن.

ئەوانە کە بەرابەر یەک دەبنەوە، چەندین پلەی جیاوازییان هەیە، هەر یەکەیان بە پێی پلە و ئاستی خۆیان ئەو خەسڵەتانەیان تێدا دەبینێت، ئەوانەش کە لە هەموان ئاقڵتر و دیندارترن، هێشتا هەندێك لەو خەسڵەتانەیان لێ نابێتەوە، کە ئامانجیشیان ئەوەیە لەبەر چاوی خەڵکی بیانشارنەوە و جیهادی نەفسییان تێدا بکەن، ئەینا بە هیلاکیان دەبات.

بزانە: ئەم صیفەتە نزم و خراپانە، ئەوانەش دەگرێتەوە کە خەریکی ئامۆژگاری و بیرخستنەوەی خەڵکین، ئەگەر مەبەستیان خەڵک لەخۆ ڕازی

کردن و، دەسکەوتی ماڵ و شکۆ و، سەربەرزی دونیایی بێت، تەنانەت لە وانەش نابێتەوە کە خۆیان بە زانستی مەزهەب و فتواوە خەریک کردووە، ئەگەر ئامانجیان پلەی قەزاوەت و سەر پەرشتی ئەوقافەکان و، پێشکەوتن بێت بەسەر هاوڕازەکانیاندا. بە کورتی: ئەم خووە نزم و ڕەزیلانە پەیوەست دەبێت بە هەمو کەسێکەوە کە زانستەکەی بۆ پاداشتی دوا ڕۆژ نەبوبێت، ئەو کاتە عیلمەکە بێ دەنگی لێ ناکات، بەڵکو یان بۆ هەتاهەتایە بە هیلاکیدا دەبات، یان تا ماوە بە سەربەرزی دەیژێنێت. بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**(أَشَدُّ النَّاسِ عَذاباً يَومَ الْقِيامَةِ: عالِمٌ لا يَنْفَعُهُ اللهُ بِعِلْمِهِ [١])**

واتە: لە هەمو کەس سزاکەی لە ڕۆژی دوایی‌داسەختترە، ئەو زانایەی کە خۆی سوودی لە زانستەکەی وەرنەگرتووە و،خودایش سوودی پێنەگەیاندووە. لەگەڵ ئەوەدا کە سوودی پێ نەگەیاندووە بەڵکو زیانیشی لێداوە، خۆ ئەگەر سەربەسەر لێی دەربچوایە، زۆر دوورە هەروا بە ئاسانی ڕزگاری ببێت، بە ڕاستی مەترسی زانست زۆر گەورەیە، ئەوەش بە دوایدا دەگەڕێت، بە دوای ئامرازێکدا دەگەڕێت کە موڵکی هەتاهەتایی و ژیانی بێ کۆتایی پێ دابین دەکات.

کەواتە هەرگیز لە یەکێك لەو دوانە جودا نابێتەوە، یان موڵکایەتییە، یان بە هیلاکدا بردن، وەک ئەو کەسە وایە لە دونیادا بە دوای دەستەڵاتدا بگەڕێت، ئەگەر خۆ دەوڵەمەند کردنی بۆ فەراهەم نەهات، تەماحی ئەوەیشی نامێنێت کە لە ژێنی چینە خوار و ڕسواکان ڕزگاری ببێت[٢].

بەڵکو دوچاری ئەو ڕۆژەش دێت کە ڕوی هەرڵدەماڵرێت و لێپرسینەوەی

---

(١) رَواهُ الطَّبَرانيُّ في(الصّغير)(١٨٢/١)والقضاعي في(مسند الشهاب)(١١٢٢)والبيهقي في (الشعب).

(٢) مەبەست ژیانی ئەوانەیە بە کولەمەرگی و ناسۆرەوە کات بە سەر دەبەن، ئەوەندە نزمە ژیانیان، پاریزراون لە تانە و لۆمەی خەڵک و چاوی خەڵکیان لە سەر نابێت.

لەگەڵدا دەکرێت. ئەگەر بڵێت: ڕێگەدان بە ڕوبەڕوبوونەوە سوودی خۆی هەیە، کە هاندانی خەڵکە بۆ فێربوون و بەدوادا گەڕانی زانست، چونکە ئەگەر خۆشەویستی ریاسەت و پلە بەرزی لە ناخیدا پەیدا نەبێت، زانستیش بە کۆتا دێت و کەس بەدویدا ناگەڕێت. بەڵێ لە ڕویەکەوە ئەوەی باست کردووە ڕاستە، بەڵام بێ سوود دەبێت، چونکە ئەگەر بۆ دڵخۆشکردنی منداڵ بەڵێنی یاری کردن بە تۆپ و جوغزێن و صەولەجان و کۆتربازی نەبێت، منداڵ دڵی ناچێتە سەرخوێندنی قوتابخانە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو جۆرە حەز لێ کردنانەیان پەسەند کراوە، وە ئەوەش کە دەڵێیت:

ئەگەر حوبی ریاسەت نەبوایە زانستی نەدەما و ئەسڕایەوە، لە ڕویەکەوە ڕاستە، بەڵام بەو واتایە نییە کە یەکێك بە دوای ڕیاسەتدا بگەڕێت ئیتر لە عەزابی خودا ڕزگاری دەبێت، بەڵکو دەکەوێتە بەر ئەو کۆمەڵەی کە ئەم فەرموودەیان بۆ ووتراوە: (**إِنَّ اللهَ يُؤَيِّدُ هَذا الدِّينَ بأَقْوامٍ لا خَلاقَ لَهُم** )[1].

واتە: خودا ئەم دینەی خۆی سەر دەخات بە هۆی کەسانێکەوە کە هیچ بەشێکیشیان نییە تیایدا. وە دەفەرموێت:

(**إِنَّ اللهَ يُؤَيِّدُ هَذا الدَّينَ بِالرَّجُلِ الْفاجِرِ**)[2].

واتە: خودا دینی خۆی سەر دەخات با بە پیاوی خراپ و فاجیریش بێت. کەواتە: ئەوەی بە دوای سەرۆکایەتیدا دەگەڕێت لە تیاچوندایە، ڕەنگە کەسانێکیتر بە هۆی ئەوەوە چاک بن، ئەگەر هانیان بدات لە سەر تەرکی دونیا، ئەمەش بۆ کەسێکە کە ڕواڵەتی کردەوەکانی وەک زانایانی سەلەفی صاڵحین وابێت، بەڵام لە ناخیدا خۆشەویستی جاه و مەقام ئەشارێتەوە.

(١) رَواهُ النَّسائِي في (السُنَنِ الْكُبرى): ٨٨٣٣ .

(٢) رَواهُ الْبُخاري (٣٠٦٢)و مسلم (١١١)

نمونەی ئەو کەسە وەک مۆم وایە، خۆی دەسوتێنێت و خەڵکیش لەبەریا دادەنیشن. کەواتە چاکی و چاکبونی غەیری خۆی لە تیاچون و بە هیلاکدا چوونی خۆی دایە[1]، بەڵام ئەگەر حوبی جاە و دەستەڵات لە دڵی دابێت و، خۆیشی خەڵکی بۆ لای دونیا بانگ بکات، نمونەی ئەو کەسە وەک ئاگری سوتێنەرە ، خۆیشی دەخواتەوە و غەیری خۆیشی دەسوتێنێت.

## کەواتە: زاناکان سێ جۆرن

**یان خۆیان و خەڵکیتریش بە هیلاکدا دەبەن.** کە ئەوانەن بە ئاشکرا بۆ دونیا هەوڵ دەدەن و ڕویان لێ کردووە بە تەواوی.

**یان خۆیان و ئەوانیتریش بەختەوەر دەکەن.** ئەوانەن کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ ڕێگای خوداناسی، بە ئاشکرا وپەنهانی وازیان لە دونیا ویستی هێناوە.

**یان خۆیان بە هیلاکدا دەبەن و خەڵکێکیتر بەختەوەر دەکەن**

ئەوانەن بۆ لای ئاخیرە تیان بانگ دەکەن بە ڕواڵەت دونیایان ڕەدکردۆتەوە، بەڵام لە ناخ و ناوەڕۆکی دڵیاندا مەبەستیان ئەوەیە خەڵکی ڕازی بکەن و، دەستکەوتی دونیایی بە دەست بهێنن. بنوارە و بزانە تۆ لەکام لەم سێ یە بەشداری؟ بەچی خۆت ئامادە کردووە بۆ ئەوزاتەی کە ئاگای لێتە؟

هەرگیز وا گومان نەبەیت کە خودا ﷻ زانست و کردارێکت لێ وەردەگرێت کە مەبەستت ڕەزامەندی تەواوی خودا نەبوبێت، لە (کیتابی ڕیا)دا،بەڵکو لە هەموو چواریەکی ئافەتە کوشندەکاندا ئەو باسانەت زیاتر بۆدەکرێت، کە گومانت نەهێڵێت و دڵنیاییت پێ ببەخشێت، ئەگەر خودا مەیلیلێ بێت

(١) وقَدْ رَوَى الطَّبَرَانِيُّ في (الْمُعْجَمِ الكَبِيرِ) (١٦٦/٢) مَرفُوعاً: **مَثَلُ الْعَالِمِ الَّذِي يُعَلِّمُ النَّاسَ الْخَيرَ ويَنْسَى نَفسَهُ كمَثَلِ السِّراجِ يُضِيءُ لِلنَّاسِ ويَحْرِقُ نَفْسَهُ.**

# باسی ئادابی فێرخواز (المتعلم)

باسکردنی ئاداب و ئەرکە دیارەکانی سەرشانی فێرخواز و قوتابی کە پێویستە ئەنجامیان بدات زۆرن، بەڵام ڕێکخستنی ئەو بەشانەی کە لێی دەبێتەوە دەکرێت بە دە بەش و جوملەوە:

## ئەرک و کاری یەکەم:

## پاککردنەوەی نەفس

پێشخستنی پاککردنەوەی نەفس لە خوو ڕەوشتی نزم و صیفەتە ناپەسەند و ناجۆرە مەعنەوییەکان[1]. چونکە بە ڕاستی زانست لە حەقیقەتدا بریتییە لەوەی کە بە دڵ بەندایەتی بکەیت و ئاوەدانیشی بکەیتەوە، وە نوێژەکانت هەڵقوڵاوی ناخت بێت، وە بە دەروون لە خودای باڵادەست نزدیک ببیتەوە. وەک چۆن نوێژکردن کە بە ئەندامە دیارەکانی لەش دەکرێت، دروست و تەواو نابێت، مەگەر بە پاککردنەوەی هەمو بەرگ و گیانی لە پیسی و بێ دەست نوێژی، هەروەها عیبادەتی شاراوە و باطینیش دروست و تەواو نابێت و دڵیشی بە زانست ئاوەدان نابێتەوە، تا لە هەمو ڕەوشت و ئاکارە پیسەکان و صیفەتە نەگریسەکان پاک نەکرێتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(**بُنِيَ الدِّينُ علَى النَّظافَةِ**)[2]. واتە: بناغەی دین لە سەر پاک و خاوێنی دا مەزراوە. ئەوەش هەروایە دەبێت دەرەوە و ناوەوەی پاک بکاتەوە.

خودای گەورەش دەفەرموێت:

---

(١) وەک صیفەتە پیس و نزمەکانی ناو دەرون (بوغز و کینە و ئارەزوپەرستی و خۆپەسەندی و ئیرەیی و غەش و خیانەت و ...) کە دەبێ خۆی لەم صیفەتە ڕەزیلانە پاک بکاتەوە.

(٢) رَواهُ الرَّافِعِيُّ في (التَّدْوِينِ فى أَخْبارِ قَزْوِينِ). (١٧٦/١) بلفظ ( **فَإِنَّ اللهَ بَنَىَ الإِسْلامَ عَلى النَّظافَةِ**) و عِندَ التِّرمِذِيَ (٢٧٩٩) **إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ يُحِبُ الطَّيِّبَ، نَظِيفٌ يُحِبُ النَّظافَةَ.**

**(إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجسٌ)** (توبه/٢٨) واته: ئەوانە پیسن کە هاوتا بۆ خودا بڕیار ئەدەن. بۆ ئەوەی دڵەکان بێدار بکاتەوە کە مەبەست لەو پاککردنەوەیە تەنها ڕوی دەرەوەی نییە، کە بە چاو و هەستەکان دەبینرێت، زۆر وا ڕێدەکەوێت ئەوەی شەریکی بۆ خودا داناوە، بەرگ و لاشەی پاک و خاوێنە، بەڵام ناخ و ناوەڕۆک و جەوهەری پیسە، واتە: ناو دەرونی تێکەڵی پیسی بووە، پیسیش بریتیە لەو شتەی کە دەبێ خۆتی لێ بپارێزیت و هەوڵ بدەیت لێی دور کەویتەوە. ئەوەی زۆر گرنگترە، خۆپاراستن و دورکەوتنەوەیە لە صیفەتە پیس و خراپەکانی دەرون، هەرچەندە ئێستا بۆخۆیان پیسن، لە داهاتویشدا خاوەنەکانیان بە هیلاک دەبەن، هەر بۆیە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**(لا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتَاً فِيها كَلْبٌ)**[1]. واتە:

فریشتەی ڕەحمەت ناچێتە ماڵێکەوە سەگی تیابێت[2].

دڵی باوەڕدار مەنزڵگای فریشتەکانە و، شوێنی دابەزینی واریدات و فیوضاتە بە هۆی مەلائیکەکانەوە، وە جێگای ئاسوودەیی و حەوانەوەیانە. صیفەتە نزم و پیسەکانیش وەک: توڕەبوون و ئارەزوات و خۆ بەگەورەزانین و خۆپەسەندی و هاو وێنەکانیان، ئەوانە وەك سەگی هەڵەوەڕو (دڕندەی زیانبەخشن). ئیتر چۆن فریشتەکان بچنە ماڵەکانیانەوە کە پڕیەتی لە سەگ (چونکە ئەو صیفەتە خراپانە وەک سەگ دەحەپێن و ڕێگە نادەن مەلائیکە نزیکیان ببێتەوە).

---

(١) رواه البخاري (٣٢٢٥) ومسلم (٢١٠٦)

(٢) ئەو فریشتانەی کە شتەکانت لە سەر دەنووسن. بۆ هەمو جێگایەک دەڕون و لێت جیانابنەوە، بەڵام مەلائیکەی ڕەحمەت و ئەوانەی بە سەر مەجالیسی زیکر و بەندە صاڵحەکاندا دەگەڕێن، ئەوانە ڕێگەیان نادرێت بچنە ماڵێکەوە سەگی تیا بێت، وەک ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێت: ئەگەر بۆ کێڵان و چاندنیش بێت، کەواتە دەبێت لە دوورەوە بۆ پاس ڕابگیرێت وەک هەندێك ڕێگەیان پێ داوە.

نووری زانستیش خودا نایخاته ناو دڵەکانەوە بە بێ هۆکاری مەلائیکەکان؟!

**(وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْياً أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً)**(شوری / ٥١) واتە: هەرگیز هیچ کەسێك ئەوەی بۆ نەلواوە کە خودا قسەی لەگەڵدا بکات، بەوە نەبێت کە فریشتەی وەحی بنێرێتە سەر کە جبرەئیلە، یان لە پشتی پەردەوە، هەروەک لە کێوی طوری سیناوە قسەی لەگەڵ (حەزرەتی)موسادا کرد. یان نێرراوێکی بنێرێتە سەرو، چی مەیلی لەسەر بێت وەحی بۆ بکات، تائەویش بە خەڵکی بگەیەنێت[1].

هەروەها ئەو فەیز و ڕەحمەتە زانستیانەی کە دەیڕژێتە سەر دڵەکان بە سەرپەرشتی مەلائیکە فرمان پێ دراوەکانە کە ئەوانە موقەددەسن و، پاکن لە خەوش و پیسی و، دوورن لە هەمو گەرد و ناپەسەندیەکان، کەواتە تەنها سەرنجی پاکەکان دەدەن و لەو خەزێنەی ڕەحمەتەی کە خودا پێی داون، هەرگیز دڵێك ئاوەدان ناکەنەوە کە لە زاهیر و باطیندا پاک و خاوێن نەکرا بێتەوە[2].

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی، لا: ٤٨٨.

(٢) ئیمامی غەزاڵی ((رضي الله عنه) ) لە کتێبی (الإملاء). لاپەرەی ٣٣ دا فەرموویەتی:

ئەگەر ئەم پرسیارەت دەربارەی ئیماندارێک کرد و وتت: چۆن کەسێ بڕوای هێناوە کە کافر بووە، وە کەسێك ئیتاعەی کردووە کە پێشتر یاخی و تاوانبار بووە، وە ڕێنومایی وەرگرتوە ئەوکەسەی کە پێشتر گومڕا بووە؟ خۆ شەیتانەکان هەرگیز لە دڵی یاخی و کافر و گومڕابوەکاندا دوور ناکەونەوە، بەو هەموو هەوڵەیان کە ڕەوشتی ناپەسەند و ناڕەوا لە دڵیاندا بڵاو دەکەنەوە، وە بەشەکانی خێر و چاکە کە دادەبارێت بە سەر دڵەکاندا لە لایەن پەروەردگارەوە و، بە هۆکاری فریشتەکان، ئەو خێرە ناچێتە ناو دڵێکەوە، کە ناوەندی ئەو شەڕ و خراپانە بێت کە شەیتان ژەهری خۆی تیا وەشاندووە، کەڕێگەیشی نەبوو ئیتر ئەو دڵە نە بە خێرەکە دەگات و نە ڕەحمەت و

# ڕونکردنەوەیەک

من هەرگیز وام نەوتووە: کە مەبەست لە وشەی (بەیت) ئەوە (دڵە) و، مەبەستیش لە کەلیمەی (سەگ) ئەو توڕەیی و صیفەتە ناپەسەندەکانە، بەڵکو دەڵێم: (ئەو تەئویلەی کە کردوومانە.) ئەوە تەنها جۆرێکە لە بێدار کردنەوە (نە ئەوەی کە گۆڕان هاتبێت بەسەریاندا). جیاوازیەکی زۆر هەیە لە میانی گۆڕینی صیفەتە ڕواڵەتییە دەرەکییەکان، بە صیفەتە باطینیە شاراوەکان، وە لە میانی ئەوەی کە مەبەستمان تەنها بێداری و ئاگادار کردنەوەیەک بێت بۆ صیفەتە باطینیەکان، لە باسکردنی صیفەتە ڕواڵەتییەکان لەگەڵ مانەوەیان

---

بەرەکەتەکەش دەچێتە ناویەوە. کەواتە دەبێت هەموو کافرێک لە سەر حاڵی کوفری خۆی بمێنێتەوە و، هەر کەسێکیش بە ئیماندارێکی پارێزراو و مەعسوم خودا دروستی نەکردبێت، بەم پێیە ناتوانێت ببێتە کەسێکی ئیماندار؟

وەڵامی ئەم پرس و ئیشکالە ئەمەیە:

شەیتانەکانیش چەندەها کات و ساتیان هەیە کە غافڵ و بێ ئاگان، ڕەوشتی ناشیرینیش تێربونێکیان هەیە، کە لاشە لێیان بێزار دەبێت. وەک چۆن فریشتەکانیش جاری وا هەیە کەمێ ون دەبن و ،دابارینی ڕەحمەتی خودایش پچڕپچڕی تێ دەکەوێت، بە هۆی ئەوان و بە نیسبەت تاکەکانەوە. ئەگەر لەم کات و ساتانەدا مەلائیکەکان دڵێکی خاڵیان بینی، با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، تێی دەچن. ئەو خێرەی پێیانە پیشانی خاوەن دڵەکەی دەدەن. ئەگەر دڵەکە پێشوازی لێ کردن و ڕەزامەندی و خۆشحاڵی دەربڕی و، تەکانیدا بەرەو ئەو خێر و چاکەیە. ئەوا لەو خەزێنەی ڕەحمەتەی کە پێیەتی هەوڵی پڕکردنی دڵی دەدەن تا تێری دەکەن، ئەگەر دڵی تەوسایەوە و پێی ناڕەحەت بوو، وە پێشوازی لێ نەکردن و پەنای بردە بەر سەربازە شەیتانەکان و، داوای کۆمەکی لە حەپەی سەگە شاراوەکانی ناو دەرونی خۆی کرد، ئەوا مەلائیکەکانیش وازی لێ دێنن و بە جێی دەهێڵن. (ألإملاء، لاپەڕەی: ٢٣)

لە سەر حاڵەتی خۆیان. ئەم جۆرە تەئویلە پەسەندەیش جیاوازیەکی ڕون و ئاشکرا دەردەخات، لەم جۆرە لێکدانەوە و، لەوەش کە (باطینیەکان) لە سەری دەڕۆن [1].ئەم ئاگادارکردنەوەیە ، ڕێگەیەکە بۆ پەند وەرگرتن، کە ئەمەش ڕێڕەوی زانایان و پیاوچاکانە، واتای پەند وەرگرتن ئەوەیە:

لە وەی باس کراوە زیهنی خۆی بگوێزێتەوە بۆ واتایەکی تر، وە تەنها لە سەر واتای وشەو لەفزەکە نەمێنێتەوە، وەک چۆن کەسێکی ژیر و دانا بەڵایەک ببینێت بەسەر یەکێکەوە، بەشی ئەوەندە پەندی لێ وەردەگرێت بۆ خۆی کە لەو بەڵایەی بەسەر ئەودا هاتووە، مێشکی خۆی دەگوێزێتەوە بۆ واتایەکیتر کە لێی بە ئاگا بێتەوە، چونکە خۆیشی لەوانەیە تووشی هەمان بەڵا و زیاتریش ببێت و، دونیایش هەمیشە لە گۆڕان و کودەتا دایە. کەواتە ئەم جۆرە پەڕینەوەیە، لە کەسێکیترەوە کە شتێکی لێ بەسەر هاتووە بۆ نەفسی خۆی، کە پەندی لێ وەرگرتووە، وە لەنەفسی خۆیشەوە بۆ ئەصڵی دونیا، کە ئەویش لە گۆڕاندایە،

---

(١) **باطینیەکان**: واتە ڕاو و بۆچونیەکانیان دەشارنەوە، ئەوانە تاقمێکی شیعەن لە ژێر پە ردەی ئەوەدا کار دەکەن کە هەمو دەقێک واتایەکی زاهیر و واتایەکی شاراوەی هەیە، تەئویل بۆ هەمو ئایەت و فەرمودەکان دەکەن. بە پێی ئەو بڕوا کوفرەی کە دەیشارنەوە و، بە ڕواڵەت خۆیان بە موسوڵمان دەردەبڕن. دەڵێن: هەمو وشەیەکی قورئانی واتایەکی شاراوەی هەیە، جگە لەوان کەس نایزانێت و، تەئویل بۆ هەمو ئایەتێک دەکەن. نیسبەتی خۆیان لە شیعەکان دەدەن، بەڵام کۆمەڵە تاقمێکی گومڕا و بێ دینن، ئیمامی غەزالی لە پێشەوە وەڵامی داونەتەوە. کەواتەجیاوازی زۆرە لە میانی ڕای باطینیەکان و ئەو ڕایەی کە ئیمام دەری بڕیوە، کە باسی ئەو صیفەتانە دەکات کە تیایاندایە، تەنها بۆ ئاگادار کردنەوەیە لە سەر صیفەتە شاراوەکانیان، نەک گۆڕانی جیسم و لاشەیان بە سەردا هاتبێت. وەرگێر

ئەمە پەندیاریە کی پەسەندو شیاوە و ئاگادارکردنەوەیەکیشەبۆی.

کەواتە تۆیش لەو خانووە کە بناغەی (دروستکردنە) بپەڕێرەوە بۆ ناو ماڵی دڵ، کە خانوبەکە خودا دروستی کردووە، هەروەها لە واتای ئەو سەگەی کە زەممی صیفەتەکانی کراوە نەک (وێنە و صورەتەکەی)، کە مانای دڕندەیی و گلاوی تێدایە، بپەڕێرەوە بۆ ڕۆحی صیفەتی سەگیەتی کەدڕندایەتییە، کەواتە لە ئەسڵی وشەکە ئاگادار دەکرێتەوە لە ناوەڕۆکی مەعنای وشەکە و بێدار دەکرێتەوە لە سەری.

بزانە: دڵێك پڕ کرابێتەوە لە توڕەیی، حەزی لە پەلاماردانی دونیایە و دەیەوێت خۆي بدا بەسەریداو، سوور بێت لەسەر ئەوەی پەلاماری شەرەف و ناموسی خەڵکی بدات و، پەردەی ئابڕوویان بدڕێنێت، ئەو کەسە لە مەعنادا سەگێکە و لە ڕواڵەتیشدا دڵی مرۆڤێکە، نووری ڕۆشنایی دڵ (بەصیرەت) سەرنجی واتا و ناوەڕۆک دەدات نەک شێوە و وێنەکەی.

وە لەم جیهانەدا وێنەکان زاڵن بەسەر واتا و مەبەستەکاندا، ماناکانیش شاراوەن لە ناو وێنەکاندا، بەڵام لە دوارۆژدا وێنەکان شوێن مەعنا و واتاکان دەکەون، ئەو کاتە واتا زاڵ دەبێت بەسەر وێنە و صورەتدا، بۆیە هەموو کەسێکیش کە زیندوو دەکرێتەوە لە سەر وێنە و صورەتی مەعنەوی[١] دەبێت کە لەسەر ئەو وێنەیە مردووە. ئەوەی بەر بۆتە شەرەف و ناموسی خەڵکی، خودای گەورە ﷻ لەسەر شێوەی سەگێکی دڕندە زیندووی دەکاتەوە. ئەوەش دەست درێژی لە سەر ماڵی خەڵکی کردووە، وەک گورگێکی پەلاماردەر حەشر دەکرێت، ئەوەی فیز و دەماری کردووە بەسەریاندا، لە سەر شێوەی پڵنگەو،

(١) صورەتی مەعنەوی: ئەو وێنە تایبەتیانەیە کە پەیوەندارن بە مانا و واتا و ناوەڕۆکی خودی ئەو کەسەوە کە ماناکان زاڵ دەبن بەسەر وێنە ڕواڵەتیەکاندا

ئەوەش بەدوای ڕیاسەتدا گەڕاوە، لە سەر شێوەی شێر زیند دەکرێتەوە.

چەندەها فەرمووده لەو بارەوە هاتووە و، زۆر لەوانەی کە خاوەنی بەصیرەت و بەرچاو ڕونین، شایەتیان لە سەر ئەم حاڵەتە داوە[١].

وە خەو بینینی ڕاست و دروست گەواهی داوە لەسەری، چونکە نووستوو کاتێک لە جیهانی هەستیارییەکان و مەحسوسات دوور دەکەوێتەوە، نزیک دەبێتەوە لە جیهانی شاراوە و مەعنەوی، چونکە نووستن برای مردنە، لە ناو خەودا بە چاکی ئەوانە دەبینێت کە بەم شێوە وەصف و پێناسەیان کراوە وەک باسمان کردن[٢]. ئەگەر بڵێت: زۆرێک هەن کە ڕەوشتیان نزمە و هەوڵیان داوە و زانستییەکانیان وەدەست هێناوە ! بەڕاستی ئەمە زۆر دوورە لە زانستی ڕاستە

---

(١) بە ڕاستی فەرموودەکانی ئیمامی غەزاڵی لەو ئیشارەت و ڕونکردنەوانەی لە سەر دە قەکان، نیشانەی تێگەیشتن و بەرچاوڕونی غەزاڵییە. وەک دەفەرموێت: شایەتی و بەرچاو ڕونی ئەهلی بەصیرەت بۆ ئەم ڕاستیانە زانست و ئەحکامە شەرعییەکان بەڵگەن لەسەری، وە هەرگیز دڵەکان لێیان بێزار نەبوون، وە هەمیشە لەگەڵ ئەرکانی شەریعەتیشدا یەکیان گرتۆتەوە و دژ بەیەک نەبوون، تۆیش نکوڵی مەکە و گوێ بە شوێن کەوتوی ئەو مەزهەبانە مەدە کە لێی دەردەچن و نەفرەتی لێ دەکەن. وە سڵ لە ڕەخنەی نەزانەکانیش مەکەرەوە. زۆر جار بابەتێکی شەرعی ڕویداوە و پەیوەستیش بووە بە هۆکارێکەوە، بەڵام ئەوانەی بەرچاویان ڕوون بووە، زانیویانە هۆی ئەوە چییە لە سەبەبەکەی لادراوە و گوازراوەتەوە بۆ مەعناکەی، یان بۆ شتێك کە دەشوبهێت بە مەعناکەیەوە، دەگونجێت کە بدرێتە پاڵی، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**رُبَّ مُبلِّغٍ أوعى مِنْ سامِعٍ وَ حامِلِ فِقْهٍ إلى مَنْ هُو أَفْقَهُ مِنْهُ** ، واتە: زۆر کەس هەیە فەرموودە دەگەیێنێتە تێگەیشتووتر لەوەی لێی بیستووە. زۆر کەسیش هەن هەڵگری (فیقە)و شەریعەتن و دەیگەیێنن بە کەسانێکی تر کە لەوان شارەزاو تێگەیشتوو ترن. بنواڕە: ألإملاء، لا: ٢٣.

(٢) ئەم زیادەیە کە باسی شەهادەتی ئەهلی بەصیرەت دەکات لە یەکێك لە نوسخە زیادەکاندا هاتووە و لە( کیمیای سەعادەت)یشدا لا ١٢٠ ، نووسراوە.

قینەی سوودبەخشەوە بۆ دوارۆژ کە بەختیاری ئاخیرەت مسۆگەر بکات، چـونکە لەسەرەتاکانی ئەو عیلمی ئاخیرەتەدا بۆت دەردەکەوێت کەتاوانەکان ژەهری کوشندەی تاوانکار تیادەبەن و سەرنگونی دەکەن.

ئایا تۆ بینیوتە کەسێك ژەهر بخوات و بشزانێت ئەوە ژەهری کوشندەیە؟ ئەوەی تۆ دەیبیستی لەوانەوە ڕواڵەتی ڕەسم و ڕێسای زانستیان گرتووە، هەندێك قسە و باسە کە بەدەمیانەوە گرتووە و، هیچ پەیوەندییەکی بە زانستی سوود بەخشەوە نییە، تەنها بەسەر زارەکی دەیڵێنەوە و هەندێ جاریش دەیهێنن بە سەر دڵیاندا، بەڵام بە زانست ناژمێررێت، وەک ئیبن و مەسعود(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (دەستکەوتنی زانست بە زۆری ڕیوایەت و گێڕانەوە نییە، بەڵکو نوورێکە خودا هەوای دەداتە ناو دڵەوە.) (**لَيسَ العِلمُ بكَثرةِ الرِّوايةِ، و إنَما العِلمُ نُورٌ يُقذَفُ فِي القَلب**[1]. وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە:زانستی ڕاستەقینە تەنها ترسانە لە خودا، وەک خودا ﷻ دەفەرموێت: (**إنَّما يَخشَى اللهَ مِن عِبادِهِ العُلماءُ**)(فاطر/٢٨)[2].

لە ناو بەندەکانی خودادا هەر زانایان لە خودا دەترسن، چونکە ئەوانە باش شارەزای کار و کردەوەی خودان و پەی بە گەورەیی خودا دەبەن[3].

ئیمامی قورطوبی دەیگێڕێتەوە کە ڕەبیعی کوڕی ئەنەس فەرموویەتی: ئەوەی لە خودا نەترسێت زانا نییە، وە پرسیاریان کرد لە سەعدی کوڕی ئیبراهیم: کێ لە هەموو کەس زانا و فەقیە ترە لە ناو مەدینەدا؟ فەرمووی: ئەوەیان کە لە هەموویان زیاتر تەقوا کار و لە خوداترس بێت[4].

---

(١) رواه احمد في الزهد(٨٦٧) و فيه: **و لكن العلم الخشية** كما هو في الخبر اللاحق.

(٢) و هو كما سبق لعبدالله بن عباس و هو في الحلية (١٣١/١) و انظر الدرّ المنثور (٢٠/٧).

(٣) خولاصەی تەفسیری نامی (٤٣٧).

(٤) بنوارە: تەفسیری قورطوبی، شەرحی ئایەتی ژمارە ٢٨ لە سورەتی (فاطر) لا ٣٠٨.

وەک ئەوەی کە هێما بکات بۆ تایبەتمەندترین بەرهەمی زانست، (کە تەقوا و لە خودا ترسانە)، بۆیە هەندێك زانای لێکۆڵەر لە واتای ئەم دەستەواژەوە کە دەڵێت: (**تعلّمنا العِلمَ لغَيرِ اللهِ فأبي العِلمُ أنْ يَكونَ إلاَّ للهِ**)[1].وایان لێکداوەتەوە: ( لەسەرەتاوە کە دەستمان بە خوێندن دەکرد، تەنها لە بەر خاتری فێربوون نەبوو، بەڵکو لەبەر ناوو شۆرەتیش بوو، واتە کەمێك نا ئیخلاصی تێدابوو، بەڵام شەرەفی زانستەکە وازی لێ نەهێناین تا ڕایکێشاین بەرەو گرتنە بەری ڕێگەی سلووکی ڕێبازی حەقیقەت و ڕێنومایی)[2].

بە ڕاستی زانست لە سەرەتاوە خۆی لێمان حەشاردا و ڕێگەی نەدا لە نهێنی و حەقیقەتەکانی شارەزا ببین، ئەوەی دەستمان کەوت تەنها باس و خواسی عیلم و وشەو ڕستەکانی بوو. ئەگەر بتووتایە: من کۆمەڵە زانایەک لە فوقەها لێکۆڵەرەوەکان دەبینم کە لە بوارەکانی لق وپۆ و بنەماکانی زانستدا بە ئاشکرا دەردەکەوتن، وە دادەنران لە ڕیزی زانا زۆر گەورەکاندا، وە ڕەوشتی نەشیاو و ناپەسەندیشیان هەبووە و هێشتا خۆیانیان لێ پاک نەکردبویەوە؟

پێیان دەوترێت: ئەگەر پلەکانی زانستت بۆ دەرکەوت، وە عیلمی ئاخیرەتت زانی، ئەوکات بۆت دەردەکەوێت ئەوەی خۆیانیان پێوە ماندوو کردووە، ئەو نرخ و بەهایەی نییە لەو ڕووەوە کە بە زانست ئەژمار کرابێت، بەڵام سوود و قازانجەکە لەوەدا بووە کە ئەمە کردارێکە بووەتە هۆکاری گەیاندنی بەندە بۆ حزوری خوداوەندی، ئەگەر مەبەستیان پێی نزدیک بوونەوە بوبێت لە خوداوە لە پێشترەوە هێمامان بۆ ئەم بابەتە کرد، وە لەمەو دوایش زیاتر باس و ڕونکردنەوەی لەسەر دەدەین. پشت بە یەزدانی مەزن.

---

(١) فەرمودەی سوفیانی سەوري .وەک ئیمامی غەزالی لە کتێبی (العزلة)دا باسی کردووە.

(٢) وەک شێخی زوبەیدی لە شەرحی ئیحیادا (الاتحاف) واتای لێکداوەتەوە (١/ ٣١٠)

# ئەركی دووهەمی فێرخواز

## ئەبێ پەیوەندییەكانی كەم بكاتەوە بە سەرقاڵیی دونیاوە و دوریش بكەوێتەوە لە ماڵ و منداڵ و نیشتیمان

چەندێك پەیوەندییەكانی زیاتر بێت، سەرقاڵی دەكات و لای دەدات لە مەبەست، وە هیچ كەسێک لە ناو بۆشایی سینەی‌دا دوو دڵی پێ نەدراوە:

**(ما جَعلَ اللهُ لِرَجُلٍ مِن قَلبَينِ فِي جَوْفِه)** (أحزاب/٤) واتە: كوفر و ئیمان ڕێنومایی و گومڕایی، گەڕانەوە بۆلای خودا و سوور بوون لە سەر تاوانكاری، ئەمانە بە یەكەوە لە دڵێكدا كۆنابنەوە، وە خودای گەورە ڕایدەگەیەنێت:

هیچ كەس خاوەنی دوودڵ نییە، یەكێكیان بۆ كوفر و ئەویان بۆ ئیمان[1].

كەواتە: بیر و هزری مرۆڤ چەندێك زیاتر دابەش ببێت و پڕش و بڵاو ببێتە وە، ئەوەندە توانای كەمتر دەبێت كە بگاتە حەقیقەت و ڕاستیەكان، بۆیە وتراوە: زانست هەندێكی خۆیت پێ نابەخشێت تا تۆ هەمووكات و توانا و بیری خۆتی

---

(١) ئەم ئایەتە لە سەر كابرایەكی قورەیشیدا هاتە خوارەوە كە دەیانووت دوو دڵی هەیە زۆر زیرەک و دانا بووە، وای دەگەیاند بە هۆی ئەو دوو دڵەوە عەقڵی لە عەقڵی پێغەمبەر ﷺ زیاتر بێت. دەڵێن ناوی جەمیل بووە كاتێ موشریكەكان لە بەدر شكستیان هێنا، ئەبوسوفیان لە ڕێگەدا بینی نەعلەكانی یەكێكیانی بە دەستەوە بوو، ئەویشیان لە پێی دا بوو، لێی پرسی ئەوە چییە ؟ لە شپرزەیی روخاندنەكەیاندا دەیووت:

وەڵلاهی وامزانیوە لە پێم دان، بۆیان دەركەوت كە ئەگەر دوودڵی ببوایە ئاگای لە خۆی دەبوو و سەرپاكەی نەدەگرت بە دەستیەوە. خوایش ڕەددی ئەوانەی دایەوە.

تەفسیری قورطوبی، لا ٤١٨.

پێ نەبەخشیت، ئەگەر هەمو توانای خۆتت پێدا، هێشتا لەوەی هەندێك لە خۆیت پێ ببەخشێت مەترسی هەیە[1]. بیری پرش و بڵاو کە سەرقاڵی چەندین کار و فرمان بێت، وەک جۆگەلەیەک وایە ئاوەکەی بڵاو بوبێتەوە، هەندێکی زەوییەکە هەڵی دەمژێت و هەندێکیشی دەبێت بە هەڵم و هەواڕایدەکێشێت، ئەوەندەی نامێنێتەوە کە کۆببێتەوەو وەک پێویست بگاتە کێڵگەکە.

# ئەرکی سێیەم:

# فێرخواز دەبێت بێ فیزو دەمار بێت

دەبێت بەرامبەر بە زانست فیز و دەماری نەبێت، فرمانیش نەکات بە سەر مامۆستاکەیدا، بەڵکو دەبێت سەرە گوریسی کار و فرمانی خۆی هەمووی بداتە دەستی مامۆستاکەیەوە، گوێ ڕایەڵ بێت بۆئامۆژگاریەکانی وەک چۆن نەخۆشێکی نەزان خۆی دەخاتە بەردەستی پزشکێکی بە سۆزی لێزانی شارەزاوە ئەمیش ئاوا بێت، وە پێویستە کە گەردن کەچ بێت بۆ وانەبێژەکەی، لە خزمەت کردنیدا بە دوای پاداشت و شەرەفمەندی دا بگەڕێت.

شەعبی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی[2]:

زەیدی کوری سابیت نوێژی لە سەر جەنازەیەک دەکرد، هێسترەکەیان بۆ نزیک کردەوە تا سواری ببێت، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس هات، ڕەشۆی وڵاخەکەی گرت بە دەستەوە، زەید فەرمووی: وازی لێ بێنە ئەی کوڕی ئامۆزای

---

(١) الفقيه و المتفقه، ٨٦٤. والجامع لاخلاق الراوي و آداب السامع (١٥٧٠).

(٢) رواه ابن عبدالبر في ( جامع بيان العلم و فضله) (٨٣٢) بتمامه و اصله عند الطبراني في (الكبير) (١٠٧/٥) و الحاكم في المستدرك (٤٢٣/٣).

پێغەمبەری خودا، ئیبن و عەبباس فەرمووی: ئاوا فرمانمان پێ کراوە کە لە خزمەت فەرماندە و گەورەکانمان بجوڵێینەوە. زەیدی کوڕی سابیتیش دەستی ماچ کرد و فەرمووی: ئێمەش ئاوا فرمانمان پێ کراوە بەڕێزەوە بجوڵێیتەوە لە خزمەت ئال و بەیتی پێغەمبەرمان حەزرەتی موحەممەدﷺ.

پێغەمبەریشﷺ فەرموویەتی:

**(ليسَ مِن أخلاق المؤمنِ التَّملُّقُ إلاّ في طلب العِلم[1])**

واتە: (ڕوپامایی کردن هەرگیز لە ڕەوشتی ئیماندار نییە، مەگەر یەکێك بۆ فێربوونی زانست بیکات) نابێت هەرگیز قوتابی فێرخواز بە دەمار بێت لەگەڵ مامۆستاکەیدا، یەکێك لەو کارانەی کە بە نەسەق زلی لەسەری حیساب دەکرێت ئەوەیە کە فیز و دەماری نەیهێنێت لە لای گەورە زانا ناودارەکان نەبێت بخوێنێت، کە ئەمەش ئەو پەڕی نەفامی‌یە، زانست بۆ خۆی هۆکاری ڕزگاربوون و مایەی بەختیاری‌یە، هەرکەسێك لەدەم دڕندەیەکی زیانبەخش ڕا بکات، کە بیەوێت پەلاماری بدات، سەیری ئەوکەسە ناکات کە ڕێگەی ڕزگاربوونی پێ نیشان دەدات ئایا بەناو بانگە یان بێ ناونیشانە. دیارە توندی هێرش و پەلاماردانی دڕندەکانی ئاگری جەهەننەم بۆ ئەوانەی کە نەزانن بە خودا و شارەزای زانستی دوارۆژیان نییە، زۆر بە هێزترە لە پەلاماردانی هەموودڕندەیەک. کەواتە: دەبێت بزانیت حیکمەت و پەندیاری، دۆزراوەی مرۆڤی بڕواداره، لە هەرکوێ وە و لە هەر کێوە دەستی بکەوێت، لە کیسی خۆیی نادات،وە هەمیشە منەتباری ئەو کەسەیە کە بۆی هێناوە و پێی داوە، هەرکەسێک بێت: بۆیە لەم

---

(١) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله (٨٥٩) و الخطيب في ( الجامع لاخلاق الراوي و اداب السامع)(١٤٧٣) و أخرجه بن عدي من حديث معاذ في (الكامل) (٢٩٨/٢) و ابي امامه في الكامل (١٠/٥) باسنادين ضعيفين.

بارەوە وتراوە: **العِلمُ حَرْبٌ للفَتَى المُتعَالي كالسَّيل حَربٌ للمَكانِ العَالي**[1].

واتە: زانست دوژمنی خۆ بەزل زانە و، پێکەوە کۆ نابنەوە، ئەوەش کە خۆی بەرز دەکاتەوە و خۆی بەرز نیشان دەدات، ئەو کەسەیە شانازی و فیز دەکات بەوەی کە هەیەتی، وەک چۆن لافاو دوژمنی جێگای بەرز و لار و پێچدراوە و بەشەپۆلەکانی بەردەوام هەوڵدەدات تا نزمی دەکات و دای دەڕمێنێت.

لەو مانا یەشدا بەندە دەڵێت:

**زانست دوژمـنی خـــاوەن دەمـــارە کـــۆ نـــابنەوە هـــەر وەک غـــەوارە**

**ئەوەی کە وێـڵـە بەدووی بـــەرزیدا شـانــازی و فـــەخری کـاری بەدکارە**

**شەپۆلی لافـــاو کۆشک دەڕمێـنێ (سێڵـــە) نـــەیـــاری لاپـاڵی خـوارە**

**(ئەحسەن)گەر نەدا دڵ بەو زانستە دەستی پـێ نـــاگا وەکـــو هەسارە**[2]

کەواتە: بە بێ گوێ گرتن و گەردن کەچی، ئەگەر دڵیشی بۆ نەکاتەوە زانستی دەست ناکەوێت. خودای گەورە فەرموویەتی:

**{ إنَّ فِي ذَلِكَ لذكري لمن كانَ لَهُ قلبٌ أَوْ ألقَي السَّمعَ وَ هُوَ شَهيد}** (ق/٣٧)

واتە: ئەوەی کە گوێی هەبێت و دڵیشی هەبێت، وە بتوانێت لە زانستی تێ بگات،کە هێزی ئەوەیشی نابێت کە تێی بگات، مەگەر بە چاکی گوێ هەڵبخات و خۆیشی ئامادە باشبێت و دڵی بۆی بکاتەوە، زۆر بە جوانی گوێ شل بکات تا هەموو ئەو قسانەی بۆی دەکرێت ئەمیش بە سوپاس و پاڕانەوە و منەتباری و خۆشحاڵییەوە وەری بگرێت با فێرخواز بۆ مامۆستاکەی وەک ئەو زەوییە نەرم و نیانە سەر بەرەو خوارەوا بێت کە بارانێـکی بە خوڕی تێدا بـــاریوە و بە هەموو ئەندامەکانییەوە لێی تێراو بووبێت وە بە تەواوی ملی ڕاکێشابێت بۆ وەرگرتن.

---

(١) انظر التبيان ص ٦٣. والمجموع (٦٢/١) و التعرف ص ٢٤٥

(٢) (ئەحسەن)موفتی. سێڵ: واتە: لافاو

هەرچۆنێک مامۆستای وانەبێژ ڕێگەی پێ نیشان بدات لە چۆنیەتی فێربوون، با واز لە ڕای خۆی بهێنێت و شوێن ڕای ئەو بکەوێت، چونکە مورشیدەکەی ئەگەر هەڵەیەکیشی کردبێت باشترە لەو ڕاستییەی کە خۆی لەسەریەتی، چونکە تاقی کردنەوە چەندەها وردەکاری پێ نیشاندەدات، بە بیستنیان سەرت لێیان سوڕ دەمێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە قازانجی گەورەیان هەیە، نابینی چەندین نەخۆش هەیە خۆیان تووشی (تا) بوون و لاشەیان گەرمە، کەچی دکتۆریش هەندێك جار بە گەرمای زیاتر چارەسەریان بۆ دادەنێت، واتە دەرمانی گەرمتریان بۆ دەنوێنێت تا هێزی زیاتریان پێ ببەخشێت، توانای ئەو لێدان و صەدمەی چارەسەر کردنەی هەبێت، لە پاشان بە دەرمانیتر لاشەی سارد دەکاتەوە، کە دەبێتە مایەی سەرسوڕمانی ئەوانەی لەم بوارەدا شارەزاییان لێی نییە!

خودای گەورە بە چیرۆکی حەزرەتی موسا و خضر (سەلامی خودایان لە سەر) ئەم بیێدارکردنەوەی ڕاگەیاندووە کە فەرموویەتی:

**إِنَّكَ لَنْ تَستَطيعَ مَعِيَ صَبْراً، وكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَي ما لَم تُحِطْ بِهِ خُبراً** (کهف/٦٧-٦٨) واتە: (تۆ ناتوانیت ئەی موسا خۆت ڕابگریت لەگەڵ مندا، لەوەی چاوت پێی دەکەوێت لە عیلمی من، چۆن دەتوانیت ئارام بیت کە شتێک ببینیت و بە ڕواڵەت هەڵە دیاربێت لێتەوەو باسی حیکمەتەکەیشت بۆ نەکراوە و نەشزانیت کامەیان ڕێگەی ڕاست و دروستە)[1].

لەپاشان مەرجێکی لەسەر دانا کە دەبێت: بێ دەنگی هەڵببژێرێت و خۆی بە تەواوی بدات بە دەستەوە بۆیە دەفەرموێت:

**فإنِ اتَّبعْتَني فَلا تَسألْني عَنْ شَيءٍ حتَّي أُحدِثَ لكَ مِنهُ ذِكْرا** (کهف/٧٠)

---

(١) تەفسیری قورطوبی ، سورەتی (کهف) لا ٤٠١.

واتە:( ئەگەر ڕازی بویت بە شوێن کەوتنم، هەر چییەکت بینی نابێت یەکسەر پرسیارم لێ بکەیت کە حیکمەتەکەت بۆڕوون بکەمەوە تا خۆم بۆت باس دەکەم یان حاڵت وای لێ دێت لە نهێنییەکان حاڵی و شارەزادەبین).

بەڵام (حەزرەتی)موسا (علیه السلام) خۆی ڕانەدەگرت، وە بەردەوام ڕەخنەی لێ دەگرت، تا بووە هۆکاری لەیەک جودابوونەوەیان[1]. کەواتە بە کورتی بزانە، هەر فێرخوازێک ڕاو ئارەزووی بە دەست خۆی هێڵایەوە گوێی بە هەڵبژاردەی فێرکار و مامۆستاکەی نەدا، ئەوا بە دڵنیاییەوە بڕیاری دارمان و دۆڕانی بدە بەسەردا.

ئەگەر وتت: (خودای گەورە فرمانی داوە: **فاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكرِ إن كُنتُم لا تَعلَمُون** (نحل/٤٣) کە ئەگەر شتێکتان نەدەزانی ئەوا پرسیار لە ئەهلی قورئان و زانستەکان بکەن[2].کەواتە: فرمان دراوە بە پرسیار کردن.

---

(١) تەفسیری قورطوبی ، سورەتی (کهف) ب/١٠:لا ٣٠١.

(٢) دیارە خوای گەورە تەنها ئەوەندە مەیلی هەبووە، ئەینا ئەگەر خۆی ڕابگرتایە، زیاتر فێردەبوو، وەک پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **رحِمَ اللهُ أخي مُوسى إستَحيى فقالَ ذلِكَ و لو لَبِثَ مَعَ صاحِبِهِ لأبصَر أعجَبَ الأعاجيب** (الاتحاف (٢١٧/١)، ئەگەر ماوەیەکیتر بمایەتەوە لەگەڵ هاوڕێکەیدا، شتی زۆر عەجیب و سەر سوڕهێنەری تری دەبینی، زۆر لەوانەی دیویەتی سەرسوڕهێنەر و نایابتر. کەواتە: عیلمی ئەسرار کۆتایی نایەت، ئەو نهێنیانەی زۆربەیان بە ڕواڵەت پێچەوانەن لەگەڵ زاهیری شەرعدا، ئەوەی زانستی زیاتری هەبێت چاکتر لەم مەسەلانە حاڵی دەبێت، ئەوانەش کە نەزان و چەواشەکارن ئەوە ناوێرن، ئەینا بە ڕۆژی ڕۆشنا چیرۆکی حەزرەتی خضر و موسایان لە قورئان دەردەهێنا و لایاندەدا، چونکە باوەڕیان پێی نییە، بە هەواڵ دانی کەسێکی دەزانن کە باسی غەیب و نادیارەکان بکات. وە هەرچیش نەچێتە ژێر هەست و هێزی هەستیاریانەوە باوەڕیان پێی نییە، بەڵام چ بکەن قورئانە و هەر ئەوەندەیان پێ کراوە

لەوەڵامدا بزانە: بەڵێ ئەوە ڕاستە، لەو کارەدا کە مامۆستا ڕێگەت پێ دەدات پرسیاری تیا بکەیت دروستە، ئەگینا پرسیار کردن لە بابەتێک کە هێشتا تۆ نەگەیشتبیتە ئەو پلەیە کە لێی حاڵی ببیت، ئەو پرسیارە نەشیاو و ناپەسەندە، بۆیە حەزرەتی خضر ڕێگەی نەدا بە حەزرەتی موسا (سەلامی خودایان لەسەر) کە پرسیار بکات. واتە:

تا کاتی خۆی نەیەت پرسیار مەکە، ئەو کە فێرت دەکات باشتر دەزانێت چی بۆ تۆ شیاوە کە بیزانیت، وە کەی گونجاوە کە پێت نیشان بدات، وە ئەگەر کاتی ئەوە نەیەتە پێش کە پێت نیشان بدات، لە هەمو پلەیەکدا لە پلەکانی سەرکەوتندا، ئەوا کاتی ئەوەش نایەتە پێشەوە کە پرسیاریان لە بارەوە بکرێت.

حەزرەتی عەلی ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی زانا ئەم مانایانەی هەیە:

نابێت زۆر پرسیاری لێ بکرێت، واتە ئەوەندە تووشی ماندووبونی نەکەیت، وە لە وەڵامدانەوەیدا تووشی ئەزیەت و ماندووبونی نەکەیت، ئەگەر تەمبەڵی کرد زۆر لێی دوپات نەکەیتەوە. ئەگەر ویستی هەستێت و بڕوات بەرگەکەی نەگریت و ڕایبکێشیت، نابێت نهێنیەکانی بڵاوبکەیتەوە، وە نابێت غەیبەتی کەسیشی لابکەیت، بە دوای هەڵە و کەم و کوڕیدا نەگەڕێیت، ئەگەر کەوتە هەڵەیەکەوە بەهانە و پۆزشی وەربگریت. وە پێویستە لەسەرت کە ڕێزی بگریت، وە لە بەر خودا بە چاوی گەورەییەوە سەیری بکەیت، تا ئەو کاتەی پارێزگاری لە فرمانی خودا دەکات، لە بەردەمیدا دانەنیشیت وە ئەگەر کارێکی هەبوو پێش هەمووان بچیت بە دەمییەوە و بۆی جێبەجێ بکەیت[1]

---

تا ئێستا نەمانبیستووە کەسێکی مەشرەب وەهابی شەرحی ئەم چیرۆکە قورئانییە بۆ بیسەر و خەڵکەکە بکات. (وەرگێڕ)

(١) الفقيه و المتفقه (٨٥٦) بنحوه.

# ئەرکی چوارەم

## نابێ فێرخواز گوێ لە جیاوازی بیر و ڕای خەڵکی بگرێت

ئەوەی دەیەوێت ڕۆبچێت لە زانستیدا و فێری بنج و بنەوانەکانی ببێت، دەبێت لە سەرەتاوە گوێ لە جیاوازی بیر و ڕای خەڵکی نەگرێت، ئیتر یەکسانە ئەوەی دەیەوێت فێری ببێت لە زانستەکانی دونیا بێت یان لە زانستەکانی ئاخیرەت. ئەگەر گوێ بداتە ڕا جیاوازەکان، ئەقڵی ئەتەوسێتەوە و تووشی سەرسوڕمانی دەکات و، ڕاکانی کرچ و کاڵدەکات و، ڕێگری دەکات کە زیاتر شارەزا ببێت و ڕاستیەکانی بۆ ئاشکرا ببێت.

بەڵکو دەبێت یەکەم جار تاکە ڕێگای پەسەند و شیاو بە چاکی فێر ببێت، لە دوای ئەوەی دڵی لە سەری دامەزرا با فێری ڕای جیاواز و شوبهەکان و ڕەددانەوەیان ببێت. بەڵام ئەگەر مامۆستاکەی بۆ خۆی ڕایەکی سەربەخۆی نەبوو، بەڵکو قسەی مەزهەبەکان و وتەی ئەم و ئەوی دەگوازتەوە، کەواتە با لێی ئاگادار بێت، ئەو مامۆستایە زیاتر لەوەوەنزیکە کە گومڕای بکات نەک ڕێگەی پێ نیشان بدات، کابرای کوێر چۆن دەتوانێت ڕێگە بە کۆمەڵە کوێرێک نیشان بدات و ڕێنومایيان بکات، هەر کەسێکیش حاڵی ئاوا لە نەزانیندا بوو، ئەوە خۆی لە ناو جەهلی سەرسوڕمان و سەرلێشێواندا دەژی، ئیتر چۆن دەتوانێت ڕێ بە کەسێکیتر نیشان بدات.

کەسێك سەرەتای ڕۆچونی بێت لەم بابەتانەدا، کە ڕێگری لێ دەکرێت فێری قسە و شوبهەکان نەبێت، وەک ئەو ڕێگری کردنە وایە لەو کەسەی کە تازە موسوڵمان دەبێت و نابێت تێکەڵیی کافرەکان بکات. وە کەسێك کە بە هێز بێت و هانبدرێت سەیری ڕا جیاوازەکان بکات، وەک ئەو پیاوە ئیمان قایمە وایە کە هاندەدرێت تێکەڵیی لەگەڵ کافرەکاندا بکات، هەروەک چۆن کەسێکی

بێ هێزی بێ دەستەڵات ڕێگری لێ دەکرێت کە هێرش بکاتە سەر ڕیزی کافرەکان، بەڵام بۆ کەسێکی ئاوا بەهێز ئەم کارە بکات ئەوە سوننەتە و هانیش دەدرێت[1]. لەم ڕوانگەوە هەندێك بێ هێز و نەفامەکان کە ئاگاداری ئەم وردەکاریانەنین، وا دەزانن کارێکی باش دەکەن کە چاو لە بە هێز و زانا بە تواناکان بکەن، کە بۆ ئەوان هەندێك ڕاو ئاسانکاری تریان لێوە نەقڵ کراوە. نازانن وەزیفەی بەهێزەکان جیاوازە لە کار و ئەرکی بێ هێزەکان، بۆیە هەندێك لە عورەفا فەرموویانە:

**(مَن رآني في البِدايَة صارَ صدِّيقاً و مَن رآني في النِّهايَة صارَ زَنديقاً)**[2].

واتە: ئەوەی بە چاوی پەند و ئامۆژگاری وەرگرتنەوە لە دوای شوێن کەوتنی طەریقەت و ڕێبازەکەم لە سەرەتاوە من ببینێت، واتە:

(لە سەرەتای سلوکەوە) ئەوە دەبێتە کەسێک لە پلەی (صددیقی)دا، واتە: ئەو پلە بەرزەی کە تەکلیفی قورس و گرانی لە سەرە کە دەبێت ئەنجامیان

---

(١) واتە: ئەوەی سەرەتای فێربوونیەتی نابێت بابەتی شوبهەکانی بۆباس بکرێت، چونکە وەڵامی پێ نییە و تێکی دەدات. بەڵام ئەگەر بڕوا و زانستی بە هێز بوو، سوننەتە بۆیشی باس بکرێت و لێیشیان شارەزا ببێت، وە ئەگەر تازە موسوڵمان بوو تێکەڵی کافرەکان ناکات تا شوبهەی بۆ دروست نەکەن، بەڵام کەسێك بەهێز و شارەزا بوو.سوننەتە تێکەڵیشیان بکات و سوننەتیشە خۆی بهاوێتە ڕیزی پێشەوەی شەڕکردنەوە تا هێز و ئیرادەی هاوڕێکانی زیاد و بەتین تر بکات، بەڵام کابرای بێ هێز و نەخۆش ئەگەر بچێتە ڕیزی یەکەمەوە و نەتوانێت خۆڕاگر بێت، کوژرانەکەی یەکسەر نیگەرانی و ترس و بیم لە ڕیزی موجاهیدەکان دروست دەکات، بۆیە پابەندی بەم فرمانەوە ڕێگای سەرفرازیت بۆ ئاشکرا دەکات. (وەرگێڕ)

(٢) میزان العمل: ص ٣٤٧

بدات، بۆیە پلەیشی بەرز دەبێت. بەڵام هەر کەسێک من ببینێت لە کۆتایی سلوک ڕیازەت کێشانمدا، واتە: لە سەر ئەو حاڵەتی کۆتاییە بمبینێت و شوێنم بکەوێت، ئەوە دەبێتە کەسێکی زەندیق و دەرچوو لە دین، چونکە کۆتاییەکە، کار و کردەوەکان دەگێڕێتەوە بۆ باطین و لایەنی شاراوەی دڵ، ئەو کاتە عیبادەت هەموو دەبێتە بیرکردنەوە، وە ئەندامەکانی دیکەی لەش هەموو ئارام و بێ جوڵە دەبن، جگە لە فەرزەکان و سوننەتە راتیبە و دوپاتکراوەکان[1].

---

(١) شێخ سیراجی بەلقینی (رضي الله عنه) لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا فەرموویەتی کە عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ هەمووی بیرکردنەوە بووە.

هەندێك لە عاریفەکانیش فەرموویانە:

واتای **(إنَّ النِّهايَة ترُدُّ الأَعمالَ إلي الباطِن)**

واتە سالیکی ڕێگای ئاخیرەت ئەو کاتە سەرقاڵ دەبێت بە زیکری قەلبی و بیرکردنەوە لە صیفەتەکانی خودا و دروست کراوانی ئاسۆ بەرزەکان و، عالەمی (مەصنوعاتی ئەنفووسی و ئافاق) و پاڵفتەکردنیان بە ڕەوشتە بەرز و پیرۆزەکان و نیشانە بەهادارەکان، لە سەر کەماڵی ئەو خاوەن سلوکە. وەک ڕەحمەت و خۆڕاگری و ئارام گرتن و شوکرانە بژێری و، ڕەزامەندی و ڕوبەروکردنەوەی کارەکان بۆ لای خودا و، پشت بەستن و گەیشتن بە حاڵی فەنا و مەقامی ئەو زاتانەی کە تەواوی پلەکانی تەصفیە و پاڵفتەییان بڕیبێت.

هەروەها لە بارەی ئەوەی کە جگە لە فەرز و ڕاتیبەکان بەردەوام سەرقاڵی بیرکردنەوەن، لەو بارەوە ووتویانە: سەرەتای پلەی پێگەیشتنی پێغەمبەران کۆتایی پلەی ئەولیاکانە، ئەمەیە ڕای دروستی ئەهلی تەسەووف، وەک حەزرەتی شاهی نەقشبەند فەرمویەتی بیدایەت و سەرەتای کاری ئێمە نیهایەتی ئەوانیترە!! چونکە نیهایەتی پلەی پێغەمبەران و حاڵەتی کارکردنیان، دەبێتە بە جێ هێنانی کارەقورس و فەرزەکانی سەرشانیان، وە سەرەتای کاری ئەولیاکانی طەریقەتیش

ئیتر بۆ ئەو کەسەی کە لەو حاڵەتی کۆتاییەدا سەرنج لە کردەوەکانیان بدات، وای بۆ دەردەکەوێت کە ئەمە تەمبەڵی و بەتاڵییە و، دورکەوتنەوەیە لە کارە فرمان پێ کراوەکان.

وە ئیهمال کردنی ئەسڵی بەندایەتییە، بەڵام ئەم بۆچونەیان زۆر دوورە لە ڕاستییەوە، ئەو حاڵەتەی کە ئەولیا لە کۆتاییدا پێی دەگەن، ئەوە حاڵەتی گەیشتن و پەیوەست بوون و مورابەطەی دڵە، لە دوورکەوتنەوەی لە هەموو (ماسِوَی الله)یەک، وە نزیک بوونەوەیەتی بە ئەسڵی بینین و شهود و حزوری هەمیشەیی، لە نزیک پەروەردگاریەوە، وە بەردەوام لە حاڵی بیرکردنەوە و یادکردنەوەدا دەبێت، کە بە گەورەترین کار بۆی دەژمێررێت[1].

---

ئەو ئەرکە قورسانەیە کە ئەنجامی بدەن، بەڵام کۆتاییەکەی بیرکردنەوە و قۆناغی فەنایەو، سەرقاڵ بوونە بە عالەمی (ئەسما ئو صیفاتەوە)، بەڵام سەرەتای کاری پێغەمبەران (سەلامی خوایان لە سەر) بیرکردنەوە بووە، بۆیە فەرموویانە: نیهایەتی ئێمە بیدایەتی دیگەرانە. بۆ زانیاری زیاتر بنوارە: الإتحاف (١/٣١٩/٣٢٠) وەرگێڕ

(١) ئەوانەی لە سەرەتای سلوکی طەریقەتدان، بنەمای کارەکەیان دامەزراوە لە سەر ڕیازەتکێشان و خزمەتکردن. ئەوانەش کە دەگەنە حاڵەتی شهود و بینینی دەستەڵاتی پەروەردگارو، لە مەقامی حزوردا خۆیان لە نزیک خوداوەندەوە دەبینینەوە. ئەوانە لەگەڵ حەقیقەتدا دەژین، ئەمەش تەنها بە فەزڵ و میننەتی پەروەردگارە. کە ئەمەش حاڵی ئەوانەیە کە لە کۆتایی کاری بەندایەتیدا ژیان بەسەر دەبەن، واتە لە نیهایەتدان. کەواتە جیاوازیەکی یەکجار زۆر هەیە لە میانی مەقامی ڕیازەت و موجاهەدە، لەگەڵ مەقامی میننەت و فەزڵی خودایی، خاوەنی موجاهەدە غەرقە لە حاڵەتی (فەرق) و جیاکاری و لێک ترازاندا، کە پەردەی تایبەتی هەیە لە میانی ئەو و خالیقەکەیدا، هەموو ڕاستییەکانی لێ

ئەگەر کەسێکی بێ هێز و لاواز خۆی بشوبهێنێت بە کەسێکی بە هێزەوە لە کارێکدا کە بە ڕواڵەت وابزانێت ئەوە لە دەم دەرچوون و کەم و کورییەکە لە مەقامدا، ئەم کارەی وەک کەسێک وایە کە پیسییەک بخاتە ناو جامۆڵکەیە ئاوەوە، بەوەش عوزر و پۆزش بهێنێتەوە کە چەندین بەرابەر لەمە زیاتر پیسی تور دەدرێتە ناو دەریاوە و ئاوی دەریاش لەم جامە گەورەترە.

ئەگەر شتێك بۆ دەریا دروست بێت کە گەورەیە، بۆ جامۆڵکەیەکیش دروستە، ئیتر ئەم هەژارە ئەوە لە یەک ناداتەوە، دەریا بە هێز و گەورەیە، ئەو

---

شاراوەیە، بەڵام ئەوەی خاوەنی پلە و مینحەی منەتباری پەروەردگارە، ئەوە لێوانە لە ناو دەریای فەزڵی خودایدا، وە لە هەموو جووڵە و وەستان و ڕۆشتنێکیدا بە خۆشەویستی خوداوە بەندە، ئەگەر قسە بکات بە خودا و هێزی خواوە قسە دەکات، کار بکات هەر بە خودا کار دەکات، بگەڕێتەوە پشتی بە خودایە و، بڕوات هەر بۆ لای خودایە، کەواتە کار و جۆڵە و ڕۆشتن و وەستانی هەموو بە خودایە و بۆ خودایە و بۆ لای خودایە و لە پێناوی خودادایە، جگە لە خودا کەسێك ناناسێت، وەک وتراوە:

ئەوەی خودای ناسی، پیشانی دەدات و نهێنییەکانی دەبینێت و لە هەمویاندا خودای تیا دەبینێت، ئەو کاتە سڵ لە هەموو شتێک دەکاتەوە و دڵی بە هیچ داناکەوێت مەگەر تەنها بە خودا.

هەموو شتێکیش بۆ لای خودا و موشاهەدەی خودایی بیبات، ئەوە دەبێتە دڵهاوەری و دڵی پێ دەکرێتەوە، بۆ هەر کوێ بنوارێت و بۆهەر کوێیەک ڕوبکات خودای تیا دەبینێت و ، خوای تیا دەدۆزێتەوە و، ڕوی لە خودا کردووە.

(**أينَما تُولُّوا فثَمَّ وَجهُ الله**) دەبێتە ڕاستی و حەقیقەت و(**وَ هُو مَعَكمْ أينَما كُنتُم**) ئەوتان لەگەڵدایە لە هەر کوێیەک بن. جێگیر دەبێت لە نێو دڵیاندا و، بەم شێوەیە خواناسی دەکەن. بۆ زانیاری زیاتر بنوارە: الإتحاف (١/٣٢٠)

پیسیه هەر چەندێك بێت دەیكاتەوە بە ئاوی پاك، ئەسڵی پیسیەكە هەڵدەگێڕێتەوە و زاڵ دەبێت بە سەر صیفەتە پیسیەكەیدا، بەڵام كەمێك پیسی كە كەوتە ناو جامێكەوە، ئەوا ئاوە كەمەكەش بە خۆیەوە پیس دەكات و صیفەتەكەیشی لە پاكییەوە دەگۆڕێت بە لای خۆیدا، هەر لە سەر وێنەی ئەم نموونەیە:

كە هەندێك شت بۆ پێغەمبەرﷺ درووست بووە، كە بۆ كەسانێكیتر ڕێگەیان پێ نەدراوە، تەنانەت بۆی بووە كە نۆ ژنی حەڵاڵی هەبێت [1].

چوونكە لە ڕوی هێز و تواناوە ئەوەندە بە هێز بووە كە بتوانێت بە دادگەری لەگەڵیاندا بجوڵێتەوە با زۆریش بن.

بەڵام غەیری پێغەمبەرﷺ ناتوانێت هەندێك لەو دادپەروەریەش دابین بكات، بەڵكو ناشتوانێت بە یەكسانی لەگەڵیاندا بجوڵێتەوە، بەڵكو مافەكانیان پێشێل دەكات و لە پێناوی ڕازی كردنیشیان خۆی ڕادەكێشێت بۆ گوناە و تاوان بە هۆی ئەوانەوە.

بەڕاستی هەرگیز سەرفزاز نابێت و ناگاتە ئامانج كەسێك حاڵی ئاسنگەرەكان و ئەوانەی سنووری خودا (حدود) جێبەجێ دەكەن، بپێوێت و قیاسیان بكات بە حاڵی مەلائیكەكانەوە.

(١) كما روى البخاري (٢٦٨) و لفظ (تسع نسوة) من رواية سعيد عن قتادە عن انس عندە، و فيه كذلك رواية (إحدى عشرة)

# ئەركی پێنجەم

## فێرخواز دەبێت خۆی فێری هەموو زانستە پەسەندكراوەكان بكات

ئەوەی فێرخواز و خوێندكاری ڕاستەقینەیە، نابێت دەستبەرداری هیچ زانست و هونەرێک ببێت، بەڵكو دەبێت خۆی فێری هەموو زانستە پەسەندكراوەكان بكات، وە بە دوای هەموو جۆرەكانیشیاندا بگەڕێت و سەیریان بكات و لێیانەوە بگات بە مەبەست و مەرامی خۆی.
لەپاشان ئەگەر تەمەن ڕێگەی پێدا، ئەوا قووڵتر بۆی دابچێت.

ئەگەر كاتێكی كەمی لە بەر دەستدا بوو، با بایەخ بە گرنگەكانی بدات و، تەواو لێیان حاڵی ببێت، پاشماوەكەشی بابەتە گرنگ و ناوازە و نەوادیرەكانی وەربگرێت و لە بەریان بكات، چونكە زانستەكان بۆخۆیان هاوكاری یەكترین، هەر هەندێكیان سەیر بكەیت پەیوەندارن بە هەندێكی تریانەوە.

هەر هیچ نەبێت بە خێرایی ئەوەندە سوودی پێ دەگەینێت كە بە هۆی نەزانینی خۆیەوە دژایەتی ئەو زانستە نەكات كە تۆزێكی لێ حاڵی بووە، چونكە ئەو خەڵكە نەیارن بۆ ئەوەی كە نایزانن.

وەک خودایش دەفەرموێت:

(وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَـٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ)(احقاف/١١) واتە:

ئێستاش كە هیدایەتی ئەم موسوڵمان بوونەیان دەستگیر نەبووە، دەڵێن:

ئەم قورئانە بوختانێكی كۆنە[1].

شاعیریش دەڵێت:

**وَمَن يكُ ذا فَمٍ مُـرٍ مَريضٍ        يَجِــد مُرّاً بِهِ الماءَ الزُلالا** [2].

واتە:

**گەر نەخۆشێ، تامــی زاری تــاڵ و تفـتی بێتــە زار**

**ئاوی شیرین پڕ دەمی كە، تاڵە هەروەک ژەهری مار**[3].

كەواتە زانستەكان بە پێی پلەكانیان:

یان دەستی بەندە دەگرن و ڕێگەی لای خودای پێ نیشان دەدەن، یان بە شێوەیەک لە شێوەكان یارمەتی دەدەن بۆ ئەو مەبەستە و، هەریەكەیان چەندین مەنزڵ و جێگای ئامادە كراویان هەیە لە دوری و نزدیكی گەیشتن بە مەرام، ئەوانەی بە چاكی پێی هەڵدەستن و مەنزڵگاكان ڕاگیر دەكەن و خۆیان فێری دەكەن، ئەوانە بە پارێزەر دادەنرێن، وەک ئەوانەی كە پارێزگاری لە سەنگەر و خاڵە گرنگەكانی پێشەوەی ڕوبەڕوبوونەوە دەكەن لەگەڵ دوژمناندا.

وە هەر یەكێك لەم فێرخوازانە پلەیەكی زانراوی هەیە، وە بە پێی پلە و تێكۆشانی خۆی پاداشتی لە ئاخیرەتدا هەیە. ئەگەر تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خودا بێت.

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی، (٥٠٣)

(٢) المتنبي في شرح ديوانه.ص ١١٣ ، و خزانة الادب للمحوي (١٨٩/١).

(٣) (ئەحسەن) وەرگێڕ

# ئەركی شەشەمی فێرخواز

## دەبێ لە جۆرەكانی زانست زۆر جوان و نایابەكانی هەڵبژێرێت

بە ڕاستی تەمەنی مرۆڤ ئەوەندە بەرفراوان نییە تا زیاتر فریای هەموو زانستەكان بكەوێت، كەواتە ڕای پتەوو بە هێز ئەوەیە كە خوێندكاری فێرخواز لە هەر جۆرێكی زانست زۆر جوان و نایابەكانی هەڵبژێرێت، هەر یەكەیان بەشی ئەوەندەی بۆنیان پێوە بكات خەریكیان ببێت و، بەشی هەرە زۆری كاتەكانی لەو زانستەی كە دەستی كەوتووە و فێری بووە با هەوڵدان بێت بۆ تەواو كردنی ئەو زانستەی كە لە هەموو زانینەكان بە نرخ و بەهادارترە، كە عیلمی ئاخیرەتی پێ دەڵێن، واتە: بە هەر دوو بەشەكەیەوە عیلمی موعامەلە و موكاشەفەیە، وە ئامانجی موعامەلە ئەوەیە كە بیگەیەنێت بە عیلمی موكاشەفە[1].

وە ئامانج لە زانستی موكاشەفە، گەیشتنە بە (معرفـةالله) و زانسـتی خودا ناسی. (بێ ئەوەی پێویستی بە هیچ بەڵگە و تێڕامانێک هەبێت) مەبەستی من بە عیلمی موكاشەفە ئەو بیر و باوەڕ و عەقیدە نییە كە تێكڕای خەڵكە ئاساییەكە لە شێخ و زاناكانیان وەرگرتووە و، دەم بە دەم لێیان فێربوون، هەروەها مەبەستیشم ئەو ڕێگە و بەرنامە نییە، كە بە بەڵگەكانەوە زانایانی عیلمی كەلام دەتوانن تۆماری قسە و زانستەكەیان بكەن، وە بە هۆی موجادەلە و ڕوبەروبوونەوەوە، هەڵوێست و بیر و ڕاكانیان بە هێز بكەن و بیانپارێزن لە پلان و فرت و فێڵی خەصم و ڕكەبەرەكانیان، كە دوا ئامانجی زانایانی عیلمی كەلامە،

---

(١) پێشـتر ئـەم زاراوانـە ڕاڤـە كـراون و پشـت بـە خـودا دێینـەوە سـەریـان. عیلمـی موعامـەلـە: مـەبـەسـت ئـەوە نییـە كـە كاروبـاری دونیـایێ بەڕێ بخـات، بەڵكو ئـەو عیلمەیە كە ڕێگە و سلوكی طەریقەتی ئاخیرەتی پێ دەگرێتە بەر.

# بەڵکو ئەوەی مەبەستمە
# لە عیلمی موکاشەفە:

بەرهەمی ئەو زانستەیە کە نوورێکە خودای گەورە دەیهاوێتە ناو دڵی بەندەکەیەوە، کە بە هۆی ڕیازەتکێشان و تێکۆشانەوە ناو دڵی خۆی پاک کردبێتەوە، وە دەروونی لە هەموو گەرد و پیسییەک پاڵفتە کردبێت، تا دەگاتە پلەی ئیمان و بڕوای ئەبوبەکری صددیق (خودای لێ ڕازی بێت)، ئەو کەسەی کە ئەگەر ئیمانەکەی بکێشرێت بە ئیمانی هەموو جیهانییەکان ئەوا بارسەنگی قورستر دەبێت، وەک حەزرەتی گەورەی هەموو ئادەمیزاد گەواهی بۆ داوە.[1]

هەواڵێکیتریش لای من نییە بە نیسبەت عەقیدەی ئەو خەڵکەوە کە بۆ خۆیانیان هەڵبژاردووە، یان زانایانی کەلام بە بەڵگەکانیان ڕێکیان خستووە، کە

---

(١) أخرجه ابن عدي في الكامل (٢٠١/٤) من حديث ابن عمر باسناد ضعيف و رواه البيهقي في الشعب (٦٩/١لا ٣٦) موقوفا علي عمر باسناد صحيح. قال الزبيدي (٣٢٣/١): الذي رواه البيهقي من قول عمر، قال السخاوي في المقاصد ص ٥٥٥ (٩٠٨) و رواية عن عمر هزيل بن شرحبيل قلت: و هو الاوزي الكوفي، ثقة مخضرم من رجال البخاري و الأربعة و رواية البيهقي: **لو وُزن ايمان أبي بكر بايمان النّاس لرجح ايمان أبي بكر** ، و رأيت في (ذخيرة الحفاظ لابن طاهر المقدسي ٢٠٠٣/٤ (٤٦١٣) الذي رتب فيه الكامل لابن عدي و هو بخط المصنف ما نصه: **لو وزن ايمان ابي بكر بايمان اهل الارض لرجّح** و كذا اخرجه ابن عدي في الكامل ٢٥٩/٥. بلفظ: (**لو وضع ايمان ابي بكر على ايمان هذه الامة أرجح بها**) و قد رواه الديلمي ايضاً في مسند الفردوس (٣٧٧/٣ _٥١٤٨)من هذا الطريق بهذا اللفظ.
ينظر للمزيد. (الاتحاف _ ٣٢٣/١).

تەنها لە جۆری قسە هێنان و بەڵگە دروست کردندا جیاوازیەکیان هەیە، ئەینا ئەوانیش عەقیدەیان وەک عاممەی خەڵکەکە وایە. هەر لە بەر ئەوەیە کە هونەرەکەی ئەمان ناوبراوە بە کەلام.

وە من نابینم کە ئەم سنعەتکاری‌یە حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلی ﷺ نەیانتوانیبێت کە بیزانن.

(بەڵام ئەوان لایان بەولایەدا نەکردۆتەوەو، هەموو گرنگی پێدانیان بە عیلمی شهوود و موکاشەفە بووە) تەنانەت لە میانی ئەو گەورە صەحابانەشدا کە حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ پێشی ئەوانی دابویەوە، لەبەر ئەو سیڕر و نهێنییە بوو کە خودا ﷻ خستبویە ناو دڵیەوە.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، ئەم قسانە هەمووی دەبیستن لە خاوەنی شەریعەت خۆیەوە (صەلات و سەلامی خودای لە سەر)، وە لە پاشان زۆر بە کەمی و بێ بایەخی سەیریان دەکەن و، وایش گومان دەبەن کە ئەمانە ئەسڵیان نییە و هەڵبەستراوو خەرافات و قسە پووچەکانی ئەهلی تەسەووفە و، ناچنە خانەی عەقڵەوە.

کەواتە تۆی دانا دەبێت زیاتر سەرنج بدەیت و گوێ لەم بابەتە ڕابگریت، هەر لەم بوار و جێگایەدایە کە سەرمایەی ژیانت بە فیڕۆ لە دەس داوە، کەواتە سووربوونتە لە سەر زانینی ئەم سیڕرەی کە لە دەرەوەی کاڵای فوقەها و موتەکەللیمینە، کەواتە ناتوانیت بگەیت بەو عیلمە، ئەگەر زۆر بە گەرمی بە دوایدا نەگەڕێیت.

## کورتەی ئەم باسەیە ئەمەیە:

بەرزترین و بەهادارترین زانست بە (ڕەهایی) وە ئامانجی هەموو خاوەن هیممەتەکان گەیشتنە بە (معرفة الله) و ناسینی خودای گەورەﷻ، بەشێوەیەک دووربێت لە گرێوگۆڵی بەڵگە هێنانەوە، ئەمەش دەریایەکە کە هەرگیز ناگەن بە کۆتایی قوڵییەکەی[1]. ئەو پەڕی پلەکانی بەشەر کە پێیان

(١) بەڕاستی ناسینی خودا بەحرێکی بێ پەیە، هەر کەس بە پێی ئاست و توانا و بە رزی هیممەت و لێبڕانی خۆی ئەندازێکی بۆ ڕوون دەبێتەوە، عیلمی تەصەووفیش هەموی ئەسراره، چەندێك زیاتر خۆی پی گەیاندبێت و خۆی پاك کردبێتەوە و تەصفیەی ڕەزائیلەکانی کردبێت، ئەوندە باشتر نزیك دەبێتەوە لە (معرفة الله). هەمو ناسینێکیش بە ناسینی حەقیقی ناژمێرێت، نابینیت وەك شێخی زوبەیدی دەیگێڕێتەوە:
عاریفێك حەفتا جار بە خزمەت خودا (جل جلاله) گەیشت، پێیان ووت: ئەگەر ئەبو یەزیدی بەسطامیت یەك جار ببینیایە، وای لێ دەکردیت ئیتر پێویستت بەو بینینەی خودایە نەدەکرد، زۆر سەری لەم قسەیە سوڕما، بەڵام کاتێ کە چاوی بە حەزرەتی بایەزید کەوت، سیڕ و نهێنییەکانی مەعریفەت و خواناسی بۆ دەرکەوت، نەك لە سەر ئەو حاڵی وەجدەی کە لە پێشەوە خودای پێ بینیبوو، بەڵکو لە سەر شارەزایی تەواو لە بەصیرەتی دڵ و ناسینی حەقیقەتی مەعریفەت، ئەوەندە تەجەللیاتی خودایی کاریگەری لەسەری هەبوو، بەرگەی نەگرت و یەکسەر ڕۆحی بەخشی بە پەروەردگاری، ئەمە جیاوازییەکی جەوهەرییە لە میانی بینینی خودا لە حاڵەتی وەجد و وەرگرتنی فیوزاتدا، لەگەڵ هەمان بینین بەڵام بە دەرکەوتنی سیڕی مەعریفەت و حەقیقەتی خواناسی و، بە هۆکاری تەوەججوهی قوطبێکی دائیرەی مەعریفەت، کە خۆی لەناو ئەو شەپۆلە بەرفراوانەدا مەلەوانی هەموو دەریاکان ببێت و، هەندێك لەو ئەسرارەش پیشانی

بگات پلەی پێغەمبەرانە، لە پاشان پلەی ئەولیاکانەو ئەوانەش کە بە دووی ئەواندادێن.

ئەگێڕنەوە:

وێنەی دوو حەکیمیان بینی لە دانا و دادوەرە دێرینەکان لەمزگەوتێکدا، کە پارچە کاغەزێك بە دەست یەکێکیانەوە بوو کە تیایدا نووسرابوو:

(ئەگەر بە جوانی و نایابی هەمو شتێکت دروست کرد، هێشتا وامەزانە کە تەواوی هەموو شتەکانت بە جوانی دروست کردووە، تا نەگەیتە ناسینی خودا و لە حەقیقەتی مەعریفەتی خودایی شارەزا نەبیت، کە دڵنیا بیت تەنها خودایە بەڕاستی هۆی سەرەکی هەموو هۆکارەکانە و، خوڵقێنەری هەمو شتەکانە، ئەمەش یەکتاپەرستی ڕاستەقینەیە) کەواتە:

(تا نەگەیتە کۆتایی هەموو زانستەکان کە (معرفة الله)یە، وەك نەگەیشبیتە هیچ زانستێك ئاوایە).

هەروەها بینی لە دەستی ئەوی تریشیاندا پارچەیەکی بە دەستەوە بوو تیا نووسرابوو: ( پێش ئەوەی من خودا (ﷻ )بناسم، حاڵم وابوو کە برسی و تینووم دەبوو، تا ئەوەی کە خودام ناسی، ئیتر لەو کاتەوە تێراو دەبم و ئاویش ناخۆمەوە.) ئەمەیە کە پێی دەوترێت:

ئاواشتە بوونی خواردنەوەی مەعنەوی کە ئیتر تینوێتی زاهیری دەشکێنێت.

---

ئەم سالیکی ڕێگایە بدات کە هەندێکیان بەرگە دەگرن و هەندێکیشیان وەك ئەو زاتەیەدەبن کە بەرگەی نەگرت و وەفاتی کرد. ڕاستگۆیی خۆیی سەلماند بۆ گەیشتن بە سیری مەعریفەت، بۆیە بوو بە شەهیدی عەشق و مەعریفەتی خوداناسی. بۆ زانیاری زیاتر بنوارە:الاتحاف: ٢٣٤/١.

# ئەركی حەوتەمی فێرخواز

# فێربوون دەبێت بە ڕیزبەندی و یەك لە دوای یەكی بێت

نابێت بە یەك جار بیەوێت بە قووڵی لە هەمو هونەرە زانستییەكان بۆیان دابچێت، بەڵكو یەك لە دوای یەك كاریان لە سەر بكات، گرنگ لە دوای گرنگ دەستیان پێ بكات، هەوڵیش نەدات لە زانستێكی دیكەش شارەزا ببێت، تا ئەوەی لە پێشەوە دەستی پێكردووە مافی تەواوی خۆی پێ نەدات

بە ڕاستی زانستەكان بۆ خۆیان بە پاكی و بە پێی پێویست ڕێكخراون، هەندێكیان دەبن بە ڕێگە بۆ گەیشتن بە هەندێكی‌تریان. ئەوەی سەرفرازە لەو زانستەدا كەسێكە چاودێری ئەو یەك لە دوای یەك و پلەكاریە بكات. خودای گەورە فەرموویەتی:

الَّذينَ آتَيْنَاهُمُ الكِتابَ يتلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ (البقرة/١٢١)

واتە: ئەو كیتابیانەی كیتابمان پێ داون، بە جوانی ئەی خوێننەوە و لەفزەكەی ناگۆڕن و لە مەعناكەی ورد دەبنەوە [١].

واتە:

زانستێك تێناپەڕێنن تا بە تەواوی و تۆكمەیی فێری نەبوون و كاریان پێ نەكردبێت. هەر زانستێكیش كە بە دەستی دەهێنێت و بە دوای دادەگەڕێت، دەبێ بەو مەبەستە بێت كە بەرزتر ببێتەوە بۆ زانستێكی بەرزتر. وە نابێت یەكسەر بڕیار بدات بە سەر زانستێكی دیكەدا كە بەكەڵك نایەت، چونكە

---

(١) تە فسیری نامی ج /١ ل١٩ .

جیاوازی بیروڕا لە میانی خاوەنەکانیدا هەیە، یان یەکێك یان چەند کەسێك هەڵەیان تیا کردبێت، یان بە پێچەوانەی زانینەکەی خۆیان کە لێیان دەخوازێت کاریان کردبێت.

وەك دەبینیت کۆمەڵێك وازیان لە زانستە عەقڵی و فیقهیەکان هێناوە، بەو بیانوەی کە دەگەیشتن و دەیان زانی. بۆ لادان و ڕەوینەوەی ئەو گومانە، پێشتر لە کتێبەکەمان (مِعْیارُالعِلمْ)دا باسمان کردووە، هەروەها کۆمەڵێکیتریش وای دەبینن:

کە زانستی تەندروستی پوچ و بێ بنەمایە، چونکە هەڵەیەکیان لە پزیشکێکەوە بینیوە.

هەندێکیش بڕوایان وایە زانستی ئەستێرە ناسی دروست و پەسەندە، چونکە ڕاستیەکیان لە یەکێکەوە بینیوە.

وە کۆمەڵێکیتریش ووتویانە پوچ و باطیلە لە بەر هەڵەیەك کە لە کەسێکدا بینیویانە.

ئەم ڕاو بۆچونانە هەموی هەڵەیە، بەڵکو دەبێت ئەو شتەی دەتەوێت پێناسەی بکەیت بە خۆیدا بیناسیت، لە بەر ئەوەی تەواوی هەمو زانستێك ڕوبەڕوی یەك کەس نابێتەوە کە سەربەخۆ بیزانێت، بۆیە حەزرەتی عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی:

حەق و ڕاستیەکان بە پیاوەکاندا مەناسە، بەڵکو لە پێشەوە ڕاستیەکان بزانە و تێیان بگە، ئەو کاتە ئەهلی ئەو زانستەش دەناسیت.

# ئەركی هەشتەمی فێرخواز

## زانینی هۆكاری بەرزی و مەزنی زانستەكە

دەبێت فێرخواز ئەو هۆكارەش بزانێت كە مەزنی و گەورەیی ئەو عیلمەی پێی دەردەكەوێت، مەبەستمان لەمبارەوە دوو شتە:

**یەكەمیان:** شەرەفمەندی بەرهەمەكەی

**دوهەمیان:** بە هێزی و تۆكمەیی بەڵگەكانی

ئەمەش وەكو زانستی ئایین و زانستی تەندروستی، كە بەرهەمی یەكێكیان ژیانی هەتاهەتاییە، وە بەرهەمی ئەویشیان ئەم ژیانەیە كە بە كۆتا دێت، كەواتە عیلمی دین مەزن و پیرۆزترە.

هەروەها لە سەیر كردنی زانستی حیساب و ژمێریاری و زانستی ئەستێرە ناسیدا، دیارە كە زانستی حیساب پەسەندترە لە بەر بە هێزی و تۆكمەیی بەڵگەكانی.

ئەگەر زانستی ژمێریاری خرایە پاڵ زانستی تەندروستییەوە، ئەو كاتە تەندروستی‌یەكە بەرز و بایەخدارترە و پایەی ژمێریاری بەرزترە لە ڕوانگەی بە هێزی بەڵگەكانیەوە، بەڵام سەرنج دان لە بەرهەمەكەی لە پێشترە لە بەڵگەكەی، بۆیە ڕای زانایان بەو ئاراستەیەدا ڕۆشتووە كە زانستی پزیشكیان بە لاوەگرنگتر بووە هەر چەند زۆربەیشی بە مەزندەكاری و تەجرەبەكردن بووە.

لێرەدا بە تەواوی دەركەوت كە شەرەفمەندترینیان زانستێكە كە پەیوەندی بە زاتی خوداوە هەبێت (العلم بالله)، وە ناسین و زانین بە فریشتەكان و كتێبە ئاسمانییەكان و پێغەمبەران، هەروەها شارەزا بوون لەو ڕێباز و ڕێگەیەی كە دەیانگەیەنێت بە عیلمی ئاخیرەت، كە واتە:

نەخەڵەتا بیت حەزت لە هیچ زانستێك بێت و سوور بیت لە سەری، جگە لەو زانستە كە خزمەتی پاشە ڕۆژت دەكات.

# ئەركی نۆیەم

## دەبێت مەبەستی فێرخواز پاڵفتەیی دەرونی بێت

دەبێت مەبەستی خێرای فێرخواز، ڕازاندنەوە و پاڵفتە کردنی دەرونی بێت و جوانکردنی بە فەزیلەت و ڕەوشتە پەسندەکان، وە لە داهاتویشدا نزیك بوونەوە بێت لە خودا (ﷻ)، وە بەرز بوونەوە بێت بۆ دراوسێیەتی جێگا بەرزەکانی (المَلَأُالأَعلَى) و، ژیان لەگەڵ فریشتە و نزیکانی دیوانی پەروەردگار.

وە نابێت هیچ مەبەستێکی لا بەلای هەبێت، وەك دەستخستنی شکۆمەندی و ماڵ و سامان و دەستەڵات و خۆ نزیك کردنەوە لەگەڵ نەفامەکان و خۆ گێڤ کردنەوە و شانازی کردن بە سەر هاوڕازەکاندا.

ئەگەر مەبەستیش گەیشتن بێت بە خودای (باڵادەست) ناچارە دەبێت بە دوای نزیکترین ڕێگەی گەیشتن بە مەرامەکەی بگەڕێت، کە عیلمی ئاخیرەتە، لەگەڵ ئەمەشدا نابێت بە چاوی سووکی و بێ ڕێزیەوە سەیری زانستەکانیتر بکات وەك: زانستی فتوادان و زانستەکانی (نەحو و زمان) کە پەیوەندارن بە کیتاب و سوننەتەوە، لەگەڵ ئەوانی تریش کە لە دەستپێك و تەواوکاریەکاندا لەبەشەکانی زانستمان ژماردن، کە زانینیان ( فەرزی کیفایەیە).

وا تێنەگەیت کە زۆر ڕۆچون و بەرزڕوانینمان بۆ زانستی ئاخیرەت، بەکەم سەیرکردن و دورخستنەوەی ئەم زانستانەیە، چونکە ئەوانەی بە ئیخلاصەوە خاوەندارێتی ئەو زانستانە دەکەن، وەك ئەوانەوان کە لێ براون و پاراستن و مانەوەی ناو سەنگەرەکانیان خستۆتە ئەستۆی خۆیانەوە، وە ئەوانەش کە لە ڕێگەی خودادا غەزادەکەن لە جەنگاوەرەکان، کە بە گیانی خۆیان و ئەوانەش کە بە هەر شێوەیەکی کۆمەکی کردن یارمەتیان دەدەن، یان ئاویان بۆ دەگێڕن و برینپێچیان بۆ دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کە خزمەتی وڵاخەکانیان دەکەن و

ئاڵفیان دەخەنە بەردەم و ئامادەیان دەکەن، ئەمانە هەمویان بێ پاداشت نابن، بەمەرجێك مەبەستیان بەم کار و خزمەتانە بەرز کردنەوەی کەلیمەو وتەی پیرۆزی یەکتاپەرستی بێت، نەك کۆکردنەوەی ماڵ و دەسکەوتی شەڕ، (یان سومعە و ڕیاکاری و دەرخستنی ئازایەتی) هەروەها زاناکانیش وەك موجاهیدەکان، هەمان پلە و پایەی جیاوازیان هەیە وەك خودا فەرموویەتی:

(يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ)المجادلة /١١

ئەوانەی خاوەن باوەڕ و خاوەن زانستن، خودا چەندین پلە بەرزیان دەکاتەوە و ڕێزیان لێ دەنێت).

هەروەها خودا فەرموویەتی: (**هم درجاتٌ عند الله**. آل عمران/١٦٣)

(ئەمانە لای خودا خاوەنی پلە و پایەی جیاجیان) گەورەیی و ڕێزەکەیشیان ڕێژەیی‌یە، کاتێك سەیری پیشەی دەلاڵی و پارە گۆڕینەوە دەکەین بە نیسبەت کاری پاشاکانەوە، کە بە کەم و بێ بایەخ بۆیان دەنوارین، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەگەر لە پاڵ خۆڵرێژەکانیشدا بەراوردیان بکەین هەروا بە بێ نرخ و بەها دەژمێررێن. وایش گومان مەبە کە ئەوەی لە ئەو پەڕی پلە و پایەی بەرزییەوە دابەزێت، ئیتر هیچ ڕێز و قەدری نەماوە، بەڵکو دەبێت بزانیت، کە پلە بەرزەکان بۆ پێغەمبەرانە و ، لە پاشان ئەولیا و موقەڕەبین و، لە پاشان زانا پێگەیشتووە زۆر شارەزاکان لە دیندا، پاش ئەوانیش پلەی صاڵح و پیاوچاکان دێت، بە پێی بەرزی و نزمی پلەکانیان. بە کورتی:

ئەوەی بە ئەندازەی گەردیلەك و کەمتریش چاکە و خێر بکات، بەرهەمە کەی دەبینێت، ئەوەش بەو ئەندازە کەمتریش شەڕ بکات، شەڕەکە دێتەوە ڕێگای، وە هەر کەسێکیش مەبەستی لە زانستەکەی تەنها ڕەزامەندی خودا بێت، ئەوە سوودی پێ دەگەیەنێت و، بە دڵنیاییەوە بەرزی دەکاتەوە، ئیتر هەر کامێك لە زتنستەکان بێت، مادام بە ئیخلاصەوە کاریان لە سەر بکات.

# ئەرکی دەیەم

# فێرخواز چۆن زانست دەیگەێنێت بە ئامانج

فێرخواز دەبێت شارەزا بێت بە ڕێژەی هەمو زانستەکان لە گەیاندنیان بە مەبەستی سەرەکی، کامەیان بەرزتر و نزیکتر بە ئامانجی دەگەیەنێت ئەوە لە پێشترە لە لای، ئەوەی بایەخی زیاترە گرنگی باشتری پێ دەدات، واتای گرنگ ئەوەیە کە لای خۆت زۆر بایەخدار بێت، ئەوەش گرنگە لە لای تۆ کە سوودی دونیا و دوارۆژت بۆ دەبینێت، کە مادام ناگونجێت چێژ و تامی ژیانی دونیا و نیعمەتەکانی دوا ڕۆژ بە یەکەوە کۆ بکرێنەوە، وەك قورئان باسی کردووە و ئەوانەش کە چاوی دڵیان کراوەیەو بە نووری خودا سەیریان کردووە و وەك چاوی زاهیری لێی دڵنیابوون، کەواتە گرنگ ترین ئەوەیە تا هەتاهەتایە لە گەڵتدا بمێنێتەوە، ئەو کاتە دونیا دەبێتە مەنزڵگای کارەکان و، جەستەیش دەبێتە جێگەی سواربوون و پەڕینەوەی ڕۆح بۆ کۆتا مەبەستەکان، کردەوەکانیش هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە مەرامەکان و، هیچ ئامانجێکی سەرەکیش نییە جگە لە لیقا و گەیشتن نەبێت بە خودا، هەمو نیعمەتەکان لەو بەیەك گەیشتنەدا دەستی دەکەوێت، هەر چەندە لەم جیهانی دونیایەدا کەمێك نەبێت قەدر و ڕێزی ئەو لیقای خودایی‌یە نازانن.

زانستەکانیش بەو پێیەی کە دەیگەینێت بە بەختیاریی لیقا و گەیشتن بە خوداو، سەیر کردن و بینینی ڕوخساری پیرۆزی پەروەردگار، مەبەستم ئەو سەیرکردنەیە کە پێغەمبەرەکان بە دویدا گەڕاون و لێی حاڵی بوون، نەك ئەوەی کە بە خێرایی دێتە ناو زیهن و مێشکی نەخوێندەوار و زانایانی موتەکەللیمینەوە. **کەواتە ئەو زانستەی کە مەبەستمانە لە سەر سێ پلەیە،** بە پێواندنی و بەراوردکردنی لەگەڵ نمونەیەکدا لێی تێدەگەین:

بەندەیەك ئەگەر كاتی ئازادكردن و گەڕانەوەی موڵك و دەستەڵاتی بەسرایەوە بە حەج كردنەوە و پێی ووترا: ئەگەر حەجی ماڵی خودات كرد و مەرجەكانت جێبەجێ كرد، ئەوا ئازاد دەبیت و دەبیتەوە بە خاوەنی موڵك و دەستەڵاتی خۆت، وە ئەگەر دەستت كرد بە سازكردنی ڕێگەی حەج و خۆ ئامادەكردن بۆی، بەڵام لەم ڕێگەدا كۆسپێك هاتە ڕێگات و، بووە ڕێگرێكی زۆر گەورە لە گەیشتنت بەو مەرامە، ئەوە تەنها لە بەندەیی ئازاد دەبیت، لە بەدبەختی و ئازاری كۆیلایەتی ڕزگارت دەبێت نەك گەیشتن بە بەختەوەری موڵكداری، كەواتە ئەم كۆیلەیە سێ كاری گرنگی لە بەردەمدایە:

**یەكەم**: ئامادە كردنی هۆكارەكانی سەفەر كردن، لە كڕینی وشتر و جێگای هەڵگرتنی ئاو و ئامادەكردنی خۆراك و سواری.

**دووهەم**: دەبێت ڕێگاكە بگرێتە بەرو، دوور كەوێتەوە لە وڵات و نیشتیمان و، ڕو بكاتە كەعبەی پیرۆز و قۆناغ بە قۆناغ بكەوێتە ڕێگا.

**سێیەم**: خۆی خەریك بكات بە ڕاپەڕاندنی كارەكانی حەججەوە و، ڕوكن لە دوای ڕوكن جێبەجێیان بكات.

دوای لێبوونەوە و ئیحرام شكاندن و تەوافی خوداحافیزی، ئەو كاتە شیاوە بۆ وەرگرتنی موڵك و دەستەڵات و (ڕزگاربوونیشی لە كۆیلایەتی).

كەواتە لە هەر جێگە و قۆناغێكدا پلە و مەنزڵێكی تایبەتی هەیە، لە سەرەتای خۆ ئامادە كردنەكانەوە تا كۆتایی، دیارە نزیكی ئەو كەسە لە خۆشی و بەختیاریەوە كە دەستی كردووە بە بە جێهێنانی ئەركانەكانی حەج، جیاوازە لەوەی كە هێشتا لە سەرەتای ئامادە كردن و كەرەستەی خواردن و سواری و پێداویستیەكانە.

بەڵكو وەك ئەوەش نییە كە ڕێگاكەی گرتۆتە بەر، بەڵكو لە هەموویان لە پێشتر و نزیك ترە لە گەیشتن بە ئاواتەكانی.

**کەواتە: زانستەکانیش بەهەمان شێوە سێ بەشیان هەیە.**

**بەشێکیان** دەچێتە جێگای کڕینی پێداویستی و ئامادەکردنی خۆراك و کڕینی وشتر و سواری بۆ سەفەرەکە، ئەمەش وەك زانستی تەندروستی و فیقە و ئەوانی تریش کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندیەکانی لاشەوە هەیە لە دونیادا.

**وە هەندێکی تر** لە زانستەکان هەمان حوکمی ئەوەیان دەدرێت بە سەردا، کە دۆڵ و شیوەکان دەبڕن و کۆسپ و تەگەرەکان بە جێ دەهێڵن، ئەمەش پاککردنەوەی دەرون و باطینی مرۆڤە لە صیفەتە خراپ و ژەنگ گرتووەکان، وە دەرپەڕاندنی ئەو کۆسپ و تەگەرانەیە لە ڕێگەیدا، کە هەمو کەسەکان لە سەرەتاو لە دواییەکاندا دەستەوەستان ماونەتەوە بەرامبەری، مەگەر تەنها ئەوانەی کە خودا تەوفیق و یارمەتی داون بۆ ئەو مەرامە. ئەمەش وەك گرتنە بەری ڕێگای طەریقەتە. وەخۆ شارەزا کردن لێی، وەك هەوڵدانە بۆ شارەزا بوون لە ئەملاولای ڕێگەکان و مەنزڵگا و قۆناغەکان، هەروەك چۆن شارەزا بوونت لە قۆناغ و مەنزڵ و ڕێگاکان ناتگەیەنێت بە ئامانج، ئەگەر نەیشیان بڕیت و پێیاندا نەپەڕیتەوە، هەروەهایش بە تەنها زانینی عیلمی ئەخلاق و پاڵفتەکاریەکان پێناگەیت، تا ڕاستەوخۆ دەستیان پێ نەکەیت و جێبەجێان نەکەیت، بەڵام ئەوەندە هەیە: تا نەبیتە خاوەنی زانست وشارەزای ڕێگاچارەکان نەبیت، ناتوانیت پاڵفتە کاریەکان بە ئەنجام بگەیەنیت.

**بەشی سێیەمیش** دەخرێتە شوێنی ئەصڵی حەج و ئەرکانەکانەوە:

ئەوەش عیلمە بە خودای باڵادەست و بە صیفەت و فریشتە و کردارەکانی و، هەموو ئەوانەی لە باس و ڕونکردنەوەی عیلمی موکاشەفەدا بەیانمان کردن. ئا لێرەدا ڕزگاربوون و دەسکەوتی بەختیاری تێدا بەدی دەکرێت، ڕزگاریش بۆ هەمو ئەوانەی ڕێگای ئاخیرەت دەگرنە بەر بەدی دێت، ئەگەر ئامانجەکەی مەبەستێکی ڕاست و دروست بێت، کە سەلامەتییە لە تیاچوونی هەتاهەتایی،

بردنەوەی خەڵاتی بەختەوەریش تەنها عاریف و خوداناسان دەستیان دەکەوێت، ئەوانە نزیکان و خەڵاتکراوەکانن، کە لە ناو نازو نیعمەتی دراوسێیەتی لە حزوری پەروەردەگاریاندان، بە ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی و ڕزق و بۆنخۆشی و سەرفرازی، لە ناو بەهەشتی پڕ لە نیعمەتی خودایی.

بەڵام ئەوانەی کە ئەگەر نەیشگەیشتبن بە چڵە پۆپەی کەماڵ و خوداناسی، بەڵام ڕزگاریان دەبێت لە ناڕەحاتیەکان، ئەوانە بە دوریش دەبن لە دۆزەخ و، لە نیعمەتەکانی بەهەشتیشدا بە خۆشی گوزەران دەکەن

**فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ، فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ، وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ، فَسَلَامٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ** . واتە: (بەڵام ئەوەی نزیکی ئێمەیە و دەمرێت، لە پاداشتدا دەحەسێتەوە و دەچێتە بەهەشتی پڕ لە خۆشی، ئەگەر لەو کەسانەش نەبوو کە لەگەڵ دەستەڕاستانن، درووود بۆ تۆ لەو کەسانەی دەستەڕاستن [1]. وە ئەوەی دەفتەری کرداریان دەدرێتە دەستی ڕاستیان، ئەوە پێیان دەوترێت: سەلامی خودات لێ بێت لەهەمو ئەو برادەرانەتەوە کەدەفتەری کرداریان دراوەتە دەستی ڕاستیان)[2] هەر کەسێك بە ڕاستی ڕوو لە مەبەست و ئامانجی سەرەکی نەکات وە خۆیی بۆ ئامادە نەکات و نەچێت بەدەمیەوە، یان هەڵبسێت و بەرەو لای ئامانجەکەی بڕوات، بەڵام چوونەکەی بە ناوی فرمانبەرداری و بەندایەتیەوە نەبێت، بەڵکو لە پێناوی ئامانجێکی خێرا و دەسکەوتێکی کاتیدا بێت، ئەوە لەو کەسانە دادەنرێن کە دەفتەری نامەکانیان دەدرێت بە دەستی چەپیانەوە و، لە گومڕابووان دەژمێررێن، ئەوە ئاگری سوورەوە بووی تاودراوی دۆزەخ دەبێتە مەنزڵگایان.

---

(١) قورئان پیرۆز. هەژار، ٥٣٧

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی / ٥٣٧ .

بزانە: ئەمە ئەو زانستەیە کە پێی دەڵێن: ( **حَقُ اليَقِين**) ئەوە هەواڵی دروست و ڕاستەقینەیە، واتە: بە چاوی بەصیرەت و نووری شاراوەی دەرونییەوە، ئەو ڕاستییانەیان بینیوە کە زۆر ئاشکرا و بە هێزترە لەوەی کە بە چاوی سەر بینیبێتیان، لەو حاڵەتەی کە تەنها لە قۆناغی بیستندا بن، وە شوێن قسەی خەڵکی‌تر کەوتبن لەوە بەرزبونەتەوە، حاڵیان وەك حاڵی ئەوانەی لێ هاتووە کە هەواڵیکیان پێدراوە و باوەڕیان پێی هێناوە، لە پاشان بە خۆیشیان دیویانە و لێی دڵنیا بوون. حاڵی ئەوانی‌تریش وەك حاڵی کەسانێك وایە کە بە جوانی و بڕوا و متمانەوە قسەکانیان بە ڕاست زانیوە و تەصدیقسان کردووە، بەڵام ئەو بەختەیان نەبووە کە بە بینین و حەقیقەت، وە بە چاوی خۆیان ڕاستیەکان موشاهەدە بکەن.

کەواتە لە پشتی زانستی موکاشەفەوە بەختیاری ڕاستەقینە هەیە، عیلمی موکاشەفەیش لە پشتی زانستی (موعامەلە)وەیە، کە ئەویش بە واتای گرتنە بەری ڕێگای ئاخیرەت لێك دراوەتەوە، وە بڕینی کۆسپی صیفەتە نالەبارەکان و گرتنە بەری ڕێگەی سڕینەوەی صیفەتە خراپەکان، لە دوای پەیداکردنی (زانستی صیفات) بە دەستی دەهێنێت، هەروەها لە دوای زانینی چۆنیەتی چارەسەر کردن و لابردنی صیفەتە خراپەکان، وە چۆنیەتی سلوك و گرتنە بەری ڕێگای پاککردنەوەیان بە ڕەوشت و بەها پیرۆزەکان، ئەمەش لە دوای شارەزا بوون لە زانستی سەلامەت بوونی جەستە و، یارمەتیدانی هۆکارەکانی تەندروستی، وە پاراستنی لاشەیش بە کۆبونەوە و خۆ دەرخستن و هاوکاری کردن دەبێت، کە بە هۆی گرتنە بەری ئەم ڕێکارانەوە بگاتە پەیداکردنی پۆشاك و بژێوی و جێگای حەوانەوە، کە دابین کردنی ئەم پێداویستیانەش بەسراوەتەوە بو سوڵتانی گەورە و یاسا و ڕیساکانی شەرعییەوە، لە ڕێکخستنی کاروباری خەڵکی بە شێوەی دادگەری و، سیاسەتی دروست لە لایەن فەقیە و

شارەزاکانەوە کەیاساکانیان پێ نیشان دەدەن. وە لە بارەی هۆکارەکانی لەش ساغییەوە، ئەوەی لە لایەن پزیشکەوە ڕادەگەیێنرێت وە ئەوەش کە (ئیمامی شافیعی) فەرموویەتی: زانست دوو جۆرە زانستە، زانستی جەستە و لەش ساغی و زانستی ئەدیان، کە هێمایە وەلای عیلمی (فیقه) مەبەستی پێی زانستە ئاشکرا و بڵاوەکانە، نەك زانستە ناوازە و گرنگ و شاراوەکان [1].

ئەگەر بڵێیت: بۆچی عیلمی (فیقه)و زانستی تەندروستیت وەك ئەوە داناوە کە خۆراك و سواریی ئامادە بکەین بۆ گەشت کردن؟

لە وڵامدا ئەوە بزانە: ئەوەی بۆ لای خودای گەورە هەوڵ دەدات و بەڕێوەیە کە لێی نزیك ببێتەوە، ئەوە دڵەکەیەتی نەك جەستەکەی.

مەبەستیشم لە (دڵ) ئەو پارچە گۆشتە هەست پێ کراوە نییە کە دەبینرێت، بەڵکو مەبەستم ئەو سیڕڕە تایبەتیەیە لە نهێنیەکانی خوداوەندی گەورە، کە شاراوەیەو ناچێتە ژێر زانیاری و بینینی هەستەوە، وە یەکێکە لە فەرمانە ناسك و لەطیفە مەعنەویەکانی دەروون ( کە کەس ناتوانێت لێی تێ بگات، مەگەر لە ڕێگای شارەزا و مورشیدێکی کامیلەوە.) وە هەندێك جار لە جیاتی دڵ دەستەواژەی ڕۆح بە کار هاتووە [2].

---

(١) فەرمودەی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە (حلیە الاولیاء)دا باس کراوە، (١٤٢/٩).

(٢) هەر لە مەیشەوە کە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز لێکدانەوەی بۆ کراوە: (**ولكن تعمى القلوب التي في الصّدور**) واتە: ئەو دڵە کوێر دەکات کە لە ناو سینە دایە، واتە چاوی دڵ و بەصیرەتی نامێنێت، دڵیش بۆیە پێی دەوترێت (قلب) واتە: لە سەر حاڵەتێك نامێنێتەوە و، هەمیشە لە هەڵگوڕاندایە، مەبەست لەو مانا تایبەتیانە کە بەسراوە پێیەوە، وەك: ڕۆح و زانست و ئازایەتی. **یەکەمیان** کە وشەی (دڵ) قەلبە کە بە واتای ڕۆح بێت، ئەوەیە کە قورئان فەرموویەتی: (**و بَلغَتِ القُلوبُ**

وه هەندێك جاریش بە نەفسی ئارام گرتوو (نەفسی موطمەئیننە) باسی کراوە، شەرعیش هەر بە دڵ ناوی بردووە و باسی کردووە، چونکە دڵ مەنزڵگا ی یەکەم و جێی حەوانەوەیە بۆ ئەو سیڕ و نهێنیانەی کە هەستیان پێ ناکرێت، وە بە هۆی دڵیشەوە هەمو لاشەی مرۆڤ دەبێتە هەڵگر و ئامێری ئەو لەطیفە مەعنەوییەی کە باسمان کرد.

وە پەردە لادان لە سەر نهێنییەکانی ئەو سیڕە تایبەتییە، بەشێکە لە کاری (زانستی موکاشەفە)، کە ئەمەش بە کەمی ئاوڕی لێ دراوەتەوە، بەڵکو ڕێگە نەدراوە کە باسی بکرێت، ئەو پەڕی ڕێگا کە درابێت و تۆزێك ڕونبکرێتەوە، تەنها ئەوەیە کە دڵ جەوهەرێکی بە نرخ و پڕ بەهایە، وە گەوهەرێکی ناوازەو دەگمەنە و، لە هەمو ئەو بینراوانەی لە بەر چاودان شەرەفدارترە.

**ڕۆح:** فرمانێکی تایبەتی خودایی‌یە، وەك خودا فەرمویەتی: پرسیارت دەربارەی ڕۆح لێ دەکەن کە چییە؟پێیان بڵێ: ڕۆح لەو مەخلوقاتانەیە کە بە ئەمرو فرمانی خودای من پەیدابووە و هەر خۆیشی دەزانێت چییە)[1].

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى﴾

وە هەمو دروست کراوەکانیش دەدرێتە پاڵ خودای باڵادەست، بەڵام درانە پاڵی ڕۆح جیاواز و پڕ بەهاترە لەوەی کە ئەندامەکانی لەشیش دروستکراوی خودان،

---

**الحَناجِرَ**) واتە کە ڕۆح دەگاتە ناو گەروو کە بێتە دەرەوە. **دوهەمیان** کە (قەلب) بە واتای (عیلم) بێت، وەك قورئان فەرمویەتی: (**لِمَنْ كانَ لَهُ قَلْبٌ**) واتە بۆ کەسێك کە زانستی هەبێت، وە سێ‌**هەمیشیان** کە بە واتای ئازایەتی دێت، فەرمودەی قورئانە (**ولتَطمَئِنَّ بهِ قُلُوبُكم**) واتە: با ئازایەتیەکانتانی پێ جێگیر ببێت . الاتحاف (٣٣١/١).

(١) خولاصەی تەفسیری نامی ل:٢٩٠.

کەواتە: هەموو دروست کردن و تەقدیر کردنی فرمانەکان ( کە بە جیهانی ئەمر) ناسراوە، هەموی بە دەستی خوداوەندی بالادەستە[1]. وە عالەمی ئەمر و فەرمان بالاترە لە جیهانی دروست کردن، ئەم گەوهەرە بە نرخەی کە هەلگری ئەمانەتی خودایی‌یە، بە هۆی ئەو پلە و پایە بەرزەوە لە هەمو ئاسمانەکان و زەوی و کەژەکان پێشکەوتووترە و بە نرختر دانراوە، چونکە ئەوانە ڕێگەیان نەدا و نەیانتوانی هەلگری ئەو ئەمانەتە بن، وە زۆر لێی دەترسان کە نەتوانن ڕاگیری بکەن، ئەوەش بە (عالەمی ئەمر) ناسراوە، ئەمەش هەرگیز ئەوەی لێ وەرناگیرێت کە هێما بێت بۆ قەدیمی و ئەزەلییەتی ڕۆح، (چونکە پەیوەندارە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی پەروەردگارەوە)، هەندێکیش وتویەتی، ڕۆح هەر بووە و تازە پەیدا نەبووە، ئەو کەسەیە تا بلێی سەرکەش و نەزان و نەفامە و نازانێت

---

(١) خودا فەرموویەتی: (**أَلا لَهُ الخَلقُ و الأَمْرُ**) کەواتە: هەر خودایە کە لە نەبوون دروستیان دەکات و دەتوانێت دەستکاریان بکات، جیهانی بەو ڕیك و جوانی و پەندیارییە دروست کردووە، ئاسمانی بە ئەستێرەکان نەخشاندووە و لە پاشان ئەم مەخلوقاتەی دروست کردووە کە گۆڕانکاریان بە سەردا دێت لە سەرەتاوە بۆ گەورە بوون و لە پاشان بۆ پێگەیشتن وە کاتێ جیهانی موڵکایەتی بۆ تەواو بوو بڕیاری دا کە کارو فرمانی بۆ ڕیك بخات، ئەو کاتە لە ئاسمانەکان و زەویەوە فەرمانی بۆ دەرکرد چۆن فەلەك لە سوڕانەوە دابێت و ئەستێرەکان لە جووڵە و ڕۆیشتنی خۆیاندابن و شەوو ڕۆژ دروست بکەن و بە دوای یەکدا بن، لە پاشان چڵە پۆپەی تەقدیری خودایی ڕاگەیاند و فەرمووی (**أَلاَ لَهُ الخَلقُ و الأَمرُ فتَبارَكَ اللّٰهُ ربُّ العالَمِين**)ئەمەش بە عالەمی ئەمر ناو بانگی دەرکردووە کە لە سەر و عالەمی هەستیارەکانەوەیە و ڕاستەوخۆ پەیوەندارە بە خاوەنی بڕیارەوە کە خودایە (ﷻ). الإتحاف (١/٣٣٢)

چی دەڵێت [1]. با ئیتر لە مەزیاتر ئەم بابەتە ڕون نەکەینەوە و، خۆمان لە باس کردنی بگێڕینەوە، چونکە ئەو عیلمە زۆر لەسەر و ئەوباسەوەیە کە ئێمە دەمانەوێت لێی بدوێین. **ئەوەی مەبەستمانە:**

ئەم لەطیفەی دڵ و ڕۆحەیە، هەر خۆیەتی کە کۆشش دەکات بۆ نزیك بوونەوە لە پەروەردگارەوە، چونکە بە ئەمری خوداوەیە، سەرچاوەکەی لە خوداوەیە و، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە، بەڵام جەستە ئەو هۆکارە هەڵگرەیە کە ڕۆح سواری دەبێت و، بە هۆیەوە لە هەوڵدایە بگات بە ئامانجەکانی، کەواتە لاشە لەوەدا کە ڕێگەی خوداناسی بگرێتە بەر، وەك ئەو وشترە وایە کە کەسێك سواری دەبێت و دەیەوێت ڕێگەی حەجی پێ ببڕێت، وە هەروەها وەك ئەو دیزە و مەشکە وایە کە ئاوی تێخراوە و هەڵگیراوە بۆ ئەو ڕێگایە کە پێویستی پێ یەتی.

هەر زانستێك تەنها بەرژەوەندی لاشەی تێدا ڕەچاو کرابێت، ئەوە وەك ئەو شتانە وایە لە بەرژەوەندی بار هەڵگرەکەدایە، شاراوە نییە کە زانستی تەندروستیش هەروایە، کاتێك کە پێویستیان پێیەتی لە بەر پاراستنی صیحەت و لەشساغی کەسەکانە، ئەگەر مرۆڤ هەر خۆیشی بوایە بە تەنها، ئەوا پێویستی بە پزیشك و دەوا و دەرمان دەبوو، بەڵام عیلمی فیقە جیاوازیەکی تیا هەیە، کە ئەگەر مرۆڤ تەنها خۆیشی بوایە، لەوانەبوو پێویستی یەك کەس بە فیقە نەبوایە، هەرچەندە بە شێوەیەك دروست کراوە، کە ناتوانێت بە تەنهایێ بژی، چونکە ناتوانێت بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی خۆی، وە پەیداکردنی خۆراك و کێڵاندنی زەوی و چاندنی زەرعات و نان کردن و شیو

---

(١) وەك فەیلەسوفەکان و هاوڕازەکانیان کە ڕۆحیان بە قەدیم ئەژمارکردووە. الاتحاف (٣٣٢/١)

لێنان، هەروەها پەیداکردنی جل و بەرگ و پۆشاك و شوێنی حەوانەوە، وە لە ئامادە کردنی ئامێرو کەرەستەکانی یەکە بە یەکەی ئەمانەدا، کە بە تەنها خۆی بۆی ناکرێت، بۆیە ناچارە بە تێکەڵ بوون و داوای کۆمەکی کردن لە کەسانێکی‌تر.

مرۆڤیش تا زیاتر لەگەڵ یەك تێکەڵ ببن، ئارەزواتیان زیاتر دەبزوێت، هۆکاری ئارەزوات و مەیلی تایبەتی ڕایان دەکێشێت بۆ لای کێبڕکێ و شەڕ و کوشتار، بە هۆی شەڕیشەوە گیانیان بە هیلاکدا دەچێت، کە لە دەرەوە لەگەڵ یەکتر کێبڕکێ دەکەن، وە هەروەها بەربەرەکانی و ڕوبەڕوبوونەوە دەکەوێتە میانیانەوە، بەهۆی دژایەتی کردنی ئەو چوار ڕەگەزەی کە لە سەری دروست کراون لە ناخ و سینەی خۆیاندا، کەواتە بە هۆی سیاسەت و دادپەروەریەوە، پارێزگاری لە میانەڕەوی دەکرێت، کە لە دەرەوە بە یەکەوە بیانهێڵێتەوە و پێکەوە ژیان بەسەر بەرن، جا ئەو عیلمەی کە چوار ڕەگەزە جیاوازەکانی ناو دەروون بە یەکەوە و بە ئاسودەیی و دادوەری دەژێنێت، ئەوە زانستی تەندروستییە و، ئەو زانستەش کە ئەحواڵی خەڵکەکە دەپارێزێت، کە لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیاندا و لە کردارەکانیاندا بە داد پەروەری لەگەڵ یەکدا بن، ئەوە عیلمی فیقهە، هەر دوو زانستەکەش لاشەی مرۆڤ دەپارێزن، کە (هەڵگری ڕۆحەکەیانە). کەواتە: ئەو کەسەی کە بە تەنها خۆی تەرخان بکات بۆ فێربوونی زانستی فیقە یان پزیشکی، ئەگەر موجاهەدە لەگەڵ نەفسی خۆیدا نەکات و، ئیصلاحی دڵی خۆی نەکات و، هەوڵی چاکسازی دڵ و دەروونی خۆی نەدات، ئەوە وەك ئەو کەسە وایە کە خۆی یەکلایی کردبێتەوە و، وشترو ئاڵفی ڕێگا و مەشکەی ئاوو پێداویستیەکانی سەفەری پەیدا کردبێت، بەڵام هێشتا ڕێگای چۆل و بیابانی حەججی نەگرتبێتە بەر.

هەروەها کەسێکیش هەموو تەمەنی خەریکی نووسین و موجادەلە و بەڵگە هێنانەوە بێت لە زانستی (فیقە)دا، وەك ئەو کەسە وایە کە تەمەنی خۆی تەرخان کردبێت بۆ پەیدا کردنی وردەکاریەکانی هۆکاری سەفەرەکەی، کە بتوانێت بە وردی بار و بارخانە و کەرەستەکانی ئاو هەڵگرتن ببەستێتەوەو، بە قایمی درومانیان بکات و تۆکمەیان بکات بۆ ڕێگای حەج.

نیسبەتی ئەو کەسانەی کە سەرقاڵن بە وەرگرتنی (عیلمی فیقە) لەگەڵ ئەو کەسەدا کە سالیکی ڕێگای حەقیقەتەو خەریکی چاکسازی دڵە، یان گەیشتووە بە عیلمی موکاشەفە و لە نهێنیەکان حاڵی بووە، نموونەی ئەمانە وەك نیسبەتی ئەو کەسانەن، کە خەریکی کڕینی وشتر و پێداویستیەکانی سەفەرکردنەکەن، لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕێگەی حەجیان گرتۆتە بەر و، خەریکی بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکانەکانی حەجن.

کەواتە: لە سەرەتاوە بە چاکی سەرنج لەم بەراوردکاریە بدە، وە بە باشی گوێ لەم ئامۆژگاریە خۆڕاییەش بگرە، لە کەسێکەوە کە هەمو حاڵەتەکانی بەسەردا تێپەڕیوە و، ڕوبەڕوی هەمویان بووەتەوە، وە دوای هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر گەیشتووە بەم ئاستەی کە بۆ تۆی باس دەکات.

( مەبەستی لەوەیە لە مورشیدێکی خاوەن تەجرەبەی شارەزا و خاوەن بەصیرە تەوە قسەکان وەربگرە) کە بە لێوەشاوەیی و جورئەت و لێبڕانێکی زۆرەوە، بە دژ خواست و ویستەکانی خەڵکە تایبەت و گشتیەکەوە هەڵساوە و، خۆی دارنیوە لە تەقلید و شوێن کەوتوویی ئەوانەی کە تەنها شوێن ئارەزوات کەوتوون،(وە ئەم ڕاستیانەیشی بۆ تۆ ڕوون کردەوە).

ئەم ئەندازەی کە باسمان کرد، بەسە بۆ دەرخستنی ئەرك و وەزیفەکانی فێرخواز لە چۆنیەتی فێربووندا.

# ماموستای مورشید و وەزیفە و ئەرکەکانی

بزانە! چوار حاڵەت ڕو دەکاتە زانست و عیلمی مرۆڤەوە، وەك چۆن بۆ پەیدا کردن و هەڵگرتنی ماڵ ئەو حاڵەتانە ڕوی تێ دەکات:-

خاوەن ماڵ لەولایەنەوە کە سوود وەردەگرێت، ئەوە بە کەسابەتکار دادەنرێت، لەو لایەنەشەوە کە لێی هەڵدەگرێت و کۆی دەکاتەوە، ئەوە بەدەوڵەمەند ئەژمار دەکرێت، کە چاوی لەدەستی کەس نابێت.

حاڵەتێکی تری ئەوەیە کە لە خۆیدا سەرفی دەکات، ئەوە بەدەسکەوت و قازانج بۆی دەگەڕێتەوە، وە ئەگەر لێیشی ببەخشێت و دەستکراوە بێت، ئەوە بەسەخی طەبع و خاوەن چاکە دەناسرێت، کە ئەمەش لە هەموو پلە و حاڵەتەکانی چاکترە. عیلمیش هەر بەم شێوەیە، وەك ماڵ ئاوا هەڵدەگیرێت.

**حاڵەتی یەکەم:**

ئەوەیە بەدوایدا دەگەڕێت و هەوڵی فێربوونی دەدات،

**حاڵەتێکی تر ئەوەیە**

کە فێربووەو پێویستی بە پرسیاری ئەم و ئەو نی‌یە،

**لایەنێکی باشتری هەیە**

کە دەکەوێتە حاڵەتی بیرکردنەوەو بەرچاو ڕونی و، تام وچێژ وەرگرتن لەوەی کە خوێندویەتی.

**حاڵەتی چوارەمیش**

ئەوەیە بەرچاوی خەڵکیش ڕونبکاتەوە و ڕێنماییان بکات، کە ئەمە باشترینی حاڵ و پێگە زانستیەکەیەتی.

کەواتە ئەوەی فێری زانست ببێت و کاری پێ بکات و خەڵکیشی لێ فێربکات، ئەو کەسە خۆی لە خۆیدا ڕۆشنە و ئەوانی تریش ڕۆشن دەکاتەوە، وەك ئەو میسکە وایە خۆی بۆن خۆشە و ئەوانی تریش بۆنخۆش دەکات.

ئەوەی خەڵك فێردەکات، بەڵام خۆی فەرمانبەردار نییە و، کار بەزانستەکەی ناکات، ئەوە وەك ئەو دەفتەرەیە کە سوودی هەیە بۆ غەیری خۆی، خۆیشی خاڵییە لە هەموو زانستێك، یان وەك ئەو هەسانە وایە ئاسن تیژ دەکات و خۆیشی هیچ نابڕێت، یان وەك ئەو دەرزییەی غەیری خۆی پۆشتە دەکاتەوە و خۆیشی هەمیشە ڕووتە، یان وەك پڵیتەی چرا وایە، ڕۆشناییەکەی بۆ چوار دەورەکەیەتی خۆیشی دەسوتێت. وەك ووتراوە:

صِرتُ كأَنِّي ذُبالةٌ وُقِدَتْ تُضيءُ لِلنَّاسِ وَهيَ تَحْتَرِقُ[1]

واتە:[2]

بــوم بە پڵیتــەی چـــرای داگیرساو
دەگرێ بۆ خەڵکی و بۆ خۆیشی سووتاو

کەواتە چەندێك سەرقاڵی ڕێنمایی فێرکردن بێت، ئەوەندەش زیاتر ڕووبەڕوی مەترسیەکی سەخت و هەڵگرتنی ئەرك و فەرمانێکی گەورەتر دەبێتەوە.

**بۆیە دەبێت پارێزگاری لە ئاداب و ئەرکە گرنگەکانی فێرکردن بکات:**

---

(١) ديوان العباس بن الأحنف (الأحنف ص(٢٢)).

(٢) وەرگێڕراوی (ئەحسەن موفتی)

# ئەركی یەكەمی مورشید:
# بەسۆزی مامۆستا لەگەڵ فێرخوازەكانیدا

دەبێ بە سۆز و نەرم و نیان بێت لەگەڵ فێرخوازەكاندا و، لە شوێنی كوڕەكانی خۆی سەیریان بكات. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

((إنَّما أَنا لَكُم مِثلُ الوالدِ لِوَلَدِهِ))[1]

واتە:( بەڕاستی من بۆ ئێوە و لە پێناو ئێوەدا وەک باوكێكی بەسۆزو میهرەبان وام لەگەڵ كوڕەكەیدا، چۆن فێری دەكات، ئاوا منیش فێریان دەكەم چ مافێكیان هەیە و چ ئەركێكیان لە سەرە) چونكە ئامانجی باوك ئەوەیە تەنها لە ئاگرو ناسۆری دونیا ڕزگاریان بكات، بەڵام مەبەست و ئامانجی ئەو ڕزگاركردنیانە لە ئاگری دۆزەخ.

بۆیە مافی فێركەر بەسەر فێرخوازەوە گەورەترە لە مافی باوك و دایك، بەڕاستی زۆر ڕاستە كە باوك هۆكارە بۆ بوونی مرۆڤ لە ئێستاداو لە ژیانێكی كۆتا هاتوودا، بەڵام مامۆستا دەبێتە هۆكار بۆ مانەوەی ژیانی هەتا هەتایی، خۆ ئەگەر مامۆستای فێركەر نەبوایە، ئەوەی لە لایەن باوكەوە پەیدا دەبوو یەكسەر بەرەو ڕوی تیاچوونی هەتاهەتایی دەبوویەوە، بەڕاستی تەنها

---

(١) رواه أبوداود(٨) و النسائي(٣٨/١) و ابن ماجة(٣١٣). وابن حبان في صحيحه (٢٧٩/٤(٦٣٨٤) من حديث أبي هريرة. وقال الزبيدي: { ٣٣٥/١-٣٣٦}: قال السيوطي في جامعه(٦٣٨٤/٤٢٢/٢)، أخرجه الإمام أحمد في مسنده (٣٧٢١) و ذكر البقية، و قال المناوي في فيض القدير(٥٧١/٢) و فيه محمد بن عجلان و فيه كلام. أهـ و ذكر المزيد لمن أراد المزيد.

ماموستاکەیەتی کە سوودی ژیانی هەتاهەتایی و دوارۆژی پێ دەگەیێنێت، مەبەستیشم ماموستایەکە کە عیلمی ئاخیرەت فێری فێرخوازەکەی بکات، یان زانستی‌یەکی دونیایی، بەمەبەست و نیەتی دەسکەوتی پاشەڕۆژ بێت نەك دەسکەوتێکی دونیایی.

چونکە بەڕاستی فێرکردنی کەسێک تەنها لە پێناوی مەبەستێکی دونیاییدا بێت، ئەوە خۆیشی و خەڵکیش بەهیلاکدا دەبات، پەنا دەگرین بە خودا لەوکەسە.

هەروەها پیاوێك خاوەنی چەند کوڕێك بێت، هەروەك چۆن دەبێت کوڕەکانی یەکتریان خۆش بووێت و هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر هەموو کارو مەبەستە گرنگەکان، هەروایش پێویستە لەسەر قوتابیانی یەك ماموستا، خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانیەکی زۆر لە میانیاندا هەبێت.

خۆ ئەگەر مەبەستیان دەسکەوتی دوارۆژ بێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەبێت ئەو جۆرە خۆشەویستییە لە میانیاندا ڕەنگ بداتەوە.

بەڵام ئەگەر تەنها مەبەستیان دەسکەوتی دونیایی بێت، ئەوە تەنها دروێنەی ڕژدی و ئیرەیی و ڕق و کینەی پێ دەکەنەوە و هیچ دەسکەوتێکی ئەو دونیایان نابێت. چونکە زاناکان و ڕۆڵەکانی دوارۆژ ، گەشتی سەرەکییان بۆ حزوری خودایە، وە هەر لە دونیاوە ڕێگای دوارۆژ دەگرنە بەرو دەبنە سالیکی طەریق، وە ساڵ و مانگەکانی دونیا، لە جێگەی مەنزڵگای کاروانی ڕێگەی حەج کردنن.

لە کاتێکدا کە گەشتیارانی دونیا پێویستییان بە هاوڕێی ڕێگا هەیە بۆ ناو شارو وولاتەکان، کە دەبێتە هۆی زیادە خۆشەویستی و دۆستایەتی لەمیانیاندا، ئیتر چۆن سالیکانی طەریقی ئاخیرەت(بەسەفەری مەعنەوی بۆ جیهانی بەرزەخ

و بەهەشت و) لە پاشان بۆ فیردەوسی باڵا، چۆن پێویستیان بە هاوڕێی ڕێگا نییە( کە کۆمەك بن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان)

ڕێگای ئاخیرەتیش بەرتەسك نییە تا کێشەو گرفت بۆ یەکتر دروست بکەن، بەڵکو بەرفراوانە و لەیەك ناکەون، هەروەك چۆن ڕێگا بەختەوەریەکانی دونیا بەرتەنگ و بەرتەسکن، وە هەمیشە دووچاری شانە خرێ دەبن لەو ڕێگایانەدا.[1]

ئەوانەیش کە مەبەستیان لە فێربوونی زانست گەیشتنە بە دەستەڵات و ڕیاسەت، ئەوانە بەدەرچوو دەژمێررێن لەو کەسانەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە دەیانگرێتەوە:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ الحجرات/١٠﴾

واتە: بەڕاستی تەنها بڕواداارانن کە برای یەکترین، وە ئەو کەسانە دەچنە ژێر ئەومەبەستانەی کە ئەم ئایەتەیە دەیانگرێتەوە :

﴿الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ الزخرف/٦٧﴾

واتە:

(دۆستەکانی دونیا لە قیامەتدا دەبنە نەیارو دوژمنی یەکتری، مەگەر خواپەرستەکانیان نەبێت)

---

(١) شانەخرێ: واتە شانشانێن، لەڕێگەی تەسکدا شانەکان بەریەك دەکەون، واتە: توشی کێ برکێ و کێشەی تایبەتی دەبن لەگەڵ یەك.

# ئەرکی دووەمی مامۆستاو مورشید:

## لە سەر فێرکردنی زانست داوای هیچ پاداشتێك لەکەس نەکات

پێویستە شوێنی خاوەنی شەریعەت بکەوێت(صەڵات و سەلامی خودای لەسەر)، دەبێت وەك حەزرەت(ﷺ) وابێت:

لە سەرفێرکردنی زانست داوای هیچ پاداشتێك لەکەس نەکات، وە مەبەستی سوپاس و سەناو پاداشتی کەس نەبێت، تەنها لە ڕێی خودادا خەڵك فێر بکات، منەت بەسەر کەسدا نەکات و وانەزانێت هیچ فەزڵێکی هەیە بەسەریاندا، با لەڕاستیشدا ئەوان منەتباری بن، بەڵکو دەبێت وابزانێت ئەوان خاوەنی گەورەیین، کە دڵیان کردۆتە ئامانج، تا تۆوی زانستیتێدا بچێنرێت، وەك کەسێك کە پارچەیەك زەویت پێ بدات کە بۆخۆت بەروبوومی تێدا بچێنێت، ئەو سوودەی بە تۆ دەگات لە دورینەوەی بەرهەمەکەی، زیاترە لە خاوەن زەویەکە، کەواتە چۆن دەبێت منەتێکی بکەیت بەسەردا، کە پاداشتی تۆ لە فێرکردنی دا زیاترە لە پاداشتی ئەو کەسەی کە فێرخوازە و شتت لێوە فێربووە، خۆ ئەگەر فێرخوازەکە نەبوایە، تۆ ئەو پاداشتەت دەست نەدەکەوت، ئیتر چۆن منەتی بکەیت بەسەردا؟!

کەواتە نابێت داوای پاداشت بکەیت لە غەیری خودای گەورە ﷻ، وەك فەرمویەتی:

﴿ وَيَا قَوْمِ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ . هود/٢٩﴾

واتە: (پێیان بڵێ: ئەی هۆزەکەم، بۆ فێرکردن و گەیاندن و ئەو نزایانەی بۆتان دەکەم داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم، پاداشتی من تەنها لای خودایە).

بەڕاستی ماڵ و ئەوەش لەناو دونیادایە، هەمووی خزمەتی لاشەو بەرژەوەندییەکانی دەکات، لای مرۆڤیش ئەوەیە کە نەفسی هەڵگرتووەو دەیگەێنێتە مەرامی خۆی، زانستیش ئەوەیە کە خزمەتی دەکرێت، کە بەهۆی زانستەوە رێزو قەدری ئەو کەسە دەردەکەوێت.

کەواتە ئەو کەسەی بەهۆی عیلمەوە بیەوێت ماڵی دونیای پێ دابین بکات، وەك ئەوە وایە کە بەجوانی ڕوخساری بیەوێت گەردو تۆزو پیسی لە ژێر پێ و نەعلەکانی بسڕێتەوە، ئەوەی خزمەتکراوە دەیگێڕێت بە خزمەتکار و، ئەوەش خزمەتکارە دەیکات بە خزمەتکراو.

ئەگەر سەرنج بدەیت، ئەمە وەك ئەوە وایە بە تەوقی سەردا کەوتبێتە خوارەوە، هەر نموونەی ئەم کەسانەیە کە لە رۆژی حەشری گەورەدا، لەگەڵ تاوانکارەکاندا سەریان شۆڕە لە حزووری پەروەردگاریاندا.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە:**

فەزڵ و منەت و پاداشتی گەورە بۆ فێرکەر و مامۆستا دەبێت.

بەڵام بنوارە چۆن کاروباری ئەم دینە کەوتۆتە دەستی کۆمەڵێکەوە، وای دەگەێنن کە مەبەستیان نزیك بونەوەیە لە خودای گەورە، بەهۆی ئەو زانستی(فیقە) و کەلام و وانەبێژییانەی کە دەیڵێنەوە لەو دوو زانستەدا، یان لە زانستەکانی تر. کە ماڵ و سامانی خۆیان لەگەڵ جاه و مەقامیان سەرف دەکەن، جۆرەها شێوەی زیللەت و ژێر دەستەیی قەبوڵ دەکەن، کە لەبەر دەرگای دەستەڵاتدارەکانیشدا بمێننەوەو خزمەتیان بکەن، بۆ ئەوەی ڕاتبێکی مانگانە بۆ خۆیان دابین بکەن، خۆ ئەگەر نەچونایەتە بەردەرگای ئەو فەرماندارانەوە، ئەوا خەڵکەکەش وازی لێ دەهێنان و کەس نەدەچوو بەلایاندا.

له پاشان مامۆستاكەش وای ڕادەبینێت له فێرخوازەكەی، كه له هەموو ڕوداوێكدا یەكسەر بچێت بەدەمیەوەو، هەستێت لەبەری و یارمەتی بدات و، لەناهەقیشدا بێت، سەری بخات و دژایەتی دوژمنەكانیشی بكات.

تا وای لێ بێت ئەو فێرخوازە بخاتە ڕیزی گوێدرێژێكەوە بۆ ئەنجامدانی كارەكانی، كه هەمیشه چاوشۆڕی بەردەمی بێت و فەرمانبەردایشی بێت، خۆ ئەگەر ڕۆژێك كەمتەرخەمییەكی هەبوو بەرامبەری، بنەڕێنێت بەسەریداو، وەك دوژمنێكی سەرسەختی خۆی بۆی بنوارێت.

بەڕاستی دەبێت زۆر بەسووكی سەیری زانایەكی وا بكەیت، كه خۆی بهاوێته ناو ئەو ڕەزالەت و بێ ڕێزییەوە، كه دڵیشی به خۆی خۆش بێت و، شەرمیش نەكات له حزوری خودا ﷻ و پێغەمبەردا(ﷺ) كه دەڵێت:

مەبەستی من لەم دەرس ووتنەوە؛

بڵاوكردنەوەی زانست و نزیك بوونەوەیە له خودا و سەرخستنی دینەكەیەتی.

دەی بنوارە بۆ نیشانەو بەڵگەكان، تا سەركەشی و شێوەكانی سەرگەردانی ئەو جۆرە كەسانەت لێ ئاشكرا ببێت.

# ئەرکی سێیەمی مورشید:

## *دەبێت هیچ ئامۆژگاریەکی چاك دوانەخات و هەموو بەشەکانی فێربکات.*

دەبێت مامۆستا ڕێگریی لە فێرخوازەکەی بکات کە داوای پلە و پایەیەك بکات پێش ئەوەی کاتی هاتبێتە پێشەوە، یان خۆی بەزانستێکی شاراوەوە خەریك بکات، پێش ئەوەی لە زانستە دیار و ئاشکراکان لێ بووبێتەوە، لە پاشان فێرخوازەکەی ئاگادار بکاتەوە، کە دەبێت لە فێربوونەکەیدا مەبەستی ڕەزامەندی و نزیك بوونەوەبێت لە خوداﷻ، نەك ڕیاسەت و کێبڕکێ و خۆفەرزکردن و فەخرکردن بەو عیلمە، وەدەبێت ئەوپەڕی توانای خۆی ئەو جۆرە نەخۆشیانە بەنەرمی لە دڵیدا دەربکات و لای قێزەوون بکات، چونکە زانایەکی خراپ و نالەبار، ئەوەندەی کە فێرخوازەکە تێکدەدات ودەیشێوێنێت، زۆر زیاترە لەوەی کە چاکی دەکات و ئیصلاحی بکات.

کەواتە ئەگەر ئەوەی زانی کە لە دەروونی فێرخوازەکەیدا تەنها بۆ دونیایە کە دەیەوێت عیلم فێرببێت ، ئەوە سەیری ئەو زانستە بکات کە دەیەوێت فێری ببێت، ئەگەر لەو زانستانە بوو کە ڕای جیاوازیان لەسەرە لە عیلمی (فیقە) دا، یان جەدەلی (زانستی کەلام)، یان ئەو فەتوایانەی کە لەدادوەری و ڕوبەڕوبونەوەو حوکمە شەرعیەکاندا ڕای پێچەوانەیان لەسەرە، ئەوا دەبێت ڕێگری فێربوونیان لێ بکات، چونکە ئەم زانستانە، نە لە عیلمی ئاخیرەت دەژمێـررێن و، نە لەو زانستیانەشن کە لە بارەیانەوە ووتراوە:

**((تَعلَّمنا العِلمَ لِغَيرِ اللهِ فَأَبَى العِلمُ أَن يَكونَ إلاَّ لِله))**

(فێربوونمان لە سەرەتاوە نا ئیخلاصی پێوە دەبینرا، بەڵام زانستەکە ڕای کێشاین بەرەو سلوکی ڕێگای حەقیقەت)[1]

بەڵکو ئەو زانستەی بەهاو پیرۆزی خۆی هەیە، وەك عیلمی تەفسیر و زانستی فەرموودەو، ئەوانەی کە پێشینەکانمان لە زانستی ئاخیرەتدا خەریکی دەبوون، هەروەها شارەزابوون لەو ڕەوشتانەی کە نەفسی لەسەر پەروەردە دەکرێت و پاڵفتە دەکرێتەوە.

ئەگەر فێرخواز فێری ئەم زانستانە بوو، وە مەبەستیشی دونیا بوو، ئەوە قەیناکات وازیشیان لێ بهێنێت، چونکە کە خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەو فێربوونە، یان مەبەستی ئەوەیە ببێتە واعیزێك و قسە بۆ خەڵکی بکات، یان خەڵکی شوێنی بکەون، بەڵام لەوانەیە لە کاتی فەرمان بەچاکە و کۆتایی وەعزو ئامۆژگاریەکانیدا، خۆیشی لە قسەکانی بەهرەمەند ببێت، بە تایبەتی لەو زانستانەی کە ترسان لە خودای تیادایەو ، دونیایان لە بەرچاو سووك دەکات و ئاخیرەتیان لە دڵدا زیاد دەکات، ئیتر لەوانەیە بیگێڕێتەوە بۆ ڕاستە ڕێگای ئاخیرەت و خۆیشی پەندو ئامۆژگاری وەربگریت لەو قسانەی کە ئامۆژگاری خەڵکی پێ دەکات.

ئەوەی کە حەز بکات لە ناو خەڵکدا قسەکانی وەربگیرێت و، پلەو پایەی دەست بکەوێت، وەك ئەو دانەوێڵە وایە کە خاوەنەکەی لە چواردەوری (تەڵە تۆڕێکی) ڕاخراودا ئەو گەنمە دەڕێژیت، بەمەبەستی ئەوەی پەلەورەکانی پێ ڕاوبکەیت، بەهەمان شێوە خودا کاری لەگەڵ عەبدەکانی کردووە، ئارەزواتی تێدا دروست کردوون، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە نەسل و ڕەچەڵەکیان پارێزراو بێت. وە حەزو خۆشەویستی پلەو پایەی تیا دروستکردوون، تا بەهۆیەوە زانستەکان

---

(١) وەك بەدرێژی ڕافەی کراوە لەبەشی پێنجەم. کۆتایی بابەتی ئەرکی یەکەم. لەم بەرگەدا ....

زیندو بمێننەوەو خزمەت بکرێن، ئەم کارو فەرمانەش هەمیشە لە ئارادایە بە نیسبەت ئەو زانستانەی کە باس کران.

بەڵام گرنگی دان تەنها بە پرسە جیاوازەکان و، وردەکاری لە مەسئەلە خیلافیەکان و لق و پۆکانیدا و، بایەخدان بە موجادەلە و قسەکردن و ڕوبەڕوبونەوەو پرسە ناوازەکان، چەندێك زیاتر خۆتیان بۆ تەرخان بکەیت و واز لە زانستە دوارۆژییەکان بهێنیت، ئەوەندە زیاتر تووشی قەسوەتی ڕەشبوونەوەی دڵ دەبێت و لە خودای گەورە غافڵ و بێ ئاگا دەبیت، وە زیاتر ڕۆدەچیت لە گومڕاهی و هەوڵدان بۆ پلەو پایەو دەستەڵات، ئیتر مەگەر خودای گەورەو میهرەبان بەڕەحمەتی خۆی فریایان بکەوێت، یان هەندێك زانستی تری لەگەڵدا تێکەڵ بکات، بەلای زانستی ئاخیرەت دا بیبات.

هیچ بەڵگەیەکیش لەسەر ئەمە نی‌یە لەو بەڵگە باشتر کە خۆی تاقی کردبێتەوە، یان لە زانا هاوچەرخەکانی بینویەتی، کەواتە تۆیش ئەی براکەم بنوارە و ئامۆژگاری وەربگرە، بە چاوی دڵ سەیر بکە؛ بۆ ئەوەی بە چاوی خۆت ئەم کارەت لە ناو خەڵك و لەوڵاتەکاندا بۆ دەربکەوێت، وە پشت و پەنایشمان هەر لە خوداوەیە.

حەزرەتی سوفیانی سەوریان بینی خەفەتبار بوو، ووتیان بۆچی غەمباری؟

فەرمووی: بوینەتە جێگای بازرگانیی بۆ دونیاویستەکان، یەکێکیان دێت بۆ لامان و لێمان نابێتەوە تا زانست فێر دەبێت، ئەو کاتە ( خۆی تێکەڵ بە دونیادەکات و دەکرێت بە(عامیل) و کۆکەرەوەی خەراج، یان بە قازی، یان بە پاڵەوانێك کاروباری دەوڵەتی پێ بگرێتەوە دەست.[1]

---

(١) قـوت القلـوب(١٣٣/١)قەهرەمـان واتە: سـەرکەوتو بێـت لە کارەکانیـداو ژێـر دەسـتەکانی بپارێزێت.

## ئەركی چوارەمی مورشید:دەبێ تورەبوونی بۆ پێگەیاندن بێت

یەكێكی تر لە وردەكاریەكانی هونەری فێركردن، كە دەبێت تا چەند بۆی دەكرێت سەرزەنشتی فێرخواز بكات و ڕاستەوخۆ بیشكێنێت بەڵام لە ڕێگەی سۆزو بەزەیی‌یەوە، نەك لە ڕێگەی ڕەخنەو سەرزەنشتەوە، چونكە ئەگەر بە ڕەقی و بەڕاشكاوی بێت، پەردەی سام و هەیبەتی نێوانیان دەدڕێنێت و، لەوانەیە بەرامبەرەكەی بكەوێتە حاڵەتی هێرش و سووربوون لەسەر هەڵەو، گیانی دەماری تێدا بوروژێنێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) كە ڕێنمایی دەری هەموو مامۆستاو پەروەردەكارێكە فەرموویەتی: ((لَوْ مُنعَ النَّاسُ عَن فَتِّ البَعْرِ لفَتُّوهُ وَقالُوا ما نُهينا عَنهُ إلا وفيهِ شَيء))[1]واتە:( ئەگەر قەدەغە بكرایە لەو خەڵكە پیسایی وشتر ورد و خاش نەكەن و پارچە پارچەی نەكەن، ئەوا دایانكردو دایانووت: شتێكی تێدایە بۆیە لێمان قەدەغەكراوە ) چیرۆكی نادەم و حەووا، لەسەر ئەم خاڵەیە بێدارت دەكاتەوە،كە ڕیگریان لێ كرا لە بەری ئەو دوو درەختە بخۆن و( بە گوێی شەیتانیان كرد)گێڕانەوەی ئەم چیرۆكە بۆ گاڵتە و چیرۆك خوانی نییە، بەڵكو بۆ پەندو ئامۆژگاری وەرگرتنە كە بێدارت بكاتەوە. هەروەها ئەگەر قسەیەك بە كینایەوبەهێمــا بــۆی بڕۆیت،خــاوەن نەفسە گەورەكان وبیرو مێشك تیژەكان واتای تری لێ وەردەگرن، وەهەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەواتاو نهێنیەكان حەزو ئارەزوویەكی تایبەتیت تیا دروست دەكات كە فێریان ببێت بۆ ئەوەی بزانێت و دڵنیابێت كە ئەم واتایانە لە نێو دائیرەی بیركردنەوەیدا دەرناچێت و بەزیرەكی خۆی دەیاندۆزێتەوە.

---

(١) [قال الحافظ الزبيدي في (الإتحاف) ١/٤٣١: قال العراقي:( لم أجد إلا من حديث الحسن مرسلا وهو ضعيف. رواه ابن شاهين)اه قلت: ووجدت بخط الداوودي مانصه: ولفظ إبن شاهين: **لَو مُنِعَ النَّاسُ فَتَّ الشَّوكِ لَقالُوا: فيهِ النَدُّ))** وفى المعنى حديث أبى جحيفة(( **لو نُهيتُم أن تأتوا الحجون لأتَيتُموها**)).قلت: رواه الطبراني في الكبير١٨/٨٦(١٥٩)عن أبي جحفة نحوه. قال العراقي ورجاله ثقات. إلا أنه إختلف فيه على الأعمش، قيل: عنه عن أبي إسحاق، وعن عبدة السوائي، وعبدة السوائي مختلف في صحبته.]

## ئەرکی پێنجەمی مامۆستای مورشید و فێرکار نابێت زانستەکانی تری لە بەرچاو بخات

ئەوەی هەڵگری زانستێکە و پێیەوە خەریکە، نابێت وای بخاتە نێو دڵی فێرخوازەوە کە زانستەکانی تر بێ سوودو بێ کەڵکن.

ئەوەی زانستی زمان دەزانێت، بەچاوێکی سووکەوە سەیری(عیلمی فیقە) دەکات و وای خووپێوەگرتووە، وە فێرکەری (فیقە) یش بەوشێوە سووکی‌یە سەیری زانستی تەفسیر و حەدیس بکات و بڵێت:

کاری ئەمانە هەمووی نەقڵ و گواستنەوەی قسەکانەو( شافیعی ووتی، یان مالیك و ئەبوحەنیفە ووتیان، ئیتر ئیبداعی تێدانییە) گوێ گرتنیش لەقسەی ئەمانە کاری پیرو پەککەوتەکانەو، ناتوانن بە بیرو ئەقڵێکی نوێوە سەرەنجی بدەن و واتا و مەبەستی تری لێ وەربگرن، هەروەها زانایانی عیلمی کەلامیش بەوچاوەوە سەیری ئەوانە دەکەن کە خۆیان بە فیقهەوە خەریك دەکەن و دەڵێن: عیلمی فیقە بەشێکە لە زانستی کەلام و، قسەیەك دەربارەی نەخۆشی و عادەی ژنان بێت، چۆن دەبێت بەراورد بکرێت لەگەڵ عیلمی کەلامدا، کە باسی صیفەتەکانی خودا دەکات.

بەڕاستی ئەمە جۆرە صیفەتێکی نالەباری ئەو کەسانەیە کە مامۆستان، پێویستە وانەبێژو فێرکار خۆیان لەم صیفەتانە بپارێزن، بەڵکو ئەوەی زانایە ئەرکی ئەوەیە:

زانستێك فێری قوتابیەکانی بکات، دەبێت ڕێگای فێربونی زانستەکانی تری بۆ خۆش بکات و بەرچاوی ڕونبکاتەوە، وە ئەگەر مامۆستاکە لە چەندین وانەدا دەرسی دەوتەوە، ئەوا دەبێت بە پێی پلەکاری و یەك لە دوای یەك ئاستی فێرخواز بەرزتر بکاتەوە، تا پلەبەپلە بەرەو سەرکەوتنی زیاتری ببات.

# ئەركی شەشەم

## دەبێت ئەوەندەی فێر بكات
## كە بتوانێت وەری بگرێت و هەڵی بگرێت

نابێت بابەتێكی بۆ باس بكات لە ئاستی تێگەیشتنی ئەودا نەبێت و لێی بێزار ببێت، یان بیر و هزری ئاڵۆز بكات، دەبێت چاو لە گەورەی ئادەمیزاد بكات (صەڵات و سەلامی خودای لەسەر) كە فەرمویەتی: **نَحنُ مَعاشِرَ الأَنبياءِ أُمِرنا أَن نُنْزِلَ النَّاسَ مَنازِلَهُم، وَنُكَلِّمَهُم عَلى قَدَرِ عُقولِهِم)**[1] .

واتە: (ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێ كراوە، بە پێی پلەو پایەی ئەو خەڵكە هەڵس و كەوتیان لە گەڵدا بكەین، وە لە ئاستی ئەقڵ و تێگەیشتنیاندا قسەیان بۆ بكەین) با حەقیقەتیشی بۆ ئاشكرا بكات و پێی ڕابگەێنێت بەمەرجێك بزانێت لەو ئاستەدایە كە بە تەواوی لێی تێ دەگات.

---

(١) رويناه في جزء من حديث أبي بكر بن الشخير. من حديث عمر أخصر منه. وعند أبي داود (٤٨٤٢) من حديث عائشة: أنزلوا الناس منازلهم، [قال الزبيدي ٣٤٢/١: فهما حديثان مستقلان أوردهما المصنف في سياق واحد. وربما يوهم أنهما حديثٌ واحد. أما حديث عائشة في الحلية لأبي نعيم٣٧٩/٤. قال الحافظ السخاوي في المقاصد: ص/١٦٣(١٧٩) هذا حديث حسنٌ. أورده مسلم في مقدمة صحيحه، ٦/١، بلا إسناد. وقال السخاوى في المقاصد قد جزم الحاكم بتصحيحه في معرفة علوم الحديث ص/٤٨، فقال: صحة الرواية عن عائشة... وساقها بلا إسناد، وروى أبو يعلي في مسنده،٢٤٦/٨ (٤٨٢٦). ورواه البيهقي في الأدب٣١١/١. عن طريق أبي هريرة] . وروى العقيلي في الضعفاء(١٥٣٤/٤): **إنا مَعشر الأنبياء كذلكَ أُمرنا أن نُكَلِّمَ الناسَ على قَدرعقولهم**، ومعناهُ سبق في حديث البخاري (١٢٧) الموقوف على (علي ابن أبي طالب) (رضي الله عنه) **(حدِّثوا الناسَ بِما يَعرِفون)**.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

**((ما أحَدٌ يُحدِّثُ قوماً بِحَديثٍ لاتَبلُغهُ عُقولُهُم، إلاَّ كانت فِتنةً على بَعضِهِم))** [1]

ئەوەی قسە بۆ کۆمەڵێ بکات و لێی تێ نەگەن، یان لە ئاستی ئەقڵی ئەواندا نەبێت، ئەوە فیتنەو ئاڵۆزییەك دەخاتە میانی هەندێکیانەوە.)

حەزرەتی عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) هێمای بۆ سینەی خۆی کردو فەرموی:

**( إنَّ هٰهُنا عُلوماً جَمَّة، لَو وُجِدَت لَها حَملة)**[2] واتە:

(لە ناو دڵ و سینەم دا زانستێکی زۆری تێدا کۆبۆتەوە، خۆزگە کەسانێ ببونایە فێری ببن و هەڵیان بگرن و لێی تێ بگەن و کاری پێ بکەن).

(خودا لێی ڕازی بێت) ڕاستی فەرمووە، دڵی پیاو چاکان و خوداناسان دەبێتە گۆڕی ئەسرارو نهێنییەکان، [3] وەنابێت زانایەك هەرچی دەیزانێت هەمو کەسێکی لێ فێر بکات، ئەمە لە حاڵەتێکدایە کە فێرخوازەکە لێی تێ بگات بەڵام شیاو و ئەهل نەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو عیلمە، ئەی ئەگەر هەر لێیشی تێ نەدەگەیشت ئیتر چۆن دروستە نهێنیەکانی بۆ باس بکات؟! حەزرەتی عیسا(سەلامی خودای لەسەر) فەرمویەتی: گەوهەری خۆتان هەڵمەواسن بە ملی

---

(١) رواه العقيلي في الضعفاء(٩٣٧/٣) عن عبدالله بن عباس (رضي الله عنهما)،ورواه مسلم في مقدمةصحيحه١١/١،موقوفاعلى عبدالله ابن مسعود،الإتحاف٣٤٣/١،لتفصيل بحث تخريجه.

(٢) رواه الخطيب في تأريخ بغداد، ٣٧٦/٦، ضمن حديث كُميل المشهور. والذي سبق ذكره. وانظر قوت القلوب ١٣٤/١.

(٣) لەبەر ئەوەی کەسانێك نەبووە کە لێیان وەربگرن، ئەو سیڕ و نهێنیانە لەناو دڵیاندا ماونەتەوەو دڵیان بووەتەگۆڕستانی نهێنیەکانی خوا کە لە فەیز و مەرحەمەتی خۆی ڕژاندویەتی بە سەریاندا.

بەرازەوە، چونکە وشەیەکی حیکمەت و پەندیاری باشترە لە گەوهەر، هەرکەسێکیش حەزی لەو حیکمەتە نەبێت ئەوە خراپترە لە بەراز.[1]

بۆیە ووتراوە: بەپێی ئەندازەی ئەقڵی هەرکەسێك بۆی بپێوە، وە بە پێی میزانی تێگەیشتنی ئەو کەسە بۆی بکێشە، تاوەکو قسەکانت سوود بەخش بن بۆی و لەدەستیشی سەلامەت بیت، چونکە (ئەگەر بە پێی کێشانە و پێوانەی ئەقڵ و تێگەیشتنی ئەو کەسە قسەت نەکردبێت) ئەوا ئینکاری ڕوی تێ دەکات، پێوەر و پێوانەکانیش جیاوازن.[2]

پرسیار لە هەندێك زانایان کرا لە بارەی شتێکەوە؛ وەڵامی نەدایەوە، پرسیارکەرەکە ووتی: ئایە نەتبیستبووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَن كتَم عِلماً نافِعاً جاءَ يَومَ القِيامَةِ مُلَجَّماً بِلجامٍ مِنْ نارٍ))**[3]

ئەوەی زانستێکی بەکەڵك بشارێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و، لغاوی ئاگرین (لە دەمیدا دەبێت)، فەرمووی: واز لەو بابەتی لغاوە بهێنەو برۆ بەڕێی خۆتەوە، ئەگەر کەسێك هات کە زانستەکەی من سوودی پێ بگەیێنێت و منیش لێم شاردەوە، ئەوا با خودا لغاوی ئاگرینم بکات.

مەرامی خودای گەورە ﷻ کە فەرموویەتی: ﴿ **وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ** النساء/٥﴾ ئاگادارکردنەوەیە لە سەر ئەوەی کە دەبێت زانستی بپارێزرێت لە کەسێك کە تێکی بدات و زایەی بکات و زیانی پێ بگەیێنێت، ئەوە فێری نەکەیت

---

(١) قوتُ القلوب، وانظر تأريخ دمشق(٦٨/٦٣) ضمن حديث طويل.

(٢) ئەم فەرموودەیە هی خاوەنی(قوت القلوب)(١/١٥٦) وە ئەصڵەکەیشی فەرموودەی بەحیای کوڕی مەعازە کە تۆماری کردوە:( **إغرف لكلِّ واحدٍ مِن نَهرِهِ، واسقِهِ بكأسِهِ**) هەرکەسێك لەڕوباری خۆی لوتێ یان دۆڵچەیەك ئاوی بۆ دەربهێنەو بە جامی خۆی ئاوی بدەری و تێراوی بکە.

(٣) رواه ابن ماجه(٢٦٥). وتقدم حديث أبي هريرة بنحوه.

باشتره، وه ئەو زوڵم و تاوانەی کە لەسەرت حیساب دەکرێت بەوەی زانستت لە کەسی شیاوی خۆی شاردۆتەوە، کەمتر نییە لەوەی کە زانست بە نا ئەهل بدەیت، وەك ووتراوە:

أأنثُـرُ دُرّي بينَ ســارِحَةِ النَّعمِ    وأُصبِحُ مَحزوناً براعِيَةِ الغَنَمْ

لأنَّهــم أمســوا بجهْــلٍ لقَدرهِ    فَلا أنا أُضحي أَنْ أطَوّقَهُ البَهَمْ

فَإن لطَفَ اللهُ اللَّطيفُ بِلُطفِهِ    وَصادَفتُ أَهلاً للعُلومِ ولِلحِكَمْ

نشَرتُ مُفيداً واستَفدْتُ مَوَدَّةً    وإلا فَمَخــزُونٌ لــدَيَّ ومُكتَـتَمْ

فمَن مَنحَ الجُهَّالَ عِلماً أَضاعَهُ    ومَن مَنعَ المُستَوجِبينَ فقَد ظَلَمْ[1]

لەواتای ئەم فەرمودەی ئیمامی شافیعی یەدا دەڵێم:[2]

**دەشێ گـەوهەر بپرژێنم؟ لە نێـو ئـاژەڵ وەك و کـــاڵات**

**سبەی غەمبار و مەحزون بم، لەگەڵ شوانی مەڕو ماڵات**

**لە جەهلابـوون شــەوی پێشوو، نەیانزانیوە قەدری دوڕ**

**ئەمن نایکەم بە قـوربـــانی، عـیلم پەرژینی حەیـــوانات**

**بە لوطفـی خۆی خودا لوطـفێ بکا، ئەهلێ ببینـــم من**

**شیاوی عیـلم و پەندیاری، وەشایســتە لە بـۆ حـــاڵات**

**ئەوەی کەڵکی هەبێ دەیڵێم، لەگەڵ کەسبی مەحببەتیان**

**ئەگەرنا با نــهێنی بێ لەلام، تـــا ژین بەکۆتا هــــــات**

**ئەگەر عیـلمی بە جاهیل دا، ئەوا زانســـت دەفەوتێنێ**

**لە ئەهلی خــۆیی بگرێتۆ، زوڵـم کـاڵایـــە بـۆ بـــاڵات**

---

(١) مـن البحـر الطويـل للأمـام الشـافعي: حليـة الأوليـاء (١٥٣/٩) و معجـم الأدبـاء للحمـوي (٢٠٨/٥) و الآداب الشرعية لإبن مفلح( ٢٣٢٠/١).

(٢) بە داوای لێ بووردن لە حەزرەتی شافیعی بەو شێوەیە کردومە بە کوردی: (ئەحسەن)موفتی.

# ئەرکی حەوتەمی مورشید

## دەبێ لە ئاستی فێرخوازدا زانستی بۆ باس بکات

ئەوەی فێرخوازێکی سەرەتایی بێت، دەبێت لە لایەنی مامۆستاکەیەوە زانستەکە بەڕون و ئاشکرایی بۆی باس بکرێت، کە لە ئاستی ئەودا بێت، باسی ئەوەی بۆ نەکات کە وردەکاری زۆری ترماوە و بۆی هەڵگرتووە، چونکە ئەم جۆرە تەمادارکردنە حەزو مەیلی لەسەر واتائاشکراکان پەرت و بڵاوتر دەکات، دڵی دەتەوسێنێتەوە و واگومان دەبات کە مامۆستاکەی بەخالەتی لەگەڵدا بەکار دەهێنێت و هەموو شتێکی فێرناکات، چونکە هەموو کەس واگومان دەبات کە خۆی شایستەیە بۆ فێربوونی وردەکاریەکان، هەموو کەسێك ڕازییە لە خودا لەوەی کە تەواوی عەقڵ و هەستیاری پێداوە، تەنانەت ئەوەیش کە لە هەموویان نەفام و گەلحۆترە، لە هەموویان دڵخۆشترە بە کەماڵی ئەقڵ و بیرمەندیی کە هەیەتی.

بەمەدا دەزانرێت:

هەرکەسێك لەڕەشە خەڵکەکەبێت، ئەگەر بە پێی حاڵی خۆی پابەند بێت بە فەرمانە شەرعیەکانەوە، وە بیروباوەڕی دروست لە مێشکیدا جێگر بووبێت، باوەڕی دامەزراوبێت بەوەی لە سەلەفی صاڵحینەوە پێیگەیشتووە، بە بێ قەیدی تەشبیهو تەئویل[1] وە خوو ڕەوشتیشی جوان بێت، وە عەقیڵیشی

---

(١) واتە: ئەوە نەکەوێتە دڵیەوە کە خودا بشوبهێنێت بەیەکێك، یان بە شتێکەوە کە شایستەی نەبێت، وەك موشەببیهەکان بڕوایان وایە، یان تەئویل نەکات بۆ ئەحکامە زاهیریەکان، بەڵکو چۆن دەقەکان هاتوون باوەڕی لەسەریان دامەزراو بێت، پێویستی بە زیادەو بەڵگەی تر نەبێت.

لەوەندە زیاتر ڕونکردنەوەی هەڵنەدەگرت، ئەوکەسە نابێت عەقیدەکەی لێ بشێوێنرێت و( باسی زیادەی بۆ بکرێت) بەڵکو دەبێت وازی لێ بهێنرێت، خۆی و ڕێگەو ڕچەو ڕێبازی خۆی، چونکە ئەگەر باسی تەئویلاتی بۆ بکەیت لە سەر زاهیری دەقەکان، صیفەتی عەوامیی لەسەر هەڵدەگیرێت و ناشگونجێت صیفەتی زاناو تایبەتمەندیی بدرێتە پاڵ، ئەوکاتە ئەو دیوارە نامێنێت لە میانی ئەوو گوناه کردندا، بەڵکو دەبێتە مرۆڤێکی تر، وەك شەیتانێکی لەڕێ لادەر (بەڕاڕایی دەژی لە میانی عەوامەکان و ئەهلی خەواص دا) ئەو کاتە سڵ لە گوناه ناکاتەوە، بەسەرپێچیەکانی خۆی دەفەوتێنێت و، خەڵکیش چاوی لێ دەکەن و بەهیلاکدا دەچن.

بەڵکو نابێت مامۆستا، حەقیقەت و ڕاستی و وردەکارییەکان فێری ڕەشە خەڵکەکە بکات، بەڵکو تەنها فێری عیبادەتەکانیان بکات، فێریان بکات ئەمانەتی ئەو زانستیەی کە لەسەرینی بیپارێزن و هەڵیبگرن، دڵیان پڕبکات لە خۆف و ترسان لە دۆزەخ و، حەزو ئارەزو بەبەهەشت، وەك قورئان ڕایگەیاندووە، هیچ گومانێکیان بۆ نەوروژێنێت و بۆ باس نەکات، زۆر جار گومانێك پەیوەست دەبێت بە دڵەوە و، زۆر بە نارەحەتیش ناتوانێت بیرەوێنێتەوە، ئەو کاتە بەدبەخت دەبێت و بەهیلاکدا دەچێت.

بەکورتی نابێت مامۆستا دەرگای هەموو باس و بابەتێك لە سەر عەوام بکاتەوە، ئەینا حاڵ و پیشەی خۆیانیان لێ تێك دەدات کەلەسەری ڕاهاتوون، وە کاری خەڵکیش پەکی دەکەوێت، وە ژیانی خەواص و تایبەتمەندەکانیش بەردەوامی نابێت.

# ئەركی هەشتەمی مورشید

## دەبێ مامۆستای فێركەركار بە زانستەكەی بكات

نابێت قسەكانی كردەوەكانی بەدرۆ بخەنەوە، چونكە زانست بە بەصیرەت و چاوی دڵ دەزانرێت، كرداریش بەچاوی سەر دەبینرێت، ئەوانەی تەنها بە چاوی سەر شت دەبینن زۆرترن، ئەگەر كارەكان پێچەوانەی زانستەكان بوون، ئەوە ڕێگای ڕوشدو ڕێنماییان لێ دادەخات، چون هەركەسێك بۆ خۆی شتێك بخوات و بەخەڵكیش بڵێت مەیخۆن؛ ئەوە ژەهرێكی كوشندەیە، دەبێتە گاڵتەجاڕی خەڵكی و ڕوبەڕوی تۆمەتیش دەبێتەوە، وە زیاتر سووردەبن لەسەر كردنی ئەو كارەی كە لێیان قەدەغەدەكات، وە دەڵێن: ئەگەر ئەو شتە لە هەموو شتێك پاكترو بەتاموچێژتر نەبوایە، بەو شێوەیە خۆی هۆگری نەدەبوو! نمونەی مامۆستای فێركەرو وانەبێژ لەگەڵ فێرخوازی ڕێنومایبخواز، وەكو ئەو نەقشە وایە كە لەسەر قوڕ دەكرێت، كە دیواری پێ دروست دەكرێت، هەروەك نمونەی دار عوودە لەگەڵ سێبەردا، كەواتە چۆن دەكرێت قوڕدەنەخشێنێت بەوەی كە خۆی نەخشی تیانەبێت؟! وە كەی بینراوە سێبەر ڕێك بێت و دار عوودی درەختەكەش لار بێت؟! بۆیە لەم نمونەیەدا ووتراوە:[1]

**لا تَنه عَن خُلُق وتَأتي مِثلَه عَارٌ عَليكَ إذا فَعلتَ عظيمُ**

واتە: **ڕێگر مەبە لەو (كـــارە) كە كردووتە بە پیــشە**

**شەرمە و بەگران دەشكێتەوە سەر تۆ بە هەمیشە** [2]

وە خودای گەورەو میهرەبانیش فەرموویەتی:

---

(١) دیوانی ئەبو ئەسوەدی دوئەلی (ل ٤٠٤) وە بنواڕە (خزانة الأدب) (٥٦٤/٨).

(٢) (ئەحسەن) موفتی وەرگێڕ.

﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ البقرة ٤٤﴾. واتە: ( ئايا فەرمان دەدەن بە سەر خەڵكیدا بەچاكەكردن و خۆتانتان بیربچوبێتەوە) هەر لەبەر ئەمەیە كە گوناه و تاوانی زانایەك گەورەترە لە گوناهی نەزانێك، چونكە بە هۆی هەڵەی زاناكەوە خەڵكێكی زۆر بە لارێدا دەچن و سەرگەردان دەبن، چاو لە زاناكە دەكەن (**ومن سَنَّ سُنَّةً سَيِّئةً فَعَليهِ وِزرُها وَ وِزْرُ مَن عَمِلَ بِها**)[1]

واتە: (ئەوەی داب و ڕەوشتێكی خراپ لە ناو ئیسلامدا دابمەزرێنێت و بیكاتە سوننەت، ئەوە گوناهی خۆی و گوناهی هەموو ئەو كەسانەش هەڵدەگرێتەوە كە كاریان پێكردووە. هەر لەبەر ئەمەیشە كە حەزرەتی عەلی(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی[2]: **دووكەس پشتی منیان شكاندووە:**

**زانایەكی خراپەكار** كە ترسی نەبێت ڕوی هەڵبماڵرێت و فەزح ببێت و نهێنیەكانی دەربكەوێت.

**وە نەزانێك** لە ژێر پەردەی عیبادەتدا خۆی حەشاردابێت، وای دەربخات كە عیبادت دەكات.

ئەم نەزانەیان خەڵكی پێ دەسخەڕۆ دەبێت بەهۆی عیبادەتەكەیەوە، زاناكەش خەڵكی پێ دووردەكەوێتەوە لە عیبادەت، بەهۆی بێ شەرمی و نەترسی ئەو لە ئاشكرابوون.... خودای گەورەش زاناترە.

---

(١) رواه مسلم (١٠١٧وأوله: **من سَنَّ في الإسلامِ سُنَّةً حسَنةً فلَهُ أجرُها وأجرُ مَن عَمِلَ بِها مِن بَعدِهِ، مِن غَيرِ أن يَنقُصَ مِن أُجورِهِم شَيئ، ومَن سنَّ سُنَّةً سيِّئةً فَعَليهِ وِزرُها وَ وِزْرُ مَن عَمِلَ بِهامِن غيرِ أن يَنقُصَ مِن أوزارهم شيئ.** أخرجه الإمام أحمد و مسلم و الترمذي و النسائي و ابن ماجه من طرق، و الدرامي و أبو عوانة و ابن حبان كلهم عن جرير.

(٢) قوت القلوب (١/١٤٠). بنحوه

# بەشی شەشەم

## باسی ئافەتەکانی زانست و زانایان

وە

ڕونکردنەوەی

## *زانایانی ئاخیرەت*

*و*

## *زانا خراپەکان*

# باسی ئافەتەکانی زانست

## وە بەیانی نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت و زانا خراپەکان

باسی هەموو ئەو دەق و فەرموودانەمان کرد لە سەر گەورەیی زانست و زانایان هاتبوون، لەبارەی زانایانی خراپ و ناپەسندەوە توندی و هەڕەشەی گەورەو گرانیان لەسەر هاتووە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەمانە لە هەموو کەس سزایان لە ڕۆژی قیامەتدا توندترە ، لەو بابەتە گرنگانەی کە پێویستە بیانزانین، ئەو نیشانە جیاکەرەوانەیە لە میانی زانایانی ئاخیرەتدا، مەبەستمان لە زانایانی دونیا زانا خراپ و ناپەسندەکانە، کە مەبەستیشیان لە زانستەکەیان ئەوەیە بیانگەیێنێت بە نازونیعمەتی دونیا و شکۆو دەستەڵات و پلە بەرزەکان.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((إنَّ أشَدَّ الناسِ عَذاباً يومَ القيامَةِ عالِمٌ لَمْ يَنفعْه اللهُ بعِلمِه))**(١)

واتە: (ئەوەی دوچاری سەختترین سزای ڕۆژی قیامەت دەبێتەوە، زانایەکە کە خودای گەورە بە زانستەکەی خۆی سوودی پێ نەگەیاندبێت).

وەدەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

---

(١) رواه الطبراني في ((الصغير)) (١٨٢/١) و القضاعي في(( مسند الشهاب))(١١٢٢) و البيهقي في ((الشعب))(١٦٤٢).[قال الزبيدي٣٤٨/١: قد تقدم في خطبة الكتاب الكلام على تخريج هذا الحديث، وإنه رواه أبو هريرة رضي الله عنه، وما يتعلق به من المعنى]

**((لا يَكونُ المَرءُ عالماً حَتَّى يكُونَ بعلمِهِ عاملاً))**[1]

واته: صیفەتی زانایی نادرێت بە کەسێك ئەگەر کار بە زانستەکەی نەکات.

وە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ):

**(( العِلمُ عِلمانِ: علمٌ علَى اللِّسان فذلك حُجَّة اللهِ تَعالى عَلى ابنِ آدَم، وَعِلمٌ فِي القَلب فَذلِك العِلمُ النَّافِع))**[2] واته:

( عیلم دەکرێت بەدوو بەشەوە: زانستێکی دەرکەوتوو لەسەر زوبان، کەدەبێتە بەڵگەی خودای بەدەستەڵات لەسەر هەموو ئادەمیزاد، وەزانستێکی تریش ئەوەیە کەلەدڵدایە، بەڕاستی ئەوە ئەو زاستەیە کە سوود بەخشە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: [3]

---

(١) وأخرجه ابن حبان في كتاب (روضة العقلاء)ص/٣٥. والبيهقي في المدخل ص/٣١٥، (٤٨٨)موقوفا على أبي الدرداء.[ قال الحافظ الزبيدي قال العراقي في التخريج الكبير: لم أجده مرفوعا، وفيه إنقطاعٌ، قلت:وأخرج الخطيب في((إقتضاء العلم و العمل))٢٦/ (١٧) موقوفا على أبي الدرداء رضي الله عنه و بلفظ: [**لاتكون عالما حتى تكون متعلما. ولا تكون بالعلم عالما حتى تكون به عاملا**] أما ما عزاه العراقي لابن حبان والبيهقي فقد أخرجه الخطيب في الكتاب المذكور ص١٦/٢٦، من رواية وكيع، عن جعفر بن برقان عن فرات بن سلمان، عن أبي الدرداء]

(٢) رواه الخطيب في(تأريخ بغداد)(١٠٧/٥-١٠٨) بإسناد جيد. وابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله(١١٥١)وأخرجه الحكيم الترمذي في النوادر٣٠٣/٢، وابن عبدالبر في العلم ١٩٠/١، من حديث الحسن مرسلا بإسناد صحيح، وأعله ابن الجوزي في العلل، ٨٢/١(٨٨). [قال الزبيدي ٣٤٩/١: أورده صاحب القوت٢١٠/١، في خلال كلامه فقال اهـ: وانظر الإتحاف(٣٤٩/١).

(٣) رواه الآجري في أخلاق العلماء(٦٨) و أجرجه الحاكم في (المستدرك) (٣٥١/٤) (٧٨٨٣) من حديث أنس وهو ضعيف، [قال الزبيدي(٣٤٩/١): هكذا أخرجه أبو نعيم في الحلية (٣٣١/٢) من رواية يوسف بن عطية عن ثابت عن أنس رفعه ثم قال: هذا حديث غريب من حديث ثابت لم نكتبه إلا من حديث يوسف بن عطية عن ثابت، وهو قاض بصري في

((**يكونُ فِي آخِرِ الزَّمان عُبَّادٌ جُهَّال وعُلمَاءٌ فُسَّاق**)) واته:

له ئاخیر زەماندا چەندین عابیدی نەزان و تێنەگەیشتوو پەیدا دەبن (زۆر خەریکی بەندایەتین) بەڵام نەزان و جاهیلن) وە چەندین زانای فاسق و لەڕێ دەرچوویش پەیدا دەبن.

وەفەرموویەتی: (ﷺ):

((**لا تَتعلَّمُوا العِلمَ لتُباهُوا به العُلماءَ، ولتُماروا بهِ السُّفهاءَ، ولتَصرِفُوا بهِ وُجوهَ الناسِ إليكُم، فمَن فَعل ذلكَ فَهُو فِي النّار**))[1]

واته:

(فێری زانست مەبن بەمەبەستی خۆ دەرخستن و شان بەرزکردنەوە و شانازی کردن بەسەر زاناکاندا، یان بۆ ئەوەی دەمەدەمێی پێ بکەن لەگەڵ نەفام و نەزانەکاندا و گومان بخەنە ناو دڵیانەوە، یان بەهۆیەوە ڕوی خەڵکی بۆ لای خۆتان ڕابکێشن، هەرکەسێك ئەم کارە بکات ئەوە لە ناو ئاگردایە.

وە فەرموویەتی: (ﷺ):

---

حديثه نكارة أهـ. ورواه البيهقي في الشعب(٣٦١/٥) (٦٩٥٤) من هذا الوجه، وقال: يوسف كثير المناكير. ومن شواهده ماأخرجه الحكيم الترمذي في نوادره(٣٢٧/٢) من رواية إبان عن أنس رفعه، **يكون في آخر الزمان ديدان القراء، فمن أدرك ذلك الزمان فليتعوذ بالله من الشيطان الرجيم، وهم الأنتون** و أخرجه أبو نعيم في الحلية(٣٥/٣) من طريق سليمان التيمي عن أبى عثمان النهدى عن أسامة رفعه إلا أنه قال: **ذئبان القراء**)) و قال غريب من حديث سليمان].

(١) أخرجه ابن ماجة في المقدمة: باب(٢٥٩) من حديث جابر بأسناد صحيح.[ قال الزبيدي(٣٤٩/١-٣٥٠) قال العراقي: فيه بشير بن ميمون الخراساني متّهم بالوضع. قاله البخاري في التأريخ الأوسط(٢٥٥/٢) و أشعث بن سوار مختلف فيه ولكن أخرجه ابن ماجه أيضا في المقدمة، قال العراقي: و إسناده على شرط المسلم، قلت: وأخرجه كذلك الحاكم(١٦١/١)(٢٩٠) وابن حبان (٢٧٨/١)(٧٧).

((مَن كتَمَ علْماً عِندَه ألجَمَهُ اللهُ بِلِجامٍ مِنْ نارٍ))[1]

واته:

(ئەوەی خودا زانستێکی پێ دابێت و بیشارێتەوە لەئەهلی خۆی، ئەوا خودای گەورە لغاوی ئاگرین دەخاتە ناو دەمییەوە.

وە فەرموویەتی:

((لأنَا مِن غَير الدَّجّالِ أخْوَفُ عَليكُم مِنَ الدَّجّال فَقيلَ وما ذلِك؟ فقالَ مِنَ الأئِمَّةِ المُضلّين)) [2].

---

(١) رواه ابن ماجة (٢٥٩)(٢٦٥). قال الزبيدي تقدم هذا الحديث قريبا، وفي الباب الأول من هذا الكتاب ، دون قوله ((عنده))، قال العراقي و هذه اللفظة في بعض حديث أبى هريرة رواها ابن الجوزي في العلل المتاهية(١٠٦/١) و أعلّها بإسماعيل بن عمر و ذكر قول الدارقطني فيه أنه ضعيف، إلا أن ابن حبان ذكره في الثقات (١٥/٤)(١٦٣٨).

(٢) خرجه أحمد في مسنده(١٤٥/٥)[٢٠٧٨٩-٢٠٧٩٠] من حديث أبي ذر بإسناد جيد [قال الزبيدي (٣٥٠/١) قال العراقي: في إسناده عبدالله بن لهيعة مختلف فيه. ورواه أبو يعلي في مسنده(٣٥٩/١)(٤٦٦) عن علي بن أبى طالب رفعه نحوه، و فيه جابر هو أبويزيد الجعفي ضعّفه الجمهور. وروى أحمد فى مسنده(٢٩٥) من طريق أبى المخارق زهير بن سالم عن عمير بن سعد الأنصاري أن عمر قالب لكعب: **أخوف شيئ على أمة محمدﷺ؟ قال: أئمة مضلون، قال عمر: صدقت، قد أسرَّ إلي ذلك وأعلَمَنيهِ رسول الله ﷺ** ، وأبو المخارق ذكره ابن حبان في الثقات(٣٣٦/٦)(٨٠٠٤) و عمر بن سعد معدود من الصحابة، والظاهر أنه منقطع بينه و بين أبى المخارق، و أخرج مسلم في كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب ذكر الدجال(٢٩٣٧) من رواية جبير بن نفير عن النواس بن سمعان في حديثه الطويل فى الدجال، وفيه: فقال:

(( **غير الدجال أخوفنى عليكم**)) و أخرج الإمام أحمد فى مسنده(٢٦٩٣٩) عن أبى الدرداء رفعه: (( **أن أخوف ما أخاف على أمتي الأئمة المضلون**)) قال الهيثمي في مجمع الزوائد(٢٣٩/٥) فيه راويان لم يسميا، و أخرج أبو نعيم في الحلية(٤٦/٦) عن عمر رفعه(**أخوف ما أخافُ على أمَّتي الأئمةُ المُضلون) فقال كعب: واللهِ ما أخاف على**

واته:

(ئەوەی زیاتر لە دەججال جێگای مەترسی‌یە بۆتان غەیری دەججالە، (واتە مەترسی پێشەوا گومڕاکەرەکانتان لەمەترسی دەججال ترسناکی زیاترە)

وەفەرموویەتی: (ﷺ):

((مَن ازدادَ عِلماً وَلَم يَزدَدْ هُدًى لَم يَزدَدْ مِنَ اللهِ إلاَّ بُعْدَاً))(١)

واته:

---

**هذه الأمة غيرهم** قال الشيخ: غريب من حديث كعب تفرد به صفوان، رواه عن تقية بن الوليد والقدماء.]

أخرجه أحمد في مسنده(١٤٥/٥)[٢٠٧٨٩-٢٠٧٩٠] من حديث أبي ذر بإسناد جيد[قال الزبيدي (٣٥٠/١) قال العراقي: في إسناده عبدالله بن لهيعة مختلف فيه، ورواه أبو يعلي في مسنده(٣٥٩/١)(٤٦٦) عن علي بن أبى طالب رفعه نحوه، و فيه جابر هو أبويزيد الجعفي ضعّفه الجمهور، وروى أحمد فى مسنده(٢٩٥) من طريق أبى المخارق زهير بن سالم عن عمير بن سعد الأنصاري أن عمر قالب لكعب: **أخوف شيئ على أمة محَمّدﷺ؟ قال: أئمة مُضلون، قال عمر: صدقتَ. قد أسرَّ إلي ذلك وأعلَمَنيهِ رسول الله ﷺ** ، وأبو المخارق ذكره ابن حبان في الثقات(٣٣٦/٦)(٨٠٠٤) و عمر بن سعد معدود من الصحابة، والظاهر أنه منقطع بينه و بين أبى المخارق. و أخرج مسلم في كتاب الفتن و أشراط الساعة، باب ذكر الدجال (٢٩٣٧) من رواية جبير بن نفير عن النواس بن سمعان في حديثه الطويل في الدجال، وفيه: فقال:(( **غير الدَّجَّال أخوفنى عليكم**)) و أخرج الإمام أحمد فى مسنده (٢٦٩٣٩) عن أبى الدرداء رفعه: (( **أن أخوف ما أخاف على أمتى الأئمة المضلون**)) قال الهيثمي في مجمع الزوائد(٢٣٩/٥) فيه راويان لم يسميا، و أخرج أبو نعيم في الحلية(٤٦/٦) عن عمر رفعه(**أخوف ما أخاف على أمتي الأئمة المضلون) فقال كعب: والله ما أخاف على هذه الأمة غيرهم** قال الشيخ: غريب من حديث كعب تفرد به صفوان، رواه عن تقية بن الوليد والقدماء.]

(١) رواه الديلمي في مسند الفردوس (٥٨٨٧) والمشهور أن هذا الحديث من قول الحسن البصري انظر: الأتحاف (٣٥١/١).

( هەرکەسێك زانستی زیاتر ببێت و بەپێی زیادبوونەکەی ڕینومایی خێرو هیدایەتی زیاتر نەبووبێت، ئەوە تابێت زیاتر لە خوداوە دوردەکەوێتەوە.

حەزرەتی عیسا(سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:

تاکەی ئێوە تاریفی ڕێگای ڕۆشن بۆلای خودا دەکەن بۆ ئەوانەی شەوڕەوی دەکەن.

(مەبەستی ئەوانەیە کە بەژیانی دونیانەویستی و زوهد، ڕێگای خودا پەرستی‌یان گرتۆتە بەر) لەگەڵ ئەمەشدا ئێوە بەکردەوەکانتان خۆتانتان لەگەڵ ئەوانەدا هێلاوەتەوە، کەوەستاون و ماونەتەوە و نەکەوتونەتە ڕێگا.[1]

ئەمانەو فەرمودەکانی غەیری ئەمانەش بەڵگەن لەسەر زۆریی بوونی مەترسی لە زانست، زانایش یان ڕووبەڕوی مەترسی و فەوتانی هەتاهەتایی دەبێتەوە، یان بەرەو پیری بەختیاری هەمیشەیی دەڕوات، بەڵام بەوەی کەڕۆبچێت لەقولایی زانستدا، بێ بەش دەبێت لە سەلامەتی، ئەگەر دەستی نەگاتە ڕێگای بەختیاری.

---

(١) إقتضاء العلم و العمل (٦٠).

# بەڵگەی ئاسار و پاشماوەکان

حەزرەتی عومەر(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ترسناکترین شت کە دەترسم ڕوو لەم ئوممەتم بکات: کابرایەکی زانای دووڕووە، ووتیان چۆن دەکرێت مونافیقیش بێت و زاناش بێت؟! فەرمووی: زوبانی پاراو و خاوەن زانیاری بێت، دڵیشی مردوو نەزان بێت[١] واتە: بێ کارو کەودەن بێت.

حەسەنی بەصری فەرموویەتی: لەو کەسانە مەبە کە زانستی زانایان و نوکتەو قسەی دانسقەی حاکمەکان کۆ دەکەنەوە، بەڵام لە کاروکرداردا ڕێ وشوێنی نەفامەکان دەگرنەبەر)[٢] پیاوێك بە ئەبو هورەیرەی ووت: دەمەوێت فێری زانست ببم و دەشترسم زایەی بکەم، ئەویش فەرمووی:

ئەوەندەی کە نایخوێنیت ئەوە ئەوپەڕی زایەکردن و بەفیڕۆدانیەتی.[٣]

---

(١) أخرجه الضياء في ((الأحاديث المختارة (٢٣٦) و أصله عند أحمد (٢٢/١).قال الزبيدي: قال العراقي: وهذا الذي ذكره أثرٌ فقد ذكره أحمد من مسنده، ٣١٢، مرفوعاً من حديث عمر بإسناد صحيح، قلت: وهذا قد أخرجه إبن عساكر في تأريخه٣١٠/٢٤، عن أبي عثمان النهدي، قال: خطبنا عمر بن الخطاب ، قال: **حذَّرنا رسول الله ﷺ كلّ منافق عليم**، اهـ،ثم قال العراقي: وصح أيضاً من حديث عِمران بن حصين رواه الطبراني في الكبير١٨ /٢٣٧ (٥٩٣)، ورفعه: **إنَّ أخوف ما أخافُ عليكم بعدي كل منافق عليم اللسان**، اهـ، قلت: وبمثل رواية أحمد رواه أيضاً البزاز ٤٣٤/١(٣٠٥) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواته محتج بهم في الصحيح وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٨٧/١، رجاله موثوقون]

(٢) أورده ابن عبدالبر فى جامع بيان العلم و فضله(١٢٦٢).

(٣) رواه ابن عساكر في((تأريخ دمشق)) (٣٦٨/٦٧) وفي(البيان المتقين)(٢٥٧/١): (وقال أبو هريرة النحوي). [قال الزبيدي٣٥٢/١: هذا موقوفٌ على أبي هريرة رضي الله عنه، ويعضده ما يُروى عن الأعمش معضلاً: **آفة العلم النسيان، وإضاعته أن تُحدِّثَ به غير أهله**. أخرجه الدارمي في المقدمة، باب مذاكرة العلم، ٦٢٤، وابن عدي في الكامل، ٣٨/١، من عدة طرق، ويُروى عن علي مرفوعاً، آفة العلم النسيان، أخرجه ابن عدي في الكامل٣٨/١.]

ووتیان بە ئیبراهیمی کوڕی عویەینە: کێ لە هەموو کەس پەشیمانی زیاتر دەردەبڕێت؟ فەرمووی: پەشیمانی خێرا کە لە دونیادا دوچاری دەبێت، کەسێکە چاکەی باشی کردبێت لەگەڵ یەکێکدا کە سوپاسی نەکات و پێیشی نەزانێت، وە پەشیمانیی کاتی مردنیش، ئەو زانایەیە سنووری خۆی بەزاندوە و زیانی لەخۆی داوەو بەو زانینەی کە هەیبووە کاری پێ نەکردووە.[١]

خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی فەرموویەتی:

چوار جۆر پیاو هەن: پیاوێك دەزانێت و دەشزانێت کە دەزانێت، ئەوە زانایە و شوێنی بکەون، وە پیاوێك دەزانێت بەڵام خۆی نازانێت کە دەزانێت، ئەوە نوستووەو خەبەری بکەنەوە، وە پیاوێك نازانێت، وە ئەشزانێت کە نازانێت، ئەوە کەسێکی فێرخوازەو داوای ڕێنومایی دەکات و فێری بکەن، وە پیاوێکی تر کە بۆخۆی نازانێت و ناشزانێت کە نازانێت( ڕەنگە خۆی بەزانایش بزانێت) ئەوە نەزان و جاهیلە و وازی لێ بهێنن و دوری بخەنەوە.[٢]

سوفیانی سەوریش(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی:

زانست بانگ دەکات کە کاری پێ بکرێت ، ئەگەر خاوەن زانستەکە وەڵامی نەدایەوەو کاری بەزانستەکەی نەکرد ئەوا عیلمەکە کۆچ دەکات و بەجێی دەهێڵێت.[٣]

عەبدوڵلای کوری موبارەك فەرموویەتی: تا ئەو کاتەی پیاو بەدوای زانستدا بگەڕێت و لێی ماندوو نەبێت، هەر بەزانا دەژمێررێت، ئەگەر وای گومان برد کە ئیتر زانایەو فێربووە، ئەوە بەنەزان دادەنرێت.[٤]

---

(١) ئیبراهیمی کوڕی عویەینە یەکێکە لەو زاناو خواناسە دونیا نەویستەکان ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

(٢) رواه ابن عبدالبر في (جامع بيان العلم و فضله)(١٥٣٨).

(٣) إقتضاء العلم و العمل(٤١).

(٤) أورده ابن قتيبة(غير منسوب) في((عيون الأخبار)(١١٨/٢).

فوضەیلی کوڕی عەیاض (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

من بەزەییم بەسێ کەسدا دێتەوە: گەورەو قسەڕۆشتوی هۆزێک کە زەلیل و ژێر دەستە بووبێت، وە دەوڵەمەندێك هەژار کەوتبێت، وە زانایەك دونیا یاری پێ بکات.[1]

حەسەنی بەصریش فەرموویەتی: تۆڵە سەندنەوە لە زانایان بەوە دەبێت کە دڵیان دەمرێت، وە بەمردنی دڵیش خواستیان لەسەر دونیا پەیدا دەبێت، ئەوکاتە بەکرداری ئاخیرەت دونیا بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن[2]

لەم بارەوە ئەم شێعرەیان ووتووە:

عَجِبتُ لِمُبتـاعِ الضَّـلالةِ بالهُدَى ومَن يَشتَري دُنياهُ بالدِّينِ أَعجَبُ

وأعجَبُ مِن هَذَينِ مَن بـاعَ دِيَنَـهُ بدُنيا سِواهُ فهُوَ مِن ذَينِ أعجَبُ[3]

**واتە: سەیر بۆ ئەوە گومڕایی کڕیوە بە هیـدایـەت!**

**سەیرتــــــر ئەوەیە ژینی کڕیوە بەدیــــــانەت!**

---

(١) المدخل إلى (السنن الكبرى) (٥٧٦) [ وقال الزبيدي (٣٥٣/١): هذا قد روي مرفوعا من حديث أنس، وأبي هريرة.أما حديث أنس فقد أخرجه الخطيب في الفقه والمتفقه١٦٦/١، ولفظه: **عَنِي قَوْمٌ إفْتَقَرَ. وعَزِيزُ قَوْمٍ ذَلَّ. وفَقِيهاً يَتَلَاعَبُ بِهِ الجُهَّالُ**. وأخرج إبن حبان في المجروحين١١٨/٢، من طريق عيسى بن طهمان عنه، ولفظه مثل الأول إلاّ أنّهُ قال: **وعَالِماً بينَ جُهَّالٍ**، وقد حكم إبن الجوزي على هذه الأحاديث بالوضع. ١٧٢/١، وقال وإنما يعرف هذه من قول فضيل بن عياض. وأما حديث أبي هريرة فأخرجه الديلمي في مسند الفردوس١٤/٢(٢١٠٣)، ولفظه:

**بَكَتِ السَّماواتُ السَّبْعُ ومَنْ فِيهِنَّ ومَنْ عَلَيهِنَّ لِعَزِيزٍ ذَلَّ، وغَنِيِّ افْتَقَرَ، وعالمٌ تَلْعَبُ بِهِ الْجُهَّالُ**، هكذا أورده السيوطي في اللآلي المصنوعة١٩٣/١، وهو شاهدٌ قويٌ لما تقدّم.]

(٢) رواه البيهقي في(شعب الإيمان)(١٦٩٦) و ابن المبارك فى الزهد(١٥١٤).

(٣) ئەم دوو شـيعرە دانـراوی مـالیکی کـوڕی دینـارە(ڕەحمەتی خـوای لـێ بیـت) بنوارە(ربيع الأبرار)(١٨٥/٤)، و وفيات الأعيان (١٧٠/٦)، و حياة الحيوان(٤٢٢/١) و زهر الأكم(٢٨٨/١).

## سەیر و سەمەرەی زیاتـــرە دینـی دەفـرۆشێت
## بۆ ژینی کەسێکی تـرە بـێ خێــر و دەرامـەت!![1]

پێغەمبەریش(ﷺ): فەرمویەتی:

**((إنَّ العالِمَ ليُعذَّبُ عَذاباً يُطيفُ بهِ أهلُ النَّار استِعظاماً لشِدَّةِ عَذابهِ))**[2] مەبەستی زانایەکی خراپەکار و ئەهلی گوناهە، واتە:

(بە جۆرێك سزای دەدەن، کە ئەهلی ئاگر دەهێنن و دەیانسوڕێننەوە بەچوار دەوری ئەو زانا تاوانکارەدا، بۆ ئەوەی نیشانیان بدەن چ جۆرە سزایەکی سەخت و گەورە دەدرێت).

ئوسامەی کوڕی زەیدیش دەفەرموێت: بیستومە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ): فەرموویەتی: **((يُؤتَى بالعالِم يَومَ القيامةِ فَيُلقَى في النَّار فتَندَلِقُ أقْتابُه فيَدُورُ بها كَما يَدورُ الحِمارُ بالرَّحَى، فَيُطيفُ بهِ أهلُ النَّارِ فَيقولونَ ما لَكَ؟ فيَقولُ كُنتُ آمُرُ بالخَيرِ ولاَ آتيهِ، وأَنْهَى عَنِ الشَّرِّ وآتيهِ))**[3] واتە:

( زانای تاوانبار دەهێنن لە ڕۆژی قیامەتداو یەکسەر توڕیان دەدەنە ناو ئاگرەوە، ڕیخۆڵەکانیان دێتە دەرەوە و بەچوار دەوریا پێچی دەدات وەك چۆن گوێدرێژ دەسوڕێتەوە بەدەوری بەرداشەکەدا. ئەهلی ئاگریش دێن و دەسوڕێنەوە بەدەوری داو، پێی دەڵێن:

ئەوە هۆی چی‌یە وات بەسەر هاتووە؟ ئەویش دەڵێت:

کاتی خۆی فەرمانم بە چاکە دەکردو خۆم فەرمانبەردار نەدەبووم، وە بەرگریم لە خراپە دەکردوو، لە خەڵکم قەدەغەدەکردوو خۆم ئەو کارەم

---

(١) (ئەحسەن) موفتی: وەرگێڕ

(٢) قال الحافظ الزبيدي: قال العراقي: لم أجده بهذا اللفظ وهو بمعنى الحديث الآتي لأسامة بمن زيد.

(٣) رواه البخاري (٣٢٦٧)، و مسلم(٢٩٨٩).

دەکرد. بۆیە سزای زانا لەسەر تاوانەکانی دووچەندانەیە، چونکە لەگەڵ زانین دا تاوانەکەی ئەنجام داوە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾النساء/ ١٤٥ ، واتە:

دوڕووەکان لە نزمترین پلەی دۆزەخدا سزادەدرێن، کە خوارترین مەنزڵگای دۆزەخیەکانە، چونکە ئەم دوڕووانە ڕاستیان زانیوە و نکوڵییان کردووە، هەروەك چۆن جولەکەکان لەگاورەکان خراپترن، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیانووتووە خودا کوڕی هەیە و، نەیشیان ووتووە کە سێ خودا هەیە.(**إنَّ اللهَ ثالثُ ثَلاثَة**)، بەڵام تەنها ئەوەندە تاوانیان هەبووە، دوای ئەوەی ڕاستیان زانیوەو ناسیویانە ئینکاریان کردووە.

بۆیە خودا فەرمویەتی: ﴿**يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ**﴾ البقرة(١٤٦).

واتە: (ئەهلی کیتابییەکان وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، ئاوا ڕاستی و پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ دەناسن بەهەموو نیشانەکانیەوە).

هەروەها خودای گەورە فەرمویەتی:

﴿**فَلَمَّا جَاءَهُمْ مَا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ**﴾ البقرة (٧٩) .

واتە: کاتێك بەبەڵگەکانەوە خرایە بەرچاویان و دەیانناسیەوە دەیشیان زانی کەڕاستە، بەڵام نکوڵییان دەکردو باوەڕیان پێ نەدەکرد، نەفرەتی خودا لەوانەی کە کافر و بێ دینن).

هەروەها لە چیرۆکی بەلعامی کوڕی باعورائدا خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿**وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ، وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ**﴾الأعراف(١٧٥-١٧٦)

واتە: هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە، کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێ بەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ دوورخستنەوەو خۆی لێ

دادەماڵی، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و پێش خۆیی خست و، چووە ناو ڕیزی گومڕاو سەرلێ شێواوانەوە، نمونەی ئەوانە وەك نمونەیی سەگ وایە، ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت لێت ئەوەڕێت و، ئەگەر وازیشی لێ بهێنیت هەر لێت دەوەڕێت.

زانای خراپەکاریش هەر بەم شێوەیە، بەڕاستی(بەلعام) زانستیی کیتابی خودای پێگەیشتبوو، بەڵام لایدا بەلای دونیاو ئارەزواتداو، لە بەر ڕازیکردنی قەومەکەی پشتی کردە کیتابی خودا ، بۆیە تەشبیهی کراوە بەسەگ، واتە: یەکسانە حیکمەت و بەڵگەکانی پێ بدرێت و بۆی باس بکرێت یان نا، ئەو هەر بەرەو لای ئارەزواتی دونیایی هەڵپەی دێت.

حەزرەتی عیسا(سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:

نمونەی زانا خراپەکان وەك نمونەی بەردێکە کەوتبێتە سەر دەمی ڕوبارێك، نە خۆی ئاو دەخواتەوە کە سوود لە ئاوەکە ببینێت، نە ڕێگەیش دەدات ئاوەکە بێتە دەرەوە و ئاودێری پێ بکرێت، وە نمونەی زانای خراپ وەك نمونەی (ئاودەستە) بەڕواڵەت گەچ و سفتو پاك و خاوێنە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بۆنی پیس و قێزەونە، یان وەك گۆڕەکان وان، لەسەرەوە ئاوەدان و ڕازاوەن، لە خواریشەوە ئێسك و پروسکی مردوو.[١]

ئەم فەرموودەو ئاسارە پیرۆزانە دەری دەخەن، ئەو زانایەی کە ئەهلی دونیایە و لە پێناوی دونیایشدا خوێندویەتی، لە هەموو کەس حاڵی خراپتر و نزمترەو سزایشی لەهەموو نەزانێك لە دوارۆژدا سەختترە، ئەوانەش کە سەرفرازو نزیکی دیوانی پەروەردگارن، تەنها زانایانی ئاخیرەتن.

---

(١) قوت القلوب (١/١٤١).

# نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت، لەوانە:

## نابێ بەهۆی زانستەکەیانەوە بەدوای دونیادا بگەڕێن.

چونکە کەمترین پلەی زانا ئەوەیە کە هەست بە سووکی و نزمی و بێ نرخی دونیا بکات لای خودا، وە بشزانێت چەندێك لە کەدارەو بێ بەقایە و هەر ماوەیەکەو دەتوێتەوە، وەبشزانێت دوارۆژ و قیامەت چەندێك گەورەو بەردەوام و بەهادارە، نیعمەتەکانی پاك و خاوێنە و موڵکێکی شکۆمەندو گەورەیە، وە زانا دەزانێت کە دونیاو ئاخیرەت دوشتی دژ بەیەکن، وەک دوو هاوسەری پیاوێك وان، هەرکامێکیان ڕازی بکات ئەویانی تورەکردووە، یان وەك دوو ناو لەپی کیشانەیەك وان، هەرکامێکیان سەنگی زیاتربێت، ئەویان سوك دەبێت و بەولادا دەشکێتەوە، یان وەك رۆژهەڵات و رۆژئاوا وان، هەرچەندێك لەلایەکیان نزیك ببێتەوە لەولایان دووردەکەوێتەوە. هەروەها دونیاو ئاخیرەت وەك دوو جام وان، یەکێکیان پڕ بێت و ئەویشیان خاڵی، بەئەندازەی ئەوەی لە جامە پڕەکەیان خاڵییەکە پڕ بکەیت، ئەوە جامەپڕەکەیش لێی خاڵی دەبێتەوە.

بەڕاستی ئەوەی سووکی و قیزەوونی دونیا نەزانێت، کە لە کەدارەو صاف و بەردەوام نی‌یە و دەپچڕێت، وە هەمیشە خۆشی و ناخۆشی تێکەڵاو دەبن و، ژیانە پوختەکەیشی بە کۆتادێت، ئەوەی بەمە نەزانێت، ئەوە ئەقڵی تێك چووە، چونکە بە تەنها بینین و تاقی کردنەوە ئەتبات بۆ لای ئەو ڕاستیانە، ئیتر چۆن لە زاناکان کەسانێك هەبن کە عەقڵیان نەبێت؟!

وە هەرکەسێکیش ئەمانە هەمووی بزانێت، وە ئاخیرەتی لا لە پێشتر نەبێت لە دونیا، ئەو بەدیلگیراوی شەیتانەو، نەفس و ئارەزوات بە هیلاکیدا بردووەو بەدبەختیی زاڵ بووە بەسەریدا، جا کەسێك ئەمە پلەو پایەی بێت، چۆن لە تاقم و کۆمەڵی زانایان دەژمێررێت؟

لەو فەرموودانەی لە حەزرەتی داوودەوە پێمان گەیشتووە (سەلامی خودای لەسەر) کە لە خودای گەورەوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

ئەی داوود! کەمترین تۆڵە کە لە زانایەکی دەستێنم، ئەوکەسەی کە ئارەزواتی خۆیی پێش محببەتی من خستووە، ئەوەیە کە بێ بەشی دەکەم لە خۆشی و تام و چێژی موناجات و پاڕانەوە لەخۆم،

پرسیاری زانەیەکم لێ مەکە کە دونیا سەرخۆشی کردبێت و، لە ڕێگەی خۆشەویستی من دوری بخاتەوە، ئەوانە لە ڕێی بەندەکانی مندا ڕادەوەستن و ڕێگریان دەکەن. ئەی داوود! ئەگەر کەسێکت دی بەدوای مندا دەگەڕا، ئەوا تۆ ببە بەخزمەتکاری ئەو. ئەی داوود! هەرکەسێك ڕاکردوویەکم بۆلا بگێڕێتەوە من وەك لێزان و شارەزاو عاریفێك ناونووسی دەکەم، ئەوەش بە پۆشتەو دەوڵەمەند و لێزانم نووسی هەرگیز سزای نادەم.[1]

هەر لە بەر ئەمەیشە کە حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: مردنی دڵی زانایەك تۆڵەیەکە لێی دەسەنرێتەوە، مردنی دڵیش یەکسانە بەوەی بەکردارەکانی قیامەت دونیای پێ بەدەست بخەیت و بەدوای دونیادا بگەڕێیت.[2]

هەر لە بەر ئەمەش بوو کە یەحیای کوری مەعاز (ڕەزای خودای لێبێت) فەرموویەتی: بەهاو قەدرگرانی زانایان دەکەوێت و دێتە خوارەوە، ئەگەر بەمەبەستی بەدوادا گەڕانی دونیا کاربکات.[3]

سەعیدی کوڕی موسەییبیش(ڕەحمەتی خودای لێبێت) فەرموویەتی:

---

(١) قوت القلوب( ١٤١/١) والقطعة الأخيرة روى بنحوها أحمد في الزهد(٩٧٧).

(٢) جامع بيان العلم و فضله(١١٦٥).

(٣) رواه ابن أبي الدنيا(٤٧٦) منسوبا لأحد الحكماء.

ئەگەر بینیتان زانایەك فێڵ و غەش لە فەرماندارێك بکات، ئەوە دزەو بەدز دەژمێررێت.[(١)]

حەزرەتی عومەریش( خودای لێ رازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر زانایەکتان بینی دونیای خۆش دەویست، ئەوا تۆمەتی بخەنە پاڵ و، لێی ئەمین مەبن لەو بابەتە دینیانەی کە لەوەوە سوودتان وەرگرتووە. چونکە ئەوەی مەیلی دڵ و خۆشەویستی بۆ هەرچیەك بوو بەو لایەدا دەڕوات.[(٢)]

مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

لە هەندێك لە کتێبە پێشوەکانم خوێندۆتەوە، کە خودای گەورە فەرموویەتی: کەمترین شت کەبەسەر زانایەکدا دەیهێنم، ئەگەر دونیای خۆش بوێت، شیرینی نزاو موناجات و پاڕانەوەی خۆمی لەدڵدا دەردەهێنم.[(٣)]

پیاوێك نامەیەکی بۆ برایەکی نوسی: خودای گەورە زانستی پێ بەخشیویت، نەکەی نووری زانستەکەت بە تاریکایی گوناه و تاوان بکوژێنیتەوە، کە لە ناو ئاخ و حەسرەت و پەشیمانیدا بمێنیتەوە، لەو رۆژەدا کە ئەهلی عیلم لە ناو نووری زانستەکەیاندا پەل دەهاون و دەجوڵێنەوە.[(٤)]

یەحیای کوڕی مەعازی ڕازی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بە زاناکانی ئەهلی دونیای دەووت:

ئەی خاوەن زانستەکان، کۆشکەکانتان وەك کۆشکی قەیصەر وایە، ماڵەکانتان وەك ماڵی کیسرا وایە،جلو بەرگەکـانتان وەك بــەرگی (طــــاهیری)

---

(١) رواه ابن الطيوري في(الطيوريات)(٦٩٠) من طريق ابن المسيب عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه).

(٢) جامع بيان العلم و فضله من قول جعفر بن محمد بنحوه( ١١٤٧).

(٣) أبو نعيم (في الحلية الأولياء) (٣٦٠/٢) بنحوه.

(٤) رواه أبو نعيم في (حلية الأولياء) (١٤٦/٩).

وایە[1] وە خوففەکانتان جوان و ڕازاوەیە وەك خوففی پێی جالووت، ئەوەش کە سواری دەبن بە زێروزیو ڕازاندوتانەتەوە قارونی‌یە، وە دەفر و قاپی خواردنتان گران بەهاو فیرعەونی‌یە، پرسەو ماتەمینیەکانتان وەك چەرخی نەفامێتی وایە، مەزهەب و ڕێبازی ژیانیشتان شەیتانی‌یە، (واتە: شوێن هەواو ئارەزوات و نەفس و شەیتان دەکەون) ئەی ڕێبازی موحەممەدی لە کوێیەو چی لێ بەسەرهات.[2] شاعیر لەم بارەوە دەڵێت:

**وَراعي الشاةِ يَحْمي الذِّئبَ عَنها ... فَكيْفَ إذا الرُّعاةُ لَها ذِئابُ**[3]

**واتە: شـــوانە، مەڕلەدەم گورگە پـارێزێ**

**گەرخۆی بوو بە گورگ کێ بیپـارێــزێ؟**

**شـــوان دەیپـارێزێت مــەڕلە دەمـی گــورگ**

**ئەی گەرشوانەکان خۆیان بوون بە گورگ**[4]

شاعیرێکی تر دەڵێت:

---

(١) طاهری نیسبەتە بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی طاهری کوڕی حسێنی وەزیر، کە بەرگی زۆر گرانی دەپۆشی بنوارە الأتحاف(١/٣٥٨).

(٢) رواه الحافظ السلفي في((معجم السفر)) (٨٠٤) . وە پێویستە بزانین ڕێبازی حەزرەتی موحەممەد ﷺ قەناعەت و دونیا نەویستی و بێ دەنگی و شانازی نەکردن و نزمی ماڵ و خانوەکەی و، سوار بوونی گوێ درێژ و ڕۆشتن بەگەردن کەچییەوە، کە خاوەنی قاپێکی تەخشتەیش بوو نانی تیا دەخواردو ،لەسەر حەسیر و زەوی دادەنیشت و، دەیان صیفەتی تر کە هەمووی نیشانە بوو لەسەر زوهدو دانایی و تەوازوعی ئەوزاتە، ئەوەی دەڵێ شوێن کەوتووی سوونەتی پێغەمبەرم ﷺ، دەبێ لە خووڕەوشتەکانی دا موحەمەدی بێت ﷺ.

(٣) سراج الملوك(١/٢١١).

(٤) وەرگێڕانی بەیتەکە(نەحسەن).

يا مَعشَرَ القُرَّاءِ يا مِلْحَ البَلَدِ     ما يُصلِحُ المِلحَ إذا المِلْحُ فَسَدْ[1]

زانای قـورئان خوێن، نمـەکی ناو شـار

چـی تامـی چاك کا، تاڵ بێ لەسەر زار[2]

وتیان بە هەندێك لە عاریف و خوداناسەکان:

ئایا وا دەبینیت کە ئەوەی تاوان چاوی گەشبکاتەوەو هۆگری بوبێت، ئەوە خودا ناناسێت؟ فەرمووی: گومانم لەوە دانیە ئەو کەسەی کە دونیای زیاتر لە پێشتر بێ لە قیامەت، ئەوە خودا ناناسێت، چ جای ئەوەی کە تاوانکاریی چاوی ڕۆشن بکاتەوە و خۆشحاڵی بکات.[3]

وە هەرگیز وا گومان نەبەیت کە ئەوەی وازی لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان هێنا ئیتر دەگاتە ڕیزی زانایانی ئاخیرەت، چونکە ئەوەی بەدوای پلەو شکۆمەندیدا بگەڕێت، ئەوە زیاتر لە ماڵ و سامانەکە زیانی لێ دەدات.

بۆیە بیشری حافی فەرموویەتی: دەرگایەك لە دەرگاکانی دونیا وشەی (حَدَّثَنا)یە، واتە هەواڵیان پێدام: ئەگەر بیستت پیاوێك لە ناو خەڵکا دەیووت هەواڵی پێدام (قسەو فەرموودەیان بۆ بخوێنێتەوە) واتە پێیان دەڵێت:

ڕێگام بۆ بکەنەوە و (گوێم لێ بگرن و دەیەوێت خۆی دەربخات)[4]

بشیری حافی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دە پازدە سەللەو قوڵینە و صندوقی پڕ لە کتێبی خۆیی خستە ژێر خاکەوەو شاردنیەوە و دەیفەرموو:

من حەزم لە قسەکردنە، ئەگەر ئارەزوی قسەکردنم لا نەمێنێت ئەو وەختە قسەتان بۆ دەکەم.[1]

---

(١) عجائب المقدور(٤٨٥).

(٢) (ئەحسەن) وەرگێر.

(٣) حلية الأولياء( ٢٧٩/٦).

(٤) قوت القلوب(١٣٥/١).

بیشر و کەسانێکی تریش فەرموویانە:

ئەگەر حەزت لە قسەکردن بوو( بۆ خەڵکی) ئەوا مەیکە، بەڵام ئەگەر حەزت لێی نەبوو ئەوا قسەیان بۆ بکە.[٢]

چونکە ئەو تام و چێژەی بەهۆی قسەکردن و شکۆداری خۆدەرخستنەوە دەستی دەکەوێت، لە هەموو لەززەتێکی دونیایی گەورەترە، هەرکەسێك بەپێی خوداستی ئارەزوەکانی بجوڵێتەوە و چۆن حەزی لە قسەکردن کرد بیکات، ئەوە لە ئەهلی دونیا دەژمێرریت.

هەر لە بەر ئەمەیە کە سوفیانی سەوری فەرموویەتی:

فیتنەو تاقیکردنەوەی قسەکردن، زۆر توندو گرانترە لە فیتنەی ماڵ و منداڵ و خانەوادە، چۆن لەو فیتنەیە نەترسیت کە خودا(ﷻ) بەگەورەی پێغەمبەرە خاون پەیامەکانی ﷺ فەرموەوە:

﴿وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا﴾ الأسراء(٧٤).

واتە ئەگەر دڵمان بە نووری متمانەو یەقین ڕاگیر نەکردبایتایە، بەڕاستی خەریك بوو کەمێك دڵت مەیلی هەبێ بەلایاندا.[٣]

---

(١) قوت القلوب(١/١٥٦).

(٢) قوت القلوب (١/١٥٦). و شرف أصحاب الحديث(٢٣٠) بنحوه.

(٣) قـوت القلـوب (١/١٥٦) بـۆ زیـاتر ڕونکـردنەوەی ئەم بـابەتە مەبەسـتی ئەم زانـا بەرزانە ئەوە نی‌یە کە گرنگی بە عیلمی حەدیث وفەرموودەو ئامۆژگاری موسـوڵمانان نەدرێت، چـونکە هەموویـان لەم بـابەوە لە ڕیـزی یەکەمـدا بـوون بـۆ خـزمەت کردنـی زانسـتی فەرمـوودەو ئامۆژگـاری موسـوڵمانان، بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیە کە نـابێ بنازێـت بە قسـەکانیاندا، نـابێ لەبەر مەرام و حەزی شەخشـی و ئـارەزوی جاهـ و مەقـام و خـۆ بەرزکردنەوە قسە بۆ ئەو خەڵکە بکات، دەبێ بەدڵ حەزی لەقسەکردن نەبێت، بەڵام بە ناچاری قسـەیان بۆ بکات، خۆی لەوان بە هەژار تر دابنێت کە پەندو ئامۆژگاری لە

سەهلی توستەری فەرموویەتی:

زانست هەمووی بەشی دونیایە، تەنها کار پێ کردنی دەیکاتە بەشی ئاخیرەت، وە هەموو کردەوەکانیش وەکو تۆز پرش و بڵاودەبنەوە، مەگەر کردەوەیەك تەنها بە ئیخلاص و لەبەر ڕەزامەندی خودای کردبێت.[1]

هەروەها فەرموویەتی: ئەو خەڵکە هەموویان بە مردوو دەژمێررێن جگە لە زاناکانیان نەبێت، زاناکانیش هەموو سەرخۆشن، مەگەر ئەوانە نەبێ کە کاریان بە زانستەکەیان کردبێت. ئەوانەش کاری پێ دەکەن سەرکەش و مەغرورن، مەگەر موخلیص و دڵسۆزەکانیان، دڵسۆزەکانیش لەسەر هێڵی مەترسی دەمێننەوە تا لەسەر ئەو حاڵەتی ئیخلاصە وەفات دەکەن.[2]

ئەبو سولەیمانی دارانی فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك بەدوای قسەکردندا دەگەڕاو(حەزی لێ دەکرد) یان ژنی هێنا، یان گەشتی دەکرد لە پێناو دەسکەوت و ژیاندا، ئەوە شانی داداوە بۆ دونیاو خۆی لەبەردەمیدا زەلیل کردووە.[3]

مەبەستی لەم جۆرە خواستانەیە( کە بەلای دونیادا ڕایان دەکێشێت) گەڕانەوە بەدوای سەنەدی ڕاویەکان و سەنەدە باڵاکاندا[4] یان گەڕان بەدوای

---

قسەکانی خۆی وەربگرێت، کەواتە زانستی فەرمووده و قسەکردن پێویستە، بەڵام بەومەرجانە.

(١) إقتضاء العلم و العمل(٢٠).

(٢) قوت القلوب (١٥٨/١). و إقتضاء العلم و العمل(٢٢) بنحوه.

(٣) قوت القلوب(١٥٣/١).

(٤) حافظی عێراقی فەرموویەتی: نایابی فەرموودە لەوەدا نییە کە سەنەدەکانی نزیك بن، بەڵکو لەوەدایە کە پیاوی سەنەدەکانی متمانە پێکراو بن، با دورو باڵایش بن، مەبەستیشی ئەودیە کەسێ بەدوای سەنەدە غەریب و نامۆکاندا بگەڕێت، وەزیاتر ئەو ڕێگانە بەیان بکات کە ڕەدکراونەتەوە، یان پەسەند نەکراون، کە زۆر خۆیان لە بنج و

ئەو فەرموودانەی بۆ ڕێگای ئاخیرەت پێویستی پێیان نابێت( وەك فەرمووده شاز و مونکەرەکان).

حەزرەتی عیسا(سەلامی خودای لە سەر) فەرموویەتی:

چۆن لە ئەهلی عیلم دەژمێررێت؟ کە سێك ک چارەنوسی بۆ ئاخیرەت بێت و ئەویش بەتەواوی ڕوی لە دونیا کردبێت؟!

وەچۆن بە ئەهلی زانست دەژمێررێت:

ئەو کەسەی بەدوای قسەو فەرموودەدا دەگەڕێت، بۆ ئەوە نا کە کاری پێ بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی کە هەواڵی لێ بدرێت و بەناوی ئەوەوە باس بکرێت[1]

صاڵحی کوڕی حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

بەخزمەت گەلێ لەو شێخە بەرزانە گەیشتووم، کە پەنایاندەگرت بەخودا لەو خراپەکارانەی کە زاناو شارەزان لە سوننەتدا[2].

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ طَلَبَ عِلماً مِمَّا يُبتغَى بِهِ وَجْه اللهِ تَعالَى لِيُصيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنيا، لَم يَجد عَرْفَ الجَنَّةِ يَومَ القِيامَة))**[3]

---

بنەوانی حەدیسە نامۆو شاذ و پەسەند نەکراوەکان شارەزا دەکەن و، پرسیاری فەرموودەی صیحاح و دروستەکانیان لێ بکەیت لێی بێ ئاگان، کەواتە ئەمانە بەدوای دونیادا دەگەڕێن.

(١) سنن الدارمي(٣٨٠) ضمن حديث طويل عنه عليه السلام. وقال الزبيدي: ٣٦٣/١: أخرجه أبو نعيم في (الحلية) (٢٧٩/٦).

(٢) قوت القلوب(١٤١/١).

(٣) أبو داوود (٣٦٤٤) و ابن ماجة(٢٥٢) بأسناد جيد، قال الزبيدي: ٣٦٣/١: قال العراقي: إسناد صحيح، رجاله رجال البخاري. اهـ . قلت: وقد رواه كذالك الإمام أحمد في مسنده (٨٢٥٢)، و الحاكم في المستدرك، ١٦٠/١(٢٨٨-٢٨٩)، و البهقي في الشعب (٢٨٢/٢

هەرکەسێك بگەڕێت بە شوێن زانستێکدا کە لە ئەصڵدا بۆ ئەوە بێت ڕەزامەندی خودای پێ وەربگیرێت، بەڵام مەبەستیی ئەم ئەوە بێت ماڵێکی دونیایی پێ دەست بخات،( واتە عیلمی ئاخیرەت بۆ مەبەستی دەسکەوتی دونیایی بەکاربهێنێت) ئەوە هەرگیز بۆنی پاکی بەهەشت ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا).

خودای گەورە تاریف و وەصفی زانا خراپەکان بەوەدەکات کە بە هۆی عیلمەوە دونیا دەخۆن، وە تاریفی زانایانی ئاخیرەتیشی بەوە کردووە کە گەردن کەچ و دونیا نەویستن،

لەبارەی زانا دونیا خۆرەکانیشەوە فەرموویەتی ﷻ:

﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ (وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ) ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾[1]

وە لەبارەی زانایانی ئاخیرەتەوە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ (وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَئِكَ) لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللَّهَ

---

(١٧٧٠)، والمدخل ص ٣١١(٤٧٧)، و أخرج الديلمي في مسند الفردوس{ كما في جامع الأحاديث للسيوطي ١٧٢/٧(٢١٦٨١) عن أبي سعيد رفعه( **من تعلم الأحاديث ليحدّث بها الناس، لم يرح رائحة الجنة، و إن ريحها لتوجد مسيرة خمسمائة عام**) قال العراقي: وفي الباب عن ابن عمر، رواه الترمذي. كتاب العلم: باب ماجاء فيمن يطلب بعلمه الدنيا(٢٦٥٥) و ابن ماجه في المقدمة: باب الإنتفاع بالعلم و العمل به(٢٥٣).]

(١) آل عمران(١٨٧). ئەوەی لە میانی کەوانەکاندا نوسراوە ئیمامی غەزالی هەمووی نەنوسیوەتەوە تەنها فەرمووبەتی لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی و باسی ئاخیرەکەشی نوسیوە. بەڵام بۆ زیاتر ڕونکردنەوە هەموو ئایەتەکەمان نوسیوە.

**سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾**[1] واتە: فەرمان درا بە ئەهلی کیتابیەکان کە بڕوا بە حەزرەتی موحەممەد بهێنن(ﷺ) وەپەیمانیان لێ وەرگیرا کە ئەوەی دەیزانن ڕایبگەیێنن و نەیشارنەوە، بەڵام پەیمانەکەیان پشت گوێ خستوو فڕێیان داوەتە دوای خۆیانەوە، وەگۆڕیویانەتەوە بە نرخێکی کەم، واتە:

لە بریتی دەرخستنی ڕاستیەکان نرخێکی کەم و حەرام و کۆتایان وەرگرتووە.

وە لەبارەی زانایانی ئاخیرەتیشەوە فەرموویەتی:

هەندێك لەوانەی ئەهلی کیتابن بڕوایان بەخودا هەیە و، بڕوایان بەو قورئانەی کە هاتۆتە خودارەوە بۆ سەر ئێوە و بەتەورات و ئینجیلی خۆیشیان هەیە، گەردن کەچ و فەرمانبەردارن لە حزوری خودادا، ئایەتەکانی خودا ناگۆڕنەوە و نایفرۆشن بە نرخێکی کەم و بەکۆتا هاتوو)

هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:

زاناکان لە ڕۆژی قیامەتدا لە ناو پێڕی پێغەمبەرەکاندا زیندو دەکرێنەوە و حەشر دەکرێن، (زانایانی ئاخیرەت)، وە قازییەکایش لەناو ڕیزو پێڕی دەستەڵاتدارەکاندا حەشر دەکرێن[2] مەبەست لە قازی و دادوەر هەموو فەقیهێکە کە بەزانستەکەی ئەوداڵی دوای دەسکەوتی دونیایی بوبێت.

ئەبو دەرداء خودای لێ ڕازی بێت گیراویەتیەوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە فەرموویەتی:

**((أوحَى الله عزَّوجَلَّ إلى بَعض الأنبياءِ: قُلْ لِلَّذين يَتَفَقَّهُونَ لِغَيرِ الدِّينِ ويتَعلَّمونَ لِغَيرِ العَمَلِ، ويَطلُبُونَ الدُّنيا بِعَمَلِ الآخِرَة، يَلبَسُونَ لِلنّاسِ مُسُوكَ الكِباش وَقُلُوبُهم كَقُلوبِ الذِّئاب، أَلسِنَتهُم أحلَى مِنَ العَسَل، وَقُلوبُهم أمَرُّ مِنَ**

---

(١) آل عمران (١٩٩). وەك پێشەوە هەموو ئایەتەکەمان نوسیوەتەوە.

(٢) قوت القلوب (١/١٥٧).

**الصَّبر، إيَّايَ يُخادِعُون، وَبِي يَستَهزِئون، لأَفتَحَنَّ لَهُم فِتنَةً تَذَرُ الحَليمَ حَيرانَ))**[1] خودای گەورە نیگای كرد بۆ هەندێك لە پێغەمبەرەكانی و فەرمووی پێیان: بڵێ بەوانەی خۆیان لە (فیقه) شارەزادەكەن و مەبەستیان خزمەتی دین نییە، خۆیان فێری زانست دەكەن و مەبەستیان ئەوە نییە كاری پێ بكەن، بە هۆی عیلمی ئاخیرەتەوە بەدوا دەسكەوتی دونیاییدا دەگەڕێن، بەرگ و فەروی خوری بۆ خەڵكەكە لەبەردەكەن و،(وان لە لیباسی مەڕداو) دڵیشیان( بۆ مل شكاندی خەڵك) وەك دڵی گورگ وایە، زوبانیان لە پاراویدا لە هەنگوین شیرینترە وەدڵیان لە صەبرو خۆڕاگری تاڵترە، ئەوانە فێڵ لەمن دەكەن؟ گاڵتە بە من دەكەن؟ دەبێت دەرگایەكی فیتنەی گەورەیان لەسەر بكەمەوە، پیاوی حەلیم و بە ئارامیش تیایدا سەرسام و دەستەوستان ببێت.

ضەححاك گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڵلای كوری عەباسەوە(خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری(ﷺ) فەرموویەتی:

**((عُلَماءُ هذِهِ الأُمَّةِ رَجُلان: رجلٌ آتاهُ اللهُ عِلماً فبَذَلَهُ للنَّاس وَلَم يأخُذ عَلَيه طَمَعاً، ولَم يَشتَر بهِ ثَمَناً، فَذلِكَ يُصَلي عَليهِ طيرُ السَّماءِ وَحيتانُ الماءِ**

(١) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١١٣٩). و الخطيب في (الفقه و المتفقه) (١٠٦٨) وأصله عند الترمذي ٢٤٠٤.أخرجه إبن عبد البر في كتاب العلم، ١٨٩/١، بسند ضعيف. [قال الزبيدي ٣٦٤/١: قال العراقي في التخريج الكبير: فيه عثمان بن عبد الرحمن الوقاصي. قال البخاري في التأريخ الكبير٢٣٨/٦: تركوه. وقال يحيى بن معينكما في الضعفاء الكبير للعقيلي ٢٠٦/٣: ليس بشيئ. وقال النسائي في الضعفاء والمتروكين، ص/٧٥. والدارقطني في السنن ١٥٠/٢(٥٤): متروك. وفي الباب عن أبي هريرة رواه إبن مبارك في الزهد، ١٧/١(٥٠)نحوه، دون ذكر كونه وحيا إلى بعض الأنبياء، وهو ضعيف، اهـ قلتُ: وجدتُ هذا الحديث في الحلية٣٩/٤. وفي الإقتضاء للخطيب، ص٧٨ (١٢٠) بأطول منه]

**وَدَوابُّ الأرضِ والكِرامُ الكاتِبوُن ، يَقْدَمُ عَلى اللهِ عزَّوجَل يَومَ القيامةِ سَيِّداً شَرِيفاً حَتّى يُرافِقَ المُرسَلين، ورجُلٌ آتاهُ اللهُ عِلماً في الدُّنيا، فضَنَّ بهِ عَلى عِبادِ اللهِ وَأخَذ عَليهِ طَمَعاً واشتَرى بهِ ثَمَناً، فذلِكَ يَأتي يَومَ القِيامَة مُلَجَّماً بِلِجامٍ مِنْ نار، يُنادي مُنادٍ عَلى رؤوسِ الخَلائِق، هذَا فلانُ بنُ فُلان! آتاهُ اللهُ عِلماً في الدُّنيا فضَنَّ بهِ علَى عِبادِه وأخَذ بهِ طَمَعاً واشتَرى بهِ ثَمناً، فَيعَذَّبُ حتَّى يُفرَغ مِن حِسابِ النَّاس))**[1]

واتە: زاناکانی ئەم ئومەتی ئیسلامە دوو پیاون:

پیاوێکیان خودای گەورە زانستی خۆی پێ داوەو، ئەویش بە ئەمانەتەوە بڵاوی کردۆتەوە، هیچ شتێکی لەسەر وەرنەگرتووە تەماحی تیا بێت بۆی، وەبە پارەو نرخێکی کەم نەیفرۆشتووە و نەیدۆڕاندووە، ئەو پیاوە پەلەورەکانی ئاسمان داوای ڕەحمەتی بۆ دەکەن، هەروەها نەهەنگی دەریاکان و هەموو مەخلوقاتی سەرزەوی لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکاندا کە کردەوەکانیان دەنوسن، لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەیهێننە بەردەمی پەروەردگاری باڵادەست بە گەورەیی و

(١) رواه الطبراني في (الأوسط)٧١/٧ (٧١٨٣). بإسناد ضعيف.[ قال الزبيدي ١//٣٦٥: أورده صاحب القوت٢٤٨/١. وقال العراقي في التخريج الكبير فيه عبدالله بن خراش وشهر بن حوشب، فالأول متفق على ضعفه، والثاني مختلف فيه، وذكر المصنف أنه من رواية الضحاك عن ابن عباس، والمعروف رواية شهر بن حوشب عنه، وقال الطبراني بعد تخريجه: لم يرو هذا الحديث عن العوام إلا عبدالله بن خراش، ولا يُروى عن ابن عباس إلا بهذا الإسناد.اهـ

قلت: قد علمت أن المصنف تبع في قوله هذا صاحب القوت، فلعله وقع له طريق إلى ابن عباس غير الذي أشار إليه الطبراني لكونه ثقة، والضحاك ذكره ابن حبان في الثقات٤٨٠/٦(٨٦٨٣)وقال: لقي جماعة من التابعين، ولم يشافه أحدا من الصحابة، ومن زعم أنه لقي ابن عباس فقد وهم. اهـ وقال ابن عدي في الكامل ٩٤/٤: عرف بالتفسير وأما روايته عن ابن عباس وأبي هريرة ففيها نظر.]

ڕێز و شەرەف مەندییەوە، تاوای لێ دێت هاوڕێیەتی پێغەمبەرە خاوەن پەیامەکان دەکات.

وە پیاوێکی تریش خودای گەورە لە دونیادا عیلم و زانستی پێ بەخشیوە، بەڵام لەسەرفکردنیدا بەخیل بووە و نەیدەبەخشیەوە بە بەندەکانی خودا، وە لە پێناوی تەماحی خۆیدا بەکاری دەهێناو شتی پێ وەردەگرت، بەنرخێکی کەمیش دەیفرۆشت و بەفیڕۆی دەدا، ئەو پیاوە سزای دەدرێت، تا ئەو کاتەی حیساب و مافی هەموو کەسێکی لەسەر نامێنێت.

لەم فەرموودەیە توندتر ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: پیاوێك خزمەتی حەزرەتی موسای دەکرد(سەلامی خودای لەسەر) هەموو جارێ دەیووت:

(موسا پاڵفتەکراوی خودا) هەواڵی پێ دام، موسا ڕزگارکراوی خودا هەواڵی پێ دام، موسا (کلیم الله) هەواڵی پێ دام، تابەم هۆیەوە دەوڵەمەند بوو، سامانی زۆر کۆکردەوە، (حەزرەتی)موسا( سەلامی خودای لەسەر)ونی کردو پرسیاری لێ دەکردو دەگەڕا بەدوایدا، هیچ هەواڵێکی نەبوو، تارۆژێك کابرایەك هات بۆ لای، بەرازێک بەدەستیەوە بوو، وە پەتێکی ڕەش لەملیدابوو، موسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرمووی: ئەرێ فڵان کەس ناناسیت؟

ووتی بەڵێ ئەم بەرازەی بەدەستمەوەیە ئەوە ئەو فڵان کەسەیە.

(حەزرەتی)موسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرمووی: پەروەردگارا؟ داوات لێ دەکەم بیگێڕیتەوە سەر حاڵەتی پێشوی خۆی، تا پرسیاری لێ بکەم بە چی تووشی ئەمە بووە؟ خودای گەورە وەحی بۆ کردو(فەرمووی):

ئەگەر داوام لێ بکەیت بەهەموو ئەو نزاو داوایانەی کە ئادەم و ئەوانەی لەخواری ئەوەوە داوایان پێ کردووە وەڵامت نادەمەوە،(واتە وەك خۆیی لێ ناکەمەوە) بەڵام هەواڵت پێ دەدەم کە بۆچی وای لێ هاتووە: چونک ئەوە صیفەتی وابوو، بەهۆی دینەوە دونیای دەست دەکەوت (دینــی کــردبوو بە

هۆكاری كۆكردنەوەی دونیا) پەنا ئەگرم بەخودا[١]

لەم فەرموودەش توونددترو قورسترئەوەیە، كە دەگێڕنەوە لە معازی كوڕی جەبەلە وە(خودای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەتەكە لەسەر خۆی ڕاوەستاوە (مەوقوفە) لە ڕیوایەتێكی تریشدا بەرزیكردۆتەوەو (داویەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) كە فەرموویەتی: ((**مِنْ فِتنَةِ الْعَالِمِ أن يَكونَ الكَلامُ أحَبَّ إليهِ مِنَ الإستماع، وفي الكَلامِ تَنْميقٌ وزِيادةٌ، ولا يُؤمَنُ عَلى صاحبِهِ الخَطأُ، وفي الصَّمتِ سلامةٌ وعِلمٌ، ومِنَ العُلَماء مَن يَخزُنُ عِلمَهُ فَلا يُحِبُّ أن يُوجَدَ عِندَ غَيرِه، فذلِكَ في الدَّركِ الأوَّل مِنَ النَّار، ومِنَ العُلماء مَن يَكونُ في عِلمِهِ بمَنزلةِ السُلطانِ فَإن رَدَّ عليه شيءٌ مِن عِلمِهِ أو تُهُوِّنَ بشَيء مِن حَقِّهِ غَضِبَ، فَذلِكَ في الدَّرك الثاني مِن النَّار، ومِن العُلماءِ مَن يَجعَلُ عِلمَه وَغرائبَ حَديثِهِ لأهلِ الشَّرَف واليَسار، ولا يَرى أهلَ الحاجةِ لَهُ أهلاً، فذلِكَ في الدَّرك الثالِثِ مِنَ النار، ومِنَ العُلَماء مَن يَنصِبُ نَفسَهُ للفِتيا فيَفتِي بالخَطأ واللهُ تعالى يُبغِض المتكلِّفينَ، فذلِك في الدَّركِ الرابع مِنَ النار، ومِنَ العُلماء مَن يَتكلَّم بكَلامِ اليَهودِ والنَّصارَى ليَغْزُرَ بهِ عِلمُهُ، فذلِكَ في الدَّرك الخامِس مِنَ النَّار، ومِنَ العُلَماء مَن يَتَّخِذُ عِلمَهُ مُروءَةً ونُبلاً وذكراً في النّاس، فذلك في الدَّركِ السادِس مِنَ النَّار، ومِنَ العُلماءِ مَن يَستَفِزُّهُ الزَّهوُ والعُجبُ، فإنْ وَعَظَ.. عَنَّفَ وإنْ وُعِظَ أنِفَ، فذلِكَ في الدَّركِ السابع مِنَ النَّار، فعَليكَ بالصَّمتِ فيهِ تَغلِبُ الشَّيطان، وإيَّاكَ أن تَضحَكَ مِنَ غَيرِ عَجَبٍ أو تَمشِيَ في غيرِ أرَب**))[٢]

---

(١) تأريخ دمشق(١٥٢/٦١)، وقوت القلوب(١٤٤/١) و لتفضيل أكثر ينظر الإتحاف(٣٦٥/١) مفصلا.

(٢) قال أبو طالب في (قوت القلوب)( ١٤٤/١).. ( وقد روينا في مقامات علماء السوء حديثا شديدا نعوذ بالله من أهله ونسأله أن لا يبلونا بمقام منه، فروينا مرة مسندا من طريق، ورويناه موقوفا على معاذ ابن جبل(رضى الله عنه)، و أنا أذكره موقوفا أحب إلي، حدثونا

واتە: (لەو فیتنەو تاقیکردنەوانەی ڕو لە زانایان دەکەن:

ئەوەی کە قسەکردنی لا خۆشتر بێت لە گوێ گرتن، وە لەقسەکردنیشدا حەزی لەوەیە بەجوانی و ڕەونەق و زیادە پێوەنانەوەی بیکات، کە خاوەنەکەی پارێزراو نی‌یە لەوەی دووچاری هەڵە ببێت، لە گوێ گرتندا سەلامەت دەبی لە هەڵەو زانستیش زیاتر وەردەگرێت، هەندێك زانا هەیە: زانستەکەی دەخاتە سەر یەك و هەڵیان دەگرێت، حەزیش ناکات کەسی تر ئەو زانستەی ئەوی لەلا بێت، ئەو کەسە لە خوارترین پلەی نزمی ناو ئاگردایە.

وەهەندێك لە زانایان کەسانێکن زانستەکەیان وەك سولطانەکان وایە، ئەگەر شتێك لە زانستەکەی خۆی بدرێتەوە بەسەریدا، یان هەندێك مافی پێشێڵ بکەیت و بەسووکی سەیری بکەیت، ئەو کاتە توڕە دەبێت، ئەوە لە پلەی دووهەمی نزمترین‌دایە لەناو ئاگردا، هەندێکیش لە زاناکان قسە غەریب و ناوازەو تایبەتیەکانی هەڵدەگرێت بۆ دەوڵەمەندو شەرەفمەندەکان و، وانابینێت کە ئەوانەی پێویستیان پێ‌یەتی ئەهل بن بۆ ئەم باسەیە، ئەمانەیش لە پلەی خواروی سێیەمدان لەناو دۆزەخدا، وەهەندێك لە زانایان خۆیان

---

عن منذر بن علي، عن أبي نعيم الشامي، عن محمد بن زياد، عن معاذ بن جبل يقول فيه: قال رسول الله(ﷺ) . ووافقته أنا على معاذ) و ذكره بلفظه هنا، و أصله عند ابن مبارك في (الزهد) (٤٨) و انظر جامع بيان العلم و فضله(٩١٠/٩١١) [وقال الزبيدي: (٣٦٦/١) هكذا أورده بطوله صاحب القوت(٢٤٩/١)، قال العراقي في التخريج الكبير: رواه الديلمى في مسند الفردوس(٢١٣/١(٨١٣)) و فيه: جبارة بن المفلس و مندل بن على ضعيفان، و أبو نعيم السامي مجهول، ومحمد بن زياد الحمصي لم يدرك معاذا، ورواه ابن الجوزي في الموضوعات(١٩٤/١) و هذا الكلام معروف من قول يزيد بن أبي حبيب، رواه ابن المبارك في الزهد و الرقائق(١٦/١(٤٦). اه

قلت: أخرجه ابن الجوزي، وقال: فيه خالد بن يزيد وهو كذاب ومندل بن علي و جبارة بن مفسل و هما ضعيفان.... اه]

دادەمەزرێنن و خۆیان دادەنێن بۆ فتوادان و دادوەری، بەهەڵەیش فتوادەدەن، خودای گەورەش ڕقی لەو کەسانەیە کە زۆر لە خۆیان دەکەن و بەسەر خۆیاندا دەیهێنن، ئەو کەسەیش لە پلەی چوارەمی ناو ئاگردایە، وە هەندێك لە زاناکان بە قسەکانی جولەکەو گاورەکان دەدوێت، بۆ ئەوەی زانستەکەی زۆرو بەرفراوان بکات قسەیان پێ دەکات ، ئەو کەسەیش لە پلەی پێنجەمی ناو ئاگردایە، وە هەندێك لە زانایان زانستەکەی دەکاتە پیاوەتی و مەردایەتی و زیرەکی و هۆکاری ناوبردنی لەناو خەڵکدا، ئەوەش لە پلەی شەشەمدایە لە ناو ئاگردا، وە هەندێکی تر لە زانایان فیزو بەخۆداهەڵدان کوشتوونی و موعجەبن بەخۆیان، لەکاتی ئامۆژگاری کردندا وشەی زۆر توند بەرکاردەهێنن، وە ئەگەر ئامۆژگاریان کردن ئەتەوسێنەوەو لووت دەکەن و پێیان نارەحەتە، ئەوانەش لە پلەی حەوتەمی ناو ئاگردان... کەواتە زۆر پێویستە لەسەرت کە زیاتر بێ دەنگبیت، بەبێ دەنگی دەتوانیت بەسەر شەیتاندا زاڵ ببیت، ئەگەر شتێکی سەرسوڕهێنەرت نەبینی نەکەی بەهەموو شتێکی ئاسای پێ بکەنیت، یان بەبێ ئیش بکەویتە ڕێ و برۆی بەلایەکدا. لەفەرموودەیەکی تردا:

**((إنَّ العبدَ ليُنشَرُ لهُ مِنَ الثَّناءِ ما يملأُ ما بينَ المَشرِقِ والمَغربِ وما يَزِنُ عِندَ اللهِ جَناحَ بَعوضَةٍ))**[1] واتە بەندەی وا هەیە کە (سەناو ستایشی ئەوەندە

---

(١) و في صحيح البخاري(٤٧٢٩) و مسلم مرفوعا(٢٧٨٥) **إنه ليأتي الرجل العظيم السمين يوم القيامة لايزن عند الله جناح بعوضة.** قال: إقرؤوا: **فلا نقيم لهم يوم القيامة وزنا**. وقال الزبيدي(١/٣٦٧): هكذا أورده بطوله صاحب القوت(١/١٤٤)، وقد تقدم في أول الكتاب عند ذكر حديث(**إن من العلم كهيئة المكنون**) ما ذكره الشيخ صفي الدين بن أبي المنصور في ترجمة شيخه عتيق نقلا عن قضيب الباني الموصلي أنه قال: **من الرجال من يرفع صونه مابين المشرق و المغرب، ولايسوى عندالله جناح بعوضة**.[ وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية(٦/٢٨٩) لم أجد له إسنادا].

زۆر دەكریت میانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا پڕ دەكات، بەڵام ئەو كەسە لەلای خودا بەهاو كێشی باڵە مێشولەیەكیشی نی‌یە).

وە دەگێڕنەوە كە حەسەنی بەصری لە مەجلیسەكەی هەڵسا، كابرایەكی ئەهلی خوراسان كیسەیەكی بۆ هێنا پێنج هەزار دیرهەم و دە بەرگی ناسكی(خۆراسانی) تێدابوو، ووتی:

ئەی ئەبو سەعید ئەمەیان مەسرەفی خوێندنەكەم و، ئەوەشیان پۆشاك و بەرگە بۆ لەبەركردن، حەسەن فەرمووی:

خودا لێت ببورێت: مەسرەف و بەرگەكانت هەڵگرەوە بۆ خۆت، ئێمە هیچ پێویستیمان پێیان نییە، خۆ ئەگەر هەر كەسێك وەك دانیشتنەكانی من ئاوا دابنیشێت و، لەو خەڵكەیش ئاوا شت وەربگرێت، كاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا دەگات بەخودای گـەورە هیچ بەشە پشكێكی خێری بۆ نامێنێتەوە).[1]

دەگێڕنەوە لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە كە خۆی فەرموویەتی، وە لەڕیوایەتێكیشدا بەرزی كردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) كە فەرموویەتی: **((لا تَجلِسُوا عِندَ كُلِّ عالمٍ إلا عالمٍ يَدعُوكُم مِن خَمسٍ إلى خَمسٍ، من الشَكِّ إلى اليَقين، ومنَ الرِّياء إلى الإخلاص، ومنَ الرَّغبةِ إلى الزُّهد، ومن الكِبْر إلى التَّواضُع، ومنَ العَداوةِ إلى النَّصيحَة))**[2]

---

(١) قوت القلوب لأبي طالب المكي: (١/١٤٤).

(٢) رواه أبو نعيم في الحلية(٨/٧٢). وارتضى أبو طالب وقفُه في (القوت)(١/١٤٤) على جابر رضي الله عنه. وقال الحافظ الزبيدي في(الإتحاف) ١/ ٣٦٧ قال العراقي في التخريج الكبير وفيه عباد بن كثير البصري، قال النسائي في الضعفاء والمتروكين. ص/٧٠(٤٠٨)وفيه شقيق عن عباد، فشقيق أحد الزُهاد العُبّاد من أهل المجاهدة والجهاد، قال صاحب ميزان الإعتدال٣/٣٤٨(٣٧٤٦) منكر الحديث. ثم قال: لايُتصور أن نحكم عليه بالضعف، لأن النكارة من جهة الرواة عنه.اهـ قلت وقد وجدت لهذا الحديث طريقا آخر ، قال السيوطي

واتە: لای هەموو زانایەك دامەنیشن و قسەیان لێ وەرمەگرن مەگەر زانایەك کە بانگتان بکات لەواز هێنان لە پێنج صیفەتی خراپەوە بۆ پێنج خەصڵەتی چاك: لەگومانەوە بۆ متمانەیی، وە لە ڕیاکارییەوە بۆ کاری ئیخلاص و دڵسۆزی، وەلە هەڵپەو حەزی دونیا ویستییەوە بۆ زوهدو دونیا نەویستی، وە لە فیزو دەمارەوە بۆ تەوازوع و گەردن کەچی، وە لە دوژمنایەتی‌یەوە بۆ ئامۆژگاری وقسەی خێر)

وەخودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ، وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ**﴾ القصص( ٧٩ - ٨٠).

واتە: قارون هاتە دەرەوەو خۆی نیشانی قەومەکەی دا، بەو هەموو بەرگ و مەوکیب و جوانکارییەی هەیبوو، ئەوانەی ژیانی دونیایان هەڵبژاردبوو چاوی هەموویانی پڕ کردو دەیانووت: بریا ئەو هەموو نازو نیعمەتەی قارون هەیەتی ئێمەش بمانبوایە، بەڕاستی بەش و بەخششێکی گەورەو مەزنی هەیە، بەڵام ئەوانەی دارای زانستی ڕاستەقینەبوون دەزانن کە بەمافی خۆی و ڕێگای دروست وەری نەگرتووە بۆیە ئەم موڵك و ئەم دەستەڵاتەی قارون فریویان نادات و دەڵێن: خەسارەت مەندی بۆ ئێوە! ئایا نازانن پاداشتی لای خودا و بەهەشت چاکترە بۆ بڕواداران. خودای گەورە بەوە زانایانی ناساندووە کە ئاخیرەتیان هەڵبژرادووە بەسەر دونیادا.

---

في اللآلي المصنوعة١/١٩٤: قال ابن النجار في تأريخه ...وساق إسناده إلى جابر مرفوعا،:**لاتَقعدوا مع كل ذي علم إلاَ عالم يدعوكم من الخمس إلى الخمس: من الرغبة إلى الزهد، ومِن الكِبْر إلى التواضع، ومن العداوة إلى المحبَة، ومن الجهل إلى العلم، ومن الغِنى إلى التقلل**، وبعد أن جمع له طرقا قال: ( فبهذه الطرق يقوى جانب الرفع).]

## وه له نیشانه‌كانی زانایانی ئاخیره‌ت:

## ئه‌وه‌ی به خه‌ڵكی ده‌یڵێت،ده‌بێ له خۆیدا جێبه‌جێی بكات

نابێت كرداره‌كانی ئه‌و زانایه پێچه‌وانه‌ی قسه‌كانی بێت، به‌ڵكو نابێت فه‌رمان به‌كارێك بدات ئه‌گه‌ر خۆی یه‌كه‌م كه‌س نه‌بوبێت له‌جێبه‌جێكردنیدا.

خودای گه‌وره فه‌رموویه‌تی:

﴿ أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ ﴾ البقرة(٤٤).

ئیبن عه‌باس ئه‌فه‌رموێت: ئه‌م ئایه‌ته له‌سه‌ر حیبره‌كانی جوله‌كه دابه‌زیوه، واته: فه‌رمان ده‌ده‌ن به‌خه‌ڵكی كه‌چاكه بكه‌ن و، خۆیشتان وازی لێ ده‌هێنن و كرده‌وه‌كانتان پێچه‌وانه‌ی قسه‌كانتانه).

خودای گه‌وره فه‌رموویه‌تی:

﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ الصف(٣)

واته: (خودای گه‌وره زۆر رقی له‌وانه ده‌بێته‌وه كه قسه بۆ خه‌ڵك ده‌كه‌ن و خۆیان كاری پێ ناكه‌ن).

خودای گه‌وره فه‌رموویه‌تی:

﴿ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ﴾ هود(٨٨)

واته: (كارێكتان لێ قه‌ده‌غه ناكه‌م كه خۆم بیكه‌م، هه‌روه‌ك چۆن واز له فه‌رمانێك ناهێنم كه داوام لێ كردبن ئه‌نجامی بده‌ن).[١]

خودای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ﴾البقرة(٢٨٢).

واته: (كاری خوداپه‌رستی ئه‌نجام بده‌ن، خودای گه‌وره‌ش فێرتان ده‌كات چۆن ته‌قوا بكه‌ن).

---

(١) ته‌فسیری قورطبی شه‌رحی ئایه‌تی(٨٨) سوره‌تی هود

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا ﴾ البقرة(١٩٦)وە خودا فەرموویەتی: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ﴾المائدة(١٠٨) واتە: (تەقوا کاری و خۆپارێزی و خودا ناسی دەرگای زانست و فێربون و بیستنی هەموو فەرمانێکی چاکەیە).

وەخودای گەورە بە حەزرەتی عیسای فەرموو: ئەی کوڕی مەریەم، ئامۆژگاری خۆت بکە، ئەگەر خۆت ئامۆژگاریت وەرگرت و کارت پێ کرد، ئەو کاتە قسەی خێر بۆ خەڵکی تر بکە، ئەینا شەرم لە من بکەو( بێ دەنگ بە).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێت:

**((مَرَرتُ ليلةَ أُسرِيَ بِي بأَقوامٍ تُقْرَضُ شِفاهُهُم بمَقارِيضَ مِن نار ، فقُلتُ: مَن أنتُم؟ فَقالُوا: كُناَّ نأمُر بالخَيرِ ولاَ نأتيهِ ونَنهَى عَنِ الشرِّ ونأتيهِ))**[1]

واتە: ئەو شەوەی شەوڕەوییم پێ کرا، دام بەلای چەند هۆزێکدا لێوەکانیان بەدەرزی ئاگرین ئەدورینەوە، ووتم ئێوە کێن؟ ووتیان:

ئێمە فەرمانمان بە خەڵك دەکرد بۆ چاکە کردن و خۆمان پێی هەڵنەدەستاین، وە خەڵکمان لە شەر ئەگێڕایەوەو خۆمان ئەمانکرد.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((هلاكُ أمَّتي عالمٌ فـاجرٌ، وعـابِدٌ جاهلٌ، وشرُّ الشِّرارِ شِرارُ العُلَماءِ،**

---

(١) أخرجه ابن حبان في(صحية) (٢٤٩/١(٥٣)) من حديث أنس [قال الزبيدي: ٣٦٩/١: قال العراقي في التخريج الكبير: طريق ابن عتاب – أحد رواة الحديث – هذه رواها أبو نعيم في الحلية، ٣٨٦/٢، و أبو عتاب إحتج به مسلم في كتاب الصيد و الزبائح، باب تحريم أكل كل ذي ناب من السباع.(١٩٣٤) ووثقه ابن الزرعة في ميزان الإعتدال(٣٣٢/٣)، و أبو حتام في (الجرح و التعديل) ١٩٦/٤، و اسمه سهل بن حماد.. اهـ

قال العراقي: وللحديث طرق أخرى: أحدها: من رواية حماد بن سلمة عن علي بن زيد عن أنس، رواه أحمد في مسنده(١١٨٠١). والثاني: من رواية عيسى بن يونس، عن سليمان التيمي عن أنس رواه الطبراني في الأوسط ١٣٠/٢(٢٠٤٦) بأسناد صحيح.]

**وخَيرُ الخِيارِ خِيارُ العُلَماءِ))**[1]واتە: ئەوەی ئوممەتی من دەفەوتێنێت و لەناویان دەبات: زانایایەکی ئەهلی گوناهو بێ شەرمیە، وە عابیدێکی نەزان و تێنەگەیشتووە، وە لە هەموو خراپەکان خراپترو شەڕتر خراپی ناو زاناکانە، و باشترین هەڵبژێرراوی ئوممەتەکەم زانا هەڵبژێرراوەکانە.

ئیمامی ئەوزاعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

گۆڕستانەکان سکاڵاو شکاتیان کرد لەو بۆنە پیسەی لە کەلاکی بۆ گەن کردووی کافرەکانەوە دێت بۆیان، خودای گەورە وەحی کرد بۆ گۆڕستانەکان و فەرمووی: ناو سکی زانا خراپەکان بۆ گەنی پیس ترە لەوەی ئێوە بۆنی دەکەن.[2]

هەروەها فوضەیلی کوڕی عیاض(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

هەواڵم پێ گەیشتووە: کە پێش بت پەرستەکان زانا خراپەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەست دەکرێت بە موحاسەبەو سزادانیان.[3]

---

(١) أخرجه الدارمي في المقدمة باب التوبيخ لمن يطلب العلم لغير الله(٣٧٠) من رواية الأحوص بن حكيم عن أبيه مرسلا بآخر الحديث نحوه، و قد تقدم و لم أجد صدر الحديث.[ قال الزبيدي: ٢٩٦/١ قال العراقي في التخريج الكبير: و حديث الدارمي هذا مرسل ضعيف، فيه بقية بن الوليد مدلس، و قد رواه بالعنعنة، و الأحوص ضعفه النسائي في الضعفاء والمتروكين ص(٢٠). و أبوه تابعي لا بأس به اهـ

قلت: ومن الشواهد للجملة الأولى ما أورده صاحب القوت ٢٤٣/١ و روينا عن عمرو غيره: **كم من عالم فاجر و عابد جاهل؟ فاتقوا الفاجر من العلماء و الجاهل من المتعبدين. وأجرج أبو نعيم ٢٤٢/١ عن معاذ قال: تصديق لرسول الله(ﷺ) وهو يطوف فقلت يا رسول الله أرنا شر الناس فقال: (( سلُو عَنِ الخَير ولا تسألُوا عَنِ الشَرّ، شرار الناس شرار العلماء في الناس))**. و قال إبن السبكي في طبقات الشافعية، ٢٨٩/٦ لم أجد له إسنادا]

(٢) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١١٦٣).

(٣) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١١٦٤).

ئەبو دەرداء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویەتی:

وەیل و خەسارەت بۆ کەسێك کە نەزانێت و نەزان بێت ئەوە تەنها یەکجارە. بەڵام وەیل بۆ ئەو کەسەی کە دەزانێت و کاری پێ نەکردووە حەوت جارە.[1]

شەعبی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

کۆمەڵێ لە ئەهلی بەهەشت چاویان بە کۆمەڵێ لە ئەهلی ئاگر دەکەوێت کە لەوەزعیان ئاگادار دەبن، پێ یان دەڵێن: چی ئێوەی خستۆتە ناو ئاگرەوە، خۆ ئێمە کە خودای گەورە خستوینیەتیە بەهەشتەوە بەهۆکارو فەزڵی ئەو ئەدەب و زانیاریانەوە بووە کە لە ئێوەوە فێربوین، ئەوانیش لەوەڵامدا ووتیان:

بەڕاستی ئێمە فەرمانمان بەخێر و چاکە دەکرد، خۆمان جێ بەجێمان نەدەکرد.[2]

حاتەمی ئەصەمیش ڕەحمەتی (خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

---

(١) رواه أبــونعيم في(حليــة الأوليــاء) (٢١١/١) وابــن عبــدالبر في((جــامع بيــان العلــم و فضله))(١٢١٢). وقال الزبيدي: ٣٧٠/١: أخرجه الخطيب في كتاب الإقتضاء ص٦٧/٤٧ وقد يروى ذالك أيضا عن عبدالله بن مسعود موقوفا عليه، أخرجه أبو نعيم في الحلية ١٣١/١، و قدر يروى هذا القول مرفوعا إلى رسول الله ﷺ فيما أخرجه الخطيب في الكتاب المذكور ٤٦(٦٤) رفعه حذيفة بن اليمان قال: قال رسول الله ﷺ **(ويلٌ لمن لايعلم، وويلٌ لمن يَعلمُ ثم لايَعمل) ثلاثاً**. وكذا رفعه سليمان بن الربيع مولى العباس فيما أخرجه الخطيب في الكتاب المذكور،ص٦٥/٤٦،عن سليمان بن الربيع مولى العباس عن رسول الله ﷺ قال: **(ويلٌ لمن لا يعلَم، ولو شاء الله لعلَّمه، وويل لمن يعلم ولا يعمل) سبع مرات..**

(٢) قال الزبيدي أورد المصنف هذا القول موقوفا على الشعبي، و هكذا أورده صاحب الحلية ٣١٢/٤، وقد جاء مرفوعا إلى رسول الله ﷺ من طريقه. قال الخطيب فى كتاب الإقتضاء ص ٧٣/٥٠ عن الشعبي عن الوليد بن عقبه قال: قال رسول الله ﷺ **إن أناسا من أهل الجنة يتطلعون إلى أناس من أهل النار فيقولون: لم دخلتم النار؟ فوالله مادخلنا الجنة إلا بما تعلمنا منكم، فيقولون: إنا كنا نقول ولا نفعل.**

هیچ کەسێك لە قیامەتدا بەقەدەر ئەو کەسە ئاخ و حەسرەتی پەشیمانی ناکێشێت، کە خەڵکی فێری زانستێك کردبێت و ئەوان کاریان پێ کردبێت و ئەمیش بۆ خۆی کاری پێ نەکردبێت، ئەوانە بەهۆی ئەمەوە سەرفراز بوون و بۆ خۆیشی بە هیلاکا چووە. مالیکی کوڕی دیناریش فەرموویەتی:

بەڕاستی ئەگەر کار بە زانستەکەی نەکات، ئامۆژگاریەکانی لە دڵدا جێگیر نابێت و ئەترازێت و پێوەی نامێنێتەوە، وەك چۆن تکەی باران بەسەر بەرزایی صەفاوە نامێنێتەوە، بۆ یە لەم واتایەدا ئەم شیعرەیان وووتوە:

**يا واعِظَ النَّاسِ قَد أصبَحتَ مُتَّهَماً ... إذ عِبتَ مِنهُم أمُوراً أنتَ تَأتيها**

**أصبَحتَ تَنْصَحُهم بالوَعظِ مُجتَهِداً ... فالمُوبقاتُ لَعَمري أنتَ جَانيها**

**تَعيبُ دُنياً وناساً راغبينَ لَها ... وأنتَ أكثرُ مِنهُم رَغبةً فيها**[1]

لەتەرجومەکەیدا دەڵێم[2]:

**گشت تۆمەتێ ڕوی لێتە، بەسە واعیزی تاکەی؟**

**زۆر کارە بە عەیبەت لە نەزەر داوە کە دەیکەی**

**بەو وەعزو نەصیحەت گەلە، هەردەم کە دەکۆشی**

**لەولایشەوە تاوانی حەرام بەرگی لەبەر کەی**

**ڕەخنەت لە کەسانێکە بە دونیا خەڵەتاون**

**لەو گشتە کەسە زیاترە تۆ ڕەغبەتی شەڕ کەی**

شاعیر (المتنبي) دەڵێت:

**لا تَنهَ عَن خُلقٍ وتَأتيَ مِثلَهُ ... عارٌ عليكَ إذا فعلتَ عَظيمُ**[1]

---

(١) الأبيات من البحر البسيط، وهي لأبي العتاهية في الأغاني ٣٨/٤ و غذاء الألباب للسفاريني ١٦٨/١، و لابن كناسة في محاضرات الأدباء لإبن المفضل ١٦٨/١ و بلا نسبة في الزهرة للبغدادي (ص ٢٢).

(٢) وەرگێڕ: ئەحسەن موفتی.

واتە:    ڕەددی ڕەوشتێ مەکە، بۆ خۆت وێنەکەی دەکەیت
**عارو نەنگیە بۆ تۆ، باجێکی گەورە دەدەیت**[٢]

ئیبڕاهیمی کوری ئەدهەم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی:

دام بەلای بەردێك دا لەسەری نوسرابوو: هەڵمبگێڕەرەوە، پەند وەردەگریت، منیش هەڵمگێڕایەوە، سەیر دەکەم لەسەر پشتەکەی نوسراوە:

تۆ کار بەوە ناکەیت کە دەیزانیت، ئیتر چۆن داوای زانینی زیاتر دەکەیت کە هێشتا نەتزانیوە؟![٣] ئیبن و سەمماك(ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی:

زۆرهەن کە خودای گەورە بەبیری خەڵکی دەهێننەوە و خۆیان خودایان لەبیرچۆتەوە، زۆر کەسیش هەن خەڵکی بەخودا دەترسێنن، بەڵام خۆیان زۆر نەترسن بەرامبەر بە خودا، زۆر یش هەن خەڵکی لە خودا نزیك دەکەنەوەو خۆیان دوورن لە خودا، هەندێکی تریش خەڵکی بۆ لای خودا بانگ دەکەن و خۆیشیان لێی ڕادەکەن، هەندێکی تر هەن کە ئایەتەکانی قورئان دەخوێننەوە وخۆیانیان لێ داماڵیوە و لەبەڵگەکانیشی دورکەوتونەتەوە.[٤]

ئیبڕاهیمی کوڕی ئەدەهەم فەرمویەتی:[٥]

ئەوەندە ڕێزمانی زمانەوانیمان زانی و بەپێی زانستی زمان قسەمان کرد، تاوامان لێ هات بەدروستی و بەبێ لەحن و شێواندن قسەکانمان بە فەصیحی

---

(١) البيت من البحر الكامل و هي لأبي الأسود الدولي في الحماسة المغربية.١٢٣٢/٢، ولسان العرب لابن منظور مادة: عظظ.

(٢) وەرگێڕ: ئەحسەن موفتی.

(٣) رواه أبو نعيم في حلية الأولياء ٣٥٨/٣ بنحوه.

(٤) رواه أبو نعيم في( حلية الأولياء) ٤٥١/٣.

(٥) رواه الخطيب في إقتضاء العلم العمل(١٥١) بنحوه. ويقول الزبيدي: هكذا هو في( قوت القلوب) و ليس هو عند الخطيب(٣٧٢/١).

دەکرد، بەڵام لە کردەوەکانماندا دوچاری لارو لوێری بووین، دورکەوتینەوە لە خوێندنەوەی دروست و فەصیح.

ئەوزاعیش فەرموویەتی: ئەگەر گرنگی دان بە ئیعراب کردنی (وشەو ڕستەکان) هاتە پێشەوە، خشوع و گەردن کەچی نامێنێت[1] (چونکە دڵی لای چۆنیەتی وشە ئاراییە، لە ڕەوانبێژیو لە دەربڕیندا، ئیتر ئاگای لە خشوعی دڵ نامێنێت کە موناجاتی کێ دەکات، یان لەبەر کێ قسە بۆ خەڵکی دەکات).

مەکحول دەگێڕێتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی غەنەمەوە کە فەرموویەتی:

دەکەس لە ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵیان پێ دام و وتیان:

ئێمە وانەی زانستیمان دەخوێند لە مزگەوتی قوباء،کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنایە سەرمان و فەرمووی:

**((تعَلَّمُوا ما شِئتُم أنْ تَعلَمُوا، فلَن يأجُرَكُم الله حَتَّى تَعْمَلوُا))**[2]واتە: هەرچی دەتانەوێت فێر ببن لە زانستی فێری ببن، بەڵام ئەوەندە بزانن کەخودا پاداشتی ئەو فێر بونەتان ناداتەوە تا کار بە عیلمەکەتان نەکەن).

---

(١) قوت القلوب، ١٦٦/١ بنحوه.

(٢) علقه ابن عبدالبر (في العلم ٦/٢) و أسنده ابن عدى[ في الكامل ٥٢/٢] و أبو نعيم[ في الحلية ٢٣٦/١] و الخطيب في كتاب إقتضاء العلم العمل [ص ٢١(٨) ] من حديث معاذ فقط بسند ضعيف، ورواه الدرامي [ في المقدمة: باب العمل بالعلم و حسن النية فيه(٢٦٠) موقوفا على معاذ بسند صحيح.]

[ قال الزبيدي: ٣٧٣/١: قال العراقي في التخريج الكبير: وقد روى من حديث معاذ، و ابن عمر، و أنس، أما حديث معاذ الموقوف، فإسناده صحيح . وأما حديث ابن عمر فرواه الدارقطني في غرائب مالك ٤٢/٥(٤٦١٣) بسند فيه محمد بن روح وهو ضعيف، ولا يصح هذا عن مالك، و أما حديث أنس فروي عنه مرفوعا وموقوفا، رواه ابن عبدالبر في العلم ٢٦/٢ من رواية عباد بن عبدالصمد عن أنس موقوفا، قال: وهو أولى من رواية من رواه مرفوعا، قال: وعبّاد متفق على تركه. اهـ قلت: وقد أخرجه ابن عساكر في التأريخ ٣٤٢/٥٢،

حەزرەتی عیسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:

نمونەی ئەو کەسەی کە فێری عیلم دەبێت و کاری پێ ناکات، وەك ئەو ئافرەتە وایە بە نهێنی زینای کردبێت و بە ئاشکرا سکی پڕ ببێت و لەبەر چاوی هەمووان فەزح ببێت، هەروەهایشە! ئەوەی کار بە زانستەکەی ناکات خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتداو لە بەرامبەری هەموو دروستکراوەکانیدا ڕوی هەڵدەماڵێت و فەزحی دەکات.[1]

معازی کوڕی جەبەل (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

وریا بن لەهەڵەو لادانی زانایەك، چونکە ڕێزی لەلای خەڵکی زۆرە و بەگەورە سەیری دەکەن، لەسەر هەڵەو لادانەکانیشی هەر شوێنی دەکەون.

عەبدوڵلای کوری مەسعودیش فەرموویەتی:

زەمانێ دێت بەسەر ئەو خەڵکەدا، شیرینی دڵەکان تاڵ و سوێر دەبن، ئەوکاتە سوود لە زانستی وەرناگرێت، نەزاناو مامۆستایەکەی، وە نەفێرخوازو قوتابییەکانی، دڵی زاناکانیان وەك پارچە زەویەکی سوێری لێ دێت، کە بارانی لە ئاسمانەوە بەسەردا ببارێت، چۆن شیرینی بارانەکە تێکەڵ بە سوێری زەویەکە دەبێت شیرینیەکەی نامێنێت، ئەمەش ئەو کاتەیە کە دڵی زاناکان لا دەدات بەسەر خۆشەویستی ئاخیرەتدا بۆ لای خۆشەویستی دونیا و جاە و دەستەڵات، لەوکاتەوە ئیتر خودای گەورە سەرچاوەکانی حیکمەتیان لەسەر دادەخات، چرای ڕێنومای لەناو دڵیاندا دەکوژێنێتەوە، کاتێك بەزاناکەیان دەگەیت

---

عن أبي الدرداء و سياقه كسياق الخطيب، و أخرج في الأقتضاء ص ٣٦(١٦) عن أبي الدرداء قال: **إنك لن تكون عالما حتى تكون متعلما، ولن تكون متعلما حتى تكون بما علمت عاملا**].قال ابن السبكي في طباقت الشافعية، ٢٨٩/٦: لم أجد له إسنادا.

(١) نسبه الحافظ الزبيدي إلى صاحب(قوت القلوب) نقلا.

هەواڵت لە حاڵی خۆی پێ دەدات کە ئەو لە خودا دەترسێت، بە زوبانی ئەو قسە دەکات و بەکردەوەکانیشی خراپەو لادان بە ئاشکرا دیارە، ئای کەچەند زوبانیان پاراوەو دڵیان پڕیەتی لەوشکانی، سوێند بەو خودایەی کە هیچ پەرستراوێك نییە تەنها ئەو نەبێت، هۆکاری ئەمە تەنها ئەمەیە کە مامۆستاو فێرکەرەکان تەنها لەبەر غەیری خودا فێری زانست بوون، وە فێرخوازەکانیش لەبەر غەیری ڕەزامەندی خودا زانستیان خوێندووە.[1] (بۆیە بەرەکەت لە زانستەکانیاندا نامێنێت).

وە لە تەورات و ئینجیلدا نوسراوە: داوای فێربوونی زانستێ مەکەن کە هێشتا فێری نەبوون، تاواتان لێ دێت کە ئەوەی زانیوتانە کاری پێ بکەن[2]

هەروەها حوزەیفە(ڕەزای خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

ئێوە لە چەرخێکدا دەژین هەرکەسێکتان دەیەکی ئەوەی دەیزانێت کاری پێ نەکات ئەوا بە هیلاکدا دەچێت، وە زەمانێکیش دێتە پێشەوە هەر کەسێک کار بە دەیەکی ئەو عیلمە بکات کە دەیزانێت، ئەوا سەرفراز دەبێت، ئەمەش لەبەر زۆری ئەوانەی کە بەبەتاڵی دەسوڕێنەوەو کەمتر کار دەکەن[3]

وە بزانە هەروەك زاناکان قازییەکانیش بەوشێوەن، لەو بارەیەشەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**(( القضاةُ ثلاثةٌ: قاضٍ قَضَى بالحَقِ وهُوَ يَعلَمُ فَذلِكَ في الجَنَّة، وقاضٍ قَضَى بالجَورِ وهُوَ يَعلَم أو لا يَعلَمُ، فهُو في النَّـار،وقاضٍ قَضَى بغَيرِ مـا أمَـرَ**

---

(١) ينظر: الأتحاف(٣٤٧/١).

(٢) قال الزبيدي ٣٧٥/١: هكذا أورده صاحب القوت(٢٣٨/١) و أخرج أبو نعيم في الحلية ٢١٩/٣ عن ابن عباس قال: رقى رسول الله ﷺ المنبر فقال: **((قال موسى عليه السلام: يابني إسرائيل – ورآهم يبكون – كم تعلمون ولا تعملون وأنتم لا تعلمون و لاتعملون))**.

(٣) قوت القلوب (١٣٨/١) وروى مرفوعا كذالك كما في( الترمذي) (٢٢٦٨).

**اللهُ بِهِ فَهُوَ فِي النَّارِ))**[1] واتە:( قازیەکان سێ جۆرن[2]

**یەکێکیان** بە حەقق و ڕاستی قەزاوەت دەکات، وە زانایشە بەوەی کە دەیکات، ئەوە لە بەهەشتدایە، وە **قازیەکیش** بە زوڵم و لادان لە ڕاستی قەزاوەت دەکات، ئەوە بزانێت یان نەزانێت لە ئاگردایە، وە **قازییەکیش** بە پێچەوانەی فەرمانی خوداوە دادوەری دەکات، ئەوە لە ناو ئاگردایە.

کەعبی ئەحبار فەرموویەتی: لە کۆتایی زەماندا چەندین زانا ئامۆژگاری خەڵکیان دەکرد و فێری دونیانەویستییان دەکردن، بەڵام بۆ خۆیان لەناو دونیادا بوون و هۆگری بووبون و، خەڵکیان دەترساندو خۆیان نەدەترسان، ڕێگەیان لێ دەگرتن ئامەشۆی والی و فەرمانڕەواکان بکەن و بۆ خۆیشیان دەچون بۆ لایان، دونیایان هەڵدەبژارد بەسەر دوارۆژدا، لەسەر زوبانی خۆیان

---

(١) أخرجه أصحاب السنن[ أبوداود، كتاب الأقضية، باب في القاضي يخطئ(٣٥٧٣)، والترمذي كتاب الأحكامم باب ماجاء عن رسول الله في القاضي(١٣٢٢)، والنسائي فى السنن الكبرى،(٤٦١/٣) (٥٩٢٢) و ابن ماجه كتاب الأحكام( باب الحاكم يجتهد فيصيب الحق،(٢٣١٥) من حديث بريدة وهو صحيح. [قال الزبيدى ٣٧٥/١: قال العراقي فى التخريج الكبير: رواه بريدة بن الخطيب و عبدالله بن عمر. أما حديث بريده فرواه أبو داود و الترمذى والنسائي في الكبرى، وابن ماجن و رواية الترمذى رجالها رجال الصحيح، و إسناد النسائى و ابن ماجة أيضا صحيح. اهـ . قلت و رواه الحاكم فى المستدرك ١٠١/٤/٧٠١٢، و صححه. قال الذهبي: العهدة عليه ثم قال العراقي: وأما حديث ابن عمر فرواه الطبراني في الكبير[كما فى جامع الأحاديث للسيوطي] (٣٨٦/٥(١٥٥٠٤) وإسناده جيدو رجالەرجال الصحيح.

(٢) (مەناوی) فەرمـوویەتی: پـلەی دادوەری زۆر بەرزو پـیرۆزە، بەڵام ئەوەی لە ڕاستی لای داو مەیلی لای باطیڵ بوو، وە ستەمی دەکرد ئەوە لە ئاگردا دەبێت، ئەوەش بە ڕاستی حوکمی کردو شوێن هەواو ئارەزوات نەدەکەوت ئەوە ئەهلی بەهەشتە. موفتی لە قازی باشترە، چونکە فتوای موفتی ئیلزامی نی‌یە کە پێویست بێت پابەندی لێ بکرێت، بەڵام فتوای قازی پێویستە بەگوێی بکرێت و پابەندی لێ بکرێت(٣٧٥/١) الإتحاف.

دەژیان و دەیانخوارد، نزیکییان لە دەوڵەمەندەکان دەکرد نەك لە هەژارەکان، چۆن ژنان غیرە لە پیاوەکانیان دەکەن و(نایانەویت لە هیچ ئافرەتێك نزیك بنەوەو بیانناسن، نەوەکو مەیلی خواستیان هەبێت لێیان) ئاوا ئەو زانایانەیش لەگەڵ زانستدا جۆر نین و سڵی لێ دەکەنەوە و غیرەی لێ دەکەن، بەشێوەیەك کە ئەگەر یەکێکی هاونیشینیان لە مەجلیسی زانایەکی تر دابنێشێت، رِقی لێ هەڵدەگرن و لێی تورِە دەبن[1] ئەوانە کە شانازی بە زانستەوەدەکەن و غیرەش لە زانست دەکەنەوە، وەك دەستەڵاتدارە ملهورِەکان و دوژمنانی خودا حیسابیان بۆ دەکرێت. وە لە پێغەمبەریانەوە ﷺ گێرِاوەتەوە کە فەرموویەتی: **((إن إلشَّيطانَ ربما يُسَوِّفُكُم بالعِلمِ، فقيلَ يا رَسولَ الله، وكيفَ ذلك؟ قال ﷺ: يقولُ اطلبِ العلمَ ولا تَعمَلْ حتى تَعْلَمَ، فلاَ يَزال للعِلْم قائلاً وللعَمَلِ مُسَوِّفاً حتىَّ يَمُوتَ وَما عَمِلَ))**[2]

بەراستی زۆر لەوانەیە کە شەیتان لە زانستدا پێشتان بداتەوە، بەوەی کە ئەمرِۆو سبەیتان پێ دەکات، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوداﷺ: چۆن شەیتان پێشمان دەداتەوە؟ فەرمووی:

---

(١) قوت القلوب ١/١٤٠.

(٢) أخرجه الخطيب في [ الجامع لأخلاق الراوي ص٨٩(٣٠) ] من حديث أنس بسند ضعيف [قال الزبيدى: أورده صاحب القوت، ٢٨٨/١، قال العراقي في التخريج الكبير، أخرجه الخطيب في كتاب الجامع لآداب الراوى و فيه عمر بن عبدالجبار. ذكره ابن عدى فى الكامل، ١٤١/٥(١٣٠٢) و أورد له أحاديث، وقال: كلها غير محفوظة. و الراوي محمد بن المغيرة. أورده الذهبي في الميزان ٣٤٤/٦، و قال روى خبرا باطلا]. کەواتە شەیتان لەو هاندانەی بۆ فێربوونی زانستی و لەو دواخستنەیشی بۆ کار پێ کردنی، مەبەستی ئەوەیە بیکات بە زانایەکی گومرِا و، تا ئایەتەکەش بیگرێتەوە کە لەسەر زانستەوە گومرِا بوویێت( و **أضله الله على علم**) پەنا بەخوا.

شەیتان دەڵێت: بەدوای زانستدا بگەڕێ، بەڵام تا بەتەواوی فێر نەبیت کاری پێ مەکەو بەدوای جێبەجێ کردنیدا مەگەڕێ، بەردەوام هانیان دەدات بۆ فێربوونی زانستی، بەڵام بۆ کار پێکردنی ئەمرۆ و سبەینێ یان پێ دەکات (دەڵێت گرنگ فێربوونە، دوایی کاری پێ دەکرێت) تاوای لێ دێت کابرا دەمرێت و هێشتاکاری بە عیلمەکەی نەکردووە.

سەری سەقەطی( ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمویەتی:[1]

پیاوێك خۆی کەناردا بۆ بەندایەتی کردن و لەخەڵکی دوورکەوتەوە، کە پێشتر زۆر سوور بوو لەسەر دەستخستنی زانستیی‌یە ڕواڵەتیەکان، پرسیارم لێ کرد چۆن وازت لە عیلم هێناو(ئێستاش خەڵوەی بەندایەتی دەکێشیت)؟ فەرمووی: یەکێك هاتە خەوم و پێی ووتم: تاکەی ئەو عیلمە زایە دەکەیت و کاری پێ ناکەیت خودا زایەت بکات! ووتم: خەریکم بەلەبەرکردن و تەواو فێربوونی، فەرمووی: لەبەرکردنی زانست کارپێکردنیەتی، ئیتر منیش وازم لە خۆ فێرکردنی زیاتر هێناو ڕوم کردە کارپێکردن و بەندایەتی.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود فەرموویەتی:

(( **لیسَ العِلمُ بکَثرَةِ الرّوایةِ، إنَّما العِلمُ الخَشیَة**))[2] (واتە: زانست بەوە دەستناکەوێت کە زۆر شت بگێڕێتەوە و قسەی لەسەر بکات، بەڵکو چەند زیاتر خۆف و ترسی خودای لە دڵدا بێت، ئەوە زیاتر زانابیەکەی دەردەخات).

حەسەنی بەصریش فەرموویەتی: چەندێك ئارەزوتان لێیەتی فێربن و خۆتان فێری زانست بکەن، سوێند بەخودا خودا پاداشتان ناداتەوە تاکاری پێ نەکەن، چونکە نەفامە کەم ئەقڵەکان تەنها بەدوای کۆکردنەوەی ڕیوایەتەکاندا

---

(١) قوت القلوب ١/١٣٣.

(٢) رواه أحمد في (الزهد)) (٨٦٨) وقال الزبيدي: ١/٣٧٧، أخرجه أبو نعيم في الحلية(١/١٣١).

دەگەڕێن، بەڵام زاناکان هەوڵ و هیممەتیان بۆچاودێری کردنی زانستەکانیانە.[1]

مالیك(ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی:

بەڕاستی گەڕان بەدوای عیلم دا جوانەو چاکەیە، بڵاو کردنەوەیش کارێکی باشە بەمەرجێك نیەتی پاك و دروست بێت لە بڵاو کرددنەوەکەیدا، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە: کە لە گزنگی بەرەبەیانەوە تا کاتی خۆرئاوا سەیربکە بزانە:

چی پێویستە لەسەرت کەپابەندی لێ بکەیت ئەوە بکەو هیچ کارو شتێکی تری پێش مەخە.[2]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش( خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

بۆیە قورئان دابەزێنراوەتە خوارەوە تاکاری پێ بکرێت، ئێوە وادەزانن تەنها فێری ببن و توێژینەوەی لەسەر بکەن ئەوە کارتان پێ کردووە، کۆمەڵێك دوای ئێوە پەیدا دەبن، ڕێکی دەخەن و پیتەکانی بە جوانی دەردەبڕن، وەك ئەو ڕمەی کە تیرەنداز بەڕێکی ئامانجەکەی دەپێکێت، ئەوانە باش و هەڵبژێرراوانی ئێوە نین، ئەو زانایەی کە کار بە عیلمەکەی ناکات، وەك ئەو نەخۆشەیە کەدەرمان دیاری دەکات بۆ نەخۆش و خۆی بەکاری ناهێنێت، یان ئەو برسییەی کە خۆراکی بە تام و چێژ ئەنوێنێت و وەصفی دەکات و دەستی ناکەوێت، لە

(١) قال الحافظ الزبيدي: ٣٧٧/١ الشطر الأول منه روى مرفوعا، من حديث معاذ، أخرجه أبو نعيم في الحلية، ٢٣٦/١، و الخطيب في الإقتضاء ص ٢٠(٧). والشطر الثاني أخرجه الخطيب في الإقتضاء ص ٣٥(٣٩) بلفظ: **همة العلماء الرِعاية، وهمة السفهاء الرواية**، و أخرج في الكتاب المذكور ص ٣٤،(٣٨) من طريق صالح بن رسم قال: قال أبو قلابة لأيوب، **يا أيوب: لا تكونن، إنما همُك أن تحدث به الناس**، وفي القوت ٢٧٢/١. وقد كان الحسن يقول: **إن الله لا يعبأ بصاحب الرِواية، إنما يعبأ بصاحب فهم و دراية**، و قال أيضا: **من لم يكن له عقل يسُوسه لم تنفعه كثرة** رواية الحديث.

(٢) ما رواه الأكابر عن مالك(٣٧) و انظر قوت القلوب ١٣٥/١، و حلية الأولياء ٣١٩/٦.

نمـونەی ئەمـانەیە کە خودای گەورە فەرموویەتی:

((وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ))الأنبياء(١٨).

(واتە: وەیل و خەسارەتمەندی بۆ ئێوەیە، کە وەصفی شت بۆ کەسانی تر دەکەن و شتیان دەخەنە بەرچاوو، خۆتان کاری پێ ناکەن). لە فەرموودەدا هاتووە: ((مِماً أخافُ علَى أمَّتي زَلَّةُ عالِمٍ، وجِدالُ مُنافِقٍ في القُرآن))[1] ئەوەی جێگەی مەترسی‌یە لەسەر ئوممەتەکەم و ئەمترسێنێت: هەڵەو گوناهی عالمێکە کە خەڵکی شوێنی دەکەوێت، وە قسەو موجادەلەی مونافق و دوڕووەکانە لەسەر قورئان، واتە: بێ ئەوەی باوەڕیان پێ‌ی هەبێت قسەیشی لەسەر دەکەن.

---

(١) أخرجه الطبراني في(( مسند الشاميين))(٢٦٤/٣)(٢٢٠) من حديث أبى الدرداء و لإبن حبان في صحيحه ٢٨١/١(٨٠) نحوه، من حديث عمران بن حصين [ قال الزبيدي ٣٧٧/١. قال العراقي في التخريج الكبير: فيه عن أبى الدرداء و معاذ، و عمر، و علي، و عمران بن الحصين. أما حديث أبو درداء فرواه الطبراني في معجمه الصغير ١٨٦/٢(١٠٠١) والأوسط ٣٤٢/٦ (٦٥٧٥) من رواية عبدالرحمن بن أبى ليلى عنه رفعه و رواه في الأوسط ٣٠٧/٨(٨٧١٥) من رواية عمر و بن مرة عن معاذ، و عمرو بن مرة لم يسمع عن معاذ. و ذكره الدار قطني في العلل ٨١/٦(٩٩٢) من رواية عبدالله بن سلمة، عن معاذ رفعه، و اعلن إبن الجوزي في ( العلل المتناهية) ١٣٩/١(٢٠٢) برواية المذكور، قال الدار قطنى وقد وقفه شعبه عن عمر بن مرة – يعني: على معاذ – قال: والوقف هو الصحيح، و أما حديث عمر رواه أحمد فى مسنده ١٤٤- ٣١٢ من رواية أبى عثمان المهدي عنه، وقد ذكره المصنف فيما تقدم مرفوعا على عمر. قال الدارقطني في العلل ٢/(٣١٢)والموقوف أشبه بالصواب،قلتُ حديث هذا رواه عبد بن حميد في مسنده، ص٣٢(١١) مرفوعا. ورواه الحارث ابن أبى أسامة في مسنده ٥٣٤/١(٤٦٦) بسند صحيح ثم قال العراقي: وأما حديث علي رواه الطبراني في الصغير (٢/٢٠٠(١٠٢٤)، والأوسط ١٢٨/٧ (٧٠٦٥) من رواية الحارث الأعور عنه رفعه بنحوه، وقال لايروى عن علي إلا بهذا الإسناد و الحارث الأعور ضعيف قلت: لاكن وثّقه ابن حبان في الثقات ١٢٧/٤(٢١٢٣). قال العراقي: وأما حديث عمران بن حصين فقد رواه ابن حبان في صحيحه ٢٨١/١. من رواية عبدالله ابن بريدة رفعه. وانظر إلى تفصيل أكثر: الأتحاف ٣٧٧/١.

**یەکێکی تر لە نیشانە جیاکەرەوەکانی زانایانی ئاخیرەت لە زانایانی دونیا:**

## بەدوای زانستی سوودبەخشدابگەڕێت
## کە بۆ دوارۆژی بە کەڵکی بێت

دەبێت زیاتر هەوڵدانی بۆ وەدەستهێنانی زانستێکی سوود بەخش بێت بۆ دوارۆژی، کە ئارەزوی بەلای بەندایەتیدا ڕابکێشیت، خۆی لەو زانستانە بپارێزێت کە سوودیان کەمەو، زیاتر پڕیانە لە قسەو موجادەلەو ووتی خەڵکی.

نمونەی ئەو کەسەی کە پشت لەو زانستانە دەکات، کە کاری تەقواکاری فێردەکەن و ئەویش ڕو لە دەمە دەمێ و موجادەلە دەکات، وەك ئەو نەخۆشە وایە کە چەندین دەردو نەخۆشی زۆری پێوە بێت، ڕێی کەوتبێت لە دکتۆرێکی شارەزاو لێزان، لە کاتێکی ناوەخت و بەرتەنگی دا، کە ترسی هەبێت لە دەستی دەربچێت، بەڵام لە جیاتی ئەوەی کە لەم ماوە کورتەدا مەبەست و خواستە گرنگەکانی خۆی و چارەسەری نەخۆشیەکانی لێ بپرسێت، خۆی و ئەویش سەرقاڵ بکات بەهەندێك باسی لابەلا، وەك:

تایبەتمەندی دەواو دەرمانەکان و، نهێنیەکانی زانستی پزیشکی، کە ئەمە بۆ خۆی ئەو پەڕی نەفامی و بێ ئەقڵیە.

دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و عەرزی کرد:

فێرم بکە لە و بابەتە ناوازەو دانسقانەی لەنێو زانستدا هەیە:

فەرمووی:

**((ما صَنعتَ في رأس العِلمِ؟ فقالَ ومَا رأسُ العِلمِ؟ فقال ﷺ هَل عرفتَ الرَبَّ تَعالى؟ قالَ نَعَم، قالَ فمَا صَنَعتَ في حَقِّهِ؟ قالَ ما شَاءَ الله، فقالَ ﷺ هَل عَرَفْتَ المَوتَ؟ قالَ نَعَم، قالَ فَما أَعدَدْتَ لَهُ؟ قالَ ما شاءَالله!**

**قال ﷺ اذهَب فأَحْكِمْ ما هُناكَ، ثُمَّ تَعَالَ نُعَلِّمُكَ مِنْ غَرائِبِ العِلْم))**[1] واته: (پێغەمبەرﷺ: لێی پرسی: چیت کردووە بەرامبەر لوتکەی زانست و زانیاری، ووتی سەرلوتکەی زانست چی یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئایا خودای گەورەت ناسیوە؟ ووتی: بەڵێ،

فەرمووی ﷺ: دەی چیت کردووە بەرامبەر بەو ناسینە؟

ووتی: ئەوەندەی خودا ئارەزوی لێ بووبێت،

لە پاشان صەڵات و سەلامی خودای لێ بێت، فەرمووی: ئایا زانیوتە مردن هەیە و چی یە؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی ﷺ: دەی چیت بۆ ئامادە کردووە؟

ووتی: ئەوەندەی خودا ئارەزوی لێ بێت،

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: برۆ ئەو زانیاریانەو کار پێ کردنیان بتەووقایم بکە، لە پاشان وەرەوە فێری زانستە غەریب و دەگمەنەکانت دەکەم.

بەڵکو پێویستە فێربوونی ڕاستەقینە لە ڕەگەزو وێنەی ئەو جۆرە فێربونەبێت کە حاتەمی ئەصەم دەیگێڕێتەوە کە شاگردی شەقیقی بەڵخی بووە(خودایان لێ ڕازی بێت) کە جارێکیان شەقیق پێی فەرموو:

ماوەی چەندێکە تۆ ڕەفاقەتی ئێمەت کردووە؟

حاتەم فەرمووی: ماوەی سی و سێ ساڵە( لەخزمەتتا بووم).

---

(١) أخرجه ابن السني و أبو نعيم في (الحلية) ١/٢٤، في كتاب الرياضة لهما و ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله ٢/٥(١٢٢) من حديث عبدالله بن مسور مرسلا، وهو ضعيف جدا. [قال الزبيدي: ١/٣٧٩: قال العراقي في التخريج الكبير هو مرسل ضعيف جدا، قال ابن أبي حاتم في الجرح و التعديل ١٦٥/٥، عبدالله بن مسور الهاشمي سألت عنه فقال الهاشميون لايعرفونه، وهو ضعيف الحديث، يحدث بمراسيل لايوجد لها أصل في أحاديث الثقاة، وقال أحمد بن حنبل في العلل: ١/٣٤٥(٦٣٦): أحاديثه موضوعه كان يضع الحديث ويكذب. اهـ. قلت: وفي المغني للذهبي١/٣٥٨(٣٣٧٢) عبدالله بن مساور تابعيٌ مجهول]

فەرمووی: کەواتە لەم ماوە زۆرەدا چی لەمنەوە فێربویت؟

فەرمووی: هەشت پرس و مەسئەلە فێربووم،

شەقیق فەرمووی: **إنا لله و إنا اليه راجعون!**

**هەموو تەمەنم لەگەڵ تۆدا سەرفکرد، هیچ فێرنەبوویت تەنها ئەو هەشت** پرس و بابەتە نەبێت؟! حاتەم فەرمووی: ئەی مامۆستا، جگە لەوانە هیچی تر فێرنەبووم، وەمن حەزم لەدرۆکردن نی یە.

**فەرمووی: دەی ئەو هەشت بابەتەم بۆ باس بکە بابیانبیستم.**

**حاتەم فەرمووی:**

**یەکەمیان:** ڕوانیم بۆ ئەو خەڵکە، بینیم هەر یەکێکیان خۆشەویستێکی بۆ خۆی دیاریکردووەو، لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەڕون تا لای گۆڕ، کەگەیشتنە سەر قەبرەکە لێی جیادەبنەوە، منیش ووتم با چاکەکانم بکەمە خۆشەویستی خۆم، ئەگەر چوومە ناو گۆڕەکەیشمەوە ئەوا لێم جیانابێتەوەو لەگەڵمدا(خۆشەویستەکەم) دێتە ژورەوە.

فەرمووی: ئەی حاتەم جوانت ووت، دووهەمیان چییە؟ فەرمووی:

**دووهەمیان:** سەرنجی فەرمایشتێکی خودام دا کە دەفەرمووێت:

﴿**وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى، فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى**﴾النازعات(٤٠-٤١).

ئەوەی لە پایەو شکۆو مەقامی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت، جڵەوی نەفسی لەهەواو ئارەزواتی نەفسی گرتبێتەوە، بێ گومان جێگای حەوانەوەی تەنها لە بەهەشتدادەبێت، بۆم دەرکەوت تەنها فەرموودەی خودای گەورەیە کە ڕاستە، منیش کۆششی تەواوم کرد و هەوڵی تەواوم لەگەڵ نەفسمدادا، کە هەواو ئارەزواتی لێ دووربخەمەوە، تاوای لێ هات لەسەر گوێڕایەڵی و بەندایەتی خودا ئارام و خۆڕاگربێت.

**سێیەم:** من بەڕاستی سەیری ئەو خەڵکەم دەکرد، بینیم هەر کەسێك شتێکی بەنرخ و نایابی لەلا بێت بەرزی دەکاتەوەو دەیپارێزێت، منیش سەرنجم دا لە فەرموودەی خودای گەورە ﷻ:﴿ **مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ** ﴾ النحل(٩٦). واتە: (ئەوەی لای ئێوەیە با هەڵیشتان گرتبێت، ئەوا هەر بەرەو کۆتا دێت، ئەوەش کە لای خودا داتان ناوە دەمێنێتەوە و پارێزراو دەبێت).

منیش هەرکاتێك شتێکی بە نرخ و بەهادارم دەسکەوتبێت،(لای خۆم هەڵم نەگرتووە ، بەڵکو داومە بە خودا، بۆ ئەوەی لەخزمەت ئەودا بۆم بمێنێت و بیپارێزێت.)

**چوارەم:** بەڕاستی من سەیری ئەو خەڵکەم دەکرد، سەیرم کرد هەریەکێك لەو خەڵکە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ و سامانی، یان حەسەب و شەرەف و نەسەب و ڕەچەڵەکی خۆی، سەیری ئەم پەنابردنەیانم کرد کە هیچ بەهایەکی لای من نەبوو، وەڕوانیم بۆ فەرموودەی خودا عزَّوجَلَّ
﴿ **إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ** ﴾ الحجرات(١٣). منیش هەوڵمداوە کە کارەکەم تەنها بۆ خۆ پارێزی و تەقواکاری بێت، تا لای خودا بە ڕێز لێگیراوی بمێنمەوە.

**پێنجەم:** سەیرێکی ئەو خەڵکەم کرد، هەریەکە تانەو تەشەر لەوی تر دەدات، نەفرەت و نەعلەت لە هەندێکی تر دەکات، سەرچاوەی ئەم هەموو بەیەکا هەڵگژانە، ئیرەیی و حەسادەت بردنە، لە پاشان سەرنجی فەرموودەیەکی خودای بەدەستەڵاتم دا کە فەرموویەتی:

﴿ **نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا** ﴾ الزخرف (٣٢)

ئێمە ژیان و بژێوی ژیانمان بەسەردا دابەش کردوون، ئیتر وازم لە حەسادەت بردن هێنا و، ئیرەییش بە کەس نابەم و لەو خەڵکەیەیش دوورکەوتمەوە، دڵنیام کە بەشی من و هەموو کەس لە لایەن خودا خۆیەوە دیاری کراوە، ئیتر وازم لە دوژمنایەتی خەڵکی هێناو( بە ئاسوودەیش دەژیم).

**شەشەم:** سەرنجی ئەو خەڵکەم دا هەندێکی دەستدرێژی دەکاتە سەر هەندێکی تر، هەندێکی لەگەڵ هەندێکی تر شەڕ دەکات، منیش گەڕامەوە بۆ ئەو فەرموودەیەی خودا ﷻ

﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ فاطر(٦).

(بەڕاستی شەیتان دوژمنی سەرسەختی ئێوەیەو، ئێوەش بیکەنە دوژمن و نەیاری خۆتان) منیش تەنها دوژمنایەتی شەیتانم کرد، هەوڵ و کۆششی تەواوم دا تا خۆمی لێ بپارێزم، چونکە خودای گەورە شایەتی لەسەر داوە کە ئەو دوژمنی منە، ئیتر وازم لە دوژمنایەتی خەڵکی هێناو، تەنها خۆم بە دوژمنایەتی ئەوەوە خەریك کردووە.

**حەوتەم:** سەرنجی ئەو خەڵکەم دا، هەر یەکێك ئەوداڵی پارچەیەك نانە دەستی بکەوێت، خۆیی بۆ زەلیل و ژێر دەستە دەکات، سەری خۆی دەکات بەو شوێنانەشدا کە بۆی حەڵاڵ نەبێت، لە پاشان سەرنجم لەو فەرموودەی خودای گەورە ﷻ دا:

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا ﴾هود(٦).

واتە: ( ئەوەی بە سەر زەوی دا بڕوات، ڕزق و بژێوییان لەسەر خودایە کە بیانژێنێت، زانیشم کە من بۆ خۆم یەکێکم لەوانەی بەسەر زەویدا دەڕۆم، ئیتر خۆم بەوشتانە خەریك کرد، کە مافی خودایە بەسەرمەوە جێ بەجێیان بکەم، وازم لەوە هێنا کە مافی منە لای ئەو. (چونکە بۆ خۆی کەفالەتی کردووە).

**هەشتەم:** سەرنجی ئەو خەڵکەم دا، بینیم هەموویان پشتیان بە دروستکراوێکی خودا بەستووە، ئەوەیان پشتی بە گوند و دێ و زەوی و زارەکەی بەستووە، ئەوی تریان پشتی بە بازرگانی بەستووە، وەهەموو دروستکراوێکی خودا پشتی بە دروستکراوێکی تر بەستووە، منیش گەڕامەوە بۆ فەرموودەیەکی

خودای گەورە: ﴿ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ﴾الطلاق(٣)

( ئەوەی تەنها پشت بەخودا ببەستێت ئیتر ئەو بەسیەتی و پێویستی بە کەسی تر نییە)، منیش تەنها پشتم بە خودای گەورە بەستووەو، ئەو بەسمەو پێویستم بە مەخلوقاتی تر نی‌یە. **شەقیق فەرمووی:**

ئەی حاتەم: خودا سەربەرزو ڕاگیرو ڕاوێستاوت کات، منیش سەرنجی هەموو زانستەکانی ناو تەورات و زەبور و ئینجیل و قورئانی گەورە و پیرۆزم داوە، بۆم دەرکەوتووە کە کۆی هەموو جۆرەکانی خێر و چاکە و دینداری، هەمووی لە چواردەوری ئەم هەشت پرسەدا جێگایان دەبێتەوە، هەر کەسێك ئەم هەشتە بەکار بهێنێت و جێ بەجێیان بکات، کەواتە هەموو چوار کیتابە ئاسمانیەکانی بەکارهێناوە و جێبەجێی کردوون[1]

ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە زانست، تەنها زاناکان بە عیلمی ئاخیرەت گرنگی پێ دەدەن و، بەوردبینی سەرنجی دەدەن و هەستی پێ دەکەن، بەڵام زاناکانی ئەهلی دونیا خۆیان سەرقاڵی ئەو شتانەدەکەن کە بۆیان دەگونجێت، لە کەسابەت و پەیداکردنی ماڵ و جاهو شکۆی دونیایی، وە کەمتەرخەمن بەرامبەر بەم زانستانە، کە هەموو پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر) بەو زانستیانە ڕەوانە کراون.

ضەحجاکی کوری موزاحیم فەرمویەتی:

من بە خزمەت ئەو زانایانەی (ئەهلی ئاخیرەت) گەیشتم، ئەوەی لەیەکتری فێردەبوون تەنها وەرع و خۆپارێزی بوو، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لەیەکتری فێردەبن تەنها قسەکردن و قسەبەزۆراندانە.[2]

---

(١) رواه أبو نعيم في حلية الأولياء(٧٩/٨) بنحوه.

(٢) قوت القلوب (٩٦/١).

### یەکێکی تر لە جیاکاریەکانی زانایانی ئاخیرەت لەگەڵ ئەهلی دونیادا:

## نەکردنی زیادەڕەوی لە خۆراك و خواردنەوە دا

دەبێت مەیلی دڵی بەلای زیادەڕەوی لە خۆراك و خواردنەوە دانەبێت، وە حەز نەکات بە خۆڕازاندنەوە، بەبەرگ و پۆشاك و جوانکاری لە کۆشک و ڕایەخ و ناوماڵ.

بەڵکو لە هەموو ئەم بوارانەدا ڕێگای مامناوەندی هەڵبژێرێت و، وەك سەلەفی صالحین وابێت(ڕەحمەتی خودا لە هەموویان). دەبێت دورکەوێتەوە لە زیادە مەسرەف و بەکەمترین شێوە لە هەموو جۆرەکاندا پێی ڕازی بێت، هەرچەندێك مەیلی دڵی بەلای کەمیی یەکێ لەم نیعمەتانەوە زیاتر بکات، زیاتر نزیك دەبێتەوە لە خوداوە و، پشکی لەناو تاقمی زانایانی ئاخیرەتدا بەرزتر دەبێتەوە.

ئەوەی گەواهی لەسەر ئەم ڕاستیە دەدات، ئەوەیە کە دەگێرنەوە لە ئەبوعەبدوڵلای خەوواص کە لە هاوڕێکانی حاتەمی ئەصەم بووە فەرموویەتی:

لەگەڵ حاتەم دا چوینە شاری(ڕەی)[1] سێ صەدو بیست پیاو بوین، ڕێگەی حەجمان گرتبویەبەر، هەموو بەرگ و جوبەی خوریان پۆشی بوو، پشت بە خودا لەسەفەردا بووین، بەبێ ئاو وکوندەو خۆراك، لاماندا لای پیاوێکی بازرگانی دونیا نەویستێکی عابیدی هەژاری خۆشەویست، ئەو شەوە میوانداری کردین، بۆ سبەینێ ئەو کابرا ووتی بە حاتەمی ئەصەم:

ئەگەر کارێکتان نەبێت، من دەمەوێت سەردان و عیادەی زانایەکی خۆمان بکەم کە نەخۆشە، حاتەم فەرمووی: سەردانی نەخۆش فەزڵ و چاکەی خۆی

---

(١) گەورەترین شاری خوراسان بووە.

هەیە، وەسەیرکردنێکی زانا و فەقیهێکیش بۆ خۆی عیبادەتە، منیش لەگەڵتدا دێم، نەخۆشەکەیش(قازی شاری ڕەی) موحەمەدی کوری موقاتیل بوو، کاتێك گەیشتنە بەردەرگاکەیان، وەك رۆژ پرشنگی دەدا، حاتەم زۆر بیری کردەوە و دەیووت: دەرگای زانایەك و لەسەر ئەم حاڵە؟!

قازی رێگەی پێ دان چوونە ژورەوە، سەیریان کرد خانوەیەکی بەرفراوان و نایاب و، بەرگ و پۆشاکی جوان و، هەموو ناز و نیعمەتێکی ڕازاوەی تێدابوو، حاتەم ماوەیەکی باش لە بیرکردنەوەدا بوو، کە ڕۆیشتنە ژورەوە ڕاخەرێکی نەرم و نیانی بینی لە ژورەکەی(قازی) دا ڕاخرابوو، شانی لەسەری دادابوو، غوڵامێك بەسەر سەریەوە بوو، باوەشێنێکی بەدەستەوە بوو، بازرگانە میوانەکە لای سەری قازیەکەوە دانیشت، حاتەمیش بەپێوە بوو( ئیبن و موقاتیل) هێمای بۆ کرد دابنیشێت، فەرمووی: دانانیشم، ووتی:

لەوانەیە کارێکت هەبێت؟ فەرمووی بەڵێ: ووتی کامەیە بیڵێ، فەرمووی پرسیارێکت لێ دەکەم، ووتی پرسە، فەرمووی هەڵسەو رێك دابنیشە با پرسیارەکەت لێ بکەم، ئەویش هەستاو خۆی کۆکردەوە.

حاتەم فەرمووی: زانستەکەت لە کوێ وەرگرتووە؟ ووتی:

لە متمانە پێ کراوەکانەوە کە بۆیان باس کردووم و هەواڵیان پێ داوم، فەرمووی لە کێوە؟ ووتی لە صەحابەکانی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)، فەرمووی: ئەی صەحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە کێوە وەریان گرتووە؟

ووتی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ؟

ووتی لە جوبرەئیلەوە (سەلامی خودای لەسەر) ئەویش لە خوداوە (پاك و بێ گەردی بۆ خودا).

حاتەم فەرمووی:

لەو هەواڵانەی کە جوبرەئیل(سەلامی خودای لەسەر) گەیاندنی لە خودای

گەورەوە بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیاندی‌یە ئەصحابەکانی، وە صەحابەکانیش بۆ متمانەپێکراوەکان، وە متمانە دارەکانیش گەیاندیان بە تۆ، ئایا بیستوتە لە یەکێك لەو هەوالانە کە بڵێت: هەر کەس لە خانوەکەیدا فەرمانڕەوابێت و فراوانی خانوەکەی ئەوەندە زۆر بێت، ئەوە گەورەترین مەنزڵ و مەقامی لای خودا بۆ دانراوەو پێی دەدرێت؟

ووتی: نەخێر، فەرمووی ئەی چۆنت بیستوە؟ ووتی بیستومە:

هەر کەسێك لە دونیادا ژیانی دونیا نەویستی هەڵبژێرێت ، وە حەزی لە ژیانی ئاخیرەت بێت، و هەژارەکانی خۆش بوێت، وە ئەو چاکانەیشی پێش خۆیدا بێت بۆ پاشەڕۆژی ئەو کەسە مەنزڵ و مەقامی بەرزی لای خودای خۆی هەیە.

حاتەم فەرمووی:

دەی تۆ پێم بڵێ: چاوت لە کێ کردووە، ئایا لە فیرعەون و نەمرود، کە یەکەم کەس بوون خانوویان بە گەچ و خشتی کورەی ئاگرین دروست کرد؟!

ئەی زانا ڕەفتار خراپەکان! نمونەی ئێوە، ئەگەر کابرایەکی نەزانی دونیا ویستی هەڵپەکار بەسەر دونیاوە، کە بەم شێوەیە تۆ ببینێت دەڵێت:

کە زاناکانمان لەسەر ئەم حاڵەتی ڕەفاهییەت و خۆش گوزەرانی‌یە دابن، خۆ من لەو خراپتر نابم! ئیتر حاتەم ئەم قسانەی بۆ کردوو لە لای هاتە دەرەوە (ئیبن و موقاتیلیش) ئەوەندەی تر نەخۆشیەکەی لێی توند کرد.

ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی شاری(ڕەی) کە چی ڕوی داوە لەمیانی ئەوو ئیبنوموقاتیل‌دا، بۆ یە پێیان ووت: لە شاری(قەزوین) قازی ئەو شارە (طەنافیسی)[1] زۆر دەست بڵاوترەو زیاتر لەخۆشیدا دەژی، حاتەمی ئەصەم

---

(١) قەزوین ٢٧ فەرسەخ دورترە لە ڕەی. ئەو قازیەش بەرگی فرۆشتوە خۆی یان براکانی بەو ناوەناوبانگی دەرکردووە، ناوی موحەمەدی کوڕی ئەحدەب بووە، الإتحاف: ٣٨٣/١.

بەڕاستەوخـۆیی بۆ ئامۆژگـاری کـردنی ئەو زانایە ڕوی کردە شـارەکەی و چووە ژوورەوەو پێی ووت:

ڕەحمەتی خودات لێ بێت، من پیاوێکی بیانیم، حەزم لێیە بنەماکانی ئاین و کلیلی نوێژکردن و چۆنیەتی دەستنوێژم فێربکەیت.

ووتی: بەڵێ بەڕیزەوە، بانگی کرد ئەی غولاَم، دەفرێکم بۆ بهێنە ئاوی تێدابێت، بۆیان هێنا،( طەنافیسی) دانیشت و سێ جار سێ جار دەست نوێژی شت و وتی ئاوا دەبێت، حاتەم فەرمووی:

لە شوێنی خۆتدابە با منیش دەستنویژێ بەبەر چاوتەوە بگرم زیاتر بۆم دوپات دەبێتەوەو شارەزای دەبم، ئەو هەڵساو لە جێگەکەی دەست نوێژێکی گرت، تا گەیشتە باڵەکانی، چوار جار چوار جار شۆردنی، طەنافیسی ووتی:

ئەی کابرا زیادە ڕەویت کرد، حاتەم فەرمووی: لە چیدا؟

ووتی: چوار جار باڵت شۆرد، حاتەم فەرموی:

**یا سبحان الله العظیم!**

پاك و مونەززەهی بۆ خودای گەورەو مەزن! من لە مشتە ئاوێکی زیادەدا بەکارم هێنا زیادەڕویم کرد، تۆ لە هەموو ئەو زیادە مەسرەفانەدا زیادەڕەویت نەکردووە؟!

(طەنافیسی) زانی کە ئەم دەرسەی مەبەست بووە، نەك فێربوونی دەست نوێژ، چووە ناو ماڵەکەی و چل ڕۆژ نەهاتە دەرەوە. کاتێك حاتەم چووە ناو شاری بەغدا، ئەهلی بەغدا لە دەوری کۆبوونەوەو پێیان ووت:

ئەی باوکی عەبدورڕەحمان؛ تۆ پیاوێکی(توری) زوبانت قسەکانت دەگرێت، کە چی لەگەڵ هەرکەسێکدا ڕوبەڕوی ببیتەوە زاڵ دەبیت بەسەریدا هۆی چییە؟

**فەرمووی: سێ خەصڵەتی تایبەتیم هەیە، بەهۆی ئەوانەوە سەردەکەوم**

**بەسەر خەصمەکەمدا:**

ئەگەر ڕاستی لەسەر زوبانی بەرامبەرەکەم دەربکەوێت خۆشحاڵ دەبم.

وە ئەگەر ڕاکەی ئەو هەڵە دەربکەوێت خەفەتبار دەبم.

وە خۆم دەپارێزم لەوەی کە بە نەزاندوویی قسەی لەگەڵ بکەم.( بەڵکو بەوریاییەوە قسەی لەگەڵ دەکەم) .

ئەم بابەتە گەیشتە لای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل( خودای لێ ڕازی بێت)

فەرمووی: سبحان الله ! چەند پیاوێکێ دانایە، هەڵسن با بڕۆین بۆ لای.

کاتێك چوونە لای حاتەم فەرمووی:

ئەی باوکی عەبدوررەحمان؛ بەچی سەلامەت دەبیت لە دونیادا؟ فەرمووی:

ئەی باوکی عەبدوڵلا ... لە دونیادا دەرباز نابیت تا چوار صیفەتی چاکەت تیانەبێت: ئەبێ لێ بوردەبی بەرامبەر نەزاندویی خەڵکەکە، هەوڵیش بدەیت ڕیگری نەزانیەنەکەیان بکەیت و فێریان بکەیت، وە ئەوەش کە خودا پێی داوی لە ماڵ بۆیان سەرف بکەیت، وە هەرگیز تەماحیشت نەبێت لەوەی کە لەدەستی ئەواندایە. ئەگەر بەم شێوەیە بیت لەگەڵیاندا سەلامەت دەبیت لە دەستیان.

لە پاشان حاتەم بەڕێکەوت بۆ مەدینە، ئەهلی شاری مەدینە پێشوازیان لێ کرد، فەرمووی ئەی خزمان ئەمە چ شارێکە؟ ووتیان:

شارەکەی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، فەرمووی:

ئەی کۆشکەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێدایە تا نوێژێکی تیا بکەم؟

ووتیان هیچ کۆشکێکی نەبووە، تەنها خانوەیەکی بووە بە ئەرزەکەدا لکابوو! فەرمووی: ئەی کوا کۆشك و تەلاری صەحابەکان.(خودایان لێ ڕازی بێت) ووتیان:

ئەوانیش کۆشکیان نەبووە، تەنها خانوویەکیان بووە لەسەر زەوی و بەنزمی.

حاتەم فەرمووی: ئەی خەڵکینە؛ کەواتە ئەمە شاری فیرعەونە!

ئەوانیش هەڵیان گرتوو بردیان بۆ لای دەستەڵاتداری شار، ووتیان: ئەم کابرا بیانی‌یە دەڵێت ئەمە شاری فیرعەونە، والی مەدینە ووتی: بۆچی وات ووتووە؟

حاتەم فەرمووی: پەلەم لێ مەکە، من پیاوێکی غەریب و نامۆم، هاتمە شارەکە ووتم ئەمە چ شارێکە؟ ووتیان شارەکەی پێغەمبەری خودایە ﷺ، ووتم ئەی کوا کۆشکەکەی، وە هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە ...

لە پاشان فەرمووی: بەڕاستی خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ الأحزاب(٢١)

( بەڕاستی دەبێت پێغەمبەری خوداو ژیانی ئەو زاتە گەورەیە، باشترین پێشەنگی خێرو چاکەبێت کە شوێنی بکەون).

کەواتە ئێوە شوێن کێ کەوتوون؟

چاو لە پێغەمبەری خوداﷺ دەکەن، یان چاو لە فیرعەون دەکەن، کە یەکەم کەس بوو بە گەچ و خشت خانووی دروستکرد؟!

ئیتر وازیان لێ هێنا و ئازادیان کرد.[1]

ئەمە بەسەرهاتی حاتەمی ئەصەم بوو( خودای لێ ڕازی بێت) وە لەمەودوایش لە شوێنی خۆیدا باسی ژیانی سەلەفی(صالحین) دەکەین کە چۆن بەرگی شرو وڕیان دەکردە بەرو وازیان لە خۆڕازاندنەوە دەهێنا، کە دەبنە شایەتی زیاتر لەسەر ئەم قسانە.

---

(١) رواها أبو نعيم فى (حلية الأولياء)(٨/٨٠).

## لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە:

خۆ جوان کردن و ڕازاندنەوە حەرام نىیە، بەشتێك کە دروست بێت بەکاری بهێنێت ، بەڵام ئەگەر زۆر ڕۆبچیت لەو خۆڕازاندنەوەدا، دڵت دادێت لەگەڵیدا و هۆگری دەبێت و، وای لێ دێت کە بۆت تەرك ناکرێت، بەردەوامی خۆڕازاندەنەوەش پێویستی بە وەدەست هێنانی هەندێك هۆکارە کە بە چاودێری کردنیان زیاتر توشی گوناه دەبیت، لە بێ دەنگی و نەرمی نواندن لە بەرامبەر حەق و ڕاستی دا، یان ڕازی کردنی خەڵک و ڕوپامایی کردن بۆیان، وە چەندین فەرمانی تر کە بۆ خۆیان قەدەغەکراون، خاوەن ئیرادەی بەهێز دەبێت خۆیان لێ بپارێزێت، چونکە ئەوەی دەستی چوو بەناو دونیادا، بە دڵنیاییەوە بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە، خۆ ئەگەر بگونجایە کەسێك پارێزراوبوایە لە وەدەستهێنانیان و ڕۆچوون لەناویاندا، ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە خۆی نەدەپاراست و، زۆر بەتوندی دونیای ڕەدنەدەکردەوە، تەنانەت ئەو کراسەش کەلەبەری کردووە، نیشانەیەکی پێوە چنرابوو[1] لەبەری خۆیی داکەندو دووری خستەوە. وە لە کاتی ووتار خوێندنەوەشدا ئەموستیەلەیەکی ئاڵتونی لە دەستدا بوو دایکەند[2] جگە لەمانەش شتی تری زۆر کردووە وەك باسی دەکەین.

دەگێرنەوە یەحیای کوڕی یەزیدی نەوفەلی نامەیەکی نووسی بۆ مالیکی کوڕی ئەنەس(ڕەحمەتی خودایان لێ بێت): **بسم الله الرحمن الرحيم**

---

(١) فقد رواه البخاري(٣٧٣)، و مسلم(٥٥٦) واللفظ له: **إن النبى ﷺ صلى في خميصة لها أعلام و قال: (( شغلتني أعلام هذه. فاذهبوا بها إلى أبى جهم و اتونى بأنبجانية))** چونکە مەشغوڵی کرد لای بردو، ناردی کراسێکی تریان بۆ هێنا.

(٢) ففي (( البخاري))(٥٨٦٧) و ((مسلم))(٢٠٩١): **كان رسول الله ﷺ يلبس خاتما من ذهب، فنبذه فقال: لا ألبسه أبدا ، فنبذ الناس خواتيمهم.**

و صلى الله على رسوله محمد في الأولين و الآخرين.

له یەحیای کوڕی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکەوە بۆ مالیکی کوڕی ئەنەس، پاش حەمدو سەنا و صەڵات و سەلام:

زانیومە کە تۆ پۆشاکی گرانبەها لەبەر دەکەیت، وە نانی گەنم و ئاردی تایبەتی دەخۆیت، وە لەسەر ڕاخەر و دۆشەکی نەرم دادەنیشیت، وە لەبەر دەرگاتدا دەرگاوانت داناوە، کە تۆ لە مەجلیسی تایبەتی بۆ زانست و عیلم دادەنیشیت، کاوڕت بۆ دەبرژێنن و بۆت لە شیش دەدەن، خەڵکیش بە تایبەتی دێن بۆ لات و تۆیان کردووە بە پێشەوای خۆیان و ڕازین بە قسەو فتواکانت، کەواتە ئەی مالیك لە خودا بترسە و پێویستە لەسەرت تەوازوع و گەردن کەچی بنوێنیت. مالیکی کوڕی ئەنەسیش بەم نامەیە وەڵامی دایەوە:

**بسمِ الله الرَّحمَنِ الرَّحيم و صلى الله على رسوله محمد في الأولين و الآخرين**

له مالیکی کوڕی ئەنەسەوە بۆ یەحیای کوڕی یەزید سەلامی خودات لەسەر، لە پاش حەمدو سەناو صەڵات و سەلام: نامەکەتم بەدەست گەیشت، وەك ئامۆژگارێکی بەسۆزی دڵسۆزانە کەوتە دڵمەوە، کە ئەدەبی لێوە فێربم .

خودای گەورە پۆشاکی تەقوا بکاتە خەڵاتت و ، پاداشتی ئامۆژگاریەکانت بەچاکە بداتەوە، داوام لە خودای گەورەیە کە ڕێنومایی ڕێگای خێر بکات و یارمەتیت بدات و پشت و پەنا و هێزو توانامان نییە بەخودای گەورە نەبێت، ئەوەش کە باست کردووە من نانی ئاردی تایبەتی دەخۆم و، پۆشاکی گرانبەها لەبەردەکەم و، دەرگاوانم بۆخۆم داناوەو، لەسەر ڕایەخی نەرم دادەنیشم، ئەو کارە کە دەکەین داوای لێ بوردن و لێ خۆشبوونی خودایش دەکەین، بەڕاستی خودای گەورە فەرمویەتی:

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ﴾ الأعراف(٣٢).

( واتە: ئەصڵ لە شتێکی سوود بەخش ئەوەیە کە دروستە، لەشتی زیان

بەخشیشدا حەرامە، ئەگەر زینەتی خودایی کە موباح بێت حەرامی بکەیت لەسەر خەڵکی، ئەوەش بە حەرام دادەنرێت، هەروەها ڕزق و ڕۆزیی پاك و بێ زیان لەبنەڕەتدا موباحن و بەکار هێنانیان درووستە)

وە من بە دڵنیاییەوە دەزانم کە کۆی ئەو هەموو جوانکاری و موباحانە وازیان لێ بهێنیت باشترە لەوەی خۆت بخەیتە ناویانەوە، وازمەهێنە لە نامەکانت، ئێمەش واز لە وەڵامدانەوەت ناهێنین، و السلام.

بنواڕە (ئیمامی) مالیك(خودای لێ ڕازی بێ) چەندێك بە ئینصافە، کە دانی ناوەبەوەدا کە وازهێنان لەو کارەموباحانە باشترە لەوەی بچیتە ناویانەوە، وە فتوایشی داوە کە کردنی کارێکی موباح دروستە، وە لە هەردوو بابەتەکەدا ڕاستی فەرمووە.

کەسێك نمونەی مالیک بێت لە جێگەو دەستەڵاتیدا، وە نەفسی ڕێگەی پێ بدات کە دان بنێت بەڕاستیداو، ئەم جۆرە ئامۆژگارییانە وەربگرێت، کە نەفسی خۆیشی وا پەروەردەو بەهێز دەکات، لە سنووری موباحەکەدا ڕابووەستێ و لێی لانەدات، وای لێ نەکات تووشی ڕوپامایی و بێ دەنگی بکات لەبەرامبەر حەقدا، وە سنوور نەبەزێنیت و کاری مەکروهو ناپەسەندیش نەکات، غەیری ئەو پیاوە کێی تر دەتوانێت ئاوا بە ئینصاف بێت.

مەیلی نەفس بۆ زیادەڕەوی لە حەڵاڵیشدا پڕپەتی لە مەترسی، دوورە لە کاری ئەو کەسانەوە کە خۆف و ترسان و(خَشْيَةُ اللہ) لە دڵیاندایە.

ترسان لە خودا تایبەتمەندیی ئەو زانایانەیە کە شارەزان بە خودای گەورە، واتە: دارای(مَعْرِفَةُ اللہ) ن، تایبەتمەندی خەشیەت و ترسانیش لە خودا بەوەدا دەردەکەوێت، کە خاوەنەکەی دوربکەوێتەوە لە هەموو کارێک کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت تووشی مەترسی ببێت.

## یەکێکی تر لە جیاکارییەکان

# دورکەوتنەوەی زانایانە لەدەسەڵاتداران

زانای ئاخیرەت دەبێت دڵی بتەوسێتەوە بە بینینی دەستەڵاتداران، مادەم ڕێگایەك بدۆزێتەوە لێیان ڕابکات هەرگیز توخنیان نەکەوێت و سەردانیان نەکات. بەڵکو دەبێت خۆی بپارێزێت لە تێکەڵی کردنیان، با ئەوانیش هاتبن بۆ لای ئەم، چونکە دونیا بۆ خۆی شتێکی جوانی شیرینی پڕ لە پڕشنگ و سەوزاییە، جڵەوی هەموو کارو فەرمانەکان بە دەستی دەستەڵاتدارەکانە، ئەوەی تێکەڵییان بکات ناچار دەبێت زۆر لە خۆی بکات بۆ ڕازی کردن و ڕاکێشانی دڵیان بەلای خۆیدا، هەرچەندە ئەوانە زاڵمیش بن، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو دیندارێکی ڕاستەقینە کە نارەزایی دەرببڕێت لە کردەوەکانیان، وە دڵیان بتەوسێننەوەو، زوڵم و زەبرو زەنگ و کردەوە نالەبارەکانیان ئاشکرا بکەن.

ئەوەی سەردانیان دەکات، یان لا دەکاتەوە بە لای جوانکارییەکانی ئەواندا، ئەو کاتە نیعمەتەکانی خودا بێ نرخ و بێ بەها دێتە بەرچاوی، یان بێ دەنگ دەبێت لەوەی کە ئینکارییان بکات، ئەوکاتە وەك کەسێکی لێ دێت کە حەق بکات بەژێرەوەو، بە زۆر قسە بهێنێت بەسەر خۆیدا بۆ ڕاگرتنی دڵیان و باشکردنی حاڵیان، کە ئەمەش بە بوهتانی ئاشکرا لەسەریان دەنوسرێت.

یان تەماحی هەبێت کە لە دونیای ئەوان بەشی خۆی بپچڕێت، کەئەمەش تێکەڵ بوونە لەگەڵ حەرامی ڕووتدا.

وە لە کتێبی(حەڵاڵ و حەرامدا) باسی ئەوە دێت، چەندێك دروستە لە ماڵی دەستەڵاتداران وەربگرێتەوەو، چەندێکیش دروست نیە، لە وەرگرتنی وەزیفەو موچەو بەخششەکان و خەڵات و شتەکانی تر.

## پوختەی قسە ئەمەیە:

تێکەڵی کردنیان کلیلی دەرگای هەموو شەڕ و خراپەکانە، زانایانی ئاخیرەتیش دەبێ ڕێبازی خۆپارێزی بگرنە بەر. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((مَنْ بَدا جَفا، يَعني: (مَن سَكَنَ البادِيَة) جَفا، ومَنِ اتَّبَع الصَّيد غَفَل، ومن أتَى السُّلطانَ افتَتَن))**(1) واتە: ئەوەی لە ناو دەشتەکاندایە، تەبعی وشکوبرنگ دەبێت، ئەوەی بکەوێتە شوێنی نێچیرەوە بێ ئاگاو غافڵ دەبێت، وە ئەوەش سەردانی سوڵطان بکات تووشی تاقی کردنەوەی زۆر دەبێت( چونکە

---

(١) أخرجه أبوداود. كتاب(باب في اتباع الصيد) (٢٨٥٩) و الترمذي كتاب الفتن باب ماجاء في النهي عن سب الرياح(٢٢٥٦) و حسنه، و النسائي في كتاب الصيد والزبائح، باب اتباع الصيد(٤٣٠٩) من حديث ابن عباس [قال الزبيدي ٣٨٧/١: أخرجه الإمام أحمد في مسنده(٣٣٥٢) و أبو داود والترمذى و النسائي و البهقي في الكبرى، ١٠١/١٠(٢٠٠٤٠) و الطبراني في الكبير٥٦/١١(١١٠٣٠) و من طريقه أبو نعيم في الحلية ٧٢/٤ كلهم من رواية سفيان، عن أبى موسى، عن وهب بن منبه. عن ابن عباس رفعه، و قال أبو نعيم في الحلية: أبو موسى هو اليماني، لانعرف له إسمان، وقال الذهبي في الميزان ٤٣٣/٧ شيخ يماني يجهل ماروي عنه غير الثوري، ولعله إسرائيل بن موسى، و إلا فهو مجهول، وفي الباب عن أبى هريرة والبراء بن عازب. فأما حديث أبى هريرة فقد رواه إبن عدى في الكامل ٣١٨/١، و ابن حبان في الضعفاء ٢٢٣/١ كلهم من رواية الحسن بن الحكم النخعي، عن عدى بن ثابت عن أبى حاتم، عن أبى هريرة و ضعّفوه، ولكن حسّنه العراقي و أما حديث البراء، فرواه أحمد مختصرا في مسنده.(١٨١٤٥) من طريق شريك عن الحسن بن الحكم، عن عدي بن ثابت، عنه رفعه.

و ذكره الدار قطني في العلل(٢٤٠/٨(١٥٤٨)فقال: تفرد به شريك و اختلف فيه على حسن بن الحكم فرواه شريك عنه هكذا، و خالفه إسماعيل بن زكريا، فرواه عنه، عن عدي بن ثابت، عن أبى حازم عن أبي هريرة، و خالفهما محمد بن عبد الطنافسي، فرواه عن عدي بن ثابت، عن شيخ من الأنصار لم يسمه. اهـ . قلت: و أخرجه العقيلي في الضعفاء ٤٠٩/٤، و الروياني في مسنده ٢٥٨/١(٣٨٣) كلهم عن البراء نحوه].

ئەگەر هاوڕاو مەرامی ئەو بێت دینکەی ڕوبەڕوی مەترسی دەبێتەوە، خۆ ئەگەر پێچەوانەیشی بکات ئەوا گیانی تووشی مەترسی دەبێت.)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((**سيكونُ عَليكُم أمَراء تَعرِفُونَ مِنهُم وتُنكِرونْ، فمن أنْكَر فَقد بَرِئَ، ومَن كَرِهَ فقَد سَلِم، ولَكِنْ مَن رَضِيَ وتابَعَ أبعَدَه الله تَعالى. قيل: أفلاَ نُقاتِلُهُم؟ قالَ ﷺ: لاَ مَا صَلَّوا**))[1]

واتە: لە داهاتودا چەندین فەرماندار دەبنە حوکمڕانتان، هەندێك کردەوەیان لێ دەوەشێتەوە و پێیان ڕازین و لە هەندێکیشی ناڕازین و ڕەدیان دەدەنەوە.

هەرکەسێك ڕەدیان بداتەوە، ئەوە خۆی و باوەڕەکەی تەبرییەکردووە( واتە زیممەی خۆیی پارستووە لە لێ پرسینەوە) وە هەریەکێك لێیان ناڕازی بێت، ئەوە سەلامەت دەبێت، بەڵام ئەوەی پێیان ڕازی بێت و شوێنیشیان بکەوێت خودای گەورەش دوریدەخاتەوە، وتیان ئایا شەڕ لەگەڵیان نەکەین، فەرمووی نەخێر هەتا نوێژ بکەن،(واتا مادام کە نوێژ دەکەن نابێ بکوژرێن)

سوفیانی سەوریش فەرموویەتی:

شیوێك لە دۆزەخ دا هەیە تەنها زانا قورئان خوێنەکانی تیا نیشتەجێن کە زۆر سەردانی پاشاکان دەکەن[2]

حوزەیفە فەرمووی: دەخیلتان بم خۆتان مەخەنە ئەو جێگایانەوە کە شوێنی فیتنەیە، ووتیان: ئەو جێگایانە کامەن؟ فەرمووی: بەردەرگاکانی

---

(١) أخرجه مسلم، كتاب الإمارة، باب و جوب الإنكار على الأمراء فيما يخالف الشرع، (١٨٥٤) من حديث أم سلمة.

(٢) قال الزبيدي: ٣٨٨/١: أجرجه البيهقي في (شعب الإيمان . ٩٤٧٩/٦٣/٧) و أخرج ابن عدي في الكامل ٣٥/٢، عن أبى هريرة رفعه (( **إن في جهنم وادٍ تَستعيذ منهُ جهنم كلَّ يوم سبعين مرة. أعدَّه الله للقُرّاء المُرائين بأعمالهم. و إنَّ أبغض الخَلقِ إلى الله عالمٌ يزورُ السُلطان**)).

فەرماندارەکان، یەکێ لە ئێوە دەچێتە لای ئەمیرێك و بە درۆ قسەکانی پشت ڕاست دەکاتەوەو هەندێك پیاهەڵدان و صیفەتی بۆ باس دەکات کە لەودا نییە.(١)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((العُلماءُ أمَناءُ الرُّسلِ عَلى عِبادِ الله تَعالى مَا لَم يُخالِطُوا السَّلاطِين، فإذا فَعلُوا ذلِك فَقد خانُوا الرُّسلَ فاحْذَروهُم واعْتَزِلوُهُم))(٢)**

واتە: زاناکان ئەمینداری پێغەمبەرەکانن بەسەر بەندەکانی خودای گەورەدا، مادەم تێکەڵی دەستەڵاتدارەکان نەکەن، بەڵام ئەگەر تێکەڵییان

---

(١) رواه ابن عبدالرزاق في (المصنف) (٣١٦/١١) ، و أبو نعيم في (الحلية ٢٧٧/١).

(٢) رواه أنس. أخرجه العقيلي في الضعفاء كما في جامع الأحاديث للسيوطي٢٢٨/٥(١٤٥٢٧) و ذكره ابن الجوزي في الموضوعات ١٩٢/١. [ قال الزبيدي ٣٨٨/١: قال العراقي في التخريج الكبير: رواه الديلمي في مسند الفردوس ٧٥/٣(٤٢١٠)، رواه ابن الجوزى في الموضوعات ١٩٢/١، من رواية ابراهم بن روستم عن عمر بن حفص العبدي. عن إسماعيل بن سميع قال: تابعه بمحمد بن معاوية النيسابورى، عن محمد بن يزيد عن إسماعيل ثم قال: و أما عمر العبدي قال يحيى(كما في الجرح و التعديل ١٠٣/٦) ليس شيئ، وقال النسائي في الضعفاء والمتروكين ص(٤٦١/٨١) متروك. وأما إبراهم بن روستم فقال ابن عدي في (الكامل ٢٧١/١) إلى هنا كلما إبن الجوزي. قال العراقي: أما إبراهيم بن رستم فقال فيه عثمان بن سعيد الدرامي، عن يحى بن معين(كما في لسان الميزان ٥٦/١) إنه ثقة. اهـ . قال السيوطي في اللآلي المصنوعة(٢٠٠/١) الحديث ليس بموضوع، و إبراهيم بن روستم معروف، مروزي جليل قال الحافظ ابن حجر في لسان الميزان(٥٦/١) عن أبى حاتم: يذكر بفقه و عبادة و محله الصدق، و ذكره ابن حبان في الثقات ١٧٠/٨(١٢٢٩٢) و قال: يخطيئ وقال الدارقطني في العلل (٢١٩/١٣) مشهور ليس بالقوى. اهـ. وله شاهد نحوه من حديث عمر بن خطاب، وله شواهد بمعناه كثيرة صحيحة و حسنة، فوق الأربعين حديثا، و هذا الحديث الذي نحن في الكلام عليه يحكم له على مقتضى صناعة الحديث بالحسن والله أعلم. اهـ].

بکەن ئەو کاتە ئەمیندارنابن، بەڵکو خیانەتیان بە پێغەمبەران کردوە، بێداربن و ئاگاتن لێیان بێت خۆتانیان لێ کەنار بگرن.

ووتیان بە ئەعمەش: بەڕاستی عیلمت زیندوو کردووّتەوە، چونکە زۆرێك لێیان وەرگرتیت، فەرمووی: پەلەمەکەن، سێ یەکیان ئەمرن پێش ئەوەی بەرهەمی زانستەکە وەربگرن کەکارپێکردنیەتی، وە سێ یەکیشیان بەردەرگای دەستەڵاتدارەکان بەرنادەن، کە لەهەموو کەسێك خراپترن.

پاشماوەی سێ یەکەکەی تریش کەمێکیان نەبێت سەرفراز نابن.[1]

هەر لەبەر ئەمە بوو کە سەعیدی کوری مەسەییب ڕەحمەتی خودای لێ بێت فەرموویەتی: ئەگەر بینیتان زانایەك زۆر سەردانی فەرمانڕەواکان دەکات خۆتانی لێ بپارێزن ئەوە دزە.[2]

(واتە: فێڵ دەکات و دونیا بۆ خۆی ڕادەکێشێت و ماڵی حەرام کۆدەکاتەوە).

ئەوزاعی فەرموویەتی:

هیچ شتێك نیيە بە ئەندازەی ئەوە خودا ڕقی لێی بێت کە زانایەك سەردانی کاربەدەستێك بکات[3]

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((شِرارُ العُلَماء الَّذينَ يـــأتُونَ الأُمَــراءَ،وخِيــارُ الأمَراء الَّذينَ يأتُون**

---

(١) رواه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله(١١١٥)

(٢) قال الزبيدي: ٣٨٩/١. هذا الذي ذكره المصنف عن سعيد بن المصيب ورد مرفوعا عن أبي هريرة بلفظ: (( **إذا رأيتم العلم يُخالط السلطان مُخالطة كثيرة فاعلم أنه لص**)) أخرجه الديلمى فى (مسند الفردوس) ٢٧٦/١(١٠٧٧).

(٣) و شاهده من حديث أبي هريرة رفعه، أخرجه إبن ماجه: **إن أبغض الخلق إلى الله العالم يزور العمال**) انظر:إتحاف: ٣٨٩/١ و هذا الذي ذكره رواه الديلمي في مسند الفردوس (٨٢٢) و الرافعي في( الدوين في أخبار قزوين) (٤٥٠/٣).

**العُلماءَ))**[1] واته: ( خراپترین زاناکان ئەوانەن دێن بۆ لای فەرمانداره‌کان و باشترینی فەرمانداره‌کانیش ئەوانەن کە دێن بۆلای زاناکان.

مەکحولی دیمەشقی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

هەرکەسێك قورئان فێرببێت و لە دین شارەزابێت و لە پاشان هاوڕێیەتی دەستەڵاتدار بکات کە ڕوپامایی بۆ بکات و تەماحی ماڵ و سامانی پێی هەبێت، بەپێی ژمارەی هەنگاوەکانی بۆ لای ئەو دەسەڵاتدارە ئەوەندە قووڵ دەبێتەوە بۆ ناو ئاگری جەهەنەم[2]

سوحنون فەرموویەتی:

چەند ناشیرین دەکەوێت لە سەر زانایەك، خەڵك بۆ بینینی ئەو دابنیشن و لەوێ نەبێت و، بپرسن لە کوێیە؟ بڵێن وا لای ئەمیر![3]

دەفەرموێت: زۆر جار دەمبیست کە دەیانووت:

---

(١) أخرجه إبن ماجه في (المقدمة) باب الإنتفاع بالعلم والعمل به(٢٥٦) بالشطر الأول نحوه من حديث أبي هريرة بسند ضعيف. قال الزبيدي: ٣٩٨/١: قال العراقي في التخريج الكبير: لم أره بهذا اللفظ، وروى ابن ماجه عن أبى هريرة نحو مرفوعا، عن النبي ﷺ في أثناء حديثٍ أولُه: **تعَوذوا بالله من جُبِّ الحَزن...))** إلى أن قال: (( **و إن أبغض القراء إلى الله الذين يأتون الأمراء))** وأول الحديث عند الترمذي: كتاب الزهد، باب ماجاء في الرياء و السمعة(٢٣٨٣) ثم قال العراقي: وروى أبوبكر أحمد بن علي بن لال الفقيه، في كتاب مكارم الأخلاق{ كما في جامع الأحاديث للسيوطي ٢٠٥/٢(٤٨٦٩)} عن أبي هريرة رفعه: (( **إن أبغض الخلق إلى الله عز و جل علم يزور العمال))** إنتهى . قلت: وهذا هو في مسند الفردوس للديلمي (٢١٥/١(٨٢٢) و تأريخ قزوين للرافعي ٤٥١/٣ [ وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية (٢٩٠/٦) لم أجد له إسنادا ].

(٢) قال الزبيدي ٣٩٠/١ هذا قد رواى مرفوعا من حديث معاذ، أخرجه أبو الشيخ في كتاب الثواب له، وكذا الحاكم في تأريخ بلفظ: **إذا قرأ الرجل القرآن، و تفقه في الدين، ثم أتي باب السلطان تملقا إليه، و طمعا لما في يده، خاص بقدر خطاه في نار جهنم.** كذا أفاده الجلال السيوطي، في جامعه ٢٥٠/١(١٦٦٩).

(٣) ذكره: ابن عبدالبر في جامع بيان العلم و فضله (١١١٧).

(ئەگەر زانات بینی دونیای خۆش دەویست، ئەوا بە ئەمینداری مەزانن بۆ دینەکەتان) منیش ئەمەم تاق کردەوە، چونکە هیچ کاتێک نەدەچوومە لای سوڵطان ئەگەر لە هاتنە دەرەوەمدا لێ پرسینەوەم لە خۆم نەکردبێت، کە دەمبینی گەردو قورسایی بەسەر دڵمەوە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە دەتانبینی چەندێك ڕوبەڕووی حەزو ئارەزوەکانی دەبومەوەو چۆن بە توڕەیی و ڕەوشتی ناشرین و ڕقەوە ڕوبەڕوم دەبویەوە، لەدوایشدا خوازیاری ئەوە بووم کە لە گوناهی چوون بۆ لای ئەو ڕزگارم بێ و سەربەسەر دەرچم.

لەگەڵ ئەوەشدا کە من هیچم لێ وەرنەدەگرت، بەڵکو قومێ ئاوی دەرگاو بانی ئەویشم نەدەخواردەوە... لە پاشان دەفەرمووێت:

زاناکانی چەرخی ئێمە لە زاناکانی بەنی ئیسرائیل خراپترن، ئەوەی ڕوخصەت و ئاسانکاری بێت فێری دەستەڵاتداری دەکەن و، بە پێی هەواو ئارەزواتی ئەو قسەیان بۆ دەکەن، خۆ ئەگەر هەواڵی پێ بدەن بەوەی کە لەسەریەتی جێبەجێی بکات و بەو حاڵەی کە تیایدا دەژی، ئەوا ڕەزا قورس دەبوون لە بەرچاوی و حەزی نەدەکرد بچنە لای، ئەگەر ئاوا یان بکردایە دەبووە مایەی ڕزگاری و سەرفرازیان لە حزوری خودادا.[1]

حەسەنیش فەرموویەتی:

یەکێك لە وانەی کە لە پێشینەکان بووە، لەسەرەتاوە موسوڵمان بوبوو وە صوحبەت و هاوڕێیەتی پێغەمبەریشی هەبوو(ﷺ)، {عەبدوڵلای کوڕی موبارەك فەرموویەتی: مەبەستی پێی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە،خودای لێ ڕازی بێت} فەرمووی: کە حاڵی وابوو نە دەچووە سەردانی فەرمانڕەوەکان و پێیشیان قەڵس دەبوو، کوڕەکانی پێیان ووت: زۆر هەن دێن بۆلای ئەو دەستەڵاتدارانە کە

(١) ترتيب المدارك (٣٥٧/١).

وەك تۆ پێشەنگی ئیسلامەتی و پلەی صوحبەتیشیان نی‌یە، تۆ بۆ ناچی بۆلایان؟

فەرمووی: ئەی کورم: بێم بۆ لای پارچە گۆشتێکی بۆ گەن کردوو کە خەڵکی دەورەیان لێ داوە؟! ئەگەر بتوانم هەرگیز بەشداری و هاوڕێیەتیان ناکەم.

ووتیان: ئەی بابە کەواتە هەموومان لە نەبونی و نەداریدا تیا دەچین

فەرمووی: رۆڵەکانم: ئەگەر بمرم بە بڕواداری و بەبرسێتی و لاوازییەوە، پێم خۆشترە لەوەی کە بمرم بە دوڕوویی و قەڵەوی و تێر وتەسەلییەوە.[1]

حەسەنی بەصریش فەرموویەتی: وەڵلاهی سەرکەتووەو زاڵ بووە بەسەریاندا، چونکە دەیزانی کە گڵی (ناو گۆڕ) گۆشت و قەڵەوییەکەیان دەخوات، وەتەنها ئیمانەکەیان بە ساغی بۆ دەمێنێتەوە.[2] ئەمەش هێمایە بۆ ئەوەی هەرکەسێك بچێتە لای دەستەڵاتدار هەرگیز ئەمین نی‌یە لەوەی کە تووشی دوڕوویی نەبێت، ئەمەش لەگەڵ بڕوای تەواودا ناگونجێت.

ئەبو ذەڕی غەففاری بە ئەبو سەلەمەی فەرمووی:

---

(١) حەزرەتی سەعدی کوری ئەبی وەقاص، بەردەوام فەرمانڕەوای ئیسلام بوو، تا زۆر فتوحاتی ئیسلامی لەسەر دەستی ئەودا ڕویدا. لە پاشان وازی لە ئیمارەت و کارکردن هێناو خۆی لە هەموو فیتنەیەك دورخستەوەو خۆی کەناردا بۆ تەقواو خواپەرستی، لە ماڵەکەی خۆیدا لە (عتیق) وەفاتی کرد. لە ساڵی پەنجاو پێنجی کۆچی، لە سەر شان هەلیان گرت و لە بەقیع ناشتیان، کە دواهەمینی ئەو دەکەسە بوو کە مژدەی بەهەشتیان پێ درابوو وەفاتی کرد. بووە پێشەنگی سەرقافڵەی ئەوانەی کە پەلە و جاە و مەقام ڕوی تێ دەکردن، خۆیان لەبەردەم ڕادەگرت و نەیدەگۆڕین، وە ئەوانەش کە ئیختیاری کە نارگیریان دەکردو خۆیان دەپاراست......بنوارە: إتحاف ٣٩١/١.

(٢) رواه ابن أبى الدنيا في العزلة(٢٠٢) وحكى البلاذري في (أنساب الأشراف) ٣٨٩/١٢ هذا عن إياس بن قتادة، وهو تابعي.

ئەی سەلەمە؛ لە دەرگای دەستەڵاتدارەکانەوە مەچۆرە ژورەوە، تۆ هیچ شتێك لە دونیای ئەوان پەیدانابکەیت، تا ئەوان هەندێکی زیاتر لە دینی تۆ زایە نەکەن! ئەمەش فیتنەو تاقی کردنەوەیەکی گەورەیە بۆ زاناکان، بیانوو بەهانەیەکی سەختی شەیتانە لە سەریان، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی دەربڕینیان بەهێزەو ووتەکانیان شیرینە[1] چونکە بەردەوام شەیتان دەیخاتە دڵیەوە کە ئامۆژگاریەکانی تۆ بۆیان و، چونە ژوورەوت بۆ لایان، لە زوڵم و ستەم دووریان دەخاتەوەو، زیاتر دروشمی پیرۆزی ئاینیی ڕاگیردەکەن و لەسەری دەبن، تا وادەخەنە خەیاڵیەوە کە چوونە لای دەستەڵاتدار دەبێتە بەشێك لە دین، کاتێك کە دەچێتە لایان، وای لێ دەکات و خۆیشی وادەکات کە بەنەرمی و شیرینی قسەیان لەگەڵدا بکات و، هەق و ڕاستییان بۆ بکات بە ژێر لێوەوەو ڕۆبچێت لە تاریف و ستایش کردنیان، بەمەش دینەکەی خۆی تیا دەبات.

## کاتی خۆی دەیانووت:

زاناکان ئەگەر زانستیان پەیدا کرد کاری پێ دەکەن، ئەگەر کاریان پێ کرد سەرقاڵ دەبن بە یادی خوداوە، کە بەمەشغوڵ بوون بە خوداوە صیفەتە ئادەمییەکانیان تیا ون دەبێت و ئەوصافی مەلەکوتی هەڵدەگرن، لەم حاڵەتەدا کە ون دەبن( خودای گەورە پلەیان بەرزدەکات و خۆشەویستییان دەخاتە دڵی خەڵکەوە) ئەو کاتە بەدوایاندا دەگەڕێن، ئەوانیش لە دەستیان ڕادەکەن)[2]

---

(١) رواه ابن أبي شيبه في (المصنف) (٣٨٨٨٧).

(٢) رواه أبـو نعـيم في حليـة الأوليـاء (٥/٢٣٤) عـن يزيـد بـن ميسـرة رحمـه الله تعـالى، واته: بەخـوداوە مەشـغوڵ دەبـن و لەخەڵکی ڕادەکەن بـۆ پاراسـتنی دینەکەیـان و کۆکردنـەوەی خەتەرەی دڵ و نیرادەی بەهێزیان. إتحاف(١/٣٩١).

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەیەکی نوسی بۆ حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودایان لێ بێت) پاش حەمد و سەنا وصەڵات و سەلام:

هەندێك کەسم بۆ دەستنیشان بکە با بەکۆمەکی و یارمەتی دانی ئەوان فەرمانی خودایان پێ جێ بەجێ بکەم، ئەویش بەم نامە وەڵامی دایەوە:

دیندارەکان تۆیان ناوێت! (مەبەستی ئەوەیە: ئەوحاڵەتەی تۆی تیا ئەژیت، کە خۆتراگرتووە لە هەڵگرتنی قورسایی و بارگرانی موڵك و دەستەڵات).

ئەوانەش کە ئەهلی دونیان تۆ ئەوانت ناوێت، بەڵام لەسەر تۆیە کە ئەشرافە خاوەن نەسەبەکان نزیك بخەیتەوە، چونکە ئەوانە شەرەفی خۆیان دەپارێزن لەوەی بەکاری خیانەتکاری پیسی بکەن[1]

ئەمە بەنیسبەت عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) کە لەزەمانی خۆیدا لە هەموو خەڵکی زاهیدو دونیا نەویست تر بووە، ئەگەر یەکێك لە مەرجەکانی ئەهلی دین ئەوەبێت کەلەو دەستەڵاتدارەش ڕابکەن و لێی دووربکەونەوە، ئیتر چۆن ڕێگە بۆ خۆیان خۆش دەکەن کە بەدوای کەسانێکی تردا بگەڕێن و تێکەڵییان بکەن.

بەردەوام زانا پێشینەکان وەك حەسەنی بەصری و سوفیانی سەوری و عەبدوڵلای کوڕی موبارەك و فوضەیلی کوڕی عەیاض و ئیبراهیمی ئەدهەم و یوسفی کوڕی ئەسباط قسەیان دەکرد لەسەر زانا دونیاییەکانی ئەهلی مەککە و شام و جێگاکانی تر، یان لەبەر ئەوە بوو کە ئەوانە مەیلیان بەلای دونیاوە دەدا، یان لەبەر تێکەڵبوونیان بووە بە دەستەڵاتدارەکانەوە.

---

(١) قوت القلوب (١٣٤/١).

## یەکێکی تر لەجیاکاریەکانی زانای ئاخیرەت

# دەبێ خۆی لە فتوادان بەدوور بگرێت

نابێت زانای ئاخیرەت خێرا پەلاماری فتوادان بدات، بەڵکو دەبێت پرسیارێکیان لێ کرد ڕابوەستێ و چەندێك بۆی بکرێت خۆی لابدات و لەفتوادان خۆی ڕزگار بکات، ئەگەر پرسیاری لێ کرا بەشتێك بە دڵنیاییەوە دەیزانی بەدەقێکی کیتابی خودا ﷻ یان دەقێکی فەرموودە یان کۆدەنگ و ئیجماع یان قیاسێکی ئاشکرا... ئەوە با فتوا بدات، وە ئەگەر پرسیاری لێ کرا لە بابەتێك کە گومانێکی هەبوو تیایدا، بابڵێت(نازانم)، وە ئەگەر پرسیاری لێ کرا لەبارەی بابەتێکەوە کە بەهۆی ئیجتهاد و بەکۆشش و مەزندەی خۆی دەیزانی، با لەسەر خۆیی لادات و چاکتر وایە بینێرێت بۆ لای یەکێکی تر. ئەگەر بزانێت ئەو کەسە دەتوانێت ئەو ئەرکە جێ بەجێ بکات و شایستەیە بۆ فتوادان. ئەمە نیشانەی حەزم و بەهێزی ئیرادەیە، چونکە هەستان بەدەم فەرمانی ئیجتهاد کردنەوە کارێکی گەورەی پڕ مەترسی‌یە.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە:**((العِلْمُ ثلاثةٌ: كِتابٌ ناطقٌ وسُنَّة قائمةٌ ولا أدري))**[1]

واتە: (زانست سیانە: کیتابێك کە قورئانەو قسەدەکات ڕون و ئاشکرایە،

---

(١) أخرجه الخطيب في أسماء من روى عن مالك [هو في الفقه و المتفقه للخطيب ٣٦٦/٢] موقوفا على ابن عمر. ولأبي داود [كتاب الفرائض] باب ماجاء في تعليم الفرائض(٢٨٨٥) و ابن ماجة [ في المقدمة باب إجتناب الرأى و القياس (٥٤)] من حديث عبدالله بن عمر مرفوعا نحوه مع اختلال و قد تقدم.

[قال الزبيدي٣٩٣/١ هكذا أورده صاحب القوت ٢٣٦/١، قال العراقي في التخريج الكبير: أخرجه الدار قطني في غرائب مالك و الخطيب في أسماء من روى عن مالك، رواه ابن عدى في الكامل ١٧٥/١، وقال: هذا من منكرات أبى حذافة السهمي سرقة من عمر بن عصام،

وەسوننەتێکە ڕاوەستاوو جێگیر و بەردەوام پارێزراوە، بەشی سێیەمی زانستیش نازانمە.)

شەعبی( ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

نازانم نیوەی زانستە[1] ئەو کەسەی لەبەرخودای گەورە لەمەسەلەیەکدا بێ دەنگ دەبێت، کە نەزانێ وەڵام بداتەوە، پاداشتی ئەو کەسە کەمتر نییە لەوەی قسەی کردووە و وەڵامی داوەتەوە، چونکە دانانان بە نەزانین دا زۆر زیاتر نەفس پێی ناخۆشە، بۆیە صەحابەکان و سەلەفی صالحین(ڕەزای خودایان لێ بێت) بەم شێوە دەجوڵانەوە.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی فتوایەك دەیفەرموو: بڕۆ بۆ لای ئەو ئەمیرەی کە کاروباری خەڵکی لە ئەستۆ گرتووە بیخەرە گەردنی ئەوەوە با ئەو وەڵام بداتەوە.[2] عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش(ڕەزای خودای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەو کەسەی لەبەرامبەر هەر پرسیارێکدا لێی دەکرێت فتوایان بۆ دەدات ئەوە شێتە[3]

---

قال العراقي: ولم يصرح المصنف بأنه مرفوع، و إنما قال و في الخبر. والظاهر أنه أراد هذا فذكر به إحتياطا، لإحتمال أن يكون روى مرفوعا. اه الحديث المذكور رواه أيضا الديلمي في الفردوس ٧٠/٢(٤١٩٧) موقوفا و الطبراني في الأوسط ٢٩٩/١(١٠٠١) ثم قال العراقي و أول الحديث مرفوع من حديث عبدالله بن عمر، رواه أبو داود، كتاب الفرائض، باب ماجاء في تعليم الفرائض(٢٨٨٥) و ابن ماجه، في المقدمة، باب إجتناب الرأي والقياس(٥٤) . اه.

وقد أخرجه أيضا الحاكم في المستدرك ٣٦٩/٤(٧٩٤٩)، قال المناوي في فيض القدير ٣٨٧/٤، وفي طريق ابن ماجة رشدبن سعد، وهو ضعيف، ومن ثم قال ابن رجب: فيه ضعفاء مشهورن]

(١) رواه الدرامي في سننه(١٨٦).

(٢) قوت القلوب(١٣١/١).

(٣) رواه الدرامي في سننه(١٧٦).

هەروەها دەفەرمووێت:

ئەوەی زانا دەتوانێت خۆیی پێ داپۆشێت و خۆیی پێ بپارێزێت؛ وشەی نازانمە[1] ئەگەر بەهەڵە ئەو وشەی بواردو نەیکرد، ئەوا جێی کوشندەی خۆیی پێکاوە.[2]

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

هیچ شتێك گران تر نی‌یە لەسەر شەیتان لە قسەی زانایەك کە بەزانستی قسە دەکات و بەزانستیش بێ دەنگ دەبێت، دەڵێت: بنوارِن لەم کابرایە، بێ دەنگ بوونەکەی( کە بە عیلمەوە وەڵام ناداتەوە) ناڕەحەتترم دەکات لەوەی کە بەزانستەوە وەڵامی داوەتەوە.

هەندێك لە زانایان وەصفی ئەبدالەکانیان بەوە کردوە[3]خواردنیان لەکاتی زۆر برسێتی و پێویستی دایە. قسەکردنیشیان لە کاتی زۆر ناچاری و پێویست بوون دایە[4] واتە: تاپرسیاریان لێ نەکرێت قسە ناکەن، ئەگەر پرسیاریان لێ کراو زانییان کەسانێك هەن کە لە جیاتی ئەوان دەتوانن وەڵامیان بدەنەوە، ئەوە بێ دەنگ دەبن، ئەگەر زۆر پێویست بێ و ناچاربن وەڵام دەدەنەوە.

ئەوانە وایان دادەنا، هەرکەسێك پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکرێت بۆ خۆی دەست بە قسەکردن بکات ، ئەوە خۆی حەزی لە قسەکردن هەیە.

---

(١) قال الحافظ الزبيدي: أخرجه الهروي في كتاب ذم الكلام و أهله ١٢٧/٢(٢٨٧) و أخرج البخاري في كتاب تفسير القرآن، باب قوله:[ و ما أنا من **المتكلمين**] (٤٨٠٩)، وعنه: **من علم شيئا فليقل به، ومن لم يعلم فليقل**: الله أعلم.

(٢) ورواه الصنعاني في(( الأمالي في آثار الصحابة))(١٦٢) وهو مروي عن غيره من السلف.

(٣) **ئەبدال: کۆمەڵێکن لە ئەولیاکان بەلای ئەهلی تەصەووفە حەوت کەسن کەم و زیاد ناکەن، کاروباری تایبەتیان پێ سپێرراوە.**

(٤) قوت القلوب(١٥٤/١) ئەوەش کە وەصفەکەی کردووە: فەزارەی شامی‌یە. وەك لە جێگەی تردا هێمای بۆ کراوە.

حەزرەتی عەلی و عەبدوڵلای کوڕی عەبباس(خودایان لێ ڕازی بێت) دایان بەلای پیاوێکدا قسەی بۆ ئەو خەڵکە دەکرد، فەرموویان:

ئەم پیاوە دەڵێ بمناسن!![1] هەندێك لە زانایان دەفەرموون:

زانای ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە پرسیارێکی لە بابەتێک لێ کرا، کاتێك وەڵام دەداتەوە وەك ددانی کاکیلەیان هەڵکێشابێت ئاوا پێی ناڕەحەت ببێت.[2]

عەبدوڵلای کوڕی عومەریش دەیفەرموو:

ئێوە دەتانەوێت ئێمە بکەنە پردێك و بەسەر ئێمەدا بپەڕنەوە بۆ دۆزەخ[3]

وە ئەبو حەفصی نەیسابوری فەرموویەتی:

زانا ئەوەیە: لە کاتی پرسیار لێ کردنیدا ترسێك دایدەگرێت کە لە ڕۆژی قیامەتدا پێی بڵێن: لە کوێوە وەڵامت دایەوە؟[4]

ئیبراهیمی تەیمی ئەگەر پرسیارێکی لێ بکرایە، دەربارەی بابەتێك دەستی دەکرد بە گریان و دەیفەرموو: جگە لە من کەمی ترتان دەست نەدەکەوت، تا ناچار بن پێویستیتان بە من هەبێت.[5] ئەبو العالیه و نەفیعی ڕەییاحی و ئیبراهیمی نەخەعی و سوفیانی سەوری و ئیبراهمی کوڕی ئەدهەم حاڵیان وابوو قسەیان بۆ دووکەس و سێ کەس و کەسانێکی کەم دەکرد[6] ئەگەر خەڵکەکە زیادیان بکردایە ئەوانیش بە جێیان دەهێشتن و بڵاوەیان لێ دەکرد.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((ما أَدْري أعُـزَيْرٌ نَبـيٌّ أم لاَ، ومـا أدْري أَتُبَّـعٌ

---

(١) واتە: حەزی لە خۆ دەرخستنە، قوت القلوب(١/١٤٤).

(٢) الجامع لأخلاق الرأی و آداب السامع(١٤٥٩) بنحوه و قوت القلوب(١/١٤٤).

(٣) قوت القلوب(١/١٥٥)

(٤) قوت القلوب(١/١٥٥)

(٥) قوت القلوب(١/١٥٥)

(٦) قوت القلوب(١/١٥٥)

**مَلعونٌ أمْ لا، وما أدري ذو القَرنَين نَبيٌّ أم لا))**[1] واتە:

( نازانم ئایا عوزەیر پێغەمبەر بووە یان نا، وە نازانم ئایا توببەع لەعنەتی لێ کراوە یان نا( کە یەکەم کەس بووە بەرگی بۆ مەککە پۆشیوە). وە نازانم ئایا (ذو القرنین) پێغەمبەر بووە یان نا.

وە لە کاتێکدا پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا لابارەی باشترین جێگا لە سەر زەوی و خراپترینی ، فەرمووی: ( لا أدری) واتە نازانم، تاوەکو حەزرەتی جوبرەئیل دابەزیە خوارەوە( سەلامی خودای لەسەر) پرسیاریان لێ کرد، فەرمووی: نازانم تا ئەوەی کە خودای(عزَّوجَل) فێری کردو پیشانی دا، کە باشترین جێگای زەوی مزگەوتەکانەو خراپترین جێگاش بازاڕەکانە.[2]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(خودایان لێ ڕازی بێت) حاڵی وابوو لە دەمەسئەلە پرسیاریان لێ بکردایە لەیەکێکیان وەڵامی دەدایەوەو لە نۆکەی تری بێدەنگ دەبوو[3]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباسیش( خودایان لێ ڕازی بێت) وەڵامی نۆ پرسیاری دەدایەوە لە یەکێ لە پرسیارەکان بێ دەنگ دەبوو[4]

---

(١) رواه أبو داود(٤٦٧٤) والجملة الأخيرة عند الحاكم في((المستدرك))(١٤/٢).

(٢) رواه ابـن حبـان في صحيحه(١٥٩٩) والطبراني في الأوسـط(٧١٣٦). و أخرجـه أحمـد في مسـنده(١٦٣٠٢) و أبـو يعلى في مسـنده ٤٠٠/١٣(٧٤٠٣) والبـراز في مسـنده ٣٥٢/٨(٤٣٣٠) والحاكم في المستدرك ١٦٧/١(٣٠٦) و صححه، و نحوه من حديث ابن عمر، [ قال الزبيدي: ٣٩٦/١ قال العراقي: رواه ابن عمر وجبير بن مطعم و أنس، أما حديث ابن عمر فرواه ابن حبـان في صحيحه ٤٧٦/٤(١٥٩٩) و أمـا حـديث جبيـر بـن مطعـم فـرواه أحمـد في مسـنده (١٦٣٠٢) و أبـو يعلـي ٤٠٠/١٣(٧٤٠٣) والبــزاز و الطبرانــي كمــا فـي مجمــع الزوائــد للهيثمي،(٧٦/٤) بنحوه. وأما حديث أنس، فرواه الطبراني في الأوسط ١٥٥/٧(٧١٤٠)].

(٣) قوت القلوب(١٣١/١)

(٤) قوت القلوب(١٣١/١)

هەندێك لە فوقەها كانیش حاڵیان وابوو كە زیاتر لەوەڵامدا ( نازانم) یان دەووت لە (ئەزانم)، لەوانە: سوفیانی سەوری و مالیكی كوڕی ئەنەس و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل وفوضەیلی كوڕی عەیاض و بیشیری كوڕی حاریس[1]

عەبدولرەحمانی كوڕی ئەبی لەیلا فەرموویەتی: لەم مزگەوتەدا گەیشتووم بە صەد و بیست كەس لە صەحابەكانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ كامیانم نەدیوە كە لەبارەی فەرموودەیەكەوە یان فتوادان بۆ مەسئەلەیەك پرسیاری لێ كرابێت و حەزی كردبێت خۆی وەڵام بداتەوە، بەڵكو حەزی دەكرد براكەی ئەو ئەركەی لە سەر هەڵبگرتایە، وە تووشی وەڵامدانەوە نەبوایە...[2]

لەدەستەواژەیەكی تردا هاتووە:كە مەسەلەیەك دەخرایە بەردەم یەكێكیانەوە ئەویش دەیگێڕایەوە بۆ یەكێكی تر، ئەویش لە كۆڵ خۆی دەكردەوە و ڕوبەڕوی یەكێكی تری دەكردەوە، بەم شێوەیە تا دەگەڕایەوە بۆ یەكەم كەسەكە.

دەگێڕنەوە كۆمەڵی (أصحاب الصفة)[3] سەلكە بەرانێكی سورەوەكراو درا بەدیاری بۆ یەكێكیان، ئەویش دەستی بۆ نەبردو دای بە دیاری بەیەكێكی تر، بەم شێوەیە بەیەكیان دەدا تا گەڕایەوە بۆ خاوەنە یەكەمەكەی[1]

---

(١) قوت القلوب(١٣١/١) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

(٢) تأريخ دمشق(٨٧/٣٦) و كذا في قوت القلوب(١٣١/١).

(٣) كۆمەڵێ بوون لە صەحابە هەژارەكان بەردەوام لە مزگەوتدا بوون، خەریكی تەقواو خۆپارێزی بوون، پشت بەخودا و بەبێ خۆراك و بژێوی ژیان، زیادو كەمیان دەكرد، ئەبو هورەیرە ئەیفەرموو ئەصحابی صوففە میوانەكانی ئیسلامن، لا بەلای ماڵ و منداڵدا ناكەنەوە، ئەگەر صەدەقەیە بهاتایە بۆ حەزرەت ﷺ بۆی دەناردن و خۆی لێی نەدەخوارد، ئەگەر دیاری بۆ بهاتایە دیسان بۆی دەناردن و بەشی خۆیشی لێ هەڵدەگرت...(متفق علیە) إتحاف ٣٩٧/١-٣٩٨).

بنوارە چۆن ئێستا کارو فرمانی زاناکان پێچەوانە بووەتەوە، ئەوەی کاتی خۆی لێیان ڕادەکرد، ئێستا بەدوایدا دەگەڕێن و، ئەوەش کاتی خۆی بەدوایدا دەگەڕان ئێستا لێی ڕادەکەن. بەڵگەو شایەت لەسەر ئەوەی بەجوانی خۆت بپارێزیت لە کارو مەنصەبی فتوادان ئەو فەرموودەیە کە دەگێڕنەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**لا يَفتي النّاسَ إلاّ ثلاثةٌ: أميرٌ، أو مَأمُورٌ، أو مُتكلِّفٌ**))[2] واتە: (تەنها سێ کەس بۆیان هەیە فتوا بدەن، خەلیفەو فەرمانڕەوای یەکەم، جێگرەکەی، وە کەسێك پێی سپێردرابێت ئەو کارە بکات.

هەندێك لە زانیان فەرموویانە:

کاتی خۆی وابوو، ئەوەی خێراتر بوایە بۆ فتوادان، کەمترینی ناو زاناکان بوو لە زانستدا، وە ئەوانەشیان کە بەخێراتر لە خۆیانیان دور دەخستەوە، لەوانی تر بە واریع و خۆپارێزتر دەناسران.[3]

وە هەندێکی تر لە زانایان فەرموویانە:

صەحابەکان چوار شتیان لە خۆیان دوور دەخستەوە و پاڵیان پێوە دەنا:

ئیمامەت و بوون بەسەر وەسێتی مردووەکان و، هەڵگرتنی ئەمانەتی ماڵی خەڵکی و کاری فتوادان.[4]

---

(١) ئەمە بەشێکە لە(ئیثار) واتە ئەوانی ترت لا پێویست تر بێت لە خۆت، بۆیە ئیمای غەزالی ئەم نمونانە دێنێتەوە تا موفتیەکانیش وەڵامەکان دەستاو دەست پێ بکەن، بنوارە: إتحاف ٣٩٨/١.

(٢) كذا في القوت ١٣١/١ حيث قال: (وقدروينا مسندا) و ذكره، وقد رواه بنحوه أحمد في((المسند)) ٢٢/٦ . و الطبراني في الكبير (٧٦/١٨)، وأوله **لايقصّ إلا أمير**.. وله روايات أخرای. وقال الزبيدي: (٣٩٨/١) تقدم تخريج الحديث و تحقيقه مسبوطا في الباب الثاني.

(٣) جامع بيان العلم و فضله(١٥٢٥) و كذا قوت القلوب(١٣٢/١).

(٤) قوت القلوب(١٣٢/١).

کاری صەحابەو تابیعین و شوێن کەوتوانیان(خودایان لێ ڕازی بێت) لە پێنج شتدا کۆدەبونەوە: خوێندنەوەی قورئان و ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکان و، ذیکری خودای گەورەو، فەرمانکردن بەچاکەو بەرگریکردن لە خراپە، ئەمەش بەهۆی ئەو فەرموودەوەیە کە لە پێغەمبەریان ﷺ بیستووە کە فەرموویەتی: **((كُلُّ كَلامِ ابنِ آدمَ عَليهِ لا لَهُ إلاَّ ثَلاثَةً: أمرٌ بمَعرُوفٍ أو نَهيٌ عَن مُنكَرٍ، أو ذِكرُ اللهِ تَعالى))**[1]

وە خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿ **لَا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ** ﴾ النساء(١١٤).

واتە: (هەموو قسەیەك كە ئادەمیزاد دەیكات بۆی حیساب نی‌یە، بەڵكو لەسەری دەژمێررێت، مەگەر سێ قسە نەبێت، فەرمان بەچاکە، یان بەگری لە خراپە، یان ذیکر و یادی خودای گەورە، قورئانیش دەفەرمووێت:

خێر لە زۆربەی قسەکانیاندا نی‌یە، کە لە میـانی یەکتری‌دا دەیکەن، مـەگەر قسەکە فەرمانکردن بێت بەصەدەقەو بە چاکەو کاری باش، یان چاکسازی لە میانی خەڵکی دا. هەندێك لە زانایان هەندێک لەوانەیان لە خەودا بینی کە خاوەنی (مەدرەسەی) ڕەئی بوون (واتە ئەهلی فیقە)، لە کوفە، پێی فەرمووە: چی دەڵێت و چیت بینی دەربارەی ئەو فتواو ڕایانەی کە لەسەری بویت و دەرت دەبڕین؟

---

(١) أخرجه الترمذي: [ كتاب الزهد، بابٌ منه(٢٤١٢) ] و ابن ماجه[ كتاب الفتن باب كف اللسان في الفتنة(٣٩٧٤) هكذا أورده صاحب القوت بلا سند ٢٢٩/١، عن بعض السلف، و قال العراقي في التخريج الكبير: فيه محمد بن يزيد بن خنيس وهو ثقة، ذكره ابن حبان في كتاب الثقات،(٦١/٩(١٥١٨٥)) قلت: و أخرجه ابن السني في عمل اليوم و الليلة ص ٨(٥)، و الحاكم في المستدرك ٥٥٧/٢(٣٨٩٢) و البيهقي في الشعب ٣٩٢/١(٥١٤) من هذا الطريق بنحوه].

روی لێ وەرگێڕام و ناوچاوی دابەیکداو ووتی:
شتێکی وامان لێ دەس نەکەوت و چاوەنواڕی خێریشی لێ ناکەین.[١]

هەروەها ئەبو حەصین دەڵێت: بەڕاستی سەیرە، کەسی واهەیە کە لەبارەی مەسەلەیەکی گرنگی واوە فتوا دەدات، ئەگەر ڕوبەڕوی عومەری کوڕی خەطاب بکرایەتەوە ئەهلی بەدری هەموو بۆ کۆ دەکردەوە.[٢]

بەردەوام بێ دەنگی و وەڵام نەدانەوە شیمەی ئەهلی عیلم بووە، مەگەر بۆ پێویستی و ناچاری، وەك لە فەرمووددەدا هاتووە:

**((إذا رأيتُمُ الرَّجُلَ قَد أُوتِيَ صَمْتاً وَزُهداً فاقتَرِبُوا مِنهُ فإنَّهُ يُلَقَّنُ الحِكمَةَ))**[٣] واتە:

(ئەگەر کەسێکتان بینی صیفەتی بێ دەنگی و دونیا نەویستی پێ درابوو، ئەوا لێی نزیك ببنەوە، بەڕاستی ئەو کەسە حیکمەت و پەندیاری بۆدێت و پێ دەدرێت ).

ووتراوە، زانا؛ یان زانای تێکڕای خەڵکەکەیە، ئەو کەسە موفتی یە و فتوادەرێکی وایە کە دەبێتەهاوڕێی چواردەوری پایەکانی مزگەوت
(واتە: خەڵکەکە لێی کۆدەبنەوە)، یان زانای تایبەتمەندەکانە، ئەو کەسەیە کە زانایە بە عیلمی یەکتاپەرستی و ئەعمالی قلوب و خاوەن عیلمی مەعریفەتە، ئەوانەن کە لەجێگا کەنارەکاندا بەتاکی و تەنهایی دادەنیشن و(تێکەڵی خەڵکی ناکەن)[٤]

---

(١) قوت القلوب ١٣٢/١ بنحوه.

(٢) رواه البيهقي في (المدخل)، و ابن عساكر في تأريخ دمشق ٤١٠/٣٨.

(٣) رواه ابن ماجه(٤١٠١).

(٤) قوت القلوب ١٤٢/١.

**کاتی خۆی دەیانووت:**

نمونەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەك دیجلە وایە هەموو کەس چنگی خۆیی پیا دەکات و ئاوی لێ دەردەهێنێت، وە وێنەی بیشری کوڕی حاریسیش وەك ئاوێکی شیرینی داپۆشراو وایە، کە یەك لە دوای یـەك خەڵکەکە دەچنە سەری و سوودی لێ وەردەگرن.[١]

هەروەها دەیانووت: فڵان کەس زانایە، فڵانیش شارەزاو موتەکەلیم و قسە ڕەوانە، وە فڵان کەس قسەی زیاتری لایە، وە فڵانیش زانستی زیاتر لایە.[٢]

ئەبوسولەیمان فەرمووی: ناسین و مەعریفەتی خودا لە بێ دەنگیەوە نزیك ترە لەوەی لە قسە کردنەوە دەستی بکەوێت.[٣]

هەندێکی تر لە زانایان فەرموویانە:

ئەوەندەی زانست زیاد بکات قسەکردن کەم دەبێتەوە[٤]

سەلمانی فارسی نامەیەکی نوسی بۆ ئەبو دەرداء(خودایان لێ ڕازی بێت) کە پێشتر پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە بەینیانەوە[٥] لە نامەکەدا فەرمووی:

بیستومە کە دانیشتویت و دکتۆری دەکەیت و چارەسەری نەخۆشەکان دەکەیت، بنوارە ئەگەر تۆ پزیشکی.. ئەوە قسەبکە، چونکە قسەکانت شیفابەخشە، وە ئەگەر خۆت کردوە بە دکتۆر و شارەزا نیت، بۆ خاتری خودا لەبەر خودا موسوڵمانان مەکوژە.

لە دوای ئەوە ئەبو دەرداء هەر پرسیارێکیان لێ بکردایە لەسەری ڕادەوەستا.[١]

---

(١) قوت القلوب ١٤٢/١.

(٢) قوت القلوب ١٤٢/١. دەیەوێت جیاوازی بخاتە میانی زانست و کەلامەوە.

(٣) قوت القلوب ١٤٢/١.

(٤) قوت القلوب ١٤٢/١ وفي نسخة هـ زيادة: إذا **كثر الكلام قلَّ العِلم**.

(٥) كما جاء في (البخاري)(١٩٦٨).

ئەنەسی کوڕی مالیك( خودایان لێ ڕازی بێت) ئەگەر پرسیارێکیان لێ بکردایە.دەیفەرموو: پرسیار لە مەولانا و گەورەمان حەسەنی بەصری بکەن.[2]

هەروەها عەبدوڵلای کوڕی عەباس( خودایان لێ ڕازی بێت) ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە دەیفەرموو: پرسیار لە حاریثەی کوری زەید بکەن[3]

وە عەبدوڵلای کوڕی عومەریش( خودایان لێ ڕازی بێت) دەیفەرموو: پرسیار لە سەعیدی کوڕی موسەییب بکەن.[4]

دەگێڕنەوە کە صەحابیەك لە خزمەتی حەسەنی بەصری‌دا بیست فەرموودەی ڕێوایەت دەکرد، ووتیان: واتاو مانای فەرموودەکان چییە؟

فەرمووی ئەوەی لای منە تەنها گێڕانەوەی مەتنی حەدیسەکانە.

حەسەنی بەصریش دەستی کرد بە لێکدانەوەی مانای فەرموودەکان یەك لە دوای یەك، زۆر سەرسام مان لە جوانی لێکدانەوەو لەبەرکردن و شارەزاییەکەی، صەحابیەکەش مشتێ وردە بەردی خستە ناو لەپیەوە و وەشاندی بەڕوویاندا فەرمووی:

لە بارەی عیلمەوە پرسیار لە من دەکەن و ئەم حیبرە( زۆر زانایە) لە ناو تاندایە.[1]

---

(١) قوت القلوب(١/١٤٧).

(٢) رواه ابن أبي شيبه(( المصنف))(٣٦٧٤٥).

(٣) قال الزبيدي ١/ ٤٠٠ ، هكذا أورده صاحب القوت(١/٢٥٤). قلت و جابر بن زيد هو الأزدي، ثم الجوفي البصري، أبو الشعثاء مشهور بكنيته، ثقه فقيه، و هذا الذي أورده صاحب القوت و تبعه المصنف فقد أخرج أبو نعيم في الحلية ٣/ ٨٥ قال ابن عباس: **لو نزل أهل البصرة بجابر بن زيد لأوسعهم علما** عن كتب الله تعالى. و رواه إبن سعد في ((طبقاته)) ٧/ ١٤٠.

(٤) قال الزبيدي ١/ ٤٠١ هكذا أورده صاحب القوت. ١/ ٢٥٤.

## یەکێکی تر لە جیاکاریەکان

## گرنگی دانی زانای ئاخیرەت بە عیلمی باطین و چاودێری دڵ

دەبێت زانای ئاخیرەت زیاترین گرنگی دانیان بە عیلمی شاراوە و باطین و موراقەبەو چاودێری دڵ بێت، وە هەوڵی زانین و گرتنە بەری ڕێگەی ئاخیرەت بدەن.[2] لەگەڵ ڕاستی ئەو هیواو ڕجایە، کە ئەو حاڵەتانەیان بۆ دەربکەوێت:

لە موجاهەدەو تێکۆشان و موراقەبەو چاودێری کردن، چونکە بەڕاستی بە هۆی موجاهەدە و ڕیازەت کێشانەوە دەگاتە حاڵەتی موشاهەدە و بینین، لە وردەکاریەکانی ئەحواڵی دڵەکان و عیلمی قلوب، تاوای لێ دێت سەرچاوەکانی حیکمەت لەناو دڵیدا هەڵدەقوڵێت، بەڵام ئەوەندە هەیە زانینی ئەم بابەتانە بە کتێب و فێربوونی زاهیری نابێت، بەڵکو ئەو حیکمەتەی کە لەسەرو هەموو ژماردن و سنوور بۆ دانانێکە،( دەریای حیکمەت کە دەڕژێتە ناو دڵەوە) تەنها بە موجاهەدەی نەفس و ڕیازەتکێشان و حاڵەتی موراقەبەو چاودێری یەوە ، ئەو دەروازە فراوانەی لەسەر دەکرێتەوە، کە پێکەوە دەست بکات بە ئەنجام گەیاندنی کردەوە ئاشکرا و شاراوەکان( واتە ئەعمالی ظاهیری و باطینی) تاوای لێ دێت وەك دابنیشێت لە حزوری خودای گەورەدا، بە ئامادەبوونی دڵ و لەخەڵوەیەکی ڕاستەقینەو، بە بیرو ئەندێشەیەکی صافەوە، وە دابڕانی تەواو لە هەموو شتێک جگە لە خودای گەورە، کە ئەم حاڵەتە ڕوحی یە دەبێتە کلیلی دابارینی ئیلهامی خودایی و، سەرچاوەی کەشف و ئاشکرابوونی نەزانراوەکان.

زۆر کەسی فێرخواز هەبوون، ماوەیەکی درێژ خایەن خەریکی فێربون و وەرگرتنی

---

(١) قوت القلوب ١٤٧/١ بنحوه.

**(٢) بە بۆنەی مورشیدێکی کامیل و عارفێکی پێگەیشتوی بەرچاو ڕون کە لەبەرەکەت و مەعنەویاتیەوە سوودمەند بێت**، بنوارە: إتحاف ٤٠٢/١.

زانستی ظاهیری بوون، لەگەڵ ئەو هەموو ماندو بونەیاندا نەیانتوانی ئەو دیو سنووری بیستنی قسەکانی مامۆستا تێ بپەڕێنن، کەچی هەندێکی زۆریش هەبوون، کە تەنها بابەتەگرنگەکانیان دەخوێند، بەڵام خۆیان یەکلایی کردبویەوە بۆ کارکردن و موراقەبەی دڵ، کە خودای گەورە هەموو جۆرەکانی لە طائیفی حیکمەت و پەندیاری بۆ دەرخستوون و لەسەر کردونەتەوە، کە ئەقڵی داناو بیرتیژ و هەستیارەکان سەریان لێی سوڕ بمێنێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((مَنْ عَمِلَ بِما عَلِمَ وَرَّثَهُ اللهُ عِلمَ ما لَمْ يَعلَم))[١]

ئەوەی کار بەو زانستانەی بکات کە دەیزانێت، خودای گەورە ئەیکات بە میراتگری ئەو عیلم و زانستانەی کە هەرگیز نەیزانیون.

وە لە هەندێك لە کتێبی پێشینەکاندا هاتووە:

ئەی بەنی ئیسرائیل، مەڵێن زانست وا لە ئاسماندا، کێ دەتوانێت دایبەزێنێتە خوارەوە، وە مەڵێن ئەوەتا لە ژێر زەویدا کێ دەتوانێت بەرزی کاتەوە، یان ئەوتانێ لەو پەڕی دەریاوە کێ دەتوانێت بیپەڕێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتە ئەم بەرەوە. زانست خراوەتە ناو دڵتانەوە، لە میانی دوو دەستەی قودرەتی مندا فێری ئەدەب و ڕەوشتی بەرزببن، لە ڕوحانیەکان سوود وەربگرن، وە لەبەر خاتری من ڕەوشتی صددیق و ڕاستگۆکان وەربگرن، زانست ئاشکرا دەکەم لەناو دڵتاندا، تا پەردەیەکتان بۆ بکات و داتان بپۆشێت.[٢]

---

(١) أخرجه أبو نعيم في الحلية(١٥/١٠) من حديث أنس و ضعفه. [ قال الزبيدي: ٤٠٣/١، و أورده صاحب القوت ٢٠٨/١، بلا سند ومن شواهد ما أخرج أبو نعيم في الحلية ٧٢/١ عن علي رفعه: ( **من زهد في الدنيا علمه الله بلا تعلم، وهداه بلا هداية، و جعله بصيرا، و كشف عنه العمى**)] [ وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية: لم أجد له إسنادا].

(٢) قوت القلوب(١٣٧/١).

سەهلی کوری عبدوڵلای توستەری(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:
زاناکان و زۆر لە عابیدو خوداناسەکان و دونیا نەویستەکان لە دونیا دەرچوون، دڵیان داخرابوو نەکرابوونەوە، تەنها دڵی صددیق و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان کرابونەوە، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ﴾ الأنعام(٥٩). واتە:
( کلیلی غەیب و نادیارییەکان لای خودا خۆیەتی و، کلیلی مەعریفەت و زانینی سەرچاوەی تەوحیدو یەکتاپەرستی لای خودایە و تەنها خۆی دەیزانێت.[١]
ئەگەر دڵی ئەو کەسانەی کە خاوەنی دەرك و شارەزایین، ئەگەر دڵیان شایستە نەبوایە بۆ ئەو نوورەی کە دەچێتە ناویەوە، ئەگەر نووری شاراوەی ناو دڵیان نەبێتە فەرمانڕەوا بەسەر عیلمی ظاهیردا، ئەوا پێغەمبەر ﷺ نەیدەفەرموو:
((إستَفتِ قَلبَكَ وإنْ أَفتَوْكَ وأفتَوكَ وأفتَوْك))[٢]
واتە: (داوای فتوا لە دڵی خۆت بکە، با کەسانی فتوادەریش فتوایان بۆ دابیت و با فتوات بۆ بدەن ، با فتوات بۆ بدەن، سێ جار دوپاتی دەکاتەوە).

---

(١) قوت القلوب(١٥٢).

(٢) رواه أحمد في مسنده(٢٢٨/٤) ئەم حاڵەتەش تایبەتە بەو کەسانەی دڵیان وریایەو هەڵیان خستووەو کردویانەتەوە بۆ وەرگرتن و بیستنی قسەی حەق، وە بەچاکی و ئامادەباشی پێی هەڵدەستن و، ڕوتی دەکەنەوە لە هەموو ئارەزوات و مەیلێکی دونیایی، چونکە(فیقە) تایبەت نییە بە وەصف کردنی زوبانەوە، بۆیە ئەگەر پرسیار لە مرۆڤی ئەهلی دڵ کرا، با وەڵام لە دڵی خۆی وەربگرێتەوە، ئەو دڵە ئەگەر شایستەو وریانەبێت، وە دەستەڵاتی بەسەر زوبان و عیلمی زاهیردا نەبێت، چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: فتوا لە دڵی خۆت وەربگرە: باموفتی یەکانیش فتواتان بۆ بدەن.لەبەشی دووهەمی ئەم کتێبەدا بە درێژی باسی کراوە بنوارە بۆ زیاتر: إتحاف ٤٠٣/١.

پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پەروەردگاریەوە کە خودا فەرمویەتی:

**((لاَ يَزالُ العَبدُ يتَقَرَّبُ إليَّ بالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإذا أحْبَبْتُه كُنتُ سَمعَهُ الَّذي يَسمَعُ بِهِ... الحديث))** [1] واتە:

( بەردەوام بەندەکانم بە هۆی بەجێ هێنانی سوننەتەکانەوە لە من نزیك دەبنەوە، تاوایان لێ دێت من خۆشم دەوێن، ئەگەر خۆشم ویستن من دەبم بەو گوێیەی کە پێی دەبیستن)، (واتە لە هێزی بیستنی خۆمیان پێ دەبەخشم).

چەندەها واتاو وردەکاری تایبەتی هەیە لە ئەسرارو نهێنیەکانی قورئان کە دەکەونە ناو دڵی ئەو کەسانەی خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ زیکرو بیرکردنەوە، کە ئەو نهێنیانە بۆیان بگەڕێیت، تەواوی کتێبە تەفسیرەکانی قورئان لێی خاڵین، بەڵکو گەورە زانایانی ئەهلی تەفسیر دەرکیان پێ نەکردووەو پەییان پێ نەبردووە.

هەر کاتێك ئەو ئەسرارانە ئاشکرا دەبن، بۆ ئەو موریدانەی لە حاڵەتی موراقەبەدان، وە دەخرێنە بەر چاوی موفەسیرەکانی قورئانەوە[2] بەجوانی

---

(١) رواه البخاری(٦٥٠٢).

(٢) ئەو موفەسیرانەی کە ئینصافیان هەیەو لەو بەشە گرنگەی مەعنەویات بەشدارن، دوورکەوتونەتەوە لە پەیوەندی هەواو ئارەزواتی نەفسی و شەیتانی، ئەو کاتە دان بە ڕاستی و نهێنیانەدا دەنێن، شێخ عەلی وەفا(قُدِّسَ سِرُّهُ) لەشەرحی ئیحیادا دەفەرمووێت: ئەو کەسەی بە ئیخلاصی دڵەوە بەردەوام بێت لە سەر زیکری قەلبی، وای لێ دێت لە میانی بەرزایی عەرشەوە تا خوار فەرش و زەوی، هەمووی لە ژێر نەزەرو خواستی ئەودا دەبێت، هەروەها فەرموویەتی: هۆکارەکان مەدەد و فریادڕەسن، چراکانی مەبەستە پیرۆزەکانن، چەندێ مەدەدو یارمەتیەکان زیاتر پاڵفتەو صەفادراوبن، ئەوەندەش تیشکی چراکان پڕشنگدارو بەهێز تر دەبن. وە لەو ئەسرارو نهێنیانە وەك دەریایەك لە زانستی دەچێتە سەر

دادەنێن و، دەزانن کە ئەو واتاو نهێنیانە لەو بێداریانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە دڵە صەفادراوەکانەوە هاتونەتە دەرەوە، دڵی پاڵفتەکراو و لوطف و میهرەبانی خودای گەورەو باڵا دەست بە هۆی دەرونی ئەو خاوەن هیممەتە بەرزانەی کەڕویان لە خوداوەند کردووە، وە هەروەها لە زانستەکانی دەرخستنی شتە شاراوەکان و نهێنیەکانی زانستی، چۆنیەتی هەڵس و کەوتیان لێ ئاشکرابووە لەگەڵ وردەکاریەکانی ئەو هەواڵ و زانیاریانەی کە دەکەونە ناو دڵەکانەوە[1]

---

خەرمانی نهێنیەکانیان، وەك[ أبو الحسن البكري] قوطبی ناوداری طەریقەت لەناو جامیعەی ئەزهەردا تەنها لەسەر سورەتی فاتیحەو تەفسیرە ئیشاریەکانی نزیکەی سێ صەد مەجلیسی تایبەتی بۆ گرتووە، هەموو دەرسەکانی پڕ بووە لە ئەسرارو نهێنی تازەتر، ئەم جۆرە فەیزو مەعریفەت و ئەسرارە مەگەر کەسێك لێی مەحروم بێت کە ئینکاری بکات، ئەینا لای ئەهلی بڕوا جێگای متامانەیە. ئەوانە شارەزا دەبن لە حەقیقەتی عیلم و ،حاڵ دەبن لە نهێنیە شاراوەکان کە بە ئەو پەڕی لێ بڕان و خزمەت و خۆیەکلایی کردنەوەوە خوا ئەو زانستەی پێ بەخشیون، بە چاوی قودرەتی خودا سەیری ڕوداوەکانی پێ دەکەن و، بەزوبانی حەقوێژیان وەصفی حیکمەتەکانی خودای پێ دەکەن، واتا شاراوەکانی قورئانی پێ ئاشکرا دەکەن و، شارەزا دەبن لە عیلمی سوود بەخشی ڕاستەقینە، کە لە میانی عەبدو خالیقدا هەیە، بە ئەندازەی زۆری ئەو عیلمە لە نزیك و موقەررەبانی دیوانی خودا ئەژمێررین... إتحاف ١/٤٠٤ .

(١) واتە ئەم سێ بەشەی زانست(( علومی موکاشەفە و ئەسرارەکانی علومی موعامەلەو وردەکاریەکانی خەواطری قلوب)) عیلمی موکاشەفە: بەدەرکەوتنی تەجەللیاتی زاتی خوداو دەرکەوتنی ئەو کردارانەی کە دەلالەت دەکەن لەسەر واتاکانی وەصفە شاراوەکان. وە ئەسراری علومی موعامەلەش: لە وەدا کە زانستیی وەرع و ئیخلاص فێر ببن، وە وردەکاریەکانی ئەو خەواطیرانەی کە

چونکە بەڕاستی هەریەکێك لەم زانستە دەریایەکی بێ پایانەو، ناتوانیت بگەیتە قووڵیەکەیەوە، ئەوەندە هەیە هەموو فێرخوازو موریدێك ڕۆدەچێت تیایاندا بە ئەندازەی ئەوەندەی کە بەشی دراوە. وە بە پێی ئەو ئاستەی کە خودا یارمەتی و تەوفیقی داوە لە ئەنجام دانی کارە باشەکان.

لە تاریف و پێناسەکردنی ئەو زانایانە حەزرەتی عەلی(خودای لێ ڕازی بێت) لە فەرموودەیەکی درێژدا دەفەرمووێت:

دڵەکان وەك زەرف و دەفرو توورەکەیەك وان کە شت هەڵبگرن، باشترینی دڵ ئەوەیە زیاترین شت لە خۆیدا بپارێزێت.

**وە بزانە کە ئەو خەڵکە سێ جۆرن:**

زانایەکی ڕەببانی، وە قوتابی و فێرخوازێك کە لەسەر ڕێگەی ڕزگاربوونە، وە کەسێکی هەرچی و پەرچی(نەفام و بێنرخ) کە شوێن هەموو بۆ قیەو دەنگۆیەك دەکەوێت، لە هەرکوێوە بای هەبوو شەن دەکات و لا دەکاتەوە بە لایدا، ئەوانە دڵیان بە نووری زانستی ڕۆشن نەبووەتەوە، پەنایان نەبردووە بۆ هیچ بنەمایەکی بتەوو متمانە پێکراوە.

زانست لە ماڵ زۆر باشترە، زانست پاسەوانیت دەکات، بەڵام تۆ خۆت دەبیتە پاسەوانی ماڵەکەت، زانست لێی سەرف بکەیت هەمیشە زیاد دەکات بەڵام ماڵ چەندت لێ خەرج کرد ئەوەندە کەم دەکات، وە خۆشویستنی زانست بەشێکە لە ئاین، پێی بەهرەدار و خاوەن چاکە دەبیت، بەهۆی عیلمەوە لە

---

دەکەونە ناو دڵەکانەوە، وە ئەو هەموو ڕەنگە جیاوازانەی دادەبارێن بەسەر دڵی موریدەکانداو لەگەڵ لە بەرچاوگرتنی جیاوازیی ئامادەباشی عاریف و خواناسەکان لە چۆنیەتی وەرگرتن و بینینی ئەو خەواطیرو هەواڵە تایبەتیانەدا کە دەکەونە ناو دڵەکانەوە.

ژیانیدا کەسبی طاعەت و گوێڕایەڵی دەکات، وە خەصڵەتی باشی نیشاندەدات و دوای مردنیشی ناوو شۆرەت و چاکەکانی ئاشکرا دەکات و زیندوی دەکاتەوە.

زانست فەرمانڕەواو دادوەرە، بەڵام ماڵ و سامان حوکم لەسەر دراوەو جێبەجێ کارە، دوای نەمانی ماڵ سوودەکەیشی نامێنیت، ( واتە هەر خزمەت و رێزێك لە یەکێ گیرابێت بە هۆی ماڵەکەیەوەیە، کە ماڵێ نەما رێزەکەیشی نامێنێت) ئەوانەی ماڵیان لەسەر یەك خست و کۆیانکردەوە هەر لەژیاندا بەمردوو حیسابن و خۆیشیان زیدوون، زاناکانیش تا ژیان مابێت، ناوشۆرەتیان بەردەوام و زیندوون (لاشەیان لە بەرچاودا ونبووەو وێنەکانیشیان لەناو دڵەکاندا جێگیرە) لە پاشان هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو فەرمووی:

هــــــــاە! بەڕاستی ئالێرەدا( هێمای بۆ سینەی خۆی کرد) زانستێکی زۆری تێدا کۆبووەتەوە، ئەگەر کەسانێك ببوایە وەریان بگرتایە و هەڵیان بگرتایە!!

بەڵکو(جێگەی داخە) کەسێکی زیرەك و فێرخواز و متمانە پێ نەکراوم دەست کەوتووە، کە ئامێری زانستی بەکاردەهێنێت بۆ وەدەستهێنانی دونیا، بە نیعمەتەکانی خودا خۆی بەسەر ئەولیاکانی خودادادا ڕادەکێشێت، وە بەڵگەکان و ئایەتەکانی خودا دەخاتە پشت سەریەوە و سەرقاڵ دەبێت بە غەیری ئەو بەڵگانەوە، خۆیشی بەسەر خەڵکەکەدا دەردەخات و خۆی بەسەریاندا شۆڕ دەکاتەوە.

یان کەسێکە کە سەر بۆ حەقق و ڕاستی دادەنوێنێت، بەڵام بەرچاوی ڕوون نی‌یە، هەر شوبهەو گومانێك بکەوێتە بەرچاوی یەکسەر گومانەکە لە دڵیدا دەچێنێت و، چاوی دڵی کوێرە تاڕاستیەکان ببینێت، نە ئەمەو نە ئەوەی پێشوو هیچیان بۆ (ئەو زانست و ئەسرارە) بەکەڵك نایەن.

یان کەسێکی تر کە هەمیشە هۆگری تام و چێژەکانە و، زۆر بە ئاسانی بەرامبەر ئارەزووەکان جڵەوی خۆی لەدەست دەدات، یان بە کۆکردنەوەی ماڵ و سەریەك خستنیان هەڵخەڵەتاوە و فریوخواردوی هەواو ئارەزواتی خۆیەتی.
واتە:

وەك ئەو دوو کەسە( کە وێڵی دوای لەززەت و فریو خواردووی ماڵ و سامانن) وەك ئەو ئاژەڵ و گیاندارانە وان کە هەمیشە خەریکی لەوەڕاندنن.

ئەی خودای گەورە! ئابەم شێوەیە کە زانست دەمرێت، ئەگەر هەڵگرانی مردووبن، بەڵام ئەوەندە هەیە هەرگیز زەوی خاڵی نابێت لە کەسانێك کە بەڵگە دروستەکانیان بەدەستەوە بێت و، ڕاوەستاو بن لە سەر حەق.

ئەو کەسانە یان بەبەرچاوەوەن و ئاشکران بۆ خەڵکی، یان دەترسن و تێکشکاون[1]

ئەوانە بەردەوام لەکایەدان، بۆ ئەوەی حوججەت و بەڵگەو ئایەتەکانی خودا هەڵنەوەشێتەوە، چەندن و لەکوێن؟

---

(١) لە ڕیوایەتی خاوەنی(حیلیە) دا ئەو ڕستەی تیا نییە، وە بەلای(إبنُ القَیم)ەوە ئەم زیادەیە دانراوی ڕافیزیە درۆزنەکانە، کە زیادیان کردووە( **إمّا ظاهراً مَشهُوراً و إمّا صفیّاً مَستُورا**) واتە یان شاراوەن و لەبەرچاونین، بۆ ئەوەی ببێ بە بەڵگە لەسەر ئەو مەهدی یە چاوەنواڕکراوەی کە باسی دەکەن. فەرمودەکە لە حەزرەتی عەلی‌یەوەیە، کەس ئەم ڕستە زیادەی پێوە نەلکاندووە، مەگەر درۆزن و دەججالەکان. چونکە حوججەت و بەڵگەی دروستی خودایی هەرگیز بە کەسێکی ترسنۆکی شاراوەی نادیار دەرناکەوێت و ئاشکرا نابێت، کە کەس نەیبنێت و وشەیەکی لێ نەبینرێت و نەشزانرێت جێگاکەی لە کوێیە: إتحاف، شەرحی ئیحیا ٤٠٥/١.

ئەوانە ژمارەیان کەمە، بەڵام قەدرو ڕێزیان گەورەو گرانە؟!

تەن وجەستەیان لە بەرچاودا ونەو، ووێنەیشیان لە دڵەکاندا هەیەو جێگیرە، بەهۆی ئەمانەوە خودای گەورە بەڵگەکانی دەپارێزێت، تا دەیخەنە ناو سینەی

هاو وێنەکانیان، وە بەڵگەکان لە دڵی هاوشێوەکانیاندا دەچێنن.

زانست ئەمانەی داوەتە بەرو پێش خۆبی خستوون، تا گەیاندوونی بە حەقیقەت و ڕاستی فرمانەکان، گەیشتوون بە ڕۆحی یەقین و متمانە پێکراو، ڕێگەی سەخت و تووشی (موتریف)و لەسنوور دەرچوەکانیان تەخت و نەرمی کردەوە، وە دڵیان داهاتووە و پەیوەست بووە بەو حەقیقەتەی کە غافڵەکان لێی دوورو بێ ئاگا بوون، بەلاشەکانیان لەناو دنیایەکدا دەژیان کە ڕۆحیان هەڵواسراو و پەیوەندار بوو بە جێگا بەرزەکانەوە.

ئەوانە بەڕاستی لەناو دروستکراوەکاندا ئەولیاو دۆستەکانی خودای گەورە و باڵا دەستن، وە ئەمیندار و کارگوزار و ڕاپەڕێنەری فەرمانەکانن لەسەر زەوی‌دا، کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لای دینی خودا.

لە پاشان(حەزرەتی عەلی گریا و فەرمووی:

ئای چەندێك تاسەی دیداری ئەوانەم.[1]

ئەمەی کە لەدوا جار داباسی فەرموو، صیفەت و پێناسەی زانایانی ئاخیرەتە، کە ئەو زانستەیە زیاتر بەهۆی کارکردن و بەردەوامی لە ڕیازەی نەفس و موجاهەدە وە دەستیان دەکەوێت.

---

(١) أخرجه أبو نعيم في الحلية(١/٧٩-٨٠) و الخطيب في (تأريخ بغداد) (٦/٣٧٦)، وانظر(قوت القلوب) (١/١٤٢-١٤٣)، و إتحاف السادة المتقين(١/٤٠٦).

# یەکێکی تر لە جیاکاریەکان

# زانای ئاخیرەت و بەهێز کردنی یەقین و متمانە

دەبێت زانای ئاخیرەت زۆر گرنگی و بایەخ بدات بە بەهێزکردنی متمانەی خۆی، چونکە سەرمایەی ئەم دینی ئیسلامەیە یەقین و بوونی دڵنیاییە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**(( اليَقِينُ: الإيمانُ كُلُّهُ))**[1]

واتە ئیمان و بڕوا هەمووی بریتی‌یە لە یەقین و دڵنیایی، سەرەتاکانی ئەو زانستەیە، لە پاشان ڕێگەی فێربوون بۆ ناو دڵ دەکرێتەوە، بۆیە **پێغەمبەر**(ﷺ) فەرموویەتی: ((**تَعلَّمُوا اليَقِينَ**))[1] واتە: لەگەڵ ئەوانەدا دابنیشن کە وەصفدار

---

(١) رواه أبو نعيم في ((الحلية) )٣٤/٥)، و أخرجه البيهقي في ((الزهد))(٣٦١(٩٨٤)) والخطيب في التأريخ ٢٦٦/١٣، من حديث إبن مسعود بإسناد حسن. [ قال الحافظ الزبيدي: ٤٠٨/١: قال العراقي في التخريج الكبير: رواه أبو نعيم في الحلية ٣٤/٥، و البيهقي في الزهد، و أبو قاسم اللاكلائي في كتاب السنة، ٩٣١/٥(١٦٨٢)، وقد أعلّه إبن الجوزي في العلل المتناهية (٨١٥/٢(١٣٦٤)) بمحمد بن خالد فقال: مجروح، و يعقوب بن حمدى ليس بشيئ، قال العراقي في التخريج الكبير: أما محمد بن خالد المخزومى فلم أجد أحدا من الأئمة جرحه، و أما يعقوب فأورده إبن حبان في الثقات، ٢٨٥/٩(١٦٤٦٤)،ثم قال: و الصحيح المعروف أن هذا من قول ابن مسعود، و هكذا ذكره البخاري في صحيحه تعليقاً، كتاب الإيمان: باب **بني الأسلام على خمس**، موقوفا عليه، ووصله الطبراني في الكبير(١٠٤/٩(٨٥٤٤) و البيهقي في (الزهد) من قول عبدالله قال البيهقي: هذا هو الصحيح موقوف].

واته: هیچ ئادەمیزادێك نی‌یە گوناهی نەبێت، بەڵام هەركەسێك خوو ڕەوشتەكەی ئەقڵ و دانایی بێت و، سروشت و شیمەیشی لەسەر یەقین دامەزرابێت، هیچ گوناهێك زیانی پێ ناگەیەنێت، چونكە هەر كاتێك گوناهێك بكات، یەكسەر تەوبەدەكات و داوای لێ خۆشبوون دەكات و پەشیمانیش دەبێتەوە، گوناهەكانی لەسەر نامێنێت و، تەوبەكەیشی دەبێتە كەفارەتی گوناهو، زیادە فەزڵێكیشی دەمێنیتەوە كە پێی دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

هە لەبەر ئەمەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**(إنَّ مِنْ أقلِّ ما أُوتيتُمْ اليَقينُ وعَزِيمَةُ الصَّبرِ، ومَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنهُما لَم يُبالِ ما فاتَهُ مِن قِيامِ اللَّيلِ وَصِيامِ النَّهارِ))**[1]

واتە:

---

(١) قال صاحب القوت(١/١٩٤)، و أخبر عليه الصلاة والسلام **إنَّ الصَّبر كمالُ العَملِ و الأجر**، فقال في حديث يرويه شهر بن حوشب الأشعري، عن أبي إمامة الباهلي، عن النبي ﷺ و ذكره، قال ملا علي في ((الأسرار المرفوعة)): قلت وهو مستفاد من قوله تعالى: (( **وما أوتيتُم من العلم إلا قليلا**)) و أما **عزيمة الصبر في العمل.. فكذا قيل، كما قال الله تعالى: ﴿ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ** ﴾سورة(ص(٢٤)).

وروى ابن عبدالبر في: العلم١/١٢٥، من حديث معاذ: **ماأنزل الله شيئاً أقلّ من اليقين، ولا قسّم شيئاين الناس أقلَ من الحلم**...الحديث

[ وقال الزبيدي(١/٤٠٩): أورده صاحب القوت ١/٢٣٥، قال العراقي في التخريج الكبير: وأما حديث معاذ فلا يصح إسناده، وقد رُوِيَ نَحوه مختصراً من قول بعض الأشياخ، رويناه في كتاب اليقين لابن أبي الدنيا ص/٦، عن أبي بكر بن أبي مريم عن الأشياخ قال: **ما نوفل في الأرض شيءٌ أقل من اليقين، ولا قسم بين الناس أقل من الحلم**.هذا حديث مقطوع ضعيف]

کراون بە زانستی یەقین، وە لەو زانایانە عیلمی یەقین بیستن و فێربن، بەردەوام بن لەسەر چاولێکردنیان، بۆ ئەوەی یەقین و دڵنیایی ئێوەش بەهێز ببێت، وەك چۆن هی ئەوان بەهێزو قایمە.
وە بە دڵنیاییەوە کەمێك یەقین کە هەیانبێت باشترە لە زۆرێك لە کارکردن.
پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا پێیان ووت:
ئەگەر پیاوێك گوناهی زۆر بێت و خاوەنی یەقینێکی جوان بێت، لەگەڵ کەسێکدا کە زۆر هەوڵ و تێکۆشانی عیبادەتی هەبێت، بەڵام یەقین و دڵنیایی کەم بێت؟
پێغەمبەر(ﷺ)(لەم بارەوە)فەرموویەتی:
**((ما مِنْ آدَمِيٍ إلاَّ ولَهُ ذنُوبٌ، ولكِنْ مَن كانَ غريزتُهُ العَقلَ وَسَجِيَتُهُ اليَقينَ، لَم تَضُرُّهُ الذُنوبُ، لأنَّهُ كلَّما أذنَبَ تابَ واستَغفَرَ ونَدِم ، فتُكَفَّرُ ذُنوبُهُ، ويَبقَى لَهُ فَضلٌ يَدخلُ بِهِ الجَنَّة))**[2]

---

(١) رواه أبو نعيم في (( الحلية)) ٩٥/٦، و ابن أبى الدنيا في (اليقين)(٧)، من قول خالد بن معدان، قال الزبيدي: فيه العباس بن الأخنس مجهول قاله الذهبي في الميزان ٤٨/٤.

(٢) الحديث عند الحيكم الترمذي في نوادر الأصول ص(٢٤٢)٣٧٥/٢، من حديث أنس بإسناد مظلم.[قال الزبيدي ٤٠٩/١: هكذا أخرجه صاحب ((القوت) (٢٣٥/١)وقال العراقي في التخريج الكبير: وإسناده مجهول، قلت: وأخرجه الإمام أحمد في مسنده (١٢٦٣٧) وعبد بن حميد في مسنده ص/٣٦٠(١١٩٧)، والترمذي كتاب صفة القيامة....،بابٌ منه(٢٤٩٩) والدارمي ، كتاب الرقائق، باب في التوبة(٢٧٢٧) والحاكم في المستدرك،٢٧٢/٤(٧٦١٧) والبيهقي في الشعب٤٢٠/٥(٧١٢٧) كلهم عن أنس رفعه: **كلُّ ابن آدم خطّاءٌ وخير الخطّائين التوابون**، وهذا يصلح أن يكون شاهداً لبعض الحديث المذكور.[ و انظر المطالب العالية (٢٦٦/٧-٢٦٩).

(یەقــین و ئیــرادە و عەزیمەتــی صــەبرو خــۆڕاگری، لە کەمترینــی ئەو نعیمەتانەیە کە پێتان دراوە، وە هەرکەسێک بەشی خۆی هەبێت لە دڵنیایی و ئیــرادەی خــۆڕاگری، ئەو کەســە بەخەیاڵیــا نــایەت کە ئەگەر شــەونوێژ و بەڕۆژوبوونیشی فەوتابێت، واتە:

یەقین و خۆڕاگرییەکە ئەو کەلێنەی بۆ پڕ دەکاتەوە).

یەحیای کوڕی معازیش فەرموویەتی:

بەڕاستی یەکتاپەرستی نووری خۆی هەیە و، شەریك و هاوتایی پەیداکردنیش بۆ خودا ئاگری خۆیی هەیە، وە دڵنیابن کە نووری تەوحید زیاتر کردەوە خراپەکانی یەکتاپەرستەکان دەسوتێنیت لە ئاگری شەریك بۆ خوداقەراردان کە زیان لەچاکەی موشریەکەکان دەدات، مەبەستی( یەحیا) لە نووری تەوحید نووری یەقین و دڵنیابوونە.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هێمای کردووە بۆ ئەوانەی کە یەقینی تەواویان هەیە، لە چەندین جێگەدا، کە بەڕاستی تەنها یەقین و دڵنیایی تەواوە کە واسیطەو هۆکاری هەموو خێرو بەختەوەرییەکە بۆ باوەڕداران.

ئەگەر ووتت:

کەواتە واتای یەقین چییەو، ئەوە مەعنای چیە کە بەهێز دەبێت یان لاواز؟

بۆیە پێویستە لەسەرتاوە لە مانای یەقین تێ بگەین، لە پاشان خۆمان سەرقاڵ بکەین بەوەی کە بەدوایدا بگەڕێین و فێری ببین. ئەوەی لە شێوەو وێنەکەی حاڵی نەبێت و لێی تێ نەگات، ناشتوانێت کە بەدوایدا بگەڕێت.

**بزانە: یەقین وشەیەکی هاوبەشە لە میانی دوو تیم و تاقم دا، کە بۆ دوو واتای جیاواز بەکاری دەهێنن:**

# پێناسەی یەکەم:

## زاراوەی یەقین لە ڕوانگەی ئەهلی نەزەرو زانایانی عیلمی کەلامەوە:

مەبەستیان پێی نەبون و نەمانی گومانە.( واتە گومان لە شتێك بکەیت دەبێتە دژی متمانە پێ کردن و دڵنیایی). چونکە نەفسی مرۆڤ کە دەیەوێت فرمانێك پشت ڕاست بکاتەوەو تەصدیقی بکات، چوار پلەو مەقامی بۆ هەیە:

**یەکەم ئەوەیە:** کە باوەڕ پێکردن و پشت ڕاست کردنەوەی ئەوفرمانە یان بەدرۆخستنەوەی بێت، هەردووکی لەلای یەکسان بێت، بەم حاڵەتەش دەوترێت گومان، وەك چۆن ئەگەر پرسیارت لێ کرا دەربارەی کەسێکی دیاری کراو، ئایا ئەو کەسە خودای گەورە تۆڵەی لێ دەسەنێتەوە یان نا؟ حاڵی ئەو کەسەش نەزانراوە و تۆ لێی شارەزا نیت، ئەو کاتە نەفسی خۆت هانت نادات حوکم بدەیت بە لایەکیاندا بە جێگیر بوونی تۆڵە بۆی یان بەرنەکەوتنی.

بەڵکو هەردوو لایەنەکە لای تۆ یەکسانەو(هیچ کامیان لەو یان لە پێشتر نی‌یە) بۆیە بەمە دەوترێت شك( واتە نەگەیشتۆتە پلەی گومان).

**دووهەم ئەوەیە:**

مەیلی دڵی خۆت بدەیت بەلای یەکێك لەو دوو فرمانەی کە خراونەتە بەردەمت، لەگەڵ ئیمکان و گونجانی لایەنەکەی تریش.

بەڵام ئەم ئەگەرەش کە دروستە وابێت، ڕێگری لەوە ناکات کە لای تۆ لایەکیان بارسەنگی هەبێت بەسەرلاکەی تردا، وەك چۆن ئەگەر پرسیارت لێ کرا دەربارەی پیاوێك کە بە ئەهلی چاکەو تەقواکار ناسیوتە، ئایا ئەو شەخصە ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە مرد تۆڵەی لێ دەسەنرێت و سزای دەدرێت؟ کە سەیری نەفس و دڵی خۆت دەکەیت مەیلت بەلای ئەوەدا دەڕوات، کە سزای نادرێت، زیاتر لەوەی کە تۆڵەی لێ بسەنرێتەوە، چونکە نیشانەکانی پیاوچاکی لێ

دیارو ئاشکرایە، بەڵام ئەوەش بەدوور نازانیت کە لەوانەیە کارێکی شاراوەی خێرای هەبێت لە باطین و نهێنیەکانی دا بەرەو سزای خودایی ببات.

ئەم بەدروست زانینە لەبەرامبەری ئەو مەیلەدا هاتووە کە نایەوێت سزا بدرێت، بەڵام ناتوانێت بارسەنگی ئەو لایەنە کەم بکاتەوە کە بڕوای وایە تۆڵەی لێ ناسەنرێتەوە ، کەواتە ئەم حاڵەتە پێی دەڵێن گومان(واتە: ظەن).

**سێیەم ئەوەیە:**

کە نەفسی مرۆڤ بەلای ئەوەدا بڕوات، کە پشتڕاستی بابەتێك بکاتەوە کە بڕوای لەسەری دامەزراوەو خەیاڵی ناڕوات بۆ هیچ لایەکی تر، خۆ ئەگەر خەتەرەیەك بۆ شتێکی تر بڕوات دژ بەو بابەتە، نەفسی خۆیشی قەبوڵی ئەو خەتەرەو گومانە ناکات، ئەمەش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نییە، بەڵکو خاوەنی ئەم پلەو مەقامە، ئەگەر بەجوانی گوێی بگرتایەو گوێی دڵیشی بکردایەتەوە بۆ ئەو شك و گومان و بەدروست زانینەی کە باسمان کردن، ئەو کاتە مەیلی دڵی بەولایەدا ساغ دەبویەوە کە بەدروستی دەزانێت. ئەم حاڵەتەش ناو دەبرێت بە بڕوایەکی نزیك لە یەقین، کە بیرو باوەڕی عەوام و ڕەشەخەڵکەکە لە هەموو مەسەلە شەرعیەکاندا ئاوایە، کە تەنها بەوەندەی بابەتەکەیان بیستووە، لەناو دڵیاندا جێگیر و چەسپاوە، تەنانەت هەموو پێڕو گروپە جیاوازەکانیش متمانەیان لەسەر مەزهەبەکەی خۆیان و ڕاستی و دروستی سەر مەزهەب و شوێن کەوتوانیان هەیە، تەنانەت ئەگەر بووترێت بەیەکێکیان: کە لەوانەی پێشەواکەیان بەهەڵەدا چوبێت، ئەوا ڕەددی دەکاتەوە و قەبوڵی ناکات.[1]

---

(١) بنوارە: ((الأقتصاد في الإعتقاد)) ی ئیمای غەزالی ص ٢٨٨ کە بە درێژی ڕونی کردۆتەوە.

**چوارەم:**

ئەو زانینە ڕاستەقینەیە کە بەهۆی بەڵگەی سەلمێنراوەوە بۆی پەیدابووە، کە هیچ گومانێکیان تیدا نیە ، گومانیش ناچێتە ناو هزرو خەیاڵەوە، جا ئەگەر بابەتێک بوونی گومانی تیا نەبوو، وە ڕێگەیشی نەبوو کە گومانێکی تری بۆ بڕوات، ئەو بابەتە بە لای زاناکانەوە ناو دەبرێت بە یەقین.

نمونەی ئەمە: ئەگەر بە عاقڵێك بووترێت:

ئایا لەم بوونەوەرەدا شتێکی وا هەیە کە هەر بووبێت و ئەزەلی بێت؟

ئەو کەسە بەبێ بەڵگەو تێڕامان یەکسەر ناتوانێت ئەو بوونەیە بسەلمێنیت، چونکە قەدیم ناچێتە ژێر یەکێ لە هەست پێکراوەکان، وەک خۆر و مانگ نیە کە بەچاو ببینرێت و بەهۆی یەکێ لە حاسە هەستیارەکانەوە دان بە بوونیاندا بنرێت، وە هەروەها زانین بەبوونی شتێکی قەدیم و ئەزەلی، شتێکی (زەروری) نییە، کە پێویستی بەبەڵگە نەبێت و بەتەنها بینینی یەکسەر لێی دڵنیا ببیت، وەك سەلماندنی ئەوەی کە ژمارە دوو زیاترە لە ژمارەیەك، بەڵکو وەك ئەوەی کە بزانیت بوونی شتێك و پەیدابوونی بەبێ هیچ هۆکارێک ئەوە مەحاڵە، چونکە ئەم جۆرە زانینەش دەکەوێتە خانەی زەرورییەوە،

( واتە: شتێکی بەدیهییە و بۆ کەسێکی دانا بەڵگەی ناوێت)کەواتە هەق خۆیەتی سروشتی عەقڵی کەسێك ڕابووەستی لە سەلماندنی بوونی شتێکی قەدیم، هەروا بەسەر پێیی و بێ بەڵگەیی بیسەلمێنێت، کە ئەو شتە هەر لە قەدیم دابووە، بەڵکو بەدوای بەڵگەو دەلیلدا دەگەڕێت.

لە پاشان کەسانێك هەن کە ئەم بابەتە لە خەڵك و کتێبەکانەوە دەبیستن و یەکسەر بە دڵنیایی وەری دەگرن و باوەڕی پێ دەکەن، وەبەردەوامیش دەبن لەسەر ئەم حاڵەتە، ئەمەش پێی دەوترێت ئیعتیقادو باوەڕ، کە حاڵی تێکڕای

نەخوێندەوارەکان ئاوایە. وە کەسانێکی تر هەن کاتێك باوەڕ دەکەن کە بەبەڵگە پێیان بسەلمێنیت، وەك ئەوەی کە پێیان بووترێت:

ئەگەر لەناو ئەو بوونەدا قەدیمێکی تیا نەبێت کە هەر بووبێت و نەبوونی نەهاتبێت بەسەردا، کەواتە هەموو ئەوانەی ئێستا بوونیان هەیە دەبێت پەیدابووبن، ئەگەر هەموویشی هەر بە خۆی پەیدابووبێت، کەواتە بەبێ هیچ سەبەب و هۆکارێك پەیدابوون، یان هەندێك بوون و پەیدابوویان تێدایە کە بەبێ هۆکارێك پەیدابووە، کە ئەمەش مەحاڵە، وە هەر ئەنجامێکیش سەر لە مەحاڵەوە دەربکات سەرەتاکەیشی مەحاڵە، کەواتە پێویستە عەقڵ بیسەلمێنێت کە لەم(بوونە) دا شتێکی واهەیە کە دەبێت قەدیم بووبێت و هەر بووبێت، **چونکە ئەگەر هەموو شتەکان بەش بەشیان بکەین دەبن بە سێ بەشی سەرەکییەوە:**

یان دەبێت ئەوەی کە بوونی هەیە هەمووی قەدیم بێت.

یان هەمووی حادیس و پەیدابووبێت.

یان هەندێکی هەربووەو هەندێکیشی پەیدابووە.

ئەگەر شتەکان هەمووی هەر بووەو لە ئەزەلەوەیەو هەر قەدیم بووە، کەواتە مەبەستەکە هاتەدی، چونکە پرسیارەکە ئەوەبوو:

ئایا شتێك هەیە لەم بوونەدا قەدیم بێت؟

کەواتە: هەموو بوون و بوونەوەرەکان هەربوون و قەدیمن.

یان وەکو ووترا هەموو ئەوەی بوونی هەیە حادیسەو پەیدابووە، ئەمەش سەر لە مەحاڵەوە دەردەکات، چونکە وای لێ دێت کە شتێك بەبێ هیچ سەبەب و هۆکارێك بوونی هەبێت ، کەواتە بەشی سێیەمی جێگیر و سەلمێنرا کە هەندێکی هەبووە و هەندێکی پەیدابووە، یان بەشی یەکەم کە وتمان هەمووی هەربووەو قەدیم بووە.

کەواتە: هەرزانستێك بەلای زاناکانی ئەهلی نەزەر و کەلامـەوە لەسەر ئەم بنەمایە چەسپا، ئەوە بە عیلمی یەقینی دادەنێن، **ئیتر یەکسانە ئەو زانینە بەهۆی سەرنج و تێڕامان و بەڵگەوە دەستت کەوتبێت**، یان بەهۆی هەست و غەریزەو سروشتی عەقڵەوە بۆت پەیدا بوو بێت، وەك ئەوەی کە عیلمت پەیدا کردووە کە مەحاڵە شتێکی تازە پەیدابوو، بە بێ هۆکار و سەبەب پەیدا بوو بێت.

**یان زانرابێت بەهۆی تەواتورەوە**[1] وەك ئەوەی کە تۆ دەزانیت شاری مەککە هەیە بانەیشت بینیبێت، یان بەهۆی تاقی کردنەوەوە زانیارییەکەت وەرگرتبێت، وەك ئەوەی کە بۆت دەرکەوتووە، ئەوەی لێ نرابێت و سازکرابێت لە جۆرێکی دەرمان بۆ مەبەستی(ڕەوانی) ئەوە مرۆڤ ڕەوان دەکات.

**یان بەهۆی بەڵگەوە بۆت دەرکەوتبێت** وەك ئەو نمونانەی باسمان کردن.

بەڵام لەلای زانایانی عیلمی کەلام و ئەهلی بەڵگەو نەزەر، مەرجی ئەوەی کە وشەی یەقین بەکاربهێنن بۆ کارێک یان کەسێك، ئەوەیە:

کە هەرگیز گومانی لە پاڵدا نەبێت، هەر عیلمێك شك و گومانی لە پاڵدا نەبێت ئەوە بە یەقین ناودەبرێت، بۆیە هەرگیز یەقین بەم شێوەیە، بە لاوازی و کەم و کوڕی وەصف دار ناکرێت، چونکە جیاوازی نی‌یە لەوەدا کە گومانی لێ دوربخرێتەوە. (مادام یەقینێك گومانی لەگەڵدا نەبێت دڵنیایی تەواو دەبەخشێت).

---

(١) تەواتور: هەواڵ و خەبەرێکە کە کۆمەڵێکی زۆر گەیاندبێتیان بە کۆمەڵێکی تر کە هەرگیز نەگونجێت هەموویان کۆبوبنەوە لەسەر درۆ. وە ئەو هەواڵە بەهۆی تاقم تاقمی خەڵکەوە گەیشتبێت بە جیلەکانی تر تا گەیشتۆتە دەمی ئەو خەڵکەی لەو زەمانەدا دەژین.

## زاراوەی دووەم بۆ پێناسەی یەقین

بە پێی زاراوەی فوقەهاو زانایانی ئەهلی تەصەووف و زۆربەی زاناکانی تر.

**یەقین**: ئەوەیە کە هیچ واتایەکی شك و گومان و بەدروست زانین نەگرێتە خۆی، وەلەم ڕوانگەوە سەیری نەکرێت و لای بەلادا نەکرێتەوە، بەڵکو بەو شێوە بناسرێت کە یەقین واتە: هەموو دڵ بگرێتەوە و گەمارۆی بدات و بەمتمانەوە ناو دڵی داگیر بکات، تاوای لێ دێت بووترێت:

فڵان کەس یەقینی کزە بەمردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە گومانی بەرامبەر بە مردن نییە، یان دەووترێت؛ فڵان کەس یەقینێکی زۆر بەهێزی هەیە، لە بارەی ئەوەوە خودا ڕازیقەو ڕۆزی بۆ دەنێرێت و بۆی دابین دەکات، لەگەڵ بوونی ئەم دڵنییایەشدا، لەوانەیە کە بگونجێت ئەو ڕزقەی بۆ نەیەت.

( کەواتە لەو ڕوانگەوە سەیر دەکرێت کە یەقینەکە زاڵ دەبێت بەسەر دڵدا و داگیری دەکات) هەر کاتێك نەفسی ئینسان بەولایەدا ڕۆشت کە باوەڕ بە شتێك بکات و پشت ڕاستی بکاتەوە، وە ئەم باوەڕە زاڵ بوو، وە هەموو دڵی داگیر کرد، ئەوەندە سەیتەرەی کرد بەسەر دڵیدا تاوای لێ هات کە خۆی فەرمانڕەوا بێت و کاریگەریی لەسەر نەفسی خاوەنەکەی هەبێت، بەوەی ڕێگەی بدات شتێك ڕو لە دڵی بکات، یان مەنعی بکات و نەهێڵێت، ئەو کاتە کە ئەم حاڵەتەی بۆ پەیدا دەبێت پێی دەڵێن یەقین.[1]گومان لەوەدانییە هەموو

---

(١) دەستەواژەکانی ئەهلی تەصەووف هێمایان بۆ ئەم بابەتە کردووە: سەییدی ئەهلی طەریقەت جونەیدی بەغدادی فەرموویەتی: یەقین بریتیە لە: جێگیر بوونی زانست لەناو دڵدا بەشێوەیەك نەگۆڕان و نەهەڵگەڕانەوەو نەگواستنەوەی بەسەردا نەیەت و بەردەوام ئەو حاڵەتە بە خاوەنەکەیەوە دەبێت.

خەڵك بەشدارن لەوەدا کە باوەڕیان بە مردن هەیە کە ڕاستە و دێتەپێشەوە، گومانیشیان لەبارەیەوە نەماوە، بەڵام هەیانە لابە لای مردن و خۆ ئامادەکردن بۆ مردن ناکاتەوە، وەك ئەوەی باوەڕی پێی نەبێت، ( هەمیشە خەریکی ژیان و ڕابواردن و تام و چێژی دونیایە).

---

سەهلی توستەری فەرمووویەتی: حەرامە لەسەر دڵێک کە بۆنی یەقین بکات، ئەگەر ئەو دڵە بە غەیری خودا بەیەکێکی تر داکەوتبێت و داهاتبێت و، دڵی بە غەیری خودا بە کەسێکی تر بکرێتەوە. هەروەها ووتویانە: نیشانەی یەقین ئەوەیە: کە لە هەموو حاڵەت و ڕوداوێکدا کە دێن بەسەرتدا تەنها لا بەلای خودادا بکەیتەوە. وە تەنها بۆ لای خودا بگەڕێیتەوە لە هەموو فەرمانێکدا، وە لە هەموو حاڵەتێکیشدا تەنها کۆمەکی لە خوداوە وەربگریت، وە لە هەموو جوڵەو وەستانێکیشدا تەنها ڕەزای خودات مەبەست بێت.
ئیمامی قوشەیریش دەفەرمووێت: جونەیدی بەغدادی فەرمووویەتی: پرسیاریان لە هەندێك زانا کرد دەربارەی تەوحید، فەرمووی تەوحید واتە: یەقین پەیداکردن، ووتی بۆم ڕونبکەرەوە، فەرمووی: یەقین ئەوەیە کە بزانیت هەموو هەڵس و کەوتێکی خەڵکی و جوڵەو بێ دەنگییان و حەرەکەو سەکەنەیان لەکرداری خوداوەیە، کاری خودای بێ شەریك و تەنهایە، ئەگەر ئەمەت زانی، ئەوا یەکتاپەرستی خوایشت زانیوە. هەندێك زانای تر ووتویانە: یەقین ئەوەیە: شتەکان کە دەبینیت بەهێزی بڕوا بێت نەك بە بەڵگەو دەلیل، بۆیە دەڵێن: ئەگەر یەقینی تەواوکرد بەڵای خودای لا دەبێت بە نیعمەت و،تاقیکردنەوەکانی خودای لا دەبێت بە بەخشیش، وەك قورئان فەرمووویەتی: ﴿**مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ**﴾، زیاتر لەم باسە بەدرێژی شێخی زوبەیدی لە إتحاف السادة المتقين ڕونی کردۆتەوە بنواڕە: ب/١/٤١٣.

وه هەندێ کەسیش هەیە خۆفی مردن دڵ و گیان و هەموو کات و ژیانی لێ داگیرکردووە، ئەوەندە خۆی بۆ ئامادەباش کردوە، دەرفەتێکی نەماوە بیپەرژێتە سەر شتێکی تر، بەم حاڵەتە دەوترێت هێزو قووتەی یەقین و دڵنیایی، بۆیە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: [1]

هەرگیز یەقینێکم نەدیوە کە هیچ گومانێکی تیدا نەبێت وەک مردن کە زیاتر بیشوبهێنیت بە گومانێکەوە کە هیچ یەقین و دڵنیاییەکی تێدا نی‌یە.

لەسەر ئەم لێکدانەوە و زاراوە تایبەتییە، وەصفی یەقین کراوە بەوەی کەلاوازە، یان یەقینێکی بەهێزە.

ئێمەش مەبەستمان لەو قسەی کە کردومانە( کە لە توانای زاناکانی ئاخیرەتدایە، کە هەموو توانای خۆیان وەگەڕخەن بۆ بەهێزکردنی یەقین) هەردوو واتاکەمان مەبەست بووە، کە نابێت گومان ڕوبکاتە یەقینەوە، لە پاشان یەقین ئەوەندە بەهێزتر بێت، کە زاڵ ببێت بەسەر نەفس و دڵی ئینسساندا، تاوای لێ دێت دەبێتە حوکمڕانی ناو دەرون و خاوەن دەستەڵات و کاریگەری تەواو[2] ئەگەر ئەم قسانە بەتەواوی تێگەیشت، ئەو کاتە دەزانیت کە

---

(١) رواه أبو نعيم عن سلمة بن دينار في ((الحلية))(٢٣٢/٣). زۆربەی موفەسیرەکانیش دەربارەی ئایەتی﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾(سورة الحجر(٩٩)) وایان فەرمووە: تا مردن، دەبێ بەندایەتی ڕاستەقینە بکەیت، واتە: یەقینیان بە مردن لێك داوەتەوە: إتحاف (٤١٤/١).

(٢) خاوەنی قوت القلوب أبو طالیبی مەککی فەرمویەتی:

یەقین لەسەر سێ پلەو مەقامی تایبەتی‌یە:

یەقینی بەرچاوو بینراو، کە جیاوازی نی‌یە لە هەواڵدان لەسەری، زانایش شارەزایە بەم یەقینە، کە تایبەتە بە صدیق و ڕاستگۆیان و شەهیدەکانەوە.

یەقینی باوەڕ پێ کردن و پشت ڕاست کردنەوە و سەلماندن، ئەمە لە هەواڵ داهاتووە و، ئەوەی زانایە پێی، هەواڵ دەرێکی تەسیلم بووە کە فەرمانەکەی

مەبەستمان چی‌یە لەوەی کەوتوومانە:(یەقین دەکریت بە سێ بەشەوە) بەهێزی و لاوازی یەقین، یان کەم و زۆری، یان شاراوەیی و ئاشکرایی.

---

سەلماندووە . کە ئەمەش یەقین و بڕوای بڕوادارانە لە خوانـاس و صـەفاکار و تەقواکاران و ئەوانەش لەخـواری ئەوانەوەن، چـونکە خـودا فەرمـویەتی: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ هەنـدێك لەمانە یەقینیـان کـز دەبێـت، بەوەی کە بوونی ئەسباب و عادەت و هاووێنەکانی کاریان تێ دەکات، دان بەبوونیاندا دەنێن و ، بیریان دەچێتە سەر هۆکارەکان و، زیاتر لەگەڵ دروستکراواندا دادێن و پێیان ئاشنا دەبن، کە لێیان دووردەکەونەوەو بێ تاقەتی و کەمی ڕوویان تێ دەکات، ئا لەمـانەوە ڕای جیـاواز دروسـت دەبێـت، چـونکە بەپـێی زۆری و کەمـی هێـزی یەقینەکەیان، حاڵەتەکانیشیان دەگۆڕێن بەلای ئەسبابی دونایی یان قیامەتیدا.
مە قامی سێیەمیش پێشتر باسی کرا، کە مەقامی تەسلیم بوون و قەبوڵ کردنەو بەس، کەواتە هەموو باوەڕدارێک زانیاری هەیە بە عیلمی تەوحید و( **معرفة الله**) بەڵام بە پێی یەقینەکەیەتی، دڵنیاییەکەیشی بە پێی پوختی و صەفای ئیمان و بڕوایەتی، ئیامەکەنەشی لەسەر شێوەی موعامەلەو هەڵس کەوتیەتی لە حزوری خودادا و چاودێری ئەحکامەکانی.
بەرزتـرین زانسـت لە عیلمـی یەقـین عیلمـی موشـاهەدەیە ، کە تـایبەتە بە موقەڕەبین و نزیکانی حزوری پەروەردگار. وە نزمترین پلەیش سەلماندن و تەسلیم بـوون و قەبـوڵ کـردنە و، ئەمـانی ئینکـارییە، ئەمەش بـۆ هەمـوو خەڵـکە، بـۆ ئەوانەیە کە خـاوەنی تەصـدیقن و لە ئەصحابی یەمیـنن ( نـامەی ئەعمـال بە دەسـتی ڕاسـتیانەوە دەدرێـت) لە میـانی مـوقەڕەبین و ئەصـحابی یەمینـیش‌دا چەنـدین پـلەو مەقـامی تـایبەت هەیە، بـۆ درێـژی ئەم بـابەتە بنـواڕە: إتحاف(١/٤١٤).

# بەشی یەکەم:

## بە بەرچاو گرتنی بەهێزی و لاوازی یەقین،

لەسەر ئەو شێوە تاریف و زاراوەیە کە زانایانی ئەهلی مەعنا و تەصەووف لێکیان داوەتەوە، کە یەقین زاڵ دەبێت و هەموو دڵ دادەگرێت و داگیردەکات، پلەی بەرزی و لاوازی یەقینیش کۆتایی نایەت، جیاوازی خەڵك چۆنە لە خۆ ئامادەکردن بۆ مردن، بە پێی ئەم مەعنایە وەك جیاوازیان وایە لە پلەکانی یەقیندا.

# بەشی دوهەم:

## بە بەرچاوگرتنی شاراوەیی یەقین و ئاشکرابوونی:

ئەمەش ئینکاری ناکرێت(هەندێك جار شاراوەیە، بە هۆی بوونی ئەو پەردەیەی کە خاوەنەکەی بۆی دروست بووە، لە تێکەڵ بوون و زیادە پەیوەندی وئونسی بە دونیاوە، ئەوە یەقینەکەی دەشارێتەوە، ئەگەر ئەو حاڵەتەیشی نەمێنێت یەقینەکەی ئاشکرا دەبێت)

جا لەو بارەوە کە دروستبێت پێچەوانەی ڕا بەهێزەکە ڕایەکی تر سەر هەڵبدات،( کە ئەمەش پلەی دووهەمە لە زاراوەی یەکەم) ئەوە بە پێی زاراوەی دووهەمی زانایانی تەصەووف، ڕەد ناکرێتەوەو ئینکاری ناکرێت.

وە لەوەشدا کە بڕوا بەشتێک بکەیت و، هەموو شك و گومانێکی دژ بەو بڕەوینیتەوە و ڕەددی بکەیتەوە( وەك پلەی سێیەمی زاراوەی یەکەم لەسەریەتی) ئەمەش ڕێگا نی‌یە بۆ ئینکاری کردنی، چونکە تۆ هەست بە جیاوازییەکی زۆر دەکەیت لە میانی ئەوەدا: کە باوەڕت بە شارێکی وەك مەککە هەبێت، لەگەڵ

بوونی شاری(فەدەك) دا[1] وە لە میانی بڕوا بوونت بە بوونی حەزرەتی موسا و یوشەع( سەلامی خودایان لە سەر) لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ گومانێکت بەرامبەر هەردوو بابەت و فەرمانەکە نی‌یە، چونکە هەمووی بە پێی تەواتور سەلمێنراوە، بەڵام دەبینیت یەکێك لەو دوو فەرمانە دیارتر و ڕون و ئاشکراترە لەناو دڵتدا لەوی تریان، چونکە لە یەکێکیاندا هۆکاری بڕوا پێ کردنەکە بە هێز ترە، ئەویش زۆریی هەواڵدارەکان بووە، هەر بەم شێوەیە ئەوانەی ئەهلی نەظەر و بەڵگەکانن، هەست بەشتەکان دەکەن و زانیاریەکان بە هۆی بەڵگەکانەوە وەردەگرن، دیارە ڕونیی ئەو بابەتەی کە بەهۆی تەنها بەڵگەیەکەوە دەرکەوتووە، ناگاتە ڕونیی و ئاشکرایی ئەو بابەتەی کە بەچەندین بەڵگەوە ئاشکرا بووە. لەگەڵ ئەوەدا کە هەردوو بەڵگەکە یەکسانن لەوەدا کە نەفی شەك و گومان دەکەن، لەوانەیە ئەم بابەتە ئەو زانا موتەکەللیمە ئینکاری بکات، کە زانستەکەی لە کتێب و بیستنەوە وەرگرتووە و، پێداچونەوەی تایبەتی نی‌یە لەگەڵ نەفسی خۆیدا، لەو حاڵەتانەی کە دەرکی دەکات و پێی دەزانێت، لە جیاوازی ئەحواڵەکان( خۆ ئەگەر بەدواداچونێکی حاڵی خۆیی بکرایەتەوە سەلامەت دەبوو وە ڕزگاریشی دەبوو)

## بەشی سێیەم:

### بە لەبەر چاو گرتنی کەمی و زۆری یەقینە

ئەمەش بە زۆری و کەمیٔ پەیوەندارەکانی یەقینەوە بەستراوەتەوە، وەك چۆن دەوترێت:

فڵان کەس زانایی زیاترە، واتە شارەزایی و زانیاریەکانی زیاترە، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێك جار (زانا) یەقینەکەی بەهێزترە لە هەموو ئەو بابەت و

---

(١) یەکێك بوو لە گوندەکانی(خەیبەر).

مەسەلانەی کە شەریعەت لەسەریان هاتووە، وە هەندێك جاریش یەقینەکەی لە هەندێك لەو بابەتانەدا بەهێزە و، وادیارە لە هەندێکیشیاندا لاوازە.[1]

---

(١) بابەتێك ماوە کە تیشکی زیاتری بخەینە سەر: وەك ئەبو طالیبی مەککی لە( قوت القلوب) دا باسی دەکات و حافظی زوبەیدی لە إتحاف دا هێناویەتی ٤١٤/١ و فەرموویەتی:

دەبێ بزانین جیاوازی لە میانی( **علم الیقین و عین الیقین و حق الیقین**) چی‌یە و، زانایانی ئەهلی تەصەووت چی‌یان فەرمووە دەربارەیان، ئیمامی قوشەیری لە ڕیسالەکەیدا دەفەرمووێت: ئەمانە چەندین دەستەواژەن تەعبیر لە کۆمەڵێ زانستی ئاشکرادەدەنەوە، یەقین: ئەو عیلمەیە کە هیچ شك و دوودڵییەك بۆ خاوەنەکەی دروست نابێت و تێکەڵ نابێت لەگەڵ موطلەق عورفدا، واتە:

عیلمی یەقین ئەصڵی یەقین و دڵنیاییەکەیە، هەروەها عەینولیەقینیش نەفسی یەقینەکەیە، حەقق و لیەقینیش هەمان ئەو یەقینەیە کە باس کراوە، بەڵام علم الیقین: بە پێی زاراوە و پێناسەی تایبەتی زانایان ئەوەیە: لەگەڵ مەرجی بەڵگەو دەلیل دابێت، وە ئەگەر بە حوکمی زیادە ڕونکردنەوەو ئاشکرا کردن بێت ئەوە:

(عین الیقین) ی پێ دەڵێن، (حق الیقین)یش ئەوەیە کە بە صیفەت و تاریفی بەرچاو بوبێت، عیلمی یەقین بۆ خاوەن ئەقڵ و بیرمەندەکانە، عەینی یەقینیش بۆ خاوەن زانستەکانە، حەقیی یەقینیش بۆ خاوەن مەعریفەت و شارەزاکانە. کەواتە ئەگەر شتێکی زانی و هیچ بێ ئاگاییەکی بەسەردا نەهات و ،یەك لەدوای یەك زانینەکەی دوپات دەبوویەوە و جێگیر دەبوو لە دڵی‌دا، ئەوە عیلمی یەقینە.

بەڵام( **عین الیقین**) ئەوەیە کە عیلمەکەت بۆ پەیدا ببێت، یەك لەدوای یەك هاو وێنەکانی لەدڵتا جێگیر ببێت، بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرنج و بەڵگە ، بەڵکو عیلمەکە لە ناخدایە و ئاشکرایشەو، لەوەشدا کە یەك لە دوای یەك دێتە سەر دڵی، ئەوا کەلێن

ئەگەر ووتت: کەواتە یەقین و دڵنیاییت زانی، کامەی بەهێزە و کامەی لاوازە، وە کامەی زۆرە یان کەمە، یان دیارو ئاشکرایە یان پەنهانەو شاراوەیە، بەو

---

و غەفڵەت نایەت بەسەریدا، ئیتر خاوەنەکەی پێویستی بە بیرکردنەوەو بەڵگە هێنانەوە نابێت، ئەوە( **عينُ اليَقين**)ە. (**حقُّ اليَقين)یش ئەوەیە:**

دڵنیایی لە بەرامبەر زانیاریەکەت پەیدابووبێت، کە زاڵ ببێت بەسەر دڵدا، وای لێ بێت غەیری ئەو زانیارییە شتێکی تر ناوو باسی نەمێنێت، بەم پێیە ناویان ناوە (حقُّ اليَقين) چونکە حەقیقیەتی تیا چەسپاوە بۆ ئەوانەی لەگەڵ حەقیقەتدا تێکەڵاو بوون، کورتەی ئەم تاریفانە ئەمەیە کە:

**عیلمی یەقین:**

هێمایە بۆ ئەو ڕاستیەی کە قەبوڵی هیچ ئەگەرێکی تر ناکات، با ئەو زانستەیش یەك لە دوای یەك دانەبارێت بەسەر دڵدا.

**عينُ اليَقين**: ئەوەیە بەم شێوەیە بێت و یەك لەدوای یەك زانستەکە دابارێت بەسەر دڵیدا تاوای لێ دێت کەمتر غەفڵەت و بێ ئاگایی ڕو لە دڵی بکات، هەرچەندە لەوانەیە لەگەڵ ئەو یەقینەش دا هەندێ شتی تریش جارجار باس و یادی بکرێت.

**حقُّ اليَقين ئەوەیە:**

زانیاریەکە ئەوەندە بەسەر دڵدا زاڵ بوبێت، هیچ شتێکی تر نەیەت بە دڵیدا ، وە دەبێت جێگیر بوبێت لە دڵیدا و ڕێگە نەدات خەیاڵێکیش کاریگەری هەبێت لەسەری. نمونەی ئەم سێ عیلمەش وەك ئەمە وایە: زانینی هەموو کەسێکی عاقڵ بە مردن کە دێتە سەری ئەوە (علمُ اليقين)ە. ئەگەر مەلائیکەکانی بینی کە دێنە سەری و گیانی دەکێشن، ئەوە (عينُ اليقين)ە، ئەگەر ڕۆحی دەرچوو، ئەوە( **حقُّ اليَقين**)ەو، ڕاستیەکان بەرجەستە دەبن. بۆ درێژتری ئەم بابەتە بنوارە إتحاف السادة المتقين بشرح إحياء علوم الدين، ١/٤١٤_٤١٥. هەروەها بنوارە: قوت القلوب(١/١٤٠) بەشێوەی ئەمە.

واتایەی کە شك و گومان و دوودڵی نەهێڵێت، وە بەو واتایەش کە دڵ داگیر بکات و زاڵ ببێت بەسەریدا.

کەواتە ئەی پەیوەندارەکانی یەقین و ڕێگاکان کە یەقینی پیا دەڕوات کامەیە و چی‌یە؟ وە بەچ ڕێگەیەك دەتوانن بەدوای یەقین‌دا بگەڕێن؟

چونکە ئەگەر من نەزانم لە کوێ‌دا یەقینی تیا بەرجەستەیەو ئەبینرێتەوە، ناتوانم بە دوای ئەویەقینەشدا بگەڕێم. کەواتە بزانە:

هەموو ئەو فەرمانانەی کە پێغەمبەرەکان(صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر) لەسەرەتادا هێناویانە تا بەکۆتا گەیشتوون، هەمووی ڕێگەی پەیوەندارەکانی زانستی پەیدا کردنی یەقینە، چونکە یەقین بۆ خۆی بریتییە لەو زانیاری‌یە تایبەتیەی کە پەیدای دەکەیت، پەیوەندارەکانیشی بریتین لەو زانیاریانەی کە شەریعەتە ئاسمانیەکان هێناویانن، کەکەس ناتوانێت سەرژمێریان بکات

**بەڵام من هێما بۆ هەندێکییان دەکەم کە بەشە سەرەکییەکانیەتی:**

**یەکێك لە بنەما سەرەکەیەکانی شەریعەتەکان، تەوحید و یەکتاپەرستی‌یە:**

تەوحید ئەوەیە هەموو شتەکان لە خاوەن خولقێنەری هۆکارەکانەوە ببینیت، وە لانەکەیتەوە بۆ وەسیلەو هۆکارەکان، بەڵکو وا دەبینیت کە هۆکارە بەرچاوەکان خۆیان هیچ فەرمانێکیان لە ژێر دەستا نی‌یە، بەڵکو دەبێت لە ژێر فرماندابن، ئەوەی باوەڕ بەم ڕاستی‌یە بکات بە باوەڕدار دەژمێررێت.

جا ئەگەر لەگەڵ بوونی ئیمانەکەیدا هەموو ڕیگەو لانەیەکی شك و گومان لەدڵیدا دەربکات و نەیهێڵێت، ئەوە بە کەسێکی خاوەن یەقین دادەنرێت، بەیەکێك لەو دوو مەعنایەی کە باسمان کرد.

ئەگەر حاڵەتەێك زاڵ بوو بەسەر دڵیدا، جگە لەو بڕوا بەهێزەی کە هەیەتی وای لێ هات کە ڕق لە هۆکارو وەسائیطەکان نەبێتەوە، یان سەیریان نەکات بەو شێوەی کە لێیان ڕازی‌یە یان سوپاسیان دەکات، بەڵکو هۆکارەکانی لە دڵیدا دابەزاندە ئەو ئاستەی کە قەڵەمێك دەیگێڕێت، وەك چۆن دەست و قەڵەم چ ڕۆڵێکیان هەیە لە بەرامبەر ئەو کەسەی خاوەن نیعمەتەکەیەو قەڵەمەکەش ئیمزای پێ کراوە، ئەوەی زانایە سوپاسی قەڵەمەکەو دەستەکە ناکات و ،ئەگەر ئیمزایش نەکات لەوان تووڕە نابێت، بەڵکو وەك دوو ئامێری بێ دەسەڵاتی فەرمان بەجێهێنەر و، تەنها دوو هۆکاری ئاسایی سەیریان دەکات، ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئەوا دەبێتە کەسێکی خاوەن یەقین، بە واتای دووهەم لەو دوو واتایەی کە باسمان کرد، کە ئەمەیان یەقینێکی بەرزترەو بەرهەمی یەقینی یەکەمە، بەڵکو دادەنرێت بەڕۆح و سوود بەخشی(**علم اليقين)** کە ئەم جارەیان بەرهەمەکەی دەبینێت.

وەچەندێك زیاتر جێگیر ببێت لە دڵیدا، کە خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و هەموو ماددە بێ گیانەکان و ڕووەك و گیاندار و هەموو دروست کراوەکان گشتی زەلیل و ژێر دەستەی فەرمان و قووەتی خودان، وەك چۆن قەڵەمەکە بە پێی فەرمانی خاوەنەکەی دەنوسێت.

وە دڵنیاش بێت لەوەی:

کە دەسەڵاتی بە توانای ئەزەلیی، سەرچاوەی یەکەمە بۆ هەموو کارەکان، ئەو کاتە زیاتر تەوەککول و حاڵەتی ڕەزامەندی و تەسلیم بوونی زاڵ دەبێت بەسەر دڵی داو، تەنها پشت و پەنای بە دەسەڵاتی خودا دەبێت.

ئەوکاتە دەبێتە خاوەنی دڵنیایی تەواو، دووریش دەبێت لە هەموو ڕق و کینەو ئیرەیی و خووڕەوشتێکی ناپەسەند و ناشیرین، ئەمەش یەکێکە لە دەرگاکانی عیلمی یەقین.

# یەکێکی تر لە بنەمای شەریعەت و نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت

# متمانەبونیان بەوەی کە خودا ڕازقی هەموانە

متمانە بوونە بەوەی کە خودا ﷻ زامنی رزق و ژیانەو ڕۆزی بە هەموان دەبەخشێت، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا هود(٦).﴾واتە:

(خودا ﷻ کەفیل و زامنی رزق و بژێوی هەموو زیندەوەرێکە بەسەر زەویدا بڕوات، بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی، نەك ئەوەی کە پێویست بێت لەسەری.)

دڵنیایشە لەوەی کە متمانەی هەیە ئەو رزقەی بۆی نوسراوە پێی دەگات، ئەوەی لە تەقدیری خودادا بۆی دیاری کراوەو دەگەڕێت بەدوای‌دا،

هەرچەندێك ئەم یەقینە زیاتر زاڵ ببێت بەسەر دڵیدا، کەمتر لە حزوری خودادا داوای دەبێت، وە سور نابێت لەسەر هەندێك شت، بەڵکو هەوڵ نادات پەلاماری شت بدات، یان نیگەرانی دەربڕیت ئەگەر شتێکی لە دەس چوو.

ئەم جۆرە یەقین و دڵنیاییە بەرهەمی کۆمەڵێ گوێڕایەڵی و تاعەت و ڕەوشتی پەسەندی لێ دەکەوێتەوە.

یەکێکی تر لە بنەماو نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت

## دەبێ دڵنیا بێت لە پاداشت و تۆڵەی خودایی

دەبێت ئەو ڕاستیە بەسەر دڵیدا زاڵ ببێت، کە ئەوەی بە ئەندازەی پارچە گەردیلەیەك چاکە بکات، پاداشت وەردەگرێتەوەو، بە ئەندازەی پارچە گەردیلەیەکیش شەڕ بکات خراپەکەی دەبینێتەوە.

ئەمەش دڵنیایی بوونی پاداشت و تۆڵەیە، تاوای لێ دێت ڕێژەی گوێڕایەڵی و بەندایەتی لە بەرامبەر پاداشتەکاندا، وەك ڕێژەی نان خواردن دەبینێت بۆ تێر بوون، وە ڕێژەی تاوانکاری بۆ تۆڵەسەندنەوە، وەك ڕێژەی بوونی ژەهر و مارەکانە بۆ بە هیلاکداچوون، هەر وەك چۆن هەوڵی زیاتر دەدات کە نانی دەست بکەوێت، بۆ ئەوەی ژیانی مسەوگەر بکات، بۆیە زۆر و کەمیی نان دەپارێزێت.

وەهەروەك چۆن گوێڕایەڵی و بەندایەتی ئەنجام بدات کەم و زۆری لە کیس نادات. وە هەروەك چۆن خۆی لە کەم و زۆری ژەهری کوشندە دەپارێزێت، هەروەهایش خۆی لە کەم و زۆری بچوك و گەورەی کاری تاوانکاری دەپارێزێت.

**یەقین بەواتای یەکەم:** بۆ تێکڕای باوەڕداران پەیدا دەبێت، کە یەقینی ئەبرار و پیاو صاڵحانە.

**بەواتای دووهەم:** تایبەتە بە نزیکان و موقەڕەبانی دەرگای خوداناسی.

بەرهەمی ئەم یەقینەیش بریتی‌یە لەوەی کە:

بەڕاستی دەتوانێت لە حزوری خودادا لە موراقەبەی هەمیشەییدابێت، وەبەڕاستی ئاگایشی لە هەڵس و کەوت و خەتەرە و خەیاڵاتی خۆی بێت، وە کۆششی زیاتریش دەکات بۆ تەقواو خوداپەرستی و خۆپاراستن لە هەموو گوناهەگەورەکان، وە هەرچەندێکیش زیاتر یەقینەکەی زاڵ ببێت بەسەر دڵیدا خۆ پاراستنەکەیشی بەهێزترو خۆ ئامادەکردنەکەیشی قایم و چالاکتر دەبێت.

## یەکێکی تر لە بنەماکانی زانایانی ئاخیرەت

## دڵنیابێت لە ئاگاداری و چاودێری خودا بە سەریەوە

که بزانیت:

خودا ﷻ له هەموو حاڵەتەکاندا ئاگادارە بەسەرتەوەو ،چاودێرە بەسەر هەموو خەتەرەو خەیاڵاتێکیشدا کە بەسەر ناخ و دەروونتدا دێت، یان بیرو هزرێك کە بەدڵ و مێشکتدا دێت و تێ دەپەڕێت، ئەمەش بەواتای یەکەم کە لێکمان دایەوە:

هەموو بڕوادارێک لێی دڵنیایەو خاوەن یەقینە بەرامبەری، کە هیچ گومانێکی لە پاڵ یەقینەکەدا نەبێت، وە بەواتای دووهەم کە مەبەستمانە باسی بکەین، ئەوە زۆر ناوازەیە و تەنها تایبەتە بە ڕاستگۆیان و صددیقانی ڕاستەقینەوە.

## بەرهەمی ئەو بنەما پیرۆزە:

وای لێ دێت مرۆڤ لە خەڵوەکەیشیداو لە هەموو کارو حاڵ و کردارە کانیشیدا بە ئەدەب و بە ڕەوشت دەبێت، وەك ئەوکەسەی کە لە بەرامبەر پادشایەکی دەستەڵاتداری گەورە دانیشتبێت و چاوی لەسەر بێت چۆن بە ئەدەب دەبێت و، بەردەوام سەری دادەخات و ئاگای لە هەڵس و کەوتەکانیەتی، خۆی کۆدەکاتەوەو خۆیشی لە هەموو جوڵانەوەیەک دەپارێزێت، کە سیمای ئەدەب و ویقاری لێ دووربخاتەوە، لە دڵیشدا هەر بە شێوەی کردارەکانی بە بیر و هزری شاراوە، خۆی لە ئامادەباشیدا دەبینێتەوە.

چونکە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە خودای گەورە ئاگادارە بەسەر نهێنیەکانیدا، وەك چۆن خەڵکەکە ئاگادارن بەسەر کردارە ئاشکراکانیدا،

کەواتە گرنگی دانی زیاتری بەجوان کردنی دڵ و پاککردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی دەرونی خۆیەتی لەبەر چاوی خودای گەورەدا کە دەیپارێزێت و لێی بە ئاگایە، ئەو گرنگی دانەی زیاترە لەوەی کە خەریکی خۆ ڕازاندنەوەی زاهیری بێت بۆ خەڵکەکان کە لە دەورو بەریدان.

ئەم مەقام و پلە بەرزەیەش لە یەقیندا، بەرهەمی شەرم و خۆف و ترسان و خۆشکاندنەوەی لێدەکەوێتەوە، لەگەڵ زەلیلی و گەڕانەوە بۆ لای خوداو گەردنکەچی و خۆ بەکەم زانین، وە کۆمەڵێکی تر لە ڕەوشتی بەرزو پەسەند، کە هەریەکەیان دەبنە هۆکاری بەرهەم هێنانی کۆمەڵێك طاعەت و تەقواکاری.

یەقین لە هەریەکێك لەم دەرگایانەوە، وەك درەختێك وایە، ئەم ڕەوشتا نەش لەناو دڵدا وەك لق و پۆکانی وان کەلێی دەبنەوە، وە ئەم کردارو طاعەت و خوداناسینەش کە بەهۆی ڕەوشتە جوانەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەنجام دەدرێت، وەك بەرهەمەکان و ئەنوارەکان وان، کە لە لق و پۆکانەوە سەریان هەڵداوە، کەواتە یەقین بنەماو بناغەی هەموو کارەکانە، وە چەندەها ڕێگەو دەرگای زیاتر لەوەی کە باسمان کرد بەهۆی یەقینەوە پەیدا دەبێت.

لەبەشی چواریەکی کارە ڕزگارکەرەکاندا(ربع المنجيات) بەدرێژ تر باسیان دێت، ئەم ئەندازەیە بەسە بۆ ئەوەی ئێستا لەواتای وشەی یەقین و بەشەکانی حاڵی ببین.

## یەکێکی تر لە بنەماکان ئەوەیە:

# دەبێ خەمبار و گەردن کەچ و بێ دەنگ بێت

دەبێت زانای ئاخیرەت هەمیشە خەمبار و دڵشکاو و حەزین و ملکەچ و بێ دەنگ بێت، ئاسەواری ترسان لە خودا لەسەر جل و بەرگ و شکڵ و ڕوخسار و ژیان و هەڵس و کەوتیدا دیار بێت، هەروەها ترسانەکە لەقسە و بێدەنگیدا ڕەنگ بداتەوە، هەر کەسێك سەیری دیمەن و ڕوخساری بکات خودای گەورەی بیربکەوێتەوە، شێوەو ڕوخساری بەڵگە بێت لەسەر کردارەکانی، وەك ووتویانە:

پیاوی سەخی سەیری بەرگ و شکڵ و ڕوخساری بکەیت، ئیتر پێویستیت بەوە نابێت کە تاقی بکەیتەوە، یان سەیری دەم و ددانی بکەیت( یان ووتراوە سەیری چاوی پیاوی پیس بکە ئیتر دەیناسیت) هەروەها زانایانی ئاخیرەتیش بەسەیر کردنی سیماو ڕوخساریان، کەنەرمی و ئارامی و زەلیلی و گەردن کەچی پێوەیە، دەیانناسیتەوەو جیا دەکرێنەوە.

ڕاستیان ووتوە کە فەرموویانە: هیچ بەندەیەك نیە کە خودا بەرگێکی لەبەرکردبێت جوانتر بێت لە بەرگی خشوع و گەردن کەچی لەناو پۆشاکی ئارامیدا، بەڕاستی ئەوە بەرگی پێغەمبەرانە، وەسیماو نیشانەی صاڵحان و ڕاستگۆیان و زانایانە. بەڵام قسە بەردانەوەو دەربڕینی ڕستەو وشەی قەڵەو کە پڕ بەدەم و لێوەکانی بێت، بۆ ئەوەی بە زوبان پاراوی قسە بکات، وە پڕ بەدەم پێکەنین و کەوتن بە پشتداو پەلەکردن لە جوڵەو قسەکردن و قسە بڕین و، مەجال نەدان بەقسەکردنی کەسی تر، ئەمانە هەمووی ئاسەواری بێڕێزیە بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا و بەجێ نەگەیاندنی مافەکانیەتی، نیشانەی ئەوەیە کە ئەمینن لە مەکری خوداو، غافڵن لە زیکری خوداو، لە تۆڵەی سەختی پەروەردگار و ناڕازی بوونی لێیان، ئەمەش پیشەی کەسانێکە کە تێکەڵی دونیا

بوون و، له خودا بێ ئاگان و، له خواروی ئەو کەسانەوەن کە زانان بە خودا، **چونکە بەڕاستی زانایانی ڕاستەقینە سێ بەشن، وەك سەهلی توستەری فەرموویەتی:**

**بەشی یەکەم: زانایەك بەفەرمانی خودا نەک بەڕۆژەکانی خودا،**

ئەوانە زانا فتوادەرەکانن لەبارەی حەلاڵ و حەرامەوە، ئەم جۆرە زانستە بەرهەمی خۆف و (خَشيَةُالله) ی نابێت.

**دووهەمیان: زانایە بە خودا نەك بە فەرمانی خودا و رۆژەکانی خودا**

ئەمانەش تێکڕای باوەڕدارانن.

**سێیەمیشیان: زانایە بە خوداو بە فەرمانی خودا و رۆژەکانی خودا،**

ئەوانەش زانا ڕاستگۆو صددیقەکانن.[1] ئەمانەش هەمیشە ترسان و خۆف و گەردن کەچی زاڵە بەسەریاندا.

مەبەستی لە ڕۆژەکانی خودا(أَيَّامُ الله): جۆرەکانی تۆڵە شاراوەکانی خودان لەگەڵ نیعمەتە نادیارەکاندا، کە ڕژاندویەتی بەسەر خەڵکانی سەدە پێشووەکان و داهاتووەکاندا، هەرکەس زانستەکەی ئەوەندە بەرفراوان بێت ئەوانە هەمووی بگرێتەوە، ئەوە ترسی لە خودا زۆر دەبێت و خشوع و گەردن کەچیشی ئاشکرادەبێت.

حەزرەتی عومەر(ڕەزای خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

زانست فێربن وە بشزانن کە هەڵگرانی زانست دەبێت خاوەنی ئارامی و ویقار و ڕێز و حیلم و خۆڕاگری بن، خۆتان بەکەم بزانن بەرامبەر ئەوانەی فێرتان دەکەن، با ئەوانەی لێتان فێردەبن فێربن گەردن کەچیتان بۆ بکەن،

(١) قوت القلوب(١/١٤٠) بەشێوەی ئەمە.

ئێوەش مەبن بەو زانایانەی کە نەسەق زل و عەزەمەت دارن، تا بەهۆی جەهل و نەزانینتانەوە، زانستەکان لە دەستتان نەڕوات و بەجێتان نەهێڵن.[1]

ووتراوە: هەر عەبدێك خودا خەڵاتی زانستێکی پێ کردبێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە حیلم و ئارامی و گەردن کەچی و ڕەوشت جوانی و نەرم و نیانیشی پێبەخشیوە، کە بەڕاستی ئەو جۆرە زانستە بەسوودبەخش دانراوە.[2]

لە فەرموودە و ئەسەری پیرۆزدا هاتووە:

هەرکەسێك کە خودا زانست و دونیا نەویستی و گەردن کەچی و ڕەوشت بەرزی پێ بەخشی بێت، ئەو بە پێشەوای تەقواکاران دەناسرێت.[3]

وە لە فەرموودەدا هاتووە:

**((إنَّ مِنْ خِيارِ أُمَّتي قَوماً يضْحَكُونَ جَهراً مِنْ سَعَة رَحْمَةِ الله، ويَبكُونَ سِرّاً مِنْ خَوْفِ عَذابِه، أَبْدانُهُم في الأَرضِ وقُلُوبهُم في السَّماء، أرواحُهُم في الدُّنيا وعقُولهُم في الآخِرَة، يَتَمَشَّوْنَ بالسَّكينَةِ ويتَقَرَّبُونَ بالوَسَيلَة))**[1]

---

(١) قال الحافظ الزبيدي: (٤٢٠/١): هكذا أورده صاحب القوت، بلا سند، ٢٤٣/١، قال العراقي في التخريج الكبير: ورد هذا مرفوعا، رواه ابن عدي في الكامل(٣٣٥/٤)، في ترجمة عباد بن كثير البصرى، عن أبي الزناد، عن الأعرج، عن أبي هريرة مرفوعا، وروى من حديث عمر أيضا مرفوعا مختصرا، رواه أبو نعيم في الحلية ٣٢٢/٦، من رواية عبد المنعم بن بشير، عن مالك عن زيد بن أسلم عن أبيه عن عمر مرفوعا بنحوه، و عباد بن كثير متروك الحديث و عبدالمنعم بن بشير المصري يكنى أبا الخير منكر الحديث... اهـ.

قلت: قال أبو نعيم: غريب من حديث مالك، لم نكتبه إلا من حديث حبوش عن عبدالمنعم، والسياق الأول أخرجه أيضا الطبراني في الأوسط (٢٠٠/٦(٦١٨٤)) من حديث أبي هريرة إلا أنه إلى قوله: (لمن تعلمون منه) ولم يذكر شينا بعد ذلك) رواه الدينوري في المجالسة و جواهر العلم(١١٩٧).

(٢) قوت القلوب(١٤١/١).

(٣) قال الحافظ الزبيدي فى الإتحاف ٤٢٠/١: هكذا أورده صاحب القوت، وتبعه المصنف.

واته: (له هه‌ڵبژێراوانی ئوممه‌تی منن، كۆمه‌ڵێك كه له خۆشی به‌رفراوانی ڕه‌حمه‌تی خودا به ئاشكرا پێده‌كه‌نن ، به‌ڵام له ترسی سزاكانی به نهێنی و شاراوه‌یی ده‌گرین، به‌لاشه له‌سه‌ر زه‌وین، به‌ڵام به‌دڵ له نێو ئاسماندان، به‌ڕۆح له دونیادا ده‌ژین، به هه‌ست و عه‌قڵیان وان له‌ناو ئاخیره‌تدا، به نه‌رمی و ئارامی و دڵنیاییه‌وه ده‌ڕۆن به‌ڕێوه و، به‌هۆی وه‌سیله‌ی كرده‌وه‌ی چاك و چاكان و حه‌زره‌ته ﷺ له خودا نزیك ده‌بنه‌وه.

حه‌سه‌نی به‌صریش فه‌رموویه‌تی:

حیلم و خۆڕاگری و ئارامی(وه‌زیری زانستی) یه، نه‌رم و نیانیش باوكیه‌تی، گه‌ردن كه‌چیش كراس و شه‌ڕواڵه‌كه‌یه‌تی .[2]

بیشری كوڕی حاریثیش فه‌رموویه‌تی: هه‌ركه‌س به‌هۆی زانسته‌وه به‌دوای ریاسه‌تدا بگه‌ڕێت، ئه‌وه خۆی له خوداوه نزیك ده‌خاته‌وه، به‌شتێك كه خودا ڕقی لێیه‌تی و غه‌زه‌بی لێ ده‌گرێت، چونكه‌ئه‌و كه‌سه له ئاسمانه‌كان و سه‌ر زه‌ویدا غه‌زه‌ب لێ گیراوه‌و خه‌ڵكی ڕقیان لێیه‌تی.[3]

وه له‌ڕیوایه‌تی به‌نی ئیسرائیلیه‌كاندا ده‌گێڕنه‌وه كه:

---

(١) أخرجه الحاكم في المستدرك(٣/١٩،(٤٢٩)) و البيهقي في شعب الإيمان، ٤٧٨/١(٢٧٦٥) و ضعفه من حديث عياض بن سليمان. [ قال الزبيدى: ٤٢١/١، قال العراقي في التخريج الكبير: رواه الحاكم و البيهقي، قال البيهقي تفرد بهذا حماد بن أبى حميد وليس بالقوي عند أهل العلم، قال العراقي بل رواه خالد بن مغيرة عن محكول، رواه أبو نعيم ١٦/١ [ قلت أورده الحافظ السيوطي في الجامع الكبير ٢١٩/١٢ و عزاه لأبي نعيم و الحاكم و كلهم عن عياض و كانت له صحبة، و هذا حديث عجيب منكر، قال ابن النجار: ذكره أبو موسى المديني في الصحابة.

(٢) قوت القلوب (١٤١/١).

(٣) قوت القلوب(١٤١/١).

یەکێك لە حەکیمەکان سێ صەدوشەصت پەڕاوی دانا لە حیکمەتدا، تا وای لێ هات بە حەکیم وەصفدار دەکراو ناوبانگی دەرکرد، خودای گەورە نیگای کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان و فەرمووی: بڵێ بە فڵان کەس:

زەویت پڕ کردووە لە دوڕوویی و زۆربڵێیی، هیچت لە بەر خاتری من نەبوو، منیش لەو هەموو نیفاقەی تۆ هیچیم وەرنەگرتووە، کابرایش پەشیمان بویەوەو وازی لە کارەکەی هێنا، لە پاشان لەگەڵ خەڵکەکە تێکەڵ بوو، لە بازاڕەکاندا دەگەڕا، لە گەڵ بەنی ئیسرائیلیەکانیشدا پشتیان بەیەکتر دەبەست، لە خودی خۆیشیدا بوو بە کەسێکی گەردن کەچ و ئاسایی، خودای گەورەش نیگای کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان کە پێی بڵێت:

ئێستا لەگەڵ ڕەزامەندی مندایت و بەپێی ویستی من جولاویتەوە.[1]

ئەوزاعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە بیلالی کوڕی سەعدەوە کە دەیفەرموو: هەندێك لە ئێوە سەیری پۆلیسێك دەکات(شرطي) ڕقی لێیەتی، بەڵام سەیر ئەوەیە سەیری یەکێك لە زانا دونیاویستەکان دەکات، کە خۆیان دەخەنە بەرچاوی خەڵکەوە و ڕوپامایی دەکەن و گوێیشیان هەڵدەخەن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ گەورەیی و ڕیاسەت، بەڵام ڕقی لەمانە نابێتەوە، کە ئەمان زیاتر لە پۆلیسی سەرجادەکان شایەستەی ئەوەن کە ڕقی لێیان ببێتەوە.[2]

دەگێڕنەوە کە عەرزی پێغەمبەریان ﷺ کرد چ کردەوەیەك خێری زیاترە؟ فەرمووی ﷺ: **((إجتِنابُ المَحارِمِ ولاَ يَزالُ فُوكَ رَطباً مِنْ ذِكرِ الله تَعالى))**

---

(١) قوت القلوب(١٤١/١) و أصله الحلية: ٢٣٧/٥.

(٢) قوت القلوب(١٤١/١).

واته: ( خۆپاراستن لەو شتانەی حەرامەو، بەردەوام دەمیشت تەڕ بێت بەزیکری خودای گەورە، ووتیان: ئەی چ هاوڕێیەك باشە؟فەرمووی ﷺ: ((**صاحِبٌ إنْ ذكَرتَ اللهَ أعانَكَ، وإنْ نَسِيتَ ذَكَّرَكَ**)) واتە:

(هاوڕێیەك ئەگەر زیکرو یادی خودات کرد یارمەتیت بدات، وە ئەگەر لە بیرت کرد وەبیرت بهێنێتەوە).

ووتیان: ئەی چ ڕەفیقێك خراپە؟ فەرموی: ((**صاحبٌ إن نَسيتَ لَم يُذَكِّرْكَ وإنْ ذَكَرتَ لَم يُعِنْكَ**)) واتە: (هاوڕێیەك ئەگەر بیرت چوو وەبیرت نەهێنێتەوە، ئەگەر زیکریشت کرد یارمەتیت نەدات)، ووتیان: ئەی چ خەڵکێك لە هەموو کەس زاناترە؟ فەرمووی ﷺ: ((**أشَدُّهُمْ للهِ خَشيَةً**)) واتە:

(ئەوەی لە هەمووان زیاتر ترس و خۆف خودای لە دڵدایە).

ووتیان: دەی هەواڵمان پێبدە کێ لە هەموان باش و هەڵبژێراوترە تا لەگەڵیان دابنیشین؟ فەرموی: ((**الَّذينَ إذا رؤُوا ذُكِرَ الله**)) واتە: ( ئەوانە هەڵبژاردەتانن کەبە بینینان خوداتان بیر دەکەوێتەوە).

ووتیان: ئەی چ خەڵکێك خراپترینە؟ فەرمووی ﷺ: (**اللَّهُمَ غَفْراً**) خودایە داوای لێ بوردنت لێ دەکەم، ووتیان هەواڵمان پێ بدە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ: فەرمووی: ((**العُلَماءُ إذَا فَسَدُوا**))[1] خراپترینی کەس زاناکانە کە خراپ دەبن و تێك دەچن.

---

(١) لم أجده هكذا بطوله، وفي زيادات الزهد لابن مبارك(١/٤١٠، ١١٤١)، من حديث الحسن مرسلا، سئل النبيﷺ أي الأعمال أفضل؟ قال(( **أن تموت ولسانك رطبٌ بذكر الله تعالى**)) والدرامي في المقدمة: باب التوبيخ لمن يطلب العلم لغير الله [٣٧٠] من رواية الأحرص بن حيكم عن أبيه مرسلا ((**ألا إن شر الشَّرِّ شرارُ العلماء، و إن خير الخَير خيارُ العلماء، وقد تقدم** )) [ قال الحافظ الزبيدي: ٤٢٢/١، قال العراقي في التخريج الكبير: لم أجده هكذا مجموعا بطوله، وهو متلفق بعضه من أحاديث، فروينا في كتاب الزهد والرقائق لابن مبارك

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إن أكثَر الناسِ أماناً يومَ القيامَةِ أكثَرهُم فِكراً في الدُّنيا وأكثر الناس ضَحكاً في الآخِرةِ أكثَرهم بُكَاءً (في الدُّنيا) وأشدُّ الناسِ فرَحا في الآخرة أطوَلهم حُزْنا في الدُّنيا))**[1] واتە: بەڕاستی ئەوەی لەهەمو کەس زیاتر ئەمینەو ناترسێت لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوانەن کە زیاتر لە هەموان لە دونیادا بیردەکەنەوە، وە ئەوەی لە هەموان زیاتر لە قیامەتدا

---

من رواية محمد بن عدي عن يونس عن الحسن. فذكرا الحديث السابق، و ذكر المصنف في آداب الصحبة حديثا متنه( **إذا أراد الله بعبدٍ خيراً، جعلَ له أخا صالحا إذا نَسي ذكَره و إذا ذكر أعانه**)) ورى الثعلبي بإسناده عن الشعبي: **إنما العالم من يَخشى الله**، وروى البراز من رواية جعفر بن أبي المغيرة عن سعيد بن جُبَير عن ابن عباس قال: **((قال رجلٌ يارسول الله، مَن أولياء الله؟ قال ﷺ: الذين إذا رؤوا ذكِرَ الله عزَّوجل))** ورى البراز أيضا في مسنده(٩٣/٧،(٢٦٤٩)) من حديث معاذ قال: **يارسول الله أي الناس شر؟ فقال اللهم غَفرا، سَل عنِ الخير و ولا تسأل عن الشر، شِرار الناس شِرارُ العُلماء))** و إسناده ضعيف، وروى الدارمي في مسنده من رواية الأحوص بن حيكم عن أبيه مرسلا وقد تقدم في الباب الثالث.قلت: هذا الحديث بطوله أورده صاحب القوت(٢٤٦/١)]. [ وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٢٩٠/٦: لم أجد له إسنادا]

(١) لم أجد له أصلا [ قال الزبيدي ٤٢٢/١: أورده صاحب القوت ٢٦١/١ عن عامر بن عبدالله المقبري، و كات من أقران الحسن، سمعت مشيختنا فيما يرون عن نبيناﷺ أنه كان يقول: فذكره، قال العراقي في التخريج الكبير: لم أجد له أصلا في الأحاديث المرفوعة. ولأول الجملة شاهد في صحيح ابن حبان في صحيحه، ٤٠٦/٢(٦٤٠)، من حديث أبن هريرة رفعه، فيما يروى عن ربه ﷻ: **(( و عِزَّتي لا أجمع على عَبدى خوفين و أمنين، إذا خافني فى الدنيا، أمِنته يوم القيامة، و إذا أمِنني فى الدنيا أخَفتُه يوم القيامة، و الجلمةُ الأخيرة من رواية مالك بن دينار قال: رأيت الحسن في منامي مشرق اللون، وفي آخره: أطول الناس حزنا في الدنيا أطولهم فرحا في الآخرة**، رواه ابن ابي الدنيا في كتاب الهم والحزن ص ٤٧(٤٠) [ قال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٢٩٠/٦ لم أجد له إسنادا]

دڵخۆش و فەرەحناکە،ئەوکەسەیە کە لە دونیادا لە هەموان زیاتر لە حوزن و خەمی درێژخایەندا بووەو ژیاوە.

**حەزرەتی عەلی(رەزای خودای لێ بێت) لەوتارەکەیدا فەرموویەتی:**

لەسەر گەردنی خۆم دەیکەم، کە زامنی قسەکانم بێت و دڵنیام لە ڕاستییان: بەروبومی هیچ کۆمەڵێك لە سەر تەقواو خوداناسی وشك نابێت، وە هیچ ئەصڵ و بنەچەیەکی ڕیشکدار لەسەر ڕێگای هیدایەت و ڕێنومایی تینوی نابێت، وە ئەوەی کە قەدرو ڕێزی خۆی نازانێت و خۆی نەناسێت لە هەموو کەس نەزانووترە، وە ئەوەش کە خودای گەورە لە هەموو کەس زیاتر ڕقی لێیەتی پیاوێکە زانستی لەملاولاوە کەم کەم کۆکردبێتەوە و(هەڵی پڕوسکاند بێت) خۆی بدات بەناو تاریکایی فیتنەو ئاڵۆزیدا، ئەوانەی وەك خۆی نەزاندو وجاهیلن و لە خواری هەموو توێژەکانەوەن ناوی ببەن بەزاناو، ئەویش بەڕاستی لێ نەنەویبێت و گرنگی نەدابێت کە ڕۆژێك تەرخان بکات بۆ فێربوونی زانست، بەڵکو بەرەبەیانێك بەدویدا دەگەڕا و پەلاماری زۆرێک لە زانستی دەدا، ئەگەر کەمێکی پوختی هەڵبگرتایە چاتربوو بۆی لە زۆرێکی بێ سوود(زۆر و بۆر و بێ بەرهەم) تا لە ناو ئاوێکی لێڵ دا خۆیی لێ ئاواشتە و تێراو کرد، زانیارییەکی زۆری لێ کۆکردەوە لەوەی کە هیچ سوودێکی نییە، لە سەر ئەم حاڵەتەیشەوە خۆی بەزانا ڕاگەیاند و دانیشت و، بە ناوی فتوادانەوە خەڵکی لە خۆی کۆکردەوە، ئەو مەسەلە گرنگانەی خەڵکێکی تر پەییان پێ نەبردبوو ئەم دەمی بۆ دەبردو هەوڵیدەدا هەموویان یەکلایی بکاتەوە، ئەگەر بابەتێکی بایەخدار و گرنگیشی بهاتایەتە بەردەم ، لەڕاو بۆچون و هزری خۆی قسەی بۆ دەتاشی و وەڵامی بۆ سازدەکرد، وە بۆ ڕەوینەوەی ئەو بابەتە شوبهەدارو نادیارانە بەو ڕا بێ هێزانەی کەوەك لانەی جاڵجاڵوکە وایە، ئاوا چواردەورێکی بۆ سواغ دەداو، خۆیشی دڵنیا نەبووە لەوەی کە ئایا ڕاستی پێکاوە یان بەهەڵەدا چووە؟

ئایا سواری ئەسپی نەزانین بووەو کوێرانە ملی ڕێگای پڕ لە هەڵەت و تێکەڵ و پێکەڵی گرتۆتە بەر؟ خۆ ئەوەندەش ئەصڵ نییە کە پۆزش بهێنێتەوە بۆ ئەو شتانەی کە نایزانێت، تا سەلامەت بێت و تووشی هەڵدێرەی سەخت نەبێت، ئەوەندەش توانای نی‌یە لە زانست و زانیاری، تا بەددانی کاکیلەی بەشی خۆی لە زانست بپچڕێت و دەسکەوتی باش وەدەست بهێنێت، نایشیەوێت نیسبەتی نەزانین بداتە پاڵ خۆی و زانستەکانیش بۆ لای خودا بگێڕێتەوە، ئەوەندەش هەوڵی نەداوە تا زانستی ڕاستەقینە وەربگرێت و دانەمێنێت، ئەو خوێنە ڕژاوانەی کە بە ناهەق بە هۆی فتوای ئەووەوە دەڕێژرێن، دەگرین لەدەست فتوا ناشەرعیەکانی ئەو، چەندەها ئافرەت بە قەزاوەتی نادروستی حەلاڵیان دەکات و، بە بڕیارەکانی حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکات، وەڵڵاهی ئەمە شیاوی ئەو جێگاو شوێنە نی‌یە کە بۆیان داناوەو پێی گەیشتووە، ناتوانێت چارەسەری ئەو کێشانە بکات کە ڕوبەڕوی دەبێتەوەو، ئەهل و شایستەی ئەو دەستەلاتەشی نییە کە خراوەتە بەردەستی، ئەوانە سێ کوچکەی سزاو تۆڵە بەسەریاندا دادەبارێت، شیاوی ئەوەن کە لووت و گوێیان ببڕرێت و، هەر لە دونیادا هەقی خۆیانە کە شین و شاپۆڕیان بەسەردا بکرێت.[1]

**هەروەها حەزرەتی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرموویەتی:**

ئەگەر گوێتان بەزانستێکەوە بوو خۆتانی بەسەردا بدەن و بەپاکی هەڵیبگرن و لەدڵتاندا ڕایبگرن، تێکەڵی گەمەو گاڵتەی مەکەن، کە دڵەکان قێزی لێ بکەنەوە و توڕی بدەنە دەرەوە .[2]

---

(١) رواه وكيع في أخبار القضاة(٣٢/١) و ابن قتيبة في((عيون الأخبار))(٦٠/١)، وابن عساكر في ((تأريخ دمشق))(٥٠٠٤/٤٢)، كلهم بنحوه، وهو في القوت بنحوه(١٤٢/١).

(٢) هكذا أورده صاحب القوت ٢٥١/١، وعزاه السيوطي في الجامع الكبير ١١٨/١٦، (٧٣٣٠) إلى عبدالله ابن الإمام أحمد في فضائل الصحابة ٥٤٢/١ (٩٠٦) ، والخطيب في الجامع لأخلاق الراوي ١٥٦/١ (٢١٠) ولفظه: **تعلَّموا العِلم فإذا تعلَّمتُموه فاكظِموا عليه ولا تخلِطُوه بضَحك و باطلٍ فتَمُجّهُ القُلوب.**

هەندێك لە زانا پێشینەکان فەرموویانە: ئەگەر زانایەك پێکەنینێکی ئاشکرا بکات، هەندێك لە زانستەکەی تورِ ئەداتە دەرەوە[1]

هەروەها ووتویانە: ئەگەر مامۆستای فێرکەر سێ شتی کۆکردەوە لە خۆی دا، ئەوا فێرخواز هەموو نیعمەت و خەصڵەتە چاکەکانی لێ فێر دەبێت و بەسەریدا تەواو دەبێت:

دەبێت ئارام بێت و پەلە لە فێرکردنی نەکات، وەفیزو دەماری بەسەر دا نەکات و گەردنکەچ بێت، بە ڕەوشێکی جوانیش لەگەڵیدا بجوڵێتەوە ، وە ئەگەر فیرخوازەکەش سێ خەصڵەت لە خۆیدا کۆبکاتەوە، بە هۆیانەوە نیعمەتەکان لەسەر مامۆستاکەی تەواو دەکات و مافی تەواوی پێ دەدات:

ئەقڵ و دانایی لە بەرامبەر ئەوەی کە فێری دەبێت، بەکارهێنانی ئەدەبی تەواو لەگەڵ زانستەکەدا، وە هەوڵدان بۆ باشتر تێگەیشتن و حاڵی بوون.[2]

## پوختەی ئەم قسانە ئەمەیە:

ئەو ڕەوشت و ئەخلاقەی لە قورئاندا باسیان هاتووە، نابێ زانایانی ئاخیرەت لە کار پێکردنیان کەمتەرخەمی بکەن و لێی دووربکەونەوە، چونکە کە فێری قورئان دەبن بۆ کار پێکردنیەتی، نەك بۆ گەورە بوونی دونیایی و وەرگرتنی ریاسەت.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

هەندێکمان لە چەرخی پێشوودا ژیاین، هەریەکێك لە ئێمە ئیمانی بۆ دەهات پێش ئەوەی فێری قورئان ببێت فێری بڕوا دەبوو، ، کە سورەتێکیش

---

(١) رواه الدرامي في سننه(٦٠٣)، وأبونعيم في الحلية ١٣٣/٣، عن علي بن حسين رحمه الله، ونسبه ابن عبدالبر في ((جامع بيان العلم و فضله))(٩٤٠) لسيدنا علي من تتمّة القول السابق.

(٢) قوت القلوب ١٤٥/١.

دادەبەزی، فێری حەڵاڵ و حەرام و لەچی دەمانگێڕیتەوە و فەرمانەکانی دەبوین، وە دەبوایە بمانزانیایە لەسەر چی دەبێت ڕابووەستین و، چۆن لەخۆماندا جێ بەجێیان بکەین.

وە ئێستەش کەسانێك دەبینم، لە پێش وەدەستهێنانی ئیمان و بڕوای ڕاستەقینەوە قورئان لەبەر دەکەن، لەمیانی سوورەی فاتیحەوە تا کۆتایی قورئانی دەخوێندەوەو خەتمی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی و نازانێت فەرمانی بەچی پێ دەدات و لە چی دەیگێڕێتەوەو نەهی لێدەکات، وە نەیدەزانی چۆن لە سەر ئایەتەکان و لە کوێدا ڕابووەستێت و فەرمانەکانی لێ وەربگرێت، هەروا پرش و بڵاوی دەکردەوە، هەروەك چۆن خورما خراپە رزیوەکان لادەدرێن.[١]

لە فەرمودەیەکی تر بەهەمان واتای ئەوەی پێشوو:

ئێمە ئەصحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ئیمان و بڕوامان وەردەگرت، پێش ئەوەی لە قورئان بزانین، لە داهاتودا لە دوای ئێوە کۆمەڵێك پەیدا دەبن، پێش ئیمان قورئانیان بۆ دێت: پیتەکانی بە جوانی دەردەبڕن و، سنوور و فەرمانەکانی زایە

---

(١) ونص الخبر الوارد: قال ابن عمر رضي الله عنهما: (**لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنَ الدَّهْرِ وَأَحَدُنَا يُؤْتَى الْإِيمَانَ قَبْلَ الْقُرْآنِ ، وَتَنْزِلُ السُّورَةُ فَنَتَعَلَّمُ حَلالَهَا وَحَرَامَهَا وَآمِرَهَا وَزَاجِرَهَا ، وَمَا يَنْبَغِي أَنْ نَقِفَ عِنْدَهُ مِنْهَا كَمَا تَتَعَلَّمُونَ أَنْتُمُ الْقُرْآنَ الْيَوْمَ ، ثُمَّ لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ رِجَالًا يُؤْتَى أَحَدُهُمُ الْقُرْآنَ . قَبْلَ الْإِيمَانِ فَيَقْرَأُ مَا بَيْنَ فَاتِحَتِهِ إِلَى خَاتِمَتِهِ مَا يَدْرِي مَا آمِرُهُ ، وَلا زَاجِرُهُ ، وَلا مَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَقِفَ عِنْدَهُ يَنْثُرُهُ نَثْرَهُ الدَّقَلَ**. أخرجه الحاكم في المستدرك ٩١/١(١٠١)، و صححه على شرط الشيخين، والبيهقي في السنن الكبرى ١٢٠/٣ (٥٠٧٣) . قال الزبيدي ٤٢٤/١، هكذا أورده صاحب القوت ٢٥٠/١ ، و أجرج ابن جرير في تفسيره عن حذيفه بن اليمان. **أن رسول الله ﷺ ذكر أن في أمته قوما يقرؤون القرءان، وينشرونه نشرَ الدَّقلِ، يتأوَّلونه على غير تأويله، لايُجاوز تراقيهم، تسبِق قرائتَهم إيمانَهم**.ددقل خراپترین جۆری خۆرمایە کە توڕدەدرێت.

دەکەن، دەڵێن خوێندومانە، کێ لە ئێمە باشتر دەتوانێت بیخوێنێت؟ وە فێری بوین، کێ لە ئێمە زاناترە لە خوێندنەوەی قورئاندا؟
ئەوە تەنها بەشێکی لێ وەردەگرن. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت:
ئەوانە خراپترینی ئەم ئوممەتەن.[1] ووتراوە کە پێنج جۆری ڕەوشت هەیە لە نیشانەکانی زانایانی ئەهلی ئاخیرەتن، کە ئەو ڕەوشتانە لە پێنج ئایەتی کیتابی پیرۆزی خوداوەندەوە ﷻ وەرگیراون:-

**ترسان لە خوداو، خشووع و ملکەچی لە حزوری خوداداو، گەردن کەچی و تەوازوع و، ڕەوشتی جوان و دونیا نەویستی، واتە:**

---

(١) قوت القلوب ١/١٤٥ و أصله عند أبی ماجه(٦١) و البیهقي في السنن الکبری(٣/١٢٠) و نصه: **كنا أصحاب رسول الله ﷺ أوتينا الإيمانَ قبل القرآن، و سيأتي بعدكم قومٌ يُؤتَون القرانَ قبلَ الإيمان، ويُقيمون حُروفَه و يُضيِّعونَ حُدودَه، يَقولون قَرأنا فمَن أقرأُمِنا ؟ و علِمنا فمَن أعلَم مِنا، فذالِك حظُّهم، وفي لفظٍ: أولئِك شِرارُ هذهِ الأمَّة).**بەڕاستی ئەگەر بەوردبینی سەیری ئەم دوو فەرموودەی سەرەوە بکەیت، کە حەزرەتی عەبدوڵلای کوری عومەر فەرموویەتی: دەردەکەوێت کە ڕاستەوخۆ ئەوکەسانە دەگرێتەوە کە ئەمڕۆ لە وڵاتەکاندا تەنها بایەخ بە جوان ووتن و تەجویدو لەبەرکردن و دەنگخۆشی دەدەن، بەڵام بە هیچ شێوەیەك خۆیان لە ناخ و ناوەڕۆك و واتاو مەبەستەکانی قورئان ناگەێنن، وە لە خۆیاندا جێ بەجێی ناکەن، قورئان بە قورگیاندا دێتە دەرەوە بەڵام لە قورگیانەوە ناچێتە خوارەوە، پەنا ئەگرم بەخودا، لە شەڕو بەدبەختیان. [قال الحافظ الزبیدی ١/٤٢٤ هکذا أورده صاحب القوت الکبیر: و إسناد ابن ماجه: صحیح، زاد الطبرانی في الکبیر ٢/١٦٥(١٦٧٨): (الخوارج شرُّ الخلق و الخلقیة(١٠٦٧) ، من روایة عبدالله بن صامت مرفوعا: **((وإنَّكم اليَومَ تَعلمونَ القرآنَ قبلَ الإيمانِ)** و هو صحیح أیضا، وروی مسلم کتاب الزکاة، باب: **إنَّ بَعدي مِن أُمَّتي قَومٌ يقرَؤونَ القُرآنَ لايُجاوِزُ حَلاقيهم، يَخرجُونَ مِنَ الدِّين كَما يَخرُج السَّهمُ مِن الرَّميَّةِ، ثُمَّ لا يَعودُونَ فيهِ، هُم شرُّ الخَلقِ والخَليقة))**.]

هەڵبژاردنی ژیانی دوارۆژ بەسەر دونیای فانی دا.

**ڕەوشتی خەشیەت و ترسان لە خودا**، لەم ئایەتەوە کە خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿**إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ**﴾ فاطر/٢٨.

واتە:( ئەوانەی کە زانا و عالمن بە خودا (جلَّ جَلالُه) ئەوانە بەڕاستی لە خودادەترسن، کەواتە ئەوەی بەتەواوی لە خودا دەترسێت تەنها ئەوە زانای ڕاستەقینەیەو (**خشیةالله**) لەدڵیایەتی).

**ڕەوشتی خشوع و ملکەچی لە حزوری خودادا**، لەم ئایەتە پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتووە کە دەفەرمووێت:

﴿ **خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا**﴾ آل عمران/١٩٩ واتە:

(دڵیان هەمیشە لە حزوردایەو، ئایەتەکانی خودا نادەن بەوەی کە لە بەرامبەردا نرخ و بەهایەکی کەمیان دەست بکەوێت، ئەمانە بەملکەچی حزوور و ناسراون لای خودا).

**ڕەوشتی گەردنکەچی و تەوازوعیش** لەو ئایەتە پیرۆزە وەرگیراوە کە خودا فەرموویەتی: ﴿ **وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ** ﴾الشعراء/٢١٥

واتە: (باڵت ڕابخەو بەگەردن کەچی و تەوازوعەوە بجوڵێرەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە شوێنت کەوتوون لە باوەڕداران، وە فیزو دەماریان بەسەردا مەکە).

**خوو ڕەوشتی جوانیش** لەم ئایەتەوە وەرگیراوە کە فەرموویەتی:

﴿ **فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ** ﴾آل عمران/١٥٩ واتە:

( ئەو نەرم و نیانییەی پێغمبەر(ﷺ)(کە بەسۆزو ڕەحمەتی خودا شانی بۆ دادابوون، ئەوە لە خوو ڕەوشتی جوانەوە سەری هەڵداوە).

**ڕەوشتی زوهدو دونیا نەویستیش** لەم فەرموودەی خوداوەیە:

﴿**وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا**﴾القصص/٨٠

واتە: ( بەڵام ئەوانەی شارەزان و نرخی حەڵاڵ و حەرام و قیامەت دەزانن ووتیان: هاوار بۆ ئێوە بۆ بیر ناکەنەوە؟ پاداشتی لای خودا بۆتان باشترە، بۆ ئەوەی بڕوای دامەزراوی هەیە و خاوەنی کردەوەی چاکەیە) .

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە فەرموویەتی:

﴿ فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ﴾ الأنعام/ ١٢٥واتە:

(ئەوەی خودای گەورە بیەوێت ڕێنومایی بکات، سینەو دڵی گوشاد دەکات بەرەو ڕێگای ئیسلامەتی) ووتیان پێی: ئەو شەرحی سینەیە چۆنە؟ فەرمووی:

**((إنَّ النُّورَ إذا قُذِفَ في القَلبِ انشَرَحَ لَه الصَّدرُوانفَسَح))**

واتە: ئەگەر خودای گەورە نوور بهاوێتە ناو دڵەوە، سینەی ئەو کەسە دەکرێتەوەو فراوان و گوشاد دەبێت، وتیان: ئایا ئەو حاڵەتە نیشانەیەکی هەیە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ:

**(نعَم، التَّجافِي عَن دارِ الغُرورِ والإنابَةُ إلى دارِ الخُلوُد، والإستِعدادُ لِلمَوتِ قَبلَ نُزولِهِ))** واتە:

(نیشانەکانی: دوورکەوتنەوە لە دونیایەك کە جێگای غرورو سەرکەشی یە، وەگەڕانەوەیە بۆماڵێك، کە هەتا هەتایە تیایدا دەمێنێتەوە، وە خۆ ئامادەکردنە بۆ مردن پێش ئەوەی ئێخەی پێ بگرێت[1].

---

(١) أخرجه الحاكم فيي المستدرك ٣٤٦/٤(٧٨٦٣) والبيهقي في الزهد [ص ٣٥٦(٩٧٤)] من حديث ابن مسعود. [ قال الزبيدي: أورده صاحب القوت هكذا. ١٥٥/١، و قال العراقي في التخريج الكبير: سكت عليه الحافظ وهو ضعيف ورواه البيهقي في ((الزهد)) ورواه ابن مبارك في الزهد و الرقائق ١٠٦/١. وهذا مرسل ضعيف وهو الصواب في رواية هذا الحديث].

### یەکێکی تر لە بنەماو نیشانەکانی زانایانی ئاخیرەت ئەمەیە کە:

## شارەزابێت لەو زانستانەی کە پەیوەندارن بە کردەوەکانیەوە

دەبێت زیاترینی باس و لێکۆڵینەوەکانی، لە فێربوونی ئەو زانستیانەدا بێت کە پەیوەندارن بە کردەوەکانەوە، دەبێت شارەزا بێت لەو دەردانەی کە کردەوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و باطیلیان دەکاتەوە، یان لەڕێگەی خەتەرەوە دڵیان تێك دەدات و تووشی شك و گومان و خەتەرەی نەفس و خراپیان دەکات و، ئیرادەی شەڕ و خراپەیان تیادا دەوروژێنێت، بەڕاستی ئەصڵ و بنەمای دین لەسەر ئەوە دامەزراوە کە خۆت لە شەڕ بپارێزێت، هەر لە بەر ئەمەیە کە وتراوە:

**عَــرِفتُ الشَرَّ لا لِلشَرِّ لكِنْ لتَوَقِّـــيهِ**

**ومَن لا يَعرِفِ الشَرَّ مِنَ النَّاسِ يَقَعْ فيهِ**

واتە: **شــەڕم زانی، لە بـــــۆ شـــەڕنا، بپارێزم سەرو مـــاڵم**

**ئەگەر لەو خەڵکە ئەهلی شەڕ، نەناسم وەی لە بۆ حـاڵم**[1]

وە لەبەر ئەوەی کە ئەو کارانەی پەیوەندارن بە کردەوەکانەوە، نزیکتر وەردەگیرێن، ئەوپەڕەکەیان بەڵکو بەرزترینیان ئەوەیە: کە بەدڵ و بەزوبان بەردەوام بێت لەسەر زیکری خودای گەورە.[2]

---

(١) بۆ شێعرە عەرەبیەکان بنوارە ديواني أبی فراس الحمدانی لاپەڕە ٣٥٢، بەندەش وەرگێرا بە کوردی(نەحسەن موفتی).

(٢) زیکـری خـودا بە هەردوو جـۆرەکەی: بەزوبـان : ئـاداب و مەرجی تـایبەتی هەیە کە بەدرێژی زانایانی ئەهلی تەصەووف باسـیان کردوە، وە زیکری دڵ: کە تـایبەتە بە زاناو

گرنگی و بایەخدانی ڕاستەقیەنە بەوەیە: کە خۆی شارەزا بکات لە هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆکاری تێکدان و، شك و گومان دروست کردن و، ئاڵۆزی لە ناو ڕێبازی زیکرەکەدا، کە لق و پۆی زۆری لێ دەبێتەوەو باس کردنیان درێژ دەبێتەوە، کە ئەهلی مەعریفەت پەیی پێ دەبەن و لێی شارەزا دەبن، کە زۆر پێویستە سالیکی طەریقەت ئەم بابەتانە بە چاکی بزانێت، چونکە زۆر کەس تووشی ئەو ناڕەحەتی و ڕێگرانە دەبێت، بەتایبەتی ئەوانەی ڕێگای ئاخیرەتیان گرتۆتەبەر.

بەڵام زانایانی ئەهلی دونیا بۆ خۆیان شوێنی لق و پۆ ئاڵوز و ناوازەکان دەکەون و ئەو مەسئەلانەی کە پەیوەندارن بە قەزاوەت و، چارەسەر کردنی کێشەی خەڵك و خصومات، کە لە دڵیاندا لە بەری دەکەن و فەتوای پێ دەدەن، بە درێژایی شەوان، بۆ داڕشتنی وێنەی هەندێك پرسیارو وەڵام خۆیان ماندوو دەکەن ، کە دونیا بە کۆتا دێت و جارێك یەکێك لەو پرسانە ڕونادەن، ئەگەر گریمان ڕوش بدات، بۆ غەیری چەرخی ئەوان ڕودەدات، وە ئەگەر ئەو پرسیارانەش ڕوبدات کەسانێکی زۆر هەن کە پێی هەڵسن و وەڵامیان بدەنەوە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، ئەوانە واز لەو شتە گرنگانە دەهێنن کە پێویستیانەو، چەندین جاریش لەشەووڕۆژدا لەسەریان دوبارە دەبێتەوە، بەتایبەتی کە لە کردارو خەتەرەو خەیاڵات و وەسوەسەو هەڵس و کەوتیاندا

---

ساداتی نەقشەبەندی‌یەوە، ئەبو عەلی روزباری کە شێخی ئیمامی غەزالی بووە، وە یەکێکە لە ڕوکن و پایە گرنگەکانی طەریقەتی نەقشەبەندی،دەفەرموێت: هەندێ ئادابی زۆر تایبەتی هەیە بۆ زیکری قەلبی، کە بەپێی مەرجەکانی ئەگەر ئەنجام بدرێت، ئەوا سالیکی ڕێگای حەقیقەت بە یەك شەو ڕێگەی چەند ساڵ دەبڕێت، کارەکانیان ئاسانەو، پێویستی بە ڕێنمایی تایبەتی مورشیدی حەققی ئەم ڕێبازە هەیە، کە لە دەمی ئەوانەوە وەری بگرن و ئەنجامی بدەن.

ڕوبەڕویان دەبێتەوە، ئای کە چەندێك دوورە لە بەختیاریەوە، ئەو کەسەی کارە زەرورگرنگەکەی خۆی کە پێویستی پێیەتی بیفرۆشێت و، بیگۆڕێتەوە بەکارێکی دەگمەن و ناوازە، کە بەلای خەڵکێکی ترەوە گرنگی هەبێت، واتە:

خۆ نزیك کردنەوە و قەبوڵکردنی خواستی خەڵکی لا گرنگ تر بێت لە نزیك بوونەوە لە خودای گەورە، هەر بە هیواو تەماحی ئەوەی، کە رۆڵە بێ کارەکانی ئەهلی دونیا، بەگەورەو لێکۆڵەرو زانای وردەکارو شارەزا ناوی ببەن!

لەلای خودایش بەوە پاداشتی دەدرێتەوە، کە تەنانەت لە دونیایشدا قسەکانی سوود بەخش نابێت بۆ خەڵکی، بەڵکو لە نارەحەتی و سەختیەکانی زەماندا ئارامی و خۆشی لێ تێك دەدات، کاتێکیش دێتە ناو قیامەتەوە، بەدەستی بەتاڵ و دڵی پڕ لە ئاخ و حەسرەتەوە خۆی دەبینێتەوە،کە ئەوانەی بەڕاستی کاریان دەکردو نزیکی دەرگای خوداناسی بوون سەرفرازییان بردو،ئەمیش دوچاری خەسارەتمەندی هات.

حەسەنی بەصری(رەحمەتی خودای لێ بێت) قسەکانی زۆر نزدیک بوو لە فەرموودەی پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر) وە لەڕەویەو ڕەفتار و ڕێبازدا، زۆر نزیك بوو لە پەیڕەوکردنی صەحابەکان(خودایان لێ ڕازی بێت) کۆی زانایان لەسەر ئەوە یەکڕان کە باسمان کرد، زۆربەی فەرموودەکانی گرنگی دان بوو بەو پرسانەی پەیوەندییان بە عیلمی یەقینەوە هەبو لەگەڵ ئەو خەتەرانەی ڕو لە دڵ دەکەن، یان کردەوەکان هەڵدەتەکێنن و گومانی خراپ دەخەنە ناو نەفسی ئینسانەوە، وە باسکردنی ئەو ئارەزواتە نادیار و شاراوانەی کە بە ئارەزواتی نەفسی دەناسرێن (یەکەم کەس بوو(خودای لێ ڕازی بێ) کە بەتەواوی بایەخی بەم بابەتە هەستیارانەدا).

هەتا جارێك پێیان ووت: ئەی ئەبوسەعید؛ تۆ جۆرە قسەیەك بۆ ئەو خەڵکە دەکەیت، لە غەیری تۆ لە کەس تر نایبیستین، لە کوێوە وەرتگرتەوە؟

فەرمووی: لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە وەرم گرتووە[1]

وە وتیان بە حوزەیفە: دەبینین تۆ هەندێك قسەدەکەیت لە کەسی تر لە ئەصحابەکان ئەم قسانە نابیسرێن، ئەوە لە کێت وەرگرتووە؟

فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتی کردووم بەو قسانە، خەڵکانی تر دەربارەی کارە خێرەکان پرسیاریان لێ دەکرد ، منیش لە بارەی شەڕەوە پرسیارم لێ دەکرد لە ترسی ئەوەی نەوەکو تووشی ببم و تێی بکەوم، وە دەشمزانی کە خێر پێشم ناداتەوە[2] هەروەها جارێکی تر فەرمووی: بۆم دەرکەوت ئەوەی شەڕ نەزانێت و (خۆی لێ لانەدات) ناتوانێت شارەزای خێر ببێت.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی:

**كانَ النَّاسُ يقولونَ: يا رسولَ الله! ما لِمَن عَمِلَ كَذا وكَذا؟**

واتە: چ خێرێکیان دەست دەکەوێت ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی ئاواو ئاوا خێر و چاکە بکات؟ پرسیاریان لە بارەی کردەوە گەورەو چاکەکانەوە لێ دەکرد، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد:

**ما يُفسِدُ كَذا وكَذا؟**

ئەی پێغەمبەری خودا، چ کردەوەیەك ئەو کارە خێرانە بەتاڵ دەکاتەوە (**فلمَّا رآني أسألُه عَن آفاتِ الأَعمالِ خَصَّني بهذَا العِلمْ**).

واتا کاتێك کە بینی من ئەو جۆرە پرسیارانەی لێ دەکەم کە پەیوەندیان بە ئافەت و کردەوە خراپەکانەوە هەیە، تایبەتمەندی کردم بەم زانستەوە.

هەروەها حەزرەتی حوزەیفە(ڕەزای خودای لێ بێت) تایبەتمەند کرابوو بە

---

(١) قوت القلوب ١/ ١٥٠.

(٢) رواه البخاري كتاب المناقب، باب علامات النبوة في الأسلام ٣٦٠٦ و مسلم كتاب الأمارة باب وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن(١٨٤٧) مختصرا.

زانین و ناسینی مونافقه دووڕووەکان.[1]

بەتەنها زانستی دووڕویی و هۆکارەکانی و وردەکاریەکانی ئەو فیتنەو تاقی کردنەوانەی کە دێنە ڕێگەی موسوڵمانان، ئەوەندە شارەزا بوو کە حەزرەتی عومەر و عوسمان و گەورەیانی ئەصحاب(خودایان لێ ڕازی بێت) لە بارەی هەموو فیتنەکانەوە بەگشتی و تایبەتیەکانەوە پرسیاریان لێ دەکرا.[2]

---

(١) قال الزبيدي ١٤٩/١. روى مسلم كتاب صفات المنافقين و أحكامهم(٢٧٧٩) عن حذيفة قال: قال النبى(ﷺ) ((**في أصحابي إثنى عشر مُنافقا منهم ثمانية لايدخلون الجنة حتى يلجَ الجمَل في سَمِّ الخياط**)) و روى البخاري. كتاب تفسير القرآن باب: **فقاتلوا أئمة الكفر إنهم لا أيمان لهم** (٤٦٥٨) عن حذيفة قال: **ما بقيَ من أصحاب هذه الأمة ولا مِن المُنافقين إلاّ أربعة**. الحديث.

(٢) حەزرەتی حوزەیفە كان صاحب سرِّ رسول الله(ﷺ) خاوەنی نهێنیەکانی حەزرەت بوو،[ تایبەتمەند کرا بوو بە ناسینی ناوو شۆرەتی مونافقەکان، ئاگاداری هەموو فیتنەو تاقیکردنەوە سەختەکان بوو کە دێنە سەر ڕێگای صەحابەو تابیعین و موسوڵمانان تا ڕۆژی دوایی، ئیمامی موسلیم دەیگێڕێتەوە کە حەزرەتی حوزەیفە فەرموویەتی: لە ناو هاوڕێکانی مندا دوانزە دوڕوویان تێدایە، هەشتیان هەرگیز ناچنە ناو بەهەشتەوە تا وشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا.

ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە کە حوزەیفە فەرموویەتی: نازانم هاوڕێکانم لە بیریان چووتەوە یان لەبیری خۆیانیان بردۆتەوە، وەڵلاهی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێ لەو سەرکردانەی نەبواردووە کەباسیان نەکات، کە سەرکردەی فیتنەکان دەبن تا کۆتایی دونیا دێت، نزیکەی سێ صەد کەس لە خزمەتیدا بوون، کە ئەو هەواڵانەی پێدان، بە ناوی خۆیان و باوکیان و هۆزو عەشرەتیانەوە، هەروەها موسلیم لە ڕیوایەتی ئەبی ئیدریسی خەولانی لە حوزەیفەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: وەڵلاهی من لە هەموو کەس ئاگادارو شارەزاترم بە هەموو ئەو فیتنانەی ڕودەدەن لە بەینی من و تا ڕۆژی قیامەت، هەروەها بوخاری و موسلیم

و ئەبوداود دەیگێڕنەوە لە حوزەیفەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسایە سەر پێ لەناو ماندا، هیچ شتێك نەما باسی نەکات، لەو کاتەوە تا ڕۆژی قیامەت، ئەوەی لەبەری کرد لەبەری کردو، ئەوەی لەبیری کرد لەبیری چوویەوە.
دارەقوطنی لە ڕیوایەتی هوبەیرەوە دەیگێڕیتەوە کە حەزرەتی عەلی پرسیاری لەناوی مونافیقەکان لە حوزەیفە کرد، ئەویش هەواڵی ناوەکانی پێ دا.
طەبەڕانی لە ((الکبیر)) دا ڕیوایەتی کردووە لە صیلەی کوڕی زەفرە وە کە دەڵێت: پرسیارمان لە حوزەیفە کرد چۆن هەواڵ و ناوی مونافقەکانت زانیوەو، کەسی تر لە صەحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ) نەیزانیوە، تەنانەت ئەبوبەکر و عومەریش؟! فەرمووی: من لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ)دەڕۆیشتم، لەسەر وشترەکەی خەوی لێ کەوت، گوێم لێ وەبوو هەندێ لە دوڕووەکان دەیان ووت: ئەگەر لەسەر وشترەکەی بمانخستایە خوارەوەو ملی بشکایە ڕزگارمان ببوایە لێی، منیش کەوتمە بەینی ئەوان و پێغەمبەرەوە، دەستم کرد بە قورئان خوێندن و دەنگم بەرزدەکردە، تا پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاگا هات، فەرمووی: ئەوە کێیت؟ ووتم حوزەیفە، فەرمووی: ئەی ئەوانە کێن؟ وتم فلان و فلانن، تایەکە یەکە بۆم ژمارد، فەرمووی ئەی بیستت چیان دەووت؟ ووتم بەڵێ: هەر بۆیە کەوتمە میانی ئەوان و تۆوە، فەرمووی بزانە ئەوانە فلان و فلان مونافیقن و هەواڵیان بە کەس مەدە.[کەواتە لە کاتی نوستنەکەیشی دا پێغەمبەر(ﷺ) گوێی بە قسەکانیانەوە بووە، وەك فەرموویەتی(**تنامُ عَينايَ و لا يَنام قَلبي**) چاوەکانم دەنوێت بەڵام دڵم وریایەو هەرگیز نانوێت] ئەمەیە ئەو صەحابەیەی کە خاوەنی سیڕەکانی پێغەمبەر بووە (ﷺ) ، یان حەزرەتی ئەبوبەکر کە ئەوەی خوا خستیە دڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەویش خستیە ناو دڵ و سینەی ئەبوبەکرەوە، ئەم حەزرەتی حوزەیفە یەکێك بووە لەسەر چاوەکانی عیلمی ئەسرار ، کە حەزرەتی حەسەنی بەصری نهێنیەکامی لێ فێر بووە، ئاگاداری هەموو فیتنەکان بووە،

بۆیە پرسیاری لە بارەی موونافیقەکانەوە لێ دەکرا، هەواڵی ژمارەی ئەوانەیانی پێ دەدان کە لە ژیاندا ماون، بەڵام هەواڵی ناوەکانی پێ نەدەدان.[1]

حەزرەتی عومەر(خودای لێ ڕازی بێت) پرسیاری لێ دەکرد:

کە ئایا شتێك لە نیشانەی موونافقەکانی تێدا نی‌یە؟ ئەویش دڵنیای دەکردەوە کە خاڵی‌یە لە هەموو نیشانەکانیان.[2]

هەروەها حەزرەتی عومەر حاڵی وابوو ئەگەر بانگیان بکردایە نوێژ لەسەر مردویەك بخوێنێت سەیری دەکرد، ئەگەر حوزەیفە ئامادە ببوایە، نوێژی لەسەر دەکرد، ئەگەرنا وازی لێ دەهێنا[3] حوزەیفە ناو دەبرا بە(**صاحِبُ السِّرِّ**)[4] واتە: خاوەنی نهێنیەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

---

قسەکانی وەك قسەی صەحابەو پێغەمبەران وابووە، خۆیشی ئەهلی طەریقەت و سەرچاوەی تەواوی ڕێبازەکانی ئەهلولڵا بووە، هەر بۆیە ئەهلی تەصەووف نهێنیەکانیان لەمورشیدەکانیانەوە وەرگرتووە، کە ئەوانیش لە ڕێگەی ئەو گەورانەوە فێر کراون. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە بنواڕە إتحاف: ٤٢٩/١.

(١) قوت القلوب ١٥٠/١.

(٢) رواه وكيع في الزهد(٤٧٧) و ابن عساكر في تأريخ دمشق ٢٧٦/١٢ بنحوه.

(٣) قال الزبيدي ٤٣٠/١: أخرج ابن عساكر في تأريخه ٢٧٦/١٢، عن حذيفة قال: **مرَّ بي عُمر بن الخطاب و أنا جالس في المسجد فقال لي يا حذيفة، إن فلاناً قد مات فاشهده، ثم مضى حتى كاد أن يخرج إلى المسجد، إلتفتَ إلي فرآني و أنا جالس، فعرف فرجع، فقال: يا أبا حذيفة ، أنشدك الله أمِن القوم أنا؟ قلت: اللهم لا، و لن أبرئ أحدا بعدَك، فرأيت عينَيْ عُمر جادتاً.** کەواتە حەزرەتی عومەر کە زانی حەزرەتی حوزەیفە نوێژ لەسەر ئەو کابرا ناکات، لەو بابەتە سڵەمییەوە، تۆ بڵێی منیش لەو تاقمە نەبم، بۆیە گەڕایەوەو سوێندی دا ،ئەویش شایەتی پاکی بۆ داو فەرمووی: ئیتر کەسی تریش تەبریە ناکەم دوای تۆ...

(٤) رواه البخاري (٣٧٤٣).

كەواتە گرنگی و بایەخدان بە ئەحواڵی قەلب و پلەو مەقامەکانی، لە داب و شیمەی زانایانی ئاخیرەت بووە، چونکە دڵ ڕێگاکە دەبڕێت بۆ نزیك بونەوە لە خودای گەورە. ئەم زانستە بایەخدارە، وای لێ هاتوە کە نامۆ و کەم بووتەوە، خەریکە لەبیر دەچێتەوە، ئەگەر زانایەك باس لە هەندێکی بکات، زۆر بە نارەحەتی لێی حاڵی دەبن و، ئەوەش بەدوایدا دەگەڕێت بە نامۆ دەناسرێت، وە بەو زانایە دەڵێن:

ئەمەی تۆ لەسەریتی زەوق و حەزی چیرۆك خوان و واعیزەکانە، دەی ئەبێ لێکۆڵینەوە لە وردەکاری و موجادەلەو ڕوبەڕوبونەوەکان لە کوێدا بێت.

بەڕاستی خاوەنی ئەم قسەیە ڕاستی ووتووە:

الطُّرُقُ شَتَّى وَطُرُقُ الحَقِّ مُفرَدَةٌ والسَّالِكُونَ طَرِيقَ الحَقِّ أفْرادُ
لا يَعرِفُونَ ولا تُدرىَ مَقاصِدُهُم فَهُم عَلى مَهَلٍ يَمشُونَ قُصَّادُ
والنَّاسُ في غَفْلَةٍ عَمَّا يُرادُ بِهِم فَجُلُّهُم عَن سَبيلِ الحَقِّ رُقَّادُ[1]

واتە: ڕێگا زۆر و زەبەندەیە، تەنها ڕێ یەك بەرندەیە

ئەوەش لە سەر ڕێگای حەقە، تاك و تەرایەو، بەندەیە

ناناسرێن و کەس نازانێت، خواست و مەرامیان چەندەیە

لەسەر خۆن و ڕێگا دەبڕن، دەم و لێویان بەخەندەیە

خەڵکیش هەموو لە غەفڵەتان، لێیان دەدوێن بەو هەندەیە

زۆری لە ڕێی ڕاستی وەکو، نووستوو چو بێ بەو دەردەیە

(ئەحسەن) دەبێ شوکرانە بێت پشتی تەنها بەومەردەیە

تاقانەیە لە هیممەتدا، میهری زۆر و زەبەندەیە[2].

---

(١) شیعری عبدالواحیدی کوری زەید بنواڕە: (قوت القلوب ١٥٣/١) و تأریخ بغداد ٢٣١/٥.

(٢) وەرگێڕ: (ئەحسەن) موفتی.

بەکورتی بیڵێین: زۆربەی ئەو خەڵکە بە دوای ئاسانکاری دا دەگەڕێن، حەزیان بە فەرمانێکە لەگەڵ سروشتی خۆیاندا گونجاو بێت، چونکە بەدڵنیاییەوە حەق و ڕاستی تاڵەو، ڕاوەستان لەسەر حەقیش قورس و گرانەو، دەرك و پەی پێ بردنیشی نارەحەتەو، ڕێگاکەشی تووشە و سەختە، بەتایبەتی ناسینی صیفەتەکانی دڵ و پاککردنەوەی لە ڕەوشتە نەشیاوو ناپەسەندەکان، بەڕاستی ئەمە وەک ڕۆحکێشانێکی بەردەوام ئاوا بەئازارە، ئەو کەسەی کە ئەم هەوڵ و تێکۆشانە دەکات وەك ئەوە وایە کە دەرمانێکی تاڵ و تفت بخواتەوە، چۆن دەبێت خۆی لەسەر تاڵیەکەی ڕابهێنێت بە هیوای چاك بوونەوە، یان خۆی بخاتە شوێنی ئەو کەسەی کە هەموو تەمەنی بڕیاری داوە کە بەڕۆژوبێت و، هەموو ئازارو نارەحەتیەکان بباتە سەر، بۆ ئەوەی لە کاتی مردندا ئیفطاری یەکجاری بکاتەوە، ئاشکرایە ڕێگەیەکی ئەوەندە سەخت و تووشە، کەی ئەوەندە حەزو ڕەغبەتی زۆری خەڵکی لەسەر دەبێت؟!

بۆیە وتراوە:

لەناو بەصرەدا صەدو بیست زانای قسە زان واعیز و چیرۆك خوانی تێدابووە، بەڵام تەنها سێ کەسی تیا بووە کە بتوانن قسە لە بابەتی عیلمی یەقین و ئەحواڵی دڵەکان و صیفەتە شاراوە و ئەسرارەکان بکەن، ئەوانیش سەهلی توستەری و صوبەیحی و عەبدولڕەحیمی کوڕی یەحیای ئەسوەد، خەڵکێکی بێ حەدد و حیساب لە لای ئەوانەی پێشو و زانا قسە زانەکان دادەنیشتن و گوێ یان لێ دەگرتن، خەڵکێکی کەمیش کە کەم وارێ دەکەوێت لە دە کەسی تێ بپەڕاندایە لای ئەم سێ کەسە دادەنیشتن، چونکە شتی بەکەڵك و پڕ بایەخ، کەسانی تایبەتمەندی دەوێت کە وەربیگرن و لە ئاستی ئەواندا بێت، بەڵام ئەوەی دەوترێت بە تێکڕای خەڵکەکە ئاسانترەو هەموو کەس پێی دەگات.

## یەکێکی تر لە نیشانەکانی زانای ئاخیرەت ئەمەیە:

# دەبێ پشتڕاست بێت بە تواناو نییەت پاکی خۆی

دەبێت لە وەرگرتنی زانستەکانیدا زیاتر پشت ڕاست بێت بەزیرەکی و بەرچاو ڕونی و صەفای دڵ و هەستیاری خۆی، نەك پشت بە کتێب و پەڕاوو نوسراوەکان ببەستێت، یان تەنها شوێن ئەو قسانە بکەوێت کە لە کەسانێکی ترەوە دەیبیستێت، بەڵکو دەبێت پشت بەوە ببەستێت کە فرمانمان پێ کراوە شوێنی بکەوین، بەتایبەتی خاوەنی شەریعەت(ﷺ) لە پەیڕەوکردنی فەرمان و فەرمایشتەکانی، بۆیە شوێن صەحابەی کیرامیش دەکەوێت، چونکە هەموو کردەوەکانیان بەڵگەن لە سەر ئەوەی لە حەزرەتی پێغەمبەر(ﷺ) بیستویانە و پەیڕەویان لێ کردووە.

لە پاشان ئەگەر گوێڕایەڵ و تەقلیدی خاوەنی شەریعەتی کرد(ﷺ) لە وەرگرتنی فەرمان و فەرمودەو، شوێن کەوتنی ڕەفتارو کردارەکانی، دەبێت سووربێت لەسەر تێگەیشتنی ئەسرار و نهێنیەکانی ئەو کردارو ڕەفتارانەی کە ئەنجامیان دەدات، چونکە خاوەنی شەریعەت کە کارێک دەکات، دەبێت هۆکارو نهێنی‌یەکی تێدا بێت، دەبێ بە چاکی بگەڕێت بە شوێن نهێنی و فەرمایشتەکاندا، ئەگەر تەنها قسەکانی لەبەر بکات و بەس، ئەو کاتە دەبێتە جێگای هەڵگرتنی زانستی، نەك زانایەکی تێگەیشتوو لە زانست، بۆیە بەو جۆرە کەسانەی تەنها قسە لەبەردەکەن دەڵێن:

بەڕاستی فلان کەس کۆگایەکی زانستیە، ئەوانەی کە بەدوای حیکمەت و نهێنی‌یەکانی زانستدا نەگەڕابن و تەنها قسەیان لەبەرکردبێت، بەزاناو عالم ناو نەدەبران.

هەرکەسێکیش پەردە لەسەر دڵی لادراوبێت و، بەنووری ڕێنومایی ڕۆشن بوبێتەوە، ئەو کاتە هەر لە خودی نەفسی خۆیەوە دەبێتە کەسێکی وا کە

تەقلیدی بکەن و شوێنی بکەون. ئەو کەسە، ئیتر نابێت شوێن کەسانێکی تر بکەوێت[1] هەر لە بەر ئەمەیە کە عەبدوڵلای کوڕی عەباس(خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (**ما مِنْ أحَدٍ إلاَّ يُؤخَذُ مِنْ عِلمِهِ ويُتْرَكُ إلاَّ رَسُول اللهِ ﷺ**)[2].

واتە: هیچ کەسێك نییە جگە لە حەزرەتی پێغمبەر(ﷺ) کە هەموو قسەکانی لێ وەربگیرێت، بەڵکو ئەوانی تر هەندێکیان لێ وەردەگیرێت و هەندێکیشیان تەرك دەکرێت، کە بۆ خۆی لە زەیدی کوڕی ثابیت فێری زانستی(فیقە) بووە، وە قورئان و خوێندنەوەی قورئانیشی لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە وەرگرتووە و فێربووە، لە پاشان بۆ خۆی لە هەردوو زانستی (فیقە)و چاك خوێندنەوەی قورئاندا پێچەوانەی ئەوانیشی دەکرد.

هەندێك لە پێشینە باشەکان فەرموویانە:

ئەوەی لە حەزرەتی پێغەمبەری خوداوە بۆمان هاتبێت و پێمان گەیشتبێت، بەسەر سەر و بەسەر چاو وەری دەگرین، ئەوەی لە ئەصحابی کیرامەوە بۆ مان هاتبێت لێی وەردەگرین و لێشی ڕەددەکەینەوە، ئەوەش کە لە زانایانی تابیعینەوە پێمان گەیشتبێت، ئەوان پیاو بوون و ئەهلییەتیان هەبووە و ئێمەش پیاوین دەتوانین خاوەنی ڕای خۆمان بین.[3]

---

(١) چونکە فەقیە لە ناو زانایاندا بەو کەسە شەرع زانە شارەزایە دەڵین: کە بەزانست و بە تێگەیشتنی دڵەوە زاناو فەقیە بێت، نەك بە قسەی خەڵکی تر، نمونەی ئەو کەسەی بە زانستی کەسانی ترەوە شارەزا دەبێت، وەك ئەو کەسە وایە کە وەصفی حاڵ و ژیانی پیاوچاکان و عاریف و مقاماتی صاڵح و صددیق و خواناسان بکات و، خۆیشی خاوەنی هیچ حاڵ و مقامێك نەبێت، نمونەی ئەمە وەك ئەوەیە کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾، إتحاف ٤٣٢/١.

(٢) رواه الطبراني في (الكبير) من حديثه مرفوعاً (٢٦٩/١١).

(٣) رواه البيهقي في ((المدخل)) عن أبي حنيفة رحمه الله تعالى بنحوه. چونکە ئەگەر زانایەك پەردەی زانستی لەسەر دڵی هەڵدرایەوە، دەبێ بە پێی یەقین و زانستەکەی خۆی

بۆیە صەحابەکان گەورەبون و خاوەن فەضڵ بوون، چونکە لە زۆربەی کاتەکاندا لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوون و، ئاگایان لە بۆنەو هۆکارو ئەحواڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ)بووە، وە دڵیشیان هەندێك فەرمانی تایبەتی دەبینی و هەستی پێ دەکرد، کە بەهۆی بەرچاوڕونی و حاڵ و مەقامەوە دەیانزانی، کە ڕێگاو ڕێبازی ڕاست و دروستی بۆ دەردەخستن و، لەحەق و ڕاستی شارەزای دەکردن، کە هەرگیز بە گەیاندن و ڕیوایەت و دەستەواژەی هیچ کەسێك فێر نەدەبوون، چونکە لە نووری پێغەمبەرایەتی دەڕژا بەسەریاندا، کە لە هەڵە و لە ڕێلادان دەیانپارێزێت.

وە لە کاتێکدا پشت بەستن بە قسەو باسی کەسانێکی تر چاو لێکردنێکی پەسەندنەبێت، دیارە پشت بەستن بە زانستییەك کە سەرچاوەکەی لە پەڕاو و دانراو و نوسراوەکانەوە بێت، دورترو نەشیاوترە، بەڵکو ئەو کتێب و دانراوانە تازە پەیدابوون، خۆ هیچیان لە چەرخی صەحابەو سەرەتای ژیانی پێغەمبەردا نەبوون، بەڵکو لە دوای ساڵی سەدو بیستی کۆچی پەیدابوون، وە لە دوای وەفاتی هەموو صەحابەکانی کیرام و زۆربەی تابیعیەکان(خودایان لێ ڕازی بێت)، وە لە دوای وەفاتی سەعیدی کوڕی موسەییەب و حەسەنی بەصری و هەڵبژاردەکانی تابیعین بووە، بەڵکو زانایانی جیلی یەکەم نوسینەوەی فەرمووده و دانانی کتێبیان بەلاوە پەسەند نەبووە، بۆ ئەوەی خەڵکەکە بەهۆی ئەو نوسینانەوە لە لەبەرکردن دوورنەکەونەوەو، واز لە قورئان و بیرکردنەوە و تێڕامان و وردبینی لە دەقەکان نەهێنن، وەهەمیشە دەیانفەرموو:

ئێوەش لەبەریان بکەن ، وەك چۆن ئێمە کاتی خۆی دەقەکانمان

---

فتوابدات دروست نی‌یە وەك ئیمامی ئەبو حەنیفە فەرموویەتی تەقلیدی کەسێکی تر بکات.

لەبەردەکرد.[١]

هەربۆیە حەزرەتی ئەبوبەکەری صددیق و کۆمەڵی لە صەحابە(خودایان لێ ڕازی بێت) پێیان ناخۆش بوو قورئان کۆبکرێتەوە لەیەك مەصحەفدا، دەیانووت چۆن ئێمە کارێك ئەنجام بدەین، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیکردبێت؟! دەترسان خەڵکەکە پشت بە مەصحەفەکان ببەستن و، واز لە لەبەرکردنی بهێنن، کە دەیانووت:

واز لە قورئان بهێنن(واتە کۆی مەکەنەوە) با هەندێك لە هەندێکی تری وەربگرن، بە فێرکردن و خوێندنەوەو لێوەرگرتن، بۆ ئەوەی تەنها قورئان جێگای بایەخ و خەم و گرنگی پێدانیان بێت.

تا حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب و هەندێك لە صەحابەکان ڕاوێژیان بۆ کرد، کە قورئان بنوسرێتەوەو کۆبکرێتەوە، لە ترسی کەمتەرخەمی و لەبیرکردن و لەبیرچونەوەی خەڵکەکە، یان تەمبەڵی بکەن و ،ئەگەر لەسەر ئایەتێک کێشەیەك دروست ببێت، ئەوا با بگەڕێنەوە بۆ ئەو مەصحەفە کۆکراوەیە، کە وەك ئەصڵ دابنرێت و، لە وشەیەك یان خوێندنەوەیەك لە ئایەتە موتەشابهیەکان پێی ڕاست بکەنەوە.

ئیتر سینەی ئەبوبەکری صددیقیش بۆ ئەم پرسەیە گوشاد و کرایەوەو، بڕیاری هاتە سەر کۆکردنەوەی قورئان و لەیەك مەصحەفدا هەموو قورئانیان کۆکردەوە.[٢]

---

(١) رواه أبو نعيم في ((الحلية)) ٣٦٣/٣ عن الزهري قوله: **كُنَّا نكره الكتب، حتى أكرهنا السلطان، فكرهنا أن نمنعه الناس) و روى أنه كان أول من دون العلم.**

(٢) قوت القلوب ١٥٩/١

هەروەها ئەحمەدی کوڕی حەنبەل حاڵێ وابوو، کە ناڕازی بوو لە مالیکی کوڕی ئەنەس کە کتێبی (موطأ)ی دانابوو وە دەیفەرموو:

کارێکی داهێناوە کەصەحابەکانی پێش خۆی(خودایان لێ ڕەزای بێت) نەیان کردوە[1]

ووتراوە: یەکەم کتێب لە مێژووی ئیسلامدا دانراوە کتێبی( ابن جريج في الآثار) بووە، هەروەها حروفی تەفسیرەکان لە موجاهیدو عەطاء و هاوڕێکانی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لەمەککەدا(خودایان لێ ڕازی بێت)، لەپاشان کتێبەکەی مەعمەری کوڕی ڕاشیدی صەنعانی لە یەمەن، کە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە پێی (فەصڵ و باب) و بە پرش و بڵاوی کۆی کردبویەوە، لە پاشان کتێبی (موطأ)ی مالیکی کوڕی ئەنەس، لە پاشان جامیعی سوفیانی سەوری، لە پاشان لە سەدەی چوارەمدا دانراوەکانی عیلمی کەلام دەستی پێکرد.[2]

زیاتر زانایان ڕۆچوون لە بابەتی شەڕەقسەو بەربەرەکانێ و بەڵگە بە زۆراندان، بەڵگەی نوسراوی یەکتریان هەڵدەوەشاندەوە، خەڵکەکە ڕوویان لەم جۆرە زانستەکرد و، خوویان دایە گێڕانەوەی چیرۆك و ئامۆژگاری پێ کردنی، لەو کاتەوە زانستی یەقین و دڵنیایی بەرەو نەمان و بەکۆتا بوون دەچوو، دوای ئەو وەختە ئیتر زانستیی ئەحواڵی دڵەکان نامۆ دەبوبویەوە، کەم کەس

---

(١) ئەو ئینکاری کردنە تەنها لەسەرەتاوە بوو ، لە ترسی گرنگی نەدان بە قورئان، بەڵام لە دواییدا بۆ خۆی حەدیسەکانی لە موسنەدەکاندا کۆدەکردەوە،کە زانی خەڵکەکە پێویستیان پێیەتی، بنواڕە إتحاف ٤٣٥/١.

(٢) قوت القلوب ١٥٩/١ و انظر فتح الباري: المقدمة(٦).

بەدوای صیفاتی نەفس و فرت و فێڵی شەیتان دا دەگەڕان، کەمێك نەبێت هەموو پشتیان لە عیلمی ئاخیرەت کرد.

وای لێ هات ئەوەی زۆر بلێ و قسەزان و موجادەلە چی بوو، ناوبانگی بەزانا دەردەکرد. چیرۆکخوانی لەبلەبان، کە قسەکانیان بە دەستەواژەی جوان و ڕەونەقدار برازێننەوەو، سەجع و وشەئارایی تێدا بەکار بهێنن، ناویان بەزانا دەرکرد، چونکە عەوام و ڕەشەخەڵکەکە گوێیان لێ دەگرتن، ئەوانیش هەرگیز نەیاندەتوانی حەقیقەتی زانست لەوانی تر جودابکەنەوە. ژیان و ڕەویە و ڕەفتاری صەحابەکانیشیان لەبەردەست نەبووە، ئاگاداریشیان نەبوون تا بەهۆی ئەوانەوە بزانن کە ڕەفتاری صەحابەکان لەگەڵ ئەو چیرۆك خوان و زۆر بلێیانە یەکناگرنەوە، بۆیە ناوی زانایانیان بەسەر خۆیاندا دابڕی، ئەو نازناوەش نەوەی داهاتوو لە پێشووەکانی وەرگرت، عیلمی ئاخیرەت پێچرایەوە، زاناو کەسە تایبەتەکان نەبێت ئەوانی تر نەیاندەزانی جیاوازی میانی زانست و کەلام چیە، حاڵیان وای لێ هات:

ئەگەر بیان وتایە فلان زاناترە یان فلان؟

دەیانووت فلان کەسیان زانستی زیاترەو، فلانیشیان کەلامی زیاترە، تەنها زانا تایبەتەکان دەیانتوانی جیاوازی بخەنە میانی زانا دیارەکانەوە، لەگەڵ ئەوانەدا کە توانای قسەکردن و ڕەوانبێژییان هەیە، بەم شێوەیە بۆ چەند سەدەیەکی پێشوو دین لاواز بوو.

ئیتر دەبێ چۆن گومان ببەیت بەو زەمانەی کە تۆی تیا دەژیت(واتا سەدەی پێنجەمی کۆچی) ئەگەر کەسێك نارەزایی و ئینکاری لە حاڵێ ئەوانە دەرببڕێت یەکسەر تۆمەتی شێتی دەبارێنن بەسەردا؟!

کەواتە چاکتر وایە هەریەکە بەخۆیەوە مەشغوڵ ببێت و بێ دەنگی لێ بکات.

## یەکێکی تر لە نیشانەی زانایانی ئاخیرەت

# خۆپارێزی لە کاری داهێنراو

دەبێت زۆر بەتوندی خۆی بپارێزێت لەو کارە داهێنراوانەی کە تازە پەیدابوون، باخەڵکەکەش بەگشتی هاوڕابن لەگەڵیدا، نابێت ئەوە فریوی بدات کە خەڵکەکەش دوای چەرخی صەحابە شتێکی داهێنراویان پەیداکرد بێت و هەموویشیان هاوڕابووبن لەسەری، بەڵکو دەبێت زۆر سوور بێت لە بەدواداگەڕانی ژیانی صەحابەو حاڵ و ژیان و کردارەکانیان، بزانێت زیاتر ئەوان خەمیان لەچی هەڵدەگرت، گرنگییان بەچی دەدا، ئایا ئەوان گرنگیان بە دەرس وتنەوە و کتێب دانان و ڕووبەڕوبونەوەو دەمەدەمێ و قەزاوەت و سەرپەرشتی کاروباری ویلایەت و کاروباری ئەوقاف و ڕاپەڕاندنی وەصێتی خەڵك و سەرپەرشتی ماڵی هەتیوان و تێکەڵیی دەستەڵاتداران و ڕوپامایی لەهەڵس وکەوت و موجامەلەکردنیاندەدا، ئایا بەمانەوە سەرقاڵ دەبوون، یان بە بیرو فکرو خۆف و حوزن و ترسان لە خوداو موجاهەدەی نەفس و موراقەبە و چاودێری زاهیر و باطینی خۆیان، وە خۆپاراستن لە گوناهەگەورە و وردو بچوکەکان، کە سووربن لەشارەزابوون و، هەستیاربون بەرامبەر ئارەزوات و حەزە شاراوەکانی نەفس و گەید و فێڵی شەیتان، لەگەڵ سەرگەرمی زیاتریان بە پاشماوەی زانستە شاراوەو باطینەکانەوە!

وە بەدڵنیایەوە بزانە:

کە بەڕاستی ناودارترین زانا لە ئەهلی ئەم زەمانە و، نزیکترینیان لە حەقیقەت و ڕاستییەوە، ئەوانەن کە زیاتر شارەزان بەڕێبازی پێشینەکان و، کرداریان وەك صەحابەکان وایە، چونکە هەر لەوانەوە ئاین وەرگیراوە، بۆیە ئیمای عەلی(خودای لێ رازی بێت) فەرموویەتی: "باشترینمان ئەو کەسەیە کە

باشترو چاکتر شوێنی ئەم دینە کەوتووە" لەوەڵامی کەسێکدا کە پێی ووت: "تۆ پێچەوانەی فلان کەس جوڵاویتەوە".[1]

نابێت خەفەت لەوە بخوات کە ڕاوبۆچون و کارەکەی پێچەوانەی هاوچەرخییەکانی خۆیەتی، مادام هاوڕاو گونجاو بێت لەگەڵ چەرخی پیرۆزی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چونکە ئەو خەڵکە بە پێی مەیل و حەزی سروشتی خۆیان ڕایەکیان دەربڕیوە (نەك بە پێی شوێن کەوتن لە حەق و ڕاستی) وە نەفسیشیان ڕێگەی پێ نەداون کە دان بەوەدا بنێن، ئەو کارو هەڵوێستەیان هۆکارە بۆ بێ بەش بوونیان لە بەهەشت، وایشیان ڕاگەیاندووە کە هیچ ڕێگایەك نییە بیانگەیەنێت بە بەهەشت جگە لە ڕاکەی ئەوان کە لەسەرینی، هەر لەبەر ئەمەیە کە حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

دوو شتی نوێ لە ئیسلامدا پەیدابوون: یەکێك خاوەنی ڕایەکی خراپ و نادروستە، وایش دەزانێت کە بەهەشت بۆ ئەو کەسەیە کە هاوڕابێت لەگەڵ ئەودا، وە کەسێکیش زۆر بەزیادەڕەویی لەناو نیعمەتەکاندا بژی و، بەندایەتی بۆ دونیا بکات و(هەموو کات و خەمەکانی بۆ تەرخات بکات) بۆ لەدەست دانی دونیا تورە ببێت و، بۆ وەدەست هێنانی دونیا ڕازی بێت و هەوڵیشی هەر بۆ دونیا بێت، وازلەم دوو کەسە بهێنن ئاگری دۆزەخ چاوەنواریان دەکات.

بەڕاستی پیاوێك ڕۆژی لێ بوویەوە لە میانی دووکەسدا؛ کەسێکی ڕۆچوو لە ناو خۆشی دونیادا کە هەمیشە نەفسی بۆلای دونیا بانگی دەکات.

وەکەسێکی هەوا پەرستی خۆ پەسەند کە خۆی بۆ لای هەواو ئارەزوات ڕای دەکێشێت، خودای گەورەش ئەو پیاوەی لەو دووکەسە پاراستبێت، کەدڵی بەلای سەلەفی صاڵیح و پێشینە باشەکاندا بڕوات، پرسیار لە کاروکردەوەکانیان

---

(١) رواه البزار كما في (( البحر الزاخر)) ٨٧٧.

بکات، بەدوای ئاسار و ڕەفتاریاندا بگەڕێت، بەڕاستی ئەو پیاوە ڕووبەڕوی پاداشتێکی زۆر گەورە دەبێتەوە، دەی ئێوەش وەك ئەو پیاوە وابن.[1]

لە عەبدوڵلای کوری مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە بەهەردوو شێوەی ڕیوایەتی (مەوقوف) کە ڕاوەستاوە لەسەرخۆی، وەبەشێوەی سەنەدو دانە پاڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە فەرموویەتی:

**((إنَّمَا هُمَا اثنَتانِ: الكَلامُ والهُدَى، فأحسَنُ الكَلامُ كَلامُ اللهِ تَعالى وأحسَنُ الهَديِ هَدْيُ رسولِ اللهِ تَعالى (ﷺ ) ألاَ وإيَّاكُم ومُحدَثاتُ الأُمورِ، فإنَّ شرَّ الأمُورِ مُحدَثاتُها، وأنَّ كُلَّ مُحدَثَةٍ بِدعَة، وإنَّ كُلَّ بِدعَةٍ ضَلالَة ألاَ لايَطُولنَّ عَليكُمُ الأمدُ فَتَقْسُوَ قُلُوبَكُم، ألاَ كُلَ ما هُوَ آتٍ قَريب، ألاَ إنَّ البَعيدَ ما لَيْسَ بآتٍ))**[2] واتە: بەڕاستی ئەوەی کە بەکەڵك دێت قسەکردنە لەسەر

---

(١) قوت القلوب ١٦٠/١

(٢) رواه ابن ماجه (٤٦) . في المقدمة باب أجتناب البدع و الجدل قال الزبيدي ٤٧٣/١ قال العراقي في التخريج الكبير إسناد حبه، وزاد الطبراني في الكبير ٩٧/٩ (٨٥٢١) بعد قوله(( **و كل بدعةٍ ضلالةٌ وكلُ ضلالةٍ في النار))**. هـ والحديث طويل، و أخرجه اللالكائي في السنة(٧٧/١)(٨٤) وأخرجه أبو نعيم في ((الحلية)) ١٣٨/١ قال عبدالله بن مسعود: **إن إصدق الحديث كتاب الله تعالى، وأوثق العُرى كلمة التقوى، و خير الملل ملة إبراهيم، و أحسن السُنَن سنةُ محمد(ﷺ) و خيرُ الهدي هدي الأنبياء، وأشرف الحديث ذكر الله. و خير القصص القرآن، و خير الأمور عواقبها، و شر الأمور محدثاتها** .... الحديث بطوله، قال العراقي: وفي الباب عن جابر ابن عبدالله رواه المسلم، كتاب الجمعة، باب تخفيض الصلاة والخطيب(٧٦٧) و ابن ماجه في المقدمة، باب اجتناب البدع و الجدل(٤٥)، **قال كان رسول الله (ﷺ) إذا خطبَ احمرَّت عَيناه. الحديث و فيه يقول: ((أما بعد: فإنَّ خيرَ الحديث كتاب الله، و خير الهدي هديُ محمد، وشرُّ الأمور محدثاتها و كل بدعة ضلالة))** قلت و أخرج أبوداود كتاب السنة، باب في لزرم السنة(٤٦٠٧) و الترمذي، كتاب العلم، باب ماجاء في الأخذ بالسنة و أجتناب البدع(٢٦٧٦) من حديث العرباض بن سارعة(رضى الله

سیرەت و ڕەفتاریان، وەشوێن کەوتنی ڕێنمایی و ڕێبازیان. جوانترین وشەو ڕستەیش کەلامی خودای گەورەیە، باشترین ڕێرەوو ڕێبازیش ڕێنوێنیەکانی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، بێدار و وریابن! خۆتان لەو فەرمانانە بپارێزن کەتازە پەیدابوون و داهێنراون، چونکە بەڕاستی خراپترینی کارە پەیدابووە تازەکانە، وە هەموو داهێنراوێکی تازە پەیدابوو بەبیدعە دەناسرێت، وەهەموو بیدعە و داهێنراوێکیش سەری لە گومڕاییەوە دەردەچێت، ئەوەندە طولی ئەمەلتان نەبێت و هیوادرێژ مەبن و دوور مەڕوانن بۆ ئەم ژیانە کە دڵەکانتان ڕەق ببێت، بێداربن هەموو شتێك کە لە ڕیدابێت بگات هەر دەگات، بزانن ئەو شتە دوورە کە لەڕێگەی هاتن دا نەبێت. وەلە وتارێکدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

**((طُوبَى لِمَن شَغَلَهُ عَيبُهُ عَن عُيُوبِ النّاس، وأنفَق مِن مَالٍ اكتَسَبَهُ مِن غَيرِ مَعصِيَة وَخَالَطَ أهْلَ الفِقْهِ والحِكمَةِ وَجانَبَ أهْلَ الزَّلَلِ والمَعْصِيَة، طُوبَى لِمَنْ ذَلَّ فِي نَفْسِه وحَسُنَتْ خَليقَتُه، وصَلُحَت سَرِيرَتُهُ وعَزَلَ عَن النَّاسِ شَرَّهُ، طُوبَى لِمَن عَمِلَ بعِلمِهِ وأنفَقَ الفَضْلَ مِنْ مالِهِ وأمسَكَ الفَضْلَ مِنْ قَولِهِ ووَسِعَتهُ السُّنَّة، ولَم يَعْدُها إلى بِدْعَةٍ))**[1] واتە: خۆزگە بەوکەسەی عەیب و کەم و کوڕیەکانی خۆی ئەوەندە سەرقاڵی دەکات، نایپەرژێتە سەر

---

عنه): **صلى بنا رسول الله(ﷺ) ذات يوم، ثم أقبل علينا بوجهه، فواعظنا موعظة بليغة، ذرفت منها العيون، ووجلت منها القلوب،** فساقو الحديث، وفيه(( **وإياكم و محدثات الأمور فإن كل محدثةٍ بدعَة، وكل بدعة ضلالة]** [ قال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٢٩٠/٦ لا نعرف المرفوع وروى الطبراني الموقوف].

(١) أخرجه أبونعيم في(الحلية ٢٠٣/٣) من حديث الحسن بن علي بسند ضعيف. و البزاز في مسنده، ٣٤٨/١٢[٦٢٣٨] من حديث أنس أول الحديث و أخره. والطبراني في المعجم الكبير(٧١/٥)(٤٦١٦) والبيهقي في(الشعب)(٢٢٥/٣)(٣٣٨٨) من حديث ركب المصرى و سط الحديث و كلها ضعيفه.[ قال الزبيدي: ٤٣٨/١ حديث ركب: أخرجه أيضا البخاري في(التأريخ) (٣٣٨/٣).

باسکردنی خەڵکی، وە لە کەسابەتی دەستی خۆی بۆ ماڵ و منداڵی سەرف دەکات، مەسرەفیشیان دەکێشێت بەبێ گوناهو تاوانکاری، خۆش بەختی بۆ ئەوەی تێکەڵی لە گەڵ ئەهلی(فیقه) و پەندیاری‌دا دەکات و، هاوڕازو ڕێبازی ئەوانە، وە واز لە ڕێو ڕچەی ئەهلی هەڵەو تاوانکاری دەهێنێت، خۆزگە بەو کەسەی کە خاوەنی نەفسێکی زەلیل و بێ فیزو دەمارەو، سروشت و ڕەوشێکی جوانی هەیە و، شیمە و خووە شاراوەکانی گونجاوو شیاون، خەڵکی لاداوە لە شەڕو خراپەی خۆی، خۆش بەختی بۆ ئەو کەسەی کە کار بە زانستەکەی خۆی دەکات و، ماڵی زیادەی هەبێت لە خێر و چاکەدا سەرفی دەکات و، خۆیشی دەگرێتەوە لە زۆر بڵێ‌بی و زیادە ڕەوی لە قسەکردندا، وە سوننەت و ڕەفتاری پێغەمبەر(ﷺ) بەشی هەموو ژیانی دەکات، کە ئیتر لێی نەترازێت و بەرەو لای کاری بیدعەو خراپ نەڕوات.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ڕەزای خودای لێ بێت) دەیفەرموو:

(**حُسْنُ الهَدي في آخِرِ الزَّمان خيرٌ مِن كَثيرٍ منَ العَمَلِ**)[1]

واتە:( لە کۆتای زەماندا خوڕەوشت و ڕێنوێنی جوان باشترە لە زۆر لەو کارانەی کە دەکرێن، وە دەفەرمووێت: ئێوە لە چەرخێکدان، چاکترینتان ئەوانەن فەرمانی زۆر و چاك ئەنجام دەدەن، وە ڕۆژگارێك دێتە پێشەوە لە دوای ئێوە، باشترینیان ئەوانەن کە خۆیان ڕادەگرن و لەسەر کردەوەکان ڕادەوەستن و، لەبەر زۆری ئەو شوبهانەی کە دێنە ئاراوە، تەنها ڕادەوەستن تا تووشی شـوبهەی حـەرام و نەخـوازراو نەبن.[2]

---

(١) أخرجه البخاري في ((الأدب المفرد)) ٤٨٩ بنحوه.

(٢) قال الزبيدي: ٤٣٨/١: هكذا أورده صاحب القوت ٢٧٦/١، و أخرج اللكلائى في السنة ٥٥/١(١٤) عنه أنه قال: **الإقتصاد في السنة خيرٌ من الإجتهاد في البدعة.**

بەڕاستی چاك و جوانی فەرمووە: هەركەسێك لەم زەمانەدا خۆڕاگر و دامەزراو نەبێت، لە هەموو كارێكدا شوێن ئاپۆری جەماوەربكەوێت و لەسەر ڕای ئەوان بجوڵێتەوە، وە ڕۆچووبێت لەو كارانەداكە ئەوان تیایدا بن و لە ناوی دا ڕۆچووبن ئەوە بەهیلاكدا چووە، وەك چۆن ئەوان تیاچوون.

حوزەیفەی یەمانی فەرموویەتی:

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە لەم چەرخەدا:

ئەوەی لای ئێوە ئەمڕۆ بەچاكە دەژمێررێت، لەزەمانێكی ڕابردوودا بەخراپ لەقەڵەم دەدرا، ئەوەش ئەمڕۆ ئێوە بە خراپی دەزانن و ناپەسەندە لاتان، لە زەمانێكی داهاتودا بەلایانەوە باش و پەسەندە، ئێوە بەردەوام حاڵتان باشە و لە خێردان، مادام حەق و ڕاستییەكان بزانن، وە زاناكانتان بەسووكی و بێ نرخی سەیریان نەكرێت[1]

ڕاستی فەرمووە: زۆربەی ئەو قسەو كردارانەی ئەمڕۆ لەم چەرخەدا بوونەتە باوو ئاسایین، لە چەرخی صەحابەدا(خودایان لێ ڕازی بێت) ناپەسەند و نەشیاوبوون. لەو كارانەی لەم زەمانەداخەڵكی فریویان پێ خواردووە، جوان كردن و ڕازاندنەوەی مزگەوتەكانە و ،خەرج كردنی ماڵ و سامانێكی زۆرە لە وردەكاری و بیناسازیدا، وە ڕاخستنی فەرش و ڕایەخی بەرزو گرانبەهایە، كە لە كاتی خۆیدا تەنانەت ڕاخستنی حەسیریش لە ناو مزگەوتدا بە بیدعەی ناپەسەند دادەنرا، وەك دەڵێن: لە داهێنراوەكانی حەججای سەقەفی‌یە[2]

---

(١) قوت القلوب(١٦١/١) وقد ((رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق)) ٩١/٤ عن عدي بن حاتم(رضي الله عنه).

(٢) قوت القلوب(١٧١/١). دەگێڕنەوە كە قەتادە(خوای لێ ڕازی بێت) لە مزگەوتدا نوێژی دەكرد پارچەیە لە حەسیرەكە لە كاتی سەجدەدا چو بە چاویدا، ئەویش

بەڕاستی نوێژ خوێنەکانی جیلی یەکەم کەم وا ڕێدەکەوت شتێکیان بخستایە میانی تەوێڵیان و زەوییەکەی کە سوجدەیان لە سەر دەبرد.[١]

هەروەها ئەمڕۆو لەم چەرخەدا، لە دیارترین زانستەکانی ئەوەیە:

کە خۆیان سەرقاڵ بکەن بە فێربوونی موجادەلەو دەمەقاڵێ و ڕوبەڕوبونەوەو هاووێنەکانیان، وە بەچاکترین و نزیکترین زانستی دادەنێن، کە مرۆڤ لە خودا نزیك بخاتەوە، کە لە کاتی خۆیدا لە کارە نەشیاوو ناپەسەندەکان دەژمێررا. لەوکارانە زیادەڕەوی‌یە لە دەنگ و ئاوازی تایبەتی لە خوێندنی قورئان و بانگداندا.[٢]

هەروەها لە کارە نەخوازراوەکانە: زیادەڕەوی و لە سنوور تێپەڕاندن لە گرنگیدان بە پاك و خاوێنی و، پەیداکردنی وەسوەسە لەسەر خۆ پاك کردنەوەو تارەت و دەست نوێژگرتندا، یان لە خاوێنی بەرگ و پۆشاکدا، بەهەموو

---

نابینا بوو، قسەی بە حەججاج ووت، کە ئەو ئەم بیدعەی حەسیر ڕاخستەنەی دانا لە مزگەوتەکاندا، ئەگینا لە پێشتر خەڵکەکە تەنها لە سەر گڵ و زەوی نوێژیان دەکرد.

(١) بەڵکو حەزیان دەکرد تەنها لە سەر زەوی بخەون بۆ زیادە تەوازوع و گەردن کەچی "إتحاف١/٤٣٩.

(٢) ئاوای لێ دێت لە واتای تیلاوەت و خوێندنەوەکە حاڵی نەبێت کە سنوری ئیعراب و چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئان ببەزێنێت:

بەشێوەیەك کە بۆ ڕێکخستن و تەواو کردنی ئاواز و لەحنی خوێندنەکەیان، پیتە کورتەکان درێژدەکەنەوە و ،درێژەکانیش کورت دەکەن و ، گۆڕانکاری بەسەر هەموو بنەماکانی زانستی تەجویدا دەهێنن، لە دەغم و ئیظهار و ئیقلاب، تەنها بۆ ڕێکخستنی دەنگ و ئاوازەکەیان. هەروەها زیادەڕەوی و سەپاندنی ئاوازی ناجۆر بەسەر بانگ دانیشدا، هەر بەو شێوەیە کە باسمان کرد. بنوارە إتحاف ١/٤٤٠.

شێوەیەك خۆی دەپارێزێت و حیساب بۆ هەموو هۆكارێكی دووریش دەكات، بەڵام ئاسانكاری دەكات لە حەڵاڵ كردن و حەرام كردنی خۆراك و بژێوییەكاندا، وە هاوێنەكانی ئەمانە.[1]

بەڕاستی عەبدوڵلای كوڕی مەسعودیش ڕاستی فەرموو كە دەڵێت:

ئێوە ئەمڕۆ لە زەمانێكدان هەواو ئارەزواتتان شوێن زانست و زانیاریەكان دەكەون، وە زەمانێك دێت بەسەرتاندا، كە زانستەكان شوێن هەواو ئارەزواتی خاوەنەكانیان دەكەون.[2]

ئەحمەدی كوڕی حەنبەل(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیفەرموو:

وازیان لە زانست هێناوەو، ڕویان كردۆتە فەرمان و وتە غەریب و نامۆكان، كە كەمتر( فیقە) و تێگەیشتنیان لە ناودایە، هەر لە خودایش داوای یارمەتی دەكەین[3]

مالیكی كوڕی ئەنەس( ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی:

كاتی خۆی ئەو خەڵكە ئەو هەموو پرسیارانەیان لە بارەی هەموو فەرمانەكانەوە نەدەكرد، وەك خەڵكی ئەم سەردەمە كە دەیكەن، زاناكانیش یەكسەر باسی حەڵاڵ و حەرامیان نەدەكرد، كە ئەوە حەڵاڵە یان حەرامە، بەڵكو من پێیان دەگەیشتم كە دەیانووت: ئەوە مەكروهە یان پەسەندو شیاوە[4]

واتای ئەم فەرموودە ئەوەیە: كە ئەوان لە وردەكارییەكانی كارە ناپەسەندو نەشیاوەكان، یان كارە پەسەندەكان دەكۆڵینەوە، چونكە كارە حەرامەكان ئاشكرا بوون( پرسیارو وەڵامی نەدەویست).

---

(١) قوت القلوب ١٦٣/١ و الإتحاف ٤٤٠/١.

(٢) قوت القلوب ١٦٧/١.

(٣) رواه الخطيب في ((الكفاية)) (٣٩٨٨).

(٤) قوت القلوب ١٦٧/١.

هیشامی کوڕی عوروە دەیفەرموو: ئەمڕۆ پرسیاریان لێ مەکەن لەو بارەوە کە دایان هێناوە، چونکە وەڵامیشیان بۆ ئامادەکردووە، بەڵکو لە بارەی سوننەتەوە پرسیاریان لێ بکەن چونکە ئەوان لەو بارەیەوە نەشارەزان و نایزانن.[1]

ئەبو سولەیمانی دارانیش (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیفەرموو:[2]

ئەو کەسەی خودا شتێك و فەرمانێکی خێر دەخاتە ناو دڵیەوە، نابێت هەروا سەربەخۆ کاری پێ بکات، تا لە ئاسارو پاشماوەی ژیانی پێشینەکان و فەرموودەکانیان بەڵگەیەکی بۆ نەبینێتەوە، ئەگەر قسەیەکی لەوانەوە بیست، ئەوا سوپاسی خودای لەسەر بکات، کە گونجاوە لەگەڵ ئەو ئیلهامەدا کە خودا خستویەتە ناو دڵیەوە.

بۆیە ئەمەی فەرمووە؛ چونکە ئەو ڕا جوان و ڕازاوانەی کە دراوە بە گوێیاندا و لکاوە و چەسپاوە بە دڵەکانیاندا، لەوانەیە ئەو صەفاو پاڵفتەیی دڵەیان لێ تێك بدات و لێیان بشێوێنێت، کەشتی نارەواو نادروست بە ڕەوا بخەنە بەرچاوی، بۆیە چاکتر وایە بۆ ئەو جۆرە ئیلهامە ئیحتیاطی بۆ بکات و ئاسارێکی پێشینەکانی لەسەر بدۆزێتەوە.

هەر لەبەر ئەمە بوو کاتێك مەروانی کوڕی حەکەم میمبەر(دوانگە)ی داهێنا، کە وتاری جەژنی لەسەر بدرێت، لە ڕۆژانی جەژندا، ئەبو سەعیدی خودری( خودای لێ ڕازی بێت) هەڵسایەوە بۆ لای و فەرمووی:

ئەی مەروان ئەم داهێنراوە چی‌یە؟

ووتی: ئەوە کارێکی بیدعە نی‌یە، ئەوە چاکترە لەوەی کە تۆ دەیزانیت، بەڕاستی خەڵکەکە زۆر بوون، دەمەوێت دەنگەکان بیانگاتێ، ئەبو سەعیدیش

---

(١) قوت القلوب ١٦٧/١.

(٢) رواه عن ابن أبي حاتم في( تفسيره)(١٧٤٥١) وهو في القوت ١٦٧/١.

فەرمووی وەڵلاهی شتێك نا هێنن باشتر بێت لەوەی من دەیزانم، وە سوێندبێ بە خودا ئەمڕۆ نوێژت لە دوو ناکەم.[1]

بۆیە ئەبو سەعید لە کارەکەی ناڕازی بوو، چونکه پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی لە وتاری جەژن و باران بارێندا خۆی ئەدا بەسەر کەوانێکدا یان دارو گۆپاڵێك دا، نەك بچێتە سەر مینبەر.[2] وە لە فەرموودەی مەشهور و بەناوبانگدا هاتووە:

((مَن أحْدَثَ في دِينِنا ما ليسَ مِنهُ فَهُو رَدٌّ))[3]

واتە: (ئەوەی لە ناو دین و ئاینەکەماندا داهێنراوێکی نوێ بکات، کە لە ناو ئاینەکەدا جێگای نەبێتەوەو پێچەوانەی فەرمانەکانی دین بێت، ئەوە دەدرێتەوە بەسەریدا و لێی وەرناگیرێت).

---

(١) قوت القلوب ١٦٨/١.

(٢) رواه الطبراني في الكبير ١١٦٩/٢٤/٢ و من حديث البراء و نحوه في يوم الأضحى ليس فيه الأستسقاء، وهو ضعيف، ورواه في الصغير [٢٨٣/٢(١١٧٤)] من حديث سعد القرظي: **((كان إذا خطب العيدين، خطب على قوس، و إذا خطب في الجمعة خطب على عصا))** وهو عند ابن ماجن[ كتاب إقامة الصلاة و السنة فيها، باب ماجاء في الخطبة يوم الجمعة،(١١٠٧) بلفظ: **((كان إذا خطب فى الحرب خطب على قوس ...))** الحديث [قال الزبيدي: ٤٤٢/١، قال العراقي في التخريج الكبير: رواى أبو داود كتاب الصلاة باب الرجل يخطب على قوس(١٠٦٩)، من رواية شعيب زريب الطائفي قال: **جلست إلى رجل له صحبة يقال له: الحاكم بن حزن الكلبي فأنشأ يحدثنا ، فذكر حديثا فيه، فأقمنا بها أيَّاماً شهدنا فيها الجمعة مع النبي ﷺ فقام يتوكؤ على عصا أو قوس فحمدالله و أثنا عليه.** و قلت: و بمثل رواية الحاكم و أبى داود أخرجه البيهقي في السنن (٥٥٤١/٢٠٦/٣)، و قال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٢٩٠/٦ لم أجد له إسنادا. و أصل الإتكاء فى الخطب عند أبى داوود(١٠٩٦)، و ابن ماجة(١١٠٧).

(٣) متفق عليه: رواه البخاري(٢٦٧٩) و مسلم (١٧١٨) من حديث عائشة بلفظ( **في أمرنا**) و عند أبي داود( كتاب السنة) باب لزوم السنة( ٤٦٠٦): (فيه).

لە هەواڵێکی تردا هاتووە:

**((من غَشَّ أمَّتي.. فعَليهِ لعنةُ اللهِ والملائكةِ والنَّاس أجمَعين، قيلَ: يا رسول الله ﷺ وما غَشُّ أمَّتِكَ؟ قال ﷺ: أن يَبتَدِعَ بِدْعَةً يَحمِلُ النَّاسَ عَليْها))**[1] واتە: ( ئەوەی فێڵ و غەش لە ئوومەتەکەم بکات، ئەوا بەرنەفرەت و لە عنەتی خوداو فریشتەکان و تێکڕای خەڵکی دەکەوێت و بەربی دەبێت لە ڕەحمەتی خودا، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، غەشکردن لە ئومەتی پێغەمبەرﷺ کامەیە؟ فەرمووی:

کار و بیدعەیەك داىهێنێت و هانی خەڵکێش بدات کەبە ناچاری شوێن بیدعەکەی بکەون. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((إنَّ للهِ عزَّوجَل مَلكاً، يُنادي كُلَّ يَومٍ: مَن خالَفَ سُنةَ رسُولَ الله ﷺ ... لَم تَنلْهُ شَفاعَتُه))**[2]

واتە: (خودای گەورە فریشتەیەکی تایبەتی هەیە هەموو ڕۆژێك هاوار دەکات: ئەوەی پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوداﷺ بجوڵێتەوە، شەفاعەتی ئەوی بەرناکەوێت و نایگرێتەوە). نمونەی ئەو کەسەی کە دەست درێژی دەکاتە سەر دینی ئیسلام و بیدعەیەکی پێچەوانەی سوننەتی بەسەردا دەسەپێنێت، بە نیسبەت ئەو کەسەوە کە گوناهێک دەکات، وەك نمونەی ئەو

---

(١) أخرجه الدار قطني في ( الإفراد) كما في جامع الأحاديث للسيوطي.(٢٨٧/٧(٢٢٤٩٨)، و كشف الخفاء للعجلوني (٣٤٩/٢(٢٥٤٧)) من حديث أنس بسند ضعيف جدا.

[ قال الزبيدي: ٤٤٣/١: هكذا أورده صاحب القوت ٢٩٥/١ و قال الدار قطني: غريب من حديث محمد بن المنكدر، عن أنس ، تفرد به ان المنكدر].

(٢) ذكره صاحب ((القوت)) ١٧٤/١، قال الزبيدي أورده صاحب القوت، انظر الإتحاف ٤٤٤/١.ووجدت بخط بعض المحدثين مانصه: رواه الخطيب في أثناء حديث بسند فيه مجهول، وقال الذهبي هو خبر كاذب.

کەسەوایە کە یاخی بووبێت لە پادشای وڵات لە پایتەختی موڵکەکەیدا، ئەم کەسەی یاخی بووە، بەراوردی بکەیت لەگەڵ کەسێکدا لە جۆرە خزمەتێکی دیاریکراودا پێچەوانەی فەرمانێکی کردبێت، ئەمەی دووهەمیان زۆر نزیکە لێی خۆش بن، بەڵام ئەوەی یەکەم کە لە ناو دڵی دەوڵەتەکەدا یاخی بوون بەرپابکات هەرگیز لێ خۆش بوونی بۆنییە.

**هەندێك لە زانایان فەرموویانە:** ئەوەی سەلەف و پێشینەی صاڵحین قسەیان تێدا کردووە، وشکی و نەشیاوو بێ وەفاییەکە بێ دەنگییان لێ بکەیت و باسیان نەکەیت، ئەوەش کە ئەوان لێی بێ دەنگ بوون، قسە لەسەر کردنی زیادە و بەسەرخۆدا هێنانە.[1]

زانایەکی تر فەرموویەتی:

حەق و ڕاستی قورسە، ئەوەی بەسەریدا دەرباز ببێت زوڵم و ستەمی کردووە، ئەوەش کە متەرخەمی لەبارەیەوە بکات ئەو مافەی لەسەریەتی نەیتوانیوە بە ئەنجامی بگەیێنێت، بەڵام ئەوەی لەگەڵ حەقدابوو، لە هەر لایەکەوە بوو بەو لایەدا بڕوات، ئەوە ئەرکی خۆیی بەجێ گەیاندووە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

**((عَليكُم بالنَّمطِ الأوسَط الَّذي يَرجِعُ إليهِ العَالي ويَرتَفِعُ إليهِ التَّالي))**[2]

---

(١) قوت القلوب ١/١٧٥.

(٢) أخرجه أبو عبيد في غريب الحديث ٢/١٥٦موقوفا على علي ابن أبي طالب ولم أجده مرفوعا. ورواه ابن أبي شيبة موقوفا على علي رضي الله عنه، في المصنف(٣٥٦٣٩)
قال الزبيدي:[ ١/٤٤٤، قال العراقي في التخريج الكبير: رجاله ثقات إلا أن فيه إنقطاع، اه. قلت والمصنف أخذه من القوت ١/٢٩٦، أورده الجوهري فى الصحاح مادة نمط فقال: وفي الحديث، فساقه كسياق أبى عبيد، وقد جاء في حديث مرفوع(( **خير الناس هذا النمط الأوسط**)) و قد ذكره فى شرح القاموس مادة( نمط) و أخرج أبو نعيم فى الحلية ٤/٤٥، عن

لەسەرتانە هەمیشە ڕێبازو ڕێڕەوێکی میانەڕەو بگرنەبەر، کە لای بەرزو سەروو دەگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، وە لا خواروەکەیش بەرزدەکاتەوە بۆ لای خۆی. ( واتە: میانڕەو بن و ئیفراط و تەفریطتان نەبێت، نە زیادەڕەوی بکەن و نە کەمتەرخەمی).

عەبدوڵلای کوڕی عەباسیش( خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ڕێگەی گومڕاهی جۆرە شیرنیەکی تێدایە لە دڵی ئەهل و خاوەنەکانیاندا.

خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ **وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا** ﴾الأنعام(٧٠).

(دەبێت وازلەوانە بهێنیت کە دینیان کردووە بە گەمەو گاڵتە).

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا**﴾فاطر(٨). واتە: (ئاخۆ کەسێك کە خراپەی بۆ جوان کراوەو بۆ خۆی پەسەندکردووە، وەکو کەسێك وایە کە بەم شێوە نەبێت).

هەرچی داهێنراوێکی تازە لە دوای چەرخی ئەصحاب( خودایان لێ ڕازی بێت) کە لە سنوور و ئەندازەی پێویستی و زەرورەت دەربچێت، ئەوە بەگەمەو گاڵتە دەژمێررێت و هەڕەشەی خودایش دەیانگرێتەوە.

دەگێڕنەوە شەیتان( لە عنەتی خودای لێ بێت) کە سەربازو یارمەتی دەرەکانی لە سەردەمی چەرخی ئەصحابدا بڵاوکردەوە بە ناویاندا، بۆ سەرلێ تێکدانیان، گەڕانەوە بێ ئەوەی توانیبێتیان لێیان نزیك ببنەوە، ووتی:

چیتان بەسەر هات؟

---

وهب قال: **إن لكل شئ طرفين ووسطا، فأذا أمسكت بأحد الطرفين مال الأخرُ و إذا أمسكت بالوسط إعتدل الطرفين. ثم قال: عليكم بالأوسط من الأشياء .]** [وقال ابن السبكي في طبقات الشافعية ٢٩١/٦: رواه أبو عبيد في الغريب موقوفا على علي ].

ووتیان: کەسمان وەك ئەم کۆمەڵەیە نەدیووە، زۆر ماندوویان کردین نەمانتوانی کەسیان فریوبدەین، ووتی:

ئێوە ناتوانن زاڵ ببن بەسەریاندا، ئەوانە پێغەمبەرەکەی خۆیانیان دیوەو هاوچەرخی بوون و ئاگایان لە دابەزینی وەحی و نیگای خودا بووە، بەڵام دوای ئەوان کۆمەڵێکی تر دێن بەدوایاندا دەتوانن لە ناویاندابگەن بە مەرامی خۆتان، کاتێك چەرخی تابیعین هاتە پێشەوە، دووبارە سەربازەکانی بڵاوکردەوە بەناویاندا.

ئەمجارەش سەربازەکانی ئیبلیس بەسەرشۆڕی و چاوشۆڕی گەڕانەوە، ووتیان: بەڕاستی کەسمان نەدیوە لەمانە سەرسوڕهێنەرتربن، وردە وردەو کەمەکەمە دەگەین بە هەندێك مەرامی خۆمان لە ناویاندا و، هەوڵی فریودانیان دەدەین، هەندێك گوناە دەکەن بەڵام کە ئێوارە داهات دەست دەکەن بە داوای لێ بوردن لە خوداو ( أستَغفِرُ الله) دەکەن، خودا گوناە و تاوانەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، شەیتان ووتی:

ئێوە ناتوانن هیچ دەستکەوتێکتان لە مانیش هەبێت و فریویان بدەن، چونکە ئەمانە خوداپەرستی و یەکتاپەرستییان ڕاست و ڕاستگۆیانەیە، بەچاکی شوێن پێغەمبەرەکەیان کەووتون، بەڵام دوای ئەمان هۆز و تاقمێکی تر دێن بەدوایاندا، کە چاوتان پێیان گەشاوە دەبێت، بە ئارەزووی خۆتان یاریان پێ دەکەن، دەست بە ڕەشۆی هەواو ئارەزوەکانیانەوە دەگرن و، بۆ هەرکوێ ئارەزوتان لێ بێت ڕایان دەکێشن و پێش خۆتانیان دەدەن، ئەگەر داوای لێ خۆشبونیش لە خودا بکەن، خودا لێیان خۆش نابێت، تەوبەی ڕاستەقینەش ناکەن تا خودا خراپەکانیان بۆ بگۆڕێت بە چاکە.

دەڵێت: لە پاش سەدەی یەکەمی کۆچی: شەیتان هەواو ئارەزواتی لە ناویاندا بڵاوکردەوە، بیدعەو کاری داهێنراوی خراپی لا جوان کردن، ئەوانیش

هەموویان بۆ خۆیان حەڵاڵ کرد، داهێنراوەکانیان کرد بە بەشێك لە دین بۆ خۆیان، داوای لێ خۆشبونیش ناکەن لە خودا لەو کارانەی کردویانەو تەوبەش ناکەن لەسەری، دوژمنانیان زاڵ دەبن بەسەریاندا و، بۆ هەرکوێ ئارەزویان لێ بێت پێش خۆیانیان دەخەن.[1]

**ئەگەر بڵێیت:** خاوەنی ئەم قسەیە لە کوێ زانی کە شەیتان بەم شێوە دواوە و قسەی کردووە کە شەیتانیشی نەدیوە و قسەیشی لەگەڵدا نەکردوە؟

بزانە بۆ وەڵامی ئەم گومان و پرسیارە:

خاوەنی دڵە زیندوەکان خودای گەورە ئەسرارو نهێنەکانی جیهانی غەیب و مەلەکوتییان بۆ ئاشکرا دەکات و دەیخاتە بەرچاویان[2]

کەرەتێك بەرێگەی ئیلهامێکی رەبانییەوە، واتە:

راستەوخۆ پەروەردگار دەیخاتە ناو دڵیانەوە، بەشێوەیەك کە خۆیان نازانن ئەو هەواڵ و نهێنییە دادەبارێت بەسەر پەرەکانی دڵیاندا، یان لە رێگەی خەو بینینی راستییەوەیە، وە هەندێك جاریش هەروا لە کاتی بەخەبەربوون و ئاگاییدا بەرێگەی دەرکەوتنی واتاکانی ئەو باباتە لە بینینی چەندین میسال و نمونەدا.[3]

---

(١) قوت القلوب ١/١٧٥

(٢) **ئەسراری مەلەکوت:** واتە: ئەو نهێنیانەی کە لەم بونەوەرەدا نادیارو شاراوەن، هەرپێنج هەستەکەی مرۆڤ دەرکی ناکەن و نایزانن، وە قەبوڵی بەش بەش کردن و پارچە پارچە کردن ناکەن، لە بەرامبەریا وشەی موڵك هەیەو هەندێك جار بە جیهانی غەیب و شەهادەیش ناودەبرێت. إتحاف ١/٤٤٥.

(٣) **ئیلهام:** بەشێکە لە سێ بەشەکەی دابەزینی وەحی و نیگا لە لایەن خوداوە بۆ سەر بەندە تایبەتیەکانی، خەوبینین و ( رۆئیای صادیقە)یش بەشێکە لەو نۆ

وەك چۆن کەسێك لە خەودا شتەکان دەبینێت( وا دەزانێت هەر لە ڕاستی دا دەیبینێت) ئەم جۆرەش بە ئاشکرا ببینێت بەرزترین پلەی بینینە( کە دوا

---

بەشەی کە لە ڕێگەی ئەوانەوە هەواڵی دروستیان پێ دەزانرێت، ئەوەش کە بەئاشکرا بخرێتە بەرچاوی بەم شێوەیە:

مرۆڤ کە لە هێزە هەستیارەکانیەوە بەرزبویەوە بۆ هێزی خەیاڵ و ئەندێشەو ،لە پاشان بۆ هێزی بیرکردنەوە، لە دوای ئەوەیش بۆ پلەی دەرک و هەست کردن بە ڕاستیەکان، کە لەناو دائیرەی عەقڵ دایەو هەموو ئەو هێزانەش بەیەکەوە بە شێوەیەکی ڕوحانی و مەعنەوی بەیەکەوە بەستراون و پەیوەنداری یەکن، زۆر لەوانەیە لەو هێزی ( قەبوڵ کردنی هەندێکیان لە هەندێکیان کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە) هەندێ ئاسەواری تایبەت بخرێتە بەرچاو، کە ڕەنگ بداتەوە لە دابەزینی هەندێ سروشت و میزاجی ئەو کەسەدا، وەك چۆن بەرز دەبێتەوە لە ڕێگەی فەیزو میهری خوداییەوە، کە بەهۆیەوە کاریگەری لەسەر هێزی بیرکردنەوەی پەیدا دەبێت، بەهۆی عەقڵەوە، لە پاشان هێزی بیرکردنەوەیش کاریگەری خۆی دەنەخشێنێت لەسەر هێزی خەیاڵ کردن، ئەم هێزەش کاردەکاتە سەر حەواس و هێزی هەستیاری مرۆڤ، تاوای لێ دێت، کە هەندێ نمونە و فەرمانی عەقڵانی پێ دەزانێت و، لەو سنورەوە هەست بە شتی تر دەکات، کە دەبنە حەقیقەت و ناوەڕۆکی شتەکان و، بنەماو هۆکارەکانی پێ دەزانێت:

وەك ئەوەی کە لە خۆی جودایەو، بە شێوەیەکیش وەك ئەوەی کە بەچاوی سەری خۆی بینیبێتی و بە گوێی خۆی بیستبێتی..
وەك چۆن نوستوو نمونەی شتە هەست پێ کراوەکان بە هێزە هەستیارەکان و بە هێزی خەیاڵ دەیانبینێت و وایش دەزانێت کە بەڕاستی بە چاوی سەر بینونی.
إتحاف ١/٤٤٥.

پلەی شەرەفمەندی هەواڵگری ئادەمیزادە کە پێ دەگات) ئیتر لەم پلە زیاتر بەسەیر و سولکی تایبەتی بەرزنابێتەوە، بەڵکو فرمانە مەعنەویەکان لە لایەن خوداوە بە وەحی و نیگا، یان بە ئیلهام، یان بە جەزەباتی ڕەببانی بۆی دادەبەزێت و لێی شارەزا دەبێت).[1]

کە ئەمەش پەیوەستە لەگەڵ ئەو پلە بەرزانەی کە دەدرێت بە پێغەمبەران، وەك چۆن خەوبینی ڕاستیش بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

کەواتە بێداربە! نەکەی بەشی خۆت لە زانست تەنها ئەوەندە بێت، کە هەرچییەك لە سنووری تێگەیشتنی تۆ بەدەر بێت باوەڕی پێ نەکەیت ، بەڕاستی هەر لەم دۆخەدا زانا خۆهەڵکێشە خۆگیف کەرەوەکان تیاچوون و، ڕێگای ئینکاریان گرتۆتەبەر، کەوایشیان گومان دەبرد ئەوان هەموو زانستە عەقڵانیەکانیان زانیوەو چواردەوریان لێ گرتووە، خۆ ئەگەر هەر لەسەرەتاوە جاهیل و نەزاندوو بوونایە، باشتر بوو لەو ئەقڵەی کە هۆکارە بۆ باوەڕ نەکردن بەم جۆرە فەرمانانەی کە تایبەتمەندن بە دۆستانی خوداوە، (چونکە بەنرخترین قسەی نەزانەکان، خۆدان بەدەستەوەیەو، گەڕاندەنەوەو تەفویزی هەمووکارەکانە بۆ لای خودا، لەو شتانەدا کە لێی نازانن و شارەزای نین، کەئەمەش کەمترین حاڵێ زاناکانە، کە ئەگەر لەم ڕوانگەوە سەیر بکرێت، هەندێك نەزانین هەیە لە هەندێك زانست باشترو خێردارترە.[2]

هەر کەسێکیش ئەم جۆرە زانست و تێگەیشتنە بۆ ئەولیاکان بەدوور بزانێت و ڕەددی بکاتەوە، ئەوا ئینکاری پێغەمبەرانیش دەکات و بەتەواوی لە دین

---

(١) إتحاف ١/٤٤٦

(٢) إتحاف ١/٤٤٦.

دەردەچێت.[1]

هەندێك لە عاریف وخوداناسان فەرموویانە:

بۆیە (ئەبدال)ەكان لە چواردەورو كەنارەكانی زەویدا بەجێ ماون و دوورن لە بەرچاوی خەڵكانی سەرزەوی، چونكە توانای ئەوەیان نیە سەیری زانا هاوچەرخەكانی ئەم سەردەمە بكەن ، چونكە ئەو جۆرە زانایانە بەلای ئەبداڵەكانەوە لە نەزانەكان دەژمێررێن، كە زانانین بە خوداو، دوورن لە(مَعرِفَةُ الله)، لەگەڵ ئەوەشدا كە لای خۆیان و خەڵكانی چوار دەوریان بەزانا دەناسرێن.[2]

سەهلی توستەری (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

گەورەو مەزنترین تاوان ئەوەیە كە نەزانێت و نەشزانێت كە نازانێت، وە سەیركردنی ئەحواڵی تێكڕای خەڵكی بكات و، گوێ لە قسەكانی ئەهلی غەفڵەت

---

(١) چونكە ڕێگەی فەیزی خودایی هەر یەكێكە، وە بە پێی توانا و ئامادەباشی زیادو كەم وەردەگرێت، ئەوەی بۆ پێغەمبەران دروستەو دەشێت، بۆ ئەولیاكانیش بە پێی توانای خۆیان وەری دەگرن، تەنها پلەی پێغەمبەران نەبێت كە ئەولیاكان وەری ناگرن و كەس ناتوانێت پێی بگات، كەواتە ئینكاری كردنی ئەو حاڵەت و پلەومقامانەی كە دۆستانی خودا پێی دەگەن سەردەكێشێت بۆ ڕەد كردنەوەی پلەو پایەی پێغەمبەرانی خودا، چونكە سەرچاوەی هەردوكیان لەیەك ڕێگەوە پەیدا دەبێت. إتحاف ٤٤٦/١.

(٢) بەلای زانایانی ئەهلی تەسەوفەوە لە هەموو زەمانێكدا ئەبدالەكان حەوت كەسن و زیاتر نابن، هەریەكێكیان لە هەرێمێكی سەرزەویدان، ئەوتادەكانیش چوار كەسن، وەك مێخ بە چوار ڕوكنی سەرزەویدا داچەقێنراون، (نوجەبا)كانیش هەشت كەسن و زیاتر نابن، (نوقەبا) كانیش تەنها دوانزە كەسن، هەریەكەیان خاوەنی حاڵ و توانا و كاری خۆیانن. إتحاف ٤٤٧/١.

و بێ ئاگایی بگرێت.[1]

هەر زانایەك ڕۆچوبێت لە دونیاویستیدا نابێت گوێ لە قسەکانی بگیرێت، بەڵکو پێویستە لە هەموو ووتەو گوفتاریدا ڕوبەڕوی تۆمەت ببێتەوە، چونکە هەر مرۆڤێك سەیری بکەیت چی خۆش بوێت لەو شتەدا ڕۆ دەچێت و گرنگی پێ دەدات و، هەر شتێکیش ببێتە ڕێگەی خۆشەویستەکەی، لای دەدات و دوری دەخاتەوە، بۆیە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی:

﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾الكهف(٢٨).

واتە: (بە گوێی ئەو کەسە مەکە کە بەهۆی دونیاویستییەوە دڵیمان لە زیکری خۆمان غافڵ کردووەو، شوێنی هەواو ئارەزواتی خۆی کەوتووەو، فەرمان و کارەکانی بێ سەروبەرەو سنووری بەزاندووە).

نەخوێندەوارە تاوانبارە یاخی‌یەکان حاڵیان باشتر و بەختەوەرترە لە وانەی بە هیچ شێوەیەك شارەزا نین لەڕێگەی دین، وە بڕوایشیان وایە بە خۆیان کە ئەوانە زاناو شارەزان.

چونکە کابرای نەخوێندەوار خەڵکەکە سەرگەردان ناکات و خۆیشی دانی ناوە بەوەدا کە هیچی پێ ناکرێت و کەمتەرخەمی هەیە، بۆیە داوای لێ بوردن لە خودا دەکات و تەوبە دەکات.

بەڵام ئەم نەزانەی کەوای گومان بردووە زانایەو، وایش گومان دەبات ئەوەی کە ئەو خەریکیەتی لەو زانستیانەی کە دونیای بۆ کۆ دەکاتەوە، وا دەزانێت کە هۆکاری ڕێگای قیامەت و دابینکردی بەختەوەری دوارۆژیەتی، بۆیە خۆی بەهەڵە نازانێت تا داوای لێبوردن و تەوبە بکات، بەڵکو بەردەوام سوورە

---

(١) قوت القلوب ١٧٦/١، تەنها ووتەی: إن من أعظم المعاصي الجهل بالجهل، ئیتر دوای ئەوە هەموی قسە ئەبو طالیبی مەکی‌یە، إتحاف ٤٤٧/١.

لەسەر ئەم نەزانین و جەهلەی تائەوکاتەی دەمرێت و بەسەرگەردانی‌یەوە دەڕوات.

ئەگەر زۆربەی ئەو خەڵکە وایان لێهات و ئومێدت نەما بەچاك بونیان(مەگەر ئەوانەی کە خودا پاراستونی) ئیتر باشتر وایە بۆ ئەو کەسەی بیەوێت دینەکەی سەلامەت بێت خۆی لێیان لا بدات و کەنارگیریان لێ بکات، وەك لە کیتابی(العُزلَة) دا پشت بە خودای گەورە باسی دەکەین.

هەر لەبەر ئەمە بوو کە یوسفی کوڕی ئەسباطی، نامەیەکەی نوسی بۆ حوزەیفەی مەرعەشی و فەرمووی:

ئەبێ ئەو کەسە چی بکات و حاڵێ چۆن بێت، کە بەتەنها مابێتەوەو، کەسێك نەمابێت کە گوناهبار نەبێت و زیکری خودای لەگەڵدا بکات ، کە قسەو گوفتوگۆ لەگەڵیدا گوناهو تاوان بێت[1] چونکە کەسێك نابینێت شایستەو شیاو بێت لەگەڵیدا بدوێت.

بەڕاستی ڕاستی فەرمووەو پێکاویەتی:

ئەوەی تێکەڵیی لەگەڵ خەڵکیدا دەکات، یان تووشی ناوبردنی خەڵکی و غەیبەت دەبێت، یان گوێی لێ دەگرێت، یان لەسەر کارو فەرمانی ناڕەوا بێ دەنگی لێ دەکات، باشترین حاڵیشی ئەو کاتەیە کە سوود لە زانستێک وەردەگرێت یان سوودێك دەگەیێنێت بە یەکێك...

بەڵام ئەم هەژارە ئەگەر زیاتر سەرنج بدات دەزانێت، کە ئەوسودەیش دەیگەیەنێت بە کەسانی تر، خاڵی نییە لە گەردی ڕیاو ناوو شۆرەت کۆکردنەوەو، پەل هاوێشتن بۆ ڕیاسەت و دەستەڵات، کەواتە ئەوەی سوودی وەرگرتووە، تەنها ئەوندەی مەبەست بووە، کە زانستەکەی هۆکارێك بێت بۆ

---

(١) قوت القلوب ١٦١/١.

خرپکردنەوەی دونیاو، وەدەست هێنانی شەڕو خراپە، کەواتە سوود پێ گەیاندنی ئەم، بووەتە یارمەتی دەر بۆ ئەو مەرامە خراپەی ئەو، بووەتە پشت و پەناو ئاسان کاری بۆ ڕاپەڕاندنی مەرامەکانی ئەو، هەروەك ئەو کەسەیە کە شمشێر و ئامێری شەڕ کردن بفرۆشێت بە دزو جەردەو ڕێگە بڕەکان، زانستیش وەك شمشێر وایە، وە ئەگەر بەباشی زانست لەگەڵ ئەهلی خۆیدا بەکاربهێنرێت، وەك باشی بەکارهێنانی شمشێر وایە لە دژی دوژمنی راستەوخۆ، بۆیە دروست نی‌یە شمشێر بە کەسێك بفرۆشرێت کە بەبەڵگەی حاڵ و مقام بزانێت بۆ ڕێگەگرتن و کاری جەردەیی بەکاری دەهێنێت.

ئەمەی باسمان کرد دوازدە نیشانەیە لە نیشانەکانی زانایانی دوارۆژو ئاخیرەت، هەریەکەیان کۆمەڵە ڕەوشت و ئاکارێکی زانایانی سەلەفی صالحین لە خۆیاندا کۆ دەکاتەوە، تۆیش یەکێك بە لەم دوو جۆر پیاوە:

یان هەڵگری ئەم صیفەت و خەصڵەت و چاکانەبە، یان دان بنێ بەهەڵەو کەموکوڕی خۆتدا، بەڵام نەخەڵەتابی هەرگیز لە پێڕی سێیەم بیت، کە ئینکاری ئەو حاڵەتانە بکەیت، وە فریوی خۆیشت بەوە بدەیت کە ئامێرەکانی دونیا بە نازناوی دیندای بەکاریان بهێنیت، وە سیرەت و ژیانی بەتاڵەو بێ کارەکان وەك ژیانی زانا پێگەیشتووەکان تێگەیشتووەکان بۆی بنوارێت، کە بەم ڕەدکردنەوەو جەهل و نەزانینەت دەگەیتەوە بە کاروانی کۆمەڵی تیاچواندا، کە بێ بەش و مەئیوس دەبن لە ڕەحمەتی خودا.

پەنا دەگرم بە خودا لە فرت و فێڵی شەیتان، بەفریودانی ئەو، کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان تیاچوون، داوا لە خودای گەورە دەکەین کە بمانگێڕێت لەو تاقمانەی کە فریوخواردوی ژیانی دونیا نابن و، هیچ غرورو سەرکەشیەکی دونیایی لە ڕاستی خوداپەرستی دوریان نەخاتەوەو سەرگەردانیان ناکات.

# بەشی حەوتەم

## لەبەشەکانی کیتابی عیلم

### لەبارەی ئەقڵ و

### بەهاو گرنگی عەقڵ

### و

### حەقیقەت ڕاستیەکەی و

### بەشەکانی

### وە ڕونکردنەوە و

### بەیانی

### شەرەف و بەهای ئەقڵ

# ڕونکردنەوە و بەیانی
# شەرەف و بەهای ئەقڵ

**بزانە:**

دەرخستنی ئەم ڕاستیە پێویستی بە خۆ خەریەك کردن و ئەزیەت دانی زۆر نی‌یە، لە کاتێکدا کە بەهاو گرنگی زانست لە ڕێگەی عەقڵەوە دەرکەوتووە، وە ئەقڵ سەرچاوە و بنەمای زانستەو ناوەندی گەشە پێدان و هەڵهاتنیەتی، زانست بە نیسبەت ئەقڵەوە وەك میوە وایە بەنیسبەت درەختەوە، یان وەك پەیوەندی نوورو تیشك وایە لەگەڵ هەتاودا، یان هێزی بینین و سەرچاوەکەی کە چاوە، ئیتر چۆن ئەقڵ دارای شەرەف و بەهایەکی گەورەنی‌یە، کە هۆکاری وە دەسهێنانی بە ختیاری دونیاو دواڕۆژە؟![1]

چۆن دەکرێت گومانت لە شەرەفی ئەقڵدا هەبێت، کە گیاندارەکانیش هەرچەندە باش و خراپ لەیەك جودا ناکەنەوە، سام و هەیبەت لە خاوەن ئەقڵ دەکەن، دەبینین گەورەترین گیاندار لەڕوی لەش و لارو هێزو تواناو

---

(١) بەهۆی ئەقڵەوە بەختەوەری ژیانی دونیا دابین دەکەیت، کە مرۆڤ دەتوانێت ببیتە جێنشینی خودا لەسەر زەویدا. لە دواڕۆژیشدا دەبێتە خاوەنی دروێنەوەی کێڵگەی قیامەت((مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ)) بەروبومی کێڵگەی قیامەتیش بە درێژی حەوت شتە:

مانەوەیەکی بێ کۆتایی و فەنا، توانایەکی بێ سنورو ماندوبوون، زانستێکی بێ جەهل و نەزانین، دەوڵەمەندییەکی دور لە هەژاری، ئاسودەیی و ئارامییەکی بێ ترس و خۆف، حەوانەوە و پاڵدانەوەیەکی بێ ماندووبوون، عیززەت و سەربەرزی‌یەکی هەمیشەیی کە هەرگیز ژێردەستەیی نەبێنێتەوە... إتحاف ١/٤٤٩.

هەڵپەو پەلاماردان و نەبەردی‌یەوە؛

کاتێك مرۆڤێك دەبینێت خۆی کۆ دەکاتەوەو سڵێ لێ دەکات و ترس و سام و دایدەگرێت، چونکە وا هەست دەکات ئەو دەتوانێت زاڵ ببێت بەسەریدا بەهۆی فرت و فێڵ و پیلانەوە کە لەڕێگەی ئەقڵەوە پێی دراوە.

بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((**الشَّيخُ فِي قَومِه كالنَّبِيِّ فِي أمَّتِه**))[1] واتە: (پیاوی گەورەو دانا لە ناو هـۆزەکەیدا وەك پێغەمبەر وایــە لە ناو گرۆو

---

(١) إبن حبان في الضعفاء[٣٩/٢(٥٧١)] من حديث ابن عمر، و أبو منصور الديلمي [ في مسند الفردوس{٣٧٣/٢(٣٦٦٦)}، عن ابن عباس، ولم أجد فيه عن أبى رافع] من حديث أبي رافع بسند ضعيف. [ قال الزبيدي: ٤٤٩/١: قال السخاوي في المقاصد ص ٤١٢(٦٠٩) جزم شيخنا و غيره بأنه موضوع، و إنما هو من كلام بعض السلف و ربما أورده بلفظ(( **الشيخ في جماعته كالنبي فى قومه، يتعلمون من علمه ، و يتأدبون بأدبه**))، وكله باطل... اهـ. و قال العراقي في التخريج الكبير، و سئل عنه الشيخ تقي الدين بن تيمية في جملة أحاديث، فأجاب بأنه لا أصل له، ثم قال العراقي: وقد روى من حديث ابن عمر و أبي رافع.

أما حديث ابن عمر فرواه ابن حبان في تأريخ الضعفاء، فيه عبدالله بن عمر بن غانم، و قد روى ابن غانم هذا عن مالك مالم يُحدِّث به مالك قط، لا يحل ذكر حديثه و لا الرواية عنه في الكتب إلا على سبيل الإعتبار، قال العراقي:

روى له أبوداود في سننه، وقال: أحاديثه مستقيمة، و ذكره إبن يونس في (تأريخ مصر) وقال: إنه أحد الثقاته الأثبات ومع ذلك فالحديث باطل، ولعل الآفة فيه من الراوى عن ابن غانم، وهو عثمان بن محمد بن خشيش القيرواني، قاله الذهبي في الميزان و أما حديث أبي رافع فرواه الديلمي في مسند الفردوس، وفيه محد بن عبدالملك يعرف بالقناطري، كذاب، وفي الميزان للذهبي٦٠/٢٤٤ حديث باطل.. اهـ

قلت: و قال ابن حبان هو موضوع، وقال الزركشي ليس هو من كلام النبيﷺ وفي لسان الميزان ١٨٣/٣: قال الخليلي هو موضوع. هذا حال الحديث من جهة روايته قد حكم عليه بالوضع، ولكن معناه صحيح يؤيده قولهِ تعالى: ﴿ **فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ**﴾ النحل(٤٣) وقله ﷺ: (**العلَماءُ وَرثَةُ الأَنبياء**) و غير ذالك.

ئوممەتەکەیدا) ئەمەش لە بەر زۆربی ماڵ و سامان و گەورەیی تەمەن و بەهێزی و توانای جەستەیی نییە، بەڵکو بەهۆی زیادە خیبرە و شـارەزایی و تاقیکارییەکانیەتی، کە ئەویش بەشێکە لەبەروبوم و بەرهەمی ئەقڵەکەی.

بۆیە دەبینیت لادێییە تەبیعەت وشکەکانی تورك و کوردو عەرەب و دروستکراوەکانی تریش، لەگەڵ ئەوەدا کە ئاستی تێگەیشتن و ڕۆشنبیرییان وەك پلەی گیانلەبەران وایە { دیارە لەو چەرخی پێنجەمی کۆچی‌یەدا زۆربەی نەتەوەکان دووربوون لە ڕۆشنبیری و خوێندن و دین، ئەویش باسی [ تورك و کوردو عەرەب] ناکات بەڵکو باسی ئەتراك و ئەکراد و ئەعرابە دەشتەکییەکان دەکات کە دووربوون لە ژیانی شارستانیەتەوە، لەگەڵ باقی نەتەوەکانی تر، ئێستاش ئەوانەی لەم میللەت و نەتەوانەن، ئەگەر زانست و ئەقڵ و دینیان نەبیت قورئان فەرموویەتی﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ (فرقان ٤٤).

واتە: ئەوانە وەك ووڵاخ وان بەڵک و گومڕاو سەرلێشێواوترن، چونکە ئەقڵیان نی‌یە چاك و خراپ لەیەك جودا بکەنەوە}

کەواتە (لەگەڵ نەفامی و تێنەگەیشتنیشیاندا) ڕێز لە پیر و شێخەکانیان دەگرن و سروشتیان هەر بەو شێوەیە، هەر بۆیە کاتێک کە زۆرێک لە دوژمن و نایاران ویستیان پێغەمبەرﷺ بکوژن، کاتێك چاویان هەڵات بەسـەر ڕوخساری پێغەمبەردا، وە چاویان ڕەشت و ڕێژا بە نووری ناوچاوانی پیرۆزی‌دا، یەکسەر سام و هەیبەت دایگرتن و،ئەو نوورە پرشنگدارەی کە نووری پێغەمبەرایەتی‌یە، کە دەدرەوشایەوە لە ناوچاوانیدا لێیان ئاشکرابوو، هەرچەندە ئەم جۆرە سام و هەیبەتە لەناو ناخ و نەفسیاندا شاراوەیە، وەك چۆن ئەقڵ شاراوەیە،

---

ورواه الرافعي من طريق الخليل الحافظ في (( مشيخته)) بسنَدٍ مرفوع. كما في التدوين في أخبار قزوين(٣/٩٥).

هەرچەندە شەرەف و بەهای ئەقڵ وەك شتێكی پێویستی و زەروری هەستی پێ دەكرێت، بەڵام مەبەستمان ئەوەیە، لە بارەی ئەقڵەوە چ هەواڵ و فەرمودەو ئایەتێكی پیرۆز لە باسی بەهاو قەدرگرانی ئەقڵدا هاتووە باسی بكەین:-

بەڕاستی دەبینین خودای گەورە ئەقڵی بەنورو تیشكی خودایی ناوبردوە:

﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ ﴾ النور(٣٥).

واتە: ( خودای گەورە نورو ڕوناكی ئاسمانەكان و زەوییەو، نورو ڕوناكی بەخشیوە پێیان، نمونەی نوورو ڕوناكیەكەی وەك تاقێك وایە چرایەكی تێدابێت...تاد)

وە ئەو زانستەی بەهۆی ئەقڵەوە وەری دەگریت، ناوی بردووە بە ڕۆح و ژیان وەك خودای گەورە فەرمویەتی:

﴿ وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا ﴾الشورى(٥٢)

( هەر ئا بەو شێوەی كە ووتمان ئەی محمد ﷺ، ئێمە لە لایەن خۆمانەوە قورئانمان بۆ ڕەوانە كردیت ، كە ژیان دەبەخشێت بە ڕۆح و گیان و عەقڵ..)

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ ﴾ الأنعام(١٢٢).

واتە: ( ئایە ئەو كەسەی بەهۆی بێ باوەڕییەوە مردوو بووەو، بەهۆی ئیمانەوە زیندومان كردۆتەوە، وە نوورو ڕوناكیەكمان لە ژیانی‌دا بۆ سازكردووە،...)

وە لە هەرجێگەیەكدا قورئان باس لە نوورو تاریكی بكات، ئەوە مەبەستی زانست و نەزانین بووە، وەك قورئانی پیرۆز فەرموویەتی:

﴿ يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ﴾ البقرة(٢٥٧).

واتە: لە تاریكستانەوە ڕزگاریان دەكەین بەرەو نورو ڕۆشنایی،( واتە لە نەزانیەوە بۆ نورو ڕۆشنایی زانست).

بەڕاستی هەربەم شێوەیە بوو کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی:[1]

**((يا أيُّها النّاس اعْقِلوا عَن ربِّكُم، وتَواصَوا بالعَقلِ تَعرِفُوا ما أُمِرتُم بهِ وما نُهيتُم عنهُ، واعلَمُوا أنَّه يُنجِدُكم عِندَ رَبِّكُم، واعلَموا أنَّ العاقِل مَن أطاعَ الله وإن كان دميمَ المَنْظرِ حقيرَ الخَطَرِ دَنيءَ المَنْزِلَة رَثَّ الهَيئَةِ، وأنَّ الجاهِل مَن عَصَى اللهَ تعالى وإنْ كانَ جَميلَ المَنظَرِ عظيمَ الخَطَر شَريفَ المَنْزِلةِ حَسَنَ الهَيئَةِ فصيحاً نَطوقاً. فالقِرَدةُ والخَنازِيرُ أعقَلُ عِندَالله تَعالى مِمَّن عَصاهُ ولا تَغتَرُّ بتَعظيمِ أهلِ الدُّنيا إيَّاهُم، فإنَّهُم مِنَ الخاسِرين))**

---

(١) أخرجه داود بن المحبر أحد الضعفاء في كتاب العقل من حديث أبي هريرة وهو في مسند الحارث بن أبي أسامة [ ٨٠٦/٢(٨٢٥)] عن داود.

[قال الزبيدي ٤٥٢/١: قال العراقي في التخريج الكبير: داود بن المحبر أختلف فيه، فروى عباس الدوري عن يحى بن معين أنه قال:[ كما في تهذيب الكمال للمزى ٤٤٥/٨):

مازال معروفا بالحديث ثم تركه، وصحب قوما من المعتزلة فأفسدوه وهو ثقة، وقال أبوداود في سؤالات أبي عبيد الأجري ص ٢٣٢: ثقة شبه الضعيف، وقال أحمد في العلل ٣٨٨/١: لا يدري ماالحديث وقال الدارقطني في السنن ١٦٢/١: متروك، وروى عبدالغني بن سعيد الأزدي المصري عن الدرقطني قال: كما في تأريخ بغداد ٣٦٠/٨):

كتاب العقل و صنعَهُ أربعة: أولهم ميسرة بن عبد ربه، ثم سرقه منه داود بن المحبر، فركبه بأسانيد غير أسانيد ميسرة، و سرقه عبدالعزيز بن أبي رجاء، فركبه بأسانيد أخر، ثم سرقه سليمان بن عيسى السنجرى، فأتى بأسانيد آخر، قال و على ماذكره الدارقطني فقد سرقه عن داود عبدالعزيز بن أبي رجاء، فاختصره و جعل له إسنادا اخر، فرواه عن مالك، عن سهيل عن أبيه، عن أبي هريرة و أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله ﷺ:

((إبن أدم أَطع ربَّك تسمى عاقلا، و لا تعصه تسمى جاهلا. رواه أبو نعيم في الحلية ٣٤٥/٦، من رواية عبدالعزيز بن أبي رجاء. قال الذهبي في الميزان، ٣٦٣/٤ هذا باطل على مالك. اهـ]

واته: ( ئەی خەڵکینە؛ لەخودای خۆتانەوە وەری بگرن و فێری ببن، وەسێت بکەن بەبوونی کەماڵی ئەقڵ لەناوتاندا، تا بەهۆیەوە بزانن چیتان فەرمان پێ دراوەو چی لەسەرتان قەدەغەکراوە، وە بشزانن کە ئەقڵ لای پەروەردگارتان مایەی عیززەت و سەربەرزیتانە ، ئاقڵ و دانا ئەو کەسەیە کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خودایە، با ئەو کەسە ڕوخسارو شکڵێکی نابوت و بێزراوی هەبێت، یان بێ نرخ و کەم بەها بێت و، سووك و بێ شان و شەوکەت بێت و ڕەش و ڕووت و ڕەجاڵ بێت.

وە بزانە کە نەزان( واتە: کەزاناو ئاقڵ نەبێت نەزانە) ئەو کەسەیە:

کە تاوانبار و تاوانکار بێت، با ڕوخساری جوان و کەشخەبێت و، بەهادارو قەدرگران و، بەشان و شەوکەت و خاوەن قۆناغ و، کەڵەگەت و سیماجوان و زوبانپاراو و قسەزانیش بێت، چونکە لای خودای گەورە مەیمون و بەرازیش لەو کەسە بە ئاقڵ تر دەژمێررێن کە گوناهو بێ گوێی خودا دەکات.

بەوەش دەسخەڕۆ مەبن کە ئەهلی دونیا بەچاوی ڕێز و گەورەییەوە سەیریان دەکات، ئەوانە ڕەنج بەزایەو خەسارەت مەندی دواڕۆژن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((أوّلُ ما خَلق الله العقلَ، فقالَ له أقبِل فَأقبَلَ، ثمَّ قالَ لهُ أدبِر فَأدبَر، ثمَّ قالَ الله عزَّوجل: وعِزَّتي وجَلالِي ما خَلقْتُ خَلْقاً أكرَم علَيَّ مِنكَ، بِكَ آخُذ، وبِكَ أُعطِي، وبِكَ أُثيب، وبِكَ أُعاقِب))**[1] واتە: ( یەکەم شتێ کە خودا دروستی کرد ئەقڵ بوو، ڕوی لێ کردو فەرمانیپێدا، وەرە پێشەوە، هات.

---

(١) أخرجه الطبراني في الأوسط[٧/١٩٠(٧٢٤١)] من حديث أبي أمامة، و أبونعيم في الحلية ٣١٨/٧ من حديث عائشة، بأسنادين ضعيفين. [قال الزبيدي ٤٥٣/١: قال العراقي في التخريج الكبير: راوي من حديث أبي أمامة، و عائشة، وأبي هريرة، و ابن عباس و الحسن عن عِدَّة من الصحابة فأما حديث أبي أمامة فرواه الطبراني في الأوسط و فيه عمر بن أبي

له پاشـــان پێی فەرموو: برۆ دواوە، ڕۆیشتە دواوە، لە پاشان سوێندی خوارد بە عیززەت و جەلالی خۆی: هیچ دروستراوێکم دروست نەکردووە لە تۆ بەڕێزتر بێت لەلام، بەهۆی تۆوە (واتە بەهۆی عەقڵەوە) کردەوە چاکەکان وەردەگرم و، بەهۆی تۆوە شتەکان ئەبەخشمەوەو، بەهۆی تۆوە پاداشت ئەدەمەوە و، بەهۆی تۆوە تۆڵە دەسەنم و سزا دەدەم.)[1]

---

صالح. ذكره العقيلي في الضعفاء ١٧٥/٣(١١٦٩). وقال الذهبي في الميزان ٢٤٨/٥: لا يعرف قال: ثم إن الراوي عنه مشهور بالمنكرات. قال: والخبر باطل. وأما حديث عائشة فرواه أبو نعيم في الحلية ٣١٨/٧، ولم أجد في إسناده أحدا مذكورا بالضعف ، ولاشك أن هذا مركب على هذا الإسناد ، ولا أدري ممن وقع ذالك و الحديث منكر. و أما حديث أبي هريرة فرواه الحيكم الترمذي في النوادر ٣٥٤/٢ و فيه أبو عبدالله مولى بني أمية، لا أدري من هو. وأما حديث الحسن عن عدة فروان الترمذي الحيكم أيضا في النوادر ٣٥٣/٢ قال حدثنا عبدالرحيم حبيب، حدثنا داود بن المحبر، حدثنا الحسن بن دينار، قال سمعت الحسن، ورجاله كلهم هلكي إلا الحسن البصري و عبدالرحيم بن حبيب الفاريابي ليس بشيئ، قال ابن حبان في المجروحين ١٦/٢: لعلّه و ضع أكثر من خمسمأة حديث، وداود تقدم والحسن بن دينار ضعيف أيضا، وبالجملة فطرقه كلها ضعيفه].

(١) شـێخ ئەحمەددینـی راوی فەرمـوویەتی: ئەمەی بەبەڵـگە هێنـاوەتەوە کە ئەقـڵ توانـای هەیە قەبـوڵی وەحـی و نیگـا بکـات و بڕوایشـی پـێ بهێنێـت، کاتێـک دەفەرمووێت: وبك أعبد: بەهـۆی تـۆوە من دەپەرسـترێم، لە کاتێکدا دەبێت کە ئەقـڵ یەکەم مەخلـوق بێـت تـایبەت کرابێـت بەوەحی و خیطـابی پەروەردگـارو محەبـبەت و مەعـریفەت و عیبـادەت و پێغەمبەرایەتیـیەوە، چـونکە بەهـۆی ئەقـڵەوە لە (معرفـة الله) شـارەزا دەبێـت و خۆیشـی دەناسـێت، ئەگەر بەنـووری خـودا سـەیری شـتەکان بکەیـت و بە قـووڵی بـۆ ئەم بـابەتە بنوارێـت، بـۆت دەردەکەوێت کە ناسینی خـودا بە عەقڵ دەبێت، ئەوەش کە وەصـفدار کراوە بە تایبەتمەنـدی لەوەرگرتنـی وەحی و خیطـابی خـودایی و محەبـبەت و مەعـریفەت و

عەبودییەتی تەواوو، وەرگرتنی پەیامی پێغەمبەرایەتی، ئەوە تەنها ( ڕۆحی) پیرۆزی خۆشەویستی خودا حەزرەتی محمد المصطفی یە ﷺ، چونکە خۆی فەرموویەتی:
یەکەم شتێ کە خوا دروستی کردبێت ڕۆحی من بووە.
لەڕێوایەتێکی تردا دەفەرمووێت:
نوری منی دروستکردووە، چونکە ڕۆحەکەی گەوهەرێکی نورانی‌یە، نورەکەیشی دانـــایی و ئەقڵەکەیەتـــی، کە مـــادەیەکی عەرەزی یەو بە جەوهەرو ڕۆحەکەیەوە وەســتاوە، هەر لەبەر ئەوەیە کە پێغەمـبەر ﷺ فەرمـوویەتی: کنـتُ نبیّاً و آدمُ بـینَ الرُّوحِ والجَسَـد، واتە: ئەو کاتەی من پێغەمبەرێتیم پێ سپێردرابوو، ئادەم هێشتا ڕۆح و لاشەیشـی نەکرابـوو بە بەردا، لەمەوە ووتـراوە: ( **مـن عـرفَ نفسَـه فقَـد عـرَف ربَّـه**)، واتە ئەوەی نەفس و خـودی خـۆی بناسێت، خـوای خـۆی ناسـیووە، چونکە بە پێناسەی خودایی خۆی ناسیوە، کە خوا پێی فەرمووە:
هـیچ دروسـتکراوێکم نـی‌یە لە تـۆ خۆشەویسـت تـر بێـت لە لام ، وە خوایشـی ناسـیووە، بەوەی کە خـودا نەفسـی خـۆیی پێ ناسـاندووە، وەك لەفەرموودەکەی سەرەوەدا باس کراوە. هەندێ لە گەورە پێشەواکان فەرموویانە:
یەکەم مەخلوقاتی خـودا مەلائیکەیەکی( کەڕوبی) بووە، کە ناودەبرێت بە ئەقڵ، کە خاوەنی قەڵەمە و ڕوی خیطابی تێکراوە (أَقبِلْ... وەرە پێشەوە)
تەئـویلی وشـــەی ئەقڵـــیش بەواتـــای (عاقـــڵ) دەکرێـــت، بەپـــێی ئەم تەئـــویلە دروســتەیە: ڕۆحـی حەزرەتﷺ دروسـتکراوی یەکەمەو، هەمـوو نازناوەکـان لە مەلائیکەی کەڕوبی و نـورو قەڵەم و ئەقڵ هەر (ڕۆح)ە پیـرۆزەکەی پێغەمـبەر ﷺ دەگـرێتەوە، کە بتوانرێـت ڕوی خیطـابی تـێ بکرێـت و، قسـە وەربگرێـت و بە ئەنجامی بگەێنێت. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە بنوارە: إتحاف السادة المتقين، ٤٥٣/١.

ئەگەر بڵێیت: ئەو عەقڵەی کە باسی دەکەیت، ئەگەر ماددەیەکی عەرەضی بێت، واتە بلکێت بەشتێکەوە، ئەی چۆن دروسکراوە پێش ئەوەی لاشەو جیسمەکە دروست بکرێت؟ کە پێیەوە ڕاوەستاوە،( خۆ شتی عەرەزی بەخۆیەوە ڕاناوەستێت) وە ئەگەر جەوهەریشە؛ کەواتە چۆن بەخۆیەوە ڕاوەستاوە و، خۆی نادات بە لایەکداو نالکێت بە شتێکەوە؟

بزانە ئەم بابەتە پەیوەندارە بە عیلمی موکاشەفەوە، ناکرێت لە بەشەکانی عیلمی موعامەلەدا باسی بکرێت، ئێمەش تەنها باسی ئەو بابەتانە دەکەین کە پەیوەنداری زانستی موعامەلەن.

لەئەنەسی کوڕی مالیك ( خودای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

تاقمێك هاتن و زۆر تاریف و پیاهەڵدانی کەسێکیان کرد لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ، تاگەیشتە ئەوەی کە زیادە ڕەوی لە پیاهەڵدانیابکەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

(( ئەقڵی ئەو پیاوە چۆنە؟))(( **كيفَ عَقلُ الرَّجُلِ**))؟

ووتیان: لەبارەی هەوڵ و تێکۆشان و عیبادەت و هەموو خەصڵەتە چاکەکانیەوە هەواڵت پێ دەدەین و تۆیش پرسیارمان لێ دەکەیت لە بارەی ئەقڵیەوە؟!

پێغەمبەر ﷺ لە پاشان فەرمووی:

**((إنَّ الأحمقَ يُصيب بحُمقِه أعظَمَ مِن فُجورِ الفاجِر، وإنَّما يَرتَفِعُ العِبادُ غَدا في الدَّرَجاتِ الزُّلفَى مِن رَبِّهم عَلى قَدَرِ عُقُولِهِم))**[1]

---

(١) أخرجه إبن المحبر في العقل بتمامه، و الحكيم الترمذي في النوادر ٣٥٧/٢ مختصرا.

[ قال الزبيدي: قال العراقي في التخريج الكبير: فيه سلام بن المنذر قال البخاري في التأريخ الكبير ١٣٥/٤(٢٢٣٤) منكر الحديث ،وقال ابن حبان في المجروحين ٣٤٠/١: لايجوز الإحتجاج به إذا انفرد ورواه الحكيم الترمذي مختصرا، و في إسناده جهالة.]

واتە:( بەڕاستی پیاوی نەفام و بێ ئەقڵ بەهۆی نەفامیەکەیەوە خۆی یان خەڵکی تووشی خراپە دەکات، گەورەتر لە زیان و خراپەو فەسادی کابرایەکی فاجیرو خراپەکار، سبەینێ لە پلە بەرزەکاندا و لە دوارۆژدا ئەوەی کە دەبێتە هۆکاری بەرزبونەوەی بەندەکان لای خودا و بۆلای خودا، بە پێی ئاستی ئەقڵ و تێگەیشتنیانە.

هەروەها حەزرەتی عومەر خودای لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەری خودای گێڕاوەتەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

**((ما اكتسَبَ رجُلٌ مِثلَ فَضلِ عَقْلِ يَهدِي صاحِبَهُ إلى هُدىً، ويَرُدُّهُ عَن رَدى، وما تَمَّ إيمانُ عَبدٍ، ولا استقَامَ دينُه حَتَّى يَكمُلَ عَقلُه))**[1]

واتە: ( هیچ شتێک بەقەدەر ئەوە باش نیيە کە پیاوێك زیادە ئەقڵ و ژیریيەکی وەرگرتبێت و دەستکەوتبێت، ڕێنومایی ڕێگای هیدایەتی پێ کردبێت، وە لە ڕێگەی خوارو خێچ و لار گێڕابیەتیەوەو ڕزگاری کردبێت، وە ئیمان و بڕوای هیچ بەندەیەك هەرگیز نەتەواو دەبێت، وە نەدینەکەیشی ڕاگیرو ڕاوەستاو دەبێت ئەگەر خاوەنەکەی دارای کەماڵی ئەقڵ و ژیری نەبێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ: فەرموویەتی:

**((إنَّ الرَّجُلَ ليُدرِكُ بحُسنِ خُلقِه دَرجَة الصائِم القائِم، ولا يَتِم لرَجُلٍ حُسنُ خُلقِه حَتَى يَتِمَّ عقلُهُ، فعِندَ ذلِك تمَّ إيمانُه وأطاع ربَّهُ وعَصَى عَدُوَّهُ**

---

(١) أخرجه ابن المحبر في العقل ، و عنه الحارث بن أبي أسامة ( في مسنده ٨٠١/٢( ٨١٣))
قال الزبيدي: ٤٥٦/١: أخرجه البيهقي في الشعب ١٦١/٤(٤٦٦٠) عن عمر، ولفظه:
**(( ما اكتسب المرء مثل عقل يهدى صاحبه إلى هدى، أو يردد عن ردى،** و أخرجه الطبراني فى الأوسط ٧٩/٥(٤٧٢٦) عنه أيضا، ولفظه:
**مااكتسب مكتسب مثل فضل علم يهدى صاحبه إلى هدى، أو يرده عن ردى، ولا استقام دينه حتى يستقيم عقله.)))**

إبليس))[1]

واتە:( بەڕاستی پیاو هەیە بەهۆی خووڕەوشتی جوانەوە دەگات بە پلەو پایەی ئەوانەی کە هەمیشە بەرۆژدا بەڕۆژوون و بەشەو خەریکی شەو نوێژو عیبادەتن، وە هەرگیز خووڕەوشتی کەسێك تەواو نابێت ئەگەر ژیری و ئەقڵی تەواو نەبوبێت، کاتێك خاوەنی ئەقڵێکی کامڵ بوو، ئیمانیشی تەواو دەبێت و دەشتوانێت گوێڕایەڵی خودای خۆی بێت، وە ئەو کاتە دوژمنەکەیشی دەناسێت کە شەیتانە و لێی یاخی دەبێت.

وە دەگێڕنەوە لە ئەبی سەعیدی خودریەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((لكلِّ شَيء دَعامَة، ودَعامَةُ المُؤمِنِ عَقلُه، فبقَدْرِ عَقْلِه تَكونُ عِبادتُه، أمَا سَمِعتُم قولَ الفُجَّار في النَار: ﴿لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾**الملك(١٠)[2] واتە:

---

(١) أخرجه ابن المحبر في رواية عمر ابن شعيب، عن أبيه عن جده به، و الحديث عند الترمذي (كتاب البر و الصلة) باب ما جاء في حسن الخلق(٢٠٠٣) مختصر، دون قوله (( **ولايتم**)) من حديث عائشة و صححه.

قال الزبيدي ٤٥٦/١: قال العراقي في التخريج الكبير و فيه مقاتل بن سليمان المفسر وليس بشيئ، قاله يحى بن معين (كما في تهذيب الأسماء للنووى،٤١٣/٢) ، وقال الجوزجانى في أحوال الرجال: ص ٢٠٢(٣٧٣) كان دجّالا جسورا. و قال البخاري في التأريخ الكبير ١٤/٨(١٩٧٦) سكتوا عنه، وقال ابن حبان: في المجروحين ١٤/٣/(١٠٤٥) كان يكذب، إنتهى.

قلت: و أخرج الطبراني في الكبير ١٦٩/٨(٧٧٠٩) عن أبي أمامة بلفظ: (( **إن الرجل ليُدرك بحُسنِ خلقه درجةَ القائم باللَّيل الظامئ بالهَواجر**)) وفيه عفير بن معدان وهو ضعيف، ورواه الحاكم في المستدرك ١٢٨/١(١٩٩) من حديث أبي هريرة و قال: هو على شرطهما، و أقره الذهبي في التلخيص].

(٢) أخرجه ابن المحبر و عنه الحارث في مسنده (٨١٣/٢(٨٤٠) و انظر: الإتحاف ٤٥٦/١.

هەموشەتێك پێویستی بە کۆڵەکەو پشگیرییەك هەیە پێیەوە ڕابووەستێت، وە پشت قایمی مرۆڤی باوەڕداریش ژیری و ئەقڵەکەیەتی، بە ئەندازەی ئەقڵەکەی بەندایەتیەکەیشی لێ وەردەگیرێت، ئایا نەتانبیستووە کە خراپەکارەکان لە دوای پەشیمانبونەوە چی دەڵێن:

ئەگەر ئێمە گوێ ڕایەڵ بووینایەو دارای ئەقڵ و ژیری بوینایە، کارێکمان نەدەکرد کە ئێستا لەناو ئاگری دۆزەخدابین.

حەزرەتی عومەر( خودای لێ ڕازی بێت) پرسیاری کرد لە تەمیمی داری:

شەرەف و گەورەیی لای ئێوە چۆنە؟ فەرمووی: ئەقڵ... عومەر فەرمووی ڕاست دەکەیت، پرسیارم لە پێغەمبەری خودا کرد وەك چۆن پرسیارم لە تۆ کرد، بەوشێوەی تۆ وەڵامی دامەوە، لە پاشان فەرمووی:

**((سألتُ جُبيريل (عليهِ السَّلام) مالسُّؤْدُد؟ قالَ: العَقْل.))**[1]

ئەفەرموێ: منیش پرسیارم لە جوبرەئیل کرد( سەلامی خودای لەسەر بێت) کەچی لە هەموو شتێك مەزن و گەورەترە؟ فەرمووی: عەقڵ.

بەڕائی ئەوسی( خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

ڕۆژێکیان پرسیاری زۆریان ڕوبەڕوی پێغەمبەری خودا ﷺ کرد ئەویش فەرمووی: **((يا أيُّها النّـاسِ إنَّ لكُلِّ شَيءٍ مَطيَّةٌ، ومَطيَّـة المَرءِ العَقْلُ، وأحسَـنُكم دلالَـةً ومَعْرِفَةً بالمَحِجَّة أفْضَلُكُم عَقْلاً))**[2]

ئەی خەڵکینە هەموو شتێك پێویستی بە ڕێگەو سوارگەیەك هەیە، ئەوەش کە پیاو سواری دەبێت و لێیەوە دەگات بە مەرامەکانی ئەقڵ و ژیری‌یە،

---

(١) أخرجه داود بن الحبر و عنه الحارث في مسنده (٨١٢/٢ (٨٣٨٣).

(٢) أخرجه داود بن الحبر و عنه الحارث في مسنده(٨٠١/٢(٨١١). قال الزبيدي: ٤٥٦/١ قال العراقي: فيه غياث بن إبراهيم النخعي أحد الوضاعين].

ئەوەش کە لە هەموو کەس باشترو جوانتر دەتوانێت سوارچاك و ئاگادار بێت بەسەر بەڵگە ڕوون و ئاشکراکاندا و شارەزا بێ لە ئەرکەکان، ئەوانەتانە کە لە هەمووان زیاتر کەماڵی ئەقڵتان هەیە.

ئەبو هورەیرە( خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویێت:

کاتێك پێغەمبەرﷺ لە غەزای ئوحود گەڕایەوە، لە خەڵکەکەی دەبیست کە دەیانووت:

فڵان کەس لەوی تر ئازاتر بوو، فڵانیش نەبەردو جوامێرتربوو، بەرگەی تاقی کردنەوەکانی خودایی زیاتر دەگرت( بەم شێوە بە شان و باڵیاندا هەڵیان دەدا) پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵام ئەوەی کە باسی دەکەن لێی شارەزانین و نایزانن. ((أمَّا هَذا فلاَ عِلمَ لَكُم بِهِ)) ووتیان:

بۆمان ڕونبکەرەوە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەویشﷺ فەرمووی:

**((إنَّهُم قاتَلُوا عَلَى قَدْرِ مَا قسَّم اللهُ لهُم مِنَ العَقلِ، وكانَت نُصرَتُهُم ونِيَّتَهُم عَلى قَدْرِ عُقُولِهِم فَأُصيبُ مِنهُم مَن أُصيبُ عَلى مَنازِلَ شَتَّى، فإذا كانَ يومَ القيامَةِ اقتَسَمُوا المَنازلَ عَلى قَدْرِ نِيَّاتِهِمْ وقَدْرِ عُقُولِهِم))**[1]

واتە: ئەوانە بە پێی ئەو بەشەی کە خودا پێی داون لە ئەقڵ و ژیری بەو پێی شەڕیانکردووە، سەرکەوتیان و هەڵسەنگاندی نیەتەکانیان بە پێی ئەندازەی ( زۆری و کەمی) ئەقڵەکانیان بووە، هەر کەس چەندێك بەشی بووبێت لەو ژیری و ئەقڵەدا، بەو شێوەیە لەناو مەنزڵگا جیاجاکاندا پشکی خۆی وەردەگریت، کە ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە، مەنزڵگا بەرزو نزمەکان دابەش دەکەن بەسەریاندا، بە پێی ئەندازەی نیەتەکانیان، وە ئەندازەو ئاستی ژیری و ئەقڵەکانیان،( ئەگەر بە کەماڵی ئەقڵ و تەواوی نیەت پاکی و ئیخلاصەوە

---

(١) أخرجه ابن محبر في (( العقل)) و انظر الأتحاف ٤٥٧/١.

جەنگابن، ئەوا مەنزڵگا بەرزەکانیان بەنسیب دەبێت) بەپێی کەم و زۆری پلەکانیشیان دەگۆڕێت.

کەواتە پیا هەڵدانی ئێستا ئەو بایەخ و کاریگەرییەی نابێت، تا ئەو ڕۆژەی کە ڕاستی نییەت و کەماڵی ئەقڵەکانیان دەردەکەوێت)

بەڕائی کوڕی عازبیش ( خودایان لێ ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداﷺ کە فەرموویەتی:

**((جَـدَّ المَلائِكةُ واجتَهَدُوا في طـاعَةِ الله سُبحـانَه بالعَقـلِ، وجـدَّ المُؤمنُونَ مِن بَني آدمَ علَى قَدْرِ عُقولِهم، فأعمَلُهم بطاعَةَ اللهِ عزَّوجَل أوفَرُهُم عَقْلا))** [1]

مەلائیکەکان بە هەوڵ و تێکۆشان و لێبڕانەوە، بە ئەقڵ و تواناکانیەوە خەریکی بەندایەتی و گوێڕایەڵی خودای گەورەبوون، باوەڕدارەکانی ئادەمیزاد یش هەریەکە بەپێی ئەندازەی ژیری و ئەقڵی خۆیان تێکۆشاون و لێ بڕاون بۆ عیبادت، کامەیان زیاتر و چاکتر توانیوەتی طاعەت و بەندایەتی بۆ خودای گەورە بکات، ئەوەیان زیاتر دارای کە ماڵی ئەقڵ و ژیرییە.

حەزرەتی عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ووتم:

ئەی پێغەمبەری خودا، بەچی پلەو پایەی ئەو خەڵکە لە دونیادا زیاد دەکات؟

---

(١) أخرجه داود بن محبر كذالك و عنه الحارث في مسنده ٨٠٤/٢(٨١٩) ورواه البغوي في معجم الصحابة من حديث ابن عازب رجل من الصحابة غير البرك، وهو بالسند الذي رواه ابن المحبر. [ قال الزبيدي: ٤٥٧/١: فيه ميسرة بن عبد ربه الفارسي ، قال ابن حبان في المجروحين ١١/٣(١٠٤٠): كان يروي الموضوعات عن الإثبات، وهو واضع أحاديث فضائل القرءان و قال أبو داود( كما في ميزان الإعتدال ٥٧٤/٦): أقرَّ بوضع الحديث، وقال أبو زرعة ( كما في ميزان الإعتدال ٥٧٤/٦) و ضع في فضل قزوين أربعين حديثا. وكان يقول: أحتسب في ذالك].

فەرمووی(( **بالعَقْل**)) واتە: بە زیاد بوونی ژیری و ئەقڵ.

ووتم ئەی لە دوارۆژدا، فەرمووی: ((**بالعَقْل**)) ئەویش بەهۆی ئەقڵەوە هەندێکیان پلەو مەقامیان بەرزتر دەبێت. ووتم ئەی مەگەر وانی‌یە، کە هەموو کەس بەپێی کردەوەکانیان پاداشتیان دەدرێتەوە؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

**((یا عائِشَة! وهَل عَمِلُوا إلاَ بِقَدْرِ مَا أعْطاهُم اللهُ مِنَ العَقل؟! فبِقَدرِما أُعْطوهُ مِنَ العَقلِ كانَت أعْمالهُم، وبِقَدْرِ مَا عَمِلُوا يُجْزَون))**[1]

ئەی عائیشە؛ ئایا توانیویانە هیچ کردەوەیەکی چاکە بکەن مەگەر بە ئەندەزای ئەو ژیری و ئەقڵەی کە خودای گەورە پێی بەخشیون ، چەندێك کەماڵی ئەقڵیان زیاتر بێت، ئەوەندە چاکتر کاری باشیان کردوە، وە بە پێی کارە باشەکانیشیان پاداشتیان دەدرێتەوە، یان کارە خراپەکانیان سزاو تۆڵەیان لێ دەسەنرێتەوە .

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس( خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((لكُلِّ شَيء آلةٌ، وعُدَّةٌ، وإنَّ آلةَ المُؤمِنِ العَقلُ، ولكُلِّ شَيءٍ مَطيَّةٌ ومَطيَّةُ المَرءِ العَقلُ، ولِكُلِّ شَيءٍ دَعامَةٌ، ودَعامَةُ الدِّينِ العَقلُ، ولكُلِّ قَومٍ غايَةٌ، وغايَةُ العِبادِ، العَقلُ ولكُلِّ قَومٍ داعٍ وداعِي العابدينَ العَقلُ، ولكُلِّ تاجرٍ بِضاعَةٌ، وبِضاعَةُ المُجتَهِدينَ العَقلُ، ولكُلِّ أهْلِ بَيتٍ قَيِّمٌ وقيِّمُ بُيوتِ الصِدِّيقِينَ العَقلُ، ولكُلِّ خَرابٍ عِمارةٌ، وعِمارةُ الآخِرةِ العَقلُ، ولكلِّ امرىءٍ عَقِبٌ يُنسَبُ إليهِ ويُذكَر بِهِ، وعَقِبُ الصِدِّيقِينَ الذي يُنسَبونَ إليهِ ويُذكَرونَ بِهِ العَقلُ، ولِكلِّ سَفرٍ فُسطاطٌ، وفُسطاطُ المُؤمنِينَ العَقلُ.))**[1]

---

(١) من حديث داود بن المحبر في ((العقل)) أنظر الإتحاف ٤٥٧/١.

واتە: ( هەموو شتێك پێویستی بە ئامێرو ئالەتێک هەیە پێی جێبەجێ بکەیت، ئامێری ڕاپەڕاندنی کاری باوەڕدارانیش ئەقڵە، وە هەموو شتێك دەبێت پاڵپشت و سوارگەیەکی هەبێت، سوارگەو هۆکاری گەیشتن بە مەرامی هەموو کەسێك ئەقڵەکەیەتی.

وە هەموو شتێك پشت و پەناو کۆڵەکەیەکی هەیە، کۆڵەکەی ئاینیش ئەقڵ و ژیری‌یە، وە هەموو تاقمێك ئامانج و مەرامێکیان هەیە، وە ئامانجی ڕاستەقینەی بەندەکان ئەقڵە.

وە هەموو قەومێك بانگ کەرێکیان هەیە، بانگکەری عابیدو خوداناسانیش ئەقڵە، هەموو بازرگانێکیش کاڵایەکیان هەیە، کاڵای فرۆشتن و مایەی ڕەواجی کاری موجتەهیدەکانیش ئەقڵە، وە هەموو خاوەن ماڵ و خانەوادەیەك سەرپەرشتیارو کار بەڕێکەرێکیان هەیە، کار بەڕێکەرو هەڵسوڕێنەری ماڵی صدديق و ڕاستگۆکانیش عەقڵە، وە هەموو وێرانەیەك ئاوەدانیەکی هەیە، ئاوەدانکردنەوەی ژیانی دوارۆژیش بە ئەقڵە، وە هەموو پیاوێك پاشماوەیەکی لێ بەجێ دەمێنێت، هەمیشە خۆی دەدرێتە پاڵی و، بەو ئاسەوارو پاشماوەوە یادی دەکرێتەوەو باسی دەکرێت، پاشماوەی پیاوە ڕاستگۆو صددیقەکانیش کە دەدرێنە پاڵیان و بەوئاسارەوە ناودەبرێن و باس دەکرێن ئەقڵ و ژیری‌یە.

وە هەموو کۆمەڵێك کە گەشت و سەفەرێکی تایبەتی دەکەن دەبێت خێمەیەکیان پێ بێت، لەکاتی پێویستیدا هەڵێ بدەن و بحەوێنەوە لە ناویدا، خێمەی هەڵدراوی باوەڕدارانیش ئەقڵە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**((إنَّ أحبَّ المُؤمنينَ إلى اللهِ عزَّوجَل مَن نَصَبَ في طاعةِ اللهِ عزَّوجلَّ، ونَصَح لعبادِهِ وكَمُلَ عَقْلُهُ، ونَصَحَ نَفْسَهُ فأَبصَرَ، وعَمِلَ بهِ أيَّامَ حَياتهِ فَأفلَحَ وأنْجَحَ))**[1]

واته: بەڕاستی خۆشەویسترین باوەڕداران لای خودای گەورەو باڵا دەست، ئەو کەسەیە کە خۆی تەرخان کردبێت و یەکلایی کردبێتەوە بۆ طاعەت و گوێڕایەڵی خوداﷻ، وە ئامۆژگاری بەندەکانی خودا بکات و ئەقڵیشی کامڵ و تەواو بوو بیت، وە لە پێشەوە ئامۆژگاری خودی خۆی بکات و چاوکراوەبێت و، ڕاستیەکان ببینێت و، هەموو ڕۆژگارەکانی ژیانی بە پێی ئەو ئەقڵ و سەلیقەو بەرچاو ڕونیە کاربکات، ئەوە سەرفرازو سەرکەوتوو دەبێت، وەگرەوی ڕاستەقینەش دەباتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

ئەوەتان کە لە هەمووان زیاتر کەماڵی ئەقڵ و سەلیقەی باشتان هەیە، لە هەمووان زیاتر لە خوداترس و خۆ پارێزتر دەبن، وە لە هەمووان جوانترو باشتر سەرنجی فەرمان پێدراوەکانی خوداو قەدەغەکراوەکانی دەدەن، با لە هەموانیشتان کەمتر گیانی خۆبەخشیتان تیا بەدی بکرێت

**((أتَمُّكم عَقلاً أشَدُّكم للهِ خَوفاً، وأحْسَنُكم فيمَا أمَرَكُم بهِ ونَهى عَنهُ نَظَراً، وإن كانَ أقلَّكم تَطَوُّعاً))**[2]

---

(١) من أحاديث داود بن المحبر في (( العقل)) انظر الإتحاف ٤٥٨/١.

(٢) من أحاديث إبن المحبر في ((العقل)) أنظر الأتحاف ٤٥٨/١ وقد روى هذه الأحاديث عنه الحارث بن أبي أسامة. في ((مسنده)) و أوردها إبن الحجر في (( المطالب العالية) و أورد بعضها إبن الجوزي في (( الموضوعات)) و السيوطي في ((اللآلئ المصنوعة)).

# ڕونکردنەوەی حەقیقەتی ئەقڵ و بەشەکانی

بزانە:

جیاوازی بیرورِا لە پێناسەکردنی ئەقڵ و حەقیقەت و ڕاستیەکانی پەیدابوون[1] زۆربەیان بێئاگان لە ناسین و حاڵی بوون لەم ناوەو شارەزابوون لێی، چونکە چەندین واتای جیاجیا دەگرێتەوە، بۆیە لە پێناسەکردنی دا جیاوازی بیروڕاشیان لێ پەیدابووە [2]

---

(١) زانینی حەقیقەتی شتێك بەوەیە: کە بزانیت ئەو شتە چۆن بەوشێوە پەیدابووەو ،چۆن دەناسرێت، وەبەو صیفەتو خەصڵەتەوە بناسرێت و، بەبێ ئەوەی مەحاڵ بێت و لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێت، بۆ نمونە:

دەتوانیت تاریفی ئینسان بکەیت بەوەی کە گیاندارێکی قسەکەرە، کە ناتوانیت بیر لە بوون و کیانی مرۆڤ بکەیتەوە بە بێ ئەوەی کە گیاندارێك بێت و قسەش بکات، بەڵام دەتوانیت بیخەیتە مێشکتەوە، کە مرۆڤ بوونی هەیە بە بێ ئەوەی کە نووسەر بێت یان پێ بکەنێت، کە ئەمەش بەشێکە لە خەصڵەتەکانی، بەڵام حەقیقەتی مرۆڤی لەسەر دانەمەزراوە و پێناسەی ناکات.

ئەقڵیش بەو شێوە دەبێت پێناسەی حەقیقەتەکەی بکەیت.

(٢) جیاوازی بیرو ڕایان لەبارەی حەقیقەتی ئەقڵەوە سەری کێشاوە بۆ جیاوازی زیاتر لەبارەی ئەوەی کە ئایا دەتوانرێت هەست و دەرك بە حەقیقەتەکەی بکرێت یان نا؟ وە ئایا حەقیقەتی عەقڵ بۆخۆی ماددەیەکی عەرەزیە یان جەهەرە؟ ئایا ئەقڵ لە ناو سەردا نێشەتەجێیە یان لەناو دڵدا؟ ئایا ئەقڵەکان لە بنەڕەتدا یەکسانن یان جیاوازییان هەیە؟ ئایا ئەقڵ ئیسمی جینسە یان بۆخۆی جینسە، یان نەوعە، وەلەسەرو ئەمەیشەوە چەندین ڕاو بۆچونی تریان دەربڕیوەو تاریفی ئەقڵیان کردووە، ئەگەر عەقڵ ماددەیەکی عەرەزی بێت ئەوا: مەلەکە و

ئەوەی ڕاستییەو پەردە لەسەر شاراوەکان لا دەدات:

ئەقڵ و ژیری ناوێکە بەهاوبەشیی چوار واتای تایبەتی دەگرێتەوە، وەك چۆن ناوی(عەین) بۆ نمونە چەند واتاو مەبەستێك دەگەیێنێت.[1]

ئەوەش بەم شێوە واتای زۆر ببەخشێت، نابێت بۆ هەموو بەشەکانی یەك پێناسەیان بۆ دیاری بکرێت، بەڵکو هەموو بەشێك جودا دەکرێتەوەو دوای لێکۆڵینەوە لە حەقیقەتەکەی پێناسەیەکی تایبەتی بۆ دیاری دەکرێت.

---

توانایەکە بۆ نەفس پەیدادەبێت، بەهۆیەوە دەتوانێت ذەرکی زانستەکان و زانیاریەکان بکات، وە ئەگەر بووترێت ئەقڵ جەوهەرە: بەوە پێناسە دەکرێت کە: جەوهەرێکی لە طیف و ناسکە، شتە نادیارەکانی پێ دەزانرێت، بەهۆکارو وەسائیلە جیاجیاکان، وە بابەتە هەستیارو مەحسوسەکانیشی پێ دەزانرێت، بەهۆی بینین و موشاهەدەوە، کە خوا ئەو توانایەی لە دەماغ و مێشکی مرۆڤدا دروست کردووە، وە نورەکەیشی خستۆتە ناو دڵیەوە، وەک زانای ئیشبیطی تاریفی کردووە.

زۆربەی زانایانیش پێناسەی ئەقڵیان بە زانست لێکداوەتەوە، یان عیلم و زانینە بە صیفەت و خەصڵەتی شتەکانە، ئەوەی کە جوانە یان ناشیرینە. یان تەواوە یان نوقسانە، یان هێزێکە خێرو شەڕ پێ لەیەك جودا دەکەیتەوە، کە لە مێشکی مرۆڤدا کۆدەبێتەوەو کاردانەوەی لەسەر جوڵە و ڕۆین و وەستانی ئەو کەسە دەبێت و، مەرام و مەبەستەکانیشی پێ دابین دەکات. بنوارە: إتحاف السادة المتقين بشرح إحياء علوم الدين ١/٤٥٨.

(١) **عەین**: وشەیەکە بە جاسوسی دەوترێت، بەواتای کانیاو و بەمانای چاویش دێت، وە هەریەکەیان پێناسەیەکی تایبەتیان هەیە، ئەقڵیش بەوشێوە چەندین واتای لێ دەکەوێتەوە.

**یەکەم:** ئەقڵ واتە: ئەو وەصف وخەصڵەتەی مرۆڤی پێ جیادەبێتەوە لە هەموو گیانلەبەرەکانی تر: ئەو خەصڵەتەیە کە بەهۆیەوە ئامادەباشی وەردەگرێت بۆ فێربوونی زانستە بەڵگە ویستەکان، کە پێویستییان بەسەرنج و تێڕامان و دەلیل هەیە، یان تەگبیرو سازکردنی ئەو پیشەو هونەرە شاراوانەی، کە بەهۆی فیکرو بیر لێکردنەوەو وردەکاری هێزی مێشکەوە پێیان دەگات و لێیان تێ دەگات.

هەر ئەوەیشە کە پێشەوا حاریثی کوڕی موحاسیبی ڕایگەیاندووەو لە پێناسەی ئەقڵدا فەرموویەتی: [ ئەقڵ هێزێکی خۆڕسك و سروشتی و زکماکی‌یە (غەریزە)یەکە بەهۆیەوە دەتوانێت ئەو زانستانە بزانێت و دەرکیان پێ بکات کە بەسەرنج و بەڵگە و نەزەرەوە وەستاون ، وەك ئەوەی کە نوورێك بێت و توڕبدرێت و بهاوێژرێتە ناو دڵەوە، کە ئامادەباشی بکات بۆ هەست کردن و زانینی شتەکان.]

ئەوەی ئینکاری ڕاکەی موحاسیبی دەکات و پێناسەی ئەقڵی بەوە کردووە کە تەنها پەیوەندارە بە زانستە زەرورییەکانەوە( واتە: ئەو زانستانەی کە بە ئاسایی و بەدیهی دەزانرێن و پێویستییان بەبەڵگە نی‌یە) چونکە بەڕاستی ئەوەی بێ ئاگاو غافڵە لەو زانستانەو، کەسێکیش کە نوستووبێت و خەوی لێکەوتبێت هەردووکیان بە ئاقڵ و ژیر ناودەبرێن، چونکە ئەو غەریزە و هێزە سروشتییە لە ناو ناخیاندا هەیە ئەگەر زانستیشیان نەبێت، هەروەك چۆن ژیان بۆ خۆی غەریزەیەکی تایبەتی تێدایە، بەهۆیەوە تەن و لاشەی مرۆڤ خۆی ئامادە دەکات بۆ جوڵاندنەوەی ئارەزومەندانەو، بۆ زانین و دەرك کردن بە شتە مەحسوس و هەستیارەکان، هەروەهایش ئەقڵ غەریزەیەکی تایبەتی تێدایە، هەندێك لە گیاندارەکان بەهۆیەوە دەتوانن بگەنە زانستەکان، کە بەنەزەرو بەڵگە دەزانرێن، ئەگەر دروست بێت لەڕوی غەریزەی ئەقڵی‌یەوە یەکسانی بخەیتە

میانی مرۆڤێك و گوێ درێژەکەوە، کە هەردوکیان هەستیارن و دەرکی مادده هەسیارەکان دەکەن، ئەو کاتە دروست دەبوو کە بووترایە:

جیاوازی نی‌یە لە نێوانیادا، ئەوەندە هەیە خودای گەورەو بەدەستەڵات بە حوکمی نەریت و سوننەتی ئیلاهی، لە ناخی مرۆڤدا چەندین زانستی دروست کردووە، کە هەرگیز لە مێشکی کەرو گیانلەبەرەکاندا دروستیان ناکات ، ( ئەگەر دروست بوایە ئەم جۆرە حوکمە بدەین) ئەو کاتە دروست دەبوو کە یەکسانیش بخرێتە میانی مادده بێ گیانەکانەوە( جەمادات) لەگەڵ گوێدرێژێکدا لە ژیاندان و بڵێین:

جیاوازی نی‌یە، بەڵام ئەوەندە هەیە خودای گەورە چەندین جوڵەو حەرەکەی تایبەتی لە (کەر)دا دروست کردووە، بە پێ سوننەت و عادەتی ئاسایی کە ڕوی دابێت، خۆ ئەگەر وای تەقدیر بکردایەو بڕیاری بدایە: کە گوێ درێژەکە جەمادێکی بێ گیانی مردوو بوایە... ئەو وەختە پێویست بوو کە بڵێین:

هەمووو جوڵەو حەرەکەیەك دەبینرێت لێ یەوە، ئەوە خودای گەورە و بەدەستەڵات دەتوانێت کە ئەو جوڵەی تیا دروست بکات، بە پێی ئەو ڕیزبەندی و یەك لە دوای یەکەی کە دەبینرێت، وە هەروەها پێویست دەبوو کە بووترێت: جیاوازی ئەو گیاندارە لەگەڵ جەمادە بێ گیانەکەدا لە جوڵانەوەکەدا، ئەو جیاوازیی‌یە نەدەبوو، مەگەر بەو غەریزە تایبەتییە نەبێت کە (کەر)ەکەی پێ جیاکراوەتەوەو، بە ژیان و حەیات تەعبیری لێ دراوەتەوە.

هەر بەو شێوەیەش دەبێت بزانین:

جیاوازی مرۆڤێك لەگەڵ گیاندارێکدا لە دەرك کردن و زانینی زانستە نەزەریەکان( ئەوەی بەسەرنج و بەڵگە و تێڕامان دەزانرێت) بەهۆی غەریزەیەکی تایبەتی‌یەوەیە، کە بە دەستەواژەی (عەقڵ) ناوی براوە و پێناسەکراوە.

[كەواتە بەمەی باسمان كردو لێكدانەوەمان بۆ كرد دەركەوت، پێناسەو تاریفەكەی ئیمای موحاسیبی بۆ ئەقڵ ڕاستەو لە جێگەی خۆیدایە[1]]

كەواتە عەقڵ وەك ئاوێنەیەكی پاڵفتەكراو وایە، كە جیاوازە لەگەڵ تەن و جیسمەكانی تردا، لەوەدا كە ئەو وێنەو ڕەنگەی دەیخەیتە بەردەمی، وەك خۆی دەری دەخات( كە ئەگەر خۆت بخەیتە بەردەمی بەردێك یان شاخێك، ئاوا دەرناكەوێت) هۆكارەكەیشی ئەوەیە: كە ئاوێنەكە خەصڵەتی صافی و جەلایی تێدایە، كە لەوانی تردا نی‌یە.

وەهەروەها چاو، خەصڵەتێكی جیاوازی هەیە لەگەڵ تەوێڵ و ناوچەواندا، كە بەهۆی شێوە و صیفەتی تایبەتییەوە، وا ئامادەكراوە كە بتوانێت شتەكان ببینێت،( بەڵام تەوێڵ هیچ نابینێت) كەواتە ڕێژە و نیسبەتی ئەو غەریزە تایبەتییەی كە خودا دروستی كردووە لەگەڵ زانستەكاندا، وەك ڕێژەو نیسبەتی چاوە لەگەڵ هێزی بینیندا، وە نیسبەتی قورئان و شەرعی پیرۆز بەرامبەر ئەو غەریزەی كە باسكرا، لەوەدا كە توانای هەیە زاستەكان دەربخات و ئاشكرایان بكات، وەك ڕێژەو نیسبەتی نووری هەتاو وایە بەرامبەر بە بینینی چاو، دەبێ بەم شێوەیە لە تایبەتمەندی ئەم غەریزەیە حاڵی ببیت و تێی بگەیت.[2] (وە گوێ بەوانە نەدەیت كە ئینكاریان كردووە).

---

(١) إتحاف السادة المتقين ١/٤٦٠.

(٢) فەخری ڕازی لە( أسرار التنزيل) دا دەفەرموێت: عەقڵ دوو جۆرە:

ئەقێڵێكیان غەریزەی هەیە لەو هێزەی كە ئامادەیە بۆ وەرگرتنی زانستەكان. وە بوونی ئەو غەریزە لە منداڵێكدا كە ئەو كاتە زانستی نەزانیبێت، وەك بوونی خورما وایە لە ناو ناوكەكەیدا، یان گوڵە گەنمێك لەناو دەنكە گەنمێكدا. بەشی دووهەمیش پاشان باسی دەكەین. إتحاف ١/٤٦٠.

**دووهەم:** ئەقڵ ئەو زانستانەیە کە لەنەبوونەوە پەیدا دەبێت و لە ناو خودی منداڵێکدا کە فامی کردبێتەوە دێتە بوون و بەهۆیەوە دەزانێت کە ئەو شتانەی بوونیان ئاسایی‌یە دروستە ببن یان نەبن، یان ئەوانەی کە مەحاڵە ببن ئەوا زانین و عیلم بەسەر ئەمانەدا پەیدا دەکات، وەك ئەوەی دەزانێت کە ژمارە دوو زیاترە لە یەك، وە یەك کەسی تەنها مەحاڵە لەیەك کاتدا لە دوو شوێندا بوونی هەبێت، ئەمەش ئەوەیە کە هەندێك لە زانایانی عیلمی کەلام ( وەك ئیمای حەرەمەین) مەبەستی بووە کە پێناسەی ئەقڵ بەم شێوە بکات کە دەڵێت: ئەوەی زانستی هەبێت بە دروست بوونی ئەوشتانە کە بوون و نەبونیان یەکسانە، ئەوە بوونیان جایزو دروستە، وە ئەوانەش ک نابێ و ناگونجێ ببن، زانابیت بەوەی کە بوونیان مەحاڵە).

ئەمەش دووبارە لە خودی خۆیدا ڕەوایەو درووستە، چونکە ئەو زانستانە بوونیان هەیە، وە ناو بردنیان بە( ئەقڵ) شتێکی ئاشکرایە، بەڵام ئەوەی ناڕەواو نەگونجاوە، کە بابەتەکە تێك دەدات، ئەوەیە کە ئینکاری بوونی ئەو غەریزە بکرێت و بووترێت: جگە لەو زانستانە هیچ شتێکی تر بوونی نی‌یە.

**سێیەم:** لەواتاکانی ئەقڵ:

چەندین زانستی تر هەن کە بەهۆی تاقیکردنەوەوە سوودیان لێ‌بینراوە وەك ڕەوت و حاڵەتێکی ئاسایی‌یان لێ هاتووە:

بۆ نمونە ئەوەی تاقیکردنەوەکان دەرسی دادابێت و پەندیاری کردبێت، ئەوە بە پێی نەریت و عادەت پێی دەوترێت: کەسێکی ئاقڵ و ژیرە، ئەوەش کە ئەم خەصڵەت و صیفەتانەی تێدا نەبێت، پێی دەوترێت: کابرایەکی نەفام و نەزان و گەمژەیە، ئەمەش جۆرێکی ترە لە زانستیی کە بە ئەقڵ ناوی دەبرێت.

**چوارەم:** ئەوەیە کەبە هێزو توانای ئەو غەریزەیەوە بگاتە دوا قۆناغی خۆی، کە داهاتووی ڕووداوو فەرمانەکان بزانێت، وە بتوانێت سەرکوت و

سەرکۆنەی ئەو ئارەزواتە خێراییانە بکات، کە بۆ خۆشیەکی بەپەلە لەئارادایە، وە زاڵ ببێت بەسەریاندا ( لە پێناوی دەستکەوتێکی بەنرخ و بەهادارتردا) ئەگەر ئەم هێزەی تێدا پەیدابوو، خاوەنەکەی بە کەسێکی ژیرو ئاقڵ ناودەبرێت، لەو رووەوە کە بەرەو رووی شتێك هەنگاو دەنێت، یان واز لە کارێك دەهێنێت، بە پێی ئەو سەرنجدانەی کە بەهۆی غەریزەی ئەقڵەوە دەنوارێت بۆ داهاتوو، نەك بە حوکم و فەرمانی شەهوەت و ئارەزوەیەکی پەلەو خێرا.

ئەمەش یەکێکی ترە لە تابەتمەندییەکانی مرۆڤ کە لە هەموو گیانداران جودای دەکاتەوە.

کەواتە **بەشێ یەکەم**: بنەڕەت و بناغەو بنەماو سەرچاوەی بەشەکانە.

**وەبەشی دووهەم**:ئەو لقەیە کە نزیکترینە لێیەوە،(چونکە بەهۆی هێزی غەریزەوە، زانستیە زەروریەکانی پێ دەزانێت، کە پێویستیان بە بەڵگەو تێڕامان نیيە).

**بەشی سێیەم**: لقی یەکەم و دووهەمە، کە بە هێزی غەریزەی ئەقڵ و بەزانستە زەروریەکان( کە بەڵگە نەویستن) بە هەردووکیان عیلمی تەجرەبە و تاقیکاری لێ فێر دەبێت.

**بەشی چوارەم**: ئەوە دوا بەرهەمەو ئەو پەڕی ئامانجە کە پێی بگات، یەکەم و دووهەم بەسروشت و بەبێ بەڵگە دەزانرێن، دووانەکەی تریشیان بە هەوڵدان و کەسب کردن پێیان دەگات.

هەر بۆیە حەزرەتی عەلی ( کَرَّم اللهُ وَجهَهُ) فەرموویەتی:

**رأيتُ العَقـلَ عَقلَـيْنِ　　فمـطبـوعٌ ومَسـمُـوعُ**
**ولا يَنفـَعُ مَسمُـوعٌ　　إذا لـَم يَـكُ مَطبوعُ**
**كَما لا تَنفَعُ الشَّمسُ　　وضُوءُ العَينِ مَمنوُعٌ((**[1]

---

(١) ديوان سيدنا على الموسوم ب ( أنوار العقول لوصي الرسول) ص ١٦١.

واته:    ئەقڵ دوو جۆرە دەیبـــــینم    کە چاپ بوو بێ و بەگوێ بیسراو
چ سوودێـکی هەیە بـیستـن    غـەریـزەی تیـا نـەبێ چـنراو
وەکـو خـۆر چۆن کە بێ سوودە    کـە نـووری چـاوی لێ سـەنراو[1]

**یەکەمیان:**

ئەوەیە کە پێغەمبەر مەبەستی بووە کە فەرمویەتی:

**((ما خَلقَ اللهُ خَلقاً أكرمَ عَليهِ منَ العَقْل))[2]**

واتە:(خودای گەورە هیچ دروستکراوێکی نەکردووە بەڕێزتربێت لەلای لە ئەقڵ). دواهەمینەکەیشیان کە ئەو ئەقڵەیە سوودی لێ وەرگیرابێت، ئەوەیە کە مەبەستی پێغەمبەر بووەﷺ کە فەرموویەتی:

**((إذا تَقرَّبَ الناسُ بأبوابِ البِرِّ، والأعْمالِ الصَّالِحَة، فتَقرَّب أنتَ بعَقلِكَ))[3]**

فەرمووی بە حەزرەتی عەلی: ئەگەر ئەو خەڵکە خۆیان لە خوداوە نزیك کردەوە بە کردنەوەی هەموو دەرگاکانی چاکەو کردەوە باش و پەسندەکان؛ ئەوا تۆ بەهۆی ئەقڵ و ژیری‌یەوە نزیك ببەرەوە لە خودای خۆتەوە، ئەمەش

---

(١) وەرگێڕ: (ئەحسەن) موفتی.

(٢) رواه الطبراني في (الكبير) ٢٨٣/٨، و أبو نعيم في الحلية ٣١٨/٧، و البيهقي في(الشعب) (٤٣١٢)و أخرجه الحكيم الترمذي في النوادر ٣٥٣/٢ و ما يعدها بسند ضعيف من رواية الحسن، عن عدة من الصحابة: [ قال الزبيدي ٤٦١/١، و أشار العراقي بأنه ضعيف لكون الترمذي المذكور رواه عن عبدالرحمن بن حبيب، عن داود بن المحبر، عن الحسن بن دينار قال: سمعت الحسن، و رجاله ما عدا الحسن هلكي. ]

(٣) أخرجه أبونعيم في الحلية(١٨/١) من حديث علي: **((إذا اكتسب الناس من أنواع البر ليتقربوا بها إلى ربنا عز وجل، فاكتسِبْ أنت أنواع العقل تسبقهم بالزُّلفة والقُرب))** و إسناد ضعيف. قال رسول اللهﷺ: **((إذا اكتسَب الناسُ إلى خالِقهم بأنواع البرِّ، فاكتسب إليه أنواعَ العَقلِ، تسبِقُهم، بالقُربة والراحةِ والدَّرجات في الدنيا))**.

مەبەستی فەرموودەی پێغەمبەری خودایە ﷺ بە ئەبودەردائی فەرمووە ( خودای لێ ڕازی بێت):

**((اِزْدَدْ عَقلاً، تَزدَدْ مِنَ رَبِّكَ قُرباً، فَقال: بأبي أنت وأمي، وكيَف لي بذلك؟ فقال: اجْتَنِبْ مَحارِمَ اللهِ تَعالى، وأدِّ فَرائِضَ اللهِ سُبحانَه، تكُن عَاقِلاً، واعمَلْ بالصَّالِحاتِ مِنَ الأعمالِ تَزْدَد في عَاجِلِ الدُّنيا رِفعَةً وكَرامَةً، وتَنَل في آجِلِ العُقبَى بها مِن رَبِّكَ عزَّوجَلَّ القُربَ والعِزَّ))**[1]

واتە: (چەندێك ئەقڵت زیاتر بكەیت، ئەوەندە زیاتر لە خودای خۆت نزیك دەبیتەوە. ووتی: (باوك و دایكم بە قوربانت بێت) چۆن بتوانم ئەقڵی خۆم زیاد بكەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆت بپارێزە لەو شتانەی كە خودا حەرامی كردوە و سنووری بۆ داناوە، وە پێویست و فەرزەكانی خودای گەورە بەجێ بهێنە، دەبیتە كەسێكی ئاقڵ و ژیر، هەوڵ بدە كردەوە چـاكەكان ئەنجـام بدەیت. لە دونیادا بە خێرایی دەبیتە خاوەنی پلەی بەرزو ڕێزو قەدرگرانی، وەلە داهاتوو و دوارۆژیشدا بەهۆی ئەو چاكانەوە لە لایەن پەروەردگارەوە دەبیتە كەسێكی نزیك و خاوەن عیززەت و ڕێزی تایبەت.

لە سەعیدی كوڕی موسەییبەوە دەگێڕنەوە: كە حەزرەتی عومەر و ئوبەیی كوڕی كەعب و ئەبو هورەیرە (خودایان لێ ڕازی بێت)چونە خزمەتی پێغەمبەرﷺ چونە ژورەوە و عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا: كێ لە هەموو كەس زاناترە؟ پێغەمبەرﷺ: فەرمووی:

كەسێكی ئاقڵ و ژیر(العاقل).

ووتیان: ئەی كێ لە هەموو كەس خوداناس و عابید ترە فەرمووی: (العاقل)

---

(١) أخرجه ابن المحبر، و من طريق الحارث بن أبي أسامة [ في مسنده ٨٠٨/٢(٨٢٩) و الحكيم الترمذي في النوادر ٣٥٨/٢ ].

واته: ئەو کەسەی کە ژیرو ئاقڵە، ووتیان: ئەی کێ لە هەمووان گەورەترە؟ فەرمووی: ( العاقل) ئەوەی ئاقڵە، ووتیان:

ئایا ئاقڵ بەو کەسە ناڵێن کە مەردایەتی و پیاوەتی تەواوکردبێت و، دواندن و ڕەوانبێژیی ئاشکرا بوبێت و، ناو لەپی پڕبێ لە سەخاوەت و دەستکراوەیی و،شوێن و جێگایەکی بەرزیشی لە ناو خەڵکدا هەبێت؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿وَإِنْ كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ (الزخرف ٣٥)﴾ **إنَّ العاقِلَ هُو المُتَّقي، وإنْ كانَ في الدُّنيا خَسيساً ذَليلاً))**[(١)]

واتە: هەرچەندە هەموو ئەمانە گشتی بۆ خوشگوزەرانی ژینی ئەم دونیایەن، ماڵ و ئەولادو دوارۆژیش، ئەوا لەلای پەروەردگارت هەر بۆ ئەوانەی داناوە کە لە خودای خۆیان دەترسن، وە بەڕاستی ئاقڵ ئەو کەسەیە کە خۆپارێزو لە خوداترس بێت، با لە دونیاشدا کابرایەکی پلە نزمی بێ بایەخی ژێر دەستە بێت.

هەروەها پێغەمبەر فەرموویەتی:

**((إنَّما العاقِلُ مَن آمَنَ باللهِ وصَدَّقَ رسُلَه وعَمِلَ بطاعَتِه))**[(٢)]

واتە: (تەنها ئەو کەسە بە ژیرو ئاقڵ دادەنرێت، کە بڕوای بە خودا هەبێت و شایەتی و بڕوای بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەمەدی هێنابێت و، بە گوێڕایەڵی ئەوەوە کاری کردبێت).

---

(١) من أحاديث ابن المحبر في (العقل) انظر الإتحاف ٤٦٢/١.

(٢) أخرجه داود بن المحبر من حديث سعيد بن المسيب مرسلا و فيه قصة: وهو أن رجلا وصف نصرانيا بالعقل، فقيل له: مه: **إنما العاقل من وحد الله و عمل بطاعته،** إتحاف ٤٦٢/١.

وا پێ دەچێت ناوی ئەقڵ بە پێی بنەمای زمانەوانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو غەریزەیەی کە لە پێشەوە باسمان کرد، وە هەروەها لە بەکارهێنانیشدا بە هەردوو مەبەستە تایبەتی و گشتی‌یەکەی، بۆیە ئەقڵ دابڕاوە بەسەر زانستە ( زەرورییەکان)دا، وەك زانایانی عیلمی کەلام بۆی چوون، لەو ڕووەوەیە کە بەرهەم و ئامانجەکەیەتی، وەك چۆن تاریفی شتێك دەکەیت و دەیناسیت بەهۆی بەرهەمەکەیەوە، بۆ نمونە دەڵێت:

زانستی بریتی‌یە لە ترسان لە خودا، کە ئەمە پێناسەی زانست نی‌یە لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵام یەکێکە لەبەرهەمەکانی، کەواتە ڕاستە کە دەڵێن:

زانا ئەو کەسەیە لە خودای گەورە دەترسێت، خۆ دەزانین کە ترسان لە خودا بەرهەمی ئەو زانستەیە کە هەیەتی، وەك شێوەی مەجازو خوداستن بۆی بەکاردەهێنێت، بۆ غەیری ئەو غەریزەی کە باسمان کرد.

بەڵام لە ڕاستی‌دا مەبەستمان ئەوە نی‌یە بە دوای واتاکەی دا بگەڕێین لە بنەمای زمانەوانیدا، (چونکە زۆربەی زۆری زانایانی عیلمی کەلام، تەفسیری ئەقڵیان تەنها بە عیلم کردۆتەوە) بەڵکو مەبەستی سەرەکیمان ئەوەیە:

کە ئەم چوار بەشەی باسمان کرد، بوونیان هەیە، ناوی ئەقڵ دەشێت بکرێتە ناوو بکرێت بە بەرگ و باڵای هەموو بەشەکاندا، هیچ ڕایەکی جیاوازیش نی‌یە لەسەر بوونی هەموو بەشەکان جگە لە بەشی یەکەم نەبێت، ئەوەی ڕاستیشە بەشی یەکەمیش دروستەو بەجێ‌یە، بەڵکو بنەماو بناغەی بەشەکانی ترە، هەموو سێ بەشی زانستەکانی تر، وەك ئەوە وایە کە لە فیطرەت و بنەڕەتدا ئاخنراو و جێکراوە بێت، لە ناو ئەو غەریزەی بەشی یەکەمەدا، بەڵام ئەوەندە هەیە، ئەو بەشانە پەیدا دەبن و ئاشکرا دەبن، هەر کاتێك هۆکاری بوون و پەیدابوونیان پەیدابێت و داخوازی بکات، بەشێوەیەك پەیدا دەبن، وەك ئەوەی کە ئەم سێ جۆرە زانستەیە هەموویان لە ناخ و ناوەڕۆکدا بوونی

فیطریان بووەو، هیچیان لەدەرەوە نەهاتۆنەتە ناو جەستەیەوە، بەڵکو لە خودی خۆیدا هەبوون و سەریان هەڵداوە.

نمونەی ئەمەش وەك ئاوی ناو زەوی، کە جۆگەلەیەك هەڵدەکەنیت ئەویش پەیدا دەبێت، وەکۆدەبێتەوەو جیادەبێتەوە لەیەك. وەك بە چاو و هەست پێی دەزانیت، نەك بەوەی کە لە دورەوە شتێکی تازەت بۆ ڕاکێشابێت و لەگەڵیدا تێکەڵت کردبێت، بەڵکو هەر لە خۆیدا کۆدەبێتەوە، هەروەها ڕۆنی(بادەم) و ئاوی گوڵاو، کە لە ناو خۆیاندا ڕۆنەکەو گوڵاوەکە بوونیان هەیەو پەیدادەبن.

هەر لەبەرئەمەیە کە قورئان دەفەرمووێت:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى (الأعراف ١٧٢)﴾ واتە:

ئەوساش کە پەروەرندەی تۆ لە پشتی ئەولادی ئادەم( تۆوی بەچەو) زارو زوێچی بەرهەم هێنا،هەر بە خۆیان شایەتیان لەسەر خۆیان داو گووتیان:

ئایا من پەروەرێن وپەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ لەوە ئاگادارین.[1]

مەبەست ئەوەیە خودی خۆیان( لە پشتی باوکیاندا) دانیان ناوە بەوەدا، نەك بەزوبان ئەو ئیقرارەیان کردبێت، چونکە لە کاتێکدا کە زوبانیان وەبەرداکرا جیاوازی کەوتە بەینیانەوە، بەشێوەیەك هەندێك لە زوبان و شەخصەکان دانیان پیادا ناو، هەندێکیشیان نکۆڵیان لێ کردو ئینکاریان کرد.[2]

---

(١) تەفسیری قورئانی پیرۆز هەژار موکریانی ١٧٣ سورەتی ئەعراف/١٧٢.

(٢) واتە هەندێکیان لەسەر دان پیانانە سەرەتاییەکەی، کە لە پشتی باوکە گەورەیان ئیقراریان پێ کردووە ماونەتەوەو بەردەوام بوون، وە هەندێکیشیان لێی پاشگەزبوونەوە، وە هەندێکیشیان بە یارمەتی خودا گەڕانەوە سەر ڕێبازی

هەر لە بەرئەمەیە کە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ (لقمان ٢٥)﴾

واتە: ئەگەر سەرنج لەهەموو حاڵەتە جیاوازەکانیان بدەیت و لە حاڵیان وردببێتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە خۆیان و ڕۆح و نەفس و ناوەڕۆکیان شایەتی دەدەن کە خودا دروستی کردوون.

﴿ فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا (الروم ٣٠)﴾

واتە: هەموو ئادەمیزادێك لەسەر بنەماو فیطرەتی ئیمان و بڕوا بە خودای گەورە دروست بووە، بەڵکو بەو شێوە خودا دروستی کردوە کە هەموو شتەکان لە سەر حەقیقەت و واتای ڕاستەقینەی خۆیان ببینن.[1]

---

دروست، کەواتە ئەصڵی دانپیانەنەکە بە دەقی پیرۆزی قورئان جێگیر بووە، ئەوەندە هەیە بە زوبان نەبووە، بەڵکو بەو غەریزەی کە خودا لە ناو تۆمی سەرەتایی بونیاندا دروستی کردووە، بۆیە ئیمامی غەزالی هێما دەکات بۆ بەروبوم و ئەنجامی بەرهەمی ئەقڵ، لەوەی کە بەزەروورەت و بێ بەڵگە هەر لەسەرەتاوە ئاشنا دەبێت بە (معرفة الله)، کە ئەوەش ئامانجی ئەو حاڵەتە پیرۆزەیە کە مرۆڤ پێی دەگات: چونکە بەرزترین بەرهەم کە لە ئەقڵەوە پێی بگات، بەرهەمی ناسینی خودایە ﷻ، وە باشتر کردنی گوێ ڕایەڵی و طاعەت و وازهێنانە لە گوناهو تاوان. بنواره الإتحاف ٤٦٣/١.

(١) نەیفەرمووە: (بەڵکو لەسەر مەعریفەت و ناسینی خوای گەورە) بەڵکو مەبەستی لە وشەی ( ئیمان و بڕوا) ناسینی خودایە بە زەرورەت( بەبەڵگەو بە بەداهەت) ئەوەش ئەوەیە کە هەموو کەسێك بزانێت کاری تێداکراوەو، یەکێك کارەکەی تیا ئەنجام داوە و، لە هەموو حاڵەتە جیاوازەکانەوە گواستویەتیەوەو تیایاندا ئاخنراوە، کەواتە مەبەستیان ئەو زانست و زانیارییە نییە بەکەسب و هەوڵ و

مەبەستم ئەوەیە ئەو فیطرەتی ئیمان و زانینی ڕاستیەکان لەسەر ئەو حاڵەتەی کە خۆیان لەسەرینی:

وەك ئەوە وایە کە جێگیرو ئاخنراو بێ لە ناو غەریزەیاندا، چونکە زۆر بەنزدیکی و ئاسانی دەرفەت دەڕەخسێت بۆ هەست پێ کردن و دەرك کردنیان لە پاش ئەوەی کە زانیمان ئیمان و بڕوا بە فیطرەت لە ناو گیان و نەفسدا جێگیر بووە، خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان پشتی هەڵکردو پەیمانەکەی لە بیر کرد، ئەوانەش کافرەکانن، وە بەشێکیشیان چاکتر بیریان کردەوەو ئەوەی بیریان چوبویەوە بە بیری خۆیانیان هێنایەوە وەك ئەو کەسەی کە شەهادەیەکی هەڵگرتبێت و لیی غافڵ و بێ ئاگا بووبێت و لە پاشان بیری کەوتبێتەوە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ (البقرة ٢٢١) ﴾

بۆ ئەوەی بیریان بێتەوە،﴿وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَاب (ص: ٢٥)﴾

خاوەن دڵەکان ئامۆژگاری لێ وەردەگرن

﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُمْ (المائدة ٧) ﴾

( ئەو چاکەیە لەبیرمەکەن کە خودا دەربارەی کردوون و ئەو پەیمانەتان لەبیربێت کە لەگەڵ خوداتان بەستووەو گوتووتانە).[1]

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ (القمر ١٧) ﴾

واتە: ( ئەم قورئانەشمان ساناو ئاسان کرد کە بیری لێ بکرێتەوە، ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟ وە ناوبردنی ئەم جۆرەیە بە بیرخەرەوە هیچ دووریەکی تێدا نییە، وەك ئەوەی کە جۆری بیرخستنەوە دەکرێت بە دووبەشەوە:

**یەکەمیان:** بەو شێوەیە کە وێنەو دیمەنێکی بەبیربێتەوە، کە کاتی خۆی لە

---

تێکۆشان دەستی کەوتووە. إتحاف ٤٦٣/١.

(١) تەفسیری قورئانی پیرۆز هەژار. ١٠٨ سورەتی مائیدە/٧.

دڵیدا بــوونی هەبووە، بەڵام دوایی بــوونەکەی لە بەرچاوی دڵدا نەماوە، بە لە بیرچونەوە، یان غافڵ بوون لێیی، ئەوی تریشیان: ئەوەیە بەو شێوەك بێت کە ئەو بیرکردنەوە لە سەر وێنەیەك بێت کە لە ئەصڵی فیطرەتدا بوونی هەبووەو لە ناخیشیدا بوونی هەر بووە.[1]

ئەمانە کۆمەڵێ ڕاستین، ئەوەی بە نووری بە صیرەت و چاوی دڵ سەرنجیان بدات، سەیریان بکات دەیسەلمێنێت، بەڵام لەسەر ئەو کەسە قورسە کە تەنها برەو بەگوێ گرتن و چاو لێ کەری دەدات و، دڵی بەو شێوە دادەکەوێت، نەك بە کەشف و بینین و چاو پێکەوتن، بۆیە دەیبینیت هەر جارەی بەشێوەیەك لێکدانەوەی هەیە لە ناو ئایەتەکانداو، بەرچاویشی ڕون نی‌یە تابەنووری بەصیرەت ڕاستیەکانی یەکسەر بۆ دەربکەوێت، بۆیە سواری

---

(١) مەبەست لەوەی کە لە فیطرەتدا ئەو غەریزەیە بوونی هەیەو بەبیریا دێتەوە ئەوەیە: کە بوونی ئەو بیرخەرەوەیە لە ناو دڵدا جێگیرە بەبێ غەفڵەت و لەبیرکردنەوە، وە زیکر و یادی خودا لەسەر شێوەی یەکەم بەلای خواناسانە وە جێگای ڕەزامەندی نی‌یە، بەڵکو کاتێ پەسەندە کە بەشێوەی پێناسەکردنی دووهەم بێت، کە لە ناو چوار بەشەکەدا باسمان کرد، ئەوەش بزانین کە زیکری خودا، کەرەتێك لەبەر ئەوەیە کە سەیری گەورەیی و عەزەمەتی دەکرێت، کە بەهۆیەوە جەلال و سامی پەروەردگار لە دڵدا دەچەسپێت و زیکری لێ دەکەوێتەوە، وە جارێکی تر بەهۆی گەورەیی قودرەتی خوداوەیە، کە بەهۆیەوە خۆف و ترس و بیم پەیدا دەبێت و زیکری لە پێناودا دەکرێت، وە جارێکی تر بۆیە زیکری خودا دەکرێت، چونکە خودا فەزڵ و میهرەبانی هەیە، کە بەهۆیەوە هیواو ئاوات پەیدا دەبێت و، نیعمەتەکانی بەسەر دەکاتەوەو شوکرانە بژێری دەکات.و،پەندو ئامۆژگاری لەو جۆرە زیکرە وەردەگرێت. بە تایبەتی ئەگەر زیکرەکەی پەیوەست بێت بەسەرنج دان لە کردارەکانی خودا،کە هەمووی حیکمەتی تێدایە و زیکری لێ دەکەوێتەوە. إتحاف ١/٤٦٤.

قسەی خۆی دەبێت و، بە تەئویلی دور لە ڕاستی باسی وشەی(تذکیر) و بیرکردنەوە دەکات و، وای دەگەیێنێت ئەو پەیمان و ئیقرارەی کە لەسەرەتاوە کردویانە، جۆرێکە لە زیادەڕەوی و بێ بنەما ئەیانداتە قەڵەم، تا بە ناچاری خەیاڵێکی تریشی بۆ دروست دەبێت، لە جۆرێك لەو هەواڵ و فەرموودە و ئایاتانەی لەو بارەوە هاتووە، کە ئەوە دژ بەیەکن و ئاڵۆزییان تیدایەو، ئەم بۆ چونەی خۆی زاڵ دەبێت بەسەریداو ، بەچاوێکی سووك و بێ ڕێزییەوە سەیری ئایەت و فەرموودەکان دەکات و، بڕوای وایە کە پوچ و باطیلن.[1]

نمونەی ئەم پیاوە: وەك نمونەی کوێرێك وایە بچێتە ناو بینایەکی زۆر گەورەوە، بەهۆی پێیەکانیەوە هەندێك دەفرو حاجەتی گران بەها بدۆزێتەوە، کە لە جێگەیەکدا هەڵچنرابن و بڵێت:

ئەوە بۆچی ئەم قاپ و دەفرو فەخفورییانە لەسەر ڕێگادا لایان نابەن و نایانخەنەوە جێگاکانی خۆیانەوە؟ بۆیە پێی دەڵێن:

ئەوانە لە جێگای خۆیــاندان، بەڵام تــۆ چاوت نابینێت تا ڕاستیــەکان ببینیت!! کەواتە کەم و کوڕیی لە چاودا چۆنە، کەموکڕیش ئەگەر لە چاوی دڵ و بەصیرەتدا بوو ئاوایە، بەڵکو زیاترو گەورەترە لە ڕوی کاریگەری سیلبی و نەرێنی یەوە، چونکە نەفسی مرۆڤ وەك ئەسپ سوارێك وایە و، لاشەکەیشی وەك ئەسپەکەوایە، بۆ هەرکوێ بیەوێت شوێنی دەکەوێت، ئەگەر ئەسپ

---

(١) چونکە ئەوەندە زانستی زاهیری نی‌یە کە بە بەڵگەی سەلمێنراو بۆی دەربکەوێت کە ئەوە دژایەتی و( تەناقوض) نییە، بەڵکو ئەکرێت کە هەر دوو بەڵگەکە کۆبکاتەوە وە تەوفیق بخاتە نێوانیانەوە، وەلە زانستی موشاهەدەو عیلمی یەقینیشدا بەشی نی‌یە تا بەهۆی ئەو عەقڵە شارەزاو بەرچاو ڕونەوە ڕاستیەکانی بۆ دەربکەوێت. بۆیە دەکەوێتە ناوەندێکی مەترسی‌دارەوە کە زیان بەخشی ئەم بۆ عاممەی خەڵك زیاترە لە زیان بەخشی کەسانێکی تر. إتحاف ١/٤٦٤.

سوارەکە کوێر بێت، زیانی زۆر زیاترە لەوەی کە خودی ئەسپەکە کە ئەوی هەڵگرتووە کوێربێت.

وە لەبەر ئەوە لێکچواندن هەیە لە میانی بەصیرەتی باطین و شاراوەی مرۆڤ و بەصەرو بینینی چاوی زاهیریدا، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى (النجم ١١)﴾

واتە: (چاوی دڵی درۆی نەکردووە لەوەی کە خودای خۆیی بینیوە و باسی لێوەکردووە، چونکە فەرمانە پیرۆزو قودسیەکان لە سەرەتاوە بە دڵ دەبینرێن، لە پاشان بینینەکە دەگوازرێتەوە بۆ ناو پەڕەکانی چاو)[1]

وە هەروەها خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ (الأنعام ٧٥)﴾

واتە: ( هەر ئەو دەمەش بوو کە پیشانی ئیبراهیمماندا، کە دام و دەزگای ئاسمانەکان و زەمین سەر بەکێیە.)[2]

---

(١) إتحاف ٤٦٤/١ وەك لە تەفسیری بەیضاوی نەقڵی دەکات.

(٢) تەفسیری قورئانی پیرۆزل ١٣٧ الأعراف ٧٥. هەژار.

وە پێویستە بزانێت کە نەفسە موقەددەسەکان کاتێك لە حزوری خودادا ئارامی پەیدا دەکەن، پەردە لە سەرچاویان لا دەدرێت و، وەك رۆژی رۆشنا پرشنگ دەدەنەوە، کاتێك حەواسەکانیان لە کار دەکەوێت بەهۆی نوستنەوە یان بەهۆی موراقەبەوە، ئەو کاتە نەفسەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی مەلەکوتی و بە پێی هێزو توانای ئەونەفسەیە دەتوانێت بۆ جیهانە بەرزەکان بەرزببێتەوەو، سەیری تایبەتی هەبێت بۆ جیهانی مەلەکووت، ئەو کاتەیش چاوی دڵی بەرزدەبێتەوە بۆ جیهانی رۆحانی، وەك تیشکی چاوەکان چۆن بەرزدەبنەوە لە ناو ئاسمانەکاندا، خوای گەورەش لە هەردوو ئایەتەکەدا سەلماندوویەتی، جۆرە بینینێك هەیە بۆ ئەقڵ ، یان لە ئایەتی:﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ (الفرقان ٤٥)﴾

وە خودای گەورە ناوی دژەکەی بە کوێر ناو بردووە، وەك فەرموویەتی:

﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ (الحج ٤٦)﴾

وەنەبێ چاوەکان کوێر بووبن، کە ڕاستیەکان نابینن، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کەوان لەناو سیەنەکاندا، چونکە ناخ و ناوەڕۆك لێك نادەنەوەو هەر شتە ڕواڵەتیەکان دەبینن) هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلًا (الأسراء ٧٢)﴾

واتە:

( جا ئەو کەسەی لەم دونیادا دڵ و گیان و دەرونی کوێر بێت، ئەوە لە قیامەتیشدا چاوی کوێرەو ،زۆر لە دونیا سەرگەردان و سەر لێشێواوترە، چونکە بە چاوی سەری هەرگیز تێنەفکراوەو خراپیشی بەکارهێناوە).

ئەم فەرمانانەی کە بۆ پێغەمبەرەکان دەرکەوتوون و ئاشکرا بوون، هەندێکیان بە بینینی چاو بووە، وە هەندێکیشیان بە چاوی دڵ و بەصیرەت بووە هەموویشی هەر بە بینین ناو براوە.

بەکورتی: ئەو کەسەی چاوی دڵ و (بەصیرەتی شاراوەی) تیژو بینا نەبێت، ئەوە لە دیندا تەنها توێکڵ و وێنەو نمونەکەی پێوە دەلکێت، نەك ناو کرۆك و مەغزاکەی.

ئەمەش کە باسمان کرد بەشەکانی عەقڵە کە ناوی (عەقڵ) دەیانگرێتەوە.

---

ئایا نابینیت چۆن پەروەردگارت سێبەر درێژ دەکاتەوە، وە بینینی بۆ (دڵ) بڕیارو جێگیر کردووە وەك دەفەرموێت: ﴿ وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ (الأعراف ١٩٨) ﴾ تۆ ئەوانە دەبینیت کەوا سەیرت دەکەن، لە کاتێکدا کە ئەوان نابینن، واتە: چاوی دڵیان بینا نییە تا حەقیقەت و ڕاستیەکانی پێ ببینن.

# ڕونکردنەوەی جیاوازی خەڵکی لە ئەقڵدا

بەڕاستی خەڵکەکە ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی بەرزونزمی ئەقڵ، پێویست ناکات قسەی ئەوانە بگوازینەوە کە کەمیان لەو بوارەدا خوێندۆتەوە و لێی حاڵی نەبوون، باشتر وایە خۆمان بەوەوە سەرقاڵ بکەین، کە ئەوەی گرنگ و ڕاستی‌یە ڕونی بکەینەوە و حەقیقەت ئاشکرا بکەین.

ڕاستی بێ پێچ و پەنا لەم بارەوە ئەمەیە کە بووترێت:

جیاوازی ئاستی خەڵکی لە زۆری و کەمی ئەقڵدا هەموو بەشەکان دەگرێتەوە، جگە لە بەشی دووهەم نەبێت، کە ئەو زانستە پێویست و زەروری‌یەیە( بە بێ بەڵگە، وەك شتێکی بەدیهی دەزانرێت) کە ئەو کارە بوونەکەی جایزو دروستە و ئەو کارانەش بوونیان مەحاڵە و بەڵگەشیان ناوێت.

بەڕاستی ئەو کەسەی کە دەزانێت دوو ژمارە زۆرترە لە یەك، دەشزانێت کە محاڵە جەستەیەك لە یەك کاتدا لە دوو شوێن دا ببێت و ببینرێت.

یان یەك شتی تەنها کە قەدیم بووبێت و هەربووبێت و تۆ پێی بڵێیت پەیدابووە، چونکە ئەمانە دژ بە یەکن، هەروەها هەموو بابەتەکانی تر کە لە بەرچاودان و هاو وێنەی ئەمانەن.

کەواتە هەموو شتێک کە کەسێکی ئاقڵ و ژیر بە دڵنیاییەوە دەرکی پێ بکات و هیچ گومانی نەبێت بەرامبەری، ئەوە هیچ جیاوازییەك نی‌یە لە میانی خەڵکەکانیشدا بەرامبەری. بەڵام سێ بەشەکەی تر( کە بەشەکانی یەك و دوو سێ‌ی ئەقڵن) ئەوە جیاوازی و کەم و زۆری ڕویان تێ دەکات، بەڵام بەشی چوارەمی ئەقڵ:

کە بەهێز و توانایەکی زۆرەوە ئەقڵ بتوانێت سەرکۆنەی ئارەزووەکانی خۆی بکات و ، سەریان بۆ دانەنەوێنیت و سەریان بنێتەوە، ئەوە گومانی تێدا نی‌یە

که جیاوازی له کەسێکی تاکیشدا هەیە لەگەڵ خۆیدا، ئەم کەم و زۆریەش هەندێك جار دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی هێزی ئارەزوات له ناخیدا، چونکه عاقڵی وا هەیە بە هێزی عەقڵەکەی دەتوانێت هەندێك لە ئارەزووەکانی نەهێڵێت، بەڵام نەیتوانیوە زاڵ ببێت بە سەر هەموویدا،( وەك ئەوەی کە دەتوانێت ئارەزووە ئاشکراکانی نەهێڵێت، بەڵام نەیتوانیوە ئارەزووە شاراوەکانی دوربخاتەوە) بەڵام ئەم جیاوازی‌یە تەنها ئەو کارو فەرمانەی ئەو ناگرێتەوە، چونکە دەبینین گەنجی وا هەیە( بەهۆی زاڵ بوونی هێرشی ئارەزواتەوە) ناتوانێت خۆی له زینا دوربخاتەوە، بەڵام ئارەزواتی ڕیابازی و ڕیاسەت و گەورەیی تا گەورتر ببێت زیاتر له ناخیدا بەهێز دەبێت نەك لاواز ببێتەوە.

وە هەندێك جار( ئەو کەم و زۆری ئەقڵە) بەهۆی ئەو زانینەیە کە بابەتی ئەو ئارەزواتەی ڕون کردۆتەوە، ئایا توانیویەتی بەچاکی یان بەکەمی باسی زیانەکانی بۆ کردبێت، بۆیە دکتۆرێکی شارەزای پسپۆڕ دەتوانێت پارێز له هەندێك خواردن و خواردنەوەی زیان بەخش بکات، بەڵام لەوانەیە کەسێکی تر کەوەك ئەو ئەقڵیشی هەبێت، بەڵام له پزیشکی‌دا یەکسان نەبن، ناتوانێت وەك دکتۆرەکە پارێزەکە بکات،( چونکه شارەزایی تایبتمەندی و زیانەکانی خۆراکەکانی نی‌یە) بە کورتی با بڕوایشی هەبێت کە ڕاستە ئەو خواردنە زیانبەخشە.

کەواتە ئەگەر زانستی دکتۆرەکە تەواوترو زیاتر بوو، ترسەکەیشی بەهێزترە، کەواتە ئەو ترس و خۆفە دەبێتە سەربازو هۆکارێکی یارمەتی دەر، بۆ کپ کردنەوەی ئارەزوات و بەربەست کردنی.

هەر بەم شێوەیەش زانایەك زیاتر دەتوانێت واز له گوناهێك بهێنێت له جاهیل و نەزانێك، چونکە بەهێزی زانستەکەی، زیانی تاوانەکەی زیاتر

لەبەرچاوە، مەبەستیشم بەزانا: زانای ڕاستەقیەنەیە، نەك خاوەنی بەرگەڕەش و تایبەتیەکان و زۆر بڵێکان، کە هاوڕێی دەستەڵاتدارەکانن.

ئەگەر جیاوازی‌یەکە لە ڕوی ئارەزواتەوە بوو، ئەوە ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازی و هۆکاری کەمو زۆری ئەقڵ، وە ئەگەر هۆی جیاوازی‌یەکە لەڕوی کەم و زیادی زانستەوە بوو( کە تاچەندێك دەتوانێت کەمی و زۆری زیانبەخشی ئەو شتەیە دیاری بکات) ئەوە ناوی ئەم بەشی دووهەمەمان برد لە بەشەکانی زانست بە ئەقڵ، چونکە غەریزەی ئەقڵ زیاد دەکات و بەهێزی دەکات، ئەو کاتە فەرق و جیاوازییەکە بۆ ئەو حاڵەتە دەگەڕێتەوە کە ناوەکەی لێنراوە( کە ئەو جۆرە زانستە بە ژیری ناوزەدکراوە).

وە هەندێك جار جیاوازییەکە تەنها بەهۆی جۆرێك بووە لە جودایی لە غەریزەی ئەقڵدا، کە ئەگەر غەریزەکەی بەهێز تر بێت، بە دڵنیاییەوە توانای ئەقڵ بۆ زاڵ بوون و دەمکوت کردنی ئارەزووەکان بەهێزتر دەبێت.

**بەڵام بەشی سێیەم** کە ئەو زانستانەی بەهۆی تاق کاریەکانەوە خیبرەی زیادبووەو شارەزایی زۆرتربووە، ئەوە ناتوانرێت ئینکاری بوونی جیاوازی لە میانی کەسەکاندا بکرێت، کامیان زیاتر شارەزاو خاوەن خیبرەبوون و، زۆرتر ڕاو بۆچونەکانیان ڕاستی پێکاوەو ،زووتر لە شتەکان حاڵی بوون، ئەوە جیاوازە لەگەڵ ئاستی ئەوانەدا کە ئەو تواناو زیرەکی و تاقیکردنەوەیان نی‌یە ، هۆکاری ئەم جیاوازییەش یان دەگەڕێتەوە بۆ کەمی و زۆری غەریزەی ئەقڵ، یان زۆری و کەمی کارکردن و پرۆڤەکردنی.

**باسی یەکەمەکەیان کە ئەصڵی هەموویانە**، مەبەستم پێی غەریزەکەیە، ئەگەر جیاوازی هەبێت لە ناوی دا، نابێ ڕێگە بدەین کە بەیەکجار ئینکاری بکرێت و بوونی ڕەد بکرێتەوە، چونکە ئەو غەریزەیە وەك نوورێك وایە کە لەسەر نەفسی مرۆڤ هەڵدێت و لەگەڵ کازیوەی بەیانی‌دا ڕۆژی بەسەردا

دێت،( لەسەرەتاوە بوونەکەی وەك نورێك وایە) و ،بنەمای پڕشنگ و شەوق دانەوەیشی لە تەمەنی فامکردنەوەوە پەیدا دەبێت، لە پاشان بەردەوام ئەو غەریزەیە لە ناخی مرۆڤدا گەشە دەکات و، وردە وردە بە پلەکاری بەرزو ئاشکرا دەبێت، تا خاوەنەکەی دەگاتە کەماڵی ئەقڵەوە، لە نزیك بوونەوەی چل ساڵیدا.

**نمونەی ئەم حاڵەتە:** وەك نووری بەرەبەیان وایە، بەڕاستی سەرەتاکانی پەیدابوونی ئەو نووری بەرەبەیانە ئەوەندە شاراوەیە، کە بە ئاستەم هەستی پێ دەکرێت، لە پاشان کەمە کەمە زیاد دەکات، تا تیشکەکەی بە تەواوی لەگەڵ هەڵاتنی پڕ بە پڕی خۆردا تەواو دەبێت.

جیاوازی و کەم و زۆری نووری بەصیرەت و چاوی دڵیش، وەك کەم و زۆری تیشکی چاوە لە زۆری و کەمی و زیادبوون و نوقسانیدا، خۆ جیاوازی بینینەکە ئاشکرایە، لە میانی کەسێکی مژمۆڵ و کەسێکی چاو تیژدا، بەڵکو سوننەتی خودا واهاتۆتە پێشەوە، کە هەموو درستکراوەکانی بە پلەبەندی و یەك لە دوای یەك دەیانهێنێتەوە بوون.

تەنانەت غەریزەی ئارەزواتی شەهوانی لە منداڵێکدا، کە باڵغیش دەبێت بەیەکجار و بەکتوپڕی هەمووی بۆ دەرناکەوێت، بەڵکو کەم کەم و بەپلە بەندی زیاد دەکات، وە هەروەها هەموو هێزو صیفەت و خەصڵەتەکانیش بەم شێوە ئاشکرا بووە.

وە هەرکەسێك ئینکاری ئەوە بکات لە بارەی ئەم غەریزەوە، کە جیاوازی لە میانی خەڵکیدا نییە، وەك ئەوە وایە بەرگی ئەقڵ و ژیری لە بەرخۆی داڕنی بێت.

وە هەر کەسێکیش وا گومان ببات، کە عەقڵ و ژیری پێغەمبەرﷺ وەك ئەقڵی ئەو ڕەشەخەڵکە لادیی و خەڵکی دەشتەکییە وایە، ئەوە لە خودی

خۆیداخراپتر و نابووت ترە لە ڕەشە خەڵکە گوندنیشینە نەزاندوەکان کە باسمان کردن.[1]

چۆن دەبێت ئینکاری ئەوە بکرێت کە غەریزەکان بە پێی کەسەکان جیاوازییان هەیە ، خۆ ئەگەر جیاوازی غەریزەی ئەقڵ و کەم و زۆری نەبوایە، ئەوا جیاوازیش دروست نەدەبوو لە خەڵکەکاندا، بۆ تێگەیشتن لە دەستەواژەکان و لە زانستەکان، وە ئەو خەڵکە دابەش نەدەبوون بەسەر چەندین بەش و تاقمدا:

کۆمەڵێ تەمبەڵ و گەلحۆ، کە هەوڵیشیان لەگەڵدابدەیت هەر تێ ناگەن، مەگەر بە ماندوو بوونێکی زۆری مامۆستاو فێرکەرەکەیان.

وە هەندێکیش ئەوەندە زیرەکن، کەمترین ڕەمزو هێماو نیشانەی بۆ بدرکێنیت ئەو لەو سەریەوە دێتەوە، وە کەسانێکی کامڵ و تەواو لە هەموو بوارێکدا، کە بە بێ فێربوون و مامۆستای زاهیری، حەقیقەتی فرمان و شتە شاراوەکانیش لە ناو دەریای سینەو گیانیانەوە هەڵدەقوڵێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی:

---

(١) ئەبو نەعیم لە حلیة الأولیاءدا(٢٦/٤) لە ( وهبی کوڕی منبە)وە دەیگێرێتەوە کە فەرموویەتی:

حەفتاو یەك کتێبم خوێندۆتەوە لە هەموویاندا بینومە کە تیایاندا نوسراوە: خوای گەورە بۆ هەموو تێکرای ئادەمیزاد لەسەرەتای دروست بوونی دونیاوە تا بەکۆتا دەگات، ئەندازەی ئەو ئەقڵەی نەداوە بەهیچ کەسێك کە بە پێغەمبەریﷺ داوە، عەقڵی هەمووی لە پاڵ عەقڵی حەزرەتی محمدﷺ دا وەك دەنکە ڕمڵێکی ناو سارایەك وایە، بەرامبەر هەموو لم و ڕملی دونیا، وە بەڕاستی حەزرەتی موحەممەد لە هەموو کەسێك ئەقڵی بەرزو بالاترەو، ڕاو فەرموودەکانیشی لە هەموو کەسی مەزن و گەورەترە. بنوارە إتحاف ٤٦٧/١.

﴿ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ (النور ٣٥)﴾ واته: ( خەریکە بۆ خۆی دابگرسێت و ڕوناکی بداتەوە، ئەگەر هیچ ئاگرێکیش لێی نەدابێت).

ئەوەش وەك پێغەمبەران(صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر) کە لە سینەو ناخی شاراوەیاندا، چەندین فەرمانی نادیار و نەزانراویان بۆ ئاشکراو ڕوون دەبێتەوە، بێ ئەوەی لە کەسێکەوە فێربووبن یان بیستبێتیان، ئەمەش بە ئیلهام ناو زەدکراوە.[1]

وە هەر لە نمونەی ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی: (**روحولقودوس**) واتە (حەزرەتی جوبرەئیل) فووی کرد بە گیانم دا، هەڵیدایە ناو نەفسمەوە و دەفەرمووێت:

**((إنَّ رُوحَ القُدُسِ نَفَثَ في رَوعِي: أَحبِبْ مَنْ أحبَبْتَ فَإِنَّكَ مُفارِقُهُ، وعِشْ ما شِئتَ فإنَّكَ مَيِّتٌ، واعْمَلْ ما شِئْتَ فَإِنَّكَ مَجْزِيٌّ بِهِ))**[2] واته: (دەتەوێت

---

(١) **ئیلهام**: ئەوەیە کە خوا شتێك ئەخاتە ناو دڵەوە و هەواڵێك دەهاوێتە ناو سینەو دەرونی ئەو کەسەوە لە ڕێگەی فەیزو میهرەبانی خۆی، وە تایبەتە بەوەی کە ئەو ئیلهامە لە لایەنی خوداوەیە ﷻ، یان لە (ملأُ الأَعلَى) وە، واتە دانیشتوانی جیگا بەرزەکان، کە ئەوانیش لە خوداوە ئەسرارەکان وەردەگرن و دەیخەنە ناو دڵی ئەوانەی شایستەن، وە دڵی ئەو کەسەش پێی دادەمەزرێت و، لە ڕاستیەکەی دڵنیایە، کە تایبەتمەندە بە پیاوە صەفادراوەکان. إتحاف ٤٦٧/١.

(٢) أما لفظ: إنّ روح القدس نفث في روعي. والذي هو مُحل الشاهد فرواه عبدالرزاق في ((المصنف)) ١٢٥/١١، و أبو نعيم في ((الحلية)) (٢٦/١٠) و تمة الحديث هو عند أبي نعيم في الحلية ( ٢٠٢/٣)، و البيهقي في ((الشعب))(١٠٠٥٨).

أخرجه الشيرازي في الألقاب من حديث سهل بن سعد نحوه، والطبراني في الأصغر٢٠/٢(٧٠٤) والأوسط ١١٩/٥(٤٨٤٥) من حديث علي وكلاهما ضعيف.[ قال الزبيدي٤٦٧/١:هكذا أخرجه أبو نعيم في الحلية ٣٧/١٠، عن أبي إمامة الباهي، الحاكم في

